


دکـــتۆر
یعقوب حسین عبدالکریم الراوی

# زانستی نوێ



و



# کۆتایی بوونەوەر

نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی
بەراوردێک لە نێوان قورئان و فەرموودەو زانستی سەردەم

چاپی سێیەم




# زانستی نوێ و کۆتایی بوونەوەر

● نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی

● بەراوردێک لە نێوان قورئان و فەرموودەو زانستی سەردەم

نووسینی

دکتۆر یعقوب حسین عبدالكريم الراوی

٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤
فەیس بووک: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی
هەولێر-بەرامبەر دەرگای قەڵا- بازاڕی ڕۆشەنبیری




ناوی کتێب: زانستی نوێ و کۆتـــایی بوونـەوەر
نووسەر: دکتۆر یعقوب حسین عبدالکریم الراوی
نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ: زەردەشـت کاوانی
بابەت: زانســـتی
چاپخانە: حاجـــی قـــادری کۆیـــی
چاپی: چاپی سێیەم/ ١٤٤٢ ـ ٢٠٢٠ .
تیراژ: ١٥٠٠
پێوانە : ( ١٧ x ٢٤ ) سم
لاپەڕە : ٦٧٥

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان / هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردن: (٥١٣) ساڵی (٢٠١٢) ی پێدراوە.

## دەروازە

پێش ئەوەی بچینە بەشی دووەمی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی، پێم باش بوو ئەم دوو تێبینیە بخەمە ڕوو بۆ ئێوەی بەڕێزو سەنگین:

* ئەو نیشانانەی کە لە بەشی یەکەم باسم کردووە زۆر زۆر بە کورتی بوون، وە زۆربەی نیشانەکانیشم تێیدا هەر باس نەکردووە.

* ئەو نیشانانەی کە لەم بەشەدا باسیان دەکەین زۆربەی هەرە زۆریان هاتوونەتە دی.

# هەژارەکان بە پارەی کەم ڕازی نابن

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر، هەژارەکان بە پارەی کەم ڕازی نابن، لە کاتێکدا پارە زۆر بەربڵاودەبێت لە نێو خەڵکیدا..

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (لَيَأْتِيَنَّ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَطُوفُ الرَّجُلُ فِيهِ بِالصَّدَقَةِ مِنَ الذَّهَبِ، ثُمَّ لَا يَجِدُ أَحَدًا يَأْخُذُهَا مِنْه..)(١).

واتە: سەردەمێك بەسەر خەڵکی دێت پارەو ماڵ ئەوەندە زۆر دەبێت تا دەگاتە ڕادەیەك پیاو سەد دیناری زێڕی دەدرێتێ و هێشتا بە کەمی تێدەگاو، دەوڵەمەندو ساماندار بە دوای هەژارێکدا دەگەڕێ خێری لێ وەرگرێ، بەڵام کەسی دەست ناکەوێ.

هەروەها پێشەوا عەوفی کوری مالیك (ﷺ) دەڵێت:

جارێکیان لە شەڕی تەبوك چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) کە لەژێر خێوەتێکی چەرمدا بوو، فەرموی: (اعْدُدْ سِتًّا بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ... ثُمَّ اسْتِفَاضَةُ الْمَالِ حَتَّى يُعْطَى الرَّجُلُ مِائَةَ دِينَارٍ فَيَظَلُّ سَاخِطًا)(٢).

واتە: شەش شتان بژمێرە لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی... پاشان ماڵ ئەوەندە زۆر دەبێت کەوا سەد دینار دەدەمیت بە یەکێك کەچی تورە دەبێت و بە کەمی دەزانێ.

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو ڕۆژگارەی ئێستا زۆر ڕاشکاوانە ئەو موعجیزەیەی پێغەمبەر(ﷺ) دەبینین و هەستی پێدەکەین.

---

(١) صحيح البخاري (٢/ ١٠٩) باب: الصدقة قبل الرد، برقم: (١٤١١).

(٢) صحيح البخاري (١١/ ٣٠٦) كتاب: الفتن، باب: ما يحذر من الغدر، برقم: (٣١٧٦).

## زۆربوونی ماڵ و پارەو بڵاوبوونەوەی هەژاری

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بوونەوەر زۆربوونی سەروەت و سامانە، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی لە هەژاریدا دەژین..

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَكْثُرَ فِيكُمُ الْمَالُ، فَيَفِيضَ حَتَّى يُهِمَّ رَبَّ الْمَالِ مَنْ يَقْبَلُهُ مِنْهُ صَدَقَةً، وَيُدْعَى إِلَيْهِ الرَّجُلُ فَيَقُولُ: لَا أَرَبَ لِي فِيهِ)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا ماڵتان زۆر دەبێ و هێندە زیاد دەکات تا خاوەنی ماڵ خەمبار دەبێ ئاخۆ کێ خێرێکی لێ قبوڵ دەکا، کاتێ دەیداتە پیاوێك دەڵێ: هیچ پێویستم پێ نیە.

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی کردووە بە سێ بەشەوە:

بەشی یەکەم: کە دەفەرموێ: (حَتَّى يَكْثُرَ فِيكُمُ الْمَالُ) دەڵێت: ئەمەیان ڕوویدا لە سەردەمی پێشەوا عوسمانی کوڕی عەفان (ڕەزای خوای لێ بێ)..

بەشی دووەم: کە دەفەرموێ: (حَتَّى يُهِمَّ رَبَّ الْمَالِ مَنْ يَقْبَلُهُ مِنْهُ صَدَقَةً) دەڵێت: ئەمەیان ڕوویدا لە سەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ).

بەشی سێیەم: کە دەفەرموێ: (وَيُدْعَى إِلَيْهِ الرَّجُلُ فَيَقُولُ: لَا أَرَبَ لِي فِيهِ) دەڵێت: ئەمەشیان ڕوودەدات لە سەردەمی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ).

ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) لە سەردەمی (عوسمانی کوڕی عەفان) هاتە دی، چونکە لەو سەردەم شارێکی گەلێك زۆر ئازاد کران وەکو شاری

---

(١) صحيح البخاري (١٣/ ٨١ ٨٢) كتاب: الفتن، برقم: (٦٦٨١).

فارس و ڕۆمەکان، کاتێك غەنیمەتیان دابەش دەکرد خەڵکێکی ئێجگار زۆر دەوڵەمەند بوون، وە لە خیلافەتی (عومەری کوڕی عبدالعزیز)یش خەڵکێکی زۆر دەوڵەمەند بوون هەتا وای لێ هات هەژار نەما، وە کەسیش خێری لە کەس وەرنەدەگرت لەبەر دەوڵەمەندی[١].

مێژوو نووسان دەڵێن: خیلافەتی (عومەری کوری عبدالعزیز) وای لێهات کە پارە ئەوەندە زۆر بوو کۆیلەیان دەکڕی و ئازادیان دەکرد[٢].

پێشەوا حاریثەی کوڕی وەهەب (ﷺ) دەڵێت:

لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو: (تَصَدَّقُوا فَيُوشِكُ الرَّجُلُ يَمْشِي بِصَدَقَتِهِ فَيَقُولُ الَّذِي يَأْتِيهِ بِهَا: لَوْ جِئْتَنَا بِالأَمْسِ قَبِلْتُهَا فَأَمَّا الآنَ فَلاَ حَاجَةَ لِي فِيهَا فَلاَ يَجِدُ مَنْ يَقْبَلُهَا)[٣].

واتە: خێر بکەن هێندەی نەماوە پیاو خێرەکەی بۆ یەکێك ببات و ئەویش پێی دەڵێ: ئەگەر دوێنێ بهاتبای وەرمدەگرت، بەڵام ئێستا پێویستم پێی نیە، ئیتر کەسی دەست ناکەوێ تا وەکو لێی وەریگرێ.

پێشەوا عەدی کوڕی حاتەم (ﷺ) دەڵێت:

ڕۆژێکیان لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بووم پیاوێك هاتە لای و باسی دەستکورتی خۆی بۆ کرد، پاشان یەکێکی تر هات باسی چەتەو ڕێگری لێ کرد، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەمووی:

(يَا عَدِيُّ هَلْ رَأَيْتَ الْحِيرَةَ قُلْتُ لَمْ أَرَهَا وَقَدْ أُنْبِئْتُ عَنْهَا قَالَ فَإِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ لَتَرَيَنَّ الظَّعِينَةَ تَرْتَحِلُ مِنَ الْحِيرَةِ حَتَّى تَطُوفَ بِالْكَعْبَةِ لاَ تَخَافُ أَحَدًا إِلاَّ اللَّهَ - قُلْتُ فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَ نَفْسِي فَأَيْنَ دُعَّارُ طَيِّئٍ الَّذِينَ قَدْ سَعَّرُوا الْبِلاَدَ وَلَئِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ

---

(١) فتح الباري (٦/ ٣١٣).

(٢) أشراط الساعة، ماهر أحمد الصوفي، لا ١١٨ .

(٣) صحيح مسلم (٢/ ٧٠٠) كتاب: الزكاة، باب: الترغيب في الصدقة قبل أن لا يوجد من يقبلها، برقم: (١٠١١).

لَتُفْتَحَنَّ كُنُوزُ كِسْرَى قُلْتُ كِسْرَى بْنِ هُرْمُزَ قَالَ كِسْرَى بْنِ هُرْمُزَ وَلَئِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ لَتَرَيَنَّ الرَّجُلَ يُخْرِجُ مِلْءَ كَفِّهِ مِنْ ذَهَبٍ، أَوْ فِضَّةٍ يَطْلُبُ مَنْ يَقْبَلُهُ مِنْهُ فَلاَ يَجِدُ أَحَدًا يَقْبَلُهُ مِنْهُ وَلَيَلْقَيَنَّ اللَّهَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ يَلْقَاهُ وَلَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تُرْجُمَانٌ يُتَرْجِمُ لَهُ فَيَقُولَنَّ أَلَمْ أَبْعَثْ إِلَيْكَ رَسُولاً فَيُبَلِّغَكَ فَيَقُولُ بَلَى فَيَقُولُ أَلَمْ أُعْطِكَ مَالاً وَأُفْضِلْ عَلَيْكَ فَيَقُولُ بَلَى فَيَنْظُرُ عَنْ يَمِينِهِ فَلاَ يَرَى إِلاَّ جَهَنَّمَ وَيَنْظُرُ عَنْ يَسَارِهِ فَلاَ يَرَى إِلاَّ جَهَنَّمَ قَالَ عَدِيٌّ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقَّةِ تَمْرَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ شِقَّةَ تَمْرَةٍ فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ قَالَ عَدِيٌّ فَرَأَيْتُ الظَّعِينَةَ تَرْتَحِلُ مِنَ الْحِيرَةِ حَتَّى تَطُوفَ بِالْكَعْبَةِ لاَ تَخَافُ إِلاَّ اللَّهَ وَكُنْتُ فِيمَنِ افْتَتَحَ كُنُوزَ كِسْرَى بْنِ هُرْمُزَ وَلَئِنْ طَالَتْ بِكُمْ حَيَاةٌ لَتَرَوُنَّ مَا قَالَ النَّبِيُّ أَبُو الْقَاسِمِ (ﷺ) يُخْرِجُ مِلْءَ كَفِّهِ)[1].

واتە: ئەی عەدی شاری حیرەت[2] دیوە؟ گوتم: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەمدیوە، بەڵام باسیان بۆ کردووم، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی: ئەگەر تەمەنت درێژ بێ، دەبینیت ئافرەتی نێو کەژاوە لە حیرەوە سەفەر دەکات تا دەگاتە کەعبە، بێجگە لە خوا لە کەسی تر ناترسێت، عەدی دەڵێت: لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەی ئەو کاتە بەدرەوشتانی خەڵکی (طەی) لە کوێن، ئینجا فەرموی: ئەگەر ژیان مەودات پێ بدات گەنجینەی کیسرا بە دەست دێنن، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کیسرای کوری هورمز، فەرمووی: بەڵێ... کیسرای کوڕی هورمز، ئەی عەدی ئەگەر تەمەنت درێژ بێت دەبینیت پیاو پڕ بە چەنگی زێڕ یان زیو دەردەهێنێ و داوا دەکات لە یەکێك کە لێی وەربگرێت، جا کەس لێی وەرناگرێت، وە هەر یەکێکیشتان لە ڕۆژی دواییدا خودا دەبینێت، هیچ وەرگێڕێکیش لە نێوان بەندەو خوادا نیە؟ ئینجا خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەی پێغەمبەرم بۆ نەناردی تا پەیامت پێ بگەینێت؟ دەڵێ: بەڵێ... دەفەرمووێ: ئەی ماڵ و بەهرەم پێ نەبەخشیت، دەڵێ: بەڵێ... جا تەماشای لای ڕاستی دەکات دۆزەخ دەبینێت، تەماشای لای چەپی دەکات هەر دۆزەخ دەبینێت، جا عەدی دەڵێت: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو: بە دەنکە خورمایەکیش

---

(١) صحيح البخاري ، كتاب الزكاة، باب الصدقة قبل الرد، رقم: (٣٥٩٥) .

(٢) شارێکە لە عێراق سێ میل لە کوفەوە دوورە.

بێت خۆتان لە ئاگر بپارێزن، جا ئەوەی ئەم دەنکە خورمایەشی نەبوو با بە وشەیەکی باش و شیرین خۆی بپارێزێت لە ئاگری دۆزەخ، عەدی(ﷺ) دەڵێت: جا کەژاوەکەم دیت لە حیرەوە دەهات تا دەگەیشتە کەعبەو تەوافی ماڵی خوای دەکرد، جگە لە خودا لە کەسی تر نەدەترسا، وە منیش یەکێ بووم لەوانەی کە گەنجینەی کیسرای کوری هورمزمان دەکردەوە، ئەگەر ئێوەش تەمەنتان درێژ بێت ئەوەش دەبینن کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی فەرمووە کە پیاو پڕ بە چەنگی زێڕو زیو دەردێنێت.

لە کوردستان دەوڵەمەندی وامان هەیە ئەگەر تەنها زەکاتەکانیان بدەن، هەژارو نەدار نامێنێ، وادەزانن لەگەڵ خۆیان دەیبەنە ناو گۆڕو حەشر و حیساب، بۆ کوێی دەبەی بەڕێزەکەم ڕۆژی دوایی هێندەی نەماوە.

ئەمرۆ بە ئاسانی تێبینی دەکرێت کە هەژاری و بێ دەرامەتی زۆر زۆر بە زەحمەت بووە بە پێی فەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، بێگومان ئەمەش پێش هاتنی ڕۆژی دوایی بەرپا دەبێ.

ئەمرۆ لە ئاسیاو ئەمریکای باشوورو ئەفەریقیاو نێجیریاو ڕۆژهەلاتی ئەوروپا، خەڵکانێك هەن لەو پەڕی هەژاری و بێ دەرامەتی دان، بە گوێرەی ئەم لێکۆڵینەوانەی ئەنجام دراون دەرکەوتووە کە چارەکی خەڵکی سەر زەوی واتە: یەك ملیارو نیو خەڵکی لە هەژاریەکی زۆر خراپدان بە شێوەیەك کە زۆر ئەستەمە مرۆڤ بێنێتە پێش چاوی خۆی، بە گوێرەی ئامارەکانی ساڵی (٢٠٠٥) (٨٢٦) ملیۆن کەس لەبەر بەد خۆراکی دەناڵێنن، یان بە واتایەکی تر بڵێین: لە هەر کاتژمێرێکدا (٦) کەس گیان لە دەست دەدەن.

لەوانەیە خەڵکانێك بپرسن بۆچی ئەوەندە خەڵکی هەژارو بێ دەرامەتن ئایا لە کەمی سەرچاوەوەیە ؟

لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر لە کەمی سەرچاوەوە نیە، بەڵکو دابەشکردنی داهاتوو و سامان دابەشکردنێکی دادپەروەرانە نیە، ئەمەش وای کردووە کەسانێك دەوڵەمەندو تێرو پڕ بن و کەسانێکیش هەژار بن و لە برسان بمرن.

ملیۆنەها خەڵکی بە دەست هەژاری و کولە مەرگیەوە دەناڵێنێت، گەورەکان تەرازووی بازرگانیان بە هەموو چەشنەکانیانەوە لە بەرزبوونەوە دایە.

لە ئامارەکانی ئەم سەردەمە دەرکەوتووە: کە نزیکەی (٢٨) ملیۆن خەڵکی لە برسان خەریکە بمرن، ئەمەش وای کردووە کە نادادپەروەری لە سەدەی بیستەم گەیشتۆتە چلەپۆپە لەچاو سەدەکانی پێشتر، وە هۆکاری سەرەکی ئەو دیمەنە مەرگ ئامێزەش دوورکەوتنەوەی مرۆڤە لە هەست و سۆزی مرۆڤانەی خۆی، هەروەها دوورکەوتنەوەیەتی لە ئایینی خودای گەورەو میهرەبان.

بۆ نمونە: ئەندەنوسیا لەم دواییەدا بڵاوی کردەوە کە (٩٥,٨) ملیۆن لە دانیشتوانی ئەندەنوسیا ڕوویان لە هەژاری کردووە کە دەکاتە ڕێژەی (٤٨٪)ی دانیشتوان.

(سۆجیتۆ سۆنید) بەڕێوەبەری گشتی ناوخۆی ئەندەنوسیا لەگەڵ ڕۆژنامەنوساندا ڕایگەیاند کە (٨٠) ملیۆن کەس لە خەڵکی وڵاتەکەمان بە هەژاری دەژین، وە بەردەوام ئەم ڕێژەیە ڕوو لە زیاد بوون دەکات.

ڕۆژئاواییەکان و گەلانی سەر زەمین وڵاتانی جیهانیان کردوون بە سێ بەشەوە، واتە: کردویانن بە سێ جیهان:

جیهانی یەکەم: بریتیە لە حەوت دەوڵەت .

جیهانی دووەم: بریتیە لە (٧٧) دەوڵەت .

جیهانی سێیەمیش: بریتیە لە دەوڵەتانی تر[١].

جا ئێمەیان خستوەتە کۆتاییەوە، ئەگەر جیهانیان بکردایە بە (١٠٠) بەشەوە ئێمە سەدەهەمین بەش دەبووین، ئەو وڵاتانە لەسەر بنەمای ئابووری دابەش کراون... بەم ڕێژەیە دۆلار ساڵانە کەمتر بەر خەڵکی بکەوێت، ئەوە دەچیتە فلان پۆلەوە، وە ئەگەر لەم ڕێژە کەمتری هەبوو دەچێتە فیسار پۆلەوە.. واتە: هێڵێك هەیە کە پێی دەگوترێت هێڵی هەژاری (poverty line).

---

(١) http://article-2011.blogspot.com/2012/11/blog-post_5992.html

بەرگی دووەم

لەگەڵ پێشكەوتنی تەكنەلۆجیا بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی (٥) بەش لە دانیشتوانی جیهانی سێهەم ڕۆژانە بە دەست برسێتیەوە دەناڵێنن و (١/٤)ی ئەو ناوچانە ئاوی خواردنەوەیان پێ ناگات، سێ بەشیان لە ژێر مەرجی (بێ ئومێدی) ژیان بەسەر دەبەن ئەمە جگە لەوەی ساڵانە (٢٥) ملیۆن كەس بە برسیەتی و بەد خۆراكی لە جیهاندا دەمرن.

لە ساڵی (١٨٧٧) لە وڵاتی چین (١٠) ملیۆن كەس بە هۆی برسیەتی لەناو چوون.

لە ساڵی (١٩١٩) لە وڵاتی ڕووسیا (٥) ملیۆن كەس بە هۆی برسیەتیەوە لە ناوچوون.

ماڵپەڕی CNN / بەپێی ڕاپۆرتێك كە لە هیندستان بڵاوكراوەتەوە ئەوە بەدەركەوتووە كە خێزانێك لە سێ خێزانی هیندستان لە ژێر هێڵی هەژاری ژیان بەسەر دەبەن.

لە دوای لێپرسینەوەی توانای ماددی و ئاستی دەسكەوتی هاوڵاتیانی شارو ناوچە جۆر بە جۆرەكانی ئەوڕوپا، لە ئەنجامی ئەو لێكۆڵینەوەیەی كە (دامەزراوەی نیشتمانی بۆ خوێندنە ئابورییەكان) لە فەرەنسا پێی هەستا ڕوون بویەوە كە(١٢٪)ی هاوڵاتیانی ئەوروپا لە ژێر باری هەژاریەوە دەژین، منداڵانی تا تەمەن (١٦) ساڵ ڕێژەی (١٣,٩٪) ی ژمارەی ئەو هەژارانە پێك دەهێنن.. هەر لە هەمان ڕوونكردنەوەی لێكۆڵینەوەكەدا هاتووە كە ڕێژەی مناڵە هەژارەكان لە زیادبووندایە.

ئەو كەسانەی لە دانیمارك لە ژێر باری هەژاریدا دەژین گەیشتووەتە (٤,٧٪) ئەمەش كەمترین ڕێژەیە لە نێوان دەوڵەتانی ئەوڕوپاداو لە كاتێكدا ئەم ڕێژەیە لە ئیتاڵیا دەگاتە (١٩,٣٩٪)[1].

---

(١) http://article-2011.blogspot.com/2012/11/blog-post_5992.html

لە یۆنان گەیشتووەتە (٧,٧٪) و لە پورتوگال (١٢,٩).. بە شێوەیەکی گشتی وڵاتانی باشوری ئەوروپا زیاتر گرفتاری هەژاری بوون و کاری تێکردوون هەتا وەکو وڵاتانی ئەوروپا.

مالّپەڕی بی بی سی:

بە گوێرەی ڕاپۆرتێکی ساڵانەی دەزگایەکی ئەمریکی دەڵێت: ئێستا لەو وڵاتە ٣٧ ملیۆن هاوڵاتی لە ژێر هێڵی هەژاری ژیان بەسەر دەبەن، ٤٦ ملیۆن هاوڵاتیش بێبەشن لە خزمەت گوزارییە تەندروستییەکان.. ئەمە لە کاتێکدا لە ساڵی ٢٠٠٦ دا (٣٦,٥) ملیۆن هاوڵاتی بوونەو لە ساڵی ٢٠٠٧ یش ژمارەیان گەیشتۆتە ٣٧,٣ ملیۆن کەس.

وە (١٨٪) ی مناڵانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ژێر هێڵی هەژاری دان و لەسەرجەم ویلایەتە یەکگرتووەکانیش ڕێژەی هەژاری ئاستێکی هەیە.

لەم سەردەمەدا هەژاری ترسناکترین خاڵە کە ڕووبەڕووی بونەوەر بوەتەوە بە تایبەتی لە وڵاتانی ئەفەریقیا و ئاسیا و ئەمریکای باشوور و ئەوروپای ڕۆژهەڵات، ڕاپۆرتەکان ئیشارەت بەوە دەدەن کە لە هەر چوار کەسێك لە جیهان کەسێك لە ژێر هێڵی هەژاریدایە، بۆیە لەم سەردەمەدا یەك ملیار کەس ژیان بەسەر دەبەن ڕۆژانە کەمتر لە دۆلارێك، وە سێ ملیار کەسیش ڕۆژانە ٢ دۆلاریان بۆ دەمێنێتەوە[١].

---

(١) http://article-2011.blogspot.com/2012/11/blog-post_5992.html

## بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام بە هەموو جیهان

لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی گەیشتنی ئایینی ئیسلامە بە هەموو جیهان، هەروەکو پێغەمبەر(ﷺ) لە چەندین فەرمایشتدا ئاماژەی فەرمووە، وە خوای گەورە هەواڵی ئەوەمان پێ دەدات کە لە کۆتاییدا سەرکەوتن بۆ ئایینی ئیسلام دەبێت، لە کاتێکدا موسڵمانان لە شاری مەککەی پیرۆز لاوازو بێ هێز بوون.

پێشەوا خەبابی کوڕی ئەرەت (ﷺ) دەڵێت:

ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) لە ژێر سێبەری کەعبە پاڵی دابوویەوەو عەبایەکی بەخۆیدا دابوو، ئێمەش سکاڵامان لەلای کردو گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای سەرکەوتنمان بۆ ناکەیو بۆمان لە خودا ناپاڕێیەوە؟

پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (كَانَ الرَّجُلُ فِيمَنْ قَبْلَكُمْ يُحْفَرُ لَهُ فِي الأَرْضِ فَيُجْعَلُ فِيهِ فَيُجَاءُ بِالْمِنْشَارِ فَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ فَيُشَقُّ بِاثْنَتَيْنِ وَمَا يَصُدُّهُ ذَلِكَ عَنْ دِينِهِ وَيُمْشَطُ بِأَمْشَاطِ الْحَدِيدِ مَا دُونَ لَحْمِهِ مِنْ عَظْمٍ، أَوْ عَصَبٍ وَمَا يَصُدُّهُ ذَلِكَ عَنْ دِينِهِ وَاللَّهِ لَيُتِمَّنَّ هَذَا الأَمْرَ حَتَّى يَسِيرَ الرَّاكِبُ مِنْ صَنْعَاءَ إِلَى حَضْرَمَوْتَ لاَ يَخَافُ إِلاَّ اللَّهَ، أَوِ الذِّئْبَ عَلَى غَنَمِهِ وَلَكِنَّكُمْ تَسْتَعْجِلُونَ)[1].

واتە: پیاوانی پێش ئێوە قۆرتێکیان لە زەوی بۆ هەڵدەکەندو دەیانخستە ناوی، جا مشارێکیان دەهێناو لەسەر سەریان دادەناو دەیانکرد بە دوو لەت هێشتا لە ئاینەکەی پاشگەز نەدەبویەوە، بە شانەی ئاسنین دادەهێنرا تا هەموو گۆشت و دەماری لە ئێسکیدا جوودا دەبویەوە، ئینجا لە ئایینەکەی پاشگەز نەدەبویەوە، سوێند بە خودا خودای گەورە ئەم ئایینە سەر دەخات هەتا سوار چاك لە شاری (صەنعاء)وە دێتە (حەضرەمەوت) لە کەس ناترسێ تەنها لە خودا نەبێ، وە گورگیش بەسەر مەڕەکانیەوە دەبێت، بەڵام ئێوە پەلە دەکەن لە هاتنەکەی.

---

(١) صحيح البخاري (٤/ ٢٠١) علامات النبوة، برقم: (٣٦١٢).

بەڵێ.. هەتا ئێستاش بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام بەردەوامە، ڕۆژانە چەندین کەسایەتی گەورە دێنە ناو ئایینی ئیسلام، وە فەرمودەکەی پێغەمبەریش(ﷺ) هاتۆتە دی لەم سەردەمە، چونکە دەسەڵاتی ئیسلام پەرەی سەند لە خۆرهەڵاتەوە هەتا خۆر ئاوا.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (لَيَبْلُغَنَّ هَذَا الْأَمْرُ مَا بَلَغَ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ، وَلَا يَتْرُكُ اللهُ بَيْتَ مَدَرٍ وَلَا وَبَرٍ إِلَّا أَدْخَلَهُ اللهُ هَذَا الدِّينَ، بِعِزِّ عَزِيزٍ أَوْ بِذُلِّ ذَلِيلٍ، عِزًّا يُعِزُّ اللهُ بِهِ الْإِسْلَامَ، وَذُلًّا يُذِلُّ اللهُ بِهِ الْكُفْرَ)[١].

واتە: هەر شوێنێك شەو و ڕۆژی بگاتێ، ئایینی ئیسلامی دەگاتێ، خوای گەورە هیچ ماڵێکی دروست کراو لە بەرد یان لە موو نامێنێت ئەم دینەی هەر دەگاتێ، بەسەر بەرزکردنی سەربەرزێك یان بە ملکەچ پێ کردنی مل کەچێك، سەربەرزیەك کە خودای گەورە ئەم ئیسلامەی پێ سەر بەرز دەکات، وە زەلیلیەك کە خودای گەورە کوفری پێ زەلیل و مل کەچ دەکات.

خوای گەورە فەرموویەتی: [يُرِيدُونَ أَن يُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٣٢﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾].

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: [يُرِيدُونَ أَن يُطْفِـُٔوا۟]. دەیانەوێ نووری خوا بکوژێننەوە ئێستاو لە داهاتوودا.

[يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟]. بەدوای هۆکاردا دەگەڕێن کە نووری خوای پێ بکوژێننەوە، ئینجا [يُطْفِـُٔوا۟] کە مانای کوژانەوەی ئاگرە کەم بێت یان زۆر بەکاردەهێنێت لە جیاتی [يُخمِدوا] کە مانای کوژانەوەی ئاگری زۆرە.

---

(١) صحيح: أخرجه الإمام أحمد (٦/ ١٣٧٧) برقم: (١٧٢٣١). وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، والحاكم في (المستدرك) (٢/ ٩٦١) كتاب: الفتن، باب: ستفترق أمتي، برقم: (٨٣٢٦) وقال: هذا حديث صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه.

واتە: کافران بەردەوام لە هەوڵدان بۆ کوژاندنەوەی نووری ئیسلامەتی کەم بێت یان زۆر کە ئەمەش موعجیزەیەو خوا نەبێت کێ دەزانێت دوژمنایەتیەکە بەردەوام دەبێت و هەموو هۆکارێکیش بەکار دێنن.

گڕی مۆمێك بە فوویەك دەکوژێتەوە، بەڵام ئاگرێکی گەورە بە فوو ناکوژێتەوە، بەڵکو زیاتر کڵپە دەسێنێ.. وە هەندێ شتیش کە مرۆڤ دای هێناوە فوو کاری تێناکە، کەسێ بیەوێ ڕووناکی گلۆپێك نەهێڵێ دەبێ لە سویچی تایبەتیەوە بیکوژێنێتەوە، ئەگەر وانەکات ڕەنج بە خەسارەو هەتا تەمەنی هەیە فووی لێ بکات هیچ بە هیچ ناکا.

ئەگەر گلۆپێك کە دەستکردی مرۆڤە بە فوو نەکوژێتەوە، دیارە نووری بەرنامەی خودا بە قاڵەی دەم و بە فووی فوو کەران و بە هەوڵی کافران هیچی لێ نایەت.

شاعیری مەحوی دەڵێت:

( وصلی الله علی) ئەو حەزرەتەی صاحێب کەمالاتە
کە ئەعلا موعجیزەی قوربانی بم من نوری قورئـــانە
لە تاریکایی شەوی کوفرا بە یەك دەم لەمعـەیەکی دا
هەزار و سیسەدو بیست و دووە دنیا چـــراخـــــانە
چـــرایەك نووری بێچوونی مومیدی بێت دەبێ وابێ
چرایەك دەستی قودرەت خۆشی کا بۆ تا ئەبەدمانە[1].

ئەگەر خودا ئەم ئایینەی نەپاراستبایە ئەوا هەر زوو ڕۆژی هیجرەت تەواو دەبوو، یان لە شەڕی خەندەق هەرەسی دەهێنا، یان بە وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) خامۆش دەبوو یان بە فیتنەی ناو موسڵمانان لەناو دەچوو، یان بە هێرشی خاچ پەرستان و مەغۆل و تەتەرەکان کە سەدان ساڵیان خایاند ڕیشە کێش و بن بڕ دەبوو.

---

(١) دیوانی مەحوی، مامۆستا عبدالکریم مدرس، لا ٤٢٠.

عەبدلوەدود شەلەبی (ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ) دەڵێت: وتەی مامۆستایەکی گەورەتان دەخەمە پێش چاو کە ئەویش (ت.ب.یرفنج)ە، کە مامۆستایە لە زانکۆی (تنسی) ئەمریکی، لە وتارێکدا بۆ کۆبونەوەیەکی موسڵمانان لە شاری (جلاسجۆ) لە بەریتانیا پێش چەند ساڵێك گوتی: ئەی موسڵمانان ئەمڕۆ ئێوە ناتوانن پێشبڕکێی دەوڵەتە گەورەکان بکەن لە ڕووی زانستی و ئابوری و سەربازیەوە، بەڵام دەتوانن ئەو دەوڵەتە گەورانە لەسەر ئەژنۆ بۆ لای خۆتان بهێنن، ئەوەش تەنها بە ئاینی ئیسلام دەبێت، ئێوە پێویستە زۆر وریا ببنەوە لەو بیّ ئاگاییەی کە تێیکەوتوون، ئیسلام گەورەترین ڕووناکیە بیانناسنەوەو بە دونیای بگەینن، دەروونی هەموو خەڵکی لە دونیادا تێنوی ئیسلامە بەڵام نایناسنەوە!؟ ئەو کاتە هەموو دونیا بە ڕووتان دەکرێتەوەو هەموو دەسەڵاتەکانیش لەبەردەم گەورەیی ئیسلام ملکەچ دەبن، (چل) گەنج لەوانەی ئەم ئاینەیان بە چاکی حاڵیەو لە دەرخستن و کرداری خۆیاندا ڕەنگ بداتەوە، (چل) گەنج لەوانە بدەنە دەستی من بەمەرجێك شێوازو زمان و مامەڵەی سەردەم بزانن و تێکەڵی خەڵکی ببن، ئەوە من هەردوو ئەمریکا پڕ دەکەم لە بانگەوازی ئیمان و ئیسلام.. دەبیّ نوری ئیسلام بەسەر چوار قوڕنەی دونیادا پەخش ببێت ئەمڕۆ بێت یان بەیانی، ناحەزانیش ئەمە باش دەزانن، بۆیە دەیانەویّ ئاستەنگ و بەربەست بهێننە ڕیّ بۆ نموونە: سەرۆکی ڕووسیا (پۆتین) بە وڵاتانی ئەوروپاو (ئەرثوذکس) دەڵیّ: ئوسوڵیەتی ئیسلامی تاکە مەترسیە کە هەڕەشە لە بونەوەر دەکات و جیهان دەخاتە مەترسیەوە، ئەوان دەیانەویّ حوکمی ئیسلامی بگێڕنەوەو یەك دەوڵەتی گەورە دروست بکەن لە (فلیپین)ەوە بۆ (کۆسۆڤۆ)، ئەگەر جیهان ڕووبەڕوویان نەبێتەوە دەگەنە ئامانج، ڕووسیاش پێویستی بە یارمەتی ماددیە تا ئسوڵیەت نەهێڵیّ لە باکووری قۆقازدا[1].

سەرۆکی پێشووی ئەمریکی (ڕیتشارد نیکسۆن) دەڵێت: تەییاری سێیەم نمونەیەکی ترسناکە ـمەبەستی ئیسلامەـ ئەو ئسوڵیانە لە ڕابردووەوە (انطلاق) دەکەن، بەڵام لە رابردوودا ناژین، چونکە ئەوانە چاویان لەسەر داهاتووە ئەوانە

---

(١) الإسلام المعجزة المتجددة، لا ١٦٣.

(محافظ) نین ئەوانە شۆڕشگێڕن، ئیسلامیەکیان دەویٚ کە دین دەوڵەتەو دەیانەویٚ شەریعەتی ئیسلامی جێبەجیٚ بکەن، دەیانەویٚ شارستانیەتی ئیسلامی سەر لە نویٚ زیندوو بکەنەوە.

(ریتشارد نیکسۆن) دوای ئەم قسانە داوا لە (حلف الأطلسي) دەکات کە ڕووبەڕووی ئەم تەییارە ببێتەوەو ئاستەنگ بهێنێتە ڕێی و نەیەڵیٚ سەر زیاد بکات.

وەزیری دیفاعی ئەمریکی (ڕامسفێلد) دەڵیٚ: ناتوانم بەرگەی ئەوە بگرم عێراقێکی ئوسوڵی ئیسلامی ببینم[1].

ولفرد کانتول سمیث دەڵیٚ: تا (کارل مارکس) و (شیوعیەت) پەیدابوو، موحەممەد (ﷺ) تاقە تەحەددای ڕاستەقینە بوو، کە ڕووبەڕووی شارستانیەتی ڕۆژئاوا ببێتەوە لە هەموو مێژوو، بەڕاستی زۆر گرنگە کە یادمان بیٚ ئەو تەحەددایە چەندە ڕاستەقینە بوو، وە چەندە هەڕەشەیەکی ترسناك بوو لە هەندیٚ کاتدا[2].

ڕۆشنبیری ڕۆژئاوایی (تۆماس کارلیل) دەڵێت: موسڵمانان کە تا دوێنیٚ شوان بوون، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایان بە ناوی ئایینی تازەوە دەست بەسەر داگرت و لە ماوەی سەدەیەك توانیان زلهێزەکان لەناو بەرن و ببنە خاوەنی موڵك و ماڵیان کە ئەمەش موعجیزەیە، ئەگەر ئەوە بە ڕاستی نەهاتە دی دەمگوت: خەیاڵە، هاوارو بانگەکەی موحەممەد (ﷺ) وەك پریشکێکی ئاگر بوو نەکەوتە سەر شاخێکی لم، بەڵکو کەوتە سەر شاخێکی باروت، کە هەمووی بە یەکجار تەقیەوەو نوورەکەی لە شاخەکانی هیندەوە گەیشتە دەشتەکانی ئەندەنوس، بەڕاستی عەرەب زەلیلترین گەل بوون، بەڵام بوونە گەورەی دونیا، بیٚ نرخترین کەس بوون، بوونە چاکترین کەس لە ڕەوشت و زانین و تێگەیشتن، لە هەموو

---

(١) الإسلام المعجزة المتجددة، لا ١٢.

(٢) ولفرد کانتول سمیث ئەم قسەیە لە کاتێکدا دەکات کە هێشتا شیوعیەت وەك ئەمڕۆ نەڕووخابوو، لەو پەڕی هێزو تواناادا بوو، لەگەڵ ئەو هەموو تەنگ پێهەڵچینە بە موسڵمانان و بانگەوازان لەگەڵ ئەو ملیار دۆلارەی خەرج دەکریٚ کەچی لە جیاتی ئەوەی ئیسلام بەرەو دوا بچیٚ، بەرەو پێش دەچیٚ و ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر گەشە دەکات و پەرە دەسێنیٚ.

کەس پەرتەوازەتربوون، بوونە ئیمپراتۆریەك كە لە مێژوودا نمونەو هاوشێوەیان نیە، ئەمانەش هەمووی بە هۆی ئەو ئایینەوە بوو كە پابەندی بوون.

قەشەی گەورەی شاری (بولونیا)ی ئیتاڵی (جیاکوموبیفی) كە تەمەنی (٧٣) ساڵە بە ئەوروپیەکان دەڵێت: بەڕاستی ئیسلام سەردەکەوێ بەسەر ئەوروپا، ئەگەر ئەوروپا بە چاکی نەبێتەوە بە گاور[١].

(کاردینال کوڕماڵ میرفی) پێشەوای کۆمەڵی ڕۆمی کاثولیك لە ئینگلتەرا دەڵێت: لە بەریتانیا مەسیحیەت لە پاشەکشەدایەو ئیسلام لەو پەڕی بەرەو پێش چوون دایە.

لە ساڵی (١٩٩٥) ئەمیر (چارلز) لە بەردەم (٧٠٠) کەسایەتی بەریتانی و (٢٠٠) ڕۆژنامەنووسی ئەوروپی و جیهانی لە هۆڵی پەیمانگای مەلەکی گوتی: حەزدەکەم هەموو دەزگا ئەکادیمیەکانی بەریتانیا هاوکاری بکەن بۆ دروستکردنی پردی لە یەك گەیشتن لە نێوان ڕۆژ ئاواو ئیسلام.

(شبلنجر) دەڵێت: شارستانیەتێکی نوێ خەریکە هەڵدێت لە جوانترین شێوەدا کە ئەویش شارستانیەتی ئیسلامە کە گەورەترین توانای جیهانی ڕۆحی پاکی هەیە[٢].

نوسەری بەناوبانگ (لیونارد) دەڵێت: بەڕاستی ئیسلام فەزڵی هەیە بەسەر ئەوروپاوە کە پێویستە دانی پێدا بنێین، لە داهاتوویەکی نزیك ئەوروپاو قاڕەی مەسیحیەتیش دان دەنێن بەوە کە ئیسلام و موسڵمانان فەزڵیان هەیە بەسەریانەوە.

لێکۆلەری بیانی (نسکس) دەڵێت: بەڕاستی موسڵمانان ڕۆژانە زیاد دەکەن کە ئەمەش بەڵگەی زیندوویەتی و پایە بەرزی ئیسلامە.

بیریاری فەرەنسی (دیباسکسە) دەڵێت: بەڕاستی ڕۆژئاوا ئیسلامی نەناسیوەو هەر لە سەرەتاوە ڕۆژئاوا چۆتە بەرەی دژایەتیەوەو کۆڵی نەداوە

---

(١) الإسلام المعجزة المتجددة، لا ٤٧٩ .

(٢) سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٨٠.

لە بوختان کردن بۆی، ئەمەش بۆ ئەوەی بیانووی بە دەستەوە بێت بجەنگێ لەگەڵیدا، ئەمەش وای کردووە لە عەقڵیەتی ڕۆژئاوا بیرو بۆ چوونی ناڕاست بچەسپێ، بێگومان تەنها یەکخواناسیەکەی ئیسلامە کە جیهانی سەردەم ڕزگار بکات لەسەر گەردانیەکانی ژیاری ماددی سەردەم کە ئەگەر بەردەوام ببێت مرۆڤایەتی لەناو دەبات[1].

(بردنادشۆ) لە بەریتانیاوە بە هەموو جیهان دەڵێ:

ڕۆژێك دێت کە ڕۆژئاوا ئیسلام وەردەگرێت، بەڕاستی چەند سەدەیەکی ڕابردوو ڕۆژئاوا تەنها ئەو شتانەی دەخوێندەوە کە دژ بە ئیسلام و پێغەمبەرەکەی بوو، بەڵام ئەمڕۆ قورئان وەرگێردراوەو پەڕاوی ئیسلامی نووسراوە بە زمانەکانی ئەوروپاو پیاوانی رۆژئاوا، تێگەیشتن کە ئیسلامی راستەقینە ئەوە نەبووە کە لە پەڕاو و ڕۆژنامەکانی پێشوودا دەیانخوێندەوە[2].

مێژوو نووسی بەریتانی (توینبی) دەڵێت:

موسڵمانان ئێستا وەك ئەهلی کەهف خەوتوون، بەڵام خەوتوو بەخەبەر دێ ئەگەر هۆکارێك ببێت بۆ خەبەرکردنەوەی، وە فشاری زۆری ڕۆژئاوا بۆ سەر گەلانی چەوساوەی موسڵمان هۆکارێکە بۆ بەئاگا هاتنی ئیسلام و سەرکردایەتی کردنی گەلانی چەوساوە بەرەو ئازادی.

رۆژهەڵاتناس (جب) لە پەڕاوەکەی (وجهة الإسلام) دەڵێ:

ترسناکترین شت لەم ئاینەدا ئەوەیە کە لە پڕ زیندوو دەبێتەوەو دەبووژێتەوەو هەڵدەستێتەوە، بەبێ ئەوەی بزانی هۆکارەکەی چیە، وە بەبێ ئەوەی بزانێ لە کوێوە سەر هەڵدەدات.

ئیسلام لەو ئایینانەیە کە بە خێرایی بڵاودەبێتەوە، بە تایبەتی لەناو ڕەش پێستەکانداو بە رەنگاری ئاشکرا دەکرێت لەلایان سپی پێستەکانەوە، یەکەم سەرۆك

---

(١) الإسلام المعجزة المتجددة، لا ٤٨٠.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٨٢.

کۆماری ئەمریکی (جۆرج واشنطون) هاوڵاتیانی ئەمریکی ئاگادار کردبوو، کە ڕێگا نادەن ئیسلام جێ پێی خۆی بکاتەوە لە ئەمریکا، بە تایبەتی لەناو ڕەش پێستەکان، تا وەکو نەبن بە هێزێك و ڕای خۆیان بسەپێنن بەسەر ئەوانی تر، دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ئەمریکا کە لە ژێر کۆنترۆڵی زایۆنیدان هەموو ڕێگەیەکیان گرتۆتە بەر بۆ تێکدان و ناشیرنکردنی ڕووی ئیسلام و موسڵمانان، ژمارەی موسڵمانەکان لە ئەمریکا (١٠/٤) ملیۆن دەبن، هەر چەندە لێکۆڵینەوە لەو بوارەدا دەڵێت: بە هۆی گۆڕانکاری لە هەڵوێستی لێپرسراوان و دەزگاکانی دژ بە ئیسلام و موسڵمانان لە ژێر کاری جوولەکەدا پاڵ بە هاوڵاتیانەوە دەنێت، کە ئاینەکەی خۆیان ئاشکرا نەکەن لە ترسی چەوسانەوە.

شێخ (ئەحمەد دیدات) دەڵێت:

ئیسلام سەردەکەوێت تۆی لەگەڵ بێت و تۆی لەگەڵ نەبێت، بەڵام ئەگەر لەگەڵی نەبیت تۆ زەرەر دەکەیت.

ئامارە نێو دەوڵەتیەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ڕێژەی زیادبوونی ئیسلام لە ساڵی (١٩٨٩ تا ٢٠١٢) بەم جۆرە بووە:

١- ئەمریکا ٢٥٪

٢- ئەوروپا ١٤٣, ٣٥٪

٣- ئوسترالیا ٢٥٧,٠١ ٪

ئایینی ئیسلام لە هەموو ئاینەکانی تر خێراتر بڵاودەبێتەوەو تاکە ئایینە کە شوێنکەوتووانی بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر پابەندن بە ئاینەکەیانەوە، چاوەڕوان دەکرێت بۆ ساڵی (٢٠٣٠) ژمارەی موسڵمانان لە جیهاندا زیاتر بێت لە (٢) ملیارو (٢٠٠) ملیۆن کەس، کە کۆی گشتی خەڵکی سەر زەوی دەبن بە (٨,٣) ملیار[١].

---

(١) www.pewforum.org

# زۆربوونی فیتنەو ئاشوب

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی سەرهەڵدانی فیتنەو ئاشوبە..

پێغەمبەر (ﷺ) پێی ڕاگەیاندووین کە تاقیکردنەوەی گەورە بەرێوەیە موسڵمانان تیایدا هەقیان لێ تێك دەچێت، هەر کاتێکیش تاقیکردنەوەیەکیش سەرهەڵبدات باوەڕدار دەڵێت: ئەم جار تیا دەچم، ئینجا ڕزگاریشی دەبێت و یەکێکی تر سەر هەڵدەدات.. مرۆڤی چاك بریتیە لەو موسڵمانە ڕاستاڵەی کە جێگیرە لەسەر ئەو ئایینەی خودای گەورە دایبەزاندووە، وە ئومەتی چاکیش هەر ئەم ئومەتەیە کە ئەم دینە پاکە بکاتە بەرنامەو لەسەریشی ڕاستاڵ بێ، ئینجا تاکی موسڵمانان و تێکرای ئومەتی ئیسلامیش توشی گەلێك جۆرە تاقیکردنەوە دێن، ڕەنگە هەر لە نێو ڕیزەکانیدا بە هۆی ئارەزوو ناکۆکی و دووبەرەکی سەر هەڵبدا، یان لە دوژمنێکی ڕق و کینە لە دڵدا ڕەنگ بداتەوە کە هێرشیان بۆ بینێ و زەبونیان بکات .

بەڵێ.. پێغەمبەر(ﷺ) ئومەتەکەی ڕێنمایی کردووە لەو جۆرە فیتنانە کە چۆن ڕەفتار بکات لەگەڵ ئەو فیتنەو ئاشوبانە کە لە نێوان موسڵمانان بەرپا دەبێت، هەق بزر دەبێ و کاروباریان دەپەشۆکێ، جا پێغەمبەر(ﷺ) داوا دەکا کە موسڵمانان دوورە پەرێز بن لەو جۆرە ململانێ و جەنگانەدا، وە لە شوێنێکی دوور کەنار بگرن با لە لوتەکەی چیایدا شوانی بکەن، یا لەسەر سنوری وڵاتی موسڵماناندا دژی دوژمنان جیهاد بکەن، خۆ ئەگەر فیتنەو شەڕی نێوان موسڵمانانی گەیشتێ فەرمانی پێدراوە دەست نەکاتەوەو داکۆکی لە خۆی نەکات ئەگەر چی سەریشی تیا بچێت.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (أَظَلَّتْكُمَ الْفِتَنُ كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ، أَنْجَى النَّاس فِيهَا صَاحِبُ شَاهِقَةٍ، يَأْكُلُ مِنْ رِسْلِ غَنَمِهِ، أَوْ رَجُلٌ مِنْ وَرَاءِ الدَّرْبِ آخِذٌ بِعَنَانِ فَرَسِهِ، يَأْكُلُ مِنْ فِيءِ سَيْفِهِ)[1].

---

(١) صحيح: المستدرك في الصحيحين (٢/ ١٠٢) كتاب: الجهاد، برقم: (٢٤٦٠). وقال الحاكم: هَذَا

واتە: فیتنەکان وەك پارچە شەوی تاریك ڕەشمالی کردووە بە سەرتان، وە ڕزگارترین کەسیش لەو فیتنانە کەسێکە کە لەو کاتانەدا لە بەرزایی چیاکان سەرقاڵی مەڕو ماڵاتەکەی بێت و لە بەروبومەکەی بخوات، یان کەسێکە لغاوی ئەسپەکەی بە دەستەوە گرتووەو لە پێناوی خوادا جیهاد دەکات و لە دەست کەوتی ڕمەکەی دەستی خۆی دەخوات کە جیهادی پێ دەکات.

هەندێك کەس هەن فیتنە کاریان تێناکات، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵیدا بە پێشەوا موحەممەدی کوڕی مەسەلەمە (ﷺ) کە فیتنە کاری تێناکات، پێشەوا حوذەیفەی یەممانی(ﷺ) دەڵێت: هەر کەسێك بگاتە سەردەمی فیتنە من دەترسم لێی کە تێوە بگلێ و کاری تێ بکات، تەنها مەحەممەدی کوڕی مەسلەمە (ﷺ) نەبێت کە گوێم لێ بوو پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: تۆ فیتنە کارت تێ ناکات و زیانت پێ ناگەیەنێت، هەرواش دەرچوو کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی.. بۆیە لە سەردەمی فیتنە موحەممەدی کوڕی مەسلەمە(ﷺ) لە جیاتی شمشێرەکەی، شمشێرێکی تەختەی هەڵگرت و چووە ناوچەی (الربذة)و بەشداری لە هیچ ئاژاوەو فیتنەیەك نەکردو پاشان گەڕایەوە مەدینە و لە ساڵی (٤٣)ك کۆچی دوایی کرد.

پێغەمبەر(ﷺ) ناو بەناو ئامۆژگاری هاوەڵانی دەکردو ئاگاداری دەکردن کە فیتنەو ئاشوب سەرهەڵدەدات، هاوەڵەکانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە چی لێی دەربچین و پارێزراوبین فەرموی: دەست بگرن بە بەرنامەی خواوەو پەیڕەوی قورئان بکەن.

هەندێ کەس داوایان لە پێشەوا ئوسامەی کوڕی زەید(ﷺ) کرد کە گلەیی بکات لە مەسەلەیەکدا لە ئەمیرەکانیان: ئەویش گوتی: ئێوە وا دەزانن قسەیان لەگەڵ ناکەم و پێیان ناڵێم؟ من بە نهێنی لەم لاوە قسەیان لەگەڵ دەکەم و دەرگایەك ناکەمەوە کە یەکەم کەس بم بیکەمەوە (کە ئەویش دەرگای فیتنەیە).

---

حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ.

پێشەوا تەبەری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: بنەڕەتی فیتنە تاقیکردنەوەو ئەزموونە، جا ئەوەی بتوانێ لەسەری واجبە بە ڕەنگاری خراپان بێتەوە، هەر کەسێکیش یارمەتی خاوەن هەق بدات پێکاویەتی، ئەوەی یارمەتی هەڵەکاریش بدات هەڵەی کردووە، ئەگەر هەق و ناهەقیش تێکەڵ بوو، ئەو کاتە نەهی کراوە مرۆڤی تێدا بجەنگێ[١].

گومان لەوەدا نیە کە ناسینەوەی هەق و ڕاستی گەلێك ئەستەمە، بەتایبەتەی لەو سەردەمانەی کە فیتنە تیایدا بەرپا دەبێ و ئارەزوویان تێدا دەردەکەوێ، بۆیە دوورکەوتنەوەو کەنارگیری دروستە لە سەردەمی فیتنە بۆ ئەوەی خوێنی موسڵمانان بە ناهەق نەڕژێ خودای گەورەش لە هەموو کەس زاناترە.

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص(ﷺ) دەڵێت:

جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) ئێمەی کۆکردەو فەرمووی:

(إِنَّهُ لَمْ يَكُنْ نَبِيٌّ قَبْلِي إِلَّا كَانَ حَقًّا عَلَيْهِ أَنْ يَدُلَّ أُمَّتَهُ عَلَى خَيْرِ مَا يَعْلَمُهُ لَهُمْ، وَيُنْذِرَهُمْ شَرَّ مَا يَعْلَمُهُ لَهُمْ، وَإِنَّ أُمَّتَكُمْ هَذِهِ جُعِلَ عَافِيَتُهَا فِي أَوَّلِهَا، وَسَيُصِيبُ آخِرَهَا بَلَاءٌ، وَأُمُورٌ تُنْكِرُونَهَا، وَتَجِيءُ فِتْنَةٌ فَيُرَقِّقُ بَعْضُهَا بَعْضًا، وَتَجِيءُ الْفِتْنَةُ فَيَقُولُ الْمُؤْمِنُ: هَذِهِ مُهْلِكَتِي، ثُمَّ تَنْكَشِفُ وَتَجِيءُ الْفِتْنَةُ، فَيَقُولُ الْمُؤْمِنُ: هَذِهِ هَذِهِ، فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُزَحْزَحَ عَنِ النَّارِ، وَيُدْخَلَ الْجَنَّةَ، فَلْتَأْتِهِ مَنِيَّتُهُ وَهُوَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَلْيَأْتِ إِلَى النَّاسِ الَّذِي يُحِبُّ أَنْ يُؤْتَى إِلَيْهِ ..)[٢].

واتە: بە دڵنیاییەوە هیچ پێغەمبەرێك نەبووە لە پێش من، ئیلا پێویست بووە لەسەری ئومەتەکەی ڕێنومایی بکات بۆ هەموو خێرو چاکەیەك کە دەیزانێت بۆیان، وە ئاگاداریشیان بکاتەوە لە هەموو ئەو خراپانەی کە دەیزانێت بۆیان، وە ئەم ئومەتەی ئێوە خێرو خۆشیەکەی خراوەتە سەرەتاکەیەوە، وە کۆتاییەکەی دووچاری بەڵاو هەندێك نەهامەتی وا دەبێت کە پێتان نامۆیە، وە فیتنەیەك دێت

---

(١) فتح الباري (٣١/١٣) .

(٢) صحيح مسلم (٣/ ١٤٧٢) باب: الأمر بالوفاء ببيعة الخلفاء، برقم: (١٨٤٤).

که لایەکی لایەکی تری پینه دەکات، وه فیتنەی وا دێت که باوەڕدار دەڵێت: بەمەیان لەناو دەچم، پاشان دەڕەوێتەوە، جا هەر کەسێك حەز دەکات و له ئاگر لا بدرێت و بخرێتە بەهەشتەوە، با کارێکی وا بکات که هەر کات مردنی هات باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێت، بە شێوازێك ڕوو له خەڵك بکات که خۆشی حەز بکات بە هەمان شێوه ڕووی تێبکەن..

پێشەوا حوذەیفەی کوڕی یەمان (ﷺ) دەڵێت: (قَامَ فِينَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مَقَامًا، مَا تَرَكَ شَيْئًا يَكُونُ فِي مَقَامِهِ ذَلِكَ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ، إِلَّا حَدَّثَ بِه، حَفِظَهُ مَنْ حَفِظَهُ وَنَسِيَهُ مَنْ نَسِيَهُ، قَدْ عَلِمَهُ أَصْحَابِي هَؤُلَاءِ، وَإِنَّهُ لَيَكُونُ مِنْهُ الشَّيْءُ قَدْ نَسِيتُهُ فَأَرَاهُ فَأَذْكُرُهُ، كَمَا يَذْكُرُ الرَّجُلُ وَجْهَ الرَّجُلِ إِذَا غَابَ عَنْهُ، ثُمَّ إِذَا رَآهُ عَرَفَهُ)[١].

واته: پێغەمبەر(ﷺ) له ناومان ڕاوەستاو هیچ شتێکی نەهێشتەوە باسی نەکات، هەر له کاتی ڕاوەستانی خۆیەوە تا ڕۆژی دوایی دێت، جا ئەوەی لەبەری کرد لەبەری کرد، ئەوەی له بیری کرد له بیری کرد، وه هاوەڵانیشمان زانیان، شتی واش دەبێت که من له بیرم چووه، که دەبینم وه بیرم دێتەوە، هەروەك پیاوێك ئەگەر یەکێکی لێ ون بوو له بیری دەکا بەڵام که دیتی بە بیری دێتەوە.

پێشەوا ئەبو زەید عەمری کوڕی ئەخطەب(ﷺ) دەڵێت: (صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الْفَجْرَ، وَصَعِدَ الْمِنْبَرَ فَخَطَبَنَا حَتَّى حَضَرَتِ الظُّهْرُ، فَنَزَلَ فَصَلَّى، ثُمَّ صَعِدَ الْمِنْبَرَ، فَخَطَبَنَا حَتَّى حَضَرَتِ الْعَصْرُ، ثُمَّ نَزَلَ فَصَلَّى، ثُمَّ صَعِدَ الْمِنْبَرَ، فَخَطَبَنَا حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ، فَأَخْبَرَنَا بِمَا كَانَ وَبِمَا هُوَ كَائِنٌ فَأَعْلَمُنَا أَحْفَظُنَا)[٢].

واته: پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی بەیانی پێ کردین، جا بەسەر مینبەر کەوت و وتاری بۆ داین تا نیوەڕۆ، پاشان دابەزی لەسەر مینبەرو نوێژی نیوەڕۆی کرد، دوایی چوه سەر مینبەر تا نوێژی عەسر وتاری بۆ داین، جا دابەزی و نوێژی عەسری کردو پاشان چۆوه سەر مینبەرو تاکو مەغریب وتاری بۆ داین، جا لەم وتارەدا باسی هەموو ئەو شتانەی کرد که ڕوودەدەن، جا ئەو کەسەمان زاناو به

---

(١) صحيح مسلم، (٤/ ٢٢١٧) باب: إخبار النبي (ﷺ) برقم: (٢٨٩١).

(٢) صحيح مسلم، (٤/ ٢٢١٧) باب: إخبار النبي (ﷺ) برقم: (٢٨٩٢).

ئاگادارترە لەو ڕووداوانە کە زیاتری لەبەرە.

پێشەوا حوذەیفەی کوڕی یەمان(ﷺ) دەڵێت: (وَاللَّهِ إِنِّي لأَعْلَمُ النَّاسِ بِكُلِّ فِتْنَةٍ هِيَ كَائِنَةٌ فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَ السَّاعَةِ ، وَمَا بِي أَنْ يَكُونَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَسَرَّ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ شَيْئًا لَمْ يُحَدِّثْ غَيْرِي بِهِ ، وَلَكِنِ النَّبِيُّ (ﷺ) قَالَ وَهُوَ يُحَدِّثُ مَجْلِسًا أَنَا فِيهِمْ عَنِ الْفِتَنِ ، قَالَ وَهُوَ يَعُدُّهَا : مِنْهُنَّ ثَلاَثٌ لاَ يَكَدْنَ يَذَرْنَ شَيْئًا ، وَمِنْهُنَّ فِتَنٌ كَرِيَاحِ الصَّيْفِ، مِنْهَا صِغَارٌ وَمِنْهَا كِبَارٌ، قَالَ حُذَيْفَةُ : فَذَهَبَ أُولَئِكَ الرَّهْطُ كُلُّهُمْ غَيْرِي)[1].

واتە: سوێند بە خوا من بە هەموو فیتنەیەك شارەزاییم لێی هەیە هەتا ڕۆژی دوایی، وە چەند جار لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بویمە کە باسی فیتنەی کردووە، ڕۆژێ باسی فیتنەیەکی کردو فەرموی: سێ فیتنە هەن هیچ شتێکی وا جێ ناهێڵن و فیتنەی واش هەیە وەکو هەورەبای هاوینە گچکەی هەیەو گەورەشی هەیە.

زانایان دەڵێن: هەندێك لەو فیتنانە توندو تاریکن و هەندێکیشان سوك و ئاسانن وەکو ئەم فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کە باسمان کرد .

تەنانەت پێغەمبەر(ﷺ) سەرهەڵدانی ئەو فیتنانە بە یەکێ لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی دادەنێت، هەروەکو دەفەرموێ: (إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يَفِيضَ الْمَالُ، وَيَكْثُرَ الْجَهْلُ، وَتَظْهَرَ الْفِتَنُ، وَتَفْشُوَ التِّجَارَةُ)[2].

واتە: لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی ماڵ زۆر دەبێت و نەزانین بەربڵاودەبێت و ئاشوب سەر هەڵدەدات و بازرگانی بڵاودەبێتەوە.

بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) ئومەتەکەی ئاگادار کردۆتەوە کە خۆمان بپارێزین لە ئاشوب، وە هەواڵی داوە کە کۆتایی ئەم ئومەتە توشی بەڵاو ناخۆشیەکی گەورە دەبێ و هیچ پارێزەرێکی بۆ نیە تەنیا بڕوا بوون بە خوای گەورەو ڕۆژی دوایی نەبێ.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢١٦) باب: إخبار النبي(ﷺ) برقم: (٢٨٩١).

(٢) صحيح: المستدرك (٢/ ٩) برقم: (٢١٤٧)، قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ وَإِسْنَادُهُ عَلَى شَرْطِهِمَا صَحِيحٌ إِلَّا أَنَّ عَمْرَو بْنَ تَغْلِبَ لَيْسَ لَهُ رَاوٍ غَيْرُ الْحَسَنِ.

شاعیری مەحوی دەربارەی ئاشوب دەڵێت:

لەم بەحری فیتنە بەڵکی نەجاتت بدا خـودا
داوێنی با خـودا بگرە، بەردە ناخـــــودا[١]
بێ کەس منم، کەســـــێ لە زوبانم بگا نیە
هەمدەم خودا نەناسن و دەم پڕ لە یاخودا[٢]



(١) باخودا : ئەوەی لەگەڵ خودا بێ. ناخودا: کەشتیەکان. واتە: بۆ ئەوەی خوا لە شەڕی ئەم جیهانە ڕزگارت بکا کە وەك دەریای ئاشوب و هەرا وایە، چارت تەنها ئەوەیە دەسەو دامێنی ئەو کەسە ببیت کە بە ڕاستی هەموو شتێکی بەدەستە کە خوا خۆیەتی و گوێ بەوانە نەدەی کە بە دیمەن چارەسازو کارسازن وەك کەشتیوان لەناو کەشتیدا بەسەر دەریاوە، چونکە ڕاستەکەی ئەوانە هیچیان بە دەست نیە . ئەم بەیتە ئیستیعماریەکی موصەرڕەحەی تێدایە ئەوەتە دونیای تێدا شوبهێنراوە بە بەحرو ناوی پێ شوبهێنراوەکە هێنراوەو نیشانەیەکی وایش لە ئارادایە وەك (باخودا) بێ کە پەیوەندی بە شوبهێنراوەکەوە هەیە، هەر چەند (ناخودا)یش هەیە کە پەیوەندیەکە بە پێ شوبهێنراوەکەوە هەیە لە نێوان (باخودا) و (ناخودا) یشدا جیناسی لاحیق هەیە، سەرەڕای طیباقی بە دیمەنیان لە واتادا.

(٢) واتە: لەم دەریای دونیایەدا کەشتی ڕۆژگار ئەوەندەی دوور خستوومەتەوە گەیشتومەتە شوێنێ، کەس شك نابەم تیایداو کەسێك نیە لە زمانم حاڵی ببێ و لە دەردم بگاو بە فریامەوە بێت. (دیوانی مەحوی لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی : مامۆستا عبدالكریم مدرس)

# فیتنەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە سەرهەڵئەدەن

بە درێژایی مێژوو وڵاتی عێراق پڕ بووە لە ئاشوب و ناخۆشی، وە مێژوو شاهێدە بەسەر ئەمەوە..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی ڕاگەیاندووین کە ڕەشەبای فیتنەو ئاشوب لە کوێوە هەڵدەکاتە سەر موسڵمانان، ئاماژە بەوەش دەکات کە زۆری فیتنەکان لە خۆر هەڵاتەوە سەر هەڵدەدەن، خۆر هەڵاتیش مەبەست پێی خۆر هەڵاتی شاری مەدینەیە کە عێراق و ئێران بە گشتی دەگرێتەوە بە تایبەتی باشوری عێراق.

پێشەوا سالمی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومەر(ﷺ) دەڵێت: (يَا أَهْلَ الْعِرَاقِ مَا أَسْأَلَكُمْ عَنِ الصَّغِيرَةِ، وَأَرْكَبَكُمْ لِلْكَبِيرَةِ سَمِعْتُ أَبِي عَبْد اللهِ بْنَ عُمَرَ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: إِنَّ الْفِتْنَةَ تَجِيءُ مِنْ هَاهُنَا، وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ مِنْ حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنَا الشَّيْطَانِ، وَأَنْتُمْ يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ...)[١].

واتە: ئەی خەڵکی عێراق چەند پرسیار لە شتی بچوك دەکەن و گوناهی گەورە ئەنجام دەدەن ، گوێم لە باوکم بوو دەیگوت : گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: فیتنەو ئاشوب ئا لێرەوە دێت جا ئیشارەتی بۆ خۆر هەڵات دەکرد لەو شوێنەی کە قۆچی شەیتانی لێ هەلدێت ئێوەش ئەی خەڵکی عێراق بە شمشێر گەردەنی یەکتر دەپەڕێنن.

لە ریوایەتێکی تر فەرموویەتی: (رَأْسُ الْكُفْرِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ، وَالْفَخْرُ وَالْخُيَلَاءُ فِي أَهْلِ الْخَيْلِ وَالْإِبِلِ الْفَدَّادِينَ، أَهْلِ الْوَبَرِ وَالسَّكِينَةُ فِي أَهْلِ الْغَنَمِ)[٢].

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٢٩) باب: الفتنة من المشرق، برقم: (٢٩٠٥).

(٢) صحيح مسلم، (١/ ٧٢) باب: تفاضل أهل الإيمان فيه، برقم: (٥٢).

واتە: سەری بێباوەڕی لە ڕۆژهەڵاتەوەیەو لە خۆبایی بوون و فیزی لە نێو دەوارنشینی خاوەن وڵاخ و حوشتری قەڵەو و ئارامی لە نێو خاوەن مەڕان دایە.

پێشەوا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(ﷺ) دەڵێت:

ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) لە پاڵ مینبەر ڕاوەستاو دەستی بەرەو خۆر هەڵات درێژ کردو فەرمووی: (إِنَّ الْفِتْنَةَ هَهُنَا إِنَّ الْفِتْنَةَ هَهُنَا مِنْ حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ)[١].

واتە: ئاشوب ئەوەتا لێرەیە، لێرە کە شاخی شەیتان دێتە دەرێ یان فەرمووی شاخی خۆر.

پێشەوا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي شَأْمِنَا، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي يَمَنِنَا، قَالُوا وَفِي نَجْدِنَا، قَالَ اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي شَامِنَا، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي يَمَنِنَا، قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَفِي نَجْدِنَا فَأَظُنُّهُ قَالَ فِي الثَّالِثَةَ هُنَاكَ الزَّلَازِلُ وَالْفِتَنُ، وَبِهَا يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ)[٢].

واتە: خوایە بەرەکەتمان بۆ بخەیتە شامەوە خوایە بەرەکەتمان بۆ بخەیتە یەمەنەوە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بۆ نەجدیش[٣]؟

---

(١) مسند الإمام أحمد (٢/ ٩١) برقم: (٥٦٥٩) قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

(٢) صحيح البخاري (٩/ ٥٤) باب: قول(ﷺ) الفتنة قبل المشرق، برقم: (٧٠٩٤).

(٣) پێشەوا ئیبنو حەجەر دەفەرموێ: (نەجد) لە زمانی عەرەبیدا مەبەست پێی شوێنێکی بەرزەو خەڵکی مەدینەش بە بیابانی عێراقیان دەگوت: (نجد)، (نەجد)یش مەبەست پێی شوێنێکی بەرزە پێچەوانەی (غەورە) کە هەموو زەویەکی نزمە، جا تیهامە هەمووی غەورەو مەککەش دەکەوێتە تیهامە. الفتح (١٣/ ٥٨).

پێشەوا (خەطابی) دەڵێت: نەجد لای ڕۆژهەڵاتە هەر کەسێك لە مەدینە نیشتەجێ بێ نەجدەکەی بریتیە لە دەشتی عێراق و دەوروبەری کە خۆر هەڵاتی دەوری مەدینەن، بێگومان عێراقیش دەکەوێتە لای ڕۆژهەڵات بە گوێرەی مەدینەش بە نەجد دادەنرێت . الفتح (١٣/ ٥٨).

ڕای پەسندیش لە نێو زانایانی ئیسلام ئەوەیە کە (نەجد) بە عێراق دەگوترێت(٢) نەك عەرەب.. علامات الساعة الصغرى والكبرى، لا ٢٧ .

پێم وایە لە سێهەمدا فەرموی: بومەلەرزەو ئاشوب لەوێ ڕوودەدات و لەوێوە قۆچی شەیتان هەڵدێت.

پێشەوا ئیبنو حەجەر(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

یەکەم ئاشوب کە سەری هەڵدا سەرچاوەکەی لە ڕۆژهەڵاتەوە بوو، کە ئەوەش هۆکارێك بوو بۆ پەرتەوازەیی موسڵمانان ئەوەش ئەو کارەیە کە شەیتان حەزی پێیەتی و دڵی پێ خۆش دەبێ، بەهەمان شێوە بیدعەکان هەر لەم لایەوە پەیدا بوو[١].

ئەوەندەی من بۆی بچم ئەوەیە لەم سەردەمەدا ئەم فەرموودەیەی خۆشەویست کە هەواڵی داوە هاتۆتە دی، تەنانەت ئاشوبەکانیش لە ڕۆژهەڵاتەوە سەریان دەرهێناوە بە تایبەتی لە وڵاتانی خوراسان و ئەفغانستان و ئێران و عێراق.

ئەگەر بگەڕێینەوە خوراسان دەبینین بە درێژایی مێژوو ئەم وڵاتە شاری فیتنەو ئاشوب و کوشتن و بەڵا بووە، بۆیە لەسەردەمی پێشەوا عوسمان (ﷺ) ئەم شارە ئازاد کراوە بۆ ئەوەی خەڵکی لە نەهامەتی و ناخۆشی ڕزگاریان ببێت، بەڵام لە کۆتاییدا دەوڵەتێکی وەکو ئەمریکا داگیری کرد لە ساڵی (٢٠٠١).

هەر کەسێك چاو بە مێژوودا بخشێنێ دەزانێ فیتنەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ سەر موسڵمانان و جیهانی ئیسلامی هەڵیان کردووە، ئەم فیتنەش بووە هۆی شەهید کردنی پێشەوا عوسمانی کوڕی عەفان و شەهید کردنی پێشەوا عەلی و شەهید کردنی پێشەوا حوسەینی کوڕی عەلی، وە سەرهەڵدانی حەروریە لە دین دەرچووەکانیش کە خەواریج بوون بۆیە ڕەشەبای خەواریجەکانیش بە درێژایی سەردەمی ئومەوییەکان ئومەتی ئیسلامی هەژاند، هەروەها شۆڕشی زەنجیش لە شاری بەسرە بەرپا بوو لە ساڵی (٢٥٥)ی کۆچی، پاشان قەرامیطیەکان لەوێ سەریان هەڵدا لە ساڵی (٢٧٨) کۆچی، ئەوەی چاو بە مێژوودا بخشێنێتەوە دەزانێت ئەو زەنجیش و قەرامیتانە چ کارەساتێکیان لە نێو ئومەتی ئیسلامی نایەوە قەت لە بیری ناکات[٢].

---

(١) فتح الباري (١٣/ ١٤).

(٢) علامات الساعة الصغرى والكبرى لا ٣٠.

هەروەها ڕەشەبای تەتەرەکانیش لە ڕۆژهەڵاتەوە دەستی پێکرد، ئەمەش هەروا دەمێنێتەوە تا بەیداخەکانی دەجال لە خوراسانەوە دێن، هەروەکو پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پێداوین.

سەرەتا لە هێرشەکانی جەنگیزخانی یەکەم سەرکردەی تەتارو مەغۆلەکانەوە دەستی پێکرد بۆ سەر مەملەکەتی خەواریزم شا لە ئەفغانستان، دواتر پەلاماردانی ئێران و داگیرکردنی، پاشان بەسەرکردایەتی ( هۆلاکۆ )ی کوڕەزای جەنگیزخان لە ساڵی (٦٥٦) کۆچی ڕوویان کردە شاری بەغدای پایتەخت و ئەوێشیان داگیر کردو خەلیفەی موسڵمانانیان کوشت و کۆتاییان بە خیلافەتی عەبباسی هێناو نەهامەتیەکی هێندە گەورەیان بەسەر ئومەتی ئیسلام هێنا کە لە مێژووی خۆیدا شتی وای بەسەر نەهاتبوو، هەر شارو مەملەتێکیش کە داگیریان دەکرد پاش قەتل و عام کردنی هەموو خەڵکەکەی تەخت و تاراجی شارەکەشیان بەسەریەکدا دەڕووخاندو دەیان سوتاند بە جۆرێك کە تەنها لە شاری (بەغداد) زیاتر لە یەك ملیۆن موسڵمانیان شەهید کرد، هەتا دواتر لە وڵاتی شام لەسەر دەستی سەرکردەیەکی ئیسلامی بە ناوی(سیف الدین قطز)ەوە موسڵمانەکان توانیان لە جەنگی (عەین جالوت)دا بیانشکێنن.

پێشەوا ئەنەس (ﷺ) دەڵێت:

جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی شاری (بەسرە) قسەی بۆ دەکردم و دەیفەرموو:

(يَا أَنَسُ، إِنَّ النَّاسَ يُمَصِّرُونَ أَمْصَارًا، وَإِنَّ مِصْرًا مِنْهَا يُقَالُ لَهُ: الْبَصْرَةُ - أَوِ الْبُصَيْرَةُ - فَإِنْ أَنْتَ مَرَرْتَ بِهَا، أَوْ دَخَلْتَهَا، فَإِيَّاكَ وَسِبَاخَهَا، وَكِلَاءَهَا، وَسُوقَهَا، وَبَابَ أُمَرَائِهَا، وَعَلَيْكَ بِضَوَاحِيهَا، فَإِنَّهُ يَكُونُ بِهَا خَسْفٌ وَقَذْفٌ وَرَجْفٌ، وَقَوْمٌ يَبِيتُونَ يُصْبِحُونَ قِرَدَةً وَخَنَازِيرَ)[1].

واتە: ئەی ئەنەس خەڵکی شار دروست دەکەن و ئاوەدانی دەکەنەوە، شارێك هەیە پێی دەگوترێ بەسرە، ئەگەر هاتوو تیایدا تێپەڕ بوویت یا چویتە ناوی

---

(١) سنن أبي داود (٤/ ١١٣) باب في ذكر البصرة، قال الألباني حديث صحيح، برقم: (٤٣٠٧).

ئاگاداربە نزیك زەوی ڕووت و لە وەرگاو دارخورماو بازاڕو دەرگای بەرپرسەکان نەبیتەوەو نەچیتە ناوی، هەر لە قەراغ شارەکە بمێنەوە، چونکە ئەو شارە دوو چاری ڕۆچوون و ئاگر باران و زرمەو نالەو ڕاتەکاندن دەبێت، وە کەسانێکی تێدا دەبێت شەو کە دەخەون بەیانی لە خەو هەڵدەستن بوون بە مەیمون و بەراز .

ئاشوبەکە هێندە بە تین بوو، تەنانەت جارێکیان ئیبنو تەیمیەو قوتابیەکی بە لای چەند تەتارێکدا دەڕۆن و مەی دەخۆنەوە، قوتابیەکەی دەیەوێ ڕێیان لێ بگرێ و نەهێڵێ ..

بەڵام پێشەوا ئیبنو تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: وازیان لێ بێنە سەرخۆش بن باشترە لەوەی بە ئاگابن و موسڵمانان بکوژن[1] .

پێشەوا ئوسامەی کوڕی زەید(ﷺ) دەڵێت:

جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) سەر کەوتە یەکێك لە قەڵاکانی مەدینەو فەرموی: ئەوەی من دەیبینم ئێوەش دەیبینن..

هاوەڵەکانیش گوتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)!

فەرموی: من دەبینم ئاشوب وەکو باران لە ماڵەکانتان دەردەکەوێ.

جا پێغەمبەر(ﷺ) لەم فەرمودەیە ئاماژە بەوە دەکات کە فیتنەکان بەرپا دەبن و بە تەنیا کۆمەڵێك تایبەت نین، بەڵکو هەموان دەگرێتەوە وەکو باران.

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

شاری مەدینە بەمە تایبەتمەند بوو، چونکە پێشەوا عوسمانی تێدا شەهید کرا، پاشان فیتنە بە وڵاتاندا بڵاوبویەوە، وە جەنگی (صفین) و (جەمەل) و شەهید بوونی پێشەوا عوسمان ڕوویدا، وە شەڕی (نەهرەوان)یش بە هۆی دادوەری جەنگی (صفین) بوو، هەموو جەنگێکیش کە لەم کاتەدا ڕوویدابێ بە هۆی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆی شەهیدبوونی پێشەوا عوسمان بوو، توندترین

---

(١) الجواب الصحيح (٣/ ١٦١).

بەرگی دووەم

هۆی کوشتنی پێشەوا عوسمانیش نا ڕازی بوونی خەڵك بوو بە ئەمیرەکانی، یەکەم جاریش ئەوە لە عێراق سەری هەڵدا کە دیارە عێراقیش لە لای ڕۆژ هەڵاتەوەیە[١].

هەموو ئەم فەرموودانەی پێغەمبەر(ﷺ) کە لە بارەی ڕۆژهەڵاتەوە دەدوێن ئێستا زۆربەی زۆری لە وڵاتی عێراق ڕوودەدەن.

لەم سەردەمە فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هەموویان هاتونەتە دی، بێجگە لەم هەموو شەڕو کاولکاریەی کە پێشتر بەسەر شاری بەسرەدا هاتووە، وە زۆربەی زۆریمان بە چاوی خۆمان دەبینین ئەو شەڕەی لە نێوان عێراق و ئێران ڕوویدا، دواتریش لە جەنگی کەنداو هەتا ئەمڕۆ بەردەوام ئەو شارە تۆپ باران و بۆردومان دەکرێت و بە سەدان خانوو دوکان و بازاڕو کوچەو کۆلانی ڕۆچوون و خەڵکەکەشی کەوتنە ژێر دارو پەردەی بینا ڕووخاوەکانەوە..

بە ڕاستی هەر لە کۆنەوە هەتا ئەمڕۆش کەسێك نیە لە بیری بێت، ئەم عێراقە بێ شەڕو فیتنە و ئاژاوەو کوشتار بوو بێت، بۆیە هەر لە کۆنیشەوە بە عێراق گوتراوە (بلد الجبابرة) واتە: وڵاتی ستەمکاران.

---

(١) فتح الباري (٦/ ٦٠٩).

## هاتنی ڕۆژگارێک
## پیاو بەیانی باوەڕدار دەبێت و ئێوارە بێ باوەڕ

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگاداری کردوینەتەوە کە تێکچوونی حاڵی خەڵکی و ڕاڕایی و جیاوازیان بەهۆی زۆر ئاژاوەو تاقیکردنەوەکانی و تەشەنەکردنی حەزو ئارەزووەکان و کەمبوونی خەڵکی چاك و خێرخوازە بۆیە دەبینی پیاو سەر لەبەیانی خاوەن باوەڕە بەڵام بۆ ئێوارە هەڵدەگەڕێتەوەو بێباوەڕ دەبێت.

پێشەوا ئەبو هوڕیرە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (بَادِرُوا بِالْأَعْمَالِ فِتَنًا كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ، يُصْبِحُ الرَّجُلُ مُؤْمِنًا وَيُمْسِي كَافِرًا، وَيُمْسِي مُؤْمِنًا، وَيُصْبِحُ كَافِرًا، يَبِيعُ دِينَهُ بِعَرَضٍ مِنَ الدُّنْيَا)[1].

واتە: پەلە بکەن لە ئەنجامدانی کردەوەی چاك لە پێش گەلێك ئاشوب وەکو پارچەی ڕەشی شەو پیاو سەر لەبەیانی باوەڕدار دەبێت و بۆ ئێوارە پاشگەز دەبێتەوە، یان ئێوارە باوەڕدار دەبێت و بۆ بەیانی پاشگەز دەبێتەوەو دەبێتە بێباوەڕ، دینی خۆی دەفرۆشێت بە شتێکی بێ بایەخ لە دونیا.

مەبەست لەم فەرموودەیە هاندانە لەسەر دەستپێشخەری بۆ کردەوەی چاکە پێش سەرقاڵبوون و نەتوانین بەهۆی ئەو ئاشووبانەی کە کۆدەبنەوە وەکو تاریکە شەوێکی بێ مانگ.

وە جۆرێکی لە سەختی ئەو سەردەمە باسکردووە کە بریتیە لەوەی کەسێك ئێوارە خاوەن باوەڕەو سەر لە بەیانی بێباوەڕ دەبێتەوە، ئەوەش بەهۆی ئەو سەختی و ناڕەحەتیانەوەیە کە مرۆڤ بێباوەڕ دەکات کە لە یەك ڕۆژدا ئەو گۆڕانە گەورەی بەسەردا دێت.

---

(١) صحيح مسلم (١/ ١١٠) باب: الحث على المبادرة، برقم: (١١٨).

بەرگی دووەم

ڕۆژگارێك پیاو ئەوەندە ئاینی لاواز دەبێت و گومانی بۆ دروست دەبێت، بۆیە واز لە دینەکەی دەهێنێت و ناتوانێت جێگیر بێت لەسەر دینداری، تەنانەت بەرامبەر شتێکی بێ بایەخ، یان بەرژەوەندی و کەسایەتی واز لە ئاینەکەی دەهێنێت و دەیفرۆشێت.

ئەوەش ڕاسترین وەسفکردنێکە بۆ ئەم سەردەمەی خۆمان.

یان لە نوێژی بەیانی لەگەڵ تۆ دەبێت لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوای پەروەردگار بەڵام نوێژی مەغریب یان لە نوێژی عیشا بە دوایدا دەگەڕێیت کەچی نایدۆزیتەوە! ڕۆژی دووەم دیسان نایدۆزیتەوەو ڕۆژی داهاتوو دیسان نییە، ئەی بۆ کوێ ڕۆیشت؟ ئەو دینەکەی خۆی فرۆشتووە، بەرامبەر بە شتێکی کەمی هیچی ئەم دونیایە.. ڕەنگە ئێوارە بچیتە ژوورێکەوە لە ژوورەکانی (الشات) یان لە ژووری (دردشە) لە (ئینتەرنێت) یان سایتێکی بەڕەڵڵایی، وە لەو ژوورە یان لەو سایتە دەرناچێت ئیلا دینەکەی خۆی فرۆشتووە بەرامبەر بە شتێکی کەمی دونیا بە پلەو پایەکی تیاچوو.. بە هەوەس و ئارەزوویەکی قەدەغەکراو... بە تام و چێژێکی لەناوچوو.. بە پلەیەکی هیچی بێ نرخ..

بەڕاستی واقیعێکی ترسناکەو زۆربەی خەڵکی تێی کەوتوون لە ئاستی هەموو مرۆڤایەتی.. کەسێك دەبینی (کەم تەرخەمە) لە نوێژەکانی یان لە باڵاپۆشی خێزانەکەی یان خواردنی حەرام و سوو یان خواردنی سامانی خەڵکی بە ناهەق لە پێناو شەهوەتێکی بێ نرخدا.

یان هەندێك لە خەڵکی دەڵێن:

هۆکاری دواکەوتوییمان دینەو دەڵێن: کەعبە وێنەیەکە لە بتپەرستی، خەڵکانێك دەڵێن حیجاب فەرز نیەو دەبێت ئافرەت و پیاو یەکسان بکرێن، بەم شێوەیە کە فەرمایشتەکە دەفەرموێت: پیاو ڕۆژ دەکاتەوە موسڵمانەو شەوی بەسەر دێت کافر دەبێت و بە پێچەوانەوە دینەکەی بە چەند کەل و پەلێکی بێ نرخی دونیا دەفرۆشێت، بە هەر مامەڵەیەکی بێ نرخ لە مامەڵەکانی دونیا!

ئایا ئێستا دەیهێنیتە پێش چاوی خۆت لە پاش ئەو دەربڕینە پڕ ڕەوانبێژییە پێغەمبەرایەتیە کە دەفەرموێت: (بَادِرُوا بِالْأَعْمَالِ فِتَنًا كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ) ئەوە دەربڕینی پێغەمبەرایەتیە لەو پەڕی رەوانبێژیدایە کە خوای گەورە (جوامع الكلم)ی پێ بەخشیوە.. خۆشەویستمان دەربارەی ئەو فیتنەیە بەو شێوەیە دەری بڕیوە (كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ).

بەڵێ.. هیچ ڕزگاربوونێك نییە لەو فیتنە زۆر تاریك و ڕەشەدا.. کە هیچ تروسکایی و ڕوناکی تیادا بەدی ناکرێت.. تەنها بە کرداری چاکە نەبێت..

تەنانەت پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) سەرنجمان ڕادەکێشێ بە ڕوونی بۆ لای چارەسەرێك چونکە ئەو میهرەبانییەکی بە دیاری نێردراوە، ئەو خۆشەویستە نەخۆشیەکمان بۆ دیاری دەکات و پاشان ئەم ئوممەتە جێ ناهێڵێ بە سەرسامی بمێنێتەوە بەڵکو چارەسەرەکەی بە وردی و دەستپاکیەوە دەست نیشان دەکات.

# عەجەم و ڕۆم دەست بەسەر وڵاتان دەگرن و جزیەش ڕادەوەستێنرێت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر عەجەم و ڕۆم دەست بەسەر زۆربەی وڵاتانی جیهان دەگرن و جزیەش ڕادەوەستێنرێت..

جزیە واتە: سەرانە: ئەو پارەیە لە ناموسڵمانەکان ئەوانەی لە وڵاتانی ئیسلامیدا دەژین وەردەگیرێت لە پێناو فەراهەمهێنانی ئاسایش و ئارامی بۆیان[1].

پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوینەتێ کە سەرانە دەوەستێت و نامێنێ، چونکە موسڵمانان داهاتێکی زۆر گرنگیان لە دەست دەچێ.

سەرانە لە زمانەوانیدا، واتە: پاداشت، پاداشتیش بە واتای شتێك لە بەرامبەر شتێکدا کردبێت.

پێشەوا شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) پێناسەی بەوە کردووە دەڵێت:

ئەو پارەیە بە ڕەزامەندی لێیان وەردەگیرێت لە بڕی نیشتەجێکردنیان لە وڵاتی موسڵمانان، یاخود لە پێناو پاراستنی خوێن و ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامانیدا[2].

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مَنَعَتِ الْعِرَاقُ دِرْهَمَهَا وَقَفِيزَهَا، وَمَنَعَتِ الشَّامَ مُدَّهَا وَدِينَارَهَا، وَمَنَعَتْ مِصْرُ إِرْدَبَّهَا وَدِينَارَهَا، وَعُدْتُمْ مِنْ حَيْثُ بَدَأْتُمْ)[3].

---

(١) زاد المعاد (٢/ ٨٨) .

(٢) حاشية القليوبي على شرح المحلى (٢٢٨/٤).

(٣) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٢٠) كتاب: الفتن باب: لا تقوم الساعة حتى يحسر الفرات، برقم: (٢٨٩٦).

واتە: ڕۆژگارێك دێت کە عێراق دیرهەم و قەفیزو پێوانەی خۆی نادات و ڕێدەگرێ وەکو (سەرانە)..

وە شامیش هەر پێوانەو دینارەکەی نادات..

وە میسریش پێوانەو دینارەکەی خۆی نادات..

وە دەگەڕێنەوە خاڵی سەرەتاتان..

واتە: کاتێك دێت کە نە عێراق و نە شام و نە میسر کە هەرسێکیان سەرچاوەی دارایی زۆر گەورە بوون و باج و سەرانەو خەراجیان لێ کۆکراوەتەوە بۆ خەزێنەی موسڵمانان کاتێك دێت ئەوانە هیچیان بە دەست ئیسلامەوە نامێنن.

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە ڕاڤەکردنی ئەم فەرموودەیەدا کە ئەو کات ئەو مەسەلەیە ڕووی نەداوە دەڵێ: دیارترین ڕووی ماناکەی ئەوەیە کە عەجەم و رۆم لە ئاخیر زەمان دەست بەسەر وڵاتەکاندا دەگرن[1].

واتە: ئەوەی باوترە لە مانا لێکدانەوەی ئەم فەرموودەیە ئەوەیە کە عەجەم و ڕۆم دەسەڵات بەسەر وولاتاندا پەیدا دەکەن لە کۆتایی زەماندا، وە ئەو باج و خەراج و سەرانەیە مەنع دەکەن لە موسڵمانان و ناهێڵن وەریبگرن، هەر کام لە (قەفیز) و (مد) و (إردب) هۆکاری پێوان (کیل) بوونە[2].

واتە: باج و خەراجی نەغدنیەو پێوراوی عێراق و شام و میسر کە لە ئەهلی کیتاب وەرگیراوە کە سەردەمی خۆی هی موسڵمانان بووە، دواتر لە موسڵمانان قەدەغە دەکرێ، ئیستاش بە چاوی خۆمان دەبینین فەرمودەکانی خۆشەویستمان هەمووی هاتۆتە دی.

---

(١) شرح صحيح مسلم (١٨/ ٢٠).

(٢) قەفیزو مودو ئەردەب پێوانەی ئەو کاتن لەو وڵاتانە، تاکو ئێستاش هەندێکیان بەکاردێت، وە دیرهەم و دیناریش ناوی دراوی ئەو سەردەمەن، هۆی ئەم ڕاگرتنەش ئەوەیە کە بێبڕوایان لە هەندێك کاتدا ئەو وڵاتانە داگیر دەکەن، ڕۆم و دواتریش تەتەر گەلێك وڵاتی موسڵمانانیان داگیر کردووە، لەم سەردەمەی خۆشمان کافرەکان وڵاتی ئیسلامیان داگیر کردووەو دەوڵەتی خەلیفایەتی ئیسلامیان لا بردووەو شەرعی خودایان لە حوکم دوورخستۆتەوە .

ئەمەش یەکێکە لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر لە ساڵی (١٩٩٠ م ١٤١٠ ك) ڕوویدا، لەو کاتەی ئابلۆقەی ئابووری خرایە سەر عێراق لەلایەن ئەمریکاوە (عەجەم)[١].

ئەگەر سەیری حاڵی ئەمڕۆمان بکەین بە هەردوو چاوی خۆمان دەبینین کە عەجەم و ڕۆم دەسەڵاتیان بەسەر وڵاتان پەیدا کردووە.

پێشەوا جابری کوڕی عەبدوڵلا (ﷺ) دەڵێت: (يُوشِكُ أَهْلُ الْعِرَاقِ أَنْ لَا يُجْبَى إِلَيْهِمْ قَفِيزٌ وَلَا دِرْهَمٌ، قُلْنَا: مِنْ أَيْنَ ذَاكَ؟ قَالَ: مِنْ قِبَلِ الْعَجَمِ، يَمْنَعُونَ ذَاكَ)[٢].

واتە: هێندەی نەماوە نە قەفیزێك و نە دیرهەمێکیان بۆ نەیەت..

گوتمان: ئەوە لە کویٚ؟

گوتی: لەلایان عەجەمەوە ئەمانە چی دیکە نایدەن و قەدەغەی دەکەن.

ئەمەش لەسەردەمی ئێمە لە وڵاتی عێراق ڕوویدا، ئێستاش هەیە دەڵێن: لە ئاخیر زەماندا هەڵدەگەڕێنەوەو زەکات و خێرەکانیان نابەخشن .

ئەم هەموو پاساوانەش بووە هۆی ڕاگرتن و نەمانی ئەو داهاتانە کە لە خەزێنەی موسڵمانانە، سەرەڕای دارمانی موسڵمانی ڕاستەقینەش کە ئابووری خۆی لەسەر شەریعەتی ئیسلامی بنیات دەنیٚ، جا سکاڵاو گازاندەمان هەر بۆ لای خودایە .

---

(١) هرمجدون، امين محمد جمالدين، لا٢٥.

(٢) صحيح مسلم، كتاب: الفتن، باب: لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل بقبر الرجل، برقم: (٢٩١٣).

بەرگی دووەم

## زۆربوونی کوشتن و کوشتار

بە درێژایی مێژوو ململانێیەکی زۆر هەبووە لەناو خەڵکی بەڵام لە سەدەی بیست گەیشتە چڵەپۆپە.

سەدەی بیستەم بە شەڕو ئاژاوە دەستی پێکردو کەسانی دڕندەشی لێکەوتەوە.

سەدەی بیستەم بە لێدوانێکی لەناکاو دەستی پێکرد کە هەموو خەڵکی گرتەوەو ملیۆنەها خەڵك لە هەردوو جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم ژیانیان لە دەستداو خەڵکێکی زۆر بێ ماڵ و حاڵ بوون .

مرۆڤی چاك بریتیە لەو موسڵمانە ڕاستاڵەی کە جێگیرە لەسەر ئایینی ئیسلام، وە ئومەتی چاکیش هەر ئەم ئومەتەیە کە ئەم دینە پاکە بکاتە بەرنامەی خۆی، ئینجا تاکی موسڵمانان و تێکرای ئومەتی ئیسلامیش توشی گەلێك جۆرە تاقیکردنەوە دێن، جا ڕەنگە هەر لە نێو ڕیزەکانیدا بەهۆی ئارەزوو ناکۆکی و دووبەرەکی سەر هەڵبدا، یان لە دوژمنێکی ڕق و کینە لە دڵ ڕەنگ بداتەوە کە هێرشیان بۆ بێنێت و زەبونیان بکات.

بەڵێ .. لە سەدەی بیستەم جیهان گوزارشت لە قۆناغێکی زۆر ترسناك دەکات کە مرۆڤ مرۆڤایەتی خۆی لە دەستدا، ئەمەش بە گوێرەی فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە باس لە نەزانین و نەفامی جەهالەت و کوشتنێکی زۆر دەکات، ئەوەش هیچ گومانی تێدا نیە ئێمە لەو سەردەمەین کە هێندەی نەماوە ڕۆژی دوایی بێت.

ئەم زەمینەی کە تیایدا دەژین هیچ ڕۆژێك لە ڕۆژان خاڵی نەبووە لە شەڕو فیتنەو ئاشوب و ململانێ بەڵام زۆربەی زۆری شەڕەکان تا پێش سەدەی بیستەم شەڕی ناوچەیی بوونە، واتە: هەموو لایەکی زەوی نەگرتۆتەوە، بەڵکو تەنها شەڕی نێوان دوو دەوڵەت بووە، بەڵام لە سەدەی بیستەم شەڕێکی وەها

هاته ئاراوه كه هەموو جیهانی گرتەوەو ناوی لێنرا شەڕی جیهانی، له شەڕی یەكەم و دووەمی جیهانی ملیۆنەها كەس كوژران و ملیۆنەها كەسیش ئاوارە و دەربەدەربوون.

به هاتنی سەدەی بیستەم شەڕو ئاژاوەیەكی زۆر هات، هێندەی پێ نەچوو ئەو شەڕانە وەكو ئاگر بڵێسەی سەندو گڕی گرت و هەموو لایەكی جیهانی گرتەوە، به نمونە:

شەڕی نێوان هەردوو كۆریا، شەری ڤێتنام[1]، شەڕی فەلەستین، شەڕی عێراق و ئێران، شەڕەكانی كەنداو، شەڕی نێوان عێراق و ئەمریكا كه له ساڵی (٢٠٠٣) بەرپا بوو، جەنگی بۆسنەو فەلەستین و ئەفغانستان و كشمیرو شیشان، كاریگەری ئەم جەنگانە به هۆی پێشكەوتنی تەكنەلۆجیای چەك و تەقەمەنی مەودایەكی دوورتری بڕی، چونكە بەكارهێنانی چەكی ئەتۆمی و كیمیاوی و بایەلۆجی قوربانی به كۆمەڵی لێكەوتەوە كه مرۆڤ دووچاری تۆقاندن و ترسان دەكات.

بۆیه هەر له سەدەی بیستەم دروست بوونی ڕەگەز پەرستەكان ڕووی له زیاد بوون كرد، ئەو ڕووداوانەی كه به هۆی ململانێی ئایدۆلۆژی و ململانێی تایفی و ڕەگەز پەرستی دروست بوون، بووە هۆی كوژران و لەناوبردنی سەدەها هەزار كەس و بریندار‌بوون و بزربوونی بێ سەرو شوێنی هەزارەهای دیكە.

---

(١) هۆیەكانی جەنگی ڤێتنام دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژانی داگیركاری فەرەنسا كه له پەیماننامەی تینتسین ی ئایاری ساڵی (١٨٨٥)ع مۆر كرا، له ساڵی (١٩٤٦)ع وشەی ڤێتنام له ڕۆژئاوادا بەكارهێنانی كەوتە ناو خەڵكەوە، وەكو ئاماژەیەك بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی هیندی چینی كه له باكوورەوە له سنووری چینەوە تا دەلتای ڕوباری میكۆنگ له باشور درێژ دەبێتەوە، بۆیه حوكمی داگیركاری فەرەنسی ناڕەزاییەكی زۆری لای گەلی ڤێتنام و حیزبی شیوعی بەشی هیندی چینی كه (هۆشی مەنە) له ساڵی (١٩٣٠)ع دایمەزراند، له ماوەی جەنگی دووەمی جیهانی یابانیەكان و فەرەنسیەكان پێكەوە كاریان كرد بۆ كپ كردنەوەی شۆڕش، بەڵام له ساڵی (١٩٤٥)ع (هۆشی مەنە) یەكگرتووی ڤیتنامی دامەزراند بۆ پەرەپێدانی خەبات له پێناو سەربەخۆییدا، ئەم یەكگرتوییە به شێوەیەكی گشتی به ناوی (فیت منە) ناسرا؟ كه دوای خۆ بەدەستەوەدانی یابان له جەنگدا دەستی گرتە سەر شاری هانۆی باكوور .

ئادەمیزاد گەیشتە قۆناغێك کە تەنیا ئەم دوا ڕۆژەی لێ چاوەڕوان دەکرا، ئەمەش لە لایەنی رامیاری و سەربازی هەر بە جارێ ئالۆزوگرێ کۆرەیە، هەر لە کێشەی فەلەستین و کشمیرو ئەرمینیاو دارفۆرو تشادو صۆمال و شیشان و جۆرجیاو ڤێتنام و کوباو بیابانی گەورەو داگیردنی ئەفغانستان و قەیرانی عێراق و داگیرکردنی کوێت و لوبنان تا دەگاتە جەنگی جیهانی یەکەم[1]و جەنگی جیهانی دووەم[2] و شەری عێراق و ئیران و جەنگی بۆسنەو ئەلبانیاو ئێرلەندە.

---

(١) هۆکارە سەرەکیەکانی جەنگی جیهانی یەکەم: جەنگی جیهانی یەکەم لە ساڵی (١٩١٤) ع هەڵگیرساو لە ساڵی (١٩١٨)ع کۆتایی هات، ئەم شەرە یەکێك بوو لە رووداوەکانی سەدەی بیستەم کە هەموو دونیای هەژاندو کاریگەریەکی قوڵی کردە سەر رێڕەوی مێژووی دوای خۆی .

بۆیە ناونرا جەنگی جیهانی، چونکە زۆربەی وڵاتە گەورەکانی ئەو سەردەمە تیایدا بەشداریان کرد لەم جەنگە، بەریتانیاو فەرنساو رووسیا کە پێیان دەگوترا «هاوپەیمانان» بەرەکەیەکی جەنگەکە بون و بەرەکەی تریشی بریتی بوو لە ئەڵمانیاو نەمساو بولگاریاو کە بە وڵاتانی «میحوەر» ناسرا بوون.

هەردوو بەرە بۆ ماوەی چوار ساڵ جەنگێکی خوێناویان کردو لە ئەنجامیشدا وڵاتانی هاوپەیمانان سەرکەوتن، جیاوازی و تایبەتمەندی جەنگی یەکەمی جیهانی لەگەڵ جەنگەکانی پێش خۆی لەوەدا بوو، کە لە هەرسێ بەرەی زەمینی و دەریایی و ئاسمانی شەڕ دەکراو بەریتانیاش بۆ یەکەمین جار بوو کە چەکێکی سەربازی زۆر گرنگی تێدا بەکار هێنا کە «تانك» بوو.

لە ساڵی (١٨٧٠) دا لە جەنگی بروسیا فەرەنسا، فەرەنسا دوو هەرێمی زۆر گرنگی بە قازانجی بروسیا لە دەست دا، کە ئەوانیش هەرێمی «ئەلزاس و لۆرین» بوو، بۆیە ئەمە وای کرد فەرەنسا رقی لە ئەڵمانیا بێتەوەو لە بچوکترین هەل دەگەڕا کە تۆڵەی خۆی بکاتەوە .

(٢) هۆکارە سەرەکیەکانی جەنگی جیهانی دووەم: جەنگی جیهانی دووەم لە ساڵی (١٩٣٩ تا ١٩٤٥) درێژەی کێشا لە نێوان وڵاتانی میحوەر کە بریتی بوون لە ئەڵمانیاو ئیتاڵیاو ژاپۆن و رۆمانیاو وولاتانی هاوپەیمان کە بریتی بوون لە بەریتانیاو فەرەنساو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو یەکێتی سۆڤێتی پێشو و هۆڵەنداو بەلجیکاو دانیمارك و نەرویج .. هتد ، کە بریتی بوون لە (٣٠) وڵات، ئایا هۆیەکانی هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانی دووەم دەزانن ؟

رێکەوتن نامەی ڤێرسای کە لە کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەمدا لە ساڵی (١٩١٤ تا ١٩١٨) مۆر کرا، تا ئەندازەیەکی زۆر نادادپەروەرانە بوو، بوە هۆی سەرەکی هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانی دووەم، ئەوەی لەگەڵ وڵاتانی دۆڕاوی جەنگی جیهانی یەکەم دەکرا وەکو ئەڵمانیاو نەمساو هەنگاریاو تورکیا ، گیانی تۆڵە سەندنەوەی لای ئەڵمانیاو هاوپەیمانانی دروست کرد .

بەرگی دووەم

بەڵێ.. لە سەد ساڵی رابردوو (١٣٢٧ ١٤٢٧)ك، سەرجەم کوژراوەکانی جیهان زیاتر لە (١٠٠) ملیۆن ئادەمیزاد بوو، زیاتر لە (٥٠٠٠,٠٠٠) کەم ئەندام بوو، زیاتر لە (٥٠٠٠,٠٠٠) گوندو شار وێران کرا، زیاتر لە (١٠٠٠٠٠٠٠) ملیۆن منداڵ بێ باوك کرا؟

تەنیا لە جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم زیاتر لە (٥٥٠٠٠٠٠٠) ئادەمیزاد کوژرا! ئەمە ئاماری تاوانەکانی سەدەی بیستەمە، دڵنیابە کە سەدەکانی داهاتوو ترسناکترو دژوارترو پڕ کارەساتر دەبێت!

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُقْبَضَ الْعِلْمُ ، وَتَظْهَرَ الْفِتَنُ ، وَيَكْثُرَ الْهَرْجُ ، قَالُوا : وَمَا الْهَرْجُ يَا نَبِيَّ اللهِ ؟ قَالَ : الْقَتْلُ)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت تا زانست هەڵدەگیرێت و زیلزال زۆر دەبێت و کاتەکان لێك نزیك دەبنەوەو فیتنە سەرهەڵدەدات و کوشتن زۆر دەبێت.

---

ئەو سیاسەتە دوژمنکاریانەی کە ئەڵمانیاو ئیتاڵیاو ژاپۆن پیادەیان دەکردو بێ دەسەڵاتی لە بەرامبەریاندا تا ڕادەیەکی زۆر هۆیەك بوو بۆ هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانی دووەم .

سیاسەتی ڕازیبوونی ڕۆژئاوا لەبەرامبەر هێزە فاشیستەکانی وەکو ئەڵمانیاو ئیتاڵیا وای کرد، ئەو وڵاتانە هێرش بکەنە سەر خاك و ئاوی وڵاتانی ترو داگیری بکەن ، گۆشەگیری ئەمریکاش لە سیاسەتەکانی ئەوروپا لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی ، لە هۆیەکانی هەڵگیرساندنی جەنگی دووەمی جیهانی بوو ، ئەو گۆشەگیریەی ئەمریکا هانی فەرەنسای دا ئەڵمانیا داماو بکات .

ئەڵمانیا لە ساڵی (١٩٣٩)ع هێرشی کردە سەر پۆلەندا، ئەمەش وای کرد بەریتانیاو فەرەنسا دەست لە سیاسەتی ڕازیکردن هەڵگرن و لە (٣)ی ئەیلولی لە ساڵی (١٩٣٩) جەنگی دژی ئەڵمانیا ڕابگەینن، هەر زۆر زووش وڵاتانی تر خزانە ناو جەنگەکەوە کە شێوەی جەنگی جیهانی دووەمی بەخۆیەوە گرت .

جەنگی جیهانی دووەم لە ساڵی (١٩٤٥)ع کۆتای هات، کاتێك هێزەکانی هاوپەیمانان لە هەر چوار لاوە گەمارۆی هێزەکانی ئەڵمانیایان داو ئەڵمانیەکان نەیانتوانی هیچ بەرەنگاریەك لە خۆیان بکەن. (بانکی زانیاری ، وەرگێرانی: مستەفا سەعید عەلی، لا ٦٦).

(١) صحيح البخاري (٤/ ٢٤١) باب: ما قيل في الزلال، برقم: (١٠٣٦).

بەرگی دووەم

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَكْثُرَ الْهَرْجُ قَالُوا: وَمَا الهرج يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: الْقَتْلُ الْقَتْلُ)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا (هەرەج) زۆر دەبێت گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا هەرەج چیە؟ فەرمووی: كوشتن كوشتن. واتە كوشتن زۆر دەبێت.

پێشەوا عەبدوڵلای كوری مەسعود(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (إِنَّ بَيْنَ يَدَيْ السَّاعَةِ أَيَّامًا يَنْزِلُ فِيهَا الْجَهْلُ وَيُرْفَعُ فِيهَا الْعِلْمُ وَيَكْثُرُ فِيهَا الْهَرْجُ قَالَ قُلْنَا وَمَا الْهَرْجُ قَالَ الْقَتْلُ)[2].

واتە: ڕۆژانێك لەبەردەم قیامەتدا هەن:

نەفامیان تێدا دەردەچێت و زانست بەرز دەكرێتەوەو كوشتن زۆر دەبێت .

**قوربانیەكانی جەنگی جیهانی یەكەم :**

قوربانیەكان لە ئەنجامی یەكەم جەنگی جیهانیدا گەیشتە هەشت ملیۆن و (٧٠٠) هەزار كەس و بەم جۆرەش بەش دەكرێن

| ناوی وولآت | ژمارەی قوربانیان | ناوی وولآت | ژمارەی قوربانیان |
|---|---|---|---|
| ئەڵمانیا | ١٩٥٠٠٠٠ كەس | ڕووسیا | ١٧٠٠٠٠٠ كەس |
| فەرەنسا | ١٣٩٠٠٠٠ كەس | نەمسا و هەنگاریا | ١٠٠٠٠ كەس |
| بەریتانیا | ٧٨٠٠٠٠ كەس | ئیطالیا | ٥٠٠٠٠٠ كەس |
| صربیا | ٤٠٠٠٠٠ كەس | توركیا | ٤٠٠٠٠٠ كەس |

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢١٥) باب: إذا تواجه المسلمان بسيفهما، برقم: (٢٨٤٥).

(٢) مسند الإمام أحمد (٦/ ٢٢٢) برقم: (٣٦٩٥).

وا دەرکەوتووە کە ژمارەی قوربانیەکان لە هەر سەردەمێکی تازەدا تا ڕاددەیەك زیادی کردووە، زیانی مرۆڤ لە سەدەی هەژدەهەم گەیشتە (١٦) ملیۆن، بەڵام تەنها لە شەڕی دووەمی جیهانیدا لە (٣٦) ملیۆن کەس زیاتر بووە.

پێشەوا حوزەیفەی کوڕی یەمان (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مِنِ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ خَصْلَةً : إِذَا رَأَيْتُمُ النَّاسَ .. وَاسْتَخَفُّوا الدِّمَاءَ)[١].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر حەفتاو دوو تایبەتمەندە، هەر کاتێك خەڵکانێکتان بینی... خوێنیان بەلاوە شتێکی سوك و لاوەکی بوو.

پێشەوا عابیسی غەفاری (ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (بَادِرُوا بِالْمَوْتِ سِتًّا: إِمْرَةَ السُّفَهَاءِ، وَكَثْرَةَ الشُّرَطِ، وَبَيْعَ الْحُكْمِ، وَاسْتِخْفَافًا بِالدَّمِ، وَقَطِيعَةَ الرَّحِمِ، وَنَشْوًا يَتَّخِذُونَ الْقُرْآنَ مَزَامِيرَ يُقَدِّمُونَهُ يُغَنِّيهِمْ ، وَإِنْ كَانَ أَقَلَّ مِنْهُمْ فِقْهًا)[٢].

واتە: دەست پێشخەری بکەن بە چاکە پێش ئەوەی شەش شت ڕوو بدات و بێتە پێشەوە: دەسەڵات کەوتنە دەست کەسانی بێ نرخ زۆربوونی پۆلیس و فرۆشتنی حوکمبە سوك سەیرکردنی خوێن ڕشتن و پچراندنی پەیوەندی خزمایەتی و پەیدابوونی کەسانێکی تازە پێگەیشتوو کە قورئان دەکەنە ئامێر بۆ ئاوازەکانیان، کەسێکیان پێش دەخەن بۆ پێش نوێژی کە تەنها بە ئاوازی خۆش قورئانیان بۆ بخوێنێت هەر چەندە لە هەمووشیان زانیاری و تێگەیشتنی لە ئایین کەمترە.

هیچ گومانی تێدا نیە لەو سەردەمەی ئێستادا خوێن ڕشتن لای خەڵکی گەلێك بێ نرخ بووە، کەسانێکی خراپ هەڵدەستن بە ناوی ئیسلام خۆیان دەتەقێننەوەو

---

(١) ضعيف: حلية الأولياء، لأبي نعيم (٣/ ٤١٠)، بە ژمارە (٤٥٥٥). حديث مرفوع، غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ وهو ضعيف كما قال الحافظ العراقي ( ٢٩٧/٣).

(٢) صحيح: مسند الإمام أحمد (٣/ ٤٩٤) برقم: (١٦٠٤٠)، والطبراني في (الكبير) (١٨/ ٣٦/ ٦١) وقال الأرناؤوط: حديث صحيح.

لەناو موسڵمانان وادەزانن شتێکی باشیان ئەنجام داوە، یان یەکێك بە سەیارە خۆی لە یەکێك دەدات و دەیکوژێت زۆر لای ئاساییەو دەڵێ قەزاو قەدەرە.

بۆسنەو هرسك و شیشان و کۆسۆڤۆ و کشمیر و فەلەستین و چەندان وڵاتی تر هەریەکەو بە دەست ستەمکارێکەوە دەناڵێنن، بە دەیان هەزار موسڵمان جینۆساید کران لە دوای نەمانی خیلافەتی عوسمانیەوە تا ئەمڕۆ نۆ جار قەسابخانە بۆ موسڵمانانی بەلقان دانراوە بۆ ئەوەی ڕق و قینی پەنگ خواردوویان بە موسڵمانان بڕێژن، لە سەردەمی تیتۆ کە جوولەکە بوو، ئەو کات حوکمی یوگسلافیای دەکرد و، نزیکەی (٧٥٠٠٠٠) هەزار موسڵمانی شەهید کرد.

سەرژمێریەکی کوژراوانی خەڵکی عێراق لە دوای ڕووخانی سەدام :

ساڵی ٢٠٠٣ (١٢١٢٣) کەس کوژراون.

ساڵی ٢٠٠٤ (١١٦٣٦) کەس.

ساڵی ٢٠٠٥ (١٦٥٨٣) کەس.

ساڵی ٢٠٠٦ (٢٩٤٥١) کەس.

ساڵی ٢٠٠٧ (٢٦٠٣٧) کەس.

ساڵی ٢٠٠٨ (١٠٢٧١) کەس.

ساڵی ٢٠٠٩ (٥٣٧٣) کەس.

ساڵی ٢٠١٠ (٤١٦٧) کەس.

ساڵی ٢٠١١ (٤١٥٣) کەس.

ساڵی ٢٠١٢ (٤٦٢٢) کەس.

ساڵی ٢٠١٣ (٩٨٥١) کەس.

ساڵی ٢٠١٤ (٢٠١٦٩) کەس.

ساڵی ٢٠١٥ (١٧٥٠٢) کەس.

ساڵی ٢٠١٦ تا مانگی حوزەیران (٧٩٥٤) کەس.

# نەمانی هۆشی خەڵکی وە پەیدابوونی کەسی کەم نرخ و تێکپرژانی موسڵمانان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر پەیدابوونی کەسی کەم نرخ و نەمانی هۆشی خەڵکە..

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (أَنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ الْهَرْجَ، قِيلَ: وَمَا الْهَرْجُ؟ قَالَ: الْكَذِبُ وَالْقَتْلُ، قَالُوا: أَكْثَرُ مِمَّا نَقْتُلُ الآنَ، قَالَ: إِنَّهُ لَيْسَ بِقَتْلِكُمُ الْكُفَّارَ، وَلَكِنَّهُ قَتْلُ بَعْضِكُمْ بَعْضًا حَتَّى يَقْتُلَ الرَّجُلُ جَارَهُ، وَيَقْتُلَ أَخَاهُ، وَيَقْتُلَ عَمَّهُ ، وَيَقْتُلَ ابْنَ عَمِّهِ، قَالُوا : سُبْحَانَ اللهِ ومَعَنَا عُقُولُنَا؟ قَالَ: لاَ، إِلاَّ أَنَّهُ يَنْزِعُ عُقُولَ أَهْلِ ذَاكُم الزَّمَانِ حَتَّى يَحْسَبَ أَحَدُكُمْ أَنَّهُ عَلَى شَيْءٍ وَلَيْسَ عَلَى شَيْءٍ)[(١)].

واتە: لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی کوشتن ڕوودەدات مەبەستیش کوشتنی کافران نیە بە دەستی ئێوە، بەڵکو یەکتر کوشتنە لە نێو خۆتاندا، تا وای لێ دێت پیاو دراوسێ و براو مام و ئامۆزای خۆی دەکوژێت گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ئەو ڕۆژە ئێمە عەقڵمان هەیە؟ فەرمووی: خەڵکی ئەو کاتی عەقڵ و هۆشیان نامێنێ، خەڵکێکی پوك دەبنە جێنشینیان و زۆربەیان وا دەزانن لەسەر ئاینێکن بەڵام لەسەر هیچ نین .

بەڵێ.. لەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆمان دەردەکەوێت کە عەقڵی زۆربەی خەڵکی ئەم سەردەمە هەڵگیراوە، کەسانێك ماونەتەوە هەموو شتێك دەزانن تەنها شەڕی خوا نەبێت، وە شوێن هەموو ڕێچکەو ڕێبازێك دەکەون تەنها ئیسلام نەبێت، وە هەموو شتێك لە دڵیاندا هەیە تەنها ترسی خوا نەبێت، هەر بۆیە لەناو خۆیاندا کوشتن و کوشتارو خوێن ڕشتنی بە ناهەق بووەتە ڕەفتارو پیشەی بەناو موسڵمانانی

---

(١) مسند الإمام أحمد (٤/ ٤٠٦) برقم: (١٩٦٥٣).

بەرگی دووەم

ئەو سەردەمە، هەروەها بکوژو کوژراویش بە پێی فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لە ئەهلی دۆزەخە، لە بەرامبەر ئەوەشدا هەر موسڵمانێك ئەگەر توانی با خۆی دووره پەرێز بگرێت و واز لە فیتنەو کوشتنەکە بهێنیت و عیبادەتی خوا بکات.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووی: (الْعِبَادَةُ فِي الْهَرْجِ كَهِجْرَةٍ إِلَيَّ)[1].

واتە: بەندایەتی کردن بۆ خودا لەکاتی فیتنەی هەرەج و کوشتندا هێندەی کۆچکردنێك بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) خێری هەیە.

کەواتە فەرموودەکان بە ڕوون و ئاشکرایی باس لە کوشتاری موسڵمانان دەکەن لە نێوان خۆیاندا، موسڵمانان ئەمرۆ لەناوخۆیاندا بوون بە (١٠٠٠) بەرە، هەر کۆمەڵەو خۆی بەشت دەزانێت و کۆمەڵەکانی تر بە هیچ، بەشی زۆری ئەو خەڵکەش عەقڵ و هۆشی بە دەستی خۆی نەماوە، هەریەکەو لە ژێر ئاڵاو دروشم و ڕەنگ و ناوێکی تایبەتدا شەڕ لەگەڵ ئەوی تردا دەکات، لە پێناوی بێ نرخترین شت یەکتر دەکوژن بۆیە خوێن بووە بە بێ نرخترین شت لە لای خەڵکیەوە.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عومەر(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (من أشراط الساعة أن تعزب العقول، وتنقص الأحلام، ويكثر القتل، وترفع علامات الخير، وتظهر الفتن)[2].

واتە: لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر خەڵك بیروهۆشی لای خۆی نامێنێت و خەونەکان بە با دەچن و کوشتن زۆر دەبێت و، وە نیشانەکانی خێر هەمووی هەڵدەگیرێ و فیتنە سەرهەڵدەدات.

پێشەوا ئەبو ئەعلەبەی خوشەنی(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (إن من أشراط الساعة أن تنتقص العقول، وتعزب الأحلام، ويكثر الهم)[3].

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٦٨) باب: فضل العبادة في الهرج، برقم: (٢٩٤٨).

(٢) ضعيف: رواه الطبراني ، وفيه عافية بن أيوب وهو ضعيف. برقم: (١٢٤٦٤)

(٣) رواه نعيم بن حماد في «الفتن» من حديث كثير بن مرة مرسلاً مثله.

له نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر خەڵك بیروهۆشی لای خۆی نامێنێت و خەونەکان بە با دەچن و غەم زۆر دەبێت...

پێشەوا ثەوبان(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (إِنَّ اللهَ زَوَى لِي الْأَرْضَ، فَرَأَيْتُ مَشَارِقَهَا وَمَغَارِبَهَا، وَإِنَّ أُمَّتِي سَيَبْلُغُ مُلْكُهَا مَا زُوِيَ لِي مِنْهَا، وَأُعْطِيتُ الْكَنْزَيْنِ الْأَحْمَرَ وَالْأَبْيَضَ، وَإِنِّي سَأَلْتُ رَبِّي لِأُمَّتِي أَنْ لَا يُهْلِكَهَا بِسَنَةٍ عَامَّةٍ، وَأَنْ لَا يُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ سِوَى أَنْفُسِهِمْ، فَيَسْتَبِيحَ بَيْضَتَهُمْ، وَإِنَّ رَبِّي قَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنِّي إِذَا قَضَيْتُ قَضَاءً فَإِنَّهُ لَا يُرَدُّ، وَإِنِّي أَعْطَيْتُكَ لِأُمَّتِكَ أَنْ لَا أُهْلِكَهُمْ بِسَنَةٍ عَامَّةٍ، وَأَنْ لَا أُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ سِوَى أَنْفُسِهِمْ، يَسْتَبِيحُ بَيْضَتَهُمْ، وَلَوِ اجْتَمَعَ عَلَيْهِمْ مَنْ بِأَقْطَارِهَا أَوْ قَالَ مَنْ بَيْنَ أَقْطَارِهَا حَتَّى يَكُونَ بَعْضُهُمْ يُهْلِكُ بَعْضًا، وَيَسْبِي بَعْضُهُمْ بَعْضًا)[1].

واتە: خودا زەوی بۆ وێك هێنامەوە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواکانم بینی، وە موڵکی ئومەتی منیش هەموو ئەو شوێنانە دەگرێتەوە کە من بینیم، وە هەردوو گەنجینەی سوور و سپیشم پێ بەخشراوە، وە داوام لە خودای باڵا دەست کرد بۆ ئومەتەکەم کە بە گرانیەکی سەرتاپا لە ناویان نەبات، وە دوژمنێکی بێجگە لە خۆیان بەسەردا زاڵ نەکات کە هەتکیان بکات و لە ناویان بەرێت، خوای گەورەش فەرمووی: ئەی موحەممەد(ﷺ) من کە کارێکم قەزا کرد قەزاکەم ڕەت ناکرێتەوە، وە من ئەوەم داوە بە ئومەتەکەت کە بە گرانیەکی سەرتاپا لە ناویان نەبەم، وە دوژمنێکیان بەسەردا زاڵ نەکەم بێجگە لە خۆیان کە هەتکیان بکات و لە ناویان بەرێت، ئەگەر هەموو مەملەکەتەکانی دونیاش لەسەریان کۆببنەوەو پەلەماریان بدەن هەتا ئەوە نەبێت کە خۆیان یەکتر لە ناو خۆیاندا لە ناو بەرن و خۆیان هەتکی ناموسی یەکتر بکەن.

لەم فەرموده بۆمان دەردەکەوێت کە ئومەتی ئیسلام هەرگیز دوژمنانی ناتوانن لە ناوی بەرن و زەفەری پێ ببەن، بەڵکو هەرچی نەهامەتی و لاوازی و بە هەلاکەت چوونی هەیە هەمووی لە ڕێی ناکۆکی و دووبەرەکی و شەڕ

---

(١) صحیح مسلم (٤/ ٢٢١٥) كتاب: الفتن/ باب: هلاك هذه الأمة، برقم: (٢٨٨٩).

و کوشتاری ناو خۆیانەوە دوچاری دەبن، وە لەم سەردەمە بە چاوی خۆمان دەبینین کە موسڵمانان شەڕ و کوشتاریان لەناو خۆیانەوە بەرپا بووەو خوێنی یەکتری دەڕێژن و بە حەڵاڵی دادەنێن، ئەگەر چاوێك بە مێژووی ئیسلامدا بخشێنین دەبینین کە هۆکاری ڕووخاندنی هەموو دەوڵەتە ئیسلامیەکان شەڕو کوشتار و ئاشوبی ناوخۆ بووە، وە دوژمنانی ئیسلام لە کاتێکدا فرسەتیان لە ئومەتی ئیسلام هێناوە کە زانیویانە لەناو خۆیاندا دووبەرەکی و ناکۆکیان تێدایە، وە لە هەر کات و شوێنێکدا موسڵمانان توانیبێتیان ناکۆکی و دووبەرەکی ناوەخۆ وەلا بنێن ئەوا خوای گەورە بەسەر دوژمنانیاندا سەری خستون و زاڵی کردوون، دوژمنانی ئیسلام هەر چەند هێزو دەسەڵاتیان هەبوو بێت، بەڵام هەمیشە لە ڕووبەرووبوونەوەی چەکداری لەگەڵ موسڵماناندا شکاون ، تەنها لەو کاتانەدا نەبێت کەوا موسڵمانان لە نێو خۆیاندا ناکۆك بوون، زۆربەی زۆری لە ڕاگەیانەکان بینیمان کە گەورەترین تواناو دەسەڵاتی سەربازی ئەم سەردەمە کە خۆی لە یەکێتی سۆڤیەتی شیوعیدا دەنواند، لە بەردەم گەلێکی ڕەش و ڕووتی موسڵمانی وەك گەلی ئەفغانی بە چۆکدا هات و شکا، یان ڕووسەکان نەیانتوانی بەرامبەر شیشانیەکان بوەستن هەر چەندە ژمارەی ڕووسەکان (دە) قاتی شیشانیەکان بوو، بەڵام ئەمە قەدەری خودایە کەوا دەبێت ئاینە پیرۆزەکەی خۆی سەربخات.

پێشەوا عامری کوری سەعید(ﷺ) ئەویش لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (سَأَلْتُ رَبِّي ثَلَاثًا، فَأَعْطَانِي ثِنْتَيْنِ وَمَنَعَنِي وَاحِدَةً، سَأَلْتُ رَبِّي: أَنْ لَا يُهْلِكَ أُمَّتِي بِالسَّنَةِ فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُهُ أَنْ لَا يُهْلِكَ أُمَّتِي بِالْغَرَقِ فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُهُ أَنْ لَا يَجْعَلَ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ فَمَنَعَنِيهَا)[١].

واتە: داوای سێ شتم کرد لە خودای باڵا دەست، ئەویش دوانی پێ بەخشیم بەڵام ئەوەی تریانی پێنەبەخشیم، داوام لە خودا کرد کە سەرتاپای ئومەتەکەم بە گرانی لەناو نەبات، ئەویش پێی بەخشیم، وە داوام لێ کرد کە ئومەتەکەم سەرتاپا

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢١٦) باب: هلاك هذه الأمة، برقم: (٢٨٩٠).

بە لافاو لەناو نەبات، ئەویش پێی بەخشیم، وە داوام لێ کرد کە ئومەتەکەم خۆیان لەناو خۆیاندا یەکتر لەناو نەبەن ، بەڵام ئەمەیانی پێ نەبەخشیم.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (إِذَا التقى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا، فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ)[١].

واتە: ئەگەر دوو موسڵمان کەوتنە بەرامبەر یەکتری و شەڕیان کرد بە چەکەکەیان ئەوا کوژەرو کوژراو لەناو ئاگرە.

لەم سەردەمە دەبینین بە هۆی ئەم کۆمەڵ کۆمەڵ و هەریەکێ بەناوێکەوە ئاشوب و فیتنەیەك بەرپابووە هەر ڕۆژێ هەزار کەس گیانی خۆی لە دەست دەدا لە پێناوی یەکێ لەو ناوانە بێ ئەوەی کوژراوو بکوژ یەکتری بناسن یان لەوەو پێش هیچ ناکۆکیەکیان هەبێ.

**نمونەشمان زۆرە دەربارەی ئەم فیتنانە بەڵام تەنها بە کورتی ئاماژەیان پێ دەکەم وەکو:**

١- کوژرانی پێشەوا عوسمانی کوڕی عەفان و لێکدابڕانی ئومەت..

ڕۆژێکیان عەبدوڵلای کوڕی حەکیم لەناو ئەڵقەیەکی قوتابیەکانیدا گوتی: جارێکی تر هەرگیز هاوکاری ناکەم لە ڕشتنی خوێنی خەلیفەدا.. قوتابیەکانیش چاویان ئەبڵەق بوو گوتیان:

بۆچی تۆ دەستت هەبووە لە ڕشتنی خوێنی پێشەوا عوسمان(ﷺ)؟

عەبدوڵلای کوری حەکیم گوتی: من وا دەبینم باسکردنی کەم و کوڕی کەسێك لە ناو خەڵکیدا وەك خوێن ڕشتن وایە.

بەڵێ.. عەبدوڵلای کوری حەکیم پێشەوا عوسمانی (ﷺ) زۆر خۆشدەویست، هەروا لە نیەتی خێرەوە باسی هەندێ شتی کرد کە بە لای ئەوەوە کەم و کوڕی بوون، ناحەزانیش ئەو قسەیان قۆستەوەو فیتنەو ئاشوب هەڵگیرساو بە ناهەق (پێشەوا عوسمان) شەهید کرا .

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢١٤) باب: إذا تواجه المسلمان بسيفهما، برقم: (٢٨٨٨).

ئەوەی جێی خەفەت و داخە هەندێ لەوانەی كە لەو فیتنەدا بەشداری دەكەن وا دەزانن بۆ خودای گەورە دەكەن، عەمری كوڕی حومق كە (٩) خەنجەری لە سنگی پێشەوا عوسماندا (ﷺ) دەیگوت: سێ خەنجەرم لەبەر خودا لێداوەو شەشیشیان لەبەر ئەو ڕقەی كە لە دڵمدا بوو.

بەڕاستی خەڵكی زۆربەی گیرەوەری زمانن، بۆیە وشیاری پێویستەو ئەبێ باش بزانین جاری وا هەیە تاقە وشەیەك كە خودا پێی خۆش نیەو قسەكار گوێی پێ نادات دەبێتە مایەی بەتاڵ بوونەوەی كاری ئەو قسە.

٢- فیتنەی خەواریجەكان ئەمەشیان لەمەوپێش ئاماژەمان پێكرد .

٣- شەهید كردنی پێشەوا عەلی ئەمەشیان لە مەوپێش ئاماژەمان پێكرد .

٤- شەهید كردنی پێشەوا حوسەین ئەمەشیان لە مەوپێش ئاماژەمان پێكرد .

٥- جەنگی (صفین) لە نێوان سوپای پێشەوا عەلی و موعاویە ئەمەشیان لەمەوپێش ئاماژەمان پێكرد، وەچەندان نمونەی تر دەربارەی فیتنە و ئاشوب، بەڵام كات بۆمان نارەخسێ ئەوەندەیان لێ باس بكەین.

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَيَأْتِيَنَّ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ لَا يَدْرِي الْقَاتِلُ فِي أَيِّ شَيْءٍ قَتَلَ، وَلَا يَدْرِي الْمَقْتُولُ عَلَى أَيِّ شَيْءٍ قُتِلَ)[1].

واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە سەردەمێك بەسەر خەڵكی دادێت بكوژ نازانێ بۆچی خەڵك دەكوژێت كوژراویش نازانێ لەسەر چی كوژراوە .

لێرەدا مەسەلەیەكی گرنگ هەیە حەزدەكەم ئاماژەی پێ بكەم ئەویش ئەوەیە كە هەندێك لە موسڵمانانی ئەمڕۆ ئەم فەرموودانە دەكەن بە بیانوو بۆ خۆ دزینەوە لە جیهادی كافر و تاغوتان و ئەو ڕژێمە ستەمكارانەی كە ئەمڕۆ بە زەبری ئاگرو ئاسن حوكمی خوایان پشت گوێ خستووە یاسا دەستكردەكانیان

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٣١) باب: لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل، برقم: (٢٩٠٨).

بەرگی دووەم

بەسەر گەلانی موسڵماناندا چەسپاندووە، وە سوکایەتی بە هەموو پیرۆزەکانی ئیسلام و موسڵمانان دەکەن، بە بیانووی ئەوەی کە جیهاد کردن لەگەڵیاندا لە ڕیزی ئەو فیتنانەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) نەهی لێ کردووە، چونکە لە ڕیزی ئەوانیشدا نوێژکارو موسڵمان هەیە، بێ ئاگا لەوەی کە گەورەترین فیتنە پشت گوێ خستنی حوکمی خوا و کارنەکردن بە شەریعەتی ئیسلامە کە جیهادی ئەو تاغوتانەی پێ دەبێت بە فەرزی عەین لەسەر هەموو موسڵمانان هەتا حوکمی خوا دەگێڕنەوە.

# ڕاپەڕین لە دژی دەوڵەت

لە نیشانە بچوكەكانی كۆتایی بونەوەر زۆربوونی ڕاپەڕین و ڕۆیشتنی بە كۆمەڵە..

ڕاپەڕین بە درێژایی مێژوو بوونی هەبووە، هەندێك جار بە نەرموو نیانی بووە، هەندێك جاریش بە شەڕو ئاژاوە بووە..

ڕاپەڕین لە ئیسلام چەند حوكمێكی شەرعی هەیە، هەیە كە واجبە، هەیە دروستەو، هەیە حەڕامە..

ئەوەی كە واجبە بۆ گۆڕینی مونكەرە، ئەمەش مەرجێكی هەیە كە دەبێت زانایان پێشەنگ بن لەم ڕاپەڕینە، چونكە ئەوان ڕێگا نیشاندەری ئەم ئوممەتەن، تەنانەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ:

(مَن رَأى مِنكُم مُنكَرَاً فَليُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَستَطعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَستَطعْ فَبِقَلبِهِ وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ)[1].

واتە: هەر كەسێك مونكەرێك و كارێكی نەشیاوی بینی با بە دەست بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی با بە زمان بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی با بە دڵ پێی ناخۆش بێت، كە ئەمەش بێهێزترین باوەڕیە..

وە گۆڕینی بە زمانیش لە دەسەڵاتی زانایانە..

جاری وەهاش هەیە دروستە لەسەر خستنی هەق و ڕاستی و سەرخستنی كەسی بێ هێز..

وە جاری وەهاش هەیە حەرامە ئەگەر زیانی زۆر بێت، هەروەها پاڵپشتی ناهەقی بكرێت و كەسی ستەمكار سەربخەیت..

---

(١) صحيح مسلم، كتاب: الإيمان، باب: بيان النهي عن المنكر من الإيمان وأن الإيمان يزيد وينقص وأن الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر واجبان، رقم: (٤٩).

پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی ئەوەی پێداوین کە لە کۆتایی بونەوەر ئەمە سەرهەڵدەدات، بۆیە بە یەکێك لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی هەژمارکراوە کە دەفەرمویٚ: (ثلاث إذا رأيتهن فعند ذلك تقوم الساعة خراب العامر وعمار الخراب وأن يكون الغزو نداءً)[١].

واتە: سیٚ نیشانە هەن هەر کاتێك بینیتان ئەو کات چاوەڕیی هاتنی ڕۆژی دوایی بن:

ئاوەدانیەکان تێك دەدرێن

وە تێکدراوەکان ئاوەدان دەکرێنەوە

وە جەنگیش بە هاوارکردن دەبێت..

وشەی (نداءً) بە واتای دەنگ بەرزکردنەوەی ئەوانە دەوترێت کە ڕاپەڕین دەکەن و داوای مافەکانی خۆیان دەکەن.

وە وشەی (ڕاپەڕین) لە قورئاندا هاتووە کە خوای گەورە لە سیاقی سەرخستنی کاری نارەوا دەفەرمویٚ: [تَظَٰهَرُونَ عَلَيۡهِم بِٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ][٢].

واتە: بە پشتیوانی خەڵکانێکی تر دژیان دەوەستن و دەست درێژی دەکەنە سەریان[٣]..

ئایا ئەگەر پێشەوای موسڵمانان ستەمکارو گوناهکار بێت ڕاپەڕین لە دژی ئەو (revolt) دروستە یان نە؟

لەم مەسەلەیەدا ئەهلی سوننە تیۆری دژ بەیەکیان هەبووە:

---

(١) ضعيف: موسوعة الأحاديث والآثار الضعيفة والموضوعة (١٥/ ٤٢٨) برقم: (٨٦٣٣). وقال الألباني: ضعيف.

(٢) سورة البقرة: (٨٥).

(٣) تەفسیری ڕامان لا ٢٩.

گروپی گەورەی فەرموودەناس (أهل الحديث) کە تەنها لە ڕێگەی زمانەوە لە دژی ستەم و ستەمکاری ئەو دەنگ بەرز بکرێتەوە لە بەرامبەر ئەوەدا وتەی هەق بگوترێت، بەڵام نابێ ڕاپەڕین بکرێت تاوەکو خوێنرێژی بەربڵاو نەبێت[١].

بەڵام پێشەوا ئەبو حەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) بڕوای وابوو کە پێشەوایەتی ستەمکار نە تەنها بەتاڵە، بەڵکو ڕاپەڕین پێویستەو دەبێ لەدژی ئەو ڕاپەڕین ئەنجام بدرێت، بە مەرجی ئەوەی شۆڕشێکی بە سوودو سەرکەوتووبێ، لە جێگەی ستەمکارو گوناهکاردا مرۆڤێکی دادپەروەر جێگیر بکرێت و ئەنجامی ڕاپەڕینەکە تەنها نەبێتە هۆی لەناوچوونی گیان و هێزەکان، وە فەرمان بەچاکەو پشتگیری لە خراپە سەرەتا لە ڕێگەی زمانەوە فەرزە بەڵام ئەگەر ڕێگەی ڕاستی نەگرتە بەر کەواتە بەکارهێنانی شمشێر پێویستە[٢].

لە جێگەیەکی تردا ئەو بەگێڕانەوەی پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی موبارەك (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) وتەی خودی پێشەوا ئەبو حەنیفەی گێڕاوەتەوە کە ڕووداوەکە پەیوەندی بە کاتێکەوە هەیە کە لە سەردەمی خەلیفەی عەباسی خراپەو ستەمکاریەکانی ئەبو موسلیمی خۆراسانی گەیشتبووە چلەپۆپە، لەو سەردەم (ئیبراهیم صانع)ی شارەزای خۆراسان هاتە لای پێشەوا و لەسەر مەسەلەی فەرمان بەچاکەو پێشگیری لە خراپە لەگەڵ ئەودا دەستی بە گفتوگۆ کرد...

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی موبارەك دەڵێت:

کاتێ ئێمە لەسەر بابەتی فەرمان بەچاکەو پێشگیری لە خراپە ڕێککەوتین کە فەرزە..

ئیبراهیم خێرا گوتی: دەستت بێنە با من لەگەڵ تۆدا بەیعەت بکەم.. بە بیستنی ئەم وتەیە جیهانی ڕۆشتن لەبەر چاومدا تاریك بوو..

---

(١) مقالات الإسلاميين (٢/ ١٢٥).

(٢) أحكام القرآن، (١/ ٨١).

ئیبنو موبارەك دەڵێت: كە پێم گوت بۆچی؟

گوتی: ئەو منی بەرەو هەقێكی پەروەردگار بانگكردو من لەوەرگرتنی خۆم پاراست، سەرەنجام من پێمگوت:

ئەگەر كەسێ بەتەنیایی بۆ ئەو هەڵسێتەوە دەكوژرێ و خەڵكیش هیچیان پێناكرێ.. هەڵبەتە ئەگەر صاڵحان و یارمەتیدەرانیان لەگەڵ ئەودا دەستی یەكێتی و هاوكاری بدەنە دەست كەسێك و بۆ سەرۆكایەتی هەڵیبژێرن كە لەمامەڵەدا جێگەی متمانەیان بێت، كەواتە ئیتر شتێك رێگر نابێت..

ئەگەر كەسێك بەتەنها بۆ ئەوە راپەرێت گیانی دەكەوێتە مەترسیەوەو من لەوە دەترسم كە ئەوە یارمەتیدانی خۆكوژی بێت كاتێ كە ئەو زایە دەبێت لە هیممەت و جورئەتی ئەوانی تریش بەهۆی كاریگەری ئەم مەترسیەوە كەم ببێتەوە[1].

بۆچوونی راستەقینەی پێشەوا بە روونی ئاشكرا دەبێت، بەڵام بۆچوونی تەواوی ئەو تا ئەو كاتە بۆ ئێمە رۆشن نابێتەوە كە نەزانین راپەرینێكی گرنگ كە لەو سەردەمەدا روویدا چۆن بوو؟

پێشەوا لە بەرامبەری ئەوەوە چەند بۆچوون و رەوشێكی گرتە بەر لەوانە: راپەرینی زەیدی كوڕی عەلی و راپەرینی (نفس الزكیه)و..هتد.

---

(١) أحكام القرآن (٢/ ٣٩).

## پەیدابوونی بەناو قورئانیەکان

پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی ڕاگەیاندووین کە لە کۆتایی بونەوەر کۆمەڵانێك پەیدا دەبن، ڕۆڵێکی مەزنیان لە لێك ترازان و پەرتەوازەبوونی ئومەتی ئیسلامی دەبێت، چونکە ئەوانە بانگەشەی زانست دەکەن و لە پەرستشدا کۆشش دەکەن بۆ کتێبی خودا، بەڵام نەفام و نەزانن حوکمەکانیان زۆر ستەمە، ڕاو بۆ چونیان کورتەو خوێنی ئەو موسڵمانانە دەڕێژن کە لەگەڵیان جیاڕان، هاوەڵان و زانایان بە نەفام و نەزان دادەنێن.

لەم سەردەمە ئەم دیاردەیە بڵاوترین دیاردەیە لە ناو خەڵك، ئەوان پشت دەکەنە دینی خوداو واز دێنن لە ڕەوشتە قورئانیەکان.. ئەم جۆرە کەسانە ئەوانەن کە دەڵێن: ئێمە ئەوەی لە قورئاندا بێت وەریدەگرین و بەس، پێویستیمان بە فەرموودە نیە..

پێشەوا میقدامی کوڕی مەعدی کەریبی کیندی(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (يُوشِكُ الرَّجُلُ يَتَّكِئُ عَلَى أَرِيكَتِهِ يُحَدِّثُ بِحَدِيثٍ مِنْ حَدِيثِي فَيَقُولُ: بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ كِتَابُ اللَّهِ، فَمَا وَجَدْنَا فِيهِ مِنْ حَلَالٍ اسْتَحْلَلْنَاهُ وَمَا وَجَدْنَا فِيهِ مِنْ حَرَامٍ حَرَّمْنَاهُ، أَلَا وَإِنَّ مَا حَرَّمَ رَسُولُ اللَّهِ مِثْلُ مَا حَرَّمَ اللَّهُ)[1].

واتە: ڕۆژگارێك نزیکە کەوا کەسێك دانیشتبیٚ لە شوێنی خۆی و وتەیەکم بگێڕدرێتەوە ئەویش دەڵێت: نێوانی ئێمەو ئێوە قورئانە (واتە: قورئانمان بەسە) هەرچی تێدا حەڵاڵ بوو حەڵاڵی دەکەین، هەرچیشی تێدا حەڕام بوو حەڕامی دەکەین، (ئەنجا پێغەمبەر(ﷺ) ئاگادارمان دەکاتەوە کە دەفەرمویٚ:) ئەوەی پێغەمبەری خوا حەڕامی بکات وەکو ئەوەیە کە خوای گەورە حەڕامی بکات.

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٤/ ١٣٢) بە ژمارە (١٧٢٣٣). قال شعيب الأرناؤوط: حديث صحيح.

ئەگەر سەیری وشەی (الا) بکەین لە زمانی عەرەبی پێی دەوترێ: (الا)ی تەنبیە، واتە: بۆ ئاگادارکردنەوەیە.

ئەگەر سەیری ئەم سەردەمەی خۆمان بکەین ئەوکات بۆمان دەردەکەوێت کە کەسانێك پەیدا بوونە ئینکاری سوننەت دەکەن، هەیانە ئینکاری فەرموودەی مێشوڵە دەکات، هەیانە ئینکاری سیواك دەکات، هەیانە گاڵتە بە فەرموودە دەکات، هەیانە بوخاری و موسلیم بە درۆ ناودەبات...

لە کۆتایی دونیا خەڵکی چاویان ئایەتە ڕوون و ئاشکراکان نابینن، وە حوکمیش دەکەن بە جگە لەوەی خودا دایبەزاندووە، قەزاو قەدەری خوداش بە درۆ دەزانن، وە بۆ ڕوپامایی خودا دەپەرستن و دین بەکار دێنن بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان، بەمەش مەبەستیان تەنها ڕووی خودا نیە، وە ئەم سیماو نیشانانەش پێغەمبەر(ﷺ) بۆمانی ئاشکرا کردووە لە پێش چواردە سەدە.

ڕۆژێك دێت بەسەر خەڵکی کە هیچ لە قورئاندا نامێنێتەوە جگە لە ڕووخساری دەرەوەی و هیچیش لە ئیسلام نامێنێتەوە جگە لە ناوەکەی و خۆشیان بە موسڵمان دادەنێن، کەچی ئەوان خەڵکێکن دوورن لە ئیسلامەوە.

کاتێك دێت بەسەر ئومەتەکەم مزگەوتەکان پڕ دەبن لە خەڵك، بەڵام پێشڕەویان نابێت، وە یەکێك لە گرنگترین نیشانەکانی ڕۆژی دوایی کاتێك دێت کە ئایەتەکانی قورئان وەلا دەنرێت و پڕوپوچ گەری جێگەی ئەوان دەگرێتەوە.

بە کورتی و بە کوردی:

سەرەتای دروست بوونی بیرۆکەی ئەم بەناو قورئانیانە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خەواریجەکان، کە فیتنەیەکیان دروست کرد، دواتر پێشەوا عەلی و پێشەوا موعاویە (ڕەزای خوایان لێ بێ) هەوڵیاندا فیتنەکە کۆتایی پێ بێنن ئەوەبوو دادوەریان دانا، ئەنجا خەواریجەکان ڕازی نەبوون و گوتیان: حوکم بەس بۆ خوایەو بەس قورئان حەکەمە لە نێوانمان و ڕازی نین بە قسەی هیچ کەسێك، وەکو بەناو قورئانیەکانی ئەو سەردەمەی ئێستا.. بۆیە پێشەوا عەلی فەرمووی: وتەیەکی ڕاستە بەڵام مەبەستیان بۆ ناڕاستی و فرت و فێڵە.

بەرگی دووەم

دوای خەواریجەکان کۆمەڵێکی گومڕا پەیدابوون ئەوانیش شیعە بوون، یەکەم کار کە ئەنجامیاندا ڕەتکردنەوەی فەرموودە بوو، وە بەپێی عەقڵ و هەواو ئارەزووی خۆیان تەفسیری ئایەتەکانی قورئانیان دەکرد، هەرچی ئایەت بوو تەئویلیان کرد بۆ فکرەی خۆیان وەکو ئەو بەناو قورئانیانە..

ئامانجی خەواریج و شیعە خزمەتکردن بە بێگانەو ڕووخاندنی ئیسلام بوو، بۆ ئەم مەبەستەش کار بۆ چەواشەکردنی موسڵمانان دەکەن لە ڕێگەی چەند کەسانێکی وەکو (عەدنان ئیبراهیم و محەممەد شەحرور.. هتد..) بۆیە قورئان لەم جۆرە کەسانە دوورە، هەروەها ئامانجێکی تریشیان هەیە ئەویش تانە دانە لەو کەسانەی کە ئایینی ئیسلامیان گەیاندووە بە ئێمە وەکو پێشەوایان بوخاری و موسلیم و ترمذی و نیسائی و ئیبنو ماجەو ئەبوداودە (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) وە ئامانجێکی تریان گومان دروستکردنە لە نێو دڵی خەڵکی.. دەڵێن: چۆن باوەڕ بکەین کە ئەم فەرموودانە بەڕاستی گەیشتوونەتە لای ئێمە؟

منیش پێیان دەڵێم: چۆن ئەم قورئانە بە دەستی کەسانی پاك گەیشتووەتە لامان فەرموودەش بەهەمان شێوە..

دەڵێن: خوای گەورە وەعدی پاراستنی قورئانی داوە!

منیش دەڵێم: خوای گەورە بە خۆی قورئانی بۆ ئێمە نەنوسیوەتەوە بەڵکو هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) نوسیویانەتەوە بۆمان، کەواتە خوای گەورە بە موسڵمانان قورئان دەپارێزێ و خۆشی یارمەتیان دەدات، بە هەمان شێوە بۆ پاراستنی قورئان خوای گەورە بە زانایانی فەرموودە ناسیش دەیپارێزێ، چونکە ئەگەر فەرموودە نەبوو ئەوا زۆربەی خەڵکی قورئان کەس لێی تێناگات.

وە محەممەد شەحروریش کە یەکێکە لە بەناوبانگترینیان باوەڕی بە فەرموودە نییە، بەڵام باوەڕی وایە کەوا کچ و کوڕ پێشی زەواج زیناش بکەن ئەوا زینا نییە.

# دینارو درهەم سوودیان لە خەڵکی زیاتر دەبێت

لە نیشانەکانی هاتنی کۆتایی بونەوەر، کەسانێك پەیدا دەبن ئەوەندە زۆر دەڵێن و ئاژاوە دروست دەکەن، تەنانەت دینارو درهەم سوودیان لەو جۆرە کەسانە زیاترە..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

(لَيَأْتِيَنَّ عَلَى النّاسِ زَمانٌ الزُّهدُ فِي النّاسِ أنفَعُ لَهُم مِنَ الزُّهدِ فِي الدَّنانيرِ وَالدَّراهِمِ)[1].

واتە: سەردەمێك دێت بەسەر خەڵکی دوورکەوتنەوە لە خەڵکی سوودی زیاترە لە دوور کەوتنەوە لە دینارو درهەم..

ئەمەش گەورەترین نیشانەو موعجیزەو بەڵگەیە لەم سەردەمە کە بەدی دەکەین و بە چاوەکانی خۆمان دەیانبینین.

بەرگی دووەم

(١) كنز العمّال (١١/ ١٥٣) برقم: (٣١٠٠٢) نقلًا عن الديلمي عن ابن عبّاس .

# پەیدابوونی خەڵکانێک کە گفتوگۆ دەکەن سەبارەت بە (متشابهات القرآن)

لە نیشانەکانی هاتنی کۆتایی بونەوەر، کەسانێك پەیدا دەبن گومان دەخەنە دڵی خەڵکی و باس لە (متشابهات القرآن) دەکەن..

پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) دەڵێت:

(سَيَأْتِي نَاسٌ يُجَادِلُونَكُمْ بِشُبُهَاتِ الْقُرْآنِ فَخُذُوهُمْ بِالسُّنَنِ، فَإِنَّ أَصْحَابَ السُّنَنِ أَعْلَمُ بِكِتَابِ اللَّهِ تَعَالَى)[1].

واتە: خەڵکانێك دێن گفتوگۆ لەبارەی (شبهات القرآن) دەکەن، ئێوەش دەست بگرن بە سوننەتی من، چونکە ئەوانەی دەستیان بە سوننەت گرتووە زاناترن بە قورئان.

ئەم جۆرە کەسانە بە بەردەوامی گفتوگۆ لە (متشابهات) دەکەن، تەنانەت بە دەرسیش دەیخوێنن..

دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت:

ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە [ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ ۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ ۗ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ] فەرمووی: (إِذَا رَأَيْتُمُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ، فَأُولَئِكَ الَّذِينَ سَمَّى اللهُ فَاحْذَرُوهُمْ)[2].

---

(١) ضعيف: سنن الدارمي (١/ ٢٤٠) باب: التورع عن الجواب، بە ژمارە (١٢١). أبو محمد عبد الله بن عبد الرحمن بن الفضل بن بَهرام بن عبد الصمد الدارمي، التميمي السمرقندي (المتوفى: ٢٥٥هـ) تحقيق: حسين سليم أسد الداراني، الناشر: دار المغني للنشر والتوزيع، المملكة العربية السعودية، الطبعة: الأولى، ١٤١٢ هـ قال المحقق: إسناده ضعيف لضعف عبد الله بن صالح وباقي رجاله ثقات.

(٢) صحيح البخاري (٦/ ٣٣) باب: آيات محكمات، برقم: (٤٥٤٧).

واتە: هەر کاتێك ئەو جۆرە کەسانەتان دیتنن کە بەدوای (متشابهات القرآن) دا دەگەڕێن، ئەوە بزانن: ئەوانە ئەو پیاو خراپانەن کە خودا لەم ئایەتەدا ناوی هێناون، خۆتان لەوان بپارێزن.

پێشەوا ئیبنو حەجەری عەسقەلانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: یەکەم جار گفتوگۆ کردن لە (متشابهات القرآن) لەناو چووەکان ئاشکرا کرا، ئینجا لەناو (خەواریج) شدا ئاشکرابوو[1].

ئەمەش گەورەترین نیشانەو بەڵگەیە لەسەر (خەوارج)ەکان کە لەم سەردەمەدا بە چاوی خۆمان دەیانبینین.

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەفەرموێ: (بَعَثَ عَلِيٌّ (ﷺ)، وَهُوَ بِالْيَمَنِ بِذَهَبَةٍ فِي تُرْبَتِهَا، إِلَى رَسُولِ اللهِ(ﷺ) فَقَسَمَهَا رَسُولُ اللهِ(ﷺ) بَيْنَ أَرْبَعَةِ نَفَرٍ: الْأَقْرَعُ بْنُ حَابِسٍ الْحَنْظَلِيُّ، وَعُيَيْنَةُ بْنُ بَدْرٍ الْفَزَارِيُّ وَعَلْقَمَةُ بْنُ عُلَاثَةَ الْعَامِرِيُّ ثُمَّ أَحَدُ بَنِي كِلَابٍ، وَزَيْدُ الْخَيْرِ الطَّائِيُّ، ثُمَّ أَحَدُ بَنِي نَبْهَانَ، قَالَ: فَغَضِبَتْ قُرَيْشٌ، فَقَالُوا: أَتُعْطِي صَنَادِيدَ نَجْدٍ وَتَدَعُنَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ): إِنِّي إِنَّمَا فَعَلْتُ ذَلِكَ لِأَتَأَلَّفَهُمْ، فَجَاءَ رَجُلٌ كَثُّ اللِّحْيَةِ، مُشْرِفُ الْوَجْنَتَيْنِ، غَائِرُ الْعَيْنَيْنِ، نَاتِئُ الْجَبِينِ، مَحْلُوقُ الرَّأْسِ، فَقَالَ: اتَّقِ اللهَ، يَا مُحَمَّدُ، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ): فَمَنْ يُطِعِ اللهَ إِنْ عَصَيْتُهُ، أَيَأْمَنُنِي عَلَى أَهْلِ الْأَرْضِ وَلَا تَأْمَنُونِي؟ قَالَ: ثُمَّ أَدْبَرَ الرَّجُلُ، فَاسْتَأْذَنَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ فِي قَتْلِهِ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ): إِنَّ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا قَوْمًا يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ يَقْتُلُونَ، أَهْلَ الْإِسْلَامِ، وَيَدَعُونَ أَهْلَ الْأَوْثَانِ، يَمْرُقُونَ مِنَ الْإِسْلَامِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، لَئِنْ أَدْرَكْتُهُمْ لَأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ عَادٍ)[2].

واتە: پێشەوا (عەلی) کاتێك لە یەمەن بوو بڕێك زێڕی کە هەر لەناو خۆڵەکەی دابوو ناردی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) دابەشی کرد بەسەر چوار بەش (ئەقرەع و عویینەو عەلقەمەو زەید) قوڕەیشیەکانیش تووڕەبوون و گوتیان: ئایا بۆ شت دەبەخشیتە گەورەکانی (نەجد) وازیش لە ئێمە دەهێنیت؟

---

(١) فتح الباري، (٨/ ٢٦٨).

(٢) صحيح مسلم (٢/ ٧٤١) باب: ذكر الخوارج وصفاتهم، برقم: (١٠٦٤).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی: لەبەر ئەوە دام پێیان کە دڵیان جێگیر ببێ و ئولفەت بگرن بە دینی ئیسلام، لە پاشان دەفەرمویٚ: پیاوێك هات ڕیشێکی پڕی هەبوو، وە سەرە ڕوومەتەکانی بڵند بوون، وە سەریشی تاشرابوو، گوتی لە خوا بترسە ئەی محەممەد(ﷺ)!

پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی: کیٚ بە ئەمری خوا دەجولێتەوە، ئەگەر من بیٚ ئەمری خوا بکەم، ئایا خوای گەورە من بە ئەمین دائەنیٚ لەسەر خەڵکی زەوی، ئێوەش من بە ئەمین نازانن ؟

لەپاشان کابرا ڕۆیشت، یەکیٚ لە هاوەڵە بەڕێزەکان داوای ئیزنی کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) کە بچی بیکوژێت..

پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی: بەڕاستی لە پشتی ئەو پیاوە کەسانێك پەیدا دەبیٚ قورئان دەخوێنن، بەڵام لە گەردەنیان ناچێتە خوار، ئەهلی ئیسلام دەکوژن وازیش لە بت پەرستان دەهێنن، دەردەچن لە ئیسلام هەروەکو چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت ، ئەگەر من بمێنم وەکو گەلی (عاد) لەناویان دەبەم.

ئەو پیاوەی کە لەم فەرموودە پیرۆزە باسی لێوە کرا ناوی (حرقوص) بووە، کەوا مەشهورە بە (ذوالخويصره) کابرایەکی زۆر بیٚ ئەدەب بووە، وە خەواریجەکانی سەردەمی پێشەوا (عەلی)یش لە پشتی ئەم پیاوەن.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویٚ: (يَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ، يَأْتُونَكُمْ مِنَ الْأَحَادِيثِ بِمَا لَمْ تَسْمَعُوا أَنْتُمْ، وَلَا آبَاؤُكُمْ، فَإِيَّاكُمْ وَإِيَّاهُمْ، لَا يُضِلُّونَكُمْ، وَلَا يَفْتِنُونَكُمْ)[1].

واتە: لە کۆتایی دونیا چەند فێڵبازێکی درۆزن پەیدا دەبن، فەرمودەی واتان بۆ دێنن کە نە ئێوەو نە باوك و باپیرانتان نەتانبیستوون، ئاگاداری خۆتان بن و خۆتان لەوان بپارێزن نەوەکو گومڕاتان بکەن و لە ئاین لاتان بدەن.

لەم سەردەمە کەسانێك دروست بوون کە خۆیان بە (لامەزهەب)ی لە قەڵەم دەدەن و دەڵێن: زانایانی ڕابردوو ئەم فەرموودەیان نەبینیوە.. یان دەڵێن: زانایانی

(١) صحيح مسلم (١/ ١٢) باب: في الضعفاء والكذابين، بە ژمارە:(٧).

ڕابردوو نەیانزانیوە ئەم فەرموودە بێهێزە، وا ئێستا زانست بەرەو پێش دەڕواو زانایانی ئێستا شارەزاترن لە ڕابردووەکان.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویێ: خەڵکانێك پەیدا دەبن قورئان دەخوێنن و لە گەردەنیان ناچێتە خوارەوە، هەر چینێکیان دەردەچێ دەبڕێندرێتەوە - زیاتر لە بیست جار وەهای فەرموو - تا لە مەیدانی ئەواندا دەجال دەردەچێ.

## نیشانەکانی ئەو کۆمەڵە:

١) بەکافر دانانی خەڵك، واتە: زۆر بە ئاسانی و بەهۆی تاوانێك تۆمەتی (شیرك) واتە: کافربوون دەدەنە پاڵ موسڵمانان عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ﷺ) خەواریجی بە خراپترین کەس دادەنان و دەیفەرمو: ئەو ئایەتانەی لە قورئان دەربارەی کافرەکان هاتونەتە خوارەوە، (خەواریج) بەسەر باوەڕداران بەکاریان دێنن.

٢- بەردەوام هەوڵ دەدەن چینی گەنجەکان گومڕا بکەن، بە تایبەتی ئەو گەنجانەی ئاستی پلەی خوێندنیان نزمەو ئەزمونی ژیانیان نەبیوە.

٣- زمانیان زۆر لوسەو دروشمی قورئان و فەرمودە بەرزدەکەنەوە بۆ خەڵکی بەناوی پیاوانی پێشین، هەر چەندە لای هەمووماں ئاشکرایە کە بەرزکردنەوەی دروشمی قورئان و فەرمودە باشترین قسەی خەڵکە، بەڵام ئەوان بەدرۆ بەرزی دەکەنەوە، هەر لەبەر ئەم درۆیەشە کە پێشینەکانی (خەواریج) ئەم دروشمەیان بەناوی (لا حکم إلا لله) ڕووبەڕووی ئیمامی (عەلی) بەرزکردەوە، پێشەوا (عەلی)ش (ﷺ) فەرموی: وشەی (لا حکم إلا لله) زۆر باشەو ڕاستە کە دادوەری تەنها مافی خوایە بەڵام مەبەست بە گوتنی ئەم وشە نارەوایە تێکدانی ڕیزی موسڵمانانە، ئەمەش یەکێکە لە نیشانەکانی (خەواریج) پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی:

(سَيَكُونُ فِي أُمَّتِي اخْتِلاَفٌ وَفُرْقَةٌ، قَوْمٌ يُحْسِنُونَ الْقِيلَ ، وَيُسِيئُونَ الْفِعْلَ ، يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ ، يَحْقِرُ أَحَدُكُمْ صَلاَتَهُ مَعَ صَلاَتِهِمْ ، وَصِيَامَهُ مَعَ صِيَامِهِمْ ،

يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ ، ثُمَّ لاَ يَرْجِعُونَ حَتَّى يَرْتَدَّ عَلَى فُوقِهِ ، هُمْ شَرُّ الْخَلْقِ وَالْخَلِيقَةِ..)[1].

واتە: سەردەمێك دێت لە نێو ئومەتەکەم پەرتەوازەیی و جیاجیایی پەیدا دەبێ، کۆمەڵێکیان قسەی جوان دەکەن و کاری خراپ ئەنجام دەدەن ، قورئان دەخوێنن لە قورگیان ناچێتە خوارەوە، ئەوانە لە ئیسلام دەردەچن وەکو چۆن تیر نێچیر دەسمێ و لێیەوە دەردەچێ، ئەوانە خراپترین بە دیهێنراوی خودان...

٤- زۆر بایەخ بە لەبەرکردنی قورئان و فەرموودەو نوێژو ڕۆژوو دەدەن، نوێژەکەیان بە شێوەیەکی جیاواز لە خەڵك دەکەن و خۆیان بەخواپەرست نیشان دەدەن و لە گوناهی بچوك خۆیان دەپارێزن و گوناهی گەورەش لایان زۆر ئاساییە.

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیب(ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (سَيَخْرُجُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ قَوْمٌ أَحْدَاثُ الْأَسْنَانِ، سُفَهَاءُ الْأَحْلَامِ، يَقُولُونَ مِنْ خَيْرِ قَوْلِ الْبَرِيَّةِ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ..)[2].

واتە: لە کۆتا زەماندا کەسانێك سەر هەڵدەدەن تەمەنیان بچوکە، دوورن لە نەرم و نیانی، فەرموودەی چاکترین مرۆڤ دەڵێنەوە، قورئان دەخوێنن و لە قورگیان تێناپەڕێ، چۆن تیر لە کەوان دەردەچێ، ئەوانیش بەم شێوەیە لە ئیسلام دەردەچن.

٥- جەماعەت نەکردن، واتە: (خەواریج)ەکان نوێژ بە جەماعەت لە دوای خەڵکی تر ناکەن، چونکە بەکافریان تێ دەگەن[3].

٦- زۆر بێ ئەدەبن بەرامبەر زانایانی ئەهلی سوننەو جەماعە، چونکە هەر لەسەدەی یەکەمەوە تا ئێستا گشت زانایانی ئیسلام بەهەڵەداچوو و گومڕابوو دادەنێن و تەنها

---

(١) سنن أبي داود (٤/ ٢٤٣) باب: في قتال الخوارج، برقم: (٤٧٦٥).

(٢) صحيح البخاري (٩/ ١٦) باب: قتل الخوارج والملحدين، برقم: (٦٩٣٠).

(٣) تحفة المحتاج، لا ٦٧.

قسەی خۆیان و سەرانی خۆیان پێ ڕاستە، باوەڕیان بە (ئیجماع)ی زانایانی ئیسلام نیەو زۆر دژی هەر چوار ئیمامەکانی سەر مەزهەبن، هەر لەبەر ئەم خەسلەتانەیە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەیان دەفەرموێ: بەڕاستی خەواریج سەگی دۆزەخیانن.

٧- بەردەوام ململانێ لەگەڵ موسڵمانان دەکەن و ئاژاوە دەنێنەوەو نایەڵن موسڵمانان سوود لە ئایین وەربگرن و ببنە یەك هێز بەرامبەر بە کافرەکان، لە هەمان کاتیشدا دۆستایەتی کافرەکان و عەلمانیەکان دەکەن، ئەمەش هاتنە دی فەرمایشتەکانی پێغەمبەرە(ﷺ) کە دەفەرموێ: خەواریج موسڵمانان دەکوژن و واز لە کافرەکان دەهێنن.

لە فەرمایشتەکی تر پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (يَخْرُجُونَ عَلَى حِينِ فُرْقَةٍ)[1]. واتە: (خەواریج) لەو کاتەدا دەردەچن و دژایەتی موسڵمانان دەکەن، کە موسڵمانان پەرتەوازەو بێ دەسەڵاتن.



---

(١) صحيح البخاري (٦/ ٢٥٤٠) باب: من ترك القتال الخوارج، برقم: (٦٥٣٤).

## پیربوون و ڕۆیشتنی ئەستێرەکان

یەکێك لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر، دابەزینی نەیزەك و پیربوونی ئەشتێرەکانە.

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (.. النُّجُومُ أَمَنَةٌ لِلسَّمَاءِ، فَإِذَا ذَهَبَتِ النُّجُومُ أَتَى السَّمَاءَ مَا تُوعَدُ، وَأَنَا أَمَنَةٌ لِأَصْحَابِي، فَإِذَا ذَهَبْتُ أَتَى أَصْحَابِي مَا يُوعَدُونَ، وَأَصْحَابِي أَمَنَةٌ لِأُمَّتِي، فَإِذَا ذَهَبَ أَصْحَابِي أَتَى أُمَّتِي مَا يُوعَدُونَ)[1].

واتە: ئەستێرەکان پارێزەری ئاسمانن، هەر کاتێك ئەستێرەکان نەمان ئەوەی بەڵێنی خوایە کە تێکچونی ئاسمانە دێتە دی، منیش پارێزەرم بۆ هاوەڵانم، بە ڕۆیشتنی من یارانیش دووچاری ئەو بەڵێنە دەبنەوە کە دراوە واتە: ئەوانیش نامێنن، هاوەڵانیشم پارێزەرن بۆ ئوممەتەکەم، ئەگەر هاوەڵانم ڕۆیشتن ئوممەتەکەشم دووچاری ئەو بەڵێنە ئەبنەوە کە دراوە پێیان..

لەم فەرموودەیە پێغەمبەر(ﷺ):

نەمانی هاوەڵانی بەستووەتەوە بە نەمانی دوو نیشانە لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر، کە ئەویش ڕۆیشتنی ئەستێرەکان و دابەزینی نەیزەکەکانە.

بەر لەوەی پەردە لە ڕووی نهێنیەکانی گەردوون لا بدەین، دەبێت ئەو ڕاستیەمان لەبەر چاو بێت کە دەڵێت: هەموو زیندەوەرێك، ئیتر مرۆڤ بێت، ئاژەڵ بێت یان ڕووەك، لەسەر زەویدا ئەجەلێکی دیاریکراوی هەیە.

لە کۆنەوە زانراوە کە خۆر لە ماوەی هەر (١١) ساڵ جارێك دووچاری چەند گۆڕانێکی بەرچاو و ئاشکرا دەبێتەوە، لەو کاتەوە لە چینە قووڵەکانی ژێرەوەیدا

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ١٩٦١) باب: بيان أن بقاء النبي(ﷺ)، برقم: (٢٥٣١).

قانی ڕەش بەسەر دەکەون و لە هەمان کاتیشدا تەقینەوەی زۆر گەورە هەڵدەقوڵێن کە هێزەکانیان بە ملیارەها جار ئەوەندەی تەقینەوەی بۆمبە ئەتۆمییەکان زیاترەو لەو ساتەشدا بڵێسەی ئاگرینی زەبەلاحی هایدرۆجینی و تەنۆچکەی بارگاوی خاوەن هێزی یەکجار زۆر بەرز دەبێتەوە تا ئاستی سەدان هەزار کیلۆمەتر لە ئاسمانی ئەم ئەستێرەیەدا، ئەم تەقینەوانە لە توانایاندایە هەسارەکانیش فڕێ بدەنە بۆشایی گەردوونی، ئەم دیمەنە ڕوخساری ئەستێرەیەکی بە هێزو بە توانایەکی بێسنوورمان پێ نیشان دەدات.

لەم سەردەمە ئەوەی بۆتە مایەی سەر سوڕمانی زانایان، ئەو ڕاستیەیە کە خۆر ئەستێرەیەو وەك هەموو ئەستێرەکان لەبەردەم گۆڕان و تەنانەت لە لەناوچوون دایە.

ئایا گۆڕانکاری بەردەوام لە خۆردا دەتوانێ کێشەیەکمان بۆ دروست بکات؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە زانایان چەندین لێکۆڵینەوەیان لە بارەی خۆرەوە ئەنجام داوەو هەندێ ئەنجامی دیاریکراویان بە دەست هێناوە.

سەردەمانێك باوەڕ وابوو کە خۆر بە هێواشی ساردتر دەبێتەوە، ئەگەر ئەم شتە ڕاست بوایە خۆر لە چەند هەزار ساڵێك زیاتر نەدەمایەوە بەڵام ئەم شتە ڕاست نیە، چونکە ئەمڕۆ زانایان بە تەواوی لەوە گەیشتوون کە ئەو ڕووناکی و گەرمیەی لە خۆرەوە دەردەچێت، ئەنجامی هەندێ کاردانەوەی گەرمایی ئەتۆمیە کە لە خۆردا ڕوو دەدات، لە ئەنجامی ئەم کاردانەوەیە ئەتۆمەکانی هایدرۆجینی ناو خۆر ئاوێتە دەبن تا ناوکی هیلیۆم پێك بهێنن، گۆڕانی هایدرۆجین بۆ هیلیۆم وزە دروست ئەکات.

ئێستا دەپرسین کە هایدرۆجینی ناو خۆر تاکەی درێژە دەکێشێ؟

بەراورد کراوە کە خۆر هێندە هایدرۆجینی تیادایە کە کاردانەوەی ناوکی ئەتۆمی بۆ ماوەی چەندین ملیار ساڵ درێژە پێبدات، هەموو تەمەنی خۆر بە نزیکەی (١٠) ملیار ساڵ مەزندە نەکراوە، نزیکەی نیوەی ئەم تەمەنە تەواو بوو، هەر بۆیە خۆر تا لانی کەم (٥) ملیار ساڵی تر ڕووناکی و ووزە بەرهەم دەهێنێ.

هەر کەسێك گەیشتە دوا تەمەنی دەبێت ژیان بەجێبێڵێت، ئەم دەستورەش بۆ هیچ هێزێك نیە لەبەریدا بوەستێت و نەبێت تەنها بەسەر زەویدا سەپا بێت، بەڵکو لە ئاسمانەکان و هەموو شوێنێکی جیهانی زۆر فرەوان و بەربڵاویشدا کاریگەرو سەپاوە.

لەم ڕاستیەوە دەتوانین بڵێین: زەوی، مانگ، خۆر، ئەستێرەکان، گەردوون بە گشتی کۆتاییەکی دیاری کراویان بۆ دانراوە... زانایان بە ڕووداوی کۆچی کۆتایی سەرانسەری گەردوون دەڵێن (کۆتایی گەردوون)، قورئانی پیرۆزیش بە (قیامەت) ناوی دەبات.

بەڵێ... قورئان ئەو پەڕاوەی کە ڕابردوو، داهاتوو دەکاتە پەڕەو زەوی و ئاسمانەکان دەکات بە دێڕی ئەو پەڕانە، نیگاری ئەو ڕۆژەی کێشاوە کە چۆن تەنە گەردوونیەکان دەدەن بە یەکداو چەندین بارستەو تەنی ئاگرینی وایان لێ دەردەپەڕێت کە زۆر لە زەوی گەورەتر بێت، شاخ و داخ و هەڵتەکان، تەقینەوەی ئاگرینی زەریاکان، تەخت بوونی ڕووی زەوی... لە ئاکامی ئەم کردارانەدا گەردوون هەڵدەسێت و بانگی ڕۆژی دوایی بە گوێی هەموو شتێکدا دەدرێت.

ئەم دوا ڕۆژە لە تێڕوانینی زانستیەوە گەیشتۆتە ئاستی دڵنیایی و بەڵگە نەویستی، بەڵام جاروبار گومان و سەلماندن مرۆڤ گێژ دەکات و دەکەوێتە پرسیار لە خۆی و دەوروبەری، بەڵام بەر لە وەڵام، دەبێت ئەوە بزانین کە هەموو شتێك هۆی بوون و نەمانی هەیە، گەردوونیش یەکێکە لەو شتانە، چۆن هۆی بوونی هەیە، ئاوەهاش هۆی نەمانی (مردنی) هەیە، جا کە دەمرێت چەند هۆیەکی هەیە.. بەڵام کامەیان گرنگترە؟

زانایانی فیزیای گەردوونی دەڵێن: ئینترۆپیی[1] گەردوون لە زۆربوونێکی هەمیشەیی دایە.

---

(١) ئینترۆپیێ: گۆڕانی هەڕەمەکی، گۆڕان بەرەو نارێکی.. هەر چەندە نارێکی زۆر بێت دەڵێین ئینترۆپی گەورەیە، گەردوونیش ئێستا بەرەو نارێکی زۆرتر دەڕوات چونکە بەرەو مردنی گەرمی دەڕوات.

بەرگی دووەم

لە هەر شوێنێکدا جوولە هەبێت ئینترۆپی ئەو ناوچەیە زۆر دەبێت، بێگومان ئەو زۆربوونەش وای لێ دێت کە بەسەر پەڕی بەرزیدا ڕابوێرێت، تا وای لێ دێت بە سفر کۆتایی دێت و زۆر نابێت، لەم کاتەشدا هەموو جۆرێکی جوولە دەسرەوێت و گەردوون تەمەنی بەرەو کۆتایی و مردن دەچێت.

ئەی ئەو ئەستێرەی کە لە ئامێزی گەردوون دایە چۆن دەمرێت؟

نەمانی هایدرۆجین لە عەمارە وزەکانی ئەستێرەدا، نیشانەی گەیشتنیەتی بە کۆتایی تەمەن.. لەم کاتەدا ئەستێرە دەچێتەوە یەك و بە قۆناغەکانی گڕگنی سپی و کونی ڕەشدا تێپەڕ دەبێ و دەمرێت، بەڵام مردن لەناوچون ناگەیەنێ، بەڵکو سەرەتای زاینێکی نوێ و تازەو بە ڕووناکیەکی گەشتر دەگەیەنێت.

بە گەشەکردن و گەورەبوونی ئەستێرە کۆچی بەرەو مردن دەست پێ دەکات، پاش ئەو گەرمە کار لێکە ناوەکیانەی کە ملیارەها ساڵ دەخایەنێت، ئەستێرە وزەکەی لە دەست دەداو بەرە بەرە قەبارەکەی فرەوان دەبێت، لەم کارلێکانەیشدا گازی هایدرۆجین دەبێت بە هیلیۆم، جا لەبەر ئەوەی گازی هیلیۆم بە گوێرەی پێویست وزەی لێوە نایەتە بەرهەم، ئەم گازە لە چەقدا کۆدەبێتەوەو دەبێتە هۆی پووکاندنەوەی ئەستێرەکە، بەهۆی کۆبونەوەی هایدرۆجین لە ئەستێرەکەداو نەمانی لە چەقدا، کارلێك لە چوار دەوردا ڕوو دەدات، نەك لە چەقی ئەستێرەکە.

جا قەبارەی ئەستێرەکەش دەست دەکات بە گەورەبوون، چونکە کارلێك لەناو جەرگەوە بەرەو چێوە بڵاودەبێتەوە.. پلەی گەرمی ڕووی ئەستێرەکەیش وردە وردە لەگەڵ گەورەبونیدا نزم دەبێتەوە.

خوای پەروەردگار لە قورئان ئاماژە بەوە دەکات کە ڕۆژێك دێت ئەستێرەکان هەموویان دەمرن و لەناو دەچن، بۆیە ژیانی ئەم بونەوەرانە کۆتاییان پێدێت و دەڕۆن، ژیانی تەواو و نەبڕاوەی ڕەها تەنها بۆ خوای گەورەی زیندووە، کە نامرێت وەکو دەفەرمووی: [كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾].

واتە: هەموو ئەو كەسانەی لەسەر ڕووی زەوین هەر هەمووی فەوتاوەو تیاچووەو دەبێت بمرن، تەنها زاتی پەروەردگاری خاوەن بڵندی و ڕێزداری تۆیە كە دەمێنێتەوە.

خوای گەورە لە قورئان لەبارەی چۆنیەتی لەناوچوونی هەندێك لە دروست كراوەكانی خۆی شارەزامان دەكات، بۆ وێنە چۆنیەتی مردن و لەناوچوونی ئەستێرەكان وەك دەفەرموێت: [وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتْ ﴿٢﴾].

زانستی نوێ ئەوە دەردەخات كە ئەستێرە ژیانێكی دوورو درێژی هەیەو بە كۆمەڵێك قۆناغی یەك لە دوای یەك تێدەپەڕێت و لە دایك دەبێت، جا وردە وردە گەورە دەبێت، هەتا دەگاتە قۆناغی لاوی و گەنجێتی و پاشان بۆ قۆناغی پیری هەتا دەگاتە قۆناغی كوژانەوەو مردن.

بێگومان ئەمەش هاوڕایە لەگەڵ ئەو هەواڵانەی كە قورئانی پیرۆز داوێتی لە بارەی حاڵ و بەسەرهاتی ئەستێرەكان لە ڕۆژی دواییدا، جیاوازی نێوان ئەوەی لە ڕۆژی دوایی ڕوو دەدات و ئەوانەی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ڕوو دەدەن، تەنها ئەوەندەیە لە ڕۆژی دواییدا ئەستێرەكان بە كۆمەڵ دەمرن، بەڵام ئەوانەی لەم ژیانەدا ڕوو دەدەن، مردنی تاك تاكەی ئەستێرەكانە نەك هەموویان پێكەوە[١].

زانستی نوێی گەردوون سەبارەت بە تەمەنی ئەستێرەكان گەیشتە ئەو ڕاستیەی كە كرداری ناوكە یەكبوون (الإندماج النووي) لە ئەستێرەكاندا ڕوو دەدات، بەجۆرێك هاوسەنگیەك لە بەرامبەر هێزی كێشكردن ڕووەو ناوەوەی ئەستێرەكە بە ئەنجام دەگەیەنێت، لە ئەستێرە تازە پێگەیشتووەكاندا كرداری ناوكە یەكبوون بەهۆی گۆڕانی بەردەوامی گازی هایدرۆجین بۆ گازی هیلیۆم ئەنجام دەدرێت و گەرمی ڕووناكی و تیشكی تر بەهۆی فەوتاندنی بەشێك لە هایدرۆجین لە ئەنجامی كردارەكەوە دروست دەبن، پاش ئەوەی بە تێپەڕبوونی

---

(١) Mir Anees–u- Dim, THEUNIVERSE SEEN , THROUGH THA QURAN,AL-Attique publisher Inc, CANADA 1999. گۆڤاری هەیڤ ژمارە (١) .

ملیۆنەها ساڵ زۆربەی ماددەی ئەستێرەکە بوو بە گازی هیلیۆم، کە لە هایدرۆجین قورسترە گازی هیلیۆم دەبێتە سووتەمەنی ئەستێرەکەو کرداری ناووکە یەکبوونی بەسەردا دێت و بەهەمان شێوەی پێشوو ئەنجامی ئەو کردارە ماددەی هیلیۆمیش بەشێکی لێ دەبێتە ووزە، ئەم کردارەش بە تێپەڕبوونی کات وا دەکات کە ماددەی ئەستێرەکان لە ماددەی سووکەوە بگۆڕێن بۆ ماددەی قورستر تا لە هەندێکیاندا دەگەنە ماددەی ئاسن، هەر هەنگاوێ لەو هەنگاوانە بریتیە لە قۆناغێکی ژیانی ئەستێرەکان، بەجۆرێك کە هایدرۆجین ماددەی سەرەکی سووتەمەنی ئەستێرەیەك بێت، دەوترێت ئەو ئەستێرەیە لە قۆناغی لاوێتی دایەو تا ماددەکەی بەرەو قورستر بڕوات، بەرەو تەمەن دەچێ و توانای وزە دانی کەمتر دەبێتەوەو لە هەندێکیاندا کە دەگاتە ئەو قۆناغەی کە ماددەی ئاسنی تیاکۆبۆتەوە دەگوترێت ئەستێرەکە لە قۆناغی نەمان دایە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی پێش ئەو قۆناغە دیاردەی مردنیش بەپێی بارستەی ئەستێرەکە دەبێت، چ بە تەقینەوەیەکی (نۆڤا یان سوپەر نۆڤا) یان کونە ڕەشەکان (الثقوب السوداء) یان هەر دیاردەیەکی تر، لە هەموو ئەمانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەستێرەکانی گەردوون گەرمی و ڕووناکیان نامێنێت و دەکوژێنەوە.

قورئان باس لە ئەستێرە پڕشنگدارو نزیکەکەی زەویەکەمان دەکات کە خۆرەو سەرچاوەی گەرمی و ڕووناکیە بۆ کۆمەڵەی خۆر بە زەویشەوە کە چۆن ڕۆژێك لە ڕۆژان نامێنێت و دەکوژێتەوە[١].. گەر زیاتر بچینە وردەکاری کرداری ناوکە یەکبوونی ئەستێرەکانەوە دیاردەی سەر سوڕهێنەری زیاترمان بۆ دەردەکەوێت، لەم ساڵانەی دواییدا زانایان هەستیان پێ کردووە سەبارەت بە چۆنیەتی پەیدابوونی ماددەی ئاسن لە زەوی و هەسارەکانی تری کۆمەڵەی خۆردا بە گشتی، هەرگیز وزەی زەوی و ئەو هەسارانە ئەوەندە نیە کە بتوانێت ئاسن دروست بکات، بەڵکو بۆیان دەرکەوتووە کە توخمی ئاسن لە بۆشایی دەرەوە هاتووەتە سەر زەوی، ئەویش لە ئەنجامی دروستبوونی ئەو توخمە لەو ئەستێرانەدا کە بە

---

(١) Mir Anees–u- Dim, THEUNIVERSE SEEN , THROUGH THA QURAN,AL-Attique publisher Inc, CANADA 1999. گۆڤاری هەیف ژمارە (١) .

(نۆڤاو سوپەر نۆڤا) ناو دەبرێن و پلەی گەرمی ناو جەرگەکەیان سەدان بلیۆن پلەی سەدی دەبێت، بۆیە کاتێك دووچاری نەمان دەبن و دەتەقنەوە ماددەی ئاسنەکەیان بڵاودەبێتەوەو بەهۆی هێزی کێشکردنەوە دەگەنە تەنە گەردوونیەکان، یەك لەوانەش زەوییە، بۆیە ئەمەش یەکێکە لە موعجیزەکانی قورئان[1].

دکتۆر زەغلول نەجار (خوای گەورە بیپارێزێت) دەڵێت:

لەگەڵ ئەوەی باوەڕمان بەوە هەیە ئەو کوژاندنەوەو نەمانە بە کۆمەڵەی توشی ئەستێرەکان دێت لە ڕۆژی دواییدا، جیاوازە لەو کوژاندنەوەیەی کە توشی تاك تاکەی ئەستێرەکان دێت لە ژیانی ئەمڕۆماندا، چونکە ئەو لەناوچونە گشتیە بە فەرمانی خوای پەروەردگار ڕوودەدات.

ئەوەندە هەیە پەی پێ بردنی زانستی ئەمڕۆی گەردوونناسی بە مردن و لەناوچوونی ئەستێرەکان وەك قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانی ئەستێرە لە دونیادا دەبێتە بەڵگە بۆ فەرموودەکانی قورئان و وتە بە پێزەکانی پێغەمبەر (ﷺ)[2].

خۆر ئەستێرەیەکە لە ئەستێرەکان و خوای گەورە هەواڵی پێچانەوەو کوژاندنەوەی داوەو هەواڵی ئەوەیشی داوە کە ئەستێرەکانی دیکەیش دەکوژێنەوەو دەچنەوە یەك، وەکو دەفەرموێ: [إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ ۝١ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ ].

وشەی (تکویر) لە زمانی عەرەبی بە واتای پێچانەوەو کۆبونەوە دێت، خاوەنی پەرتوکی (مختار الصحاح) لەم بارەیەوە دەڵێت: (ك و ر: كار الحمامة على رأسه) واتە: مێزەرەکەی پێچایەوە بەسەرییەوە، هەموو خولەکێك واتە: (کور).

پێشەوا ئیبنو عەباس (ﷺ) دەفەرموێ: واتە: ڕۆدەچێت.

پێشەوا ئەبو عوبیدە(ﷺ) دەفەرموێ: وەك ئەوە وایە مێزەرێك بپێچیتەوە، واتە: ڕووناکیەکەی کۆدەکرێتەوەو دەپێچرێتەوە هەر چۆن مێزەرێك دەپێچرێتەوە.

---

(١) Mir Anees–u- Dim, THEUNIVERSE SEEN THROUGH THA QURAN,AL- Attique publisher Inc, CANADA 1999. گۆڤاری هەیف ژمارە (١) .

(٢) من أسرار القرآن (والليل إذا عسس، والصبح إذا تنفّس)، د.زغلول النجار.

پێشەوا ئیبنو مەنزور(ﷺ) دەفەرموێ: لە بنەڕەتدا وەك پێچەوانەی مێزەر وایە، پێچەوانەی خۆر. پێشەوا موجاهید(ﷺ) دەڵێت: بە واتای بڕانەوەو فەنابوون یان ڕۆیشتن دێت، هەروەك چۆن دەڵێن بە واتای پێچەوانەیش دێت.

پێشەوا ئەخفەش(ﷺ) دەڵێت: بە واتای پێچەوانەو نەمان دێت.. پێشەوا فەراء(ﷺ) دەڵێت: ڕووناکیەکەی دانا (فڕێی دا)..

پێشەوا ڕەبیعی کوڕی خەیسەم(ﷺ) دەڵێت: (کورت) واتە: هەڵیدا. (کورته فتکور) واتە: کەوت. (الإنکدار) لە (الکدر)ەوە هاتووە کە بە مانای لێڵی دێت دژە مانای ڕونیە.. پێشەوا ئیبنو مەنزور(ﷺ) دەڵێت: (الکدر) دژە ڕونیە، (الکدرة من الألوان) واتە: ئەوەی نەچێت بەلای ڕەش یان چڵکنی دێزیدا[1].. پێشەوا (شمر) دەڵێت: (طموس البصر) واتە: نەمانی ڕۆشنایی چاو، هەروەها (طموس الکواکب) نەمانی ڕووناکی هەسارەکە، (الطمس) لەبن هێنانی ئاسەواری شتێك[2].

وتەی ڕاڤەکەرانی قورئان لەبارەی ئەم ئایەتە پیرۆزانەوە:

لەسەر ئایەتی [إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ][3]. ڕاڤەکەران چەند وتەیەکیان هەیە:

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە: [إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ][4]. پێشەوا قەتادە(ﷺ) دەڵێت: واتە: ڕووناکیەکەی ڕۆیشت.

پێشەوا سەعیدی کوڕی جوبەیر(ﷺ) دەڵێت: واتە: چوو بەناوا.

پێشەوا زوجاجیش(ﷺ) دەڵێت: واتە: پێچرایەوە. هەروەك چۆن مێزەرەێك دەپێچرێتەوەو دەڵێن: (کورت العمامة علی رأسي) واتە: مێزەرەکەم پێچایەوە بەسەرمەوە،

---

(١) لسان العرب، ابن منظور (٥/ ١٣٤).

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٣) سورة التکویر، الآیة: (١).

(٤) سورة التکویر، الآیة: (١).

وە بنەمای (التكوير) واتە: کۆکردنەوەی کۆمەڵێك شت پێکەوە، واتە: خۆر خۆی کۆدەکاتەوەو خۆی دەپێچێتەوە هەر ئەمەیشی بەسەر هات ڕووناکیەکەی نامێنێت[1].

پێشەوا تەبەری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: بەلای ئێمەوە ڕاستی ئەوەیە: فەرموودەی خوای گەورە (كُوِّرَتۡ)، وشەی (التكوير) لە زمانی عەرەبیدا بەمانای کۆکردنەوەو کۆبوونەوەی شتێك دێت، ئەمەش وەك پێچانەوەی مێزەرێك بەسەرەوە وایە، یان وەك کۆکردنەوەی جل و بەرگ و پێچانەوەی، هەروەها فەرموودەی پەروەردگار[إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ][2]. واتاکەی ئەمەیە، کۆبوونەوە فڕێدان ئەگەر ئەمەیشی بەسەر هات ڕووناکیەکەی دەڕوات[3].

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ][4]. هەندێك لە ئەهلی ڕاڤە دەفەرموون [ٱنكَدَرَتۡ] بەواتای گۆڕدرا، وە دەڵێن: کەوتنە خوارەوەو پرژو بڵاوبوون.

پێشەوا قورتبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: [وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ]. واتە: کەوتە خوارەوەو بڵاوبۆوە.

پێشەوا ئیبنو عەباس(ﷺ)ەوە دەگێڕنەوە: [ٱنكَدَرَتۡ] گۆڕاو ڕووناکی نەما، چونکە لەشوێنی خۆیاندا نەماون[5].

لە ئایەتێکی تر دەفەرموێ: [فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتۡ][6].

زانایان دەفەرموون: (طمس النجوم) بە واتای ڕۆیشتنی ڕووناکی و نەمانی نورەکەیەتی.

---

(١) تفسير البغوي (٣٤٥/١).

(٢) سورة التكوير، الآية: (١).

(٣) تفسير الطبري (٤٥٦/١٢).

(٤) سورة التكوير، الآية: (٢).

(٥) تفسير القرطبي (١٩٧/١٩).

(٦) سورة المرسلات، الآية: (٨).

پێشەوا تەبەری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: [فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتۡ] کاتێك ئەستێرە ڕووناکیەکەی بڕوات و ڕوناکی نەمێنێت[1].

لە کاتێکدا زانایان دۆزیانەتەوە کە ئەو ئەستێرەیەی کە ٤٠٠٠ ساڵی ڕووناکی لێمانەوە دوورە لە خۆری ئێمە دەچێت، لە خۆیدا تەقیوەتەوەو قەبارەکەی دەست بە بچوکبوونەوە دەکات و دەگۆڕێت بۆ ئەستێرەیەکی سپی قەزەم، پلەی گەرمی ئەو تەقینەوەیە دەگاتە ٤٠٠ هەزار پلەی سەدی! زانایانیش ئەوە دووپات دەکەنەوە، کە خۆر بە هەمان شێوە وەکو ئەو ئەستێرەیەی لێ دێت و دەسوتێت، ئەو کرداری سووتانە دەبێتە هۆی چوونەوەیەکی قەبارەی خۆر بە چەند قۆناغێك تا دەگۆڕێت بۆ خۆرێکی بچووك ئەوەش ئەوەیە کە زانایان ناوی دەبەن بە سپی قەزەم، ئایا سەیر نیە کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز دەربارەی کۆتایی خۆر دەفەرموێت: [إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ] واتە: کە خۆر لوول دراو ڕووناکی لێ بڕاو ئاگری تێدا کوژایەوە[2].



### قۆناغەکانی ژیانی ئەستێرە لە ژێر ڕۆشنایی زانستی نوێدا:

ئەستێرە لە کۆبوونەوەی کۆمەڵە گازێکەوە دروست دەبێت، کە قەوارەیەکی زەبەلاحی هەیە، بریتیە لەو تەنە ئاسمانیانەی کە پلەیەکی گەرمی زۆر بەرزیان هەیە، وە سوورەوە بوون، داگیرساو و ڕووناکی بەخشن، بەزۆری گازی هایدرۆجین زاڵە بەسەر پێکهاتەکانی، پاشان گازی هیلیۆم و لەمیش کەمتر ئەو توخمانەی تر کە لە کێشدا قورسترن، لە ئەنجامی خولانەوەکەی ئەستێرەکە بە دەوری تەوەری خۆیدا وردە وردە هێزی کێشکردن ڕووەو چەقەکەی خۆی فەراهەم دێنێت، ئەمەش دەبێتە هۆی یەکگرتنێکی ناوکی گەردیلە هایدرۆجینەکان لە نێو خۆیاندا، بەمەش تێکەڵ بوون و پێکداچوونێکی ناوکی ڕوودەدات، لە

---

(١) تفسير ابن كثير (٤/٥٩٠)، وتفسير القرطبي (١٩/١٣٨)، وتفسير البغوي (١/٣٠٤)، زاد السير لابن الجوزي (٨/٤٤٧)، فتح القدير للشوكاني (٥/٥٠١).

(٢) www.Nlparabia.com.

ئەنجامی ئەم یەکگرتنە ناوەکیەوەش بڕێکی ئێجگار زۆر لە وزە لە شێوازی ژمارەیەك لە تیشکی کارۆموگناتیسی دەردەچێت کە گرنگترینیان ڕووناکی و گەرمین.

ئەم یەکگرتنە ناوکیە دەبێتە هۆی گۆڕینی توخمەکان بۆ جۆرە توخمێکی دی، کە لە کێشدا لەوەی پێش خۆی قورستر بێت ئەم کردارەش بە بەردەوامی ڕوو دەدات، دیارە ئەمەش بە کاریگەری خۆی دەبێتە هۆی ئاڵۆزکردنی پێکهاتەی کیمیایی و بونیادی ناوەکی ئەستێرەکە، کە بە بەردەوامی لە قەوارەدا دەچێتەوە یەك و لە چڕیدا ڕووی لە زیاد بوونەو پلەی گەرمبشی لە بەرزبوونەوەدایە، بەمەش کۆمەڵێك قۆناغی یەك لە دوای یەك دەبینێت کە بە سوڕی ژیانی ئەستێرە ناودەبرێت، کاتێك لە یەکتر کۆدەبنەوەو گرد دەبێتەوەو ڕوەو ناوەوە دەچێتەوە یەك..

خوای گەورە دەفەرموێ: [وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ] یان [فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتۡ] خوای پەروەردگار باس لە بچووك بوونەوەی ئەستێرەکان و قۆناغی بەرەو نەمان و کۆتایی هاتنی ژیانی دونیاو ئەستێرەو بچوك بوونەوەی قەوارەکەی دەکات، هەروەکو چۆن لە سەرەتای بابەتەکەدا ئاماژەمان بە وتەی ڕاڤەکارانی قورئاندا وەك ئیبنو کەثیر کە گوتی: [طُمِسَتۡ] واتە: ڕووناکیەکەی ڕۆیشت، وە بە وتەی پێشەوا تەبەری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت): ڕووناکیەکەی نەماو ئیتر نورو ڕۆشنایی تێدا نامێنێت..

ئەمەش ئەو ڕاستیەیە کە لە ئەنجامی ئەو کارەساتەوە ڕوودەدات کە بەسەر ئەستێرەکاندا دێت بە تایبەت دوای داماڵینی توێکڵی دەرەوەی ئەستێرەکان و مانەوەی ناو کرۆکەکەی بەتەنهاو بەبێ توێکڵ، ئەم ناو کرۆکەیش بە ڕادەیەکی زۆر زۆر دەچێتەوە یەك، لەم کاتەدا دڵی ئەستێرەکە لە لێدان کەوتووە یان خەریکە لە لێدان دەکەوێت و ڕووناکیەکەی دەکوژێتەوەو تیشکی کەم دەبێتەوەو هێدی هێدی دەبێتە (قەزەمێکی ڕەش) بێگومان دوای ئەوە قۆناغی (قەزەمی سپی) دەبڕێت، لە هەمان کاتدا بە هۆی کەمبوونەوەی کارلێکە ناوەکیەکەیەوە گەرمیە زۆرەکەشی بەرەو نەمان دەڕوات، کە ئەوە بەلێدانی دڵی ئەستێرە دەژمێردرێت،

پاشان ئەستێرەكە سەرچاوەی وزە گەرمیەكەی ون دەكات و لاواز دەبێت و ڕوناكیەكەی نامێنێت و بەرەو (گۆڕستانی ئەستێرەكان دەڕوات)، ئەمەیش دوا قۆناغی چیرۆكی ژیانە لە جیهانی ئەستێرەدا[١].. بۆیەخۆر دەپێچرێتەوەو بچوك دەبێتەوە دوای ئەوەی سەدان ئەوەندەی خۆی كشاوەو گەورە بووە، بۆیە زانست دەڵێ: چارەنووسی زەبەلاحی سوور بۆ دوو شێوە دەگۆڕێت:

١- نۆڤـــا: لە كاتێكدا پلەی گەرمی بۆ سەدان ملیۆن پلە بەرز بویەوە، چەند تەقینەوەیەك ڕوو دەدات و بەشێ لە بارستایی لە دەست دەدات، كە بە ئەستێرەی تەقاوە ناسراوە.

٢- سۆپەر نۆڤـــا: بریتیە لە تەقینەوەیەكی گەورە كەوا سەرجەم ئەستێرە زەبەلاحە سورەكە دەگرێتەوەو كەرت و پەرت دەبێ و بە ئاسماندا بڵاودەبێتەوە، بە سۆپەر نۆڤا یان سەروی تەقینەوە ناومان ناوە، كاتێ ڕوودەدات كە پلەی گەرمی ناوەوەی دەگاتە هەزاران ملیۆن پلەی سەدی، هەندێ جاریش بەر لەوەی بگاتە زەبەلاحی سوور ئەم دیاردەیەی بەسەر دادێت[٢].

ئەم ئەستێرانە كۆتاییەكانیان زۆر كارەسات ئاسایە، ئەویش بریتیە لە تەقینەوەیەكی ئێجگار گەورەو بەهێز، بۆیە لە ئەنجامی ئەم تەقینەوەیە چینە دەرەكی و ناوەكیەكانی ئەستێرەكە لە ئاسماندا پەرش و بڵاودەبنەوە، ڕووناكیەكەی ملیۆنەها جار ئەوەندەی بەر لە تەقینەوەكەیدا بەهێزتر دەبێ و شەپۆلی بەركەوتنی دوای تەقینەوەكە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی گازە گرگرتوەكان، هەرچی لە پێشیدا بێت ڕایدەماڵێ و تەفروتونای دەكات.

---

(١) وەرگیراوە لە سایتی دكتور زەغلول نەجار.

(٢) الكون العميق، لا ٣١- ١٣٢.. زانایان پێناسەیەكی تریشیان كردووەو دەڵێن: بریتیە لە تەقینەوەی مەزن لە ژیانی ئەستێرەدا ڕۆشنایی و پرشنگ دانەوەیەكی بەهێزی هەیە، كە دەگاتە (٤٠٠٠٠) ئەوەندەی پرشنگ دانەوەی بنەڕەتی، بەڵام ئەگەر ئەستێرەكە هەموو تەقینەوە ئەوا پێی دەگوترێت (سوپەر نۆڤا)، پرشنگ دانەوەی ڕەنگە بگاتە توندی (ملیۆنەها ملیۆنەها) لە بۆمبای هایدرۆجینی.

لەساڵی (٢٠٠٨) فەلەکناسان گەورەترین تەقینەوەی ئەستێرەییان تۆمار کرد ئەویش بەم شێوازە، فەلەکناسان لە هەردوو زانکۆی (کالیفۆرنیا) و (تێکساس) هەڵسان بە تۆمارکردنی گەورەترین و مەزنترین تەقینەوەی ئەستێرە، کە لە هەموو تەقینەوەکانی پێشوو بە بریقەتر بوو، ناونرا بە گەورەترین تەقینەوەی ئەستێرەی تۆمارکراوە بە (سوپەر نۆڤا)، پێشتر هیچ تەقینەوەیەکی گەورەی لەو شێوەیە تۆمار نەکراوە، ئەمەش یەکەمین جارە کە زانایان بتوانن تەقینەوەو مردنی یەکێك لە گەورەترین ئەستێرەی وەکو ئەمە ببینن، کە قەبارەکەی دەگاتە (١٠٠-٢٠٠) ئەوەندەی قەبارەی ڕۆژ[١].

سەرەتای ژیانی ئەستێرە لەو تۆزە گەردوونیانەوە دەست پێدەکات، کە لە یەکەمین تەقینەوەکەی گەردوونەوە دروست بوون و لە گەردووندا بڵاوبوونەتەوە، ئەستێرە هەیە لە دروست بووندایەو گەردوون ناسانیش چاودێریان دەکەن، بێگومان ئەم دروست بونەش بە کۆمەڵێك هەنگاوی یەك لە دوای یەك، بەهۆی کۆمەڵێك گێژەڵوکەی گەردوونی بەهێزەوە کە بە کێژەڵوکەی چڕکەرەوەی ماددە ناسراوەو کار لەسەر چڕکردنەوەی ئەو ماددانە دەکات کە لە هەورە گەردوونیەکاندا هەن..

ئەمەش بە هۆی هێزی ڕاکێشانی قورسایییەوە دەبێت، کە دەبێتە هۆی دروست بوونی پێکدادانی بەردەوامی یەك لە دوای یەکی تەنۆلکە گەردوونیەکان، بێگومان ئەم پێکدادانانەش بەرزبوونەوەی وردە وردە پلەی گەرمای لێ پەیدا دەبێت، هەتا دەگاتە ئەو ڕاددەیەی کە ببێتە تەنێکی تیشك بەخش، کە تیشکی ژێر سور دەنێرێت، بەمەش تەنێك لە دایك دەبێت بەناوی ئەستێرەیەکی سەرەتایی.

ئەم کۆبونەوەو یەك ڕاکێشانەی کە لە نێوان تەنۆلکەکانی ئەستێرەیەکی سەرەتاییدا هەیە ڕووەو چەق بەردەوام دەبێت، تا ئەو ڕاددەیەی بارستاییەکی وا دروست ببێت، کاری یەکگرتنی ناوکی (الإندماج النووي)، تێدا فەراهەم بێت..

---

(١) Mir Anees–u- Dim, THEUNIVERSE SEEN , THROUGH THA QURAN,AL- Attique publisher Inc, CANADA 1999. گۆڤاری هەیڤ ژمارە (١) .

ئینجا پێکدادان بەردەوام دەبێت و هەر لە زیادبووندا دەبێت، پەستان بە ڕاددەیەك بەرز دەبێتەوە کە ڕێگا بدات بە دروست بوونی کارلێك و پێکداچونی ناوکی لە نێوان ناوکی گەردیلە هایدرۆجینییەکاندا، بەمەش ئەستێرە سەرەتایەکە دەست بە درەوشانەوە دەکات و وزەو ڕووناکی بینراوی لێ دەردەچێت، بەمەش ئەو ئەستێرە سەرەتایە دەگاتە قۆناغی پێگەیشتن کە بە زنجیرەی سەرەکی ئەستێرەی گەنج ناو زەدکراوە.

زانست و لێکۆڵینەوە نوێکان ئەوەیان چەسپاندووەو کۆکن لەسەر ئەوەی، کە ئەستێرە لە دایك دەبێت و پاشان دەگاتە قۆناغێکی تەمەن، کە تەمەنی لاوێتیە، ئەیستێرە زۆرترینی تەمەنی لەم قۆناغەدا بەسەر دەبات، پاش ئەمیش دەچێتە قۆناغێکی ترەوە هەتا دەگاتە دوا قۆناغ کەنەمان و کوژانەوەیەتی و ئیتر ڕووناکی نامێنێت[1].

لێکۆڵینەوە نوێکان دەری دەخەن خۆر لە کشان دایەو قەبارەکەی گەورە دەبێت، بێگومان خۆر بەردەوام تا سەر ناتوانێت پارێزگاری لە چوارچێوەو توێکڵەکەی خۆی بکات، چینەکانی سەرەوە وردە وردە ڕادەکەن و لێی دەبنەوە، بەشێوەی چینی و ئەڵقەی گازی و بە شێوەیەکی ترسناك، لەم حاڵەتەدا ئەم ئەڵقە هەڵوەریوانە هەموو هەسارەکانی خۆر دەگرێتەوە تا دەگاتە هەسارەی (بلۆتۆ)، بگرە دەوروبەری هەموو کۆمەڵەی خۆریش، ئەم قۆناغەی ئەستێرە بە (سەدیمەی هەسارە) ناو دەبرێت، کاتێك ئەستێرەکان توێکڵە دەرەکیەکانیان فڕێ دەدەن بەشێوەی بازنەیی، ئەستێرەی (قیسارە) لە نێو هەزارەها ئەستێرەی دۆزراوەدا، کە بەناوبانگرتین نمونەی ئەستێرەیە لەم بوارەدا، بۆیە گەردووناسان زانیاریان لەسەری هەیە کە چینە دەرەکییەکانی فڕێ دەدات[2].

خۆر لەو قۆناغەیدا زیاد لە سێیەکی بارستاییەکەی لەناو دەبات، تا وای لێدێت دەبێتە ناو کرۆکێکی ڕوتی بچوکی زۆر گەرم، کرداره ناوکیەکان دەوەستێت و ناواخنەکەی وردە وردە سارد دەبێتەوەو قەوارەیشی بەرەو بچووکبوونەوە دەڕوات،

---

(١) الكون العميق، لا ١٣٣..

(٢) حياة النجوم بين العلم والقرآن الكريم، للدكتور محمد صالح النووي، لا ٣٢١ .

ڕووەو گۆڕستانی ئەستێرەکان هەنگاو دەنێت، کە بە قۆناغی (قەزەمی سپی) ناسراوە، لەو قۆناغەدا چڕی ماددە بە ڕێژەیەکی ترسناك زیاد دەکات، تا دەگاتە ئەو ڕاددەیەی یەك سانتیمەتر سێجا لەو ماددە قەزەمیە سپیە نزیکەی یەك تەن کێشەکەیەتی بەبەراورد لەگەڵ ماددەی زەویدا، جگە لەوەی قەبارەی خۆر هێندەی قەبارەی زەوی بچووك دەبێتەوە.

شاعیر دەربارەی کۆتایی ئەستێرەو پێچەوانەی ڕۆژو مانگ دەڵێت:

مثــل لنـفـسك أيـهـا الــمــغـروريوم القيامة والسمــاء تـمور
إذ كورت شمس النهـــار وأدنـيـتحتى على رؤس العـباد تسـير
وإذا النجوم تســاقـطت وتـنـاثرتوتبدلت بعد الضيــاء كـــدور
وإذا الـبـحـار تـفجرت من خوفهـاورأيتها مـثـل الـحميم تـفور
وإذا الـجـبال تـعـلـقـت بـأصولـهورأيــتـها مثل السحاب تسير
وإذا الـعشار تـعـطـلـت وتـخربتخـلـت الـديار فما بهـا معمور
وإذا الوحوش لدى القيامة حشرتوتقول للأملاك أيــن تــســـير
وإذا تـقـــات المسلمين تـزوجـوامن حور عين زانـهنّ شـــعور
وإذا الـــمـؤودة سئِلَتْ عن شأنهـاوبأي ذنب قـتـلهـــا مـيـسـور
وإذا الـجلـيل طوي السما بـيمينهطيّ السجل كـتـــابه المنشور
وإذا الصحـــائـف عند ذاك تـساقطتبدو لنا يوم القصاص أمـور
وإذا الصحـــائـف نشّرتْ فتطايرتهتَكَتْ إذاً لـلـمـذنـبين ستور
وإذا السماء تـكـشـطت عـن أهلهاورأيتَ أفـلاك السمـاء تدور
وإذا الجحيـم تـسـعرت نـيرانـهـافـلها عـلى أهل الذنوب زفير
وإذا الـجنان تــزخرفت وتـــطيـبـتوإذا الـجـنـين معـلق مع أمه
يخشي الـــقـصاص وقلـبـه معذورهذا بـــلا ذنب يـخـاف جناية
كيـــــف المُصــــــر عـــــــلى الذنــــوب دهــــور؟ [١]

---

(١) المحكمة الآلهية، د. مصطفى مراد، كلية الدعوة جامعة الأزهر، لا ٣٩.

# زۆربوونی ئامێری مۆسیقا و گۆرانی بێژان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر بڵاوبوونەوەی ئامێری مۆسیقا و گۆرانی و خۆبادانە..

بۆ ماوەیەکی زۆر مۆسیقا بەبێ نووسین مایەوە، تەنیا دەماودەم ئاوازەکانیان لە یەکترەوە وەردەگرت، ئەم کردارەش گۆڕانکاری زۆری بەسەر ئاوازەکە دەهێنا، بۆیە پێویستی وای کرد مۆسیقا بنوسرێتەوە بەو جۆرە بوترێتەوە کە نوسراوەتەوە، ئەو ڕێگایەش کە دانرا بۆ نووسینەوەی مۆسیقا پێی دەگوترێت: (نۆتە) واتە: نیشانەکانی مۆسیقا.

سیستەمی نووسینی نۆتە مۆسیقیەکان، کە ئەمڕۆ لە دونیادا بەکار دەهێنرێت، ئەنجامی چەندین سەدەیە لە هەوڵ و کۆشش و پێشکەوتن، لە نزیکەی کۆتایی سەدەی نۆیەمەوە تا سەرەتای سەدەی هەژدەم ئەم پێشکەوتن و هەوڵانە لەناو کەنیسەو دەیرەکانی کەنیسەی کاسۆلیکی درا، چونکە زۆربەی نوێژەکانی ناو کەنیسە بە ئاوازەوە دەگوترا دەماو دەم لە یەکتریان وەردەگرت، ئەمەش بۆ خۆی کێشەی گەورەی دروست کرد لە گۆڕانی ئاوازەکاندا، بۆیە لە کۆتایی سەدەی نۆهەمدا، دەست کرا بە دانانی خاڵ و هێڵ لەسەر وشەکان لە پەرتوکی نوێژدا .

ئەو نیشانانەش ئەو ئاراستەیە دیاری دەکرد، کە دەبوایە ئاوازەکەی لەسەر بگوترایە، بەڵام خوێندنەوەی هێشتا زۆر ئاڵۆزو نادیار بوو، بۆیە لەساڵی (١٩٠٠) خوێندنەوەی مۆسیقا ئاسانتربوو، هێماکان لەسەر ماوەیەکی دیاری کراو دەنوسرا، لەسەر هێڵێکی سووری ئاسۆیی بۆ ئەوەی بەرزو نزمی تۆنەکە دیار بکات، دوای ئەوە ماددەیەك داهێنرا لەسەر دەستی ڕاهیبێك بە ناوی (گۆدۆ دایرزۆ) کە بریتی بوو لە چوار هێڵ، بەڵام نۆتەکە دەبوایە درێژی هەر تۆنێکی دیاری بکردایە، لە سەدەکانی سیازدەو چواردەدا نووسینی مۆسیقا شێوەی تازەتری بە خۆیەوە بینی

و لق و پۆ بۆ هەندێك لە تۆنەکان زیاد کرا بە گوێرەی درێژیەکەی، تا لە سەدەی حەڤدەهەم نۆتەی مۆسیق ئەو شێوەیەی بەخۆوە گرت کە ئەمڕۆ دەیبینین.

بەڵام لە پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت ئامێری مۆسیقا ژەن و گۆرانیبێژو بەندبێژ زۆر دەبن..

پێشەوا سەهلی کوری سەعد(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: (سَيَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ خَسْفٌ وَقَذْفٌ وَمَسْخٌ، قِيلَ: وَمَتَى ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللهِ(ﷺ)؟ قَالَ: إِذَا ظَهَرَتِ الْمَعَازِفُ وَالْقَيْنَاتُ..)[١].

واتە: لە ئاخیر زەماندا ڕۆچوون و ئاگر باران و ڕوو وەرگێڕان زۆر دەبێت، گوتیان: ئەمە کەی ڕوودەدات ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟

فەرمووی: هەر کاتێك ئامێری مۆسیقا ژەن و ئافرەتی گۆرانی بێژ زۆربوون.

پێشەوا ئەبو مالیکی ئەشعەری(ﷺ) دەڵێت:

گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (لَيَكُونَنَّ مِنْ أُمَّتِي أَقْوَامٌ، يَسْتَحِلُّونَ الحِرَ وَالحَرِيرَ، وَالخَمْرَ وَالمَعَازِفَ، وَلَيَنْزِلَنَّ أَقْوَامٌ إِلَى جَنْبِ عَلَمٍ، يَرُوحُ عَلَيْهِمْ بِسَارِحَةٍ لَهُمْ، يَأْتِيهِمْ - يَعْنِي الفَقِيرَ - لِحَاجَةٍ فَيَقُولُونَ: ارْجِعْ إِلَيْنَا غَدًا، فَيُبَيِّتُهُمُ اللَّهُ، وَيَضَعُ العَلَمَ، وَيَمْسَخُ آخَرِينَ قِرَدَةً وَخَنَازِيرَ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ)[٢].

واتە: کۆمەڵانێك لە ئوممەتی من پەیدا دەبن کە بەدڕەوشتی و ئارموش و مەی و مۆسیقا حەڵاڵ دەکەن، وە کۆمەڵە قەومێکیش لە پاڵیانەوە ئاڵا هەڵدەدەن، گاوان و شوانیان بەرانەوە بەسەردا دەگەڕێن بۆ پێداویستیەك دێنە لایان و دەڵێن: بەیانی وەرەوە لامان، جا خودا شەویان بەسەردا دێنێ و ئاڵاکە دادەگرێ و ئەوانی تریش تا ڕۆژی دوایی دەکاتە سەگسارو شێوەیان دەکاتە مەیمون و بەراز.

واتای حەڵاڵکردنیان بۆ ئەو شتە حەرامکراوانە دوو شتە:

---

(١) المعجم الكبير (٦/ ١٥٠) برقم: (٥٨١٠).

(٢) صحيح البخاري (٧/ ١٠٦) باب: ما جاء فيمن يستحل الخمر، برقم: (٥٥٩٠).

١) باوەڕیان وایە كە ئەو شتانە حەڕام نەكراون.

٢) لەبەر ئەوەی خەڵك ڕاهاتووە لەسەر كردن و ئەنجامدانی ئەو شتانەی بڵاوبوونەتەوە لە نێو خەڵكیدا تا وای لێهاتووە خەڵكی نە بە زمان و نە بەدڵ بە خراپی نازانن، بۆیە خەڵكی هەست بە حەڕامبوونی ناكەن لەكاتی ئەنجامدانیان.

پێشەوا ئەبو ئومامەی باهیلی (رضي الله عنه) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لَيَبِيتَنَّ أَقْوَامٌ مِنْ أُمَّتِي عَلَى أَكْلٍ وَلَهْوٍ وَلَعِبٍ، ثُمَّ لَيُصْبِحُنَّ قِرَدَةً وَخَنَازِيرَ)[١].

واتە: كۆمەڵانێك لە ئوممەتی من لەسەر خواردن و خواردنەوەو ڕابواردن بەسەر دەبەن، كاتێ بەیانی دادێت هەموویان بوون بە سەگسار وەكو مەیمون و بەراز.

لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆ كە ئێمەی تێیداین هیچ شتێك هێندەی ئامێری مۆسیقاو گۆرانی بێژان زۆر نیە كە ناوی هونەرمەندو هونەرمەندان لە خۆیان دەنێن، وە ژمارەی تیپی مۆسیقاو گۆرانی بێژو مۆسیقا ژەنەكان هێندە زۆر بووە لە ژمارە نایەن، وە ئێستاش دەیان قوتابخانەو پەیمانگا هەیە بۆ فێركردنی بەكارهێنانی ئامێرە مۆسیقیەكان و بەرهەم هێنانی مۆسیقا ژەن و گۆرانی بێژی زیاتر، وە ڕادیۆو تەلەفزیۆن و ڕاگەیاندنەكانیش لە خزمەتیان دایە، بە شێوەیەك ئەگەر هەردوو گوێشت بناخێت هەر گوێت لە گۆرانی و مۆسیقا دەبێت .

لە فەرموودەیەكی تر كە عومرانی كوڕی حصین(رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە كە یەكێ لە هاوەڵان گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) كەی ئەو شتانە ڕوودەدات؟ فەرموی: (إِذَا ظَهَرَتِ القَيْنَاتُ وَالمَعَازِفُ وَشُرِبَتِ الخُمُورُ)[٢].

واتە: هەر كاتێك ئامێری مۆسیقا ژەن و ئافرەتی گۆرانی بێژو ئارەق خواردنەوە بە ئاشكرا خورایەوە.

---

(١) المعجم الكبير (٨/ ٢٥٦) برقم: (٧٩٩٧).

(٢) سنن الترمذي (٤/ ٦٥) كتاب: الفتن، باب: قول النبي (ﷺ) بعثت أنا والساعة كهاتين، برقم: (٢٢١٢)، وقال الترمذي: هذا حديث غريب.

## حوکمی گۆرانی و مۆسیقا لای بەشێك لە زانایانی ئیسلام:

پێشەوا ئەحمەد پێی داگرتووە لەسەر حەرامی ئامێرەکانی گاڵتەو گەپ وەك عودو طنبورو شیابەو صنیح، وە هیچ گومانی تێدا نیە کە ئامێرەکانی ئاواز دانانی نوێ دەچنە ناو ئەو نەهیەوە وەکو(کەمانچەو ئۆکردیۆن و پیانۆو گیتار...هتد)، ئەمانە لە هەست بزواندن و کاریگەریدا زۆر لە ئامێرەکانی کۆن خراپترن کە نەهیان لێکراوە .

پێشەوا ئیبنو قەییم دەڵێت: گومانی تێدا نیە کە حەرامیەکەی زیاتر دەبێ و گوناهەکە گەورەتر دەبێ ئەگەر لەگەڵ مۆسیقاکەدا دەنگ و گۆرانی لەگەڵ دابێ وەك دەنگی گۆرانی بێژە ئافرەتەکان، بەڵام کاتی گوناهی زۆر زیاتر دەبێ ئەگەر وشەی گۆرانیەکە بریتی بێ لە دڵداری و عەشق و غەرامیات.

بە شێوەیەکی گشتی بابەتی گۆرانی و مۆسیقا بووە بە گەورەترین بەڵاو فیتنە لەم سەردەمەدا، ئەوەی کە زیاتر لەم سەردەمەدا بەڵاکەی زیاتر کردووە ئەویش دانانی دەنگی مۆسیقایە لەناو زۆر شتدا وەك کاتژمێرو زەنگی مۆبایل و یاری منداڵان و کۆمپیوتەرو...هتد، ئیتر وای لێ هاتووە بۆ خۆپاراستن لێی پێویستی بە ورەو ئیرادەیەکی گەورە هەیە، خوداش پشت و پەناو یاریدەدەرە بۆ ئەو کەسانەی دەیانەویت خۆیانی لێ بپارێزن، بەڵام زۆر لە زانایانی سەردەم ئاوازو مۆسیقایان حەڵاڵ کردووە بۆ بەکارهێنانی کاری بانگەوازکردن بە تایبەتی سروودی ئایینی و سروشت بە مەرجێك مۆسیقاکە ئەو ئامرازانەی تێدا بەکار نەیەت کە ئارەزووی مرۆڤ دەبزوێنێ بۆ کاری خراپ.

تەنانەت لەم ڕۆژگارەدا گۆرانی بووەتە عەیبەیەك لەلایەنی بەشێك لە خەڵکی، ڕۆژنامەیەکی ئەمریکی کاریکاتێرێکی وێنەی جووتیارێکی بڵاوکردەوە کە لە ژێر دارێکدا نوێژی دەکردو دەپاڕایەوەو دەیگوت: خودایە لە دیموکراتیەتی ئەمریکا بمانپارێزیت، هەروەها لەو ئافرەتانەی قومار دەکەن و جگەرە دەکێشن و مەی دەخۆنەوە، هەروەها لەدەستی مۆسیقای تازەی وەك (ڕۆك ئەندرۆڵ)و

هەموو ڕەوشتە تازەکانی ئەمریکا ڕاگیرمان بکە لەسەر عەیبە کۆنەکانمان کە ئەمڕۆ بوونەتە شتێك ئاخیان بۆ هەڵدەکێشین.

خوای گەورە دەفەرموێ: [ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِي ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ وَعِدْهُمْ ۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿٦٤﴾ ][1].

ڕاڤەکارانی قورئان دەڵێن: مەبەست لە ئایەتی [بِصَوْتِكَ ] مەبەستی گۆرانیە، واتە: هەستی یاخی بوەکان بەهۆی دەنگتەوە بجولێن.

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾][2].

واتە: ئایا ئەو کەسەی ویست و ئارەزوی خۆی کردۆتە خوای خۆی، بەهۆی ئەوەوە خوایش گومڕای کردوە، کە زانیویەتی شایەنی ئەوەیە لە ئەنجامی بەد هەڵوێستی خۆیدا، مۆری ناوە بە دەزگای بیستن و دڵ و دەرونیداو پەردەشی هێناوە بەسەر چاو و دەزگای بینینیدا، جا ئیتر کێ هەیە ڕێنمویی بکات.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: [ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْتَرِى لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٦﴾][3].

پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەڵێ: سوێند بەخوا دەخۆم مەبەست لە [لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ ] گۆرانی گوتنە.

---

(١) سورة الإسراء: الآية: (٦٤).

(٢) سورة الجاثية، الآية: (٢٣).

(٣) سورة لقمان، الآية: (٦).

جارێکیان پێشەوا عوقبەی کوری نافیع(ﷺ) سەرکردەی مەزنی بەناوبانگی موسڵمان، لەسەر زەریای ئەتلەنتی وەستا بوو، قسەی لەگەڵ ئاو دەکردو لا إله إلا الله ی لە پشتی ئاودا بەرز دەکردەوەو بە کوڕەکانی دەگوت:

کوڕەکانم ئاگاداری خۆتان بن لە گۆرانی گوتن، بەو خوایە هەر بەندەیەك گوێی لێبگرێ توشی خراپەکاری دەبێت..

پێشەوا شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: لە شاری بەغداد دەرچوم خراپەکاریەك لە بەغداد ڕوویدا ناویان نابوو (التغبیر) کە گۆرانی گوتنە لە ئارەق خواردنەوە کاریگەرترە.

پێشەوا عومەری کوری عبدالعزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) زۆر جار بە کوڕەکانی خۆی دەگوت:

لە گۆرانی ئاگادارتان دەکەمەوە، لە گۆرانی ئاگادارتان دەکەمەوە، لە گۆرانی ئاگادارتان دەکەمەوە، هەر بەندەیەکی خوا گوێی لێگرت، خوای گەورە کتێبی خۆی لەبیر دەباتەوە.

پێشەوا ئیبنو تەیمییە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: مەزنترین شت کە کاروباری شەیتان بەهێز بکات، گوێ لە گۆرانی گرتنە.

# یەکتر نەناسینەوەی خەڵکی

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی و کۆتایی بونەوەر، خەڵکی یەکتر ناناسنەوە، ئەمەش بە هۆی زۆربوونی دەردەسەری و پشێوی پەیوەندی نێوان خەڵکی، تا وای لێدێت پەیوەندی کۆمەڵایەتی ئەوەندە لاواز دەبێت دەگاتە ئەو ئاستەی کە لێکدابڕان و پشت لە یەکتر هەڵکردنی خەڵکی ئەوەندە زۆر دەبێت خەڵکی یەکتر ناناسنەوە لەبەر بەرژەوەندی دونیایی نەبێت..

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (عِلْمُهَا عِنْدَ رَبِّي لاَ يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا إِلاَّ هُوَ ، وَلَكِنْ أُخْبِرُكُمْ بِمَشَارِيطِهَا وَمَا يَكُونُ بَيْنَ يَدَيْهَا... وَيُلْقَى بَيْنَ النَّاسِ التَّنَاكُرُ فَلاَ يَكَادُ أَحَدٌ أَنْ يَعْرِفَ أَحَدًا)[1].

واتە: زانستی کۆتایی بونەوەر لای پەروەردگارمە کەس ناتوانێت کاتی ڕوودانی دەربخات خوای گەورە نەبێت، بەڵام من ئاگادارتان دەکەمەوە لە نیشانەکانی و ڕووداوەکانی پێش هاتنی: لە پێش هاتنی کۆتایی بونەوەر ئاژاوەو کوشتار هەڵدەستێ، .. وای لێدێت خەڵکی پشت هەڵدەکەن لە یەکترو کەس کەس ناناسێتەوە.

ئەم فەرمووده بەڵگەیە لەسەر واقیعی ئەمڕۆی خەڵکی، چونکە هەندێك لە خەڵکی خزم و دۆست و هاوڕێی خۆیان ناناسنەوە، تەنانەت لەوانەیە منداڵەکانیان لە شوێنە گشتیەکان بگەن بە یەکتری و یەکتر نەناسنەوە..

وە پەیوەندی خەڵکی لەو سەردەم لەسەر بنەمای بەرژەوندی دامەزراوەو، پەیوەندی لاوازیش کە لەسەر بنەماو بنچینەی لاواز پەیدا بوو زوو دەڕوخێت و دەبڕێتەوە، چونکە دروستبوونی لەسەر حەزو ئارەزووی خەڵکیەو دانەمەزراوە لەسەر باوەڕبوون بە خوای گەورەو برایەتی، بەڵکو تەنها تەماشای بەرژەوندییە دونیاییەکانی خۆیان دەکەن ئەگەر قابیلی بەدیهاتن بن، ئەگەر نا یەکسەر پەنا دەبەنە بەر لە یەکتر دابڕان.

---

(١) مسند الإمام احمد (٥/ ٣٨٩) برقم: (٢٣٣٥٤). قال شعيب الأرناؤوط: صحيح لغيره، وقال الهيثمي رجاله رجال الصحيح (مجمع الزوائد (٧/ ٣٠٩) ).

## بڵاوبوونەوەی سوو خواردن و پەیدابوونی بانکی ریبەوی

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر سوو خواردن بڵاودەبێتەوە بە نێو خەڵکی..

سوو (ڕیبا) بریتیە: لەو قازانجەی کە لەسەر قەرزدار دادەنرێت، ئینجا قەرزەکە پارە بێت یان هەر کەل و پەلێکی تر بێت بە سوو دەژمێرێت، سوو (ڕیبا) دوو جۆرە:

١- سووی نەسیئە[١].

٢- سووی فەضل[٢].

پێشەوا حوزەیفەی کوڕی یەمان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مِنِ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ خَصْلَةً .. وَأَكَلُوا الرِّبَا ..)[٣].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر حەفتاو دوو تایبەتمەندە... هەتا وای لێدێت خەڵکی پارەی ڕیبا دەخۆن..

پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ يَظْهَرُ الرِّبَا..)[٤].

---

(١) سووی نەسیئە: بەوە دەڵێن: کە ئەندازەیەك پارە بدەیت بە یەکێك بە قەرز بۆ ماوەیەك بە ئەندازەیەك قازانج، ئەگەر ماوەکە تەواو بوو نەیدایەوە داوای درێژکردنەوەی کرد بۆی درێژ دەکرێتەوە بە زیادەکەی پێشوشەوە کە دەبێت بە چەند دانە (أضعافا مضاعفة) سوودێکی زۆر لای خاوەن پارە کۆدەبێتەوە.

(٢) سووی فەضل: بەوە دەڵێن : کاتێك شتێك بگۆڕیتەوە بە باشتر، وەك (١٥) کیلۆ برنجی هەولێر بە (٣٠) کیلۆ برنجی سولەیمانی.

(٣) ضعیف: حلیة الأولیاء، لأبي نعیم (٣/ ٤١٠)، بە ژمارە (٤٥٥٥). وهو ضعیف کما قال الحافظ العراقي ( ٣/٢٩٧).

(٤) المعجم الکبیر (٧/ ٣٤٩) برقم: (٧٦٩٥).

واتە: لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی سوو خۆری سەر هەڵدەدات و بڵاودەبێتەوە.

لە فەرموودەیەکی تر دەفەرموێ: (لَيَأْتِيَنَّ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ لَا يَبْقَى مِنْهُمْ أَحَدٌ، إِلَّا آكِلُ الرِّبَا، فَمَنْ لَمْ يَأْكُلْ، أَصَابَهُ مِنْ غُبَارِهِ)[1].

واتە: ڕۆژێك دێت کەس نامێنێ سووی نەخواردبێ، ئەوەی کە سووی نەخواردبێ پڕیشکی بەرکەوتووە یان تۆزێ سووی لێ نیشتووە.

هەروەها لە نیشانەکانی قیامەت ناوی ڕیبا دەگۆڕن و ناوی دەنێن کڕین و فرشتن.. پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (ﷺ) دەڵێت: (إن من أعلام الساعة وأشراطها .. إذا استحلت هذه الأمة الربا بالبيع)[2].

لەم فەرموودەیە زۆر بە ڕاشکاوانە بۆمان بە دەردەکەوێت کە لە پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت ناوی ڕیبا دەگۆڕن و چەندین ناوی تری لێدەنێن..

بە ڕاستی ئەمەش موعجیزەیەکی گەورەیە، چونکە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) سوو خواردن هەبوو، بەڵام بە هۆی ئەوەی کە ئیسلام جەنگێکی گەورەی بەرپا کرد دژی سوو خۆری و حەرامی کرد تەواو کەم بویەوە.

باشە کێ دەڵێ ... سەر هەڵدەداتەوە؟

باشە ئەگەر سەری هەڵدایەوە چۆن ئاوا زۆر بڵاودەبێتەوەو هەموو کەس دەگرێتەوە..؟

ئەگەر سەیری ئەم سەردەمەی خۆمان بکەین ڕاستیەتی ئەم فەرموودەیە بە چاکی دەبینین، ئەوەتا هەموو کاروباری بانقەکان لەسەر سوو خواردن بەندەو خەڵکانێکی زۆر سل لە سوو خواردن ناکەنەوەو زۆر کەسیش ئەگەر ڕاستەوخۆ سوو نەخوات پڕیشکی پێ دەکەوێت.

بەرگی دووەم

---

(١) صحيح: أخرجه ابن ماجة في سننه، كتاب: التجارات (٢/ ٤٩٤)، والحاكم في المستدرك (٢/ ١١) برقم: (٢١٦٢)، قال الإمام الحاكم: فَهَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

(٢) كنز العمال في سنن الأقوال والأفعال، برقم: (٣٨٤٩٥).

بە ڕاستی ئەم فەرموودانە باس لە بارودۆخی ئەمڕۆی موسڵمانان دەکەن، بەشە هەرە زۆری خەڵکی ئەمڕۆ، تەنیا مەبەستیان پارە پەیداکردنە بێ ئەوەی بیر لە حەڵاڵی یان حەرامی ئەو پارەیە بکاتەوە، یان ئەو ڕێگەیەی کە پێی پەیدای دەکەن، هەر کارێك کە دەستی بۆ دەبەیت بە ڕێگەیەك لە ڕێگاکان حەرامی تێکەڵ بووە، تا وای لێهاتووە دینارێکی حەڵاڵ بووە بە شتێکی دەگمەن لەو لاشەوە سوو خۆری بووەتە بنەمای ئابووری ئەمڕۆ لە ئاستی گشت دەوڵەتان و کۆمپانیا بازرگانیەکان و سەرمایەدارەکان، کە کارە ئابووری و مامەڵە بازرگانیەکانیان هەر هەمووی لەسەر بنەمای سوو وەرگرتن دامەزراوەو گشت بانکەکانی جیهانیش ئەمڕۆ هەر لەسەر ئەو بنەمایە کار دەکەن، کە ئەمەش بۆتە مایەی ئەوەی هاوڵاتیان و جەماوەری موسڵمان بە گشتی بە چاری نا چارەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو دەزگا سوو خۆریانەدا بکەن و دەست تێکەڵی ئەو تاوانە بکەن کە خوای گەورە نەفرینی لە ئەنجامدەرانی کردووە.

تەنانەت خوای پەروەردگار سزای سەختی بۆ داناون، خوای گەورە ڕێگای نەداوە بە شەڕکردن لەگەڵ هیچ کەسێك تەنها ئەوانە نەبێت کە سوو دەخۆن، خوای گەورە دەفەرموێت: [يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾][1].

واتە : ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە لە خوا بترسن، وە دەست لەو سووە هەڵگرن کە لە لای خەڵکی ماوتانە ئەگەر بڕوادارن، ئەگەر دەستان لێ هەڵنەگرت ئاگاداربن بە جەنگێك لەلایان خواو پێغەمبەری خواوە، واتە: خواو پێغەمبەری خوا لەگەڵتان دەجەنگن، ئەگەر پەشیمان ببنەوە تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە ئەوا سەرمایەی ماڵەکانتان هی خۆتانەو ئەو کاتە نە ستەم دەکەن و نەستەمتان لێ دەکرێت.

---

(١) سورة البقرة، الآية: (٢٧٨ ٢٧٩).

ئەم ئایەتە سوو قەدەغە دەکات و جەنگ بەرپا دەکات لە دژی ئەوانەی کە سوو دەخۆن، خوا بە خوایەتی خۆی دەزانێت کە مرۆڤ لەو سەردەمەداو تا ڕۆژی دواییش گیرۆدەی سووخواردن دەبێت و سووش زیانی گەورە لە ئابووری تاك و کۆمەڵ دەدات بۆیە ئاوا باسی دەکات.

ئەگەر سەیری ڕێژەی تاکەکانی خەڵك و دەوڵەتان بکەین دەبینین کە سوو خواردن کاریگەریەکی خراپی هەبووە بۆ ڕوودانی ئاشووب و شەڕ، هەروەك ڕوودانی جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم، یەکێك لە هۆکارەکانی ئەم دوو جەنگە بریتی بوو لە پاشکەوتنێك و نەبوونی و قات و قڕی و لە کار وەستان و نەتوانینی پڕ کردنەوەی قەرزەکان، ئەمانە هەمووی کاری کردۆتە سەر خراپی باری ئابووری و بەرزبونەوەی ڕێژەی بێ کاری، وە هەرەس هێنانی زۆربەی کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنان و پیشەسازییە پێویستیەکان، لە ئەنجامدا بەرهەمهێن وای لێدێت ڕەنجی ڕۆژانەی بدات بۆ پڕکردنەوەی ئەو قەرزانە یان پڕکردنەوەی سووەکانی کە تەواو بوونی نیە، ئینجا بێ توانا دەبێت لە دانەوەیان، ئەمەش دەبێتە هۆی دروست بوونی چینایەتی لە نێو کۆمەڵگا، چینێك دەبێت بە خاوەنی ماڵێکی زۆر و چینەکانی تریش هەژار و نەدار دەمێننەوە.

بۆیە پێویستە نەفسی موسڵمان دوور بێت لەم کارە گەورەیە بۆ ئەوەی بزانێت کە چەند ناڕەوایە، وە ئەو کەسانەی کە پارەو پولیان لە بانقەکان داناوە لە ترسی ئەوەی لێیان نەدزرێت و نەفەوتێت پێش ئەوەی تووشی سزای خوا ببن پارەکانیان بگێڕننەوە سووەکەی وەرنەگرن، وە بزانن ئەوەی ئەو سووە بخوات وەك ئەوە وایە گۆشتی مردارەوە بوو بخوات .

نیزامی کۆمۆنیستی چونکە لەگەڵ فیترەت نەدەگونجا هەرەسی هێناو بوو بە پەندی زەمانە، لەبەرامبەریشیەوە نیزامی سەرمایەداری وا سەرەتای تیاچوونی لە ئەمریکا سەری هەڵداوە دونیای سەرقاڵ کردووە، پشت بە خوا ئەمیش دەبێتە پەندی زەمانە، چونکە لەسەر سووخواردن بنیات نراوە.

ئەم هەرەس هێنانەش لە خۆیەوە نەبووە، ئەمە پەیمانی خوایە بەرامبەر نیزامی سووخواردن کە بە بەرچاوی هەموو دونیاوە ئەمڕۆ دێتە دی، ئەمڕۆ باری ئابووری ئەمریکا لەو پەڕی خراپی دایە، قەرزی دەرەوەو ناوەوەی حکومەتی ئەمریکی دەگاتە (٤٥٠) ملیار دۆلارو عەجزی بازرگانیش زیاترە لە (٦٥) ملیار دۆلار، وە بێ کاری ڕوو لە زیاد بوونە[1].

ئەم ئەزمەی مالیەش بووەتە هۆی زیانی (٢،٤) تریلیۆن دۆلار، نزیکەی (٧٠) کۆمپانیای ڕەهنی عەقاریش کارەکانی هەڵپەساردووە لە سەرەتای ساڵی (٢٠٠٦)، وە زیاتر لە (١١) بانقی گەورەش ئیفلاسیان کرد.

(کریستۆفر والین) کە ئەندامە لە کۆمپانیای لێکۆڵینەوەی (تحليلات المخاطر المؤسسية) دەڵێت: نزیکەی (١١٠) بانقی تر کە سەرمایەکەیان (٨٥٠) ملیۆن دۆلارە تا ناوەڕاستی ساڵی (٢٠٠٩) دادەخرێن، (جۆرج بۆش) و کار بەدەستانی ئەمریکا بە (٧٠٠) ملیار دۆلار ویستیان فریای وەزعەکە بکەون، بەڵام ئەمە چارەسەری ناکات، چونکە وەك ئەوە وایە بۆتڵی خوێن بکەیتە نەخۆشێکەوە کە خوێنی زۆری لەبەر بڕوات.. بۆیە هەموو وڵاتانی جیهان لەم ئەزمەیەدا بەشیان هەیەو هەر دەوڵەتەو بە پێی خۆی زیانی لێکەوتووە.. ئەمڕۆ لە هەموو کاتێك زیاتر دونیا چاوی لەسەر نیزامی ئیقتیصادی ئیسلامیە کە وەك بەدیلێك سوودی لێ وەربگیرێ و مرۆڤایەتی لەم قەیرانە جەرگ بڕە ڕزگار بکات.

پاش ئەو دارمانە گەورەیەی ئابووری وڵاتان، ڕۆژنامە ئابووریە گەورەکانی جیهان داوای پەیڕەو کردنی شەریعەتی ئیسلامی دەکەن لە بواری ئابووری، تا ڕزگاریان ببێ لە خراپی نیزامی سەرمایەداری کە بۆتە هۆی ئەو زەرەرو زیانە گەورەیە.

---

(١) ئەمەریکا ئەگەرچی لە ڕێگەی هەیمەنەی دۆلارو داتاشراوەکانی توانیویەتی دەست بگرێت بەسەر بەشێکی زۆری بازرگانی جیهان، بەڵام لە ڕوانگەی ستراتیژیەتی درێژخایەنەوە دوچاری کۆمەڵێك شکست بوەتەوە چونکە هەناردەی ئەمەریکا کە دەگاتە (١١٤٠) ترلیۆنێك و سەدو چل ملیار لەبەرانبەردا بڕی ١٩٨٧ ترلیۆنێك و نۆسەدو هەشتاو حەوت ملیار دۆلار هاوردەی هەیە، کێشەکانی یەك لە دوای یەك ڕوو دەدات ..ئەمانەش هەموو وەعدو فەرمانەکانی خوای پەروەردگارە .

لە کردنەوەی گۆڤاری (چالینز)ی پاریسی، سەرنوسەر (بۆ فیس فانسۆن) بابەتێکی بڵاوکردۆتەوە بە ناونیشانی (البابا أو القرآن)، کە ئەمەش مشتومڕێکی زۆری دروست کرد لە ناوەندە ئابووریەکان، نووسەر باسی سەرمایەداری و ڕۆڵی خراپی کەنیسە دەکات کە نەیتوانیوە ئەو ڕەوشتانە بگۆڕێت و بێدەنگیش بووە لەو سووە زۆرەی کاری پێکراوە.. دواتر دەڵێت: وا دەزانم ئێستا لەم ئەزمەیەدا زیاتر پێویستمان بە خوێندنەوەی قورئانە لە جیاتی ئینجیل، تا تێبگەین خۆمان و بانقەکانمان توشی چی بووین، چونکە ئەگەر کاربەدەستانی بانقەکان ڕێزیان لە قورئان و تەعلیمات و ئەحکامەکانی بگرتایەو پەیڕەویان بکردایە، ئەوا تووشی ئەم ڕۆژە نەدەبووین.

(ڕولان لاسکین) سەرنوسەری ڕۆژنامەی (لوگۆڕناڵ دفیناس) داوای پەیڕەوی کردنی شەریعەتی ئیسلام دەکات لە بواری ئابووری کە سوو حەرام بکرێت، تا سنوورێك دابنرێت بۆ ئەو ئەزمەیەی کە بازاڕی جیهانی شڵەقاندووە.

دەوڵەمەندێکی بەریتانی لە ماوەیەکی کەم (٤٠) ملیار دۆلار زیانی لێکەوت بە هۆی سووخواردن.

گەورەترین بانکی ئەمریکی وەك (لیمان برازەرەز) و (ئەنتجرتی) و (واشنتون میوتشواڵ) ئیفلاس بوونی خۆیان ڕاگەیاند.. وە هەروەها نزیکەی (٣) ملیۆن ئەمریکی خانووەکانیان لە دەست دەدەن، چونکە ناتوانن قیستی مانگانەیان بدەن.

لە ساڵی (٢٠٠٨ ٢٠٠٩) کۆمپانیاکان و بانکەکانی ئەمریکا بە شێوەیەك هەرەسیان هێنا لە تەمەنی (٢٣٠) ساڵەی ئەمریکا زیانی ئاوای بە خۆیەوە نەدیووە، بۆیە (جۆرج دەبلیۆ بۆش) سەرۆکی پێشووی ئەمریکا زیاتر لە دوو مانگ بوو داوای لەسەرانی پیران و نوێنەران کرد کە فریای بانکەکان بکەون و لە ئیفلاس و توانەوە تەنیا لەبەردەم ریبا.

(لیندون لاروش) کە یەکێکە لە هەڵبژێردراوەکانی حیزبی دیموکراتی بۆ سەرۆکایەتی ئەمەریکا لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠٠٤) لە وتارێکیدا لە واشنتۆن لە (٢٠٠١/٧/٢٤) دا واتە: پێش (٤٨) ڕۆژ لە ڕووداوەکە دەڵێت: ئێمە

لە ئەزمەیەکی ئابووری داین، ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا خراپ دەبڕێ بەڕێوە، لە سەردەمی کارتەرەوە نیزامەکەمان لەسەر لێواری ئیفلاس بوونە، نیزامی هاتووچۆ.. وزە.. فێرکردن.. تەندروستی.. هتد، ژێر خانی ئابوریمان لە حاڵەتی داڕووخاندایە، لە سەدا هەشتای گەل خاوەن داهاتێکی کەمن، وە ئێستا حاڵیان زۆر خراپترە لە پێشترو لەچاو ساڵەکانی (١٩٧٧) دا، وە هەتا سندوقی دراوی نێو دەوڵەتی و سیاسەتی ئێستامان و (ول ستریت) و نیزامی ئیحتیاتی فیدراڵی بەسەرمانا زاڵ بێ، کەس بە تەمای چاك کردن و چاك بوون نەبێت، ئەگەر حاڵ وا بڕوات ئەوا سەرۆك (جۆرج دەبلیۆ بۆش) ناچار دەبێت واز لە پۆستەکەی بهێنێ پێش ئەوەی ماوەی سەرۆکایەتییەکەی تەواو ببێت، داڕووخان یەکسەر دەرناکەوێت، بەڵکو سیاسەتی هەڵە بەردەوام دەبێت هەتا لەپڕ کارەساتێك ڕوودەدات، ئینجا نەك هەر ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بەڵکو ئینگلتەرا و ئەڵمانیاو فەرەنساو ئیتاڵیا، واتە: ولاّتەکانی ئەوروپای ڕۆژئاواش لەسەر لێواری ئیفلاسن، لەلایەکی ترەوە گۆڕانی زۆری تازە ڕوویانداوە لە ئاسیادا، لە ڕووسیاو چین و هیندو تەنانەت یابانیش، یەکێتی (شنغهای) دامەزراوەو هەوڵیش لە ئارادایە بۆ دامەزراندنی هێڵی هاتووچۆ کە لە چینەوە دەست پێ دەکات و بە ئاسیادا تێدەپەڕێ و دەگاتە ئەوروپا.. ئێمە دەتوانین دەستی یارمەتی بۆ ئەو ولاّتانە درێژ بکەین کە لەسەر ئەو هێڵەن و یارمەتی ولاّتانی تریش بدەین بەبێ (سوو) بەمەش بازاڕی نوێ بۆ خۆمان فەراهەم دێنین، بەلاّم لەم بارودۆخانەدا لەم کاتانەدا جەنگی جیهانی بەرپا دەکرێ، کاتی خۆی ئینگلیز جەنگی جیهانی یەکەمی بەرپا کرد بۆ ئەوەی گۆڕانکاری لە ئاسیادا ڕوونەدات، لە پێشدا ئاگری جەنگیان لە بەلقان هەڵگیرساندو دوایی هەموو جیهانی گرتەوە، وە ئەوەی بەم کارە هەستاوە، ئەو هێزانەی ناو ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، کە ئامانجیش تیایدا ئەوەیە کودەتایەکی ئیداری بکەن و ولاّت بەرەو جەنگ بەرن، وە ئەوانە ئامادەن کاری تریش بکەن بۆ ئەوەی بگەنە ئامانجەکانیان[1].

---

(١) گۆڤاری المجتمع ژمارە: (١٤٧٥) ٢٠٠١/١١/٣.

# داگیرکردنی قودس لەلایان بێبڕواکانەوە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی قیامەت قودس بۆ جاری سێیەم داگیر دەکرێتەوە... بەڵام ڕۆژگارێك دێت کە مرۆڤ ئاوات دەخوازێت کە هەموو ماڵ و سەروەت و سامانی دونیا ببەخشێت تەنها لە پێناوی بینینی بەیتلومەقدیس، هەروەکو:

پێشەوا ئەبو زەر (ﷺ) دەڵێت:

(لَيُوشِكَنَّ أَنْ يَكُونَ لِلرَّجُلِ مِثْلُ سِيَةِ قَوْسِهِ مِنَ الْأَرْضِ، حَيْثُ يَرَى مِنْهُ بَيْتَ الْمَقْدِسِ خَيْرٌ لَهُ مِنَ الدُّنْيَا جَمِيعًا)[1].

بەڕاستی لەم سەردەمەدا ئەم وتەیەی پێشەوا ئەبو زەر (ﷺ) هاتۆتە دی، مرۆڤ ئامادەیە هەموو قوربانیەك بدات لە پێناوی ئەوەی قیبلەی دووەمی موسڵمانان ببینێت و نوێژی تێدا ئەنجام بدات..

تەنها بە سەیرکردنی جارێك دڵی خۆشەویسترە لەو هەموو ماڵ و سەروەت و سامانەی کە هەیەتی..

(١) المعجم الأوسط (٧/ ١٠٣) برقم: (٦٩٨٣). لَمْ يَرْوِ هَذَا الْحَدِيثَ عَنْ قَتَادَةَ إِلاَّ الْحَجَّاجُ، وَسَعِيدُ بْنُ بَشِيرٍ، تَفَرَّدَ بِهِ: إِبْرَاهِيمُ بْنُ طَهْمَانَ، عَنِ الْحَجَّاجِ، وَتَفَرَّدَ بِهِ: ابْنُ سُلَيْمَانَ بْنِ أَبِي دَاوُدَ، عَنْ سَعِيد.

# بڵاوبوونەوەی نەخۆشی چاوە قوڵە (طاعون)

یەکێ لە نیشانەکانی نزیك بونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی سەرهەڵدانی نەخۆشی چاوە قوڵەیە بە درێژایی ژیان..

پێشەوا عەوفی کوری مالیك (ﷺ) دەڵێت: لە شەڕی تەبووکدا چوومە لای پێغەمبەر(ﷺ) کەوا لە ژێر خێوەتێکی چەرمدا بوو، فەرمووی: (اعْدُدْ سِتًّا بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ مَوْتِي ثُمَّ فَتْحُ بَيْتِ الْمَقْدِسِ ثُمَّ مُوتَانٌ يَأْخُذُ فِيكُمْ كَقُعَاصِ الْغَنَمِ..)[1].

واتە: شەش شتان بژمێرە لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی: مردنی من واتە: پێغەمبەر (ﷺ) پاشان ئازادکردنی قودس، پاشان دەردێکتان تێدەکەوێ وەکو ئەو دەردەی تووشی مەڕ دەبێ و ئاوی لەبەر لوتی دەڕوا کە زۆرتانی پێی دەمرن.

(مُوتَان) واتە: زۆری مردن، وەکو پەتاو نەخۆشی کە دەکەوێتەوەو خەڵکانێکی زۆر لەناو دەبات[2].

(قُعَاص) یان (عُقاص) پەتاو نەخۆشیەکە ئاژەڵ دەگرێتەوەو شتێك لە لوتیەوە ڕێ دەکات تاکو لە پڕ دەمرێت.

چونکە سەرەتا لە لوتیان زیبکەیەك سەری هەڵ ئەدا هەتا کتوپڕ ئەیکوشت.. وە پێغەمبەر(ﷺ) بۆیە ئەو ناوەی لێناوە چونکە سەرەتا پەتاو نەخۆشیەکان لە جەستەدا وەك برین دەرئەکەوتن لە دواییدا لە پڕێکەوە ئەو کەسەی ئەکوشت..

لەم فەرمودە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو مردنەی پێغەمبەر(ﷺ) باسی دەکات زۆر خەڵکی پێ دەمرێت، یەکێکە لە نیشانەکانی هاتنی نزیك بوونەوەی ڕۆژی دوایی..

---

(١) صحيح البخاري (٤/ ١٠٢) كتاب: الجزية والموادعة، باب: ما يحذر من الغدر، برقم: (٣١٧٦).

(٢) الإشاعة لأشراط الساعة، (لا ١٠٢).

ئەم نیشانەیەش هاتە دی لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) لە ساڵی (١٨) ی کۆچی، کە وڵاتی فەڵەستین هەتا شام بڵاوبوویەوە، وە هاوەڵانێکی زۆری پێغەمبەریش(ﷺ) شەهید بوون بە دەست ئەم نەخۆشیەوە، یەکێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەبو عوبەیدەی جەڕاح بوو[1].

لە فەرموودەیەکی تر پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە نەخۆشی چاوە قوڵە فەرمویەتی: (.. غُدَّةٌ كَغُدَّةِ الْبَعِيرِ تَخْرُجُ بَيْنَ الْآبَاطِ وَالْمَرَاقِّ...)[2].

واتە: غودەیەك دووچاری (مەراق) دەبێت (مەراقیش ئەو غودەیەیە کە لە نێوان ڕان و سکی حوشتر دایە)، (الإبط)یش واتاکەی ڕوونە واتە: بن باڵ.

بۆیە هەر نەخۆشی چاوەقوڵە بوو لە سەدەکانی ناوەڕاستدا یەك لەسەر چواری دانیشتوانی ئەوروپای کوشت تا ئێستاش کە سەدەی بیست و یەکەمە لەناو ئێمەدا دەژی، نەخۆشی چاوەقوڵە لە کۆندا بە نەخۆشی «مردنی ڕەش» ناسرا بوو، ساڵانە نزیکەی (١٥٠٠) حاڵەتی لێ تۆمار دەکرێت لە ئەفەریقیاو ئاسیاو ئەمریکادا، بەڵام بەراورد لەگەڵ نەخۆشیەکانی وەکو (سیل و مەلاریا)دا کە ساڵانە ملیۆنەها کەس دەکوژن، نەخۆشی چاوەقوڵە وەکو سەدەکانی ناوەڕاست مەترسیدار نیە، چونکە خۆپاراستنی مومکینەو چارەسەر کردنیشی ئاسانە.

**طاعون:** بریتیە لە (میکرۆب)ێك ناوە زانستیەکەی (گرام نیگەتیف باسیللۆکۆکس)ە، ئەم میکرۆبە لەناو جۆرە کێچێکدا دەژی، ئەم جۆرە کێچە کاتێ دێتە سەر مرۆڤ یا هەر ئاژەڵێك ئەو ڤایرۆسەی ناو خۆی دەگوێزێتەوە بۆ ناو خوێنی ئەو مرۆڤە یا ئەو ئاژەڵە، بەم جۆرە ئەو مرۆڤە یان ئەو ئاژەڵە دووچاری نەخۆشی طاعون دەبێت.

ئەم ڤایرۆسە حەزی لە کرتێنەرەکانی وەکو رسق و مشکە، دەتوانن بۆ ماوەیەکی زۆر لەلاشەیاندا هەڵی بگرن و پاشان دەیگوازێتەوە بۆ کێچ و ئەویش

---

(١) البداية والنهاية، ابن كثير (٧/ ٩٠).

(٢) معجم ابن الأعرابي (٣/ ١١٣٩) رقم: (٢٤٥٦).

دەتوانێت بڵاوی بکاتەوە، بۆ بەدبەختی ئەو کێچانەی کە لەسەر کرتێنەرەکان دەخۆن دەتوانن لەسەر مرۆڤیش بخۆن، ئەم نەخۆشیە لە شارەکانی جیهانی سێیەمیشدا بڵاودەبێتەوە، بەڵام لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا بەهۆی سمۆرەو مشکە کێوی و سەگی مروجەوە تەنها لە گوندەکاندا بڵاودەبێتەوە.

ئەگەر نەخۆشیەکە لە ڕێگەی کێچەوە گوێزرایەوە بۆ مرۆڤ ئەوا تووشی چاوەقوڵەی ڕشانەوە دەبێت، لە ماوەی دوو ڕۆژ بۆ شەش ڕۆژ توشی تا دێت، لەگەڵ ئازارو ئاوساندا لە نزیك شوێنی گەستنی کێچەکە، بەڵام ئەگەر زوو چارەسەر نەکرێت ئەوا هەموو لەش دەگرێتەوە کە دەبێتە سەحایاو زاتە ڕیئە، لەگەڵ تووش بوون بە نەخۆشی زاتە ڕیئە ڕاستەوخۆ نەخۆشیەکە لە ڕێگەی کۆکەو پژمینەوە دەگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی تر.

بۆیە (١٤٤١) ساڵە پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداری کردوینەتەوە ئەگەر ئەم نەخۆشیە بڵاوبویەوە ئەوا خۆمان بپارێزین لە هەندێ هۆکار.

کابرایەك پرسیاری کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد سەبارەت بە نەخۆشی چاوەقوڵە، ئەویش فەرموی: (إِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ فَلاَ تَقْدَمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا، فَلاَ تَخْرُجُوا فِرَاراً مِنْهُ)[1].

واتە: ئەگەر بیستان لە وشکانیدا چاوەقوڵە بڵاوبویەوە مەچن بۆ هیچ شوێنێك، ئەگەر خۆشتان لە شوێنێکدا بوون نەخۆشی چاوەقوڵە بڵاوبویەوە ئەوێ بەجێ مەهێڵن.

بیریکەرەوە لەم ئامۆژگاریەی پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە ئەمە بناغەی زانستێکە ئەمرۆ پێی دەگوترێت: (الحجر الصحی) بوونیادی ئەم زانستەیە، بەڕاستی شیومانیزمی ئیسلام پیشان دەدات، ئەتوانێ ڕابکەیت و دەفەرموێت: ڕامەکە، تووش دەبیت یا تووش ببیت، دەمری یا بمری» گرنگ ئەوەیە خەڵکی تر پارێزراوبن»ئەگەر مردیشی خۆڕاگربە ئەوە شەهیدی، چونکە خۆشەویستمان(ﷺ) دەفەرموێ: (الطَّاعُونُ شَهَادَةٌ لِكُلِّ مُسْلِمٍ)[2].

---

(١) صحيح البخاري (٥/ ٢١٦٣)، باب: ما يذكر في الطاعون، برقم: (٥٧٣٠).

(٢) صحيح البخاري (٦/ ٤٢)، كتاب: الجهاد باب: الشهادة سبع سوى القتل، برقم: (٢٨٢٩).

واتە: نەخۆشی چاوەقوڵە شەهادەتە بۆ هەموو موسڵمانێك.

ئەم فەرموودەیە زانیارییەکی سەرسوڕهێنەری تێدایە!

بەشی یەکەمی فەرموودەکە ئاشکرایەو هەموومان دەزانین ئەگەر تاعون لە شوێنێك بڵاوبووەوە بۆ ئەوەی نەخۆشیەکەمان بۆ نەگوازرێتەوەو توش نەبین ناچینە ئەو شوێنە، بەڵام ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە بەشی دووەمی فەرموودەکەیە کە دەفەرموێت: ئەگەر لەو شوێنەشبوون مەچنە دەرەوە؟!

لەوانەیە کەسێك بڵێت چۆن شتی وا دەبێت؟ من ئەگەر لەو ناوچەیەبم و ساغبم و هێشتا نەخۆشیەکەم تووش نەبوبێت، بۆچی خێرا نەچمە دەرەوەی شارەکە؟! من بە چاوی خۆم کەسانی دەوروبەرم ببینم کە ڕۆژ بەڕۆژ تووش دەبن و بۆ گۆڕستانیان دەبەن، ئایا چاوەڕێ بکەم هەتا منیش تووش دەبم و دەمرم؟ ئایا چۆن پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی وادەکات کە ئەو شارە بەجێنەهێڵم؟ ئایا ئەوە خۆکوشتن نییە؟

ئەم گرفتە هاوەڵانیشی لە تاعونی عەمواسدا سەرسامکردبوو، کە تاعونێك بوو لە وڵاتی شام لەسەردەمی خەلیفە عومەر (رضي الله عنه) بڵاوبووەوە، خەڵکانێکی زۆر بەو تاعونەوە مردن، گەورە پیاوانی هاوەڵان لە کۆچبەران و پشتیوانان کۆبوونەوە، لەسەر ئەوەی ئایا چی بکەن؟ ئایا بڕۆنە شامەوە یان خۆیان دووربگرن؟

هەبوو دەیگوت: چۆن لە قەدەری خوا ڕا بکەین؟ هەتا عومەری کوری خەتاب بڕیاری یەکلاکەرەوەیدا و گوتی: لە قەدەری خوا ڕادەکەین بۆ قەدەرێکی تری خودا، نەخۆشی قەدەرەو تەندروستیش قەدەرە، ئێمە قەدەرە باشەکە هەڵدەبژێرین و ناچینە شام.

لەوێدا یەکێك لە هاوەڵان (رضي الله عنه) وتی: من زانیارییەکم لە پێغەمبەرەوە پێیەو ئەو فەرموودەی خوێندەوە کە نابێت بچینە ئەو شارەوەو نابێت کەسیش بێتە دەرەوە[١].

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، (لا ١٠٤).

دکتۆر عبدالمجید زەندانی (خوای گەورە بیپارێزێت) دەڵێت: ئەم پرسیارەمان ئاراستەی زانایەکی دانیمارکی کردووە، بەناوی (جۆن هۆنۆڤەر لارسن) کە مامۆستای بەشی بەکتریایە لە نەخۆشخانەی (گیسی حوکمی کۆپنهاگن)، پێمان گوت: ئەگەر بەڕێزتان بەرپرسی شارێکبن و ئەو شارە دووچاری نەخۆشییەکی کوشندەی ترسناك بێتەوە (تاعون) بەڕێزتان چی دەکەن؟

لە وەڵامدا گوتی: سوپا و هێزی سەربازی دەهێنم گەمارۆ دەخەمە سەر شارەکە، ناهێڵم کەس لەو شارە دەربچێت و ناشهێڵم کەسیشی لێبێتە دەرەوە، پێی وترا: کەس نەچێتە ناوی ئاشکرایە، بەڵام بۆچی ناهێڵیت کەسی لێدەربچێت؟!

گوتی: چونکە لێکۆڵینەوە زانستە نوێیەکانی ئەم دواییە دەریانخستووە کاتێك تاعون لە ناوچەیەك یان شارێك بڵاو دەبێتەوە، نزیکەی (٧٠ بۆ ٩٠٪)ی خەڵکەکەی دەبنە هەڵگری ڤایرۆسەکە، بەڵام تەنیا (١٠ بۆ ٣٠٪)ی خەڵکەکە نەخۆشییەکەی تیا دەردەکەوێت ئەوانی تر سەلامەتن، هەر چەندە ڤایرۆسەکەیان هەڵگرتووە بەڵام بەهۆی بەهێزی کۆئەندامی بەرگرییان بەسەر ڤایرۆسەکەدا زاڵ دەبن، میکرۆبەکە لە لەشیاندا دەبێت بەڵام زیانیان پێ ناگەیەنێت! هەندێکیان کەمێك لە نەخۆشیەکەیان تیا دەردەکەوێت بۆ نموونە تەنیا تای لێ دێت و چاك دەبێتەوە.

کەواتە مانەوەی کەسە ساغەکە لەو ناوچەیە ترسی نییە، وەك بڵێی بەهۆی کۆئەندامی بەرگرییەوە کوتراوە لە دژی نەخۆشییەکە.

کەواتە مانەوەی کەسە ساغەکە لەو ناوچەیە ترسی نییە، وەك بڵێی بەهۆی کۆئەندامی بەرگرییەوە کوتراوە لە دژی نەخۆشیەکە.

بەڵام کێشە گەورەکە لەوێدایە ئەگەر ئەو کەسە ساغەی هەڵگری میکرۆبەکەیە بچێتە دەرەوە بۆ شارێکی تر، ئەو کاتە میکرۆبەکە دەباتە دەرەوەو لە شارەکانی تر بڵاویدەکاتەوە، بەوەش ملیۆنانی تر لەناو دەچن.

پرسیار لە دکتۆر (جۆن هۆنۆڤەر) کرایەوە: ئایا ئەو ئابڵوقەی دەخرێتە سەر ئەو ناوچەیە تا چەند بەردەوام دەبێت؟

دکتۆر جۆن گوتی: هەتا ئەو کاتەی ڤایرۆسەکە سیفاتی خۆی دەگۆڕێت و زیانی نامێنێت، تایبەتەمەندە بۆ ماوەیی تازەی تێدا دروست دەبێت، تایبەتمەندییە دوژمنکارییەکەی تێدا نامێنێت[١].

هەروەها تاعون ناچێتە نێو شاری مەدینە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (إن الطاعون لا يدخل المدينة)[٢].

واتە: چاوە قوڵە ناچێتە شاری مەدینە.

ئەمەش موعجیزەیەکی پێغەمبەرە(ﷺ) تا ئێستاش ئەم نەخۆشیە نەچۆتە شاری مەدینەو ناشچێت، ئەم (حجر الصحی)یەی کە بونیادێکی ڕەسەنی تەندروستیە تەنها بۆ (طاعون) نیە، هەندێك نەخۆشی هەیە دەچوێنرێت بە (طاعون) خێرا بڵاودەبێتەوە وەك (کۆلیرا) کۆلیراش هەمان حوکمی هەیە، ئەگەر بڵاوبویەوە لە شوێنێکدا نابێت ئەو شوێنە بەجێ بهێڵێت، لە ڕووی شەرعیەوەش بۆی نیە بە جێی بهێڵێت، چونکە گوناهبار دەبێت.

ئەگەر سەیری مێژوو بکەین و بەراوردی بکەین لەگەڵ فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێت: ئەگەر (طاعون) لە وڵاتی خۆتانا بڵاوبویەوە ئەو شوێنە بەجێ مەهێڵن، ئەمەش دەردەکەوێت کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام (٧٥٠) ساڵ پێش ڕۆژئاوا یاسای (الحجر الصحی) داناوە.

ئەم یاسایەی (حجر الصحی)یە کە پێغەمبەر (ﷺ) دایناوە پاش (٧٥٠) ساڵ ڕۆژئاوا پەیکەری بۆ کرد.

د. محمد البار دەڵێت: چاوەقوڵە دەردێکی کۆنەو میسریە کۆنەکان لەسەر پەڕەی (البردی) شتیان نووسیوەو باسیان کردووە، لە ساڵی (٥٤٢)ی پێش هاتنی پێغەمبەر (عیسا) چاوەقوڵە لەسەر ڕووی ئەفەریقیاو ئەوروپاو ئاسیادا بڵاوبۆتەوە، (٥٠) ساڵ لەم وڵاتەوە بۆ ئەو وڵاتە دەگوێزرایەوەو نزیکەی (١٠٠) ملیۆن کەسی لەناو برد.

---

(١) www.eajaz.org

(٢) صحيح البخاري، كتاب: الطب، باب: ما يذكر الطاعون، برقم: (٥٣٣١)

هەروەها لە سەدەی (١٤) نەخۆشی چاوەقوڵە ئەوروپاو ئاسیای گرتەوەو تەنها لە ئەوروپادا (٢٥) ملیۆن کەسی کوشت، کە یەك لەسەر چواری دانیشتوانی ئەوروپا بوون، تا ئێستاش ناو بەناو لە وڵاتی هیندو وڵاتانی تردا بڵاودەبێتەوە[١].

لە ساڵی (١٣٤٨)ع نەخۆشی (طاعون) بە هەموو ئەوروپادا بڵاوبویەوە، لە دەرەوەی شاری (میلانۆ) دەزگایەکیان دانا بۆ خەڵکی بێگانە، خەڵکی بێگانە کە دێت ناهێڵن بڕواتە ناو شاری میلانۆوە (٣٠) ڕۆژ لەوێ ئەیهێڵنەوە، خواردنی ئەدەنێ و خزمەتی دەکەن نەبادا هەڵگری نەخۆشی (طاعون) بێ، بەو شوێنەیان دەگوت: (ترنتینا) لە (٣٠)ەوە هاتووە واتە: خانەی (٣٠) ڕۆژەکە.

دوای سەیر دەکەن هەر بڵاودەبێتەوە کردیان بە (٤٠) ڕۆژ هەرچی ڕێبوارێك لەوێوە دەهات بیەوێت بچێتە ئیتاڵیاوە (٤٠) ڕۆژ لەوێ گلیان دەدایەوە ..

لە ساڵی (١٣٣٧-١٣٥١)ع، نزیکەی (٧٥) ملیۆن کەس بە هۆی نەخۆشی (طاعون)ەوە مردن، وە مردنی (٢١) ملیۆن کەس بە هۆی نەخۆشی ئەنفلوەنزا لە ساڵی (١٩٨١) عیسایی بوو[٢].

لە مانگی تەممووزی ساڵی (١٨٣٠)ع هەواڵی دەرکەوتنی پەتای (طاعون) لە شاری تەبرێزی (ئێران) لە عێراقدا بڵاوبوویەوە، لە دوای دوو مانگ ئەم (طاعون)ە گەیشتە شاری کەرکوك... (داود) پاشای والی بەغدا داوای لە پزیشکی تایبەتی باڵوێزخانەی بەریتانیا کرد، کەوا بەرنامەیەکی چاك دابنێت بۆ بەربەست کردنی ئەم نەخۆشیەو بڵاوبونەوەی لە بەغدا، بەڵام لەبەر دواکەوتویی هەندێ لە دارو دەستەو نزیکانی والی ئەم بەرنامەیە سەری نەگرت و ڕێگە لەو کاروانانەی کە لە ئێران و کوردستانەوە ڕوویان دەکردە بەغدا نەگیرا، تا ئەوەبوو لە مانگی ئازاری ساڵی (١٨٣١)ع یەکەم حاڵەتی (طاعون) لە گەڕەکە پیسەکانی جولەکە لە بەغدا دەرکەوت، وە لەوێشەوە بڵاوبوویەوە بۆ گەڕەکەکانی تر، تا وای لێهات لە کۆتایی ئەو مانگەدا ڕۆژانە هەزار کەس بە (طاعون)

---

(١) الإعجاز العلمي في السنة النبوية، (١/ ٥٥٠).

(٢) الإشاعة لأشراط الساعة، (لا ١٠٨).

دەمردن، لە ناوەڕاستی مانگی نیساندا ژمارەی قوربانیەکان گەیشتە (٣٠٠٠) هەزار کەس لە ڕۆژێکدا... تا وای لێهات فەرمانبەر نەما ژمارەی قوربانیەکان تۆمار بکات، بەڵکو لە دواتردا ئەم ژمارەیە بەرزبویەوە بۆ (٩٠٠٠) کەس لە یەك ڕۆژدا، تا وای لێهاتبوو کە لە شەقام و کۆڵانەکاندا جگە لە هەڵگرانی تەرم هیچ کەسێك نەدەبینرا، تەنها ئەوانەی ئاو و کفنیان بۆ مردوو دەهێنا، مردن ئەوەندە ئاسایی بویەوە خەڵکی نزیکترین و خۆشەویسترین کەسانی خۆیان بە خاك دەسپارد بەبێ هیچ دڵگرانیەك، کار گەیشتبووە ئەوەی دەردەداران لەسەر جادەو شەقامەکاندا دەهاتن بە لاداو کەس نەبوو کفن و د فنیان بکات، سەگ و دڕندەش دەکەوتنە خواردنی لاشەکانیان، هەندێ جاریش هێشتا زیندوو بوو، لە هەمووی ناخۆشتر گریانی ئەو منداڵانە بوو کە دایکەکانیان مردبوون.

بۆیە لە ڕۆژانی یەکەمی ئەم طاعونەدا کە بە ترسناکترین پەتا دادەنرێت لە مێژووی عێراقدا، داخوازی لەسەر کفن و گۆڕو پێویستیەکانی بە خاك سپاردن زۆر بوو، ئەمەش بووە هۆی بەرز بوونەوەی نرخی ئەم شت و مەکانە، هەتا کار گەیشتە ئەوەی کفن لە بازاڕدا نەما، بە هەمان شێوە نرخی ئاویش بەرزبویەوە کە بۆ شۆردنی مردووەکان بەکار دەهێنرا، تا وای لێهات ناچار خەڵکی خۆیان دەچوونە سەر ڕووباری دیجلە بۆ هێنانی ئاو.

دزو جەردەکانیش ئەم هەلەیان قۆستبویەوە دەچونە سەر ماڵان بەبێ ئەوەی کەس بەرگریان لێ بکات، چونکە خاوەن ماڵەکان یان مردبوون ویان لەسەر مەرگ دابوون، لە هەمووی سەیرتر دەگێڕنەوە کە لەو ڕۆژگارەدا پیاوێك لە خەویدا کۆمەڵە کەسێك دەبینێت کە ژمارەی مردووەکانی هەموو ماڵێك تۆمار دەکەن، وە ئەو ژمارەیەی کە نوسیان بۆ ماڵ و منالی ئەم پیاوە بە (طاعون)ە کە مردبوون، تەنها خۆی مابویەوە، کاتێك لە خەوەکەی بەخەبەر هات.. خۆی بۆ مردن ئامادەکرد.. خۆی شۆردو کفنی پۆشی و ڕووەو قیبلە ڕاکشا چاوەڕوانی مردنی دەکرد، لە ناکاو دزێك خۆی کرد بە ماڵەکەدا وای زانی کە خاوەن ماڵەکە مردووە.. هەر ئەوەندەی زانی خاوەن ماڵ بە کفنی سپیەوە هەستایەوەو هاواریکرد بەسەریدا، دەست بەجێ دزەکە گیانی دەرچوو[1].

---

(١) لمحات اجتماعية من تأريخ العراق الحديث . د. علي الوردي ، بەشی یەکەم: (لا : ٢٦٩-٢٧٤) .

نەخۆشی (چاوەقوڵە) گەلێك ناوی لێنراوە، کە هەموویان ترسێنەرن، وەکو «مردنی ڕەش» و «تاعونی ڕەش»، ئەم مەسەلەیە ئیعجازێکی فەرموودەی پێغەمبەری (ﷺ) تێدایە؟

لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی بەدڕەوشتی لەزۆر شوێنی دونیادا، لە ساڵی (١٣٤٧)ع، نەخۆشی چاوەقوڵە بڵاوبوویەوە لە خوارووی ئاسیاو چین، نزیکەی (٥٧) ملیۆن کەسی کوشت، ئینجا گەیشتە ئەوروپاو دوو لەسەر سێی دانیشتوانی ئەوروپاشی قڕکرد، لەوەوە ناویان نا ڕەشە مردن، کە ئەمەش زۆرترین ڕێژەی مردنە لە مێژوودا.

زانایانی ڕۆژئاوا خۆیان دەڵێن (نەخۆشی چاوەقوڵە زیاتر لە (٢٠) ملێون کەسی کوشت لە چەند هەفتەیەکدا لە ئەوروپا، سزای خوا بوو بۆیان لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی بەدڕەوشتی)[١].

زانایانی سەردەم جەخت دەکەنە سەر ئەوەی کە ئەم نەخۆشیە لە پڕ دەردەکەوێ و لەپڕیش دیار نامێنێ، ئەوەتا تا سەدەی نۆزدە چاوەقوڵە بەردەوام لێرەو لەوێ دەردەکەوت و بە ملیۆنەهای لەناو دەبرد، دواتر ئەو دیاردە نەماو نەخۆشی تر دەرکەوت کە نەبوون، وەکو ئایدز ئەمەش کت و مت ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگرێتەوە کە دەفەرموێت: (يا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ خَمْسٌ إِذَا ابْتُلِيتُمْ بِهِنَّ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ تُدْرِكُوهُنَّ: لَمْ تَظْهَرِ الْفَاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قَطُّ، حَتَّى يُعْلِنُوا بِهَا، إِلَّا فَشَا فِيهِمُ الطَّاعُونُ، وَالْأَوْجَاعُ الَّتِي لَمْ تَكُنْ مَضَتْ فِي أَسْلَافِهِمُ الَّذِينَ مَضَوْا، وَلَمْ يَنْقُصُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ، إِلَّا أُخِذُوا بِالسِّنِينَ، وَشِدَّةِ الْمَئُونَةِ، وَجَوْرِ السُّلْطَانِ عَلَيْهِمْ، وَلَمْ يَمْنَعُوا زَكَاةَ أَمْوَالِهِمْ، إِلَّا مُنِعُوا الْقَطْرَ مِنَ السَّمَاءِ، وَلَوْلَا الْبَهَائِمُ لَمْ يُمْطَرُوا، وَلَمْ يَنْقُضُوا عَهْدَ اللَّهِ، وَعَهْدَ رَسُولِهِ، إِلَّا سَلَّطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ غَيْرِهِمْ، فَأَخَذُوا بَعْضَ مَا فِي أَيْدِيهِمْ، وَمَا لَمْ تَحْكُمْ أَئِمَّتُهُمْ بِكِتَابِ اللَّهِ، وَيَتَخَيَّرُوا مِمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ، إِلَّا جَعَلَ اللَّهُ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ)[٢].

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، (لا ١٠٩).

(٢) صحيح: أخرجه الحاكم في (المستدرك) كتاب: الفتن والملاحم، باب: ذك خمس بلاء أعاذ النبي منها للمسلمين (٤/ ٥٤ ٥٤١) وصححه ووافقه الذهبي.

واتە: ئەی کۆمەڵی موهاجیرەکان پێنج بەڵا هەن ئەگەر دوو چاریان ببن پەنا بەخوا دەگرم لەوەی پێیان بگەن، داوێن پیسی لەهەر میللەتێکدا سەری هەڵدابێت و ئاشکرا بووبێت، ئەوا جۆرە تاعون و دەردو نەخۆشیەکی وایان لەناودا پەیدا دەبێت کە هەرگیز لە باوو باپیرانی پێشتریاندا نەبینراوە، وەکو نەخۆشی ئایدز کە پێشتر نەبینراوە، وەئەگەر کێشانەی پێوانەو تەرازووەکانیان کەمکەن، ئەوا دووچاری گرانی و بارقورسی و ستەمی دەسەڵات داران دەبن، وەئەگەر زەکاتی ماڵەکانیان نەدەن ئەوا بارانیان لە ئاسمانەوە لێ دەگیرێتەوەو لەبەر خاتری ئاژەڵیش نەبوایە هیچ نەدەباری، وەهەرکات پەیمانی خواو پێغەمبەرەکەتان شکاند ئەوا خوای گەورە دوژمنێکی دەرەکیتان بەسەردا زاڵ دەکات کە بەشێکی دەسەڵاتەکەی ژێر دەستان لێ بستێنن، وەئەگەر پێشەواو سەرکردەکانیشتان حوکم بە بەرنامەی خوا نەکەن و بەئارەزووی خۆیان هەندێکی لێ وەرگرن و ئەوی تری وەلا بنێن، ئەوا خوای گەورە لە ناو خۆیاندا کوشتار دەخاتە نێوانیان.

پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر خوای گەورە سروشی بۆ نەناردبێ چۆن دەتوانێت ئاوا بە وردی قسەی زاناکانی ئەم سەردەمە بکات، لەکاتێکدا زانایانی سەردەم لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی زۆرەوەو لە ئەنجامی سەرهەڵدانی نەخۆشیەکانەوە ئەو دیاردەیەیان باسکردووە.

پێشەوا ئەبو حەسەنی مەدائینی دەفەرموێ: بەناوبانگترین تاعونەکان کە مێژووی ئیسلام تۆماری کردبێت ئەمانەن:

**یەکەم:** تاعونی شێرەویەی لە خاکی مەدائین، ئەمەش لە سەردەمی پێغەمبەر گیان (ﷺ) لە ساڵی (٦)ی کۆچی..

**دووەم:** تاعونی عەمواس لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) لە خاکی شام، کە نزیکەی (٢٥) هەزار کەس شەهید بوون..

**سێیەم:** تاعونی عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر(ﷺ) لە مانگی شەوالی ساڵی (٦٩)ی کۆچی، بەس لە ماوەی (٣) ڕۆژ (٧٠٠٠٠) هەزار کەس شەهید بوون.. لە شەهیدەکان

ئەنەسی کوڕی مالیك و (ﷺ) (٣٨) لە منداڵەکانی وەفاتیان کرد، وە عەبدوالرحمانی کوڕی ئەبی بەکرە (ﷺ) خۆی و (٤٠) منداڵی شەهید بوو..

**چوارەم:** تاعونی (فەتەیات) لە شەوالی ساڵی (٨٧)ی کۆچی [1]..

مێژوو چەندین کارەساتی ترسناکی گەورەی تۆمارکردووەو هەندێکیشیان لەبیرچوون، بەڵام ئەوانەی کە بەتەواوی تۆمارکراون ئەمانەن:

• مردنی (٧٥) ملیۆن کەس بەهۆی نەخۆشی تاعون و مردنە ڕەشەوە لە ساڵەکانی (١٣٣٧ ١٣٥١) .

• مردنی (١٠) ملیۆن کەس بەهۆی نەخۆشی وشکانی و بێ بارانی لە هیندیستان لە ساڵی ١٧٧٠[2].

بەڕاستی ئەم فەرمودەیە بە تەنها بەسە کە بەڵگە بێت لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەو پێغەمبەرەی کە خوا خۆی شایەتی بۆ ئەدات و هەر ئەوەشی بەسەو ئەمانەی تر هەر بۆ دڵ قایمی و بیانوو بڕینی خەڵکە، تا ببێ بە حوجە بەسەریانەوە.

لە ساڵی ٢٠٢٠ ڤایرۆسێك زۆر بە خێرایی بڵاوبویەوە بەناوی (کۆڕۆنا کۆڤید ١٩) کە زۆربەی وڵاتانی جیهانی گرتەوە.. ئەم کۆڕۆنایە بە بەشێك لە تاعون هەژمار دەکرێت..

ئەم ڤایرۆسە زۆر بەخێرایی بڵاودەبێتەوە، وە کاریگەری ئەم نەخۆشییە بۆ سەر مرۆڤ سی و گورچیلەکان تێك دەدات.. ئەم نەخۆشیە لە وڵاتی چین سەری هەڵدا تا گەیشتە هەرێمی کوردستان..

بە پێی داتای نوسینی ئەم بابەتە، ئەمڕۆ ٢٠٢٠/٩/٦ ژمارەی تووشبووان لەسەرتاسەری جیهان گەیشتە (٢٧٢٣٤٠٥٦) بیست و حەوت ملیۆن و دووسەدو سی و چوار هەزارو پەنجاو شەش کەس.

---

(١) حسن المحاضرة (٢/ ٢٥٢).

(٢) الإشاعة لأشراط الساعة، (لا ١١٠).

بەرگی دووەم

ئەوانەی بەهۆی ئەم ڤایرۆسەوە مردوون لە جیهان گەیشتە(٨٨٦٢٢٧) هەشت سەدو هەشتاو شەش هەزارو دوو سەدو بیست و حەوت کەس..

ڕێژەی تووشبووان لە وڵاتی عێراق (٢٦٠٣٧٠) دوو سەدو شەست هەزارو سێ سەدو حەفتا کەس، وە (٧٥١٢) حەوت هەزارو پێنج سەدو دوانزە کەسیش مردوون بە هۆی ئەم ڤایرۆسەوە..

ژمارەی تووشبووان لە هەرێمی کوردستان گەیشتە (٣٢٢١٠) سی و دوو هەزارو دووسەدو دە کەس، وە (١٢٠٧) هەزارو دووسەدو حەوت کەسیش بەهۆیەوە مردووە.

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە:**

١ـ بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی جەستە بۆ سەروو ٣٨ ..

٢ـ توندبوونی هەناسە..

٣ـ کۆکەی سەخت..

٤ـ ئاو هاتن بە لوتدا..

٥ـ ئازاری ماسولکە..

## کەم بوونی زانست و زۆربوونی نەزانین لە کارو باری ئایین

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی کەم بوونی زانست و بڵاوبوونەوەی نەزانینە، مەبەست لە کەمبوونی زانست و زۆربوونی نەزانین زانست و زانیاری شەرعیە.

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يُرْفَعَ الْعِلْمُ ، وَيَثْبُتَ الْجَهْلُ..)[1].

واتە: لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە زانست هەڵدەگیرێت و نەزانین دەچەسپێت.

پێشەوا عەبدوڵڵای کوری ئەبو موسا(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (إِنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ لَأَيَّامًا يَنْزِلُ فِيهَا الْجَهْلُ....)[2].

واتە: لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی ڕۆژانێك هەن نەزانینی تێدا دادەبەزێت[3].

پێشەوا عەبدوڵڵای کوری عەمری کوری عاص(ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو:

(إِنَّ اللَّهَ لاَ يَقْبِضُ الْعِلْمَ انْتِزَاعًا يَنْتَزِعُهُ مِنَ الْعِبَادِ وَلَكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمَ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ حَتَّى إِذَا لَمْ يُبْقِ عَالِمًا اتَّخَذَ النَّاسُ رُؤُوسًا جُهَّالاً فَسُئِلُوا فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا)[4].

---

(١) صحيح البخاري (٩/ ٣٣٠) كتاب: النكاح باب: يقل الرجال ويكثر النساء، برقم: (٥٢٣١).

(٢) صحيح البخاري (٩/ ٤٨) باب: ظهور الفتن، برقم: (٧٠٦٢).

(٣) واتە: زانستی دین وردە وردە بەرو نەمان دەچێت و نەزانین بەدین وردە وردە زۆر دەبێ.

(٤) صحيح البخاري (١/ ١٧٤) كتاب: العلم، باب: كيف يقبض العلم، برقم: (١٠١).

واتە: خوای گەورە زانست هەڵناگرێت بە لێكردنەوە لە دڵی بەندەكانی بكاتەوە، بەڵام زانست ناهێڵێت بە نەهێشتنی زاناكان، هەتا كاتێك وای لێهات زانا نەما، ئیتر خەڵكی كەسانێكی نەزان دەكەن بە گەورەی خۆیان و پرسیاریان لێ دەكەن، ئەوانیش بە نەزانی فتوایان بۆ دەدەن، سەر لە خۆشیان و لەوانیش دەشێوێنن.

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت:

ئەم فەرموودەیە مەبەستی نەمانی زانستە كە فەرموودەكانی پێشتر ئەوە ڕوون دەكاتەوە كە نەمانی زانست بەوە نیە كە لە نێو دڵدا بسڕێتەوە كە پارێزگاری لێ كراوە، بەڵكو واتای ئەوەیە كەوا هەڵگرانی دەمرن كە زانایانن و جا خەڵكیش خەڵكی نەزان دەكەن بە دەم ڕاست و كار دەكەن بە بۆچوونی كاڵیان جا خۆیان و ئەوان گومڕا دەكەن[1].

پێشەوا ئیبنو بەطال(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت:

ئەوەی كە ئەم فەرموودە لەخۆی دەگرێ لە واتادا لە نیشانەكانی ڕۆژی دوایی ئەوا بەڕاستی وا ئێمە بەچاوی خۆمان دیمان، چونكە بەڕاستی زانست كەم بویەوەو نەزانین سەری هەڵداوە[2].

ئیبنو حەجەر(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت:

ئەوەی كە دیارە كە ئیمام باسی كرد زۆر بەرچاوە لەگەڵ ئەوەشدا بەرامبەریان هەیە، چونكە ئەو قسەیە ڕەتی ئەوە ناكاتەوە كە كۆمەڵێ لە زانایان هەبن و بوونیان هەبێ، چونكە ئەم جۆرە زانایانە لەوانەیە ئەو كات ژێر دەستە یاخود گیراوبن لە نێو ئەم جۆرە خەڵكانەدا[3].

---

(١) شرح صحيح مسلم (١٦/ ٢٢٣ ٢٢٤).

(٢) فتح الباري (١٣/ ١٦).

(٣) فتح الباري (١٣/ ١٦).

مەبەست لە زانست لێرەدا زانستی قورئان و سوننەتە، کە ئەوەش زانست و میراتی پێغەمبەرانە لەبەر ئەوەی زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، وە بەنەمانیان زانست دەڕواو نامێنێ، وە سوننەتی پێغەمبەریش(ﷺ) دەمرێ و بیدعەکان دەردەکەون و نەزانین گشت خەڵك دەگرێتەوە.

هەر چەندە ئێمە دوورکەوینەوە لەسەردەمی پێغەمبەرایەتی زانستی ئایینی کەمتر دەبێت و نەزانین زۆرتر دەبێ، لەبەر ئەوەی هاوەڵان زاناترینی ئەم ئوممەتە بوون لە پاشان چەرخی دوای ئەوان پاشان سەدەی دوای ئەوان.

ئەوەندەی بۆی بچم زۆربوونی نەزان بە مردنی زانایان نیە، بەڵکو زانایان لە پیشە سەرەکیەکانیان دوور دەخرێنەوە، کە ئەویش فێرکردن و تێگەیاندنی خەڵکیە.

پێشەوا یەزیدی کوری مەیسەر(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت:

هەر کەسێك زانیاریەکەی بۆ ڕێی خوا بێت خوای گەورە ڕووی گەشاوە دەکات و ڕووی بەندەکانیشی بۆ گەشاوە دەکات، بەڵام هەر کەسێك زانیاریەکەی بۆ ڕێی خوا نەبێت و ڕووی گرژ دەبێت خوای گەورە ڕووی بەندەکانیشی بۆ گرژ دەکات.

پێشەوا سەعید نورسی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت:

زانست مەبەستێکی دوورە بە تیروکەوان ڕاو ناکرێت، بە تیرو پشك دابەش ناکرێت لەخەودا نابینرێت، بەلغاو نابەسترێت، لە باوانەوە بۆمان نامێنێتەوە، وە لە هەر زەویەك ناچینرێت چونکە خۆڵە پاکەکەی سووربوونەو بادانی ڕەحمەتی سەرکەوتنەو هەوایەکی ڕەفتارەو تێکۆشانی بە سودی ئارام گرتنە شتێکە بە دەستمان ناکەوێت هەتا گیانمان وەرنەگرێت مەبەستێکە بە چنگ ناکەوێت هەتا مرواری بۆ ڕانەخرێت بەرد پاڵپشتێتی بێزاربوونی بۆ نیە سواری مەترسی دەبێت، شەونخونی هەمیشە کارەکەیەتی و برادەرەکەی سەفەرکردن و زۆر تێڕوانین و کارەکانی بیرکردنەوەو زانستبەرێکە تەنها بۆ چاندن باشە، وە تەنها لە گیاندا دەچێنرێت.

(جولیان هکسیلی ) دەڵێت:

دەبێت خۆمان ئامادە بکەین بۆ ڕووبەڕوو بونەوە لەگەڵ ڕاستی چونکە نەزانینمان بۆ ڕاستیەکانی کۆتایی هەتا هەتایە لەگەڵمان بەردەوامەو توانامان سنوور دارە.

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب(ﷺ) دەڵێت: (إِذَا مَاتَ الْعَالِمُ انْثَلَمَ فِي الإِسْلامَ ثَلْمَةً ، وَلا يَسُدُّهَا شَيْءٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ)[١].

واتە: ئەگەر زانایان کۆچی دواییان کرد عەیب و کەمتەرخەمی لە ئیسلام دروست دەبێت، عەیبەیەك تا ڕۆژی دوایی داناخرێت.

پێشەوا جابری کوڕی عەبدوڵلا (ﷺ) دەڵێت: مردنی زانایان دەبێتە پەڵەیەك لە ئیسلام داناخرێت هەتا ڕۆژو شەو مابێت.

پێشەوا ئەبو دەرداء(ﷺ) دەڵێت: مردنی هۆزێك ئاسانترە لە مردنی زانایام کە ئەستێرەیەکی درەوشاوەیە.

خوای گەورە دەفەرموێ: [أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَأْتِي الْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا ].

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عەباس(ﷺ) دەفەرموێ: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر مردنی زانایان.

پێشەوا ئەبو جەعفەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: مردنی زانایەك لەلای شەیتان خۆشەویسترە لە مردنی حەفتا خوا پەرست[٢].

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ( لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى.. يغيض العلم غيظا ويفيض الجهل فيظا..)[٣].

---

(١) المقاصد الحسنة فيما اشتهر على الألسنة، بة ذمارة (٧٦).

(٢) كشف الخفاء، (١/ ٨٧).

(٣) ضعيف: أخرجه ابن عساكر في تاريخ دمشق (٤٥٣/٧) والطبراني في المعجم الكبير، (٢٢/٣٧٦/ ١ ٩٤)، وابن عساكر في «التاريخ « (١٠٢٩/٨) وقال الألباني في السلسلة الضعيفة : ضعيف.

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت.. هەتا زانست بەرەو کەمبوون دەڕوات چ کەمبوونێك، وە نەزانین بڵاودەبێتەوە چ نەزانینێك.

هەر چەندە هەندێك لە زانایانی فەرموودەناس دەفەرموون: ئەم فەرموودە بێ هێزە.. بەڵام لە واتادا زۆر واقیعیە.

# دووڕوویی زمانەکان و درۆی دڵەکان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی خەڵکی قسەی زۆر دەکەن و کرداری کەم ئەنجام دەدەن.

وە زانایان ئەوانەن کەوا کاردەکەن بە زانستەکانیان و ئومەتی ئیسلام تێدەگەیەنن لە ڕاستیەکان و ڕێگای ڕێنمایی و ڕاستیان نیشان دەدەن لەبەر ئەوەی زانست بەبێ کردار سودی نیە، بەڵکو دەبێتە بەڵایەك بۆ خاوەنەکەی.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عومەر(ﷺ) دەڵێت:

گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو:

(مِنِ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ:

أَنْ يُرْفَعَ الأَشْرَارُ

ويُوضَعَ الأَخْيَارُ

ويُفْتَحَ القَوْلُ

ويُحْبَسَ العَمَلُ

ويُقْرَأَ فِي القَوْمِ المَثْنَاةُ

قيل: وما المثناة؟

قال: مَا كُتِبَ سِوَى كِتَابِ اللهِ)[1].

واتە: خراپەکاران بەرز دەکرێنەوەو پیاوچاکان سوکایەتیان پێ دەکرێت و قسە زۆر دەکرێت و کردەوە ڕادەوەستێنرێت، وە لەو گەلەدا (المثناة) دەخوێندرێتەوە.

---

(١) صحيح: رواه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٥٥٤) برقم: (٨٦٥٩) وصححه ووافقه الذهبي، وصححه الألباني في الصحيحة (٢٨٢١).

گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (المثناة) چییە؟ فەرمووی: پەرتوکێك دەخوێننەوە لە جێگای کتێبی خوای گەورە.

(المثناة) بە چی دەوترێت:

واتە: زانایەکانی بەنی ئیسرائیل لە دوای پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لێ بێ) کتێبێکیان لە نێو خۆیان کرد بە دەستورو یاسا جگە لە کتێبی خوای گەورە.. لەم سەردەمە ئەوە بەدی دەکەین کە ئەوەندەی خەڵك خەریکی خوێندنەوەو نوسینی وتارو بابەتەکانن نیو هێندە خەریکی خوێندنەوەی قورئان نین..وە خەڵکی هێندە زانستەکان لە نووسراوی بەندەکان وەردەگرن نیو ئەوەندە سوود لە قورئانی پیرۆز نابینن..

هەر چەندە بەندە وای بۆ دەچێت کە ئەمرۆ ئەوەندەی خەڵکی شوێن چیرۆك گێڕانەوە کەوتووە شوێن قورئان و سوننە نەکەوتوون، بۆیە ئەمەش بە نیشانەیەکی هاتنی ڕۆژی دوایی هەژمار دەکرێت.

لە ڕیوایەتی پێشەوا بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەم زیادەیە هاتووە کە دەفەرموێ: (وينقص العمل)[١]

واتە: کارو کردەوەو عیبادەت کەم دەبێتەوە.

پێشەوا زەهەبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت:

زانایان تەنیا کەمێ لە زانست نەبێ پێیان نەبەخشراوە، بەڵام ئەمرۆ کەمێکی کەم نەبێ لە زانستەکان نەماوە لە نێو خەڵکێکی ژمارەکەمدا، وە کەمیش لەم ژمارە کەمە کردار بەم زانستە کەمە دەکەن، جا هەر خوای گەورە پشت و پەنامان بێت[٢].

واتە: ئەو خەڵکە قسەی جوان دەزانن بەڵام کاری پێناکەن، بە زمان یەکیان خۆش دەوێت بەڵام دڵیان پڕ لە ڕق و کینەیە، تۆ دەزانیت کە دەربڕینی زەردەخەنەیەك لە بەرانبەر براکەتدا وەك چاکەیەك وایە، خەڵکی لە مامەڵەکردنیاندا دبلۆماسیانە

---

(١) صحيح البخاري (٨/ ١٤) باب: حسن الخلق، برقم: (٦٠٣٧).

(٢) تذكرة الحفاظ (٣/ ١٠٣١).

ڕەفتار دەکەن، زمانەکان لە هەنگوین شیرینترن بەڵام دڵەکانیان لە ئارام گرتن تاڵترن، ئەمەش نیشانەی دووڕوویە لە بەرامبەر مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا.

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (ﷺ) ڕۆژێکیان بە کابرایەکی گوت:

(سَيَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ
قَلِيلٌ فُقَهَاؤُهُ
كَثِيرٌ قُرَّاؤُهُ
تُحْفَظُ فِيهِ حُرُوفُ الْقُرْآنِ
وَتُضَيَّعُ حُدُودُهُ
كَثِيرٌ مَنْ يَسْأَلُ
قَلِيلٌ مَنْ يُعْطِي
يُطِيلُونَ فِيهِ الْخُطْبَةَ
وَيَقْصُرُونَ الصَّلاَةَ
يُبَدُّونَ فِيهِ أَهْوَاءَهُمْ قَبْلَ أَعْمَالِهِمْ)[1].

واتە: ڕۆژێك دێت
خەڵکی تێگەیشتوو و زانا کەم دەبێت و
قورئان خوێن زۆر دەبێت
پیتەکانی قورئان لەبەر دەکەن بەڵام سنورەکانی دەبەزێنرێت
زۆریان پرسیار دەکەن
کەمن ئەوانەی دەیبەخشن
وتاری هەینی درێژ دەکەن
نوێژی کورت دەکەن
بە دوای ئارەزووەکانیان دەکەون پێش کردەوەکانیان.

---

(١) صحيح: أخرجه مالك (١/ ١٧٣)، والبخاري في (الأدب المفرد) برقم: (٧٩٠)، والطبراني في الكبير، برقم: (٩٤٩٦) وهو موقوف، وقال الهيثمي في المجمع (٧/ ٢٨٥) ورجاله رجال الصحيح.

## زانستی ئایینی
## لەلای کەسانی کەم تەمەن و گەنج دەست دەکەوێت

هەر لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)، خەڵکی داوای فێربوونی زانست دەکەن لەلای گەورە زانایان و شەرعناسان، سەردەمێکیش دێت خەڵکی کەم زانست و ناشارەزاو بۆچوون ناپەسندەکان دەچنە پێشەوە بۆ فێرکردنی زانست، خەڵکی پرسیاریان لێ دەکەن و ئەوانیش فەتوا دەدەن و خەڵکی گومڕا دەکەن.

ئەمە یەکێکە لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ ثَلَاثًا: إِحْدَاهُنَّ أَنْ يُلْتَمَسَ الْعِلْمُ عِنْدَ الْأَصَاغِرِ...)[1].

واتە: سێ شت لە نیشانەکانی ڕۆژی دواییین: یەکێکیان ئەوەیە کە خەڵکی لەلای کەسانی بچوك بە دوای زانستدا دەگەڕێن.

پرسیار کرا لە پێشەوا عەبدوڵلای کوری موبارەك (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی کەسانی بچووك، ئەویش فەرمووی: (الَّذِينَ يَقُولُونَ بِرَأْيِهِمْ، فَأَمَّا صَغِيرٌ يَرْوِي عَنْ كَبِيرٍ فَلَيْسَ بِصَغِيرٍ)[2].

واتە: ئەو کەسانەن کە بە ڕای خۆیان قسە دەکەن و فەتوا دەدەن، نەك ئەوەی کە بە تەمەن منداڵە.

لە حاشیەی پەرتوکی (الزهد) یشدا دەڵێت: مەبەست لە کەسانی بچوك ئەهلی بیدعەیە[3].

---

(١) صحيح: رواه ابن المبارك في (الزهد) برقم:(٦١) والمعجم الكبير (٢٢/ ٣٦١) برقم: (١٨٧٦٠).

(٢) جامع البيان (١/ ٦١٢) باب: حال العلم، برقم: (١٠٥٢).

(٣) صحيح رواه ابن المبارك في (الزهد) برقم:(٨١٥)

پێشەوا عەبدوڵلای کوری مەسعود (ﷺ) دەڵێت: (لَا يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا أَتَاهُمُ الْعِلْمُ مِنْ قِبَلِ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ (ﷺ)، وَأَكَابِرِهِمْ، فَإِذَا أَتَاهُمُ الْعِلْمُ مِنْ قِبَلِ أَصَاغِرِهِمْ، فَذَلِكَ حِينَ هَلَكُوا)[١].

واتە: بەردەوام خەڵك لەسەر خێرو چاكەن مادەم زانستیان لە هاوەڵانی موحەممەدەوە بۆ بێت، وە لەلایەن زانا گەورەکانیان، بەڵام کاتێك کە زانستیان بۆ هات لەلایەن بچوکەکانیانەوە، وە ئارەزووەکانیان لێکترازان و جیاوازمان ئەوە بە هیلاك ئەچن.

شێخی ئەلبانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: مەبەست لە (الاصاغر) ئەو نەخوێنەوارانەن کە قسە لەسەر قورئان و سوننەت دەکەن بەبێ زانیاری، خۆیان گومڕابوونەو خەڵکیش گومڕا دەکەن[٢].

ئەوەش بە یەکێك لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی هەژمار دەکرێت کە گەنجەکان بەرەو ئیسلام و مزگەوت دەگەڕێنەوەو زانستی ئیسلامی پەیدا دەکەن.. بەڵام لەم سەردەمەی ئێمەدا هێشتا زانست و زانایان لە حاڵێکی باشدان، ئەگەرچی ڕاگەیاندن هەڵساوە بە دەرخستن و بەناوبانگکردنی ژمارەیەك لە قوتابیانی زانست کە تەنها هەندێ لە زانیاریە گشتیەکانی ئیسلام دەزانن و مەسەلە بەناوبانگەکان دەزانن، بەڵام زانستیان لەبەر نییەو شەرعناس نین، ئەگەر چی باوو بانگەشەیان پەیدا کردووە لە نێو خەڵکیدا، خەڵکیش ڕوویان تێدەکەن و داوای زانست و فێربوونیان لێ دەکەن، خۆ ئەگەر زانا گەورەکان دەرکەوتایە بۆ خەڵکی لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و کەناڵە ئاسمانییەکان و ئێزگەو ماڵپەڕەکانی ئینتەرنێت، خەڵکی دەیانناسین و ڕوویان تێ دەکردن.

ئەم مەسەلەیەش بە زۆری وایە، وەکو چۆن پیری و گەورەیی نیشانە نییە لەسەر زانست، بە هەمان شێوە منداڵیش بەڵگە نییە لەسەر نەزانین، وەکو پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: زانست بە تەمەن نییە.

---

(١) صحيح رواه ابن المبارك في (الزهد) برقم: (٨١٥) والطبراني في (المعجم الكبير) (١١٤/٩) (٨٥٨٩).

(٢) صحيح أشراط الساعة الصغرى والكبرى، لا ٤٩.

پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) دەڵێت:

زانست بەتەمەن منداڵی و گەورەیی نییە، بەڵکو خوای گەورە لە هەر کوێ بیەوێت دایدەنێت.

پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە دەچێتە پێشەوە بۆ زانست فێربوون و ناوبانگ دەردەکات، هەوڵ بدات خۆی لە خانەی (أصاغر) دەربکات بۆ خانەی (أکابر) لە ڕێگەی فێربوونی زانست و لێ شارەزابوونی و پەیوەندی کردن بە گەورە زانایانەوە.

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عەباس (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (من أشراط الساعة أن تكون المخاطبة للنساء ويخطب الصبيان على المنابر...)[1].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی قسەکردن لەگەڵ ئافرەتان سەرهەڵدەدات و، وە منداڵەکان لەسەر مینبەر وتاری هەینی دەخوێننەوە.

وە مەترسیدارترین کاریش لەم ڕۆژگارەی ئەم سەردەمە کۆمەڵە وتاربێژێك دروست کراون بۆ ئەوەی زانایان و دانایان لەکەدار بکەن و خەڵکی دڵیان بەلای وتارو وتاربێژەکانەوە نەچێت و قسەیان بەرامبەر بکەن.

پشت بەخوای گەورە لە نیشانەکانی داهاتوو درێژەی پێدەدەین.. لەبەشی کەمکردنی زانست.



(١) اخرج ابن مردويه، تفسير السيوطي (الدر المنثور في التفسير بالمأثور) (٦/ ٣٢).

# ئیسلام غەریب دەبێت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر ئیسلام غەریب دەبێتەوە هەروەکو چۆن بە غەریبی دەستی پێکرد.

پێشەوا عەبدورەحمانی کوڕی سەننە(ﷺ) دەڵێت:

گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (بَدَأَ الْإِسْلَامُ غَرِيبًا، ثُمَّ يَعُودُ غَرِيبًا كَمَا بَدَأَ، فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَنِ الْغُرَبَاءُ؟ قَالَ: الَّذِينَ يُصْلِحُونَ إِذَا فَسَدَ النَّاسُ)[١].

واتە: ئیسلام بە غەریبی دەستی پێکردو گەیشتە لوتکەی دەسەڵات، جارێکی تریش غەریب دەبێتەوە هەوەکو کاتی دەست پێکردنی، خۆشبەختی بۆ غەریبەکان، هاوەڵەکان گوتیان: غەریبەکان کێن ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟

فەمووی: ئەوانەن کە چاکە دەکەن لە کاتێکدا خەڵکانێك لە ئومەتەکەم تێکی دەدەن.

ئەم فەرموودەیە باس لەم سەردەمەی ئێمە دەکات، کە نیقاب و ڕیش و جلی کورت و سوننەتی پێغەمبەر نامۆ بووە بەرامبەر بە ڕەقس و خراپەکاری..

بۆیە ئەمڕۆ دژایەتی سوننەت دەکرێت بە هەموو شێوەیەك، وە شوێن هەواو ئارەزووەکانمان کەوتووین، تەنانەت ئەمڕۆ نەزانەکان بڕیار لەسەر نەبوونی سزای گۆڕ و شەفاعەت دەدەن، وە هەندێکیشیان گاڵتە بە سیواك و ڕیش دەکەن.

ئەمڕۆ بە ئاشکرا لە ڕێگەی تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان و گۆڤارەکان بە ئاشکرا دژایەتی خواو پێغەمبەری خوا ڕادەگەیەنرێت کە دەیان بوختان بۆ ئیسلام و قورئان و پێغەمبەر هەڵدەبەسترێت بەناوی ئازادیەوە، داوا لە خوای گەورە دەکەم کە هیدایەتیان بدات، ئەگەر شایەنی هیدایەت نین خوای گەورە لە کۆڵ ئێمەی موسڵمانان بکاتەوە.

---

(١) مسند الإمام أحمد (٢٧/ ٢٣٧) برقم: (١٦٦٩٠).

بەرگی دووەم

## پەیدابوونی کۆمەڵێک کە قورئان دەخۆنەوە وەکو خواردنەوەی شیرو تەئویلی قورئان دەکەن لەسەر غەیری خۆی

لە نیشانەکانی قیامەت کۆمەڵە قورئان خوێنێك دروست دەبن، قورئان دەخوێنن و بازرگانی بە قورئان خوێندنەوە دەکەن... جا پێشیان دەڵێن: مەلا.. یان مامۆستا..

بەداخەوە بەشێك لەم میللەتەی خۆمان تا ئێستا ئامادەن پارە بڕێژن بۆ ئەو بازرگانانە، لە چەندین تازیەو بۆنە ئایینیەکان بینیومە ٢٠ وەرەقەیان وەرگرتووە.. یان ئافرەتێك خۆی کردووە بە مەلاژن پارەی زۆر وەردەگرێت و دەبێت بە جوانترین شێوازیش خزمەت بکرێن..

پێشەوا عوقبەی کوڕی عامیر(ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( سَيَخْرُجُ أَقْوَامٌ مِنْ أُمَّتِي يَشْرَبُونَ الْقُرْآنَ كَشُرْبِهِمُ اللَّبَنَ)[١].

واتە: کۆمەڵێك دەردەچن لە ئوممەتەکەم قورئان دەخۆنەوە هەروەکو چۆن شیر.

ئەوانە ئەو کەسانەن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناوی بردوون بە خواردنەوەی شیر..

پێشەوا عوقبەی کوڕی عامری جوهەنی (ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو: (هَلَاكُ أُمَّتِي فِي الْكِتَابِ وَاللَّبَنِ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْكِتَابُ وَاللَّبَنُ قَالَ يَتَعَلَّمُونَ الْقُرْآنَ فَيَتَأَوَّلُونَهُ عَلَى غَيْرِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَيُحِبُّونَ اللَّبَنَ فَيَدَعُونَ الْجَمَاعَاتِ وَالْجُمَعَ وَيَبْدُونَ)[٢].

واتە: لەناوچوونی ئوممەتی من لەسەر کیتاب و شیرە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا؟ کیتاب و شیر چیە؟ فەرمووی: فێری قورئان دەبن و تەئویلی دەکەن جگە لەوەی کە خوای گەورە دایبەزاندووە.

---

(١) المعجم الكبير (٢٩٧/١٧) برقم: (٨٢١).

(٢) صحيح: مسند الإمام أحمد (٢٨/ ٦٣٢) برقم: (١٧٤١٥). قال شعيب الأرناؤوط: إسناده حسن.

## قورئان دەبێتە عەیبە لای هەندێک خەڵکی بەناو موسڵمان

لە نیشانەکانی قیامەت کۆمەڵە گومڕایەك دروست دەبن کە قورئان خوێندن لایان دەبێتە عەیبە.. یان دەڵێن: کەی مۆدیلی قورئان خوێندن ماوە.. خۆیان کافر دەکەن..

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( لا تقوم الساعة حتى يجعل كتاب الله عاراً ...)[١].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا قورئان دەبێتە عەیبە لەلای خەڵکی..

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم فەرموودەیە زۆر ڕاشکاوانە ئەم موعجیزەیەی پێغەمبەری خوا بە دی دەکەین.. هەر چەندە زانایانی فەرموودەناس دەفەرموون: ئەم فەرمووده بێ هێزە بەڵام لە واقیعدا زۆر ڕاست و دروستە.

بۆیە ڕێگای ڕزگاربوونمان لەم سەردەمەی پڕ لە فیتنەیە ئەوەیە دەست بگرین و بە کتێبەکەی خوای گەورەو هەمیشە شانازی پێ بکەین..

زۆر خەڵکی هەن لە تەواوی زانستەکانی دونیایی شارەزان، بەڵام لە زانستی قورئان کۆڵەوارن و لەلای خوای پەروەردگاریش بە نەزان هەژمار دەکرێت.

کەواتە با پەیامەکەی خودا بە بەرزو نرخ ڕابگرین، وە لە بچوکیەوە منداڵەکانمان ڕابهێنین لەسەر گەورەیی قورئان، چونکە فێرکردنیان لە کاتی منداڵیدا نموونەی وەکو نەقش وایە کە لەسەر بەردێك هەڵکەنرابێت.

سوێند بەخوای گەورە هەر کەسێك پەیامی خودا عەیبدار بکات و ڕەخنەی لێ بگرێت، خوای گەورە خەجاڵەتی دونیاو دوا ڕۆژی دەکات، نمونەکانی ژیان زۆرن کە چۆن سەرشۆڕو زەبوون بوون.

---

(١) ضعيف: اخرجه ابن عساكر في تاريخ دمشق (٤٥٣/٧) أخرجه الدولابي في «الكنى» (١/ ٣١)، والطبراني في « المعجم الكبير» (٢٢/٣٧٦/ ١ ٩٤)، وابن عساكر في «التاريخ « (١٠٢٩/٨) وقال الألباني في السلسلة الضعيفة: ضعيف.

بەرگی دووەم

# زۆربوونی وتاربێژ و مامۆستای ئایینی (مەلا)

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر وتاربێژو مامۆستای ئایینی زۆر دەبن.. مامۆستا بە لێشاو زۆر دەبن، بەبێ ئەوەی زانستی شەرعیان خوێندبێت.. چەندین کەس دەناسم وتاربێژن بەڵام خزمەتگوزارن یان قورئان خوێن و بانگبێژن.. بەبێ ئەوەی بڕوانامەی حوجرەو بڕوانامەی ماستەرو دکتۆرایان هەبێت...

زۆر بەداخەوەم کە ئەم وتاربێژانە بە یەکێك لە نیشانە خراپەکانی قیامەت دادەنرێن..

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِنَّ مِنَ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ .. وَكَثْرُ خُطَبَاءُ مَنَابِرِكُمْ ...)[1].

واتە: بە دڵنیایی لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر ئەوەیە.. ئەگەر وتاربێژی سەر مینبەرەکانتان زۆر بوون..

پێشەوا عەبدوڵلای کوری مەسعود (ﷺ) دەڵێت:

(إِنَّكُمْ فِي زَمَانٍ قَلِيلٍ خُطَبَاؤُهُ كَثِيرٍ عُلَمَاؤُهُ يُطِيلُونَ الصَّلَاةَ وَيَقْصُرُونَ الْخُطْبَةَ وَسَيَأْتِي عَلَيْكُمْ زَمَانٌ كَثِيرٌ خُطَبَاؤُهُ قَلِيلٌ عُلَمَاؤُهُ يُطِيلُونَ الْخُطْبَةَ..)[2].

واتە: ئێوە لەسەردەمێکن وتاربێژتان کەمەو زاناتان زۆرە نوێژ درێژ دەکەنەوەو وتار کورت دەکەنەوە بەڵام ڕۆژگارێك دێت وتاربێژ زۆر دەبێت و زانایان کەم دەبن..

لەم فەرموودەیە بۆمان بە دیار دەکەوێت زۆر بوونی وتاربێژو مامۆستای ئایینی بە یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت هەژمار دەکرێت..

---

(١) ترتيب الآمالي (٢/ ٣٥٢) برقم: (٢٧٢٥).

(٢) المعجم الكبير، للطبراني (٩/ ١١٣) برقم: (٨٥٦٧).

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب(ﷺ)دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (من أشراط الساعة أن تكون المخاطبة للنساء ويخطب الصبيان على المنابر...)[1].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی قسەکردن لەگەڵ ئافرەتان سەرهەڵدەدات و، وە منداڵەکان وتاری هەینی لەسەر مینبەرەکان وتاری هەینی دەخوێننەوە..

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ( لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى.. تقوم الخطباء بالكذب..)[2].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت.. هەتا وتاربێژەکان هەڵدەستن لەسەر مینبەر چیرۆکی درۆیین دەگێڕنەوە..

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (من اقتراب الساعة إذا رأيتم الناس أضاعوا الصلوات .. وصعدت الجهال على المنابر ..)[3].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبونەوەی کۆتایی بونەوەر هەر کاتێك خەڵکتان بینی نوێژەکانیان نەکردو چواندیان، وە نەخوێنەوارەکان بەسەر مینبەر کەوتن..

هەر چەندە هەندێك لە زانایانی فەرموودەناس دەفەرموون: ئەم فەرموودە بێ هێزە.. بەڵام لە واتادا زۆر واقیعیە.. وە لەم سەردەمەدا خەڵکێکی زۆر پەنای بردووەتە بەر درۆکردن و ڕاستگۆیی بەرەو ئاراستەیەکی کەم دەڕوات.. ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەر(ﷺ)، لەسەر ئەوەش کە لەلایەن خوای گەورەوە ڕەوانە کراوە.

---

(١) اخرج ابن مردويه، تفسير السيوطي (الدر المنثور في التفسير بالمأثور) (٦/ ٣٢).

(٢) ضعيف: أخرجه ابن عساكر في تاريخ دمشق (٤٥٣/٧) والطبراني في (المعجم الكبير) (٢٢/٣٧٦/ ١ ٩٤) ، وابن عساكر في «التاريخ « (١٠٢٩/٨) وقال الألباني في السلسلة الضعيفة : ضعيف.

(٣) البحور الزاخرة في علوم الآخرة، محمد بن أحمد بن سالم السفاريني الحنبلي، (لا ١/ ٤٣٢).

## زاناکان لە بەرپرسەکان خۆیان نزیک دەکەنەوە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر وتاریێژو مامۆستای ئایینی خۆیان نزیك دەکەنەوە لە بەرپرسەکان و حەلاڵیان بۆ حەرام دەکەن و حەرامیان بۆ حەلاڵ دەکەن.. بەبێ ئەوەی زانستی شەرعیان خوێندبێت..

زۆر بەداخەوەم کە ئەم بەناو زانایانە بە یەکێك لە نیشانە خراپەکانی قیامەت هەژمار دەکرێن..

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِنَّ مِنَ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ .. وَرَكَنَ عُلَمَاؤُكُمْ إِلَى وُلَاتِكُمْ, فَأَحَلُّوا لَهُمُ الْحَرَامَ, وَحَرَّمُوا عَلَيْهِمُ الْحَلَالَ، وَأَفْتَوْهُمْ بِمَا يَشْتَهُونَ..)[1].

واتە: بە دڵنیایی لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر ئەوەیە.. ئەگەر زاناکانتان پاڵیاندا بە سەرکردەکانتانەوەو بوون بە پیاوی ئەوان و حەرامیان بۆ حەلاڵ کردن و حەلاڵیان لێ حەرام کردن و بە ئارەزووی دڵی بەرپرسەکان فتواياندا ئەوا چاوەڕوانی ڕۆژی دوایی بکەن.

ئەم خەڵکە لەگەڵ زەمانێکدا ڕوو بە ڕوو دەبن کە ئیسلام تەنها ناوی دەمێنێ و قورئانیش تەنها وێنەو خەتی دەمێنێ، واتە: بە فەرمانەکانی کار ناکرێت مزگەوتەکان بە هەموو جۆرێ دەرازێنرێتەوەو ئاوەدان دەکرێتەوە، بەڵام لە خواپەرستی و خواناسیدا چۆڵ و وێرانە، زانایانی ئەو سەردەمە خراپترین کەس دەبن لە ژێر ئاسماندا هەر ئەو زانایانەش دەبن بە هۆی بڵاوبونەوەی ئەو فیتنەو ئاشوبە.

بەڕاستی ئەم فەرموودەیە وەکو ڕۆژی ڕووناك بە چاوەکانی خۆمان دەیانبین و موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سات بە سات دەردەکەون.

---

(١) ترتيب الآمالي (٢/ ٣٥٢) برقم: (٢٧٢٥).

پێشەوا عەبدوڵڵای کوری مەسعود (ﷺ) دەڵێت:

(إِنَّكُمْ فِي زَمَانٍ قَلِيلٍ خُطَبَاؤُهُ كَثِيرٍ عُلَمَاؤُهُ

يُطِيلُونَ الصَّلَاةَ وَيَقْصُرُونَ الْخُطْبَةَ

وَسَيَأْتِي عَلَيْكُمْ زَمَانٌ كَثِيرٌ خُطَبَاؤُهُ قَلِيلٌ عُلَمَاؤُهُ

يُطِيلُونَ الْخُطْبَةَ

وَيُؤَخِّرُونَ الصَّلَاةَ حَتَّى يُقَالَ هَذَا شَرَقُ الْمَوْتَى فَمَنْ أَدْرَكَ ذَلِكَ فَلْيُصَلِّهَا لِوَقْتِهَا فَإِنِ احْتَبَسَ فَلْيُصَلِّ مَعَهُمْ وَيَجْعَلْ صَلَاتَهُ وَحْدَهُ الْفَرِيضَةَ وَصَلَاتَهُ مَعَهُمْ تَطَوُّعًا)[1].

واتە: ئێوە لەسەردەمێکن

وتاربێژتان کەمەو زاناتان زۆرە

نوێژ درێژ دەکەنەوەو وتار کورت دەکەنەوە

بەڵام ڕۆژگارێك دێت وتاربێژ زۆر دەبێت و زانایان کەم دەبن

وە نوێژەکانیان دوا دەخەن هەتا دەگوترێت ئەوە (شرق الموتى)یە

هەر کەسێك بەم کاتە گەیشت نوێژەکانتان لە کاتی خۆی بکەن و نوێژیان لەگەڵدا ببەستن، وە بە تەنیا نوێژی فەرز بکەو لەگەڵ ئەوانیش نوێژ داببەستە وەکو سوننەت.

هیچ شتێك هێندەی ئەو بەناو زاناو مامۆستایانە بێ ڕێز ناکات کە هەمیشە لەبەردەم دەرگای بەرپرسەکان ڕاوەستاون.. مێژووی هەندێك لە مامۆستایانی کوردستان شایەتیەکی حاشا هەڵنەگرە.

مامۆستایانی ڕاستەقینە ئەوانەن: کە تەنها کەمێکی شەو دەخەون و کاتەکانی تر هەمووی بە شەو نوێژو زیکرو قورئان خوێندن دەبەن بەڕێوە، وە خوای گەورە خۆشەویستی خۆی و نەرم و نیان پێ دەبەخشێت.

---

(١) رواه الطبراني في (المعجم الكبير) (٩/ ١١٣) برقم: (٨٥٦٧).

# زۆربوونی غەم و پەژارە

لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی زۆربوونی غەم و پەژارەیە..

ئەبو سەعلەبەی خوشەنی (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (إن من أشراط الساعة أن تنتقص العقول، وتعزب الأحلام، ويكثر الهم)[١].

لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر خەڵك بیروهۆشی لای خۆی نامێنێت و خەونەکان بە با دەچن و غەم و پەژارە زۆر دەبێت...

ئەگەر سەیری بارودۆخی ژیانی خۆمان بکەین لەم سەردەمە، بەڕاستی ئەبینین خەڵکی لەوپەڕی غەم و پەژارەیی دەژین.. لە کاتێکدا خوای پەروەردگار زۆر نزیکە لێمانەوە ئەگەر داوای لێ بکەین کە پەژارەیی لە ئێمە دوور بخاتەوە.

ئەگەر بمانەوێت غەم و پەژارەمان نەمێنێت هەمیشە پێویستە سوجدە بۆ خوای گەورە ببەین، چونکە تاکە دڵخۆشیە کە مرۆڤەکان بەرەو جیهانێکی ڕووحی دەبات.

چەند خاڵێك مرۆڤەکان بەرەو دڵخۆشبوون دەبات:

- پەیوەست بوون بە سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ).
- کارو کردەوەکانت بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە بێت.
- هاوڕێیەتی ئەوانە بکە کە ئەهلی شەو نوێژن.
- هەمیشە ببە ڕێگر لەوەی کەسێك بیەوێت ستەم بکات.
- هەواڵی ئەو دۆستانەت بپرسە کە هاوڕێی قوتابخانەکەت بوون.
- هەمیشە ئارام بگرە لە کاتێکدا توڕەت دەکەن.
- خوێندنەوەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (ﷺ).
- هەمیشە سەلام لە خەڵکی بکەیت بەبێ جیاوازی.

---

(١) رواه نعيم بن حماد في «الفتن» من حديث كثير بن مرة مرسلاً مثله.

بەرگی دووەم

## زاناکان بەهۆی زانستەکەیانەوە پارە کۆدەکەنەوە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر وتاریێژو زانای ئایینی خۆیان نزیك دەکەنەوە لە بەرپرسەکان بۆ بە دەست هێنانی پارەو سەروەت و سامان.. کە لەم سەردەمەدا زۆر ڕاشکاوانە ئەم نیشانەیە بەرچاو دەکەوێت..

زۆر بەداخەوەم کە ئەم بەناو زانایانە بە یەکێك لە نیشانە خراپەکانی قیامەت هەژمار دەکرێن..

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (إِنَّ مِنَ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ.. وَتَعَلَّمَ عُلَمَاؤُكُمُ الْعِلْمَ لِيَجْلِبُوا بِهِ دَنَانِيرَكُمْ وَدَرَاهِمَكُمْ..)[١].

واتە: لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەیە ئەگەر زاناکانتان بۆ ئەوە فێری زانست دەبوون کە دینارو درهەمی پێ کۆبکەنەوەو بەدەستی بهێنن..

پێشەوا عەبدوڵلای کوری مەسعود(ﷺ) دەڵێت: (إِنَّكُمْ فِي زَمَانٍ قَلِيلٍ خُطَبَاؤُهُ كَثِيرٍ عُلَمَاؤُهُ يُطِيلُونَ الصَّلَاةَ وَيَقْصُرُونَ الْخُطْبَةَ وَسَيَأْتِي عَلَيْكُمْ زَمَانٌ كَثِيرٌ خُطَبَاؤُهُ قَلِيلٌ عُلَمَاؤُهُ يُطِيلُونَ الْخُطْبَةَ وَيُؤَخِّرُونَ الصَّلَاةَ حَتَّى يُقَالَ هَذَا شَرَقُ الْمَوْتَى فَمَنْ أَدْرَكَ ذَلِكَ فَلْيُصَلِّهَا لِوَقْتِهَا فَإِنِ احْتَبَسَ فَلْيُصَلِّ مَعَهُمْ وَيَجْعَلْ صَلَاتَهُ وَحْدَهُ الْفَرِيضَةَ وَصَلَاتَهُ مَعَهُمْ تَطَوُّعًا)[٢].

واتە: ئێوە لەسەردەمێکن وتاریێژتان کەمەو زاناتان زۆرە، نوێژ درێژ دەکەنەوەو وتار کورت دەکەنەوە، بەڵام ڕۆژگارێك دێت وتاریێژ زۆر دەبێت و زانایان کەم دەبن، وە نوێژەکانیان دوا دەخەن هەتا دەگوترێت ئەوە (شرق الموتی)یە، هەر کەسێك بەم کاتە گەیشت نوێژەکانتان لە کاتی خۆی بکەن و نوێژیان لەگەڵدا ببەستن، وە بە تەنیا نوێژی فەرز بکەو لەگەڵ ئەوانیش نوێژ داببەستە وەکو سوننەت.

---

(١) ترتيب الآمالي (٢/ ٣٥٢) برقم: (٢٧٢٥).

(٢) المعجم الكبير، للطبراني (٩/ ١١٣) برقم: (٨٥٦٧).

## نەخشاندن و ڕازاندنەوەی ماڵەکان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی خەڵکی زۆر بایەخ بە ڕازاندنەوەی ماڵ دەدات..

زۆری خۆشگوزەرانی و زێدەڕۆیی و شانازیکردن و لە خۆبایی بوون، ئەمانە هەمووی خراپ و سەرزەنشت کراون.

وە لە کۆتایی بونەوەریشدا خەڵکی شانازی دەکەن بە پەردەی گرانبەهای نەخشاوو هەڵواسراو بە دیواری ماڵەکانیانەوە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَبْنِيَ النَّاسُ بُيُوتًا يُوشُونَهَا وَشْيَ الْمَرَاحِيلِ)[1].

واتە: کۆتایی بونەوەر هەڵناسێت تاکو خەڵکی دەست نەکەنە دروستکردنی ماڵی پر نەخش و وەکو پۆشاکی نەخشێنراو.

ئەمەیش قەدەغەبوونی دانانی پەردەی جوان و ڕازاندنەوەی ماڵ ناگەیەنێت، بەڵکو ئەوەی قەدەغەیە زێدەڕەویە لەو بابەتەو ماڵ بە فیڕۆدان و لە خۆبایی بوونە.

کەسێك کە ماڵەکەی خۆی دەڕازێنێتەوە بۆ ئەوەی زیاتر لە خۆشگوزەرانیدا بژیەت هەڵدەستن بوختان کردن و وتەی نەشیاویان بۆ دەردەبڕن، بەداخەوە.. هەر شتێك بەسەر لاشەتدا هات ئەوە بە هۆی زمانەوەیە..

ماڵەکەت بڕازێنەوە بەڵام زیادە مەسرەفی مەکە، وە هەمیشە بڵێ: بۆ هەموو شتێك خوام بەسە، چونکە زیان و قازانج هەر بە دەست ئەوە.

---

(١) رواه البخاري في (الأدب المفرد) (١/ ١٦٣) برقم: (٤٥٩) وصحح الألباني في الصحيحة (٢٧٩).

## قورئان خوێن زۆر دەبن بەڵام كردەوەی پێناكەن

لە نیشانەكانی نزیكبوونەوەی هاتنی كۆتایی بونەوەر قورئان خوێن زۆر دەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا فەقیهەكان كەم دەبنەوە.. وە كەسانێك پەیدا دەبن قورئان دەخوێنن بەڵام لە گەروویان تێپەڕناكات، وە زۆر نەشارەزان لە تەفسیركردنی قورئان..

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (سيأتي على أمتي زمان.. تكثر فيه القراء وتقل الفقهاء)[1].

واتە: سەردەمێك دێت بەسەر ئوممەتم كە قورئان خوێنی زۆری تێدا دەردەكەوێت، وە فەقیهەكانی تێدا كەم دەبێت..

لە ریوایەتێكی تر فەرموویەتی: (سيأتي على أمتي زمان.. يقرأ القرآن رجال لا يجاوز تراقيهم ..)[2].

واتە: سەردەمێك دێت بەسەر ئوممەتم.. پیاو قورئان دەخوێنێت.. لە گەروویان تێپەڕ ناكات..

لەم سەردەمەدا ئەم نیشانەیەی قیامەت زۆر ڕاشكاوانە وەكو موعجیزەیەكی ڕووناك دەبینین.

هەموو ئەشكەوتەكانمان تاریكین بۆمان ئەگەر كردەوەی پێ نەكەین، بەڵام ئەشكەوتەكەی قورئان هەمیشە ڕووناكیە ئەگەر كردەوەكانمان لەگەڵ قورئان یەك بگرێتەوە.

هەموومان دەزانین ڕۆژی دوایی نزیك بۆتەوە بەڵام خەڵكی لە غەفڵەت و بێ ئاگاییدان لەو ڕۆژە.

---

(١) صحيح: المستدرك (٨٤١٢) قال الحاكم: هذا حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه.

(٢) صحيح: المستدرك (٨٤١٠) قال الحاكم: هذا حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه.

## بێباوەڕەکان موناقەشە لەگەڵ باوەڕداران دەکەن !

لە نیشانەکانی نزیبکبوونەوەی کۆتایی بونەوە کەسی بێاوەڕو دووڕوو موناقەشە لەگەڵ بڕواداران دەکەن سەبارەت بە بوونی خوای گەورە...

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (سيأتي على أمتي زمان.. يجادل المنافق الكافر المشرك بالله لنؤمن بمثل ما يقول..)[1].

واتە: سەردەمێك دێت بەسەر ئوممەتم.. مونافیق و بێباوەڕو هاوەڵ پەرست جیدال لەگەڵ باوەڕدار ئەکەن لەبارەی خواوە هەر بەو شێوەیەی بڕوادار قسەی لەبارەوە دەکات..

ئەم نیشانەیەش بە ڕۆژی ڕووناك دەیانبینین.. بۆیە موعجیزەکان ڕۆژ بە ڕۆژ دەردەکەون.

هەمیشە گوتومە: زیکرو یادی خوای گەورە ئیمان دەڕوێنێت لە دڵەکان، بەڵام موناقەشە دووڕوویی ئەڕوێنێت.. واتە: زیاتر دووڕووەکان حەزیان لە موناقەشە کردنە.

هاوڕێیەتی ئەوانە بکە کە لەسەرووی تۆ بێت لە بواری دین و زانست، بەڵام هەرگیز هاوڕێیەتی ئەو کەسانە نەکەیت کە موناقەشەت لەگەڵ دەکەن..

بەداخەوە کەناڵە کوردیەکان فێری دیاردەیەك بوون، دوو کەس دەهێنن بۆ ئەوەی موناقەشە لەگەڵ یەکتردا بکەن، ئەمەش تەنها بۆ زیاتر چەسپاندنی خراپەکاری و بێ دینیەتە بۆ ئەوەی حەلاڵمان بۆ حەرام بکەن و حەرامیشمان بۆ حەڵاڵ بکەن، چونکە ئەو جۆرە کەناڵانە لە هەوڵی نانەوەی فەسادو خراپەکارین بۆ گەیاندنی گومانی ئیمانی لە دڵی باوەڕداران.

(١) صحيح: المستدرك، برقم: (٨٤١٢) قال الحاكم: هذا حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه.

بەرگی دووەم

## زۆربوونی جیاڕایی لە نێو براکان

لە نیشانەکانی نزیکبونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی جیاڕایی لە نێوان برا دروست دەبێت و دەبێتە هۆی ئەوەی لەسەر بابەتی بچوك پشت لە یەك بکەن و قسە لەگەڵ یەکتر نەکەن..

دایکمان مەیمونە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (كَيْفَ أَنْتُمْ .. إِذَا اخْتُلِفتِ الإِخْوَانُ ..)[١].

واتە: ئێوە حاڵتان چۆن دەبێت کاتێك .. جیا ڕایی بکەوێتە نێوان براکانتان ...

پاکو بێگەردی بۆ خوای گەورە ئەمڕۆ ڕووداوەکان بە چاوی خۆمان دەبینین و برا شەڕ لەگەڵ یەکتر دەکەن و ڕێزی یەکتر ناگرن.

هەمیشە ئەو برایەی کە هەتە ئەگەر ئارامگر بیت لەسەر هەڵوێستە ناخۆشەکانی ئەوە پاداشتی لەسەر وەردەگریت، وازی لێ بهێنە چونکە لەسەرت دەنوسرێت نەك بە چاکە بۆت بنوسرێت.

هەتا مرۆڤ لە برایەتی دووربێت ئەوا وتەو کردەوەی تاك ڕەوی ناڕەوایی زیاتر دەبێت، ئەم دیاردەیەش لە پێش هاتنی کۆتایی بونەوەر سەرهەڵدەدات.

هەر کەسێك بەردەوام بێت لەسەر پتەوکردنی پەیوەندی برایەتی ئەوە زۆرترین خێری بەسەردا دەڕژێت، ڕێگاکانی خێر زۆرن، و باشترینی لەوەی بەندە دەیبینێت هەمیشە دۆعای خێر بۆ خۆت و دایك و باوکت و خوشك و براکانت بکە.

هەر کەسێك لە خوا بترسێت و خۆڕاگر بێت لەبەرامبەر تاقیکردنەوەکان، ئەوا بەڕاستی خودای گەورە چاکەی چاکەکاران وون ناکات.

بۆیە هەمیشە بە براکەت بڵێ: پێکەنینەکانی تۆ هۆکارێکە لە هۆکارەکانی دڵ خۆشبوونم.!!

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٦/ ٣٣٣) برقم: (٢٦٧٨٢) قال الشيخ الأرناؤوط: إسناده حسن.

# تێکەڵ کردنی دین بە دونیا

لە نیشانەکانی نزیکبونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی کەسانێك دین تێکەڵ دەکەن بە دونیا بە ئارەزووی خۆیان..

دایکمان مەیمونە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (كَيْفَ أَنْتُمْ إِذَا مَرِجَ الدِّينُ .. )[1].

واتە: ئێوە حاڵتان چۆن دەبێت کاتێك دین تێکەڵ کرا..

بەداخەوە.. لەم سەردەمە زۆر بە ئاشکرا ئەوە بەدی دەکەین کە کەسانێك لەبەر بەرژەوەندی خۆیان دین بە دونیا تێکەڵ دەکەن..

هەر کەسێك خۆی بپارێزێت لە تێکەڵکردنی دین بە دونیا ئەوە خوای گەورە کاروباری ژیانی بۆ ئاسان دەکات و تاوانەکانی پاك دەکاتەوەو چاوپۆشی لێ ئەکات.

بە ڕای بەندە خراپترین مرۆڤ کەسێکە کە دین و دونیا تێکەڵ بە یەکتری دەکات، چونکە هیچ دەرمانێك نییە بۆ کەسێك کە تووشی فیتنەو تاقیکردنەوە ببێت لە وێنەی صەبرو ئارامگرتن.

ئەگەر سەرنجی پیاو باشانی پێشوو بدەین، هەمیشە ئەوەمان بۆ بەدیار دەکەوێت کە ئەوان بە هیچ شێوەیەك حەزیان بە دونیا نەدەکرد، وە نەیاندەویست ناویان دەرکەوێت و دین و دونیا تێکەڵ بە یەکتری بکەن..

نمونەی جوانترین تابیعی پێشەوا ئەیوبی سختیانیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) کە هەمیشە ڕێگەکەی دەگۆڕی و ڕای دەکرد لە خەڵکی لە ترسی ئەوەی بڵێن: ئەوە ئەیوبی سختیانیە[2].

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٦/ ٣٣٣) برقم: (٢٦٧٨٢) قال الشيخ الأرناؤوط: إسناده حسن.

(٢) مصنف ابن ابي شيبة برقم: (٩٢١٠).

بەرگی دووەم

## شانازی بە قسەکردن و بەدەستهێنانی پارە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر پارە پەیداکردنە لە ڕێگای زمان و سوعبەت و نوکتەو گۆرانی و بەندو... هتد..

شورەیی نیە مرۆڤ ماڵ بەدەست بهێنێت بە ڕێگەی دروست و ڕەوا، وەکو ماڵ بەدەستهێنان لە ڕێگەی ڕوونکردنەوەو قسەو بەڵگەوە، وەکو کاری پارێزەرو مامۆستاو کەسانی تر.. بەڵام جێگای سەرزەنشتە کە مرۆڤ ماڵ بە دەست بهێنێت بە زمانی، لە ڕێگەی پیاهەڵدانی ناڕەوا، بۆ کەسی ناشایستە، یان سوێند خواردنی درۆ لە کڕین و فرۆشتنداو درۆکردن..

جارێکیان پێشەوا عومەری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص پێویستیەکی هەبوو لەلای باوکی، ئیتر ئەویش پێش باسکردنی پێویستیەکەی هەندێ قسەی نەستەق و ڕەوانبێژی بۆ کرد لەو شێوەی کاتێك خەڵکی ئیشێکیان دەبێت لەلای کەسێك دەیکەن، سەعید پێشتر ئەو شێوە قسەی نەبیستبوو، کاتێك کوڕەکەی لە قسەکانی بویەوە، سەعد فەرمووی: تۆ دوور نەبووی لە بەدەست هێنانی پێویستیەکەی خۆت و منیش بێ بایەخ تەماشام نەدەکرد، ئەگەر ئەو قسانەت نەکردایە، گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (سَيَكُونُ قَوْمٌ يَأْكُلُونَ بِأَلْسِنَتِهِمْ كَمَا تَأْكُلُ الْبَقَرَةُ مِنْ الْأَرْضِ)[١].

واتە: کەسانێك پەیدا دەبن لە ڕێگەی زمانیانەوە دەخۆن، وەکو چۆن مانگا لە زەوی دەخوات.

ئەم فەرموودەیە زۆر ڕاشکاوانە پێمان دەڵێت: کە خەڵکی مەدحی بەرامبەرەکانیان دەکەن و، خۆیان وەکو خۆشەویست نیشان دەدەن و، بەسەر خۆیاندا هەڵدەڵێن تا ماڵ و سەروەت و سامان بە دەست بهێنن.

---

(١) حسن لغيره: مسند الإمام أحمد (١/ ١٧٥) برقم: (١٥١٧) قال الشيخ الأرناؤوط: حسن لغيره.

## مرۆڤە بڕوادارەکان خۆیان دەشارنەوە لە مونافیقەکان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر مرۆڤی بڕوادار لە ترسی مونا فیقەکان خۆیان دەشارنەوە..

پێشەوا جابری کوڕی عەبدوڵلا (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يأتي زمانٌ على النَّاسِ يستَخفي المؤمِنُ فيهِم كما يَستَخفي المُنافِقُ فيكمُ اليومَ)(١).

واتە: سەردەمێك بەسەر خەڵکی دێت بڕوادار خۆیان لە مونا فیقەکان دەشارنەوە هەروەکو چۆن مونا فیق ئەمڕۆ خۆتان لێدەشارنەوە..

ئەم فەرموودەیە زۆر ڕاشکاوانە پێمان دەڵێت: کە پێش هاتنی قیامەت مرۆڤی مونا فیق زۆر دەبن.. ئەم ڕووداوەش لە حوکمی شیوعی ئیتیحاددی سۆڤیەتی ڕوویدا، کە بە هەزارەها خەڵکی عیبادەتی خوایان دەکرد بە نهێنی و نەیاندەتوانی ئیسلامەتیەکەی خۆیان ئاشکرا بکەن..

بۆیە هەر کەسێکتان بینی پشتی کرد لە ڕێگای پێغەمبەرایەتی و شەرعی خودا، ئەوا گومانی تێدا نییە کە ئەو کەسە مونا فیقەو هەر دەبێت گومڕا ببێت و لەناو بچێت.

کەسی مونا فیق هەمیشە خەریکی چپەچپ و قسەکردنن لە نێو خۆیان، ئا ئەوانە خەریکی بونیات نانی گومڕایین، وە هەمیشە ئەوانە خۆیان بە زانا لە قەڵەم دەدەن، لە کاتێکدا هیچ شتێك نازانن.

---

(١) ضعيف: رواه الطبراني في (مسند الشاميين) برقم: (٢٣٨). والكامل في الضعفاء، ابن عدي (٩/٩).. وفيه يحيى بن أبي أنيسة، وقد اجتمع أصحاب الحديث على تركه إلا من لا يعلم، وجاء في سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة وأثرها السيء في الأمة: (١٤/ ٥٨٢) : ضعيف. فيه راو ضعيف، والإسناد مرسل. وللحديث طريق أخرى فيها متروك.

## شوێن كەوتنی ڕەوشتی گەلانی ڕابردوو لە خراپەكاری

لە نیشانەكانی نزیكبوونەوەی هاتنی كۆتایی بونەوەر، ئەم ئوممەتە دووچاری ڕەوشتی خراپ دەبێت و شوێن جولەكەكان دەكەون..

یەكێك لە فیتنە گەورەكان شوێن كەوتن و چاولێكردنەوەی جولەكەو گاورەكانە، بەڕاستی هەندێ لە موسڵمانان چاولێكەری كافران دەكەن و خۆ بەوان دەچوێنن و ڕەوشتیان وەكو هی ئەوان لێدەكەن و پێیان سەرسام دەبن كە ئەوەش لە فەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ) ڕوون دەبێتەوە، وە نمونەشمان زۆرە سەبارەت بە شوێن كەوتنی جولەكەو گاورەكان.

یەكەم گۆڕانكاری كە بێ بڕواكان بەسەر ئایینی پیرۆزیاندا چەسپاند تاشینی ریش بوو، چونكە تاشینی ڕیش بووە بە نەریتێك لەناو شارە ئیسلامیەكاندا بڵاوبوویەوە، ئەمەش لە كاتێكدا بوو كە دەستی بێبڕواكان گەیشت بەسەر وڵاتە ئیسلامیەكان و داگیركردنیان، بۆیە ئەم دیاردەیە لە پاش سەرهەڵدانی شەڕی جیهانی یەكەم بڵاوبوویەوە بەزۆری، بەڕاستی ئەمەش كاریگەریەكی زۆری هەبوو لەسەر وڵاتە ئیسلامیەكان، بۆ ئەوەی موسڵمانان لەم كارەدا خۆیان داماڵن و بە دوای ئارەزووی شەیتانانەكان بكەون.

بۆیە لە كۆتایی نیشانەكانی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەم ئوممەتە وای لێدێت دوو چاری چەرخ و كاتێ دەبن كە لە كاتی خۆی بەنی ئیسرائیلیەكان وەكو دوو جووت پێڵاو چۆن هاوتای یەكن ئاوا تووشی دەبن، هەتا ئەگەر بەنی ئیسرائیلیەكان بە ئاشكرا كاری خراپەیان لەگەڵ دایكی خۆیان كردبێ لە ئومەتی منیش شتی وا پەیدا دەبێ.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَأْخُذَ أُمَّتِي مَا أَخَذَ الأُمَمَ وَالْقُرُونَ قَبْلَهَا ، شِبْرًا

بِشِبْرٍ، وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، كَمَا فَعَلَتْ فَارِسُ وَالرُّومُ؟ قَالَ: وَهَلِ النَّاسُ إِلاَّ أُولَئِكَ)[1].

واته: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا ئوممەتەكەم شوێن پێی میللەتانی پێش خۆی هەڵدەگرێت، بست بە بست و باڵ بە باڵ، پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەكو فارسەكان و ڕۆمەكان؟ فەرمووی: ئەی جگە لەوان كەسی تر هەیە.

پێشەوا ئیبنو بەتاڵ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەیزانی كە ئوممەتەكەی لە دوای خۆی شوێنی چەند كارێكی خراپ و تازە پەیدا بوو دەكەوێ، هەروەك گەلانی پێشوو تووشی بوون، بەڕاستی زۆرێك لە فەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتۆتە دی[2].

پێشەوا ئیبنو حەجەر(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: زۆربەی ئەو هەواڵانەی كە پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداری لێیان داوە ڕوویان داوە[3].

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری(ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بَاعًا بِبَاعٍ، وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ، وَشِبْرًا بِشِبْرٍ، حَتَّى لَوْ دَخَلُوا فِي جُحْرِ ضَبٍّ لَدَخَلْتُمْ مَعَهُمْ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى؟ قَالَ: فَمَنْ؟)[4].

واته: بە ڕاستی ئێوە شوێن پێی ئەوانەی پێش خۆتان هەڵدەگرن بست بە بست و باڵ بە باڵ، تەنانەت ئەگەر ئەوان بچنە كونی بزن مژەوە ئێوەش بە دوایان دەكەون گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) مەبەستت پێی جوولەكەو گاورەكانە ؟ فەرمووی: ئەی كێ؟

---

(١) صحيح البخاري (١٣/ ٣٠٠) كتاب: الاعتصام بالكتاب والسنة، باب: قول النبي (ﷺ) لتتبعن سنن من قبلكم، برقم: (٧٣١٩).

(٢) فتح الباري (١٣/ ٣٠١).

(٣) فتح الباري (١٣/ ٣٠١).

(٤) صحيح البخاري (١٣/ ٣٠١) كتاب: الاعتصام بالكتاب والسنة، باب: قول النبي (ﷺ) لتتبعن سنن من قبلكم، برقم: (٧٣٢٠).

بەرگی دووەم

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت:

مەبەست پێی لە بست و باڵ و کونی بزن مژ پێچواندنە بە توندی چاو لێکەریان بۆیان، وە مەبەست لە چاو لێکردنیان لە تاوان و گوناه و سەر پێچی نەك لە بێباوەڕی کە بە یەکجاری کافرین، جا لە مەدا موعجیزەیەکی زۆر ڕوون هەیە بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ).. چۆنی فەرموو بوو ئاوا هاتە دی[1].

بە ڕاستی لەم سەردەمە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتۆتە دی، چونکە بە چاوی خۆمان دەبینین موسڵمانان شوێنکەوتەی جوولەکەو گاورەکان دەکەون، وەکو عەلمانیەت و دیموکراسی و پرچ شەق کردن و پانتۆلی تەسك و بسك بەردانەوەو ریش تاشین و سمێڵ هێشتنەوەو ڤالانتاین و ئاهەنگی سەری ساڵی زایینی و... هتد، چونکە پیاوەکانمان چاو لە پیاوەکان دەکەن و ئافرەتەکانیشمان چاو لە ئافرەتەکانیان دەکەن، لە هەموو شتێکدا لاساییان دەکەنەوە، تەنانەت لە ریش تاشینیش بەو هۆیەوە بوو خەڵکێکی زۆر لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام لایاندا ئەمەش بە ناوی مافی مرۆڤ و مافی ئافرەت و عەلمانیەت و دیموکراسیەوە بوو.

لاساییکردنەوە دەردێکی کوشندەو شتێکی خراپە، بۆ؟

چونکە ئەو کەسە کە تۆ وەك ئەو دەکەی بەبێ ئەوەی کە لە فەلسەفەی بیرکردنەوەو ڕەفتارو هەڵسوکەوتەکەی تێبگەی، ئەوە شتێکی ناپەسندو دزێوە، ڕەنگە ئەو ڕەفتارەی ئەو دەینوێنێ، یان ئەو قسەیەی ئەو دەیکات و ئەو حاڵەتەی ئەو لە خۆیدا بەرجەستەی دەکات، بۆ ئەو پاساو و بەڵگەیەك هەبێ بەڵام کە تۆ وەك ئەو دەکەی بێ ئەوەی لێی تێبگەی، شتێکی زۆر سەیر دەکەی، وە دیارە لە نێو خەڵکیشدا باوە کە مەیمون بە ڕەمزی لاسایی کردنەوە دادەنرێ، واتە: مرۆڤ چی بکات ئەویش وادەکات.

---

(١) شرح صحيح مسلم للنووي (١٦/ ٢١٩ ٢٢٠).

بەڕاستی لاسایی کردنەوەو شوێنکەوتنی کوێرانە دەردێکی کوشندەیە، مێژوو نوسی بەناو بانگ (ئیبنو خەلدون) لە سەرەتای کتێبەکەی (المقدمە) قسەیەکی جوان دەکات و دەڵێت: (المغلوب مولعٌ بتقليد غالبه). واتە: کەسێك کە هەست بە تێکشکاوی دەکات هەمیشە سەرگەرمی ئەوەیە خۆی وەك ئەو کەسە لێ بکات کە تێکیشکاندوەو بەسەریدا زاڵ بووە.

بێگومان حاڵەتی لاسایی کردنەوە زیاتر لە کەسانێکدا بەرجەستە دەبێ کە لە بەرامبەر ڕۆژئاواو لە بەرامبەر ئەواندا کە هەڵگری فیکرو فەلسەفەیەکن کە نەیارە بە ئیسلام، هەست بە تێکشکاوی دەکەن و هەست بەوە دەکەن کە دەست بەتاڵن و ڕووت و ڕەجاڵن، پێیان وایە هیچیان نیە، بۆیە ئەو هەست کردن بە تێکشکان و هەزیمەی نەفسی و نەزانی و ئاتاجیە پاڵیان پێوە دەنێ کە وەك ئەوان بکەن، لە بیرکردنەوەو هەڵسوکەوت و ڕەفتارو تەنانەت بەرگ و پۆشاکیشدا!

بەڵێ ... پێویستە ئێمە شتی سوود بەخش و باشی خەڵك وەربگرین، جوانیش گوتراوە (انظروا إلى ما قيل ولا تنظر إلى ما قال) واتە: تەماشا بکە چی گوتراوە، تەماشا مەکە کێ گوتویەتی.

ئەگەر پێیان بگوترێ بروا بێنن و وەرنە سەر ڕاستە شەقامی خوا، دەڵێن:[..إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾ ][1].

واتە: ئێمە باوکو باپیرانمان و پێشینانمان لەسەر ڕێبازێك بینیوە ئێمەش بە دوای ئەوان دەکەوین و ڕێچکەی ئەوان دەگرین و بەرینادەین، خوای دادگەریش لە وەڵامیاندا دەفەرموێ: [...أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٠٤﴾][2].

واتە: ئەدی ئەگەر باوکو باپیرانیان و پێشینانیان نەیانزانیبێ و ڕێگایان نەدۆزیبێتەوە، دەبێ هەر بەدوایان بکەون؟!

---

(١) سورة الزخرف، الآية: (٢٣) .

(٢) سورة المائدة ، الآية : (١٠٤) .

کەواتە لە ئیسلامدا بۆت نیە بەدوای باوکو باپیرانیشت بکەوی لە شتی ناهەق و بەتاڵ و پووچدا، چ جای بەدوای بێگانەیەك بکەوی کە بڕوای بە ئایین و بەرنامەی تۆ نیە!

ئیسلام دەڵێ: بێژینگ بەو شتی چاك وەربگرەو هی خراپیش ڕەت بکەوە.

وەك هەنگ (مێش هەنگوین) بە شیلەی گوڵان بمژە، مێشە ڕەشە مەبەو بە دوای خاڵی ڕەش و شتی پیس و پۆخڵ دا مەگەڕێ!

شتە باشەکانی خەڵك وەربگرەو خۆت لە شتە خراپەکانیان بپارێزە، لێیان بەهرەمەند بە، بەڵام لاساییان مەکەوەو لێیان زەرەرمەند مەبە.

ئێمە لەسەردەمێك دەژین پێی دەگوترێت سەردەمی تەکنەلۆجیا، بەڵام حەیف لە کردارەکانی تەکنەلۆجیا تێنەگەیشتووین، تەنانەت لە ئاینەکەشمان تێنەگەیشتووین..

خۆچواندن بەبێ باوەڕەکان سێ حوکمی هەیە:

یەکەم: ئەنجامدەری خۆوێکچووەکە کافر دەبێت و بڕواکەی لە دەست دەدات.. وەکو: بڕوات بە هەندێك لە دەقەکانی ئایین هەبێت و بڕوات بە هەندێکی نەبێ.

دووەم: ئەنجامدەری خۆوێکچووەکە پێی فاسق دەبێت و تاوانی گەورەتری بەدوای خۆیدا دەهێنێت.. وەکو: دروستکردنی مزگەوت لەسەر گۆڕی پیاوچاکان یان خۆچواندنی پیاوان بە ئافرەتان و بە پێچەوانەوەش.

سێیەم: ئەنجامدەری خۆوێکچووەکە بە هەڵە ئەنجامی دەدات.. وە دەبێت بە زووترین کات وازی لێبهێنێت، وەکو شێوازی پرچ داهێنان و لەبەرکردنی جلوبەرگی وەکو ئەوان، بۆ ئەوەی هاوشێوەی ئەوان دەربچن[١].

---

(١) أحاديث معجزات الرسول التي ظهرت في زماننا، دکتۆر عبدالمهدي عبدالقادر عبد الهادي، (٢/ ٦٢) مكتبة الإيمان، الطبعة الأولى ١٤٢٣ هـ ٢٠٠٢ م.

## بانگەشەکردنی خەڵکی بەرەو ئاگری دۆزەخ

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر، هەر کەسەو هەڵدەستێت بە بانگەشەی خەڵکی بۆ پرۆگرام و یاسای دەستکرد، کە ئەمەش بانگەشەکردنێکی ئاشکرایە بۆ ئاگری دۆزەخ..

گەلێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) هەوڵی ئەومیان داوە تا لە فیتنە دەرباز ببن کە ئوممەتی ئیسلام دووچاریان دەبێتەوە.

پێشەوا حوذەیفەی کوڕی یەمان(ﷺ) دەڵێت: من شارەزاترین کەسم بە هەموو فیتنەیەك کە لە نێوان خۆمەوە تا ڕۆژی دوایی روودەدات.

پێشەوا حوذەیفەی کوڕی یەمان(ﷺ) دەڵێت: (كَانَ النَّاسُ يَسْأَلُونَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَنِ الْخَيْرِ، وَكُنْتُ أَسْأَلُهُ عَنِ الشَّرِّ مَخَافَةَ أَنْ يُدْرِكَنِي، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا كُنَّا فِي جَاهِلِيَّةٍ وَشَرّ، فَجَاءَنَا اللهُ بِهَذَا الْخَيْرِ، فَهَلْ بَعْدَ هَذَا الْخَيْرِ شَرٌّ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَقُلْتُ: هَلْ بَعْدَ ذَلِكَ الشَّرِّ مِنْ خَيْرٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَفِيهِ دَخَنٌ، قُلْتُ: وَمَا دَخَنُهُ؟ قَالَ: قَوْمٌ يَسْتَنُّونَ بِغَيْرِ سُنَّتِي، وَيَهْدُونَ بِغَيْرِ هَدْيِي، تَعْرِفُ مِنْهُمْ وَتُنْكِرُ، فَقُلْتُ: هَلْ بَعْدَ ذَلِكَ الْخَيْرِ مِنْ شَرّ؟ قَالَ: نَعَمْ، دُعَاةٌ عَلَى أَبْوَابِ جَهَنَّمَ مَنْ أَجَابَهُمْ إِلَيْهَا قَذَفُوهُ فِيهَا، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، صِفْهُمْ لَنَا، قَالَ: نَعَمْ، قَوْمٌ مِنْ جِلْدَتِنَا، وَيَتَكَلَّمُونَ بِأَلْسِنَتِنَا، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَمَا تَرَى إِنْ أَدْرَكَنِي ذَلِكَ؟ قَالَ: تَلْزَمُ جَمَاعَةَ الْمُسْلِمِينَ وَإِمَامَهُمْ، فَقُلْتُ: فَإِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُمْ جَمَاعَةٌ وَلَا إِمَامٌ؟ قَالَ: فَاعْتَزِلْ تِلْكَ الفِرَقَ كُلَّهَا، وَلَوْ أَنْ تَعَضَّ عَلَى أَصْلِ شَجَرَةٍ حَتَّى يُدْرِكَكَ الْمَوْتُ وَأَنْتَ عَلَى ذَلِكَ)[(١)].

واتە: خەڵکی لە بارەی خێرو چاکەوە پرسیاریان لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد بەڵام من لە بابەت شەڕو خراپەوە پرسیارم دەکرد، نەوەك تێی بکەوم و بگەمە کاتی شەڕو فیتنەکان، جا پرسیم ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئێمە لە نەفامی

(١) صحيح مسلم (٣/ ١٤٧٥) باب: الأمر بلزوم الجماعة، برقم: (١٨٤٧).

و شەڕدا بووین، خودا ئەم خێرەی بۆ هێناین، ئایا لەدوای ئەم خێرە شەڕ هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتم: ئەی لە دوای ئەو شەڕە خێر هەیە؟ فەرموی: بەڵێ بەڵام لێڵی تێدایە، گوتم: لێڵەیکەی چیە؟ فەرموی: قەومێك بە ڕێبازی بێجگە لە ڕێنمایی مندا دەڕۆن چاکەشیان هەیەو خراپەشیان هەیە، جا کاری چاکیان پەسند دەکەی و خراپەیان ئینکار دەکەی..

گوتم: ئەی پاش ئەو خێرە چ شەڕی دیکە هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ کۆمەڵێك خەڵکی بۆ دەرگەی دۆزەخ بانگ دەکەن، هەر کەسێ بە گوێیان بکات هەڵی دەدەنە ناو دۆزەخ..

گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) باسیانم بۆ بکە، فەرمووی: ئەوانە لە خۆمانن و بە زمانی ئێمە دەدوێن..

گوتم: ئەگەر گەیشتمە ئەو سەردەمە چیم پێ دەفەرمووی؟ فەرمووی: پابەندی کۆمەڵ و پێشەوای موسڵمانان بن، گوتم: ئەی ئەگەر کۆمەڵ و ڕابەریان نەبوو؟ فەرمووی : کەواتە لە هەموو ئەو کۆمەڵانە کەنار بگرە بە دانیشت بنکی دارت بگەزی تاکو لەسەر ئەم بارە مردنت دەگاتێ.

ئەم فەرمووده باس لەو کۆمەڵ و ڕێچکانە دەکات کە لە ئاخیر زەمان دروست دەبن و هەریەکێکیان کەسانێك بانگەشەی بۆ دەکەن، هەر کەسێك باوەڕیان پێ بکات و بەدەم بانگەشەیانەوە بچێت دینی خۆی دەدۆڕێنێت و ڕێگەی دۆزەخ دەگرێتە بەر.

وە فەرمان بە موسڵمانان دەکات کە ئەگەر لەو ڕۆژەدا کۆمەڵ و پێشەوای ئیسلامی هەبوو ئەوا با پەیوەست بێت پێیانەوە، ئەگەر نا با خۆی دوورە پەرێز بگرێت لە گشت ئەو ڕێچکەو ڕێبازە نا ئیسلامیانەی کە لەو کاتەدا پەیدا دەبن، هەرچەندە خاوەنەکانیشی هاوڵاتی و هاو زمانی خۆمان بن، چونکە شوێنکەوتووی ئەو ڕێگانە هەمووی بە دۆزەخ دەگات .

من لەم فەرمودەیەدا وای دەبینم کەوا ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) مەبەستی پێی ئەوانەیە کە بانگەشەی بێ دینی و خراپەکاری و فەسادو ئاشوب دەکەن.

پێشەوا قازی عیاز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: مەبەست لە شەڕی یەکەم ئەو ئاژاوەو فیتنەیە بوو کە لە دوای شەهید بوونی پێشەوا عوسمان (ﷺ) هاتە ئاراوە، وە ئەو خەیرەی کە بەدوایدا هات خیلافەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو، وە مەبەست لەوانەی چاکەو خراپەیان لێدەبینن ئەو ئەمیرانەن کە لە دوای عومەری کوری عبدالعزیز کاروباری وڵاتیان گرتە دەست، هەندێکیان پابەندبوون بە سونئەتەوەو دادپەروەر بوون لەگەڵ خەڵکی، هەندێکیشیان خەریکی تاوان و بانگەشە بوون بۆ بیدعەو خورافیات، وە مەبەست لەسەردەمی تەماوی ئەوەیە کە ڕویداوە لە سەردەمی پێشەوا عەلی و موعاویە (ڕەزای خوایان لێ بێت) کە هەندێك لە ئەمیرەکان خراپبوون، وە مەبەست لەوانەی خەڵکی بانگ دەکەن بۆ دۆزەخ ئەوانەن کە دەیانویست ماڵ و سامان و دەسەڵات بەدەست بێنن، وەکو خەواریج و هاوشێوەکانیان کە لە مەنهەجی ئەهلی سوننەت و جەماعە لایان دابوو[1].

ئەم فەرمودەیە هێما دەکات بۆ ئەوانەی کە لەم ڕۆژگارەدا بانگەواز دەکەن بۆ جۆرەها خراپە، وەکو نەتەوایەتی و عروبەت و عەلمانیو ئیشتراکیو سەرمایەداری و ئازادی ڕەها، ئەوانەن بانگخوازانی ئاگرن هەرکەسێ وەڵامیان بداتەوە بێگومان دەچێتە دۆزەخەوە، ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوونە کە پێغەمبەرمان(ﷺ) باسی لێدەکات.

واتای عەلمانیەت: کاتێ ئەم وشەیە دەکەوێتە بەرچاو و گوێت لێ دەبێ سەیر دەکەی واتای دروشمی زانست هەردەگرێ و بەخۆیەوە دەبینی و هیچ بەرگرییەکی نیە لەگەڵ ئایینی پیرۆزی ئیسلام، بەڵکو بیرت بۆ ئەوە دەچێ کە ئەمە یەکێکە لەم ڕێگاو ئامانجانەیە کە ئایینی ئیسلام داوای دەکات لە موسوڵمانان، بزانە براکەم هۆشیارم هەروەکو کورد گوتەنی ئەوانە (دوژمنی خۆیان بە هەنگوین ئەخنکێنن) .. ئەگەر ڕوحی خۆشی پێدای بڕوای پێ مەکە چونکە بزانە ئەو زێڕەی دەتداتێ لەکۆتایی زیوەکەی توشی پێ نایەت، مەبەستی ئەوانە ئەوەیە بەم وشەیە لەخشتە بردنی موسڵمانانە بۆ ئەوەی بکەونە وەهمی ئەم مانایەو هەستی پێ نەکەن.

---

(١) شرح صحيح البخاري، (١٣/ ٣٩).

# بەهێز بێ هێز دەخوات

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر کەسی خاوەن دەسەڵات ستەم لە بێ دەسەڵاتەکان دەکات..

دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) هاتە لام و فەرمووی: (يَا عَائِشَةُ ، قَوْمُكِ أَسْرَعُ أُمَّتِي بِي لَحَاقًا ، قَالَتْ : فَلَمَّا جَلَسَ ، قُلْتُ : يَا رَسُولَ اللهِ ،جَعَلَنِي اللَّهُ فِدَاءَكَ ، لَقَدْ دَخَلْتَ وَأَنْتَ تَقُولُ كَلَامًا ذَعَرَنِي، قَالَ : وَمَا هُوَ ؟ قَالَتْ : تَزْعُمُ أَنَّ قَوْمَكَ أَسْرَعُ أُمَّتِكَ بِكَ لَحَاقًا ، قَالَ : نَعَمْ ، قَالَتْ : وَمِمَّ ذَاكَ ؟ قَالَ : تَسْتَحْلِيهِمْ الْمَنَايَا، وَتَنَفَّسُ عَلَيْهِمْ أُمَّتُهُمْ، قَالَتْ : فَقُلْتُ : فَكَيْفَ النَّاسُ بَعْدَ ذَلِكَ ، أَوْ عِنْدَ ذَلِكَ ؟ قَالَ: دَبًى، يَأْكُلُ شِدَادُهُ ضِعَافَهُ ، حَتَّى تَقُومَ عَلَيْهِمُ السَّاعَةُ ، قَالَ أَبُو عَبْد الرَّحْمَنِ : فَسَّرَهُ رَجُلٌ: هُوَ الْجَنَادِبُ الَّتِي لَمْ تَنْبُتْ أَجْنِحَتُهَا)[1].

واتە: ئەی عائیشە قەومەکەی تۆ خێراترین ئوممەتن لە گەیشتنیان بە من، دەفەرموێت: کاتێك دانیشت وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، خوا منت بە قوربان بکات، کە هاتیتە ژوورەوە قسەیەکت فەرموو ترسی هاویشتە دڵمەوە، فەرمووی لەبەرچی؟ وتم: فەرمووت کە قەومەکەی من خێراترین ئوممەتن فریات بکەون، فەرمووی: بەڵێ. وتم: بەهۆی چیەوە؟ فەرمووی: مردن وەکو نێچیرێکی ئاسان تەماشایان دەکات و هێرش دەکاتە سەریان وتم: ئەی خەڵکی دوای ئەوە حاڵیان چۆن دەبێت؟ فەرمووی: وەکو کوللەن بە هێزەکانیان بێهێزەکانیان دەخۆن تاکو کۆتایی بونەوەریان بەسەردا هەڵدەسێت.. باوکی عەبدوڕەحمان گوتی: پیاوێك لێکی دایەوە بە ئەو کوللانەی کە هێشتا باڵیان دەرنەکردووە.

ئەو فەرموودەیە ئاماژە دەکات بۆ ڕوودانی ستەمێکی گەورەو خراپیەکی زۆر تەنانەت کەسی خاوەن دەسەڵات کەسی لاواز و بێدەسەڵات دەخوات.

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٦/ ٨١) برقم: (٢٤٥٦٣) قال شعيب الأرناؤوط: رجاله ثقات رجال الشيخين وأورده الهيثمي في المجمع ١٠ / ٢٧ - ٢٨ وذكر أن رجاله رجال الصحيح .

بەرگی دووەم

## خواردنی خواردنە قێزەوەنەکان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر شوێنکەوتنی جولەکەو گاورەکانە هەتا وای لێ دێت خواردنی قێزو بێز دەخۆن..

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

(لَتُنْقَضَنَّ عُرَى الإِسْلامِ عُرْوَةً عُرْوَةً ... حَتَّى لَوْ أَنَّهُ كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ مِنَ الأُمَمِ أُمَّةٌ يَأْكُلُونَ الْعَذِرَةَ رَطْبَةً أَوْ يَابِسَةً لأَكَلْتُمُوهَا ..)[1].

واتە: قوڵفەکانی خێمەی ئیسلامەتی یەك یەك دەپچرێت، هەتا ئەگەر ئوممەتانی پێش ئێوە شتی قێزەون و پیس بخۆن تەڕ بێت یان وشك دەرخوارتانی دەدەن و دەیخۆن.

پاکو بێگەردی بۆ خوای گەورە هەر دەڵێی ئەمڕۆیە کە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) هەواڵی پێداوین، تەنانەت هەندێك لە موسڵمانان کاتێك سەفەری وڵاتێکی کوفر دەکەن ئەوەی ئەوان دەیخۆن موسڵمانەکەش دەیخوات، هەتا ئەگەر ماسی بخۆن بە پیسیەوە ئەوانیش دەیخۆن، وە ناشزانێت چی لە گۆڕێ هەیە تەنها شوێنی کەوتووە، ئەو هەژارە وا دەزانێت ئەمە پێشکەوتووە، نازانێت کە گاڵتەی پێ دەکەن.

لە ساڵی ٢٠٢٠ خوای گەورە ڤایرۆسێکی بە چاو نەبینراوی نارد بۆ وڵاتێکی وەکو چین، کە ناسراوە بە ڤایرۆسی کۆڕۆنا کۆڤید ١٩، ئەمەش بەهۆی خواردنە

---

(١) صحيح: أخرجه الإمام أحمد في المسند (٥/ ٢٥١) برقم: (٢٢١٦٠). وابن حبان في صحيحه برقم:(٦٧١٥) وقال الأرناؤوط: إسناده قوي، والحاكم في (المستدرك) (١/ ٢٧٢) وقال: الإسناد كله صحيح ولم يخرجاه.. والطبراني في (الكبير) (٨/ ٩٨/ ٧٤٨٦).

قیٚزەوەکانەوە بوو، کە خوای گەورە حەرامی کرد... ئینجا دواتر بە وڵاتانی جیهان بڵاوبوویەوە.. وە زۆرترین ئەو وڵاتانەی کە ئەم ڤایرۆسەی تیادا بڵاوبوویەوە وڵاتانی ڕۆژئاواو ئەوروپا بوو..

بە پێی داتای نوسینی ئەم بابەتە، ئەمڕۆ ٢٠٢٠/٩/٦ ژمارەی تووشبووان لەسەرتاسەری جیهان گەیشتە (٢٧٢٣٤٠٥٦) بیست و حەوت ملیۆن و دووسەدو سی و چوار هەزارو پەنجاو شەش کەس.

ئەوانەی بەهۆی ئەم ڤایرۆسەوە مردوون لە جیهان گەیشتە (٨٨٦٢٢٧) هەشت سەدو هەشتاو شەش هەزارو دوو سەدو بیست و حەوت کەس..

ڕێژەی تووشبووان لە وڵاتی عێراق (٢٦٠٣٧٠) دوو سەدو شەست هەزارو سیٚ سەدو حەفتا کەس، وە (٧٥١٢) حەوت هەزارو پێنج سەدو دوانزە کەسیش مردوون بە هۆی ئەم ڤایرۆسەوە..

ژمارەی تووشبووان لە هەرێمی کوردستان گەیشتە (٣٢٢١٠) سی و دوو هەزارو دووسەدو دە کەس، وە (١٢٠٧) هەزارو دووسەدو حەوت کەسیش بەهۆیەوە مردووە.

نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە:

١- بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی جەستە بۆ سەروو ٣٨ ..

٢- توندبوونی هەناسە..

٣- کۆکەی سەخت..

٤- ئاو هاتن بە لوتدا..

٥- ئازاری ماسولکە..

## سەرهەڵدانی کەناڵە ئاسمانیەکان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی سەرهەڵدانی کەناڵە ئاسمانیەکان و ناوەخۆییەکانە..

ئەمڕۆ لە ئاسماندا نزیکەی سیانزە هەزار کەناڵی سەتەلایت هەیە لە جیهان کە چەند فیتنەو بەڵاو خراپەی لەگەڵ خۆی هێناوە..

ئیبنو ئەبی شەیبە بە سەنەدێکی صەحیح لە پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمانەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

(لَيُوشِكَنَّ أَنْ يُصَبَّ عَلَيْكُمَ الشَّرُّ مِنَ السَّمَاءِ حَتَّى يَبْلُغَ الْفَيَافِيَ ، قَالَ : قِيلَ : وَمَا الْفَيَافِيُ يَا أَبَا عَبْدِ اللهِ ، قَالَ : الأَرْضُ الْقَفْرُ)[1].

واتە: نزیکە لە ئاسمانەوە شەڕێکتان بۆ ببارێت تا ئەپەڕێتەوە بۆ (فەیافی)، پرسیان: (فەیافی) چیە ئەی باوکی عەبدوڵڵا؟

فەرمووی: زەوی وشك (واتە: بیابان).

واتە: ئەو بیابانەی کە هیچی لێ شین نابێت..

هەندێك لە زانایان دەفەرموون:

مەبەست پێی کەناڵە ئاسمانیەکانە کە فیتنەو خراپەکانی هەموو کون و قوژبنێکی دونیا دەگرێتەوە!

بۆیە عەرەبیش بە هەموو شتێك لەسەرەوەی ئادەمیزادەوە بێت دەڵێن (سماء) لە (لسان العرب)یشدا هاتووە: (السماء كل ما علاك فاظلك) واتە: ئاسمان بە هەموو ئەو شتانە دەگوترێت: کە لە تۆ بەرزتر بێت و سێبەرت بەسەردا بکات.

---

(١) مصنف ابن أبي شيبة (١٥/ ١١٠) برقم: (٣٨٥٥٤).

تەلەفزیۆنیش ئەمڕۆ ئەو هەموو بێ ئابڕوویی و شەرمەزاریانەی مانگە دەستکردەکان وەردەگرن کە دەیبارێنن، تەنانەت چادرەکانی ناو بیابانەکان ڕزگاریان نەبووە لەو بەدڕەوشتیە.

جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر بەرزاییەکی شاری مەدینە وەستاو فەرموی:

(هَلْ تَرَوْنَ مَا أَرَى ؟

قَالُوا : لاَ

قَالَ : إِنِّي لأَرَى الْفِتَنَ تَقَعُ خِلاَلَ بُيُوتِكُمْ كَوَقْعِ الْمَطَرِ)[١].

واتە: ئایا ئەوەی ئێوە کە دەیبینن من دەیبینم؟

گوتیان نەخێر

فەرمووی: من ئاشوب دەبینم کە دێتە خوار بەسەر ماڵەکانتاندا وەکو هاتنە خوارەوەی ڕێژنەی باران.

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) سەبارەت بەم فەرمودەیە دەڵێت:

وێ چواندنی (فیتنە)یە شوێنی باران لەبەر زۆری گشتیەتی بووە، واتە: ئاشوبەکان زۆرن هەموو خەڵکەکەی دەگرێتەوە.. تایبەت نابێ بە کۆمەڵێك[٢].

---

(١) صحيح مسلم، كتاب: الفتن وأشراط الساعة (١٨ / ٧ مع شرح النووي) .

(٢) صحيح مسلم (١٨ / ٨ مع شرح النووي).

## کەسی گەمژە دەبێتە خۆشحاڵترین کەس بە دونیا

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە کەسی گەمژە دەبێتە خۆشحاڵترینی کەسی دونیا..

یەکێك لەو بنچینە گرنگانەی کە ژیانی مرۆڤی پێ چارەسەر بکرێت ئەوەیە کار بدرێتە دەست پیاوی شیاو، وە کەسی گونجاو لە شوێنی گونجاو دابنرێت، بۆیە ئەو ماوانەی فەرمانڕەوایی لە دەست کەسانێکی بە توانا و چاك و پارێزگار دابوو ماوەیەکی ڕووناکو پرشنگدار بوون لە مێژووی ئومەتی ئیسلامی، کوشندەترین دەردیش کەوا بکەوێتە ژێر سیستەمی ژیان ئەوەیە کەسانێکی نابوت و نا لەبارو نا شایەن کاروبارو فەرمانڕەوایی بگرنە دەست، بە پێی ئارەزووی خۆیان ژیان ببەنە سەرو مرۆڤی لێهاتوو و هەڵکەوتوو توانا لە ئاست بەڕێوەبردنی کاروباران بە چاکترین شێوە پشت گوێ بخرێن.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يُوشِكُ أَنْ يَغْلِبَ عَلَى الدُّنْيَا لُكَعُ بْنُ لُكَعٍ، وَأَفْضَلُ النَّاسِ مُؤْمِنٌ بَيْنَ كَرِيمَتَيْنِ)[1].

واتە: هێندەی نەماوە سپڵەی کوڕی سپڵە بەسەر دونیادا زاڵ بێ، چاکترین خەڵکیش بڕوادارێکی نێوان دوو ڕێزدارانە.

(لُكَعُ بْنُ لُكَعٍ) کەسی خراپ کە کەس باسی ڕەوشتی باشەی ناکات، عەرەبیش بە کۆیلەی خراپ و قەڵپ دەیانگوت: (لكع).

هەروەها ئەو وشە بۆ ئاماژە کردن بۆ گێلی و گەمژەیی بەکارهاتووە بۆیە بە پیاو دەوترێت (لُكَع) و بە ئافرەتیش دەوترێت (لُكَاع)، جا ئەو کەسە

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٥/ ٤٣٠)، برقم: (٢٢٧٠١). قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

دەبێتە خۆشحاڵترین کەس بە دونیا لە ڕووی ماڵ و سامان و ڕێزو سەیارەو ماڵی جوان و فراوان، چونکە (لُکَع)ە، ماڵی شلە لە هەموو ڕێگەیەکەوە بێت هەر بەدەستی دەهێنێت و لەگەڵ خەڵکی بە پێی هەواو ئارەزووی خۆی مامەڵە دەکات.

هەر کەسێك چاوی دابێتە مێژووی ئوممەتی ئیسلامی، دەزانێ ئەو نەخۆشیەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاماژەی بۆ کردووە، لەو بەڵا هەرە گەورانەیە کە موسڵمانانی گرفتار کردووە، کەسانێکی زۆردارو کەڵەگا کاروباری ئەم ئوممەتەیان گرتۆتە دەست، ناتوانن گوێ بدەنە ڕای پێچەوانەو ناکۆکن لەگەڵ بۆ چوونی خۆیان.

زۆر جاران کە دەچیتە مەجیلیسێك ئەوەت بەرچاو دەکەوێت کە چەندین (لکع) لەو مەجلیسە دانیشتوون، بەبێ ئەوەی باسی خوای گەورەیان کردبێت، یان ئەو دانیشتنەیان کردووەتە مایەی قسەی دونیایی.

لەم سەردەمە پێویستە ئەو جۆرە کەسانە بناسینەوە نەك لەبەر ئەوەی خراپن، بەڵکو بۆ ئەوەی خۆمانیان لێ بپارێزین، چونکە هەر کەسێك چاکەو خراپە لە یەك جیا نەکاتەوە ئەوا دەکەوێتە ناو خراپەوە.

هەر کەسێك بیەوێت بە خۆشگوزەرانی بژیەت و ڕزق و ڕۆزی زۆر بێت و تەمەنێکی پڕ لە بەرەکەت بەسەر ببات ئەوا پێویستە مرۆڤ لەم جۆرە کەسانە خۆی بە دوور بگرێت، بۆیە هەر کەسێك گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکات ئەوا گوێڕایەڵی خوای گەورەی کردووە.

وە ئەگەر دەتەوێت لە ژێر عەرش و ستری خوای گەورەدا بیت، ئەوا هەمیش دوور بکەوە لەوانەی کە پێیان دەوترێت (لکع).

# حەج و عومرە قەدەغە دەکرێت بەسەر خەڵکی

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی قەدەغەکردنی خەڵکە لە چوونە حەج و عەمرە کردن..

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى لَا يُحَجَّ الْبَيْتُ)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا وای لێدێت حەجی ماڵی خودا ناکرێت..

واتە: هەندێك لە دەست درێژ کاران ماڵی خودا لە خەڵکی قەدەغە دەکەن.

ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) وەکو ڕۆژی ڕووناك هاتە دی، وە بەردەوامیش دەبێت هەتا دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت)..

شێخ محەممەد بەرزنجی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

• لە ساڵی (٣٢٠) هەتا (٣٢٧) کۆچی لە شاری بەغداد کەس نەچوویە حەج ئەمەش بە هۆی فیتنەو ئاشوبی قەرامیطەکان .

• لە ساڵی (٣٨٤) کۆچی خەڵکی عێراق و شام و یەمەن نەچوون بۆ حەج، ئەمەش بە هۆی ئەوەی کە چەند دەشتەکیەك داوای باجیان لێدەکردن، لەو ساڵی تەنها خەڵکی میصر چوون بۆ ماڵی خوا.

• لە ساڵی (٤١٨) کۆچی لە ڕۆژهەلاتی عێراق و ولاتانی تر ڕێگەنەدرا کەس بچێت بۆ حەج تەنها موسڵمانانی شاری خوراسان چوون، ئەمیش بەهۆی ئەوەی لە ڕێگای دەریاوە ڕۆیشتن، بۆیە توانیان بەرەو ماڵی خوا بەڕێ بکەون.

---

(١) صحيح البخاري (٢/ ١٤٩) باب: قول الله تعالى: جعل الله الكعبة، برقم: (١٥٩٣).

• لە ساڵانی (٨٠٣ ٨٠٤ ٨٠٥) ئەو حاجیانەی کە لە ڕێگای شام هاتن هەموویان ڕێیان لێگیرا نەیاتوانی سەفەری حەج بکەن[١].

• لە ساڵی (٣٤٩)ی کۆچی حاجیەکانی میصر نەیانتوانی بچن بۆ حەج، چونکە گەیشتنە دۆڵێك پڕ ببوو لە ئاوی باران.. بۆیە بە ناچاری گەڕانەوە[٢].

• لە ساڵی (٣٩٢)ی کۆچی خەڵکی بەغداد نەیاتوانی بچنە حەج، لەبەر دزو جەردەکانی ئەو سەردەم .

• لە ساڵی ٢٠٢٠ ع ماڵی خوای گەورە قەدەغە کرا بە هۆی ڤایرۆسێکی بە چاو نەبینراوی نارد بۆ زۆربەی وڵاتانی جیهان، کە ناسراوە بە ڤایرۆسی کۆڕۆنا کۆڤید ١٩، بە پێی داتای نوسینی ئەم بابەتە، ئەمڕۆ ٢٠٢٠/٩/٧ ژمارەی تووشبووان لەسەرتاسەری جیهان گەیشتە (٢٧٤٣٨٥٤٣) بیست و حەوت ملیۆن و چوار سەدو سی و هەشت هەزارو پێنج سەدو چل و سێ کەس، ئەوانەی بەهۆی ئەم ڤایرۆسەوە مردوون لە جیهان گەیشتە (٨٩٥٤٤٠) هەشت سەدو نەوەدو پێنج هەزارو چوار سەدو چل کەس.. وە ژمارەی تووشبوان لە وڵاتی سعودیە گەیشتە (٣٢١٤٥٦) سێسەدو بیست و یەك هەزارو چوار سەدو پەنجاو شەش کەس و مردنی (٤١٠٧) چوار هەزارو سەدو حەوت کەس.. بۆیەش لە ساڵی ٢٠٢٠ حەجکردن لە هەموو وڵاتان قەدەغە کرا تەنها سعودیە نەبێت.. کە ئەمەش بە یەکێك لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی هەژمار دەکرێت..

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة (لا ٩٩ ١٠٠).

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بەرگی دووەم

## بە ناپاک دانانی دەستپاک و متمانە پێکردنی ناپاک

یەکێکی تر لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر نەمانی دەستپاکی و سپاردنی کاروبارە بە کەسانی ناشایستە، هەروەها لە نیشانەکانی: بە ناپاك دانانی دەستپاك و متمانە پێکردنی ناپاك، واتە: گومان بردن بە کەسی دەستپاك و بڕوا نەبوون بە ڕاستگۆیی ئەو کەسە، لە کاتێکدا متمانە دەکرێت بە درۆزن و دوو ڕووو ڕیاباز ناپاك.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی ڕاگەیاندووین کە ئەو پێوەرانەی پیاوان هەڵدەسەنگێنن بەر لە هاتنی ڕۆژی دوایی لاسەنگ دەبێت، جا درۆ بە راست وەردەگیرێ و راستیش بە درۆ دادەنرێت و ڕەت دەکرێتەوە ، ماڵ و ناموس ئەسپەردەی ناپاك و دەست بڕان دەکرێ و دەست پاك و ڕاست کردارانیش بە ناپاکی تۆمەت بار دەکرێن ، پیاوی نابوت و نا کەس قسان دەکەن کە بۆ هەموو خەڵکی گرنگن، ئینجا بێجگە لە ڕاو بۆچوونی پوچ و هیچی دیکە نادەن بۆ ڕێچکەی خوار و خێچ نەبێ ڕێبەری ناکەن.

پێشەوا ئەبو هوڕەیرە(ﷺ) دەگێڕێتەوە دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (إِنَّهَا سَتَأْتِي عَلَى النَّاسِ سِنُونَ خَدَّاعَةٌ ، يُصَدَّقُ فِيهَا الْكَاذِبُ ، وَيُكَذَّبُ فِيهَا الصَّادِقُ ، وَيُؤْتَمَنُ فِيهَا الْخَائِنُ، وَيُخَوَّنُ فِيهَا الأَمِينُ ، وَيَنْطِقُ فِيهَا الرُّوَيْبِضَةُ قِيلَ : وَمَا الرُّوَيْبِضَةُ ؟ يَا رَسُولَ اللهِ قَالَ : السَّفِيهُ يَتَكَلَّمُ فِي أَمْرِ الْعَامَّةِ)[1].

واتە: سالانێکی هەڵخەڵەتێنەر بەسەر خەڵکی دێت
درۆزنی تێدا دەکرێت بە ڕاستگۆ

---

(١) صحيح: أخرجه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٥٥٧) برقم: (٨٥٦٤). قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الإِسْنَادِ.. وصححه ووافقه الذهبي.

وە ڕاستگۆشی تێدا دەکرێت بە درۆزن

وە خیانەت کاری تێدا دەکرێت بە دەست پاك

وە دەستپاکی تێدا دەکرێت بە خیانەتکار

(روبیضة) قسەی تێدا دەکات؟

گوتیان: (روبیضة) چیە ئەی پێغەمبەری خودا؟

فەرموی: کەسانی نا کەس بەچەو بێ نرخ قسە لە کاروباری گشتی خەڵکدا دەکەن.

هەر کەسێك لە بارەی جیهانی ئەمڕۆمان ڕابمێنێ، دەبینێت لەم سەردەمەدا دەژین کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی لێوە کردووە، درۆی بێباوەران و هاوبەش دانەران کە ئاژانسی هەواڵ و رادیۆ و تەلەفزیۆنیان هەن بە ڕاست دادەنرێ و کەچی ڕاستگۆ و دادوەران بە درۆ دەخرێنەوە، ئومەتی ئیسلامیش ماڵ و سامانی دەخاتە دەست ناپاکە بێباوەڕەکان، کامەی نابوتە بووەتە پیاوی مەیدان و قسان لە کاروباری دونیادا دەکەن، وە جیهان بەرەو هەڵدێرێکی وا دەبەن هێندەی نەماوە سەر تاپای مرۆڤایەتی تێ بچێت.

جوانیەك لە کۆمەڵگادا مابێتەوە، بەهۆی ئیسلامەوە ماوەتەوە، بەڕاستی فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هەمووی هاتە دی، ئەوەی نەرم و نیانە بە توندڕەو ناوی دەرکردووە، ئەوەی توندڕەوە پێی دەڵێن: نەرم و نیان.

لەم سەردەمە دۆستان و ئەولیاکانی خوای گەورە لەلایەن خەڵکی تۆمەتبار دەکرێن بە خراپەکار، و خراپەکارانیش پێیان دەوترێ لە خوا ترس.

# حەڵاڵ کردنی جلی ئاوریشم

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر حەڵاڵکردنی جلی ئاوریشمەو پیاوان لەبەری دەکەن و شانازی پێوە دەکەن..

پێشەوا حوزەیفەی کوڕی یەمان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مِن اقْتِرَابِ السَّاعَةِ اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ خَصْلَةً : إِذَا رَأَيْتُمُ النَّاسَ .. وَالْحَرِيرُ لِبَاسًا ..)[1].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر حەفتاو دوو تایبەتمەندە: ئەگەر خەڵکتان بینی ..جلی ئاوریشمیان پۆشی.

پێشەوا ئەبو مالیکی ئەشعەری(ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (يَكُونَنَّ مِنْ أُمَّتِي أَقْوَامٌ، يَسْتَحِلُّونَ الحِرَ وَالحَرِيرَ، وَالخَمْرَ وَالمَعَازِفَ، وَلَيَنْزِلَنَّ أَقْوَامٌ إِلَى جَنْبِ عَلَمٍ، يَرُوحُ عَلَيْهِمْ بِسَارِحَةٍ لَهُمْ، يَأْتِيهِمْ - يَعْنِي الفَقِيرَ - لِحَاجَةٍ فَيَقُولُونَ: ارْجِعْ إِلَيْنَا غَدًا، فَيُبَيِّتُهُمُ اللَّهُ، وَيَضَعُ العَلَمَ، وَيَمْسَخُ آخَرِينَ قِرَدَةً وَخَنَازِيرَ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ)[2]. واتە: کۆمەڵانێك لە ئوممەتی من پەیدا دەبن کە بەدرەوشتی و ئاوریشم و مەی و مۆسیقا حەڵاڵ دەکەن، وە کۆمەڵە قەومێکیش لە پاڵیانەوە ئاڵا هەڵدەدەن، گاوان و شوانیان بەرانەوە بەسەردا دەگەڕێن بۆ پێداویستیەك دێنە لایان و دەڵێن: بەیانی وەرەوە لامان، جا خودا شەویان بەسەردا دێنێ و ئاڵاکە دادەگرێ و ئەوانی تریش تا ڕۆژی دوایی دەکاتە سەگسارو شێوەیان دەکاتە مەیمون و بەراز.

واتای حەڵاڵکردنیان بۆ ئەو شتە حەڕامکراوانە دوو شتە:

١) باوەڕیان وایە کە ئەو شتانە حەڕام نەکراون.

٢) لەبەر ئەوەی خەڵك ڕاهاتووە لەسەر کردن و ئەنجامدانی ئەو شتانەی بڵاوبوونەتەوە لە نێو خەڵکیدا تا وای لێهاتووە خەڵکی نە بە زمان و نە بەدڵ بە خراپی نازانن، بۆیە خەڵکی هەست بە حەڕامبوونی ناکەن لەکاتی ئەنجامدانیان..

---

(١) ضعيف: حلية الأولياء (٣/ ٤١٠) (٤٥٥٥). وهو ضعيف كما قال الحافظ العراقي ( ٣/٢٩٧).

(٢) صحيح البخاري (٧/ ١٠٦) باب: ما جاء فيمن يستحل الخمر، برقم: (٥٥٩٠).

# حەڵاڵ کردنی زینا

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر حەڵاڵکردنی زیناو داوێن پیسی یە.. خەڵکی پەنا بۆ حەڵاڵکردنی دەبات .. کە ئەمڕۆ بەشێك لە شیعەکان بە حەڵاڵی دادەنێن لە ژێر دروشمی (سیغەو هاوشێوەکانی) تەنانەت جاری وا هەیە خەڵکی پێنج ژن دەهێنێ.

پێشەوا ئەبو مالیکی ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت:

گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: (يَكُونَنَّ مِنْ أُمَّتِي أَقْوَامٌ، يَسْتَحِلُّونَ الحِرَ ... )[1].

واتە: کۆمەڵانێك لە ئوممەتی من پەیدا دەبن کە بەدڕەوشتی حەڵاڵ دەکەن..

واتای حەڵاڵکردنیان بۆ ئەو شتە حەرامکراوانە دوو شتە:

١) باوەڕیان وایە کە ئەو شتانە حەرام نەکراون.

٢) لەبەر ئەوەی خەڵك ڕاهاتووە لەسەر کردن و ئەنجامدانی ئەو شتانەی بڵاوبوونەتەوە لە نێو خەڵکیدا تا وای لێهاتووە خەڵکی نە بە زمان و نە بەدڵ بە خراپی نازانن، بۆیە خەڵکی هەست بە حەرامبوونی ناکەن لەکاتی ئەنجامدانیان.

بەڵێ.. ئەمڕۆ کار گەیشتۆتە ئەوەی کەسانێکی زۆر نەك هەر ئەو کارە بەدرەوشتیانە ئەنجام دەدەن، بەڵکو بە حەڵاڵیشیی لە قەڵەم دەدەن، تەنانەت چەندین ڕێککخراو کە بەناو داکۆکی لە مافی ئافرەت دەکەن کە لە پشتیانەوە چەندین حیزب و لایەنی سیاسی وەستاوەو پشتگیریان دەکات، بە ئاشکراو بە بێ پەردە لە تەلەفزیۆن و ڕادیۆو گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا،

---

(١) صحيح البخاري (٧/ ١٠٦) باب: ما جاء فيمن يستحل الخمر، برقم: (٥٥٩٠).

داوای سڕینەوەی ئەو یاسایانە دەکەن کە زینا بە تاوان لە قەڵەم دەدات، ئەنجامدانی ئەو کارە قێزەوەنە دەکەن بە مافێکی سروشتی ئینسانەکان.

دەڵێن: ئیسلام بەو کارە دەڵێت زینا بەڵام ئێمە پێی دەڵێین: پەیوەندیەکی سروشتی لە نێوان ژن و پیاودا کە پێویست ناکات هیچ کۆسپ و بەر بەستێك لەبەردەمیدا دابنرێت، ئەوەی جێی داخ و سەرسوڕمانیشە کەسانێك داوای ئازادی زیناو لا بردنی عەقدی شەرعی مارەکردن دەکەن، کە بە ڕەچەڵەك موسڵمانن و لەسەر ئومەتی ئیسلام حیساب دەکرێن.

بە ڕاستی ئەمە هاتنە دی ئەو فەرموودە پیرۆزانەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: لە ئومەتەکەم کۆمەڵانێك پەیدا دەبن زیناکردن و ئاوریشم پۆشین و مەی خواردنەوە ئامێری مۆسیقا ژەنین بە حەڵاڵ دەزانن.

بەڕاستی سەرکەوتووە ئەو کەسەی لەم سەردەمە خۆی بە دوور دەگرێت لە بەحەڵاڵ زانین و ئەنجامدانی کاری بەدڕەوشتی، چونکە بە مەزندەی خۆم وایە هەر کەسێك تووشی کاری داوێنپیسی دەبێت دوو هۆکاری هەیە:

- ئاستی لاوازی زانستی شەرعی پزیشکی.
- لاوازی لە ئاڕامگرتن بەسەر شەهەواتەکانی.

ڕۆشنایی ئیمان لە دەم و چاوی هیچ کەسێك دەرناکەوێت مەگەر کەسێك خۆی لە زینا کردن بپارێزێت، کەواتە ئەمەیان لە گەورەترین ڕەوشتی ئیسلامە، بۆیە هەر کەسێك داوێن پاکەکانی خۆش بوێت ئەوا لە بەرەکەت و خێرو خۆشی دەژیەت، بە پێچەوانەی زیناکاران.

خوشکی ڕێزدار..

دڵت بپارێزە لە ئاست هەموو کوڕان جگە لە هاوسەری خۆت، چونکە دڵنیابە کوڕان گەر بێتو ڕێزی دڵت و هەستەکانت بگرن لە کۆتاییدا ئەو دڵەت دەخەنە ژێر پێیان و هیچ حیسابێك بۆ هەستەکانت ناکەن.

## غەیبەتکردن و عەیب گرتن لە خەڵکی زۆر دەبێت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی غەیبەتکردن و عەیب گرتن لەلاشەی خەڵکی زۆر دەبێت..

بەداخەوە.. غەیبەت بویتە میوەی زۆرێك لە کۆڕو دانیشتنەکانی موسڵمانان و دەم خستنە ناو باسی شەرەف و ناموسیان بۆتە باو، ئەوەش کارێکە خوای گەورە ڕێگری لێکردوە بەندەکانی لێی ترساندوە بە وێنەیەکی ناشیرن وێنای کردووە کە سروشتی مرۆڤ بێزی لێ دەکات، ئەویش خواردنی گۆشتی برای خۆتە کە بە مردوویی بیخۆیت.

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (إن من أعلام الساعة وأشراطها أن تكثر.. الهمازون والغمازون واللمازون)[1].

واتە: بە دڵنیایی لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی.. غەیبەت کردن و گاڵتەکردن بە مرۆڤی شەل و عەیب گرتن بە دەم و چاوی خەڵکی زۆر دەبێت..

لە ریوایەتێکی تر فەرموویەتی: (من أشراط الساعة تفشوا الغيبة)[2].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی غەیبەت بەربڵاودەبێتەوە.

غەیبەت کردن ئەوەیە تۆ باسی موسڵمانێك بکەی بە شتێك پێی ناخۆشبێ، جا چ دەربارەی جەستەی بێت یا دەربارەی دینی یان دنیای یان خودی خۆی بێت یان هەڵسوکەوتی یان شێوەی بێت، غەیبەتیش چەندین چەندین شێوەی هەیە لەوانە: عەیبەکانی باسبکرێ، یان بە شێوەیەکی سوکایەتی چیرۆکی هەڵس و کەوتێکی بگێڕدرێتەوە.

---

(١) ضعيف: أخرجه الطبراني في (المعجم الكبير) (٢٢٨/١٠) قال ابن حبان في (المجروحين) (٤٤٦): يَأْتِي بالمقلوبات والأشياء الموضوعات لَا يحل الِاحْتِجَاج بِهِ لمُخَالفَته الْأَثْبَات فِي الرِّوَايَات عَلَى قلتهَا، وقال الذهبي في (مختصر مستدرك الحاكم) (٥٤٦٥) والحديث ضعفه البيهقي .

(٢) الترغيب والترهيب برقم: (٤١٩٤) .

بەرگی دووەم

## ئەمانەت دەبێتە دەسکەوت

لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر ئەمانەت وەکو دەستکەوت سەیر دەکرێت.. ئەگەر ئەمانەتێك لای یەکێك دابنێیت، دواتر داوای بکەی دەڵێت: پێت نەداوم.. یان بەبێ ئیزنی خاوەن ئەمانەت هەڵدەستێت بە بەکارهێنانی ئەمانەتەکەی..

لە دەستدانی ڕاسپاردە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی کۆتایی هاتنی ڕۆژی دوایی، پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت:

جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) لە کۆڕێك قسەی بۆ خەڵکی دەکرد، دەشتەکیەك هاتە لای و لێی پرسی کەی ڕۆژی دوایی دێت؟

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەر لە باسەکەی خۆی بەردەوام بوو، هەندێك لە هاوەڵان گوتیان: قسەکەی بیست بەڵام حەزی لێ ناکا، هەندێکیش گوتیان: نەخێر گوێی لێ نەبوو، تاکو لە فەرمایشتەکانی خۆی بویەوە

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:

کوا ئەو کەسەی لە بارەی ڕۆژی دواییەوە پرسیاری کرد؟

کابرا گوتی: ئەوەتام ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (إِذَا ضُيِّعَتِ الْأَمَانَةُ، فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ؟ أَوْ مَا إِضَاعَتُهَا؟ قَالَ: إِذَا تَوَسَّدَ الْأَمْرَ غَيْرُ أَهْلِهِ، فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ)[١].

واتە : ئەگەر ئەمانەت ون کرا ئەوا چاوەڕێی ڕۆژی دوایی بن، گوتیان: مەبەستت لە ون کردن چیە ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟

---

(١) صحيح البخاري (١/ ١٤١) كتاب: العلم، باب: من سئل علمًا وهو مشغل في حديثه، برقم: (٥٩).

فەرموی: هەر كاتێك كاروبار كەوتە دەست كەسانێك كە شیاوی نەبن ئەوا چاوەڕێی ڕۆژی دوایی بە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕایگەیاندووە كە یەكێك لە نیشانەكانی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەیە كار بدرێتە دەست كەسی نا شایستە، ئەوەش كاتێك ڕوودەدات كە خەڵك نەزانەو بیروهۆشی لای خۆی نیە، هەر لەبەر ئەمەشە كە پێشەوا بوخاری فەرموودەی ئەبو هورەیرەی پێشتری هێنایەوە لە كیتابی (العلم) كە ئاماژەیەكە بۆ ئەمە.

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

موناسەبەی ئەم فەرمووده بە كیتابی العلم ئەوەیە كەوا كارخستنە دەستی كەسی نا شایستە لە كاتی بڵاوبوونەوەی نەزانی ڕوودەدات كە زانست نامێنێ و بەرز دەكرێتەوە، ئەوەش یەكێكە لە نیشانەكانی نزیكبونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی[1].

وە یەكێكی تر لە واتایەكانی ئەمانەت ئەوەیە كە كاروباری خەڵك لە دەوڵەت داری و سەركردایەتی خەڵك بە گشت جۆرەكانی بكەوێتە دەست كەسانێك كە شایستە نەبن بە كارەكەیانەوە یان توانای بەڕێوەبردنیان لاواز بێت و نەتوانن پارێزگاری لێ بكەن، ئەوەش دەكات بە فیڕۆدانی مافی خەڵك و بە سووك ڕوانینە بەرژەوەندیەكانیان كە دەبێتە مایەی ئاشوب نانەوە[2].

لەم ڕۆژگارەدا زۆربەی كەسەكان كە دەبن بە مامۆستای مزگەوت نەك شیاوی پێش نوێژی نین بەڵكو شیاوی مینبەری پێغەمبەری خواش نین، دەبنە موفتی بەسەر موسڵمانانەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِذَا اتُّخِذَ الفَيْءُ دُوَلاً، وَالأَمَانَةُ مَغْنَمًا..)[3].

---

(١) فتح الباري (١/ ١٤٣).

(٢) قبسات من هدي الرسول الأعظم، لا ٦٦.

(٣) ضعيف: سنن الترمذي (٨/ ٤١٤) باب: ما جاء في علامة حلول المسخ والخسف، برقم: (٢٣٧٢). وقال حديث غريب. وضعفها الألباني في ضعيف الترمذي (٣٨٦ ٣٨٧).

بەرگی دووەم

واتە: ئەگەر دەسکەوتی بێ شەڕ تایبەت کرا بە دەوڵەمەندەکان و دەستپاکی بووە.

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مِنِ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ خَصْلَةً .. وَأَضَاعُوا الأَمَانَةَ ..)[1].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر حەفتاو دوو تایبەتمەندە... ڕاسپێردراو ونکرا.

خوای گەورە لە قورئان دەفەرموێ: [إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾].

واتە: بە ڕاستی ئێمە سپاردەو (تکالیف)ەکانمان خستە سەر ئاسمانەکان و زەوی و کێوەکان، کەچی هیچیان لە خۆیان ڕانەدی لە هەڵگرتنیان و نکوڵیان کرد.



خاوەنی کتێبی (أضواء البيان) دەڵێت: ئەم (عرض)ە نمایشی سپاردەیە، وەرنەگرتنی ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان.. شتێکی ڕاستەو هەقیقەتی هەیە، هەرچەند ئێمەش چۆنیەتەکەی دەرك نەکەین، بەڵام ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان نەچونە ژێر ئەو بارەو ترسان کە نەتوانن هەڵسن بە جێبەجێکردنی داخوازییەکان، کەچی مرۆڤ هاتە پێشەوەو چووە ژێر بارو هەڵیگرت.

زانایان لەبارەی ڕانواندنی ئەمانەتەوە دوو ڕایان هەیە :

یەکەم دەڵێن: هەقیقەتەو خوای گەورە فام و ژیری لە ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان دروست کردووەو قسەی لەگەڵدا کردوون، بە بەڵگەی ئەوەی کە پێشەوا (ترمذی) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی:

---

(١) حلية الأولياء، لأبي نعيم (٣/ ٤١٠)، برقم: (٤٥٥٥). وهو ضعيف كما قال الحافظ العراقي (٢٩٧/٣).

(خودای گەورە فەرمووی بە ئادەم: من ئەمانەتم بەسەر ئاسمانەکان و زەویدا ڕانواند بۆ ئەوەی هەڵی بگرن، بەڵام نەیانتوانی، ئایا تۆ ئەو ئەمانەتە هەڵدەگریت بە هەرچیەکەوە کە تیایەتی؟ ئادەم گوتی: پەروەردگار جا چی تێدایە؟

خوای گەورە فەرموی: ئەگەر هەڵت گرت و پاراستت پاداشتت دەدرێتەوە، ئەگەر بە فیڕۆتدا سزا دەدرێیت، دەی شانی بدەرە بەرو بیگرە ئەستۆت بە هەرچیەکەوە کە تێیدایە).

**دووەم دەڵێن:** ئەوە هێمایە بۆ ئەوە ئەگەر زەوی و ئاسمانەکان خاوەن فام بن و ئەم ئەرکە بخەنە سەریان، بۆیان هەڵناگیرێت، لەبەر گەورەیی و گرانی ئەمانەت.

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (أَنَّ الأَمَانَةَ نَزَلَتْ فِي جَذْرِ قُلُوبِ الرِّجَالِ، ثُمَّ نَزَلَ الْقُرْآنُ، فَعَلِمُوا مِنَ الْقُرْآنِ ، وَعَلِمُوا مِنَ السُّنَّةِ، ثُمَّ حَدَّثَنَا عَنْ رَفْعِ الأَمَانَةِ فَقَالَ : يَنَامُ الرَّجُلُ النَّوْمَةَ فَتُقْبَضُ الأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ فَيَظَلُّ أَثَرُهَا مِثْلَ أَثَرِ الْوَكْتِ ، ثُمَّ يَنَامُ نَوْمَةً فَتُقْبَضُ الأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ ، فَيَظَلُّ أَثَرُهَا مِثْلَ أَثَرِ الْمَجْلِ كَجَمْرٍ دَحْرَجْتَهُ عَلَى رِجْلِكَ تَرَاهُ مُنْتَبِرًا وَلَيْسَ فِيهِ شَيْءٌ ، قَالَ : ثُمَّ أَخَذَ حَصًى فَدَحْرَجَهُ عَلَى رِجْلِهِ، قَالَ: فَيُصْبِحُ النَّاسُ يَتَبَايَعُونَ لاَ يَكَادُ أَحَدٌ يُؤَدِّي الأَمَانَةَ، حَتَّى يُقَالَ : إِنَّ فِي بَنِي فُلاَنٍ رَجُلاً أَمِينًا، حَتَّى يُقَالَ لِلرَّجُلِ : مَا أَجْلَدَهُ وَأَظْرَفَهُ وَأَعْقَلَهُ وَمَا فِي قَلْبِهِ حَبَّةٌ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ، وَلَقَدْ أَتَى عَلَيَّ زَمَانٌ، وَمَا أُبَالِي أَيَّكُمْ بَايَعْتُ، لَئِنْ كَانَ مُسْلِمًا لَيَرُدَّنَّهُ عَلَيَّ دِينُهُ، وَلَئِنْ كَانَ نَصْرَانِيًّا أَوْ يَهُودِيًّا لَيَرُدَّنَّهُ عَلَيَّ سَاعِيهِ، فَأَمَّا الْيَوْمَ فَمَا كُنْتُ لأُبَايِعَ مِنْكُمْ إِلاَّ فُلاَنًا ، وَفُلاَنًا)[١].

واتە: ئەمانەت پاراستن دابەزیە ناو دڵی پیاوانی بەهێزەوە، لەوێدا جێگیر بوو، قورئانیش دابەزی و ئاودێری کرد، سوننەتیش چاودێری کرد، تا خۆی گرت، پاشان دەربارەی ئەمانەت نەپاراستن دوا، پاشان کابرا دەخەوێت، ئەمینداریەتەکەی لە دڵی هەڵدەگیرێت و تەنها ئاسەوارێکی لێ دەمێنێت! بە ئەندازەی ئاسەواری

---

(١) صحيح مسلم، (١/ ١٢٦) باب: رفع الأمانة، برقم : (١٤٣).

پشکۆیەك کە بەسەر قاچتدا غلۆری کەیتەوە! کە لێرەو لەوێ خاڵ خاڵی دەکات و دەیکاتە تلۆقێکی دیار، کە سەرەنجامی کارکردن نەبوە! لەو کاتەشدا پێغەمبەر(ﷺ) بەردو چکەیەکی هەڵگرت و بەسەر قاچی پیرۆزی خۆی غلۆری کردەوە، خەڵکەکەش بە سەرسوڕمانەوە سۆراغیان دەکرد.. ئینجا فەرمووی: ئیدی وای لێ دێت کە ئەمینداریێتی و ئەمانەت نامێنێت تا دەگوترێت: لە فلان هۆز پیاوێکی دەستپاکی لێ یە، ئەمانەت دەپارێزێت! ئیدی خەڵکی مەدحی دەکەن و دەڵێن: چەند پیاوێکی بە ئارامە، پیاوچاکە، ژیرە، خاوەن هەڵوێستە! لە کاتێکدا کە مسقاڵە زەڕرەیەك باوەڕی لە دڵ و دەروندا نیە! ئینجا پێشەوا حوزەیفەی کوڕی یەمان (ﷺ) لەسەر قسەی خۆی بەردەوام دەبێت و دەڵێ: ئێی، زەمانێك بوو خەمم نەبوو بەیعەت بە کێ دەدەم، پێی ئاسایی بوو بەیعەت بە کێتان بدەم، چونکە دەمزانی ئەوی موسڵمان بوویێت و پەیمان و بەڵێنم لەگەڵیدا بەستبێت، ئەوە سەر ڕاستانە وەریگرتوەو لە ڕۆژی دواییدا شایەتیم بۆ دەدات، ئەوەی جولەکەو دیانیش بوبێت و دینەکەم پێ گەیاندبێت و وەری نەگرتبێت، یان پەیمان و بەڵێنێکم لەگەڵیدا هەبێت، ئەوە هەر لەژێر سایەی شەرعەکەدایەو والیەکان مافی خۆمیان لێ وەردەگرن.. کەچی ئێستا کەوتومەتە سەردەمێك لەناوتاندا، مەگەر بەیعەت تەنها بە فلان و فلان بدەم.

لەم فەرموودانەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەمانەت لە دڵەکان نامێنێت، تاکو پیاو دەبێتە خاوەن دڵێکی بەتاڵ لە ئەمانەت دوای ئەوەی کە ئەمین بوو، ئەوەش لەو کەسە ڕوو دەدات کە ترسی خوای گەورەی لە دڵدا نەماوەو باوەڕی بێهێز بووەو تێکەڵ بە خیانەتکاران بووە تاوەکو ئەوان بونەتە خائین لەبەر ئەوەی لە یەك نزیکن و چاولێك دەکەن.

بەڕاستی ئەمڕۆ بە دەگمەن کارمەندێك یان بەرپرسێك دەبینرێت بە شیاوێتی و شایەنیەتی خۆی لە جێگەی خۆی دابنرێت و بەدەست پاکی و بێ خیانەتی کاری خۆی ئەنجام بدات، بەڵکو زۆربەی کارمەندان و بەرپرسانی ئەمڕۆ بە چاوی پارووی قەڵەو سەیری کاروباری هاوڵاتیان دەکەن کە بە ئەمانەت خراوەتە ئەستۆیان، سەیریش لەوەدایە ئەو کەسانەی کاری خیانەت و دەست پیسیان لێ

ئاشکرا دەبێت، بەردەوام پلەو پایەیان زیاتر بەرز دەکرێتەوە، وە ئەوانەی کە دەست پاکن و ئامادە نین خیانەت لە ئەمانەت بکەن بە پیاو خراپ لە قەڵەم دەدرێن و لەکار لا دەدرێن، ئەمانەش هەمووی بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە دینداری و لە خواترسی لە ناو خەڵك و بەرپرساندا نەماوە بۆیە خیانەت کار دەکرێت بە دەست پاك و دەست پاکیش دەکرێت بە خیانەتکار.

کاتێك مرۆڤ ڕازی بوو بە هەڵگرتنی ئەمانەت، پەروەردگار لەناو قووڵایی دڵی مرۆڤدا ئەمانەتی دانا، تا بە دڵ حەزی پێ بکات و ببێتە سروشت و فیترەت بۆی.. بەڵام شەیتان بەردەوام ئادەم تووشی سەر قاڵی و هەواو ئارەزوو دەکات بۆ ئەوەی فێری خیانەت و دەست پیسی بکات، لە کاتێکدا کە مرۆڤ خەوی غەفڵەت دایدەگرێ و ئەمانەت لە دڵی هەڵدەگێڕێتەوەو شوێنەوارێکی کەم بەجێ دەهێڵێ.

خوای گەورە لەناو بەرەی ئادەمی نێرداوی تایبەتی ئەمینی هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی پەیامی هەق و ڕاستی خوایی بگەینن بە ئادەمیزاد و بەمەش مرۆڤ بیانووی نەمێنێ و لە پاشە ڕۆژدا نەڵێ: ئاگادار نەکراومەتەوە و کەسمان بۆ نەهاتووە.

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) فەتحی مەککەی کرد، کلیلی دەرگای کەعبەی لە (عوثمانی کوڕی طلحە) وەرگرت کە لە لای ئەو بوو، لەو کاتەدا کە (عوثمان) دەستی هێنا کلیلەکەی بداتێ، عەباسی کوڕی عبدالمطلب(ﷺ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا دایك و باوکم بە فیدات بێ، بەڵکو کلیلەکان دوایی بدەیت بە من و لەگەڵ ئەوەدا کە (سقایە)م لایە، واتە: (ئاودان بە حاجیان) ئەمەش لای من بێت، عوثمانی کوری طلحە(ﷺ) کە ئەوەی بیست خەریك بوو دەست بگێڕێتەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (عوثمان) کلیلەکانم بدەرێ، ئەویش دایەو گوتی: دەبگرە ئەمە ئەمانەتەکەی خوا.. پاشان پێغەمبەر(ﷺ) چووە ناو کەعبەوەو پاکی کردەوە، ئینجا کە هاتە دەرەوە تەوافی کردو کلیلەکانی دایەوە دەست (عوثمان) بۆیە تا ئێستاش ئەو کلیلە لای ئەو بنەماڵەیەیە کەس ناتوانێ بە زۆر لێیان بستێنێ.

بەرگی دووەم

بوارەکانی ئەمانەت پارێزی ئەمانەن:

هەریەکە لە ئەندامەکانی لەش ئەمانەتن، بۆیە دەبێت مافی هەریەکەیان بدرێت و لە کاری خێرو چاکەشدا بەکار بهێنرێت.. جا ئەگەر ئەو ئەندامانە بە پێچەوانەوە لە کاری نابەجێ و بێ فەرمانی خوادا بەکارهاتن، ئەوا خیانەتە لە ئەمانەت و خوای گەورش ئاگای لێیەتی و لێی دەپرسێتەوە لە ڕۆژی دوایی.

ئافرەتان ئەمانەتێکی خوایین لە لای پیاوان، پێغەمبەر(ﷺ) لە ووتاری ماڵئاوایی ئامۆژگاری پیاوانی کرد کە باش بن لەگەڵ هاوسەرەکانیانداو فەرمووی: لە خوا بترسن لە مەسەلەی ژنەکانتان ئێوە وەك ئەمانەتێك خواستوتانن.

پێغەمبەر(ﷺ) خیانەت کردنی بە یەکێك و لە نیشانەکانی دووڕوویی داناوە.

پێغەمبەر(ﷺ) قەدەغەی کردووە خیانەت بکرێ بەرامبەر کەسێك کە خیانەتی کردووە، پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ کۆچی کرد بۆ مەدینە پێشەوا عەلی(ﷺ) دانا لە جێگای خۆی، بۆ ئەوەی ئەو ڕاسپاردانەی لەلای بوون بیداتەوە بە خاوەنەکانیان، ئاشکراشە کە خەڵکی مەککە چی خراپ بوو کردیان بەرامبەر بە پێغەمبەرو(ﷺ) موسڵمانان، بەڵام ئەم ناپاکی و خراپانە وای لە پێغەمبەر(ﷺ) نەکرد دەست بگرێ بەسەر ئەو شتانەدا کە بە ئەمانەت لەلای دانرابوون..

کاربەدەستی ئەمانەتە، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بە پێشەوا ئەبو زەر دەڵێت: ئەی (ئەبو ذەر) تۆ لاوازیت، ئەمەش ئەمانەتە، لە ڕۆژی دواییدا سەر شۆڕی و پەشیمانیە، مەگەر کەسێك بە هەق وەریبگرێت و هەقی خۆیشی بداتێ بە چاکی، ڕۆژێکیان عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) بە هاوەڵەکانی فەرموو: هەر کەس ئاواتی چیە با بیڵێ، یەکێکیان گوتی: خۆزگە پر بەم ژوورە ئاڵتونم هەبوایەو لە ڕێی خوادا بمبەخشیایە، ئەوانی تریش هەریەکە و شتێکیان گوت: عومەریش گوتی: منیش ئاوەتە خوازم کە پر بەم ژوورە پیاوی وەك ئەبو عوبەیدەم(ﷺ) هەبوایەو کارم پێ بسپاردایە، پێشەوا عومەر(ﷺ) دەڵێت: هەر کەسێ ببێتە کار بەدەستی موسڵمانان و پاشان کەسێ دابمەزرێنێ لەبەر خۆشەویستی یان خزمایەتی، ئەوە خیانەتی لە خواو پێغەمبەر(ﷺ) کردووە.

## زەکات دەرکردن بە باج سەیر دەکرێ و بازرگانی پێدەکرێت

لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر خەڵکانێك کە زەکات دەدەن وا دەزانن باج دەدەن ئەوەندە لە دڵیاندا ناخۆشە.. بنچینە ئەوەیە ئەو کەسەی زەکات دەردەهێنێت بە ڕەزامەندی و دڵخۆشیەوە دەریبهێنێت چونکە پاککەرەوەیە بۆ ماڵ و نزیکبوونەوەیە لە خوا، نەك وەك باج و سزادان تەماشا بکرێت.

بەڵام لە کۆتایی بونەوەر تەماعکاری و ڕەزیلی بڵاودەبێتەوەو هەندێك لە دەوڵەمەندەکان هەست دەکەن زەکاتەکەیان وەکو باجێکە بەزۆر لێیان وەردەگیرێت، واتە: زەکاتەکەی بە ناچاری دەردەکات، بۆیە هیچ پاداشتێکی دەست ناکەوێت بەهۆی نەبوونی نیەتی پاك لە کارەکەی.

پێشەوا ئەبو هورێرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِذَا اتُّخِذَ الفَيْءُ دُوَلاً، وَالأَمَانَةُ مَغْنَمًا وَالزَّكَاةُ مَغْرَمًا..)[1].

واتە: ئەگەر دەسکەوتی بێ شەڕ تایبەت کرا بە دەوڵەمەندەکان و دەستپاکی بووە غەنیمەو زەکات بوە باج و غەرامە..

لە فەرموودەیەکی تر پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (يا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ خَمْسٌ إِذَا ابْتُلِيتُمْ بِهِنَّ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ تُدْرِكُوهُنَّ: .. وَلَمْ يَمْنَعُوا زَكَاةَ أَمْوَالِهِمْ، إِلَّا مُنِعُوا الْقَطْرَ مِنَ السَّمَاءِ، وَلَوْلَا الْبَهَائِمُ لَمْ يُمْطَرُوا.. )[2].

واتە : ئەی کۆمەڵی موهاجیرەکان پێنج بەڵا هەن ئەگەر دوو چاریان ببن پەنا بەخوا دەگرم لەوەی پێیان بگەن، یەکێك لەو پێنج بەڵایانە ئەگەر زەکاتی

---

(١) ضعيف: سنن الترمذي (٨/ ٤١٤) باب: ما جاء في علامة حلول المسخ والخسف، برقم: (٢٣٧٢). وقال حديث غريب. وضعفها الألباني في ضعيف الترمذي (٣٨٦ ٣٨٧).

(٢) صحيح: أخرجه الحاكم في (المستدرك) كتاب: الفتن والملاحم، باب: ذك خمس بلاء أعاذ النبي منها للمسلمين (٤/ ٥٤ ٥٤١) وصححه ووافقه الذهبي.

بەرگی دووەم

ماڵەکانیان نەدەن ئەوا بارانیان لە ئاسمانەوە لێ دەگیرێتەوەو لەبەر خاتری ئاژەڵیش نەبوایە هیچ نەدەباری..

کوا زەکاتی موسڵمانان؟! خەڵکانێکی هەژار هەن کەس پێیان نازانێت، ورگ دڕاوی دەوڵەمەندەکانە کە هەژاری دروست کردووە، بەو واتایەی ئەگەر دەوڵەمەندەکان زەکاتی ماڵی خۆیان دەربکەن و ببیەخشن بە هەژاران ئەوا هەژار لە وڵاتانی ئیسلامیدا نەدەما ئەم پارووە لە زەکاتی ماڵی ئەمەدایە.

زەکات نەدان خوای گەورە توڕە دەکات فریشتەکان نیگەران دەبن و ڕەحمەتی خوا دانابەزێت، کەواتە خوای گەورە باران بارینی بەستۆتەوە بە دەرکردنی زەکاتی ماڵەوە، واتە: کاتێك زەکاتی ماڵەکەم دەدەم ئەو ماڵە گەشە دەکات وەك چۆن کاتێك باران باری زەوی گەشە دەکات و دەبوژێتەوە.

پێشەوا عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ﷺ) دەڵێت: (إن من أعلام الساعة وأشراطها .. إذا استحلت هذه الأمة.. واتجروا بالزكاة)[1].

لەم فەرموودەیە زۆر بە ڕاشکاوانە بۆمان بە دەردەکەوێت کە لە پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت زەکات بازرگانی پێدەکرێت.. یان زەکات دەدات بە یەکێك لە بەرامبەر ئەوەی کە زەکاتی داوە داوای شتی لێدەکات.. یان بە پارەی زەکات کڕین و فرۆشتن ئەنجام دەدا، لە کاتی گرتنەوەی زەکاتدا خوای گەورە وشکە ساڵی دەنێرێت و بارات نابارێت، ئەگەر دوعا کردن نەبێت ڕزقیان ناداتێ، کوا زەکاتی موسڵمانان؟! خەڵکانێکی هەژار هەن کەس پێیان نازانێت، ورگ دڕاوی دەوڵەمەندەکانە کە هەژاریی دروست کردووە، بەو مانایەی ئەگەر دەوڵەمەندەکان زەکاتی ماڵی خۆیان دەربکەن و ببیەخشن بە هەژاران ئەوا هەژار لە وڵاتانی ئیسلامی نەدەما ئەم پارووە لە زەکاتی ماڵی ئەمەدایە.

بۆیە زەکات نەدان دەبێتە هۆی توڕەکردنی خودای گەورەو فریشتەکان نیگەران دەکات و ڕەحمەتی خوای گەورە بەسەرمانەوە قەدەغە دەبێت..

---

(١) كنز العمال في سنن الأقوال والأفعال، برقم: (٣٨٤٩٥).

بەرگی دووەم

# فێربوونی زانستی شەرعی بۆ دونیا

یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر ئەوەیە کە خەڵکانێك زانست فێر دەبن بۆ ئەوەی ناوبانگ بە دەست بهێنن و پارەی پێ کۆبکەنەوە...

لە بنچینەدا پێویستە مرۆڤ فێربوونی زانستی شەرعی و بڵاوکردنەوە و فێرکردنی بە خوا پەرستن بزانێت.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِنَّ اللَّهَ وَمَلاَئِكَتَهُ وَأَهْلَ السَّمَوَاتِ وَالأَرَضِينَ حَتَّى النَّمْلَةَ فِي جُحْرِهَا وَحَتَّى الحُوتَ لَيُصَلُّونَ عَلَى مُعَلِّمِ النَّاسِ الخَيْرَ)[1].

واتە: خوای گەورەو فریشتەکان و خەڵکی ئاسمانەکان، تەنانەت مێرووله لە کونی خۆیداو ماسی لە دەریادا، داوای لێخۆشبوون دەکەن بۆ ئەو کەسەی چاکە فێری خەڵکی دەکات.

وە پێش هاتنی کۆتایی بونەوەر خەڵکانێك پەیدا دەبن خەریکی فێربوونی قورئان و فەرموودەو شەرع دەبن بەڵام مەبەستیان خوا نیە، بەڵکو بۆ خۆدەرخستن و بەناوبانگ بوون و شتی لەو شێوەیە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِذَا اتُّخِذَ الفَيْءُ دُوَلاً .. وَتُعُلِّمَ لِغَيْرِ الدِّينِ..)[2].

واتە: ئەگەر دەستکەوتەکان تایبەت کران بە دەوڵەمەندەکانەوەو خەڵکی فێری زانست بوون بە مەبەستی تر جگە لە ئایین..

---

(١) سنن الترمذي (٤/ ٣٤٧) باب: ما جاء في فضل الفقه، برقم: (٢٦٨٥). وهذا حديث صحيح.

(٢) ضعيف: سنن الترمذي (٨/ ٤١٤) باب: ما جاء في علامة حلول المسخ والخسف، برقم: (٢٣٧٢). وقال حديث غريب. وضعفها الألباني في ضعيف الترمذي،(٣٨٦ ٣٨٧).

بەرگی دووەم

# خراپەکردن بەرامبەر بە دایک و باوک

یەکێ لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی ئازاردانی دایك و باوکە، وای لێدێت منداڵ دڵی دایك و باوکی خۆی دەشکێنێت و ئازاریان دەدات

ئازاردانی دایك و باوکیش یەکێکە لە گوناهە گەورەکان کە خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزو پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرمایشتە پیرۆزەکانی باسی کردووە.

پێش هەموو شتێك پێویستە ئەو ڕاستیە بزانین کە دایك و باوك هۆکاری بوونی منداڵن، ڕاستە خوای گەورە بەدیهێنەری مرۆڤە بەڵام خەڵقکردنی مرۆڤ و هەموو شتێك تەنها هی خوایەو جگە لە خوای گەورە دەسەڵاتی دروستکردنی باڵە مێشولەیەك و بچوکتریشی نیە، بەڵام خوای گەورە سەبەبیشی داناوە بۆ پەیدابوونی ئەو منداڵە، دایك و باوك سەبەبن بۆ دروست بوونی منداڵ، کەوابوو: ئەگەر دایك و باوکمان نەبونایە خوای گەورە ئێمەشی بەدینەدەهێنا.

شتێکی زانراوە لای هەموو کەس کە یەك قەترە ئاو لە پشتی پیاو دێتە دەرەوەو دەچێتە ناو ڕەحمی دایك، ئینجا لەوێدا ئەو منداڵە پەروەردە دەبێ و گەورە دەبێ، تا دێتە سەر زەوی، کەوابێ منداڵ پارچەیەکە لە دایك و باوك، بۆیە زۆر پێویستە ئێمە قەدرو ڕێزی دایك و باوکمان بزانین، منداڵ بە ماڵی دایك و باوکی گەورە دەبێ، چۆن مۆمێك خۆی دەتوێنێتەوە بۆ ئەوەی دەوروبەرەکەی ڕووناك بکاتەوە، دایك و باوکیش ژیان و گەنجێتی و ئیسراحەتی خۆیان دەتوێننەوە بۆ ئەوەی ئەو منداڵە گەورە ببێ، واتە: خۆیان ڕێگای مردن دەگرن بۆ خاتری ژیانی منداڵەکانیان.. نابینی باوك حەرام حەڵاڵ دەکاو حەڵاڵ حەڕام دەکا، سەرماو گەرمای ساڵ بەخەسار ناداو ئەم شارو ئەو شار دەکاو زۆر جار خوای گەورە لەخۆی تورە دەکا لەبەر خاتری ئەوەی پارەی باشتر پەیدا بکاو ژیانێکی خۆشتر بۆ منداڵەکانی دابین بکا! لەولاشەوە دایك خوێنی خۆی، ژیانی خۆی، ئیسراحەتی خۆی، هەمووی بە منداڵەکەی دەبەخشێ .

بەڵێ.. دایك و باوك ئێمەیان ئاوا گەورە کردووە، ئێمە هەروا بە ئاسانی پێ نەگەیشتووین و گەورە نەبووین، بەڵکو بوونی ئێمە واتە: توانەوەی دایك و باوك، بەڵام بەخوا مرۆڤ هەتا خۆی منداڵی خۆی نەبینێ هەرگیز وەکو پێویست نازانێ دایك و باوکی چیان بۆ کردووەو چۆن خوێنیان بووە بە ئاو لە پێناو گەورەکردنی ئەودا، خۆت جەرگی خۆت ببینە بزانە سۆزو ڕەحمی تۆ چۆنە بەرامبەر منداڵەکەت، دڵنیابە کە سۆزو خۆشەویستی ئەوان لە منداڵیدا بۆ تۆ زۆر لەوە زیاتر بووە!

بۆیە پێش هاتنی کۆتایی بونەوەر پیاو لەگەڵ دایکیدا ڕەفتاری ناشیرین دەبێت و هاوسەرەکەی خۆی نزیك بکاتەوەو گوێڕایەڵی بکات لە خراپەکردن لەگەڵ دایکی، یان زۆر جار لەگەڵ باوکی، ئەمەش لەم ڕۆژگارە بە ئاشکرا دیارە، دەبینی دایك بە تەنها لە ماڵێکدا ژیان بەسەر دەبات و کوڕوکچەکانی زۆر بەکەمی سەردانی دەکەن، هاو کات هاوسەرو منداڵەکان لەخۆشگوزەرانی و گەشت و گوزارکردندان.. یان ئەگەر دایك و باوك لەگەڵ منداڵەکاندا نیشتەجێ بن، گرنگی و بایەخیان پێ نادرێت وەکو پێویست..

پێشەوا ئەبو هورێرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (إِذَا اتُّخِذَ الفَيْءُ دُوَلاً .. وَعَقَّ أُمَّهُ)[١]. واتە: ئەگەر دەستکەوتەکان تایبەت کران بە دەوڵەمەندەکانەوەو پیاو خراپەی لەگەڵ دایکی کرد..

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ( لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى.. تخزن ذوات الأولاد)[٢]. واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت.. هەتا ئەوانەی خاوەنی منداڵن زۆر دڵتەنگ دەبن.. هەمووی بەهۆی ئازاردانیانەوە..

هەر چەندە زانایانی فەرمودە ناس دەفەرموون: ئەم فەرموودە بێ هێزە.. بەڵام لە واتادا زۆر واقیعیە، چونکە مرۆڤەکان تەمەنیان زۆر زۆر کەمە لەم سەردەمەدا.

---

(١) ضعيف: سنن الترمذي (٨/ ٤١٤) باب: ما جاء في علامة حلول المسخ والخسف، برقم: (٢٣٧٢). وقال حديث غريب. وضعفها الألباني في ضعيف الترمذي (٣٨٦ ٣٨٧).

(٢) ضعيف: خرجه ابن عساكر في تاريخ دمشق (٤٥٣/٧) قال الألباني في السلسلة الضعيفة:ضعيف.

# پیاو گوێڕایەڵی ژنی دەبێت لە ترسان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر پیاو لەگەڵ دایکیدا ڕەفتاری ناشیرین دەبێت و هاوسەرەکەی لە خۆی نزیك دەکاتەوەو گوێڕایەڵی دەکات لە ترسان.. لەم ڕۆژگارە بە ئاشکرا دیارە، دەبینی دایك بە تەنها لە ماڵێکدا ژیان بەسەر دەبات و کوڕو کچەکانی زۆر بەکەمی سەردانی دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا هاوسەرو منداڵەکان لە خۆشگوزەرانیدان...

یان ئەگەر دایك و باوك لەگەڵ منداڵەکاندا نیشتەجێ بن، گرنگی و بایەخیان پێ نادرێت وەکو پێویست..

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (إِذَا اتُّخِذَ الفَيْءُ دُوَلاً .. وَأَطَاعَ الرَّجُلُ زَوْجَتَهُ، وَعَقَّ أُمَّهُ..)[1].

واتە: ئەگەر دەستکەوتەکان تایبەت کران بە دەوڵەمەندەکانەوەو پیاو گوێڕایەڵی هاوسەرەکەی کردو خراپەی لەگەڵ دایکی کرد..

ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) وەکو موعجیزەیەکی ڕۆژی ڕووناك هاتە دی، کە ڕۆژانە چەندین ئافرەت لە پیاو دەدەن بە پێی داتاکانی مافی پیاوان، وە گەورەترین موسیبەت و نەهامەتی دونیا لە ترسان ڕێزی خێزانت بگری.

هەمیشە ڕێزی خێزانت بگرە، بەڵام شورەییە بۆ پیاو لێی بترسێت، با هیچی تر لەسەر شتە سادەکان یەکتر زویر نەکرێن، با ئەمڕۆ ماڵ پەرت و بڵاوبێت گرنگ ئەوەیە ژیانێکی پڕ لە بەختەوەری هەبێ بەبێ ترس.

خوای گەورە بەرەکەت و خۆشەویستی و بەختەوەری بڕژێنێتە سەر ماڵ و ژیانی گشت موسڵمانان.

---

(١) ضعيف: سنن الترمذي (٨/ ٤١٤) باب: ما جاء في علامة حلول المسخ والخسف، برقم: (٢٣٧٢). وقال حديث غريب. وضعفها الألباني في ضعيف الترمذي (٣٨٦ ٣٨٧).

# خۆ نزیککردنەوە لە هاوڕێ!

لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر، دانیشتن و ڕووخۆشی و گەشاوە بە ڕووی هاوڕێ و بایەخ نەدان بە دایك و باوك.

لەوانەشە زیاتر دڵخۆشبوونی لاوەکان بە دانیشتن لەگەڵ هاوڕێکانیان زیاتر لە باوك و دایکیان بەهۆی بەساڵاچوونی باوکەکانیشیان بێت، یان زۆر جار بە هەڵسانیان بە سەرزەنشت کردن و ڕەخنە لێگرتنیان، بەڵام وێڕای ئەوەش پێویستە منداڵ مافی دایك و باوکیان بزانن.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (إِذَا اتُّخِذَ الفَيْءُ دُوَلاً.. وَأَطَاعَ الرَّجُلُ زَوْجَتَهُ، وَعَقَّ أُمَّهُ وَبَرَّ صَدِيقَهُ، وَجَفَا أَبَاهُ..)[١].

واتە: ئەگەر دەست کەوتەکان تایبەت کران بە دەوڵەمەندەکانەوەو پیاو گوێڕایەڵی هاوسەرەکەی کردو خراپەی لەگەڵ دایکی کردو هاوڕێکانی نزیککردەوە..

لەم فەرموودەیە ئەوەمان بۆ بەدەردەکەوێت کە ئەوەندە نزیکبوونەوە لە هاوڕێکانت بە یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر هەژمار دەکرێت..

ئەگەر هاوڕێکەت بینی باسی چاکەکانی دەکردی لە دوای تۆ، ئەوا هەرگیز نەکەیت پشتی تێ بکەیت، چونکە ئەمانە جوانترین و باشترین هاوڕێی سەر زەوین.

بزانە هاوڕێیەتی کێ دەکەیت و لەگەڵ کێ ڕێگات گرتوە، بزانە ئەو هاوڕێیەی هەتە بۆ بەهەشت بانگ دەکات یان بۆ دۆزەخ!

لات سەیر نەبێت کە وا دەڵێم، چونکە مرۆڤ لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی، جا بۆ ئەوەی لە ڕۆژی دوایی شەرمەزار نەبین با هەمیشە هاوڕێی باش هەڵبژێرین.

---

(١) ضعيف: سنن الترمذي (٨/ ٤١٤) باب: ما جاء في علامة حلول المسخ والخسف، برقم: (٢٣٧٢). وقال حديث غريب. وضعفها الألباني في ضعيف الترمذي (٣٨٦ ٣٨٧).

## نەزۆکەکان دڵخۆشترینی خەڵکی دەبن

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوانەی کە نەزۆکن یان خوای گەورە منداڵی پێ نەبەخشیون زۆر دڵخۆش دەبن

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: ( لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى.. تفرح العواقر)[١].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت.. هەتا نەزۆکەکان دڵخۆش دەبن..

هەر چەندە زانایانی فەرمووده ناس دەفەرموون: ئەم فەرمووده بێ هێزە.. بەڵام لە واتادا زۆر واقیعیە، چونکە ئەوانەی کە خاوەنی منداڵ نین زۆر دڵخۆشترن لەوانەی کە منداڵیان هەیە.

بەداخەوە.. لەگەڵ پەیدابوونی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەشێکی زۆری مرۆڤەکان خەریکن نارەحەتی و خەم و دڵتەنگی منداڵەکانیان بکەنە پۆستێك و بێزاری خۆیان و سکاڵایان بۆ خەڵکی باس بکەن و بڵاویکەنەوە.

هەر چەندە نەزۆك، بەڵام بیرت بێت کەلەناو دڵی هەر زەحمەتێك ڕەحمەتێك هەیە بۆیە هەمیشە گەشبین بە!

بە جۆرێك بە!

ئەوەی کە دەتبینێت ئاواتە خواز بێت وەکو تۆ بێ!

ئەوەی دەتناسێ دۆعای خێرت بۆ بکات!

وە ئەوەی لە بارەی تۆوە دەبیستێ ئاواتەخواز بێ بتبینێ!

---

(١) ضعيف: أخرجه ابن عساكر في تاريخ دمشق (٤٥٣/٧) قال الألباني في السلسلة الضعيفة: ضعيف.

## بارانێک ڕەشماڵەکان بەرگەی ناگرن

نیشانەیەکی تر لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی کردووە، بریتیە لە باران بارینێك کە ماڵە قوڕەکان بەرگەی ناگرن، بەڵکو ئەو دەوەرانە بەرگەی دەگرن لە مووی وشتر دروست کراون.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُمْطِرَ السَّمَاءُ مَطَرًا لَا يَكُنُّ مِنْهُ بُيُوتُ الْمَدَرِ، وَلَا يَكُنُّ مِنْهُ إِلَّا بُيُوتُ الشَّعَرِ)[1].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت تاکو بارانێك نەبارێت، ماڵە قوڕەکان بەرگەی ناگرن، بەڵکو تەنها ئەو ڕەشماڵانەی لە موو دروست کراون بەرگەی دەگرن.

باران ئاوی شلەیە لەسەر شێوەی تنۆك، کە لە هەورەکانەوە دەکەونە سەر زەوی و کێشەکەشیان ئەمەندە قورسە کە هێزی ڕاکێشانی زەوی بتوانێت کاریان تێبکات و بەرەو خۆی ڕایانبکێشێت.

وە ڕای بەندە وایە کە ئەم فەرموودەیە مەبەست پێی لافاوێکی بەهێزە، کە یەکێکە لە دیاردەو ڕووداوە سروشتیەکان، وە دروستبوونی لافاو دەگەڕێتەوە بۆ چەند خاڵێك، لەوانە:

- تۆبۆگرافیای ناوچەکە.
- کەمی ڕووبەرە سەوزاییەکان.
- بەرتەسك بوونەوەی ڕێڕەوە ئاوییەکان.

---

(١) صحيح: رواه الإمام أحمد في (مسنده) (٢/ ٢٦٢)، وقال الهيثمي في المجمع (٧/ ٣٣١) ورجاله رجال الصحيح، وصححه الشيخ أحمد شاكر في تعليقيه على المسند (١٣/ ٢٩١) وصحيح ابن حبان (١٧/ ١٧٣) برقم: (٦٧٧٠).

## دوورخستنەوەی باوک و حەزنەکردن بە بینینی

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر منداڵ حەز بە بینین و دانیشتن و ڕووخۆشی باوکی ناکات.. تەنانەت بایەخشی پێ نادات..

ئەمەش بەهۆی بەساڵاچوونی باوکەکانیان بێت، یان زۆر جار بە هەڵسان و سەرزەنشت کردن و ڕەخنە لێگرتنیان بێت، بەڵام وێڕای ئەوەش پێویستە منداڵ مافی باوکی بزانێت..

پێشەوا ئەبو هوریرە (ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِذَا اتُّخِذَ الفَيْءُ دُوَلاً .. وَأَطَاعَ الرَّجُلُ زَوْجَتَهُ، وَعَقَّ أُمَّهُ وَبَرَّ صَدِيقَهُ، وَجَفَا أَبَاهُ..)[1].

واتە: ئەگەر دەستکەوتەکان تایبەت کران بە دەوڵەمەندەکانەوەو پیاو گوێڕایەڵی هاوسەرەکەی کردو خراپەی لەگەڵ دایکی کردو هاوەڵی نزیککردەوەو باوکی دوورخستەوەو مامەڵەی بە وشکی لەگەڵ کرد..

مرۆڤی وا هەیە کە قسەیەك بەرامبەر بە باوکی دەکات یان لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵی وشکە بەبێ ئەوەی بیری لێ بکاتەوە لای خوای گەورە تاوانەکەی ئەوەندە گەورەیە نزیکە خودا بیخاتە ئاگرێك بە ئەندازەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بێت.

ئاگاداری باوکتان بن.. هەتا نەمرن قەدریان نازانن، کە مردن ئەو کات دەرگایەك لە دەرگاکانی بەهەشت بەسەرتدا دادەخرێت، وە هیچ شتێك هێندەی ڕەق بوون لەگەڵ باوك مرۆڤ بێ ڕێز ناکات.

حەڵاڵ و ڕەوا نییە بۆ هیچ منداڵێك کە بە وشکی و ڕقەوە مامەڵە لەگەڵ باوکیدا بکات.

---

(١) ضعيف: سنن الترمذي (٨/ ٤١٤) باب: ما جاء في علامة حلول المسخ والخسف، برقم: (٢٣٧٢). وقال حديث غريب. وضعفها الألباني في ضعيف الترمذي (٣٨٦ ٣٨٧).

## دەنگ بەرزکردنەوە لە مزگەوتەکان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر، دەنگ بەرزکردنەوەیە لەناو مزگەوتەکان.

لە بنچینەدا مزگەوتەکان پێویستە هێمنی و ئارامی باڵیان بەسەردا بکێشیت، جا یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر دەنگ بەرزکردنەوەو مشتومڕکردنە لە مزگەوتەکان.. یان سواڵ کارەکان داوای پارە دەکەن و ڕیزی مزگەوت ناگرن..

پێشەوا ئەبو هوریرە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (إِذَا اتُّخِذَ الفَيْءُ دُوَلاً .. وَارْتَفَعَتِ الأَصْوَاتُ فِي الْمَسَاجِدِ..)[1].

واتە: ئەگەر دەستکەوتەکان تایبەت کران بە دەوڵەمەندەکانەوەو.. وە دەنگ بەرز کرا لە مزگەوتەکاندا..

ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) چەند واتایەك لە خۆی دەگرێت، لەوانە:

- واتای میکریفۆنی مزگەوت دێت.
- یان دەنگ بەرزکردنەوەی ئەوانەی هەژارن و داوای یارمەتی لە خەڵکی دەکەن.
- یان کەسێك شتێکی ون کردبێت و هاوار لە مزگەوت دەکات.
- یان هاوارکردنە بەبێ هۆکار وەکو سەردەمی نەزانین.
- هۆکاری سەر لێشێواوی و لاڕێ بوون بریتییە: لە دەنگ بەرزکردنەوە لە مزگەوتەکاندا.

---

(١) ضعيف: سنن الترمذي (٨/ ٤١٤) باب: ما جاء في علامة حلول المسخ والخسف، برقم: (٢٣٧٢). وقال حديث غريب. وضعفها الألباني في ضعيف الترمذي (٣٨٦ ٣٨٧).

## دووڕووەکان دەبنە سەرگەورە بەسەر هۆزەکانیانەوە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر خراپەکاران دەبنە سەر گەورەی خەڵکی..

لە ڕاستیدا خۆی پێویستە کەسی چاك و زاناو دانا لێپرسراوێتی بگرێتە دەست، بەڵام ڕۆژگارێك دادێ پیاو خراپ دەبێتە سەر گەورەی هۆزو کۆمەڵەکەی، یان بەهۆی دەوڵەمەندی و پەیوەندییەکانیەوە، یان بەهۆی ڕووداری و بێ شەرمیەوە، لەوانەشە بە هۆی ڕەچەڵەك و ناوداری خانەوادەکەی بێت.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِذَا اتُّخِذَ الفَيْءُ دُوَلاً .. وَكَانَ زَعِيمُ القَوْمِ أَرْذَلَهُمْ..)[1] . واتە: ئەگەر دەستکەوتەکان تایبەت کران بە دەوڵەمەندەکانەوەو سەرگەورەیی خراپەکاران بەسەر هۆزەکانەوە..

بۆیە خراپەکاران دەبنە سەر گەورەی کەسێك ئیتر ئایا لە گەشتێکدا بن، یان کۆبووبێتنەوە لە کارو کێشەیەکدا، ئەو سەر گەورەیە چاکترین و داناترینیان نابێت، بەڵکو کەسێکی ناسەنگین و بێ بایەخ دەبێت، ئەوەیش بەهۆی خراپبوونی خودی دونیا، یان زاڵبوونی ئەو جۆرە کەسانە.

لە فەرموودەیەکی تر دەفەرموێ: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَسْوَدَّ كُلُّ قَبِيلَةٍ مُنَافِقِيهَا)[2]. واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت تاکو دووڕووەکان نەبنە سەر گەورەی هەموو هۆزێك.

(المنافقون) واتە: باوەڕ لاوازەکان، کە ترسی خوایان کەمەو زۆر درۆ دەکەن و زۆر نەفامن.

---

(١) ضعيف: سنن الترمذي (٨/ ٤١٤) باب: ما جاء في علامة حلول المسخ والخسف، برقم: (٢٣٧٢). وقال حديث غريب. وضعفها الألباني في ضعيف الترمذي (٣٨٦ ٣٨٧).

(٢) مسند البزار (٤/ ٢٦٥) برقم: (١٤٣٤) .

## ڕێزگرتن لە پیاو لەبەر مەترسی خراپەی

یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر ڕێزگرتنە لە بەرامبەرەکەت نەك لەبەر ئەوەی خۆی بەڕێزە.. بەڵکو ترس و بیمی بۆ دروست نەکات و خراپە لەبەرامبەرت ئەنجام نەدات..

ئەوەش بەبۆنەی زاڵبوونی خەڵکانی خراپ و دەرکەوتنیان، تاکو خەڵکی ناچار دەبن ڕێزیان لێ بگرن و پێشیان بخەن، لەوانەشە شان و سەریشی ماچ بکرێت بە مەبەستی سەلامەتی لە خراپەو ئازاری، یان بەهۆی دەستدرێژی و ستەمی.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِذَا اتُّخِذَ الفَيْءُ دُوَلاً .. وَأُكْرِمَ الرَّجُلُ مَخَافَةَ شَرِّهِ..)[١].

واتە: ئەگەر دەستکەوتەکان تایبەت کران بە دەوڵەمەندەکانەوەو وە پیاو ڕێزی لێ گیرا بەهۆی مەترسی خراپیەکەی..

ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەکو موعجیزەیەکی ڕۆژی ڕووناك بە چاوەکانی خۆمان دەبینین.

وە بۆ ئەوەی لەبەر مەترسی خراپەی خراپەکاران دەربازبین پێویستیمان بە چەند خاڵێکە، لەوانە:

- هەوڵ بدەیت سەرپێچی خوای گەورە نەکەیت.
- هەمیشە ئاسودەبیت کە خودای گەورە پارێزراوت دەکات.
- قسە لە شتێك نەکەیت کە زانستت پێی نییە.
- بەدەست هێنانی ئیخلاصی و دڵسۆزی.

---

(١) ضعيف: سنن الترمذي (٨/ ٤١٤) باب: ما جاء في علامة حلول المسخ والخسف، برقم: (٢٣٧٢). وقال حديث غريب. وضعفها الألباني في ضعيف الترمذي (٣٨٦ ٣٨٧).

## داوێنپیسی لەناو کەسە بە تەمەنەکان سەرهەڵدەدات

لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی مرۆڤی بە تەمەن پەنا بۆ زیناکردن و داوێنپیسی و دەبەن..

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەڵێت: (إِذَا كَانَتِ الْفَاحِشَةُ فِي كِبَارِكُمْ..)[1].

واتە: ئەگەر داوێنپیسی لە نێوان بە تەمەنەکان سەری هەڵدا..

بەداخەوە.. ڕێژمان هەیە بۆ کەسە بە تەمەنەکان، بەڵام زۆربەیان بە دوای کاری قێزەون و ئافرەتن.. وە زینا لەگەڵ خەڵکی دەکەن.. هەندێ جار کار گەیشتۆتە نێربازی.

هیچ کەسێك نییە تووشی داوێنپیسی هاتبێت تەنهاو تەنها لەبەر نوقسانیە لە: تەوحیدو ئیمانەکەی، وە ئیمانی هیچ کەسێك تەواو نابێت هەتاوەکو خۆی لە هەواو هەوەس و داوێنپیسی نەپارێزێت.

بەڕای بەندە حەوت کردەوە هەن کە مرۆڤ دوور دەخەنەوە لە داوێنپیسی:

- شەو نوێژکردن.
- زۆر داوای لێخۆشبوون کردن.
- یادکردنەوەی خوای گەورە.
- بەردەوام بەخشین لە پێناوی خوای گەورە.
- لەبەرکردنی یەك ئایەتی قورئان ڕۆژانە.
- ئەنجامدانی نوێژە سوننەتەکان.
- هاوڕێیەتی کردنی چاکەکاران.

---

(١) صحيح: أخرجه ابن ماجه، برقم: (٤٠١٥) وإسناده صحيح رجاله ثقات.

## سەرهەڵدانی بایەکی سوورو سووربوونی ئاسمان

یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر سەرهەڵدانی بایەکی سوورە کە بە شێکی وڵاتان دەگرێتەوە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِذَا اتُّخِذَ الفَيْءُ دُوَلاً .. فَلْيَرْتَقِبُوا عِنْدَ ذَلِكَ رِيحًا حَمْرَاءَ، وَزَلْزَلَةً وَخَسْفًا وَمَسْخًا وَقَذْفًا..)[1].

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆمان بە دەردەکەوێت کە ئەم نیشانەیە چەند جارێك سەریان هەڵداوە، وە بەردەوامیش سەرهەڵدەدەن..

بە نموونە لە ساڵی ٢٣٢ کۆچی لەسەردەمی خیلافەی متەوەکیل لەسەردەمی عەبباسی بایەك سەری هەڵدا لە خاکی عێراق، بایەکی توندی ژەهراوی کە هاوشێوەی نەبووە لە پێشتردا، تەنانەت کشتوکاڵێکی زۆری سوتاند لە کوفەو بەسرەو بەغداد..

نزیکەی (٥٠) ڕۆژ درێژەی کێشا تەنانەت گەیشتە (هەمەذان و موصل و سنجار) مەڕو ماڵات و کێڵگەکانیان سوتا، وە قەدەغەی هاتووچۆ کرا لە بازارەکان[2].

لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: (لا تقوم الساعة حتى تبعث ريح حمراء من قبل اليمن)[3].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا بایەکی سوور هەڵدەکات لەلای یەمەنەوە..

---

(١) ضعيف: سنن الترمذي (٨/ ٤١٤) باب: ما جاء في علامة حلول المسخ والخسف، برقم: (٢٣٧٢). وقال حديث غريب. وضعفها الألباني في ضعيف الترمذي (٣٨٦ ٣٨٧).

(٢) أشراط الساعة، ماهر أحمد الصوفي، لا ١٢٢ .

(٣) صحيح ابن حبان برقم: (٦٨٥٣) رجاله ثقات رجال الصحيح، غير عبد الغفار بن عبد الله، ذكره ابن حبان في الثقات.

# زۆربوونی نەیزەک

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر زۆربوون و پەیدابوونی نەیزەکە بە ئاسمانی دونیاو کەوتنە خوارەوەی لە زەوی.. لە ساڵانی پێشوو دابەزینی نەیزەك شتێکی ئاسایی بوو چونکە زۆر بە کەمی دادەبەزی بەڵام لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی نەیزەکێکی زۆر دادەبەزێت..

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (ﷺ) دەڵێت: (لا تقوم الساعة حتى ترضخ رؤوس أقوام بكواكب من السماء باستحلالهم عمل قوم لوط)[١].

شێخ محەممەد بەرزنجی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

- لە ساڵی (٥٩٣)ی کۆچی نەیزەکێکی گەورە هاتە ئاسمان و دەنگێکی زۆری بە دوای خۆیدا هێنا، هەتا خەڵکی هاواریان بۆ خوای گەورە هێنا کە ڕزگاریان بکات، ئەوەندە لە خوای گەورە پاڕانەوە وایانزانی هاتنی ڕۆژی دوایی دەستی پێکردووە..

- لە ساڵی (٣٢٣)ی کۆچی ئەستێرەیەك تەقیەوە بە هۆیەوە نەیزەکێکی زۆر ڕوویان لە زەوی کرد هەتا خەڵکێکی زۆری پێ کوژرا[٢]..

هەزاران ساڵە خەڵکی وا ڕاهاتووە سەیری داچۆڕانی ئەستێرەکان «پرژە ئاگر» بکات و پرسیار لەسەرچاوەکەشی بکات، خەڵکی کۆن بڕوایان وابوە پرژە ئاگر لە جیهانێکی ترەوە دێت، بەڵام ئێستا دەرکەوتووە ئەوانە ئەستێرە نین بەڵکو پرژە ئاگر «نیازك»ن کە بریتیە لە تەنێکی ڕەقی بچوك و بە ئاسماندا دەگەڕێت وەکو چۆن بە کەشی زەویدا دەگەڕێن، کاتێك پرژە ئاگر دەگاتە کەشی

---

(١) رواه الديلمي، اتحاف الجماعة برقم: (٢٢٤٦).

(٢) الإشاعة لأشراط الساعة (لا ١٠١).

زەوی ئێمە دەتوانین بەچاو بیبینین، چونکە کلکێکی گڕدار لە شوێن خۆی بەجیَ دەهێڵێ لە ئەنجامی لێك خشاندنێك لە نێوان ئەو و هەوادا گەرمایەك دروست دەبێت، ئەوەی جێی سەرسوڕمانە زۆربەی پرژە ئاگرەکان هێندەی سەری دەمبوسێك گەورەن، هەشیانە چەند تەنێك دەبێت.

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (.. النُّجُومُ أَمَنَةٌ لِلسَّمَاءِ، فَإِذَا ذَهَبَتِ النُّجُومُ أَتَى السَّمَاءَ مَا تُوعَدُ، وَأَنَا أَمَنَةٌ لِأَصْحَابِي، فَإِذَا ذَهَبْتُ أَتَى أَصْحَابِي مَا يُوعَدُونَ، وَأَصْحَابِي أَمَنَةٌ لِأُمَّتِي، فَإِذَا ذَهَبَ أَصْحَابِي أَتَى أُمَّتِي مَا يُوعَدُونَ)[١].

واتە: ئەستێرەکان پارێزەری ئاسمانن، هەر کاتێك ئەستێرەکان نەمان ئەوەی بەڵێنی خوا کە تێکچونی ئاسمانە دێتە دی، منیش پارێزەرم بۆ هاوەڵانم، بە ڕۆیشتنی من یارانیش دووچاری ئەو بەڵێنە دەبنەوە کە دراوە واتە: ئەوانیش نامێنن، هاوەڵانیشم پارێزەرن بۆ ئوممەتەکەم، ئەگەر هاوەڵانم ڕۆیشتن ئوممەتەکەشم دووچاری ئەو بەڵێنە دەبنەوە کە دراوە.

لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر(ﷺ): نەمانی هاوەڵانی بەستووە بە نەمانی دوو نیشانەیەك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر، کە ئەویش ڕۆیشتنی ئەستێرەکان و دابەزینی نەیزەکەکانە.

زانایان بڕوایان وایە لە شەو و ڕۆژێکدا هەزاران پرژە ئاگر دەکەونە سەر زەوی، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆربەی زەوی ئاوە بۆیە دەکەونە زەریاو دەریاکانەوە، پرژە ئاگرەکان لە ئاسماندا وادێنە پێش چاو کە بەهەمـوو لایەکدا دەجولێنەوە بەڵام هەزارانیان بەیەکەوە کاتێك زەوی بەدەوری خۆردا دەسوڕێنەوە لەو کۆمەڵە ئاگر پرژێنە نزیك دەبنەوە، ئەوانیش کاتێك دەبینرێن کە لەچینەکانی سەرەوەی کەش دەخشێت.

ئەستێرەناسان لایان وایە، ئەو کۆمەڵانەی پرژە ئاگرەکان، پەلاشەی بڵاوە کردوی کلکدارەکانە، کاتێك کلکدارێك دەتەقێتەوە ملیۆنەها پەڵاشە بەگەردووندا

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ١٩٦١) باب: بيان أن بقاء النبي(ﷺ)، برقم: (٢٥٣١).

بەرگی دووەم

بڵاودەکاتەوەو بەشێوەی کۆمەڵە دەست بەسوڕانەوە دەکەن، لە مەدارو ڕێڕەوی ڕێك و پێکدا، لەناو ئەو کۆمەڵانەدا هەیە ڕێگەی زەوی بە (٣٣) ساڵ دەبڕێت، کاتێك پارچەیەك لە پرژە ئاگر دەگاتە زەوی پێی دەگوترێت «بەردی پرژە ئاگر» بۆیەش دەکەوێتە سەر زەوی، چونکە زەوی بۆ خۆی ڕادەکێشێت[١][٣٤].

لەسەردەمی ڕۆماندا لەساڵی (٤٦٧) پێش لە دایکبوونی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لیٚ بیٚ)، بەردێکی پرژە کەوتە سەر زەوی، کەوتنە خوارەوەی بە ڕووداوێکی گرنگ لە قەڵەم دراو تەنانەت مێژونوسانی ڕۆمانیش لە مێژوودا باسیان کردووە.

خوای گەورە دەفەرمویٚ:

[ لَا يَسَّمَّعُونَ إِلَى الْمَلَإِ الْأَعْلَىٰ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ﴿٨﴾ دُحُورًا وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ ﴿٩﴾ إِلَّا مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ﴿١٠﴾ ][٢].

واتە: جنۆکەکان گویٚ لە فریشتە باڵاکان ناگرن و لە هەموو لایەکەوە بۆردومان دەکرێن، دوور دەخرێن و سزایەکی بەردەوامیان هەیە، مەگەر یەکێکیان وشەیەك بدزن، ئەو کاتە شهوبەکی کونکار شوێنی دەکەوێت.

بەشێکی زۆر لەو شوهبانە لە هەوادا دەسوتێن و کەمێکیان دەگاتە زەوی کە ڕەنگە بە چاو نەبینرێن، ڕۆژانە هەزار تەن لەم شوهبانە دێنە سەر زەوی کە بە نەیزەك ناسراون.

ئاژانسی ئەمریکی ئاشکرای کرد، کە (١٠٠٠) هەتا (٤٠٠٠) بەردو شهوب هەیە، بەرەو ڕووی زەوی دێن، کە تیرەکەیان لە نیو میل زیاترە، کە ئەمەیش مرۆڤایەتی و زەوی دەپێچێتەوە، تەنها (١٥٠) دانەشیان ناسراون تا ئێستا، ئەو بەردانەش کە لە (٣٠٠) پیٚ زیاترن ژمارەیان دەگاتە (٣٠٠٠٠٠) هەزار بەرد کە بەرەو ڕێڕەوی زەوی دێن و هیچیان لە بارەوە نازانین، خوای گەورە دەفەرمویٚ:

---

(١) آيات الله المبصرة / أ .د .توفيق علوان .

(٢) سورة الصافات، الآية : (٨-١٠) .

[ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ﴿١٦﴾ أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗاۖ فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ نَذِيرِ ﴿١٧﴾].

[حَاصِبٗا] واتە: بەرد.

بەردە ئاسمانیەکان تەنها ئەو کاتەی لە بۆشایی ئاسماندان لە بەرزایی (١١٢) کیلۆمەتردا دەبینرێن، زۆربەیان لەجەودا کە دەگەنە بەرزایی (٨٠) کیلۆمەتر خێراییان بۆ خوارەوە لە نێوان (١٦٠ تا ٢٠٠) کیلۆمەترە لەیەك سانیەدا، بەردە ئاسمانیەکان ڕۆژو شەو دەکەونە خوارەوە بەڵام بەڕۆژ بە هۆی تیشکی خۆرەوە نابینرێن.

بەردە ئاسمانیەکان لە ڕاستیدا پارچەی ئەستێرەی کلکدارن، هەر کاتێ زەوی لە تەوەرەی هەندێ ئەستێرەی کلکدار نزیك دەبێتەوە هەندێ پارچەیان بەرەو زەوی ڕادەکێشرێن، ئەم پارچانە لەوانەیە گەورە یان بچووك بن، بۆیە گەورەترین بەردی ئاسمانی کە کەوتۆتە سەر ڕووی زەوی قورساییەکەی (٣٧) تەن بوو.

بەرگی دووەم

## سێ جۆر بەردی ئاسمانی هەیە :

**یەکەم:** شوهب یان نەیزەك ، ئەم جۆرە بەردە ئاسمانیە لە ئەستێرەیەکی کز دەچێت.

**دووەم:** بەردی نەیزەکیە کە هێندە گەورەیە هەندێ پارچەی دەگاتە سەر زەوی.

**سێیەم:** تۆپی گڕن، ئەم تۆپە گڕانە ئەگەر گەورەش بن هەر لە جەودا لەناو دەچن.

ڕووی دەرەوەی ئەم بەردە ئاسمانیانە گەرمە، بەڵام ناوەوەیان ساردە بە هۆی توانەوەی ڕووی دەرەوەی، ڕووپۆشێکی تەنکی پڕشنگدار دروست دەبێت، زۆر لەبەردە ئاسمانیەکان چاڵ و چۆڵی تێدایە کە لە شوێنەواری ئاوڵەی سەردەم و چاوی مرۆڤ دەچێت، جا دروست بوونی ئەم بەردە ئاسمانیانە هەر بە دروست بوونی بەردە بالوریەکانی سەر زەوی دەچێت.

زانایان دەڵێن: بە ملیۆنان نەیزەك و ئەستێرە زۆر بە خێرایی بەرەو ڕێڕەوی زەوی دێن، هەر یەکێ لەو نەیازیك و ئەستێرانە ئەگەر بگاتە سەر زەوی، ئەوا جێگایەکی زۆر تێك دەچێ و زەمین لەرزەی زۆریش پەیدا دەبێ[1].

زانای فەلەکی (دۆنالد یومانز) لە ئاژانسی ناسا (لە معلمی تحلیلی کونی لە (باسادینا کالیفۆرنیا) دەڵێت: لە ڕۆژی (٢٣) ی مارسی ساڵی (١٩٨٩) بەردێکی ئاسمانی (ئەسترۆیدس) تەنها (٧٠٠٠٠٠) هەزار میلی مابوو بەر زەوی بکەوێ ئەگەر تەنها شەش سەعات دوا بکەوتایە لە هانندا ئەوا بەر زەوی دەکەوت و دونیای کاول دەکرد بەسەر یەك، بە ڕاستی زەوی لەسەر خولگەی خۆی بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە کە لە دەوروبەری بەردی کەونی زۆر هەیە، ئێستا بێت یان لە داهاتوودا بەردێکی هەر بەردەکەوێ ئەمە ئەگەر شتی تر پێشتر ڕوونەدات.

هەر کاتێ یەکێ لە ئەستێرەکانی ئاسمان کە دەخولێتەوە لە زەوی نزیکتر دەبێتەوە، بەهۆی هێزی ڕاکێشانی زەویەوە بەرەو زەوی ڕادەکێشرێن، ئەم ڕاکێشانە دەبێ بەهۆی زیادبوونی خێرایی ئەستێرە، سەرەنجام ئەستێرەکە زۆر گەرم دەبێ و گازی گەرمی لێ دێتە دەرەوە.

وە زۆربەی دیاردەکانی نەیزەکەکان دەگەڕێتەوە بۆ هەسارەکانی (موشتەری و زوهرەو زەوی)، هەر چەندە کلکدارەکانیش بە سەرچاوەیەکی تری ئەمانە دادەنرێن.

توێژینەوەی نێزەکەکان گرنگە چونکە لە دەرەوەی زەویەوە دێن و زانیاری بە سودمان سەبارەت بە کۆمەڵەی خۆرو بە تایبەتی گەردوون بە گشتی پێ دەبەخشن، دواترین توێژینەوەش لەسەر نەیزەکەکان ئەوەبوو کە لە ساڵی (١٩٩٦) ع ئاشکرا کراو زانایان وای بۆ دەچن تەمەنی ملیارەها ساڵ بێت.

بوونی بەرگە هەوا لە دەرەوەی گۆی زەوی باشترین قەڵغانە بۆ سووتاندنی هەسارەکان کە ژمارەیەکی بێ شوماریان بەرەو زەوی دێن و بە هۆی ئەو

---

(١) آيات الله المبصرة / أ .د .توفيق علوان .

بەرگی دووەم

سووتاندنەوە دەبنە نەیزەك و هێندێكی زۆر كەم لە بارستەو ژمارەشدا دەبنە نێزەك، ئەم قەڵغانە كە بۆ مرۆڤ ڕەخسێنراوە لە زۆر تەنی تری گەردوونی نیە، لەوانە مانگ كە ڕووەكەی چاڵ چاڵە، ئەویش بەهۆی پیاكێشانی بەردەوامی هەسارەكانەوە چونكە بەرگی زەوی لە هێرشێكی دەرەكی گەردوون پاراستووە تاوەكو نەبێتە ڕێگر لەبەردەم ژیانیدا .

بیركردنەوە لە زەوی و لە دوورو نزیكی خۆرو مانگ لە زەویەوەو وردبوونەوە لە بەرگی گازی دەوری زەوی كە بەردەوام زەوی دەپارێزێ لە ملیۆنەها (نەیزەك) كە بەری بكەون، هەروەها پلەی گەرمی دەپارێزێ و نایەڵێ تیشكی زیانبەخش بگاتە سەر زەوی.

كێ بەرگە هەوای بۆ زەوی دروست كرد تا لە هەموو شتە زیانبەخشەكان وەكو تیشك و نەیزەك لە ئاسمانەكانی گەردوونەوە دێن بۆ زەوی بیپارێزێ و ژیان بەردەوام بێت لەسەری؟

كێ پێویستی ژیانی هەموو بوون و بوونەوەری لەسەر ئەم زەویە دروست كرد بە ملیۆنەها پێویستی بۆ ملیارەها زیندەوەر؟

لە وەڵامدا دەڵێین تەنها ( رب العالمین )ە خودای باڵادەست و بە توانایە.

بەرگی دووەم

## نەفرین کردنی کۆتایی ئەم ئوممەتە لەسەرەتاکەی

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر خەڵکانێك پەیدا دەبن جوێن بە هاوەڵان و تابیعین و زانایانی کۆن دەدەن..

لەم سەردەمە ئەم جۆرە کەسانە بوونیان هەیە لەوانە شیعەکان تەنها زەیدیەکان نەبێ کە جوێن بە پێشەوایانی ئیسلام ئەبوبەکرو عومەر دەدەن، تەنانەت هەندێکیان بە بتی قورەیش ناوزەدیان دەکەن، هەندێکی تر دەڵێن: عائیشە مانگایە..

هەروەها ئەوانەی ئەمڕۆ دروست بوون بەناوی قورئانی و خەواریج و مورجیئەو .. هتد..

تەنانەت ماوەیەك پێش ئێستا کۆمەڵە خەواریجێك دروست بووبوون کە ئیمامی شافعیان کافر کرد... لەگەڵ ئەوەشدا بە عیبادەتیان دەزانی..

داهێنراو لە دیندا زۆر دەبێت لە کۆتایی بونەوەر، پاشینەکان نکوڵی دەکەن لە پێشینان و چاکەی هاوەڵە بەرێزەکان و مەزنی پلەو پایەیان فەرامۆش دەکەن و خۆیانی لێ بێ ئاگا دەکەن و ئیتر هەندێك لە پاشینان نەفرین دەکەن لە پێشینانی ئەم ئوممەتە.. بەڵگەش لەسەر ئەم نیشانە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِذَا اتُّخِذَ الفَيْءُ دُوَلاً .. وَلَعَنَ آخِرُ هَذِهِ الأُمَّةِ أَوَّلَهَا..)[1].

واتە: ئەگەر دەستکەوتەکان تایبەت کران بە دەوڵەمەندەکانەوەو وە تاکو کۆتایی ئەم ئوممەتە نەفرین نەکەن لە پێشینانی ئەم ئوممەتە..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَلْعَنَ آخِرُ هَذِهِ الْأُمَّةِ أَوَّلَهَا)[2].

---

(١) سنن الترمذي (٨/ ٤١٤) باب: ما جاء في علامة حلول المسخ والخسف، برقم: (٢٣٧٢).

(٢) أمالي ابن بشران (١/ ١٠٦) برقم: (٢١٦).

واتە: کۆتایی بونەوەر هەڵناسێت تاکو کۆتایی ئەم ئوممەتە نەفرین نەکەن لە پێشینانی ئەم ئوممەتە. واتە: ئوممەتی پێغەمبەر(ﷺ).

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مِنِ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ خَصْلَةً : إِذَا رَأَيْتُمُ النَّاسَ .. وَلَعَنَ آخِرُ هَذِهِ الأُمَّةِ أَوَّلَهَا)[١].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر حەفتاو دوو تایبەتمەندە: هەر خەڵکانێکتان بینی .. کۆتایی ئەم ئوممەتە نەفرین نەکەن لە پێشینانی ئەم ئوممەتە..

هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە پێش و سەروی بڕواداران گەر بۆ بڕواداران بە گشتی لە ڕەگەزی نێرو مێ تاوانی گەورەو ئاشکراو بوهتانی پێ ئازاردان و قسە پێگوتنیان و بێ ڕێزی لەگەڵ کردنیان بێت ئەوە بۆ هاوەڵان حەوت جار تاوانترو قەدەغەیە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لاَ تَسُبُّوا أَصْحَابِي، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدِهِمْ، وَلاَ نَصِيفَهُ)[٢].

واتە: جنێو بە هاوەڵەکانم مەدەن سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە گەر یەکێك لە ئێوە هاو نمونەی چیای ئوحد لە ئاڵتون ببەخشێ ناگاتە مستێکی یەکێك لە هاوەڵانم وە ناگاتە نیوەشی.

لە فەرموودەیەکی تر دەفەرموێ: (مَنْ سَبَّ أَصْحَابِي فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ)[٣].

واتە: هەر یەکێك جنێو بە هاوەڵانم بدا، نەفرینی خودای لەسەرە.

---

(١) ضعيف: حلية الأولياء، لأبي نعيم (٣/ ٤١٠)، برقم: (٤٥٥٥). وهو ضعيف كما قال الحافظ العراقي (٢٩٧/٣).

(٢) صحيح مسلم (٤/ ١٩٦٧) باب: تحريم سب الصحابة، برقم: (٢٥٤٠).

(٣) المعجم الكبير (١٢/ ١٤٢) برقم: (١٢٧٠٩).

لەم فەرموودانە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە موسڵمان دەبێ زۆر بەڕێزو خۆشەویستەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بکات، بۆیە دەبێ زمانمان بگرین لە قسەی ناشیاو بەرامبەریان.. ئەوەی بێ ڕێزیان لەگەڵدا بکات با بزانێ دووچاری تاوانی گەورە بووە، وە بەر نەفرینی خوداو فریشتەو خەڵکی دەکەوێت..

پێشەوا ئەحمەدی کوری حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت:

لە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکراو زانراو ئەوەیە کە باشیەکانی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) هەمویان تێکرا باس بکرێت، واز بێنن لە باس کردنی خراپەکانیان، هەر یەکێك جنێو بدات بە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) یان بە یەکێکیان لەوان یان لە پلەو پایەیان کەم بکاتەوە یان تانەو تەشەرەیان لێ بدا، یان کەم و کورتیەکانیان بخاتە ڕوو، یان عەیبداری یەکێکیان بکات، ئەوە داهێنەرو و (موبتەدیع)ێکی (رافضي) شیعەی پیسەو خودا هیچی لێوەرناگرێت[١].

بەداخەوە لەم سەردەمە پڕ لە فیتنەیە کەسانێکی جاهیل و نەخوێنەوار نەفرەت لە زۆربەی زانایانی پێشوو دەکەن و غەیبەتیان دەکەن، لە کاتێکدا پێشەوا بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی:

هیوام وایە لە قیامەت خوای گەورە هیچ لێپرسینەوەم لەگەڵ نەکات لەسەر غەیبەت کردن[٢].

بەڕاستی مرۆڤ کە نەفرەت دەکات لە هاوەڵان و زانایان هۆکارەکەی تەنها بۆ بێدەسەڵاتی دەگەڕێتەوەو لە کۆتاییدا دەچێتە جەهەننەم.

موسڵمانی ڕاستەقینە دەناسرێتەوە بە ویقارو نەرمی قسەکانی و ڕاستگۆیی وتەکانی، بۆیە هەر کەسێکتان بینی جوێنی بە هاوەڵانداو نەفرەتی لێیان کردن، ئەوە بزانن کەسێکی دڵنەخۆش و دەجال و مونافیقە.

---

(١) السنة: الإمام أحمد بن حنبل (لا ٧٨).

(٢) تأريخ بغداد (٢/ ٣٣٢).

# ڕێزی پیاوی بە تەمەن ناگیرێت و بەزەییش بە بچوکەکان نایەتەوە

لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی خەڵکی ڕێز لە مرۆڤی بە تەمەن ناگرێت و بەزەییشی بە بچوکەکاندا نایەتەوە بە هۆی دڵڕەقیەوە..

پێشەوا ئەبو زەڕ (ﷺ) دەڵێت: (إذا اقترب الزمان.. لا يوقر كبير ولا يرحم صغير..)[1].

واتە: ئەگەر ڕۆژی دوایی نزیك بوویەوە.. ڕێزی بە تەمەن ناگیرێت و بەزەییش بە بچوکەکان نایەتەوە..

ئەم دوو نیشانەیەی قیامەت لەم سەردەمە بە ڕۆژی ڕووناك دەیانبین، کە ڕێزی پیاوی بە تەمەن ناگیرێت و بەزەییش بە بچوکەکان نایەتەوە.

ڕێزی پیرەکان بگرە، کاتێك گەنجیت.

یارمەتی لاوازەکان بدە، کاتێك بەهێزی.

بەزەییت بە بچوکەکان بێتەوە کاتێك مەردی.

چونکە ڕۆژێك لە ژیاندا، پیرو لاواز و هەڵە ئەبیت.

تکایە.. با ڕێزی پیرەکان بگرین، ئەگەر خوا تەمەن بدات ئێمەش ئەم دیمەن و کاتە ئەبینین ئەو کات دەزانین پیرەکان چەندە گوناهن.

وە بەزەییمان بە بچوکەکان بێتەوە، چونکە ئەوانیش چاو لە گەورەکان دەکەن و هەست بەدڵنیاییەکی زۆر دەکەن.

ئیتر با ئەو بێ ڕێزیەی بەرامبەر پیرەکان دەکرێت با بوەستێنرێت، چونکە پیرەکان لە مەرگ نزیکن و حەز بە ژیان ئەکەن.

---

(١) رواه الحاكم في (المستدرك على الصحيحين): (٣٨٦/٣) برقم: (٥٤٦٥).

# فەرامۆشکردنی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) و سەرهەڵدانی بیدعە

لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی خەڵکی پشت لە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات و بیدعە بە هەواو ئارەزووی خۆی دروست دەکات..

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عەباس (ﷺ) دەڵێت: (مَا مِنْ عَامٍ إِلَّا وَالنَّاسُ يُحْيُونَ فِيهِ بِدْعَةً , وَيُمِيتُونَ فِيهِ سُنَّةً، حَتَّى تَحْيَا الْبِدَعُ وَتَمُوتَ السُّنَنُ)[١].

واتە: هیچساڵێك نیە ئیلا خەڵکی بیدعەی تیایدا زیندوو دەکەنەوەو سوننەت دەمرێت، هەتا بیدعە زیندوو دەکەنەوەو سوننەت دەمرێت.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری مەسعود(ﷺ) دەڵێت:

(كَيْفَ أَنْتُمْ إِذَا ظَهَرَ فِيكُمُ الْبِدَعُ، وَعُمِلَ بِهَا..

حَتَّى يَعْمَلَ الرَّجُلُ بِالسُّنَّةِ فَيُقَالَ: بِدْعَةٌ،

قَالُوا: مَتَى ذَلِكَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ؟

قَالَ: إِذَا كَثُرَتْ قُرَّاؤُكُمْ وَقَلَّتْ فُقَهَاؤُكُمْ ..)[٢].

واتە: ئێوە حاڵتان چۆن دەبێت کاتێك بیدعە لە نێوتاندا سەرهەڵدەدات و ئیشی پێدەکرێت، وە هەتا پیاو ئیش بە سوننەت دەکات پێی دەوترێ: بیدعە

گوتیان: ئەوە کەی سەرهەڵدەدات ئەی باوکی عەبدوررەحمان؟

---

(١) ضعيعف: المجالسة وجواهر العلم، (٣/ ١٨١) إسناده ضعيف. أبو بكر أحمد بن مروان الدينوري المالكي (المتوف: ٣٣٣هـ)، المحقق: أبو عبيدة مشهور بن حسن آل سلمان، الناشر: جمعية التربية الإسلامية (البحرين - أم الحصم )، دار ابن حزم (بيروت - لبنان)، تاريخ النشر : ١٤١٩هـ

(٢) السنن الواردة في الفتن (٣/ ٦١٨) برقم: (٢٨١).

فەرمووی: ئەگەر قورئان خوێن زۆر بوون و زاناو تێگەیشتووانتان کەم بوون..
پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردووین و فەرموویەتی:

(عليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين من بعدي، تمسكوا بها، وعضوا عليها بالنواجذ)[1].

واتە: پەیوەست بن و دەست بگرن بە سوننەتی جێنشینە هیدایەتدراوەکانی دوای خۆمەوە، دەستی پێوە بگرن و، بە ددانەکانتان پارێزگاری لیٚ بکەن.

ئەمە فەرمانە بۆ ئوممەتی ئیسلام هەتا ڕۆژی دوایی، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شوێن سەلەفی سالحی کۆن بکەوین، نەك کۆمەڵە کەسانێك کە ناوی سەلەفیان ناشرین کردووە.. بەداخەوە.. چونکە ئەم ئوممەتە چاك نابێت تەنها بەوە نەبێت کە سەرەتاکەی پیٚ چاك بووە.

ئەو کەسەی دەیەوێت عیززەت بۆ ئوممەتی ئیسلام بگەڕێتەوە، و ئوممەت لە سەلەفی سالح و پیاوچاکان دابڕێت، ئەوا کەسێکە شەڕی بۆ موسڵمانان دەوێت، و دەیەوێت دەستکاری ئیسلام بکات بە ئارەزووی خۆی، وە بیدعەو موخالەفات بێنێتە ئاراوە، بۆیە ئەم جۆرە کەسانە پێویستە ڕەفز بکرێن و بەرپەرچ بدرێنەوە.

ئەو کەسەی بیەوێت خەلەفی ئەم ئوممەتە لە سەلەفی پێشووی دابڕێت ئەوا کەسێکی موفسیدو خراپەکارە لەسەر زەوی.. بەڵام نابیٚ ئەوە لە بیربکەین کە باسی سەلەف دەکرێت مەبەستمان پێی سەلەفی سالحە نەك تەزویرەکان..

بۆیە بوونی پەیدابوونی بیدعە بوختان کردنە بەدەم پێغەمبەرەوە(ﷺ)، تەنانەت پێشەوا ئیبنو تەیمییە (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) فەرموویەتی: هیچ کەسێك نییە بە ئەنقەست درۆی بە دەمی پێغەمبەرەوە کردبێت (ﷺ) ئیلا خوای گەورە نهێنیەکانی هەڵماڵیوەو حەقیقەتی ئەم کەسەی بۆ خەڵکی دەرخستووە[2].

---

(١) حسن: رواه الإمام أحمد في مسنده (٤/ ١٢٦) وابو داود في سننه (٤/ ٢٠٠) والترمذي (٥/ ٤٤) برقم: (٢٦٧٦). وقال الترمذي: حسن صحيح.

(٢) منهاج السنة (٢/ ٤٥٨).

# دەرکەوتنی گەنجینەکانی زەوی

لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر ئەوەیە کە زەوی گەنجینە شاردراوەکانی خۆی دەردەهێنێت و خەڵکیش بێ نیاز دەبن لە سامان ئەوەندە زۆر دەبێت.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (تَقِيءُ الْأَرْضُ أَفْلَاذَ كَبِدِهَا، أَمْثَالَ الْأُسْطُوَانِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، فَيَجِيءُ الْقَاتِلُ فَيَقُولُ: فِي هَذَا قَتَلْتُ، وَيَجِيءُ الْقَاطِعُ فَيَقُولُ: فِي هَذَا قَطَعْتُ رَحِمِي، وَيَجِيءُ السَّارِقُ فَيَقُولُ: فِي هَذَا قُطِعَتْ يَدِي، ثُمَّ يَدَعُونَهُ فَلَا يَأْخُذُونَ مِنْهُ شَيْئًا)[1].

واتە: زەوی پارچە شاردراوەکانی خۆی دەردەهێنێت لە چەشنی لوولەکی ئاڵتوون و زیو، بکوژ دێت و دەڵێت: لە پێناو ئەوەدا من بووم پیاوم دەکوشت، دڵ ڕەق و بێ بەزەییش دێت و دەڵێت: لە پێناو ئەوەدا بوو لەگەڵ خزمانم پەیوەندیم پچڕاند، دزیش دێت و دەڵێت: لە پێناو ئەوە بوو دەستم بڕا، ئینجا وازی لێ دەهێنن و هیچی لێ نابەن.

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: کە فەرمان دەداتە زەوی گەنجینەکانی دەرخات کە لەناخیدا شاردویەتیەوە، پێغەمبەر(ﷺ) گەنجینانی بە (أَفْلَاذَ كَبِدِهَا) ناو بردوە، کە لەبنەڕەتدا بە واتای پارچە جەرگی وشتر دێت، هەندێکیش دەڵێن: بریتیە لە پارچە گۆشت، مەبەستی فەرمودەکەی پێغەمبەریش(ﷺ) وێچواندنە، واتە: ئەو پارچانە دەردەخا کە لە ناخیدا شاردراونەتەوەو، لەبەر گەورەیی‌و زۆریشی بە کۆڵەگەی چواندون[2].

وە چەمکی فەرموودەکە لێچواندنە، واتە: زەوی پارچە شاردراوەکانی خۆی دەردەهێنێت کە لە وێنەی کۆڵەکەو ستوونە لە ڕووی گەورەیی و زۆرییەوە.

---

(١) صحيح مسلم (٢/ ٧٠١) باب: الترغيب في الصدقة، برقم: (١٠١٣).

(٢) شرح النووي على مسلم : (٩٨/٢).

ئەم فەرمووده‌یەش بە واتای ئەوە دێت کە پێش هاتنی کۆتایی بونەوەر زێڕو زیوێکی زۆر لە ژێر زەوی و دەریاکان ئەدۆزرێتەوە، وە فیتنەو بەڵا ئەوەندە زۆر دەبێت، تەنانەت خەڵکی زۆر زۆر ڕەزیل دەبن ئەمەش بە هۆی سەروەت و سامانی دونیاوە..

جا کە خەڵکی ئەو زۆریەی زێڕو زیو دەبینن لێی بێ نیاز دەبن و ئێش و ئازار دەخۆن کە بۆ وەدەست هێنانی ئەو مایە پوچە گوناە و تاوانیان ئەنجام داوە.

ڕاپۆرتێکی ئەمریکی هۆشداری داوە لە دەرکەوتنی کەنزو گەنجینە لە کاتی گرتنەوەی ئاوی فوڕات.

پێش بیستنی ئەم ڕاپۆرتە هەمیشە لەکاتی گوێ بیستنی ئەو فەرموده‌یەدا کە لەباسی دەرکەوتنی (شاخە ئاڵتونیەکە)ی ڕوباری (فورات) وام بە بیردا هاتووە کە ئەو شاخە ئاڵتونیە بریتی بێت لە پێکهاتەی کانزایی ئەو خاکە خۆی، واتە: ئەو بەشەی ئەو ناوچەیە لە ڕووی مێژوویەوە شوێنێکی ئاسەوارەو شارستانیەتی زۆری تێدا ژیاوە، وە خاوەنی (کەنزێك)ێکی زۆرە کە مێژووەکەی بۆ سەردەمی دێرین دەگەڕێتەوە.

لە ماڵپەری (شام) بۆ زانستەکانی گەردوون و ئەستێرە ناسی ئاماژە دەکات بەوەی کە (کەنز) و (خەزێنە)ی نەمرود لە وێدایە، وەکو باس کراوە گەنجینەکەی بە چەندین کەس هەڵگیراوە.

ڕاپۆرتێکی ماڵپەری (NPR) ی ئەمریکی کە لەبەرواری ٢٠ ی مارسی ساڵی ٢٠٠٩ ع بڵاوی کردۆتەوە کە زانایانی جیۆلۆجی ئاشکرایان کردووە لە عێراق، دەڵێن: ئەگەر ڕوباری فوڕات بگیرێتەوە ناوچەیەك دەردەکەوێت کە گەنجینەیەکی گەورەی ئاڵتونە کە شارستانیەتی ڕۆمانیە دێرینەکانە، بەڵام بەپێی بۆچونی هەندێك شوێنەوار ناسانی عێراقی تا ئێستا زۆر دڵنیانین لەو شوێنەوارە.

ڕاتب عەلی کویەیسی بەڕێوەبەری شوێنەواری شاری (ئەنبار) دەڵێت: بە وشك بوون و گرتنەوەی ئاوی فوڕات زەویەکی نوێ دەبینرێت وا لێك دەداتەوە

ئەم شارستانیەتە لە شاری ئەنبار بێت، هەر چەندە ئەنبار ناوچەیەکی بیاباناویە، وە دەزانرا گرنگی مێژوویی نیە، بەڵام ئێستا ئاشکرا بووە لە ڕووی شوێنەوارەوە گرنگی خۆی هەیە بۆ سەرجەم عێراقیەکان.

لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩٨٠) حکومەتی عێراقی هەڵسا بە دروست کردنی بەربەستێك لەو ناوچەیە، لێپرسراوان کە بینویانە (٧٥) ناوچە شوێنەواری کەمتر لەو ناوچەیە نیە کە ئەو بەربەستەی تێدایە بەڵام حکومەت پاش هەڵکەندنی بە مەبەستی (بەربەست) بەخێرایی بە ئاو دای پۆشیوە، وە تێکڕای ئەو شوێنانە خاوەنی شارستانی دێرینن کە مێژووەکەیان بۆ (٣٠٠٠) ساڵ پێش لە دایکبوونی پێغەمبەر عیسا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سۆمەری و ڕۆمانیەکان، وە لە مێژووی جولەکەی کۆندا باس کراوە کە ئەم ناوچەیە نقوم بووە پاش گیرانەوەی ئاوەکەی، گۆڕی زۆری مەسیحی پێشینەی لێ بووە، کە بەهیوابوون جارێکی تر بی بیدۆزنەوە.

وە دەڵێت: هەست بە دڵە ڕاوکێ دەکەم لەو ناوچانە بۆیە (١٠) پاسەوانمان بۆ داناون لەبەر مەترسی، وە زیاتر لە ترسی سوپاو شوێنەوار ناسانی ئەمریکا، وە هەر لەم ڕاپۆرتەدا دەڵێت: ئاستی ئاوی فوڕات تەواو دابەزیوە، وە لە نزمترین ئاستدایە، ئەم ناوچانە دەوڵەمەندە بەو کەل و پەلانە، وە خشڵ و ئاڵتوون و بەڵگەی زۆر دێرینی لێیە.

(صیاد سعید ناجی) دەڵێت: زۆر دەترسم چونکە هیچ کارێکی بۆ نەکراوە لە پاراستنی، ئاوەکەی قوڵایی لەو ناوچەیەدا (٣-٤) پێ قوڵە، وە دەڵێ: ئێستا پەیکەرێکی سەیر بە دەرکەوتوە، لە شێوەی کەوانێکی بەرد دایە، وە ئەوانەی ئێستا لەوێن هیچیان شوێنەوار ناس نین، بەڵکو تەنها بۆ کەل و پەلی بە نرخ دەگەڕێن، ئەمەش پێش ساڵێك گیرایەوە پارچەیەك دەرکەوت، ئێمە سەرەتا گەڕاین لەو ناوچانە، هەندێك کوپەڵە گۆزەو ئاڵتوون و ئێسك و پروسکمان دۆزیەوە[١].

---

(١) ماڵپەڕی ئاژانسی (NPR)ی ئەمریکی: (Drought Reveals Iraqi Archaeological Treasures).

# جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی بانگەشەی ئەوە دەکرێت کە دەبێت دین لە دەوڵەت جیابکرێتەوە..

ئاینی ئیسلام لەسەر دەستی پێغەمبەرو(ﷺ) هاوەڵان دامەزراو تا گەیشتە وڵاتی ڕۆم و فارس، بەڵام لە ئەنجامی بێئاگایی موسڵمانان و پیلانی نەبڕاوەی دوژمنانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ئایین و دەوڵەت لە یەکتر جیابوونەوەو هەڵگرانی مەشخەڵی هەق و ڕاستی کەوتە بەر چەرمەسەری و دەردەسەری و دەربەدەری و کوشتن و بڕین.. بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هەر لەسەرەتاوە پێشبینی ئەم ڕۆژەی کردووەو ئامۆژگاری موسڵمانانی کردووە کە دەست بگرن بە بەرنامەی خواو کۆڵ نەدەن لە هەوڵ و خەبات.



پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: (يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ الصَّابِرُ فِيهِمْ عَلَى دِينِهِ كَالقَابِضِ عَلَى الجَمْرِ)[١].

واتە: ڕۆژێك دێت ئەوەی ئارام دەگرێت لەسەر دینداری وەکو کەسێکە کە پشکۆی بە دەستەوە بێت.

پێشەوا موعازی کوڕی جەبەل(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (أَلَا إِنَّ رَحَى الْإِسْلَامِ دَائِرَةٌ، فَدُورُوا مَعَ الْكِتَابِ حَيْثُ دَارَ، أَلَا إِنَّ الْكِتَابَ وَالسُّلْطَانَ سَيَفْتَرِقَانِ فَلَا تُفَارِقُوا الْكِتَابَ، أَلَا إِنَّهُ سَيَكُونُ أُمَرَاءُ يَقْضُونَ لَكُمْ، فَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ أَضَلُّوكُمْ وَإِنْ عَصَيْتُمُوهُمْ قَتَلُوكُمْ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَكَيْفَ نَصْنَعُ؟ قَالَ: كَمَا صَنَعَ أَصْحَابُ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ، نُشِرُوا بِالْمَنَاشِيرِ وَحُمِلُوا عَلَى الْخَشَبِ مَوْتٌ فِي طَاعَةٍ خَيْرٌ مِنْ حَيَاةٍ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ)[٢].

---

(١) سنن الترمذي (٩/ ٤) باب: الصابر على كالقابض، برقم: (٢٤٢٨).

(٢) المعجم الكبير (٢٠/ ٩٠) برقم: (١٦٩٢٩).

واتە: حاڵی ئیسلام دەگەڕێ، ئێوەش لەگەڵ قورئاندا بن هەر چۆن گەڕا، ئاگاداربن ڕۆژێك دێت قورئان و دەسەڵات لە یەكتری جیا دەكرێنەوە، ئێوە دەست لە قورئان بەر مەدەن، ئاگاداربن ڕۆژێك دێت كاربەدەستی ئاوا پەیدا دەبێت تەنها بۆ خۆیان دەوێ و بۆ ئێوەیان ناوێت، ئەگەر بە گوێیان بكەن سەر گەردانتان دەكەن، ئەگەر بە قسەشیان نەكەن دەتان كوژن..

هاوەڵەكانیش گوتیان:

ئەی پێغەمبەری خودا ئەو ڕۆژە ئێمە چی بكەین؟

فەرمووی: وەكو هاوەڵانی پێشەوا عیسای كوڕی مەریەم بن، كە بە مشار دوو كەرتیان دەكردن و بە دارا هەڵیان دەواسین، ئەوە وای لێنەكردن لە ئاینەكەیان دوور بكەونەوە، مردن لەسەر تاعەتی خوا چاكترە لە ژیانێك كە لە گومڕایی و سەرپێچی دابێت.

پێشەوا عەبدورەحمانی كوڕی سەننە(ﷺ) دەڵێت:

گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (بَدَأَ الْإِسْلَامُ غَرِيبًا، ثُمَّ يَعُودُ غَرِيبًا كَمَا بَدَأَ، فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَنِ الْغُرَبَاءُ؟ قَالَ: الَّذِينَ يُصْلِحُونَ إِذَا فَسَدَ النَّاسُ)[١].

واتە: ئیسلام بە غەریبی دەستی پێكردو گەیشتە لوتكەی دەسەڵات، جارێكی تریش غەریب دەبێتەوە هەروەكو كاتی دەست پێكردنی، خۆشبەختی بۆ غەریبەكان!

هاوەڵەكان گوتیان: غەریبەكان كێن ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟

فەمووی: ئەوانەن كە چاكە دەكەن لە كاتێكدا خەڵكانێك لە ئوممەتەكەم تێكی دەدەن.

ئەم فەرمودانەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەمڕۆ هەمووی هاتۆتە دی، بۆیە جوولەكەو هاوكارانیان لە پیلانێكی مەحكەم و وورد و حیساب بۆ كراو لە دەیان ساڵدا كاریان كردو ماندووبوون و پارەی زۆریان خەرج كرد تا بنەماكانی ئیسلامیان

---

(١) مسند الإمام أحمد (٢٧/ ٢٣٧) برقم: (١٦٦٩٠).

نەهێشت لە ئەنجامی جەنگی یەکەمی جیهانەوە کە جوولەکە دەستیان تێدا بوو، هەروەك لە پرۆتۆکۆلاتی (حکماء صهیون)دا هاتووە.. جوولەکە هەڵگیرسێنەری ئاگری شەڕن، جوولەکەکان بە هەزارەها ملیۆن قوربانیاندا بۆ ئەوەی حوکم و دەسەڵات نەکەوێتە ژێر دەستی موسڵمانانەوە بەڵام کاتێك ڕۆیشتن کە دڵنیا بوون دەسەڵات ناکەوێتە دەست موسڵمانانی ڕاستەقینە، کەسانێکیان دروست کرد کە لەسەر مەنهەجی ئەوان بێت و دین و دەوڵەتیان بۆ جیابکاتەوەو ڕۆژ بە ڕۆژ غەریبی ئیسلام و موسڵمانان زیاد بکات.

ڕۆژئاوا کەسانی زیرەك و بلیمەتیان لە جیهانی ئیسلامیەوە دەقۆستەوەو لە ڕێی (بعثات)ی زانستی وەرگرتنی عیلم و مەعریفەت و بڕوانامەی باڵاوە ئاوی گوێیان دەدان، ئینجا هەر لە ڕێی ئەوانەوە موسڵمانانیان لە ئیسلام دەتۆراند.. کاتی خۆی (طه حسين) چوو بۆ فەرەنساو لەوێ بیرو باوەڕیان شێواند و ناردیانەوە بۆ دژایەتی ئیسلام و بانگەوازکردن بۆ شارستانیەتی خۆرئاوا ، ئەمەش لەبەر ئەوەی باش لەو شارستانیە گەیشتبوون.

ئەوان نایانەوێ ئەو هەوڵ و کۆششەیان لە کیس بچێ، بەڵکو بەردەوام چاودێری ئەوە دەکەن لەهەر جێگایەك و شوێنێك بزانن ئەمە دووبارە دەبێتەوە هەر زوو هەوڵی بۆ دەدەن لەناوی ببەن، چونکە لەهەر جێگایەك هەستێکی بزاوتی ئیسلامی هەبێت دەچن بەخێرایی کپی دەکەن.

نووسەری ئەمریکی (وليام غاى كار) ئاماژەی بەوە کرد کە بیرۆکەی جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت ئەوە لەکاری جوولەکەکانە.

ئەم بیرۆکەیەش لەڕۆژهەڵاتی ئیسلامی زۆر نامۆیە، لە دواییدا دەرکەوت کە دەستی بێگانە لە دوای ئەم شتەیە، چونکە ئەم بیرۆکەیە لەبیری زانایانی ئیسلامی نەبوو هەتا چەند ساڵێکیش لەمەو پێش نەزانرابوو، کەس لەبەر چاوی نەگرتبوو، بەڵکو پێچەوانەی ئەمە بوو قورئانی پیرۆز ئەوەی لێ زانرابوو ئەوەبوو، نابێت کتێب بەش بەش بکرێت، ئەمە لە ڕوانگەیی قورئان و ئیسلام ئەم کارە بە کوفرو ئاشوب و نەفامی لەقەڵەم دەدرا.

بەڵێ.. دوژمنان بە پیلانێكی مەحكەم و هەمەلایەنە موسڵمانانیان دوورخستەوە لە ئیسلام هەنگاو بە هەنگاو پلە بە پلە، لە سەرەتاوە حوكم و دەسەڵاتیان نەهێشتن بەوەی كە دەڵێن: دین و دەوڵەت دەبێ لە یەكتری جیابكرێتەوە ، باشە دینێك نەتوانێ حوكم بكات بۆچی باشە؟

چۆن دەبێ موسڵمان لە عیبادەتەكانیدا بە پێی ئیسلام بجولێتەوەو دینەكەی تەنها لە مزگەوت دابێ و لەم لاشەوە بێ دین و خوا نەناسەكان بە پێی بەرنامەی شەیتان و هەواو ئارەزووی خۆیان حوكم بكەن؟

دوای نەهێشتنی دەسەڵات وورده وورده عیبادەتەكانیشیان نەهێشت بۆیە خۆشەویستمان محەممەد (ﷺ) دەفەرمووی:

(لَتُنْقَضَنَّ عُرَى الْإِسْلَامِ عُرْوَةً عُرْوَةً، كُلَّمَا انْتَقَضَتْ عُرْوَةٌ تَشَبَّثَ النَّاسُ بِالَّتِي تَلِيهَا، فَأَوَّلُهُنَّ نَقْضًا الْحُكْمُ، وَآخِرُهُنَّ الصَّلَاةُ)[1].

واتە: قوڵفەكانی خێمەی ئیسلامەتی یەك یەك دەپچڕێت

هەر كاتێك یەكێكیان پچڕا خەڵكی دەست بەویتریانەوە دەگرێ

یەكەمینیان حوكمەو

دواهەمینیان نوێژە .

بەڕاستی هەروا دەرچوو، دوژمنان هەر ڕۆژەو بیانوویەك بە ئیسلام دەگرن و خەڵكانێكی زۆریش وازیان لە نوێژ كردن هێناوەو تەنها بەناو موسڵمانن.

---

(١) صحيح: أخرجه الإمام أحمد في المسند (٥/ ٢٥١) برقم: (٢٢١٦٠). وابن حبان في صحيحه برقم:(٦٧١٥) وقال الأرناؤوط: إسناده قوي، والحاكم في (المستدرك) (١/ ٢٧٢) وقال: الإسناد كله صحيح ولم يخرجاه.. والطبراني في (الكبير) (٨/ ٩٨/ ٧٤٨٦).

بەرگی دووەم

# ئامرازە نوێیەکانی سواربوون.. ئۆتۆمبێل

وردەکاریەکانی کۆتایی بونەوەر ژمارەیەك لە داهێنراوەکانی، باسکراوە لە ژمارەیەك لە فەرمووودەکاندا بە شێوەی ئاماژە بۆ کردن، بۆ نمونە پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی ئەوەی پێداوین کە بازاڕەکان زۆر دەبنەوەو کاتەکان نزیك دەبنەوە، ئەوەش (بەپێی بۆچوونی هەندێك لە زانایان) ئاماژەیە بۆ سەیارە کە لەم سەردەمەی خۆماندا داهێنراوە.

پێشەوا ئیبنو عومەر(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (سَيَكُونُ فِي آخِرِ أُمَّتِي رِجَالٌ يَرْكَبُونَ عَلَى سُرُوجٍ ، كَأَشْبَاهِ الرِّحَالِ ، يَنْزِلُونَ عَلَى أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ ، نِسَاؤُهُمْ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ..)[١].

واتە: لە کۆتایی بونەوەردا کەسانێك لە ئوممەتی من سواری زین دەبن وەکو شێوەی وڵاخ و لە دەرگای مزگەوتەکاندا دادەبەزن، ئافرەتەکانیان پۆشتەو ڕووتن..

(كَأَشْبَاهِ الرِّحَال) ئاماژەیە بۆ ئەوەی شێوازێکی نوێیە لە سوارکراو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیبینیووە، واش دەردەکەوێت کە ئۆتۆمبێلە.

(السروج) لە زمانەوانیدا: کۆی (سرج)ە، ئەویش ئەوەیە کە لەسەر پشتی وشتر دادەنرێت وەکو کۆپانەو کەژاوە، هەروەها مەبەست لە (الرحال): ئەو کەژاوەوەیە کە ئافرەت سواری دەبێت، بەماڵی هەر پیاوێك دەڵێن: رحل.

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عەمر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەری خوای (ﷺ) بیستووە کە فەرموویەتی: (سَيَكُونُ فِي آخِرِ أُمَّتِي رِجَالٌ يَرْكَبُونَ عَلَى السُّرُوجِ كَأَشْبَاهِ الرِّجَالِ يَنْزِلُونَ عَلَى أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ نِسَاؤُهُمْ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ عَلَى رُءُوسِهِمْ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْعِجَافِ الْعَنُوهُنَّ فَإِنَّهُنَّ مَلْعُونَاتٌ..)[٢].

---

(١) صحيح ابن حبان (١٣/ ٦٤) برقم: (٥٧٥٣).قال الألباني: حديث حسن.

(٢) صحيح: مسند الإمام أحمد (٣٦/١٢) برقم: (٧٠٨٣) تحقيق: أحمد شاكر وقال إسناده صحيح.

واتە: لە کۆتایی ئومەتەکەمدا پیاوانێك دەبن سواری زین دەبن هەر دەڵێی ماڵ و خانووەو بە سواری ئەوانە دێنە دەرگای مزگەوتەکان، ژنەکانیشیان ڕووت و قووتە هەر بەناو جل و پۆشاکیان لەبەردایە، پرچی سەریان هەروەك پشتی حوشتر کۆمەڵ کردووە، ئەو ئافرەتانە نەفرەتیان لێ بکەن، چونکە نەفرەتیان لێکراوە .

ئەم فەرموودەیە لە گەورەترین موعجیزەکانی پێغەمبەرە(ﷺ) کە ئاماژە بە پەیدابوونی ئۆتۆمبێل دەکات و هەر دەڵێی لەو ڕۆژەدا ئەم ووتە پیرۆزەی تێدا فەرمووە، بە چاوی پیرۆزی سەیری واقیعی ئەمڕۆی کردووە، چۆن پیاوانی ئومەتەکەی بە سواری ئۆتۆمبێل ڕوودەکەنە مزگەوتەکان، کە چی لەولاشەوە بێ ئەوەی گوێی پێ بدەن ئافرەتاکانیان کچ و خوشکەکانیان ڕووت و سفورن، جلی کورت و تەسك و تەنك لەبەر دەکەن و قژیان لەف دەکەن و دەم و چاویان ئارایشت دەکەن و بۆنی خۆش لە خۆیان دەدەن و بە هەزار و یەك شێوە خۆیان دەڕازێننەوە، پاشان دێنە سەر کۆچە و شەقام و کۆڵانەکان و بە لەنجە و لار پیاسە دەکەن و پێغەمبەریش(ﷺ) دەربارەیان دەفەرموێ: ئەو جۆرە ئافرەتانە نەفرەتیان لێ بکەن، چونکە خواو مەلائیکەتەکانیش نەفرەتیان لێ دەکەن و لە ڕەحم و میهری خوای گەورە بێ بەشن .

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عەمر(رضي الله عنه) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:

(سَيَكُونُ فِي آخِرِ هَذِهِ الْأُمَّةِ رِجَالٌ يَرْكَبُونَ عَلَى الْمَيَاثِرِ حَتَّى يَأْتُوا أَبْوَابَ مَسَاجِدِهِمْ، نِسَاؤُهُمْ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ)[1].

واتە: لە کۆتایی ئومەتەکەم پیاوانێك پەیدا دەبن سواری زینی گەورە دەبن و هاتوو چۆی پێدەکەن، ژنەکانیشیان ڕووت و قووتن هەر بەناو جلیان لەبەردایە.

---

(١) صحيح: المستدرك (٤/ ٦٠١) برقم: (٨٤١٣). هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

پێغەمبەر(ﷺ) ئەم کۆمەڵەی لە ئافرەتان بە (کاسیات عاریات) ناوبردووە، واتە: بەرگ لەبەرو ڕووت، لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە ئافرەتانە بەگرێگی زۆر تەنك و نەرم لەبەر دەکەن و ئەم جل و بەرگە ناتوانێ ئەرکی داپۆشین بکات لەبەر نەرمی و تەنکیەکەی هەروەکو زۆربەی جل و بەرگی ئافرەتانی ئەم سەردەمەی ئێمە[1].

جا ئێوە ئیستا دەبینن ئۆتۆمبێل هەروەکو ماڵی لێهاتووە، هەموو تایبەتمەندیەکی تێدا ئامادەیە بە تەواوی، بەڵکو ئۆتۆمبێلی وا هەیە سەر ئاوی تێدایە، ڕەنگە هەر مرۆڤێك لەسەر کورسیەکەی دادەنیشێت و ڕەنگە بخەوێت ئێوەش دەزانن ئەو ئۆتۆمبێلانەی کە لە کەرەقانە دەچێت.. هتد.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ:

(وَاللهِ، لَيَنْزِلَنَّ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَادِلًا، فَلَيَكْسِرَنَّ الصَّلِيبَ، وَلَيَقْتُلَنَّ الْخِنْزِيرَ، وَلَيَضَعَنَّ الْجِزْيَةَ، وَلَتُتْرَكَنَّ الْقِلَاصُ فَلَا يُسْعَى عَلَيْهَا، وَلَتَذْهَبَنَّ الشَّحْنَاءُ وَالتَّبَاغُضُ وَالتَّحَاسُدُ، وَلَيَدْعُوَنَّ إِلَى الْمَالِ فَلَا يَقْبَلُهُ أَحَدٌ)[2].

واتە: سوێند بەخوا کوڕی مەریەم وەك فەرمانڕەوایەکی دادوەر دادەبەزێ، جا خاچ دەشکێنێ و بەراز دەکوژێ و سەرانە هەڵدەگرێ و حوشتری نێرو مێ وازی لێ دەهێندرێ و کەس ئیشی پێ ناکا، دوژمنایەتی و ڕق و کینە و ئیرەیی (حەسودی) بەرامبەر یەکتر نامێنێ، خەڵك بانگ دەکرێ ماڵی پێ بدەن هیچ کەس قبوڵی ناکات.

ئەوەی ئێمە مەبەستمانە لەم فەرموودە صحیحەدا ئەو بڕگەیەیە کە پێغەمبەری خوا سوێند دەخوات کە واز لە حوشتر دەهێنرێت لەوەی کە بۆ گواستنەوە بەکار بهێنرێت (وَلَتُتْرَكَنَّ الْقِلَاصُ فَلَا يُسْعَى عَلَيْهَا) دیارە ئەمەش ئێستا بە چاوی خۆمان دەیبینین کە چۆن حوشتر بۆ گواستنەوە بەکارناهێنرێت و هۆکارە نوێیە بەدیهێنراوەکانی تر بۆ ئەم مەبەستە بەکاردەهێنرێن.

---

(١) الحلال والحرام في الإسلام، د. يوسف القرضاوي، (لا ٨٣).

(٢) صحيح مسلم، كتاب الإيمان، باب نزول عيسى: (١٣٥/٤) برقم: (١٥٥).

خوای گەورە دەفەرموێت: [وَٱلۡأَنۡعَٰمَ خَلَقَهَاۗ لَكُمۡ فِيهَا دِفۡءٞ وَمَنَٰفِعُ وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ۝٥ وَلَكُمۡ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسۡرَحُونَ ۝٦ وَتَحۡمِلُ أَثۡقَالَكُمۡ إِلَىٰ بَلَدٖ لَّمۡ تَكُونُواْ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلۡأَنفُسِۚ إِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ۝٧ وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ۝٨ وَعَلَى ٱللَّهِ قَصۡدُ ٱلسَّبِيلِ وَمِنۡهَا جَآئِرٞۚ وَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِينَ ۝٩].

بەڵگەی دەقەکە: لە بڕگەی [ وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ] ئاماژە هەیە بە بەردەوامی دەرکەوتن و پەیدابوونی هۆکارەکانی گواستنەوە لە داهاتوودا.

کە ئەو کات کاتی دابەزاندنی ئەم ئایەتانەی قورئانی بە پێز هیچ کەس ئەوەی نەدەزانی کە هۆکاری تر هەبن بۆ گواستنەوە جگە لە ئەسپ و هێسترو گوێدرێژ، لە کاتێکدا ئەمڕۆ ئەو هەواڵە هاتۆتە دی.

پێشەوا مەراغی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) سەبارەت بەم ئایەتە دەڵێت: [وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ] مەبەست پێی ئەوەیە کە زانست پێی دەگات و ڕێی لێ دەکەوێت و ژیری و عەقڵی مرۆڤەکان بەرهەمی دەهێنن لە نموونەی هۆکارەکانی گواستنەوەی خۆتان و کەل و پەلەکانتانە لە زەویەکەوە بۆ زەویەکی ترو لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر، سەرەڕای باڵۆنی هەوایی کە بە ئاسماندا دەڕوات و ژێر دەریاییەکانیش کە لە ژێر ئاوی دەریا و زەریاکاندا دەگەڕێت و هەر دەسکردێکی تری مرۆڤ کە مایەی سەرسامی ئێوەیەو جێگەی ئەسپ و گوێدرێژ دەگرنەوە لە هەردوو بواری گواستنەوەو بەکارهێنان بۆ جوانی و ڕازاندنەوە.

پێشەوا ئیبنو عاشور(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: من وای دەبینم ئەم ئایەتە یەکێکە لە ئیعجازە زانستییە شاراوەکانی نێو قورئان و ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە خوای گەورە مرۆڤەکان ڕێنمایی دەکات و دەیانخاتە سەر ئەو ڕێگەیەی کە هۆکاری وەها دروست بکەن و بەرهەم بهێنن کە بۆ ئەوان لە گوێدرێژو هێسترو ئەسپ چاکترو گونجاوترین بۆ گواستنەوە.

هەر لەو پایسکیلەی کە کەسێك سواری دەبێت و بە قاچەکانی تایەکانی دەسوڕێنێتەوە تا دەگاتە ئۆتۆمبێل و شەمەندەفەرو تا دەگاتە فڕۆکەکان کە بۆ کارکردنیان سوود لە بەرهەمە نەوتییەکان وەرگیراوە، هەر هەموو ئەم داهێنراوانە لە سەردەمە یەك لە دوای یەکەکاندا دروست کراون و نەوەکانی پێشووتر هیچیان لەبارەوە نەزانیوە.

وە ئیلهام بەخشینی خوای گەورە بۆ مرۆڤەکان، هەر دەدرێتەوە پاڵ بەدیهێنانی خوایی و سەرەنجام داهێنانی مرۆڤەکان دیسانەوە دەچێتەوە بازنەی بەدیهێنانی خوایی.

پێشەوا شەنقیتی(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) سەبارەت بەم ئایەتە دەڵێت: [وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ] خوای گەورە لەم ئایەتەدا باس لە بەدیهێنانی هەندێ شت دەکات کە خەڵکی ئەو سەردەمە لە کاتی دابەزینی ئەم ئایەتانەدا نەیاندەزانی.

ئەو بەدیهێنراوە نوێیانە لە ئایەتەکەدا بە نەزانراوی و شاراوەیی هێڵراوەتەوەو تەنها ئاماژەکە لە بابەتی پەیوەندیداریدا هەیە «کە لێرەدا هۆکارەکانی گواستنەوەی ئەو سەردەمە بووە» واتە: بەدیهێنانە نوێیەکە لەو بوارەدا دەبێت کە بابەتی باسەکەیە.

چونکە هاوکات بوونی ئەو ئاماژەیە لەگەڵ منەت کردنی خوای گەورە بە نیعمەتەکانی هۆکارەکانی گواستنەوەی ئەو سەردەمە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو بەدیهێنراوە نوێیانە لە بواری گواستنەوەدا دەبن.

هەر ئەوەشە کە ئێمە ئێستا دەیبینین لە هاتنەدی منەتی خوای گەورە لە داهێنانی هۆکاری نوێی گواستنەوەدا و دروستکردنی سەرجەم هۆکارە نوێیەکانی وەك فڕۆکەو شەمەندەفەرو ئۆتۆمبێل و چەندین هۆکاری تر..

پێشەوا ئالوسی(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) سەبارەت بەم ئایەتە دەڵێت: [وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ] لە ڕواڵەتدا کە لەسەر شێوەی داهاتوو داڕێژراوە بەڵگەو ئاماژەی بەردەوامی و نوێبوونەوەی تێدایە.

بەرگی دووەم

پێشەوا زەرکەشی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) سەبارەت بەم ئایەتە دەڵێت: [وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ] سەبارەت بە ریزبەندی هۆکارەکانی گواستنەوەی ئەو سەردەمە کە ئەسپ و هێسترو گوێدرێژ باسکراون، دەگەڕێنێتەوە بۆ چاکی و گرنگی هەر یەکەیان کە لە باشترینەوە بۆ باشترو باش ریزکراوان بە پێی ئەو سەردەمە، بۆیە ئەسپ پێشخراوەو دواتر هێسترو دواتریش گوێدرێژ باسکراوە.

## ڕووی ئیعجاز لەم نیشانەیەی کۆتایی بونەوەر:

لە بەرهەمەکانی پێشکەوتنی زانستی لەم سەردەمە نوێیەدا، داهێنان و بەرهەمهێنانی هۆکاری پێشکەوتووی گواستنەوە بووە لە ئۆتۆمبێل و کەشتی گەورەو فڕۆکەو تەنانەت کەشتی ئاسمانیش سەرجەمیان لە چوارچێوەی هۆکاری گواستنەوەدان، لەبەر ئەوەی کۆتایی ئایەتەکە دەفەرموێ: [وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ].

بۆیە دەرکەوتن و پەیدابوون و بەدیهێنان و داهێنانی ئەم هۆکارە نوێیانەی گواستنەوە دەقاو دەق دێتەوە لەگەڵ ئەو ئاماژە قورئانیەدا کە لەو دەقەدا هاتووە، کە ئەمەش بەڵگەی حاشا هەڵنەگری ئەو ڕاستیەیە کە بێژەری ئەو ڕاستیە هەر خۆی بەدیهێنەری ئەم گەردونەیەو ئاگادارە بە سەرەتاو کۆتایی و هەموو پێشهاتەکانی گەردوون[1].

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (من اقتراب الساعة.. ركب النساء البراذين)[2].

---

(١) هذا محمد رسول الله وبراهين رسالته، د.عبدالله المصلح، لا ٣٤٩.

(٢) أخرجه أبو داود كتاب المهدي باب أول المهدي برقم (٤٢٩٠) وهو منقطع، وكنز العمال (٥٧٣/١٤) برقم: (٣٩٦٣٩).

# سەرهەڵدانی پەیوەندی خۆشەویستی لـە نێوان کوڕان و کچان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر، پەیوەندی ناشەرعی بەناوی خۆشەویستی پاك لە نێوان کوڕان و کچان سەرهەڵدەدات..

وە هەمیشە کوڕان حەز دەکەن پەیوەندیان لەگەڵ چەندین ئافرەت هەبێت بە مەبەستی ڕابواردن.. کە ئەمەش بە یەکێك لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی هەژمار دەکرێت..

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (من أشراط الساعة أن تكون المخاطبة للنساء ويخطب الصبيان على المنابر...)[١].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی قسەکردن لەگەڵ ئافرەتان سەرهەڵدەدات و، وە منداڵەکان وتاری هەینی لەسەر مینبەرەکان دەخوێننەوە..

لە ڕیوایەتێکی تر دەفەرموێ: (يأتي على الناس زمان همهم بطونهم .. وقبلتهم نساؤهم ودينهم دراهمهم ودنانيرهم أولئك شر الخلق لا خلاق لهم عند الله تعالى)[٢].

واتە: سەردەمێك بەسەر خەڵکی دێت خەمیان تەنها تێرکردنی سکیانە، وە ئافرەت دەبێتە ڕووگەیان ئەوەندە خۆشەویستی پەرەدەسەنێت.. وە دینیان دەبێتە دیرهەم و دینار، ئا ئەوانە خراپترینی خەڵکین کە هیچ بەشێکیان نییە لە لای خوای گەورە.

---

(١) الدر المنثور في التفسير بالمأثور (٦/ ٣٣).

(٢) كنز العمال( ١١ / ٥٨٢ ) فالحديث المشار إليه رواه السلمي من حديث علي كما في كنز العمال وكما في كشف الخفاء لإسماعيل العجلوني، ولم نتمكن من الوقوف على سنده كي نحكم عليه بالصحة أو الضعف فالله أعلم بحاله، ولم نقف على كلام لأهل العلم في تضعيفه أو تصحيحه. إلا أن عدم العثور عليه في غير كتاب كنز العمال يدل على ضعفه كما نص على ذلك أهل هذا الفن.

## پەیدابوونی سەرکردەی ستەمکار و یارمەتیدانیان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر کۆمەڵە سەرکردەیەك سەرهەڵدەدەن، سەروەت و سامان دەکەوێتە ژێر دەستیان..

ستەم: واتە: شتێك لە شوێنێك کە لە جێگای خۆی نیە، ئەسڵی ستەمیش واتە: بەزاندنی سنوورو ئازاردانی کەسێك جا ئەم ئازاردانە کەم بێت یان زۆر.

پێشەوا ئەبو سولالەی سولەمی (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (سَيَكُونُ عَلَيْكُمْ أَئِمَّةٌ يَمْلِكُونَ أَرْزَاقَكُمْ يُحَدِّثُونَكُمْ فَيَكْذِبُونَكُمْ وَيَعْمَلُونَ وَيُسِيئُونَ الْعَمَلَ لَا يَرْضَوْنَ مِنْكُمْ حَتَّى تُحَسِّنُوا قَبِيحَهُمْ وَتُصَدِّقُوا كَذِبَهُمْ فَأَعْطَوْهُمُ الْحَقَّ مَا رَضُوا بِهِ، فَإِذَا تَجَاوَزُوا فَمَنْ قُتِلَ عَلَى ذَلِكَ فَهُوَ شَهِيدٌ)[1].

واتە: بەم زووانە دەسەڵاتدارانێك بەسەر ئێوەدا دەسەڵاتدار دەبن کە ڕۆزی ئێوە لەدەستی ئەواندا دەبێت، ئەوانە کاتێ قسەتان لەگەڵ دەکەن درۆ دەکەن و ئەگەر کارێکیش بکەن بە گەندەڵی ئەنجامی دەدەن، ئەوانە لە ئێوە ڕازی نابن تاوەکو ئەمەی کە ستایشی پێدا هەڵگوتنی گەندەڵییەکانیان بکەن و درۆکانیان بەڕاست لە قەڵەم بدەن، ئێوە هەق بدەنە دەستیان تاوەکو بیکەنە کردار، ئەگەر ئەوان هێرشیان کردە سەرتان و کەسێك بەدەستی ئەوان کوژرانەوە شەهیدە.

پێشەوا جابری کوڕی عەبدوڵلا (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ:

(مَنْ أَرْضَى سُلْطَانًا بِسَخَطِ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ خَرَجَ مِنْ دِينِ اللهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى)[2].

---

(١) المعجم الكبير، للطبراني (٢٢/ ٣٦٢) برقم: (٩١٠).

(٢) المستدرك، (٤/ ١١٦) برقم: (٧٠٧١).

واتە: کەسێك لەبەر خاتری دەسەلاتدارێك قسەیەك بکات کە ببێتە هۆی ناڕەزایی بوونی پەروەردگاری، ئەوە لەدینی خودا چووەتە دەرەوە.

پێشەوا کەعبی کوڕی عوجرە(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ:

(..سَيَكُونُ بَعْدِي أُمَرَاءُ فَمَنْ دَخَلَ عَلَيْهِمْ فَصَدَّقَهُمْ بِكَذِبِهِمْ وَأَعَانَهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ فَلَيْسَ مِنِّي وَلَسْتُ مِنْهُ وَلَيْسَ بِوَارِدٍ عَلَيَّ الحَوْضَ..)[1].

واتە: لە دوای من کاربەدەستانێکتان دەبێت، هەر کەسێك بچێتە لایان و درۆکانیان بەڕاست بزانێت و پشتیوانی ستەمەکانیان بکات ئەو کەسە لە من نیەو منیش لەو کەسە نیم، وە نایەتە لام بۆ سەر حەوزی کەوسەر.

پێشەوا ئیبنو عەبباس(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ:

(يَكُونُ عَلَيْكُمْ أُمَرَاءُ هُمْ شَرٌّ عِنْدَ اللَّهِ مِنَ الْمَجُوسِ)[2].

واتە: کاربەدەستانێك دێنە سەرتان و حوکم دەکەن لەسەرتان کە لەکافری مەجوس خراپترن.

پێشەوا ئەبو قەبیل لە موعاویەی کوری ئەبو سوفیانەوە دەگێڕێتەوە کە جارێکیان لە ڕۆژی هەینی پێشەوا موعاویە(ﷺ) سەر دەکەوێتە سەر مینبەر بۆ تاقیکردنەوەی موسڵمانان لەناو وتارەکەدا دەڵێت: سامان سامانی خۆمانەو دەست کەوتیش دەست کەوتی خۆمانە بە هەرکەسمان ویست دەیدەنێ و لە هەرکەسیشمان ویست قەدەغەی دەکەین، ئەمەی گوت و هیچ کەس وەڵامی نەدایەوە، بۆ هەینی داهاتوو ووتەکەی دووبارە کردەوەو هیچ کەس وەڵامی نەدایەوە، کە هەینی سێهەم هات بە هەمان شێوە ووتەکەی دووبارە کردەوە، کە لێی بوویەوە لەناو مزگەوتدا

---

(١) سنن الترمذي (٤/ ٩٥) برقم: (٢٢٥٩)، وقال الإمام الترمذي: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

(٢) رواه الطبراني في (المعجم الصغير) (٢/ ١٩٦) برقم: (١٠١٨).

بەرگی دووەم

یەکێك لە نوێژکاران هەڵسایە سەر پێ و وەڵامی دایەو گوتی: نەخێر.. سامان سامانی خۆمانەو دەست کەوتیش دەست کەوتی خۆمانە، هەر کەسێ لێمانی دابڕ بکات ئەوا بە شمشێرەکانمان دەیبەینە بەر دادگایی خوا!

پێشەوا موعاویە(ﷺ) لەسەر مینبەر دابەزی و ناردی بە دوای کابراداو بردیانە ژوورەوە.. لای خەڵکەکە وەها بوو ئەو وەڵامەی کابرا یەکجار دڵی خەلیفەی نارەحەت کردووە، بۆیە هەموو کەسێك لە ئاستی خۆیەوە ڕای وابوو کە کابرا تیاچوو!! پاشان خەڵکی چوونە ژوورەوە لای خەلیفە دەبینن وا پیاوەکە لەسەر قەرەوێلەیەکە لەگەڵ خەلیفەدا دانیشتووە، پێشەوا موعاویە(ﷺ) سەرنجیدا خەڵکەکە سەریان سوڕ دەمێنێ، خێرا بەر لەوەی کە ئەوان پرسیار بکەن خۆی فەرموی: ئەم پیاوە منی ڕزگار کرد، خوا ڕزگاری بکات ، گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بووە کە فەرمویەتی:

(سَيَكُونُ بَعْدِي أَئِمَّةٌ، يَقُولُونَ عَلَى مَنَابِرِهِمْ فَلَا يُرِدُ عَلَيْهِمْ قَوْلُهُمْ، يَتَقَاحَمُونَ فِي النَّارِ كَمَا يَتَقَاحَمُ الْقِرَدَةُ) [1].

واتە: دوای من کار بەدەستانێك دێن هەر قسەیەك بکەن، وەڵامیان نادرێتەوە، واتە: کەس ناوێری ڕای راست بەرامبەر بەو ڕا خوارەی ئەوان دەربڕێ، ئەوانە وەك مەیمون فڕێ دەدرێنە ناو ئاگرەوە، جا من جومعەی یەکەم کە قسەم کردو هیچ کەس وەڵامی نەدامەوە ترسام من یەکێك بم لەوانە، پاشان کە جومعەی دووەم باسەکەم کردەوەو هیچ کەس وەڵامی نەدامەوە، لە دڵی خۆمدا گوتم: من لەوانم، جا کە لە جومعەی سێهەم باسەکەم کردەوە، ئەم پیاوە هەستا وەڵامی دامەوە، ڕزگاری کردم خوا ڕزگاری بکات.

چونکە هەندێك لەم فەرمانڕەوایانە بە ئارەزوو ڕابواردن دەغافڵێن و ئاگایان لە کاروباری موسڵمانان نامێنێ، هەندێکیشیان هەق ناناسن، بۆیە خەڵکی بەرەو کاری نەشیا و هەڵدەنێن و بیدعەو خراپەکاریان تێدا بڵاودەکەنەوە.

---

(١) مسند أبي يعلى (١٣/ ٣٧٣) برقم: (٧٣٨٢). وقال محققه: إسناده صحيح.

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (سَتَكُونُ أُمَرَاءُ فَتَعْرِفُونَ وَتُنْكِرُونَ، فَمَنْ عَرَفَ بَرِئَ، وَمَنْ أَنْكَرَ سَلِمَ، وَلَكِنْ مَنْ رَضِيَ وَتَابَعَ)[١].

واتە: فەرماندەی وا پەیدا دەبن کاری چاك و کاری خراپیان لێ دەبینن، جا ئەوەی ڕقی لە کارە خراپەکان بویەوە ساغ دەبێ، ئەوەی بەر هەڵستی بکات سەلامەت دەبێ، بەڵام ئەوەی پێی ڕازی بێ و شوێنکەوتە بێ ساغ دەرناچێ.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمودەیەکی ترمان بۆ باس دەکات و دەفەرموێ: (سَتَكُونُ بَعْدِي هَنَاتٌ وَهَنَاتٌ، فَمَنْ رَأَيْتُمُوهُ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ، فَكَأَنَّمَا فَارَقَ بَيْنَ أُمَّتِي، فَاقْتُلُوهُ كَائِنًا مَنْ كَانَ، فَإِنَّ يَدَ اللهِ مَعَ الْجَمَاعَةِ، وَإِنَّ الشَّيْطَانَ مَعَ مُفَارَقَةِ الْجَمَاعَةِ يَرْكُضُ)[٢].

واتە: لە پاشە من خراپەکاری ڕوودەدات، هەرکەسێکیشتان دیت لە کۆمەڵ جودا بۆتەوە، یا دەیەوێ کاروباری ئوممەتی موحەممەد(ﷺ) پەرتەوازە بکات، هەرکێ بوو بیکوژن، چونکە دەستی خودا لەگەل کۆمەڵ دایە، وە شەیتانیش لەگەڵ ئەو کەسەی لە کۆمەڵ جودا دەبێتەوە ڕادەکات.

ئەم فەرموودانەو چەندین فەرموودەی تری لەم جۆرە بەو پەڕی ڕاستگۆیی تەعبیر لە واقیعی ئەمڕۆی موسڵمانان دەکات لە سەرانسەری جیهان، کە چۆن گرفتار بوون بە دەست کۆمەڵە سەرکردەو دەسەڵاتدارێکەوە باوەڕو لە خواترسان لە دڵیاندا نیە تا لە ستەم بیانگێڕێتەوە.

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مِنِ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ خَصْلَةً: إِذَا رَأَيْتُمُ النَّاسَ..وَاتُّخِذَ الظُّلْمُ فَخْرًا)[٣].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر حەفتاو دوو تایبەتمەندە: هەر خەڵکانێکتان بینی... شانازیان بەستەم کردنەوە کرد.

---

(١) صحيح مسلم (٣/ ١٤٨٠) باب: وجوب الإنكار على الأمراء، برقم: (١٨٥٤).

(٢) شعب الإيمان (١٠/ ١٨) برقم: (٧١٠٦).

(٣) ضعيف: حلية الأولياء (٣/ ٤١٠)، (٤٥٥٥). وهو ضعيف كما قال الحافظ العراقي ( ٣/٢٩٧).

ئەمڕۆ شانازیکردن بەستەم بووەتە دیاردەیەکی ئاسایی لەلایەن کەسانی کەم باوەڕەوە.

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت: (یکون علیکم أمراء یعذبونکم ویعذبهم الله )[1].

واتە: سەرکردەی وا دەسەڵات دەگرێتە دەست ئازارتان دەدەن و ئازاری خوای گەورەش دەدەن.

پێشەوا جابری کوڕی عەبدوڵلا (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: (اتَّقُوا الظُّلْمَ، فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَاتَّقُوا الشُّحَّ، فَإِنَّ الشُّحَّ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، حَمَلَهُمْ عَلَى أَنْ سَفَكُوا دِمَاءَهُمْ وَاسْتَحَلُّوا مَحَارِمَهُمْ)[2].

واتە: خۆتان دوورخەنەوە لە ستەم، چونکە ستەم تاریکاییە لە ڕۆژی دوایی، وە خۆتان دوورخەنەوە لە ڕەزیلی لەبەر ئەوەی ڕەزیلی گەلانی پێش ئێوەی بە هیلاك برد، کە وای لێکردن خوێن بە ناهەق برێژن و قەدەغە کراوەکانی خوا حەڵاڵ بکەن لە دژی یەکتر.

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ( لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى.. يظهر البغي)[3].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت.. هەتا ستەمکردن سەرهەڵدەدات و منداڵی زینا زۆر دەبێت..

---

(١) صحيح: رواه الحاكم في المستدرك (٤/ ٥٥٠) برقم: (٨٥٣٩) وقال: صحيح الإسناد ولم يخرجاه، ووافقه الذهبي.

(٢) صحيح مسلم (٤/ ١٩٩٦) باب: تحريم الظلم، برقم: (٢٥٧٨).

(٣) ضعيف:أخرجه ابن عساكر في تاريخ دمشق(٤٥٣/٧) وقال الألباني في السلسلة الضعيفة: ضعيف.

هەر چەندە زانایانی فەرمووده ناس دەفەرموون: ئەم فەرمووده بێ هێزە.. بەڵام لە واتادا زۆر واقیعیە، چونکە لەم سەردەمە ستەمکردن زۆر بە ئاشکرا ئەنجام دەدرێت..

ستەمکردن بە هەموو شێوەو شێوازێك حەرام و قەدەغە کراوە.. بۆیە خوای پەروەردگار لە فەرموودەیەکی قودسی فەرموویەتی: ئەی بەندەکانم من ستەمم لەسە خۆم حەرامکردووە لە نێو ئێوەشدا حەرامم کردووە، بە هیچ شێوەیەك ستەم لە یەکتری نەکەن.

ستەمکاران هەر لە دونیا تۆڵەیان لێ دەسەنرێتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: خۆتان لە سزای ستەملێکراوان بپارێزن، چونکە لە نێوان خوای گەورەو نزای ستەملێکراو پەردەیەك نییە.

ئەگەرچی سزای ستەمکار دواش بکەوێت، بەڵام هەقی ستەم لێکراو هەر ئەسەنرێتەوە، بۆیە خوای گەورە لە دونیا سزای ستەمکاران دەدات، بەڵام جاری وا هەیە دوا دەکەوێت لەبەر حیکمەتێك لە حیکمەتەکانی خوای گەورە لە گوناهەکانی ستەم لێکراو خۆش دەبێت..

زۆر جاران خەڵکی لە نێو خۆیاندا ستەم لە یەکتری دەکەن، وە خوای گەورە هەرگیز ستەمکاران سەرکەوتوو ناکات.. سەرکەوتن تەنها بۆ ئەو کەسانەیە کە دادوەرن و دادگەری بەرپا دەکەن.. بە مەرجێك دادگەران شوێنکەوتەی بەرنامەو پەیامی پێغەمبەران بن (سەلامی خوایان لەسەر).

# بەرپرسەکان نوێژەکانیان لە کاتی خۆیدا ئەنجام نادەن

لە نیشانەکانی نزیکبووەنەوەی کۆتایی بونەوەر کۆمەڵە سەرکردەیەك پەیدا دەبن لەبەر ئیش و کاری ڕۆژانەیان نوێژ لە کاتی خۆیدا ناکەن و دوای دەخەن..

پێشەوا عوبادەی کوری صامت(ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (سَتَكُونُ أُمَرَاءُ تَشْغَلُهُمْ أَشْيَاءُ يُؤَخِّرُونَ الصَّلاَةَ عَنْ وَقْتِهَا فَصَلُّوا الصَّلاَةَ لِوَقْتِهَا ، وَاجْعَلُوا صَلاَتَكُمْ مَعَهُمْ تَطَوُّعًا)[1].

واتە: هەندێك فەرماندە دێن شتانێك خەریکیان دەکات، نوێژەکانیان لە کاتی خۆیدا ناکەن، جا ئێوە نوێژەکانی خۆتان لەگەڵ ئەواندا بکەنە نوێژی سوننەت.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمودەیەکی ترمان بۆ باس دەکات و دەفەرموێ:

(سَيَكُونُ عَلَيْكُمْ أُمَرَاءُ يُؤَخِّرُونَ الصَّلاَةَ عَنْ مَوَاقِيتِهَا

وَيُحْدِثُونَ الْبِدَعَ، قَالَ: فَكَيْفَ أَصْنَعُ إِنْ أَدْرَكْتُهُمْ ؟

قَالَ: تَسْأَلُنِي ابْنَ أُمِّ عَبْدٍ كَيْفَ تَصْنَعُ ؟ لاَ طَاعَةَ لِمَنْ عَصَى اللَّهَ)[2].

واتە: فەرماندەی وا دێنە سەرتان نوێژ لە کاتی خۆی دوا دەخەن و بیدعە دەنێنەوە

ئیبنو مەسعود گوتی: جا چی بکەم ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟

فەرمووی: دەپرسی چ بکەم؟

---

(١) مسند الإمام أحمد (٣٧/ ٣٥٦) برقم: (٢٢٦٨١). وقال شعيب الأرنؤوط : صحيح لغيره..

(٢) المعجم الكبير (١٠/ ١٧٣) برقم: (١٠٣٨٣).

گوێڕایەڵی بۆ کەسێك نیە لە خودا یاخی بێت.

پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی نەداوە لە ژێر فەرمانی فەرمان ڕەوایی گوناهکار دەربچین، چونکە ڕەنگە ئاشوب و خوێن ڕشتنی زۆری لیّ بکەوێتەوە، ئەمەش لە حاڵەتێکدا ئەو فەرمان ڕەوایانە بە شێوەیەکی گشتی شەرعی خودایان وەرگرتبیّ.

لە ڕیوایەتی پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:

(سَيَلِي أُمُورَكُمْ بَعْدِي

رِجَالٌ يُطْفِئُونَ السُّنَّةَ، وَيَعْمَلُونَ بِالْبِدْعَةِ

وَيُؤَخِّرُونَ الصَّلَاةَ عَنْ مَوَاقِيتِهَا

فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ أَدْرَكْتُهُمْ، كَيْفَ أَفْعَلُ؟ قَالَ: تَسْأَلُنِي يَا ابْنَ أُمِّ عَبْدٍ كَيْفَ تَفْعَلُ؟ لَا طَاعَةَ، لِمَنْ عَصَى اللَّهَ)[1].

واتە: لە دوای من کاروبارتان دەکەوێتە دەست کەسانێك

پیاوانێك دەیانەوێت سوننەت بکوژێننەوەو کار بە بیدعە دەکەن

نوێژ لە کاتەکانی خۆیان دوا دەخەن

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر گەیشتم بەم جۆرە کەسانە چی بکەم؟ فەرمووی:

پرسیارم لیّ دەکەیت کە چی بکەم ئەی کوڕی دایکی عەبد؟ گوێڕایەڵی کەسێك مەبە کە سەرپێچی خوای گەورە دەکات..

---

(١) صحيح: سنن ابن ماجة (٤/ ١٢٣) باب: لا طاعة في معصية الله، (برقم): (٢٨٢٦). قال الشيخ الأرناؤوط: إسناده حسن.

# فرەوانبوونی شاری مەدینە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی شاری مەدینە ئەوەندە گەورە دەبێت هەتا دەگاتە ئیهاب...

پێشەوا ئەبو هوڕەیرە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لا تقوم الساعة حتى تبلغ المساكن إيهاب)[1].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا شاری مەدینە ئەوەندە فرەوان دەبێت و دانیشتوانەکەی دەگاتە ئیهاب.

(ئیهاب یەهاب) ناوێکە لە نزیك شاری مەدینە، واتە شاری مەدینە ئەوەندە فراوان دەبێت هەتا دەگاتە (یەهاب).

ئیهاب یان بیری حەڕڕە ئەو بیرە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) تفی موبارەکی خستە ناویەوە لە شاری مەدینە..

بیری ئیهاب (٥ ٧) کیلۆمەتر لە ڕۆژهەڵاتی مەدینەوە دوورە لەسەر ڕێگای ریازە..

لە ئێستاشدا شاری مەدینە ئەوەندە فرەوان بووە..

تەنانەت بە تەواوەتی گەیشتۆتە ئیهاب.. پاکو بێگەردی بۆ خوای گەورە کە چۆن نیشانەکان هاتونەتە دی.

بەڕاستی ئەم فەرمودەیە گەورەترین موعجیزەمان نیشان دەدات کە لەم سەردەمەدا بە چاوەکانی خۆمان دەیانبینین.

---

(١) صحيح مسلم، كتاب: الفتن وأشراط الساعة، باب: إخبار النبي(ﷺ) فيما يكون إلى قيام الساعة (8/ 172).

بەشی دووەم

## دروستکردنی باڵەخانەی گەورە
## لە (ذوالحلیفة)

لە نیشانەکانی نزیکبونەوەی کۆتایی بونەوەر لە شاری مەدینەوە هەتا دەگاتە (ذوالحلیفە) هەمووی دەبێتە باڵەخانە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لا تقوم الساعة حتى يبلغ البناء شجرة ذي الحليفة)[1]..

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا باڵەخانەکان دەگاتە داری (ذوالحلیفە).

لە ئێستاشدا شاری مەدینە ئەوەندە بووەتە باڵەخانە.. تەنانەت گەیشتۆتە (ذوالحلیفە) پاکو بێگەردی بۆ خوای گەورە کە چۆن نیشانەکان هاتونەتە دی.

(ذوالحلیفە): یەکێکە لەو میقاتانەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دیاریکردووە بۆ خەڵکی مەدینە.

هەر چەندە لە ئێستادا بە (ذوالحلیفە) دەگوترێت: (ئەبیار عەلی) بەڵام ئەو ناوە هەڵەیەو لە بەسەرهاتێکی بێ بنەما سەرچاوەی گرتووە، کە گوایە پێشەوا عەلی (ﷺ) لە بیرێك لەو ناوچەدا بەو ناوە شەڕی لەگەڵ جنۆکە کردووە.

ئەی ڕاستیەکەی (ئەبیار عەلی) چییە؟

ئەم ناوە نیسبەت دەدرێت بۆ عەلی کوڕی دینار کاتێك هاتە حەج لە ساڵی ١٨٩٨ ع حاجیەکانی لە میقات بینی بارو زروفیان لەوپەڕی خراپی بوو، هەستا چەند بیرێکی لێدا بۆ ئەوەی لە ئاوەکەی بخۆنەوەو مزگەوتێکی دروست کرد بەناوی مزگەوتی: (ذوالحلیفە).

دەزانیت عەلی کوڕی دینار کێ بوو؟ سوڵتانی دارفۆڕ بوو.

---

(١) رواه الامام أحمد (٢/ ٤٠٢).. حديث مرفوع

## بەرزبوونەوەی مارەیی ئافرەتان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر کە لە نێو خەڵکی بەربڵاوبۆتەوە لەم سەردەمەدا زۆری مارەیی ئافرەتانە..

هەر چەندە مارەیی زۆر بێت لە شەرعدا ڕێگە پێدراوەو کێشەی تێدا نیە، بەڵام مارەیی سوك بەرەکەتی زیاتر تیایدا بەدی دەکرێت..

بۆیەش لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مارەیی ئەوەندە زۆر نەبوو، تا گەنج نەتوانێت ژیانی هاوسەری پێك بهێنێت.. بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم بەرزبوونەوەی مارەیی بە یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر هەژمار کردووە.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری مەسعود(ﷺ) دەفەرمویٚ: (إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ .. أَنْ تَغْلُوَ مُهُورُ النِّسَاء.. ثُمَّ تَرْخُصَ فَلا تَغْلُو إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ)[1].

واتە لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر ... مارەیی ئافرەتان بەرز دەبێتەوە.. دواتر ئاسایی و هەرزان دەبێتەوە ئەو کات بەرز نابێتەوە تا ڕۆژی دوایی.

ئەگەر سەیری حاڵی ئەمڕۆی خۆمان و گەنجان بکەین بەڕاستی لەبەر زۆری مارەیی ڕێژەی هاوسەرگیری زۆر کەم بۆتەوە، زۆر جار ئافرەتان بە کەمی مارەیی ڕازین، بەڵام باوك و مام و خاڵ و ... هتد، دەبنە سەرپەرشتیاری کچەی و لێی ناگەڕێن.. بۆیە ئەگەر ڕێژەی مارەییش زۆر بوو گەنج توانای ژن هێنانی نابیٚ، ئەو کات قەیرەیی لە نێوان هەردوو ڕەگەز سەر هەڵدەدات و داوێنپیسی زۆر دەبێت و سەیرکردنی فیلمی بیٚ ئابڕۆ دەبێتە شتێکی ئاسایی (خوا پەنامان بدات).

ئوم حەبیبەی کچی ئەبو سوفیان لە زەینەبی کچی جەحش (ڕەزای خوایان لێبێت) دەگێڕێتەوە کە جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) ربە ترسەوە هاتە ژوورەوە بۆ لای

---

(١) مسند أبي داود، بە ژمارە (٣٨٩).

و فەرمووی: (وَيْلٌ لِلْعَرَبِ مِنْ شَرٍّ قَدِ اقْتَرَبَ، فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مِثْلُ هَذَا، وَحَلَّقَ إِبْهَامَهُ بِالَّتِي تَلِيهَا، قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟ قَالَ: نَعَمْ، إِذَا كَثُرَ الْخَبَثُ)[1].

واتە: خاك بەسەر عەرەب لەو ڕوداوە خراپەی کە نزیك بۆتەوە، ئەمڕۆ بەربەستەکەی یەئجوج و مەئجوج هێندەی ئەمە کراوەتەوە(بەسەر هەردوو پەنجە گەورەو پەنجەی شایەتمانی بازنەیەکی دروست کرد، زەینەبی کچی جەحش (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا لەناو دەچین لە کاتێکدا کە پیاوانی چاکمان لەناو دابێت، فەرموی: بەڵێ ئەگەر داوێن پیسی زۆربوو.

ئێستاش بە چاوی خۆمان دەبینین کە:

• خراپە زۆر بووە.
• تاوان زۆر بووە.
• زیناو داوێن پیسی زۆر بووە.
• مەشروب خواردنەوە زۆر بووە.
• ریبا خواردن زۆر بووە.
• ریشوە خواردن زۆر بووە.
• سفوری ئافرەتان زۆر بووە.
• دزی و زوڵم و گەندەڵی زۆر بووە.

دوای ئەوەی مارەییەکان ئاسانکاری بۆ دەکرێت تا ڕۆژی دوایی، لەوانەیە بۆ سێ هۆکار بگەڕێتەوە:

یەکەم: خەڵکی بگەڕێنەوە ژێر ڕێنماییەکانی ئیسلام و ئاسانکاری بۆ گەنجان بکرێت.

دووەم: لەوانەیە خەڵکێکی زۆر دەوڵەمەند ببنەوە.

سێیەم: ماڵ ئەوەندە زۆر دەبێت کە لە چاو دوێنێی مارەیی ئەمڕۆ زۆر کەمترە.

---

(١) صحيح البخاري (١٣/ ١٠٦) كتاب الفتن، باب يأجوج ومأجوج، برقم: (٣٥٩٧).

بەرگی دووەم

# نەمانی چیاکان لە شوێنی خۆیان

پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی ئەوەی پێ ڕاگەیاندووین کە یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر نەمانی چیاکانە لە شوێنەکانی خۆیان، ئیتر ئەوەیان نەمانێکی ڕاستەقینەیە وەکو ڕۆچوون و بە کاریگەری هەورە تریشقە، یان بە کرداری ئادەمیزادەکانە، بەهۆی زۆری باڵەخانە دروست کردن و تەختکردنی چیاکان، وەکو لەم سەردەمەی خۆمان لە زۆرێك لە وڵاتان ڕوودەدات.. یان بەهۆی داڕوخانی شاخەکان و زۆربوونی هاڕەکردنی تاوێرەکان، کە چەندین جار ڕوویانداوە.

پێشەوا سەمورە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَزُولَ الْجِبَالُ عَنْ أَمَاكِنِهَا..)[١].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت تاکو چیاکان لە شوێنەکانی خۆیان نەجولێنەوە.

شێخ محەممەد ڕەسول بەرزنجی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

لە ساڵی (٢٤٢)ی کۆچی لەسەردەمی خیلافەی (متەوەکیل) چیایەك کەوتە نێو باخ و باخاتی خەڵکی..

وە لە ساڵی (٣٠٠)ی کۆچی چیای بەدینور ڕووخا، هەتا ئاوێکی ئەوەندە زۆری لێ هەڵقولا چەندین گوند تیایدا نقوم بوون[٢].

بەندە ڕای وایە لەم سەردەمە ئەم نیشانەیەی کۆتایی بونەوەر زۆر زۆر ڕاشکاوانە بەدی دەکرێت والله اعلم.

---

(١) صحيح: المعجم الكبير، للطبراني (٧/ ٢٠٧) برقم: (٦٨٥٧) وصححه الألباني في (السلسلة الصحيحة)، برقم: (٣٠٦١).

(٢) الإشاعة لأشراط الساعة، (لا ٨٨).

# پەیدابوونی پاپۆڕو قیتار

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر پەیدابوونی پاپۆڕو قیتارە، ئەمەش لە چەندین فەرموودەی پێغەمبەری پێشەوا ئاماژەی پێکراوە.

پێشەوا سەمورە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى .. َتَرَوْنَ الْأُمُورَ الْعِظَامَ الَّتِي لَمْ تَكُونُوا تَرَوْنَهَا)[١].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت تاکو.. کارەساتگەلێکی گەورە نەبینن کە پێشتر نەتانبینیبوو.

زانایانی سەردەم دەفەرموون:

کارەساتگەلێك بە واتای پاپۆڕ دێت کە پێویستە مرۆڤ یادی خوای گەورە بکات و لە بیری بێت..

لە فەرموودەیەکی تر فەرمویەتی: (سترون قبل أن تقوم الساعة أشياء .. فإذا رأيتم ذلك فاذكروا الله تعالى واعلموا أنها أوائل الساعة)[٢].

واتە: لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی کارەساتگەلێکی گەورە دەبینن، هەر کاتێك بینیتان ئەوا یادی خوای گەورە بکەن و بزانن ئەوە دەستپێکی هاتنی ڕۆژی دواییە.

تێبینی: بەشێك لە زانایانی فەرموودەناسی سەردەم ئەم فەرموودەیان بە پاپۆڕ لێکداوەتەوە.

---

(١) صحيح: المعجم الكبير، للطبراني (٧/ ٢٠٧) برقم: (٦٨٥٧) وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة، برقم: (٣٠٦١).

(٢) رواه الطبراني والبزار من حديث سمرة .

## بەردبارانکردن و سەرهەڵدانی بورکان

ئەم ئوممەتە دووچاری گەلێك بەڵا دێت لە نغۆربون و بەردباران و بە سەگساربون، ئەمەش بە هۆی گوناهکاری و تاوان و یاخیبونی ئاشکرا، وەك مەی خواردنەوەو ئاوریشم پۆشینی پیاوان و داوێن پیسی و سووخۆری و گەندەڵی وا کە دەگاتە ڕادەی حەڵاڵ کردنی حەرام.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (يَكُونُ فِي أُمَّتِي خَسْفٌ وَمَسْخٌ وَقَذْفٌ)[1].

واتە: سەردەمانێك بەسەر ئوممەتم دێت ڕۆچوون و بوون بە سەگسارو بەردباران کردن و سەرهەڵدانی بورکان ڕوودەدات.

پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ مَسْخٌ، وَخَسْفٌ، وَقَذْفٌ)[2].

واتە: لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ڕۆچون و بوون بە سەگسارو بەردباران و سەرهەڵدانی بورکانە.

دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (يَكُونُ فِي آخِرِ هَذِهِ الأُمَّةِ خَسْفٌ وَقَذْفٌ، قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟ قَالَ: نَعَمْ إِذَا ظَهَرَ الخُبْثُ)[3].

---

(١) سنن الترمذي، (٤/ ٤٥٦) كتاب: الفتن، باب: بعد ما جاء في أشراط الساعة، برقم: (٢١٥٣). وقال الإمام الترمذي: وَهَذَا الْحَدِيثُ لَا نَعْلَمُهُ يُرْوَى عَنْ عَبْدِ اللَّهِ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) إِلَّا بِهَذَا الْإِسْنَادِ.

(٢) سنن ابن ماجة (٥/ ١٨١) باب: الخسوف، برقم: (٤٠٥٩) وقال شعيب الأرناؤوط: حسن لغيره، وهذا إسناد رجاله ثقات.

(٣) سنن الترمذي (٤/ ٤٩) باب: ما جاء في الخسف، برقم: (٢١٨٥). قال الإمام الترمذي: هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ.

واتە: ڕووداوێك ڕوودەدات لە كۆتایی ئومەتەكەم ئەویش

ڕۆچوون بە ناخی زەوی و

بە سەگسارکردنەوەو

بەردباران کردنە

دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت:

گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئێمە لە ناو دەچین ئەگەر پیاوی باشمان لەناودا بێت

فەرمووی: بەڵێ ئەگەر پیسی زۆر بوو.

(خەسف) واتە: رۆچوون.

(مەسخ) واتە: بەسەگسارکردن.

(قەذف) واتە: بەردباران کردن.. یان هەڵدانی بورکان لە ژێر قوڵایی زەویەوە..

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەڵێت:

جارێکیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەرباری شاری (بەسره) قسەی بۆ دەکردم و فەرمووی:

(يَا أَنَسُ

إِنَّ النَّاسَ يُمَصِّرُونَ أَمْصَارًا، وَإِنَّ مِصْرًا مِنْهَا يُقَالُ لَهُ: الْبَصْرَةُ - أَوِ الْبُصَيْرَةُ -

فَإِنْ أَنْتَ مَرَرْتَ بِهَا، أَوْ دَخَلْتَهَا، فَإِيَّاكَ وَسِبَاخَهَا، وَكِلَاءَهَا، وَسُوقَهَا، وَبَابَ أُمَرَائِهَا، وَعَلَيْكَ بِضَوَاحِيهَا

فَإِنَّهُ يَكُونُ بِهَا خَسْفٌ وَقَذْفٌ وَرَجْفٌ، وَقَوْمٌ يَبِيتُونَ يُصْبِحُونَ قِرَدَةً وَخَنَازِيرَ)[1].

---

(١) سنن أبي داود (٤/ ١١٣) باب: في ذكر البصرة، قال الألباني حديث صحيح، برقم: (٤٣٠٧).

واتە: ئەی ئەنەس !

خەڵکی شار دروست دەکەن و ئاوەدانی دەکەنەوە

شارێك هەیە پێی دەگوترێ بەسرە

ئەگەر هاتوو تیایدا تێپەڕ بوویت یا چویتە ناوی ئاگاداربە نزیك زەوی ڕووت و لە وەرگاو دارخورماو بازاڕو دەرگای بەرپرسەکان نەبیتەوەو نەچیتە ناوی

هەر لە قەراغ شارەکە بمێنەرەوە، چونکە ئەو شارە دوو چاری ڕۆچوون و ئاگر باران و زرمەو ناڵەو ڕاتەکاندن دەبێت

وە کەسانێکی تێدا دەبێت شەو کە دەخەون بەیانی لە خەو هەڵدەستن بوون بە مەیمون و بەراز.

شێخ محەممەد ڕەسول بەرزنجی (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت:

• لە ساڵی (٢٨٥)ی کۆچی لە گوندێکی بەصرە بارانێکی زۆر باری، لەگەڵ بارانەکە بەردی سپی و ڕەشی لەگەڵ بوو.. وەزنی بەردەکەش سەرو پەنجا دیرهەم بوو..

• لە ساڵی (٢٤٢)ی کۆچی لە گوندی سوەیدا بەرد باری لە ئاسمان..

• لە ساڵی (٤٧٨)ی کۆچی قوم و خۆڵ باری..

• لە ساڵی (١٠٦٠)ی کۆچی لەگەڵ باران بارین بەردی ڕەش لەگەڵی دەباری کە بە ئەندازەی هێلکەیەك بوو..

• لە ساڵی (٧٤١)ی کۆچی کۆمەڵێك لە دڕندەو مار و دووپشك دەباری[1].

لێرەدا ئەوەمان بۆ بەدەردەکەوێت کە هەمیشە موعجیزەکانی فەرموودە ئەوە دەسەلمێنن کە هیچ شتێك بە ئەندازەی هاتنی ڕۆژی دوایی نزیك نییە.

---

(١) الإشاعة لإشراط الساعة، لا ٩٠.

## بە سەگسارکردنی بەشێکی ئەم ئوممەتە

یەکێك لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی بە سەگسارکردنەوەی کۆمەڵانێکی ئەم ئوممەتەیە کە خوای گەورە تووشی سزای کردوون.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمویٚ: (يَكُونُ فِي أُمَّتِي خَسْفٌ وَمَسْخٌ وَقَذْفٌ)[1].

واتە: سەردەمانێك بەسەر ئومەتم دێت ڕۆچوون و بوون بە سەگسارو بەردباران و سەرهەڵدانی بورکان ڕوودەدات.

پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمویٚ: (بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ مَسْخٌ، وَخَسْفٌ، وَقَذْفٌ)[2].

واتە: لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ڕۆچون و بوون بە سەگسارو بەردباران و سەرهەڵدانی بورکانە..

دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمویٚ: (يَكُونُ فِي آخِرِ هَذِهِ الأُمَّةِ خَسْفٌ وَمَسْخٌ وَقَذْفٌ، قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟ قَالَ: نَعَمْ إِذَا ظَهَرَ الخُبْثُ)[3].

واتە: ڕووداوێك ڕوودەدات لە کۆتایی ئومەتەکەم ئەویش ڕۆچوون بە ناخی زەوی و بە سەگسارکردنەوەو بەردباران کردنە، عائیشە دەڵێت: گوتم: ئەی

---

(١) سنن الترمذي، (٤/ ٤٥٦) كتاب: الفتن، باب: بعد ما جاء في أشراط الساعة، برقم: (٢١٥٣). وقال الإمام الترمذي: وَهَذَا الْحَدِيثُ لَا نَعْلَمُهُ يُرْوَى عَنْ عَبْدِ اللَّهِ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) إِلَّا بِهَذَا الْإِسْنَادِ.

(٢) سنن ابن ماجة (٥/ ١٨١) باب: الخسوف، برقم: (٤٠٥٩) وقال شعيب الأرناؤوط: حسن لغيره، وهذا إسناد رجاله ثقات.

(٣) سنن الترمذي، (٤/ ٤٥٦) كتاب: الفتن، باب: بعد ما جاء في أشراط الساعة، برقم: (٢١٥٣). وقال الإمام الترمذي: وَهَذَا الْحَدِيثُ لَا نَعْلَمُهُ يُرْوَى عَنْ عَبْدِ اللَّهِ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) إِلَّا بِهَذَا الْإِسْنَادِ.

پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئێمە لە ناو دەچین ئەگەر پیاو باشان لەناودا بێت، فەرمووی: بەڵێ ئەگەر پیسی زۆر بوو.

بە دڵنیایی تاوان و خراپە هۆكارێكی سەرەكین بۆ دابەزینی سزاو عقوبەی خوای گەورە، و هەر كاتێكیش تاوان و خراپەو زینا و داوێنپیسی زۆر بوو خوای گەورە خەڵكی لەناو دەبات.

جا ئەگەر تەوبە نەكەین و خۆمان و ماڵ و منداڵمان چاك نەكەین ئەوا خەشم و قینی خوای گەورە دادەبارێتە سەرمان و ئەو كات هیچ گەڕانەوەیەكی بۆ نییە.. وە دەسەڵاتی خوای گەورە كە هات هیچ كەسێ هیچ دەسەڵاتێ بەرگەی ناگرێت.

پێشەوا ئەبو ئومامە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لَيَبِيتَنَّ أَقْوَامٌ مِنْ أُمَّتِي عَلَى أَكْلٍ وَلَهْوٍ وَلَعِبٍ، ثُمَّ لَيُصْبِحُنَّ قِرَدَةً وَخَنَازِيرَ)[١].

واتە: كۆمەڵانێك لەم ئوممەتە لەسەر خواردن و خواردنەوەو ڕابواردن بەسەر دەبەن، كاتێ بەیانی دادێت هەموویان بوونەتە سەگسار وەكو مەیمون و بەراز.

لەوانەیە پێمان سەیر بێت كە باسی گۆڕانكاری ڕووخسارو شكل و شێوە دەكەین، بەڵام بزانە هیچ شتێك لای خوای پەروەردگار ئەستەم نییە، ئەمەش بۆ پەند وەرگرتن و ئامۆژگاری..

جا ڕووخسار گۆڕان جار وایە هەر بەڕاستی ڕووخسار دەگۆڕدرێ جاری واش هەیە لە واتادا دەبێ:

دەربارەی گۆڕانگاری ڕووخساری جولەكەكان خوای گەورە دەفەرموێ: [وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ الَّذِينَ اعْتَدَوْا مِنكُمْ فِي السَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ ﴿٦٥﴾][٢].

---

(١) المعجم الكبير، (٨/ ٢٥٨) برقم: (٧٩٩٧).

(٢) سورة البقرة، الآية: (٦٥).

واتە: وە بەڕاستی زانیتان، ئەوانەی وا لە ئێوە كە لە ڕۆژی شەممەدا دەست درێژیان كرد جا پێمان گوتن ببنە مەیمونی دووركراو.

كەوابوو ئەم جۆرە ڕووخسار گۆڕینە بەڕاستیەو تەنیا لە واتادا نیە، كە هەر ئەمەش ڕاڤەی ڕاستە بۆ ئەم ئایەتە هەروەكو ئیبنو عەبباس ڕاڤەی كردووە.

پێشەوا ئیبنو حەجەر لە پێشەوا ئیبنو عەرەبی دوو واتای گواستۆتەوە بەڵام هەر واتای یەكەمی بەڕاست داناوە[1].

بەڵام پێشەوا ڕەشید رضا لە تەفسیرەكەی واتای دووەمی بەڕاست داناوە كە دەڵێ: واتای وایە كە ئەوانە گۆڕان بەسەر ڕەوشتیاندا هاتووەو ڕەوشتی مەیمونیان وەرگرتووە[2].

بەڵام پێشەوا ئیبنو كەثیر ئەوەی بە دوور لە ڕاستی داناوە كە لە پێشەوا موجاهید دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

ئەمە قسەیەكی نامۆیەو پێچەوانەی ڕووی دیاری ئایەتەكەیە لێرەو لە شوێنەكانی تردا[3].

لە پاشان دەڵێ: مەبەست لە هێنانەوەی ئەم بۆچوونانە لای زانایان ئەوەیە كە پێچەوانەی ئەم بۆچوونەیە كە پێشەوا موجاهید بۆی چووە كە دەڵێ مەسخەكەیان لە واتایی دایە نەك وێنەیی، بەڵام ڕاستیەكەی ئەم ڕووخسار گۆڕانە مەعنەوی و وێنەییە.

پێشەوایان موجاهیدو ئەبو عالیەو قەتادە (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) دەڵێن: (المسخ) واتە: ڕووخسار گۆڕان لە واتا دایە نەك لە ڕاستی، كە واتای وایە ئەوانە دڵەكانیان گۆڕاون نەك بونەتە مەیمون[4].

---

(١) فتح الباري، (١٠/ ٥٦).

(٢) تفسير المنار (١/ ٣٤٣ ٣٤٤).

(٣) تفسير القرآن العظيم، ابن كثير (١/ ١٥٣).

(٤) تفسير القرآن العظيم (١/ ١٥٠).

بەرگی دووەم

پێشەوا ئەنەس (ﷺ) دەڵێت:

ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) دەرباری شاری (بەسرە) قسەی بۆ دەکردم و دەیفەرموو: (يَا أَنَسُ، إِنَّ النَّاسَ يُمَصِّرُونَ أَمْصَارًا، وَإِنَّ مِصْرًا مِنْهَا يُقَالُ لَهُ: الْبَصْرَةُ - أَوِ الْبُصَيْرَةُ - فَإِنْ أَنْتَ مَرَرْتَ بِهَا، أَوْ دَخَلْتَهَا، فَإِيَّاكَ وَسِبَاخَهَا، وَكِلَاءَهَا، وَسُوقَهَا، وَبَابَ أُمَرَائِهَا، وَعَلَيْكَ بِضَوَاحِيهَا، فَإِنَّهُ يَكُونُ بِهَا خَسْفٌ وَقَذْفٌ وَرَجْفٌ، وَقَوْمٌ يَبِيتُونَ يُصْبِحُونَ قِرَدَةً وَخَنَازِيرَ)[1].

واتە: ئەی ئەنەس خەڵکی شار دروست دەکەن و ئاوەدانی دەکەنەوە، شارێك هەیە پێی دەگوترێ بەسرە، ئەگەر هاتوو تیایدا تێپەڕ بوویت یا چویتە ناوی ئاگاداربە نزیك زەوی ڕووت و لە وەرگاو دارخورماو بازاڕو دەرگای بەرپرسەکان نەبیتەوەو نەچیتە ناوی ، هەر لە قەراغ شارەکە بمێنەوە، چونکە ئەو شارە دوو چاری ڕۆچوون و ئاگر باران و زرمەوناڵەو ڕاتەکاندن دەبێت، وە کەسانێکی تێدا دەبێت شەو کە دەخەون بەیانی لە خەو هەڵدەستن بوون بە مەیمون و بەراز .

شێخ محەممەد بەرزنجی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

لە سەردەمی فاتمیەکان لە میسر خەڵکی کۆدەبوونەوە لە ڕۆژی عاشورا، جوێنیان بە پێشەوا ئەبوبەکرو عومەر دەدا، لە کاتێکدا پیاوێك لە هەژارەکان هاتە لای یەکێك لە فاتیمیەکان و گوتی: کێ خواردنم پێدەدات لەبەر خۆشەویستی پێشەوا ئەبوبەکر، پیاوێکی پیر گوتی: من خواردنت پێ دەدەم با بچین بۆ ماڵەوە، کە گەیشتینە ماڵ پیاوە پیرەکە زمانی گرت و یەکسەر لێی کردەوە گوتی: ئەمە لەبەر خۆشەویستی پێشەوا ئەبوبەکرە، پاشان پیاوەکە چۆوە شاری مەدینەو چوو بەرەو مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) چووە سەر قەبری پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەر، وە زمانەکەشی لەسەر دەستی بوو، زۆر دڵتەنگ بوو، پاشان لەبەر دەرگای مزگەوت خەوی لێکەوت، لە خەوەکەی پێغەمبەرو(ﷺ) ئەبوبەکری بینی، پاشان گوتی: ئەی ئەبوبەکر من لەبەر خۆشەویستی تۆ زمانم لێکرایەوە، پێشەوا ئەبوبەکر دۆعای بۆ کردو بە ویستی خودا زمانەکەی چاکبوویەوە لە جاران باشتر، بەڵام پێی گوت:

---

(١) سنن أبي داود (٤/ ١١٣) باب: في ذكر البصرة، قال الألباني حديث صحيح، برقم: (٤٣٠٧).

ئەم هەواڵە بە کەس مەدە هەتا ئەگەڕێتەوە شارەکەی خۆت، پاش ساڵێك ئەم پیاوە گەڕایەوە میسر لە ڕۆژی عاشورا دووبارە گوتی: کێ هەیە لەبەر خۆشەویستی پێشەوا ئەبوبەکر شتێکم پێ ببەخشێ گەنجێك گوتی: من وەرە ماڵەوە با بەیەکەوە بچینەوە، دەڵێت: من لەگەڵ ئەو گەنجە چومە ئەو ماڵەوە کەوا ساڵی پێشوو پیاوە پیرەکە زمانی بڕیم لەو ماڵەدا، کابراش بە گەنجەکەی گوت: من سەر سورمانم لەو ماڵە ساڵی پێشوو هاتمە ئەو ماڵە ئیهانەیەکی زۆر کرام و زمانم بڕدرا، بەڵام ئێستاکە لەو ماڵەدا زۆر ڕێزم لێ دەگیرێت، گەنجەکەش گوتی: چۆن؟ کابراش بە تێرو تەسەلی چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە، کاتێ گەنجەکە گوێبستی قسەکانم بوو کەوتە دەست و پێ ماچ کردنم و گوتی: چیت بۆ بگێڕمەوە باوکم لەسەر ئەو کردارە خراپە بەردەوام بوو، هەتا خوای گەورە وای لێکرد بوو بە مەیمونێکی تەواو[1].

لە شاری حەلەب پیاوێك هەبوو زۆر جوێنی بە پێشەوا ئەبوبەکرو عومەر دەدا، لەسەر ئەم ڕەفتارەشی بەردەوام بوو هەتا مرد ، کاتێ ویستیان لە گۆڕدا بینێژن تەماشایان کرد دەم و چاوی ببوو بە بە بەراز ، پاشان دەریان هێناو سوتاندیان بە ئاگر[2].

پێشەوا (سیوطي) لە پەرتوکی (تأريخ الخلفاء) باسی بابەتێکمان بۆ دەکات و دەڵێت: لە ساڵی (٧٨٢) لە سەردەمی خەلیفە (متوكل)ی شەشەم لە وڵاتی میسر، کتێبێکمان پێ گەیشت کە لە شاری حەلەب کەسێك پێش نوێژی بۆ خەڵکی دەکرد، یەکێکیش لە دواوەی گاڵتەی بە نوێژەکەی دەکرد، پێش نوێژەکەش نوێژەکەی نەبڕی هەتا تەواو بوو، کاتێ سەلامی دایەوە تەماشای کرد کابرا بووەتە بەراز.

ئەو سێ نمونەی باسمان کرد هەمووی هەقیقەتە پێویستە مرۆڤی ژیر پەند لەم چیرۆکانە وەربگرێت.

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ٩٣ .

(٢) سەرچاوەی پێشوو.

## ئاشکرابوونی موعجیزەیەکی قورئان لەسەر نیشانەیەکی قیامەت:

لە سەردەمانی پێش پێغەمبەر محەممەد(ﷺ) کەسانێك هەبوون پێچەوانەی فەرموودەکانی خوای گەورە دەجوولانەوە، چ کاری ناشیرنی خراپ هەبوو دەیانکرد وەکو کۆمەڵی (أصحاب السبت) کە بە پێچەوانەوە دەجولانەوە خودای گەورە کردنی بە مەیمون و بەراز بۆ ئەوەی ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ نەوەکانی داهاتوو، کاتێك کۆمەڵی کافران دەوری مەدینەیان داو جوولەکەکانی (بەنی قریظە) پەیمانیان شکاند، خوای گەورە موسڵمانانی سەرخست بەوەی ڕەشەبای ناردو پەردەی بەسەر یەکەوە نەهێشتن و دووبەرەکی تێخستن... ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) چووە سەر (بەنی قریظە)و گوێیان لێ بوو کە لەسەر شوراکانیانەوە جنێویان بە موسڵمانان دەدا، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموون: ئەی براکانی مەیمون خوا ڕیسوای کردن و سزاو خەشمی خۆی بۆ ناردن؟

ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە کاتی خۆی هەندێکیان بوون بە مەیمون، هەندێکیان بوون بە بەراز، هاوەڵەکان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا مەیمون و بەرازی ئێستا نەوەی ئەوانن ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نەخێر هەر کەس خوا مەسخی بکات نەوەی نابێت.

کاتێك هەندێ لە جوولەکەکان کەوتنە فڕوفێل کردن و حەڵاڵ کردنی ئەوەی کە خوا لێی حەرام کردبوون، خوای گەورە کلکی مەیمونی لێ ڕواندن و هەندێکیشیان کلکی بەرازیان بۆ پەیدا بوو دەنگیان نەما وەکو مەیمون و بەراز دەنگیان دەردەهات ، بۆیە لە ماڵەوە نەدەهاتنە دەرەوە، جا کە خەڵکی نەیانبینن و بچنە سەر کاری خۆیان و دیارنەبوون چوون بۆ ماڵەکانیان»بینیان مەسخ بوون و شێوازیان تێك چووەو کلکیان بۆ پەیدابووەو چ قسەیان لەگەڵ کردن بە ئیشارەت وەڵامیان دانەوە، دیارە ئەمەش بەڵایەکی گەورە بوو بۆیان، جا هەندێکیان سەری خۆیان هەڵگرت و بەرەو بیابانی میسر بەڕێ کەوتن، هەندێکیشیان بەرەو شام، سەرەنجام لەو بیابانە لەناو چوون، وە هەندێکی تریشیان پاش چەند ڕۆژێك لە

بەرگی دووەم

ماڵەکانی خۆیان گیانیان دەرچوو، جا بە پێی عادەتی ئەو سەردەمە هەندێك لەوانەیان (مۆمیا) کرد، وەك مۆمیای میسریەکان لە تابوتی تەختەدا دایان نان کە هیچ بزماری پێوە نیە، بە پێی بیرو بۆچوونی جولەکەکان .

لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٠)ع ویستی خوای گەورە وابووە کە ڕاستی فەرموودەکەی خواو پێغەمبەری خودا بسەلمێنرێت و ئاشکرا بێت.

بەڵێ.. هەندێ لە شوێنەوار ناس و پسپۆڕی موسڵمانی فەلەستینی توانیان گۆڕستانێك بدۆزنەوەو ئەو مۆمیایانە دەربهێنن و وێنەی بگرن.. جا مۆمیاکان قژی سەرو لاشەیان ماوەو دەمیان داچەقیوەو ترس و شپرزەیان پێوە دیارە، هەندێکیان کلکیان هەیە وەك مەیمون، هەندێکیان کلکیان بستێك دەبێ وەك بەراز، هەندێکیان ناوقەدیان درێژبۆتەوەو شێواوە، ئەمە بێجگە لەوەی کە پارچەی تۆڕی راوچیەکانیش دۆزراوەتەوە.. ئەمەش تا دەستی جوولەکەی نەگاتێ دایان پۆشیەوەو بە نهێنی هێشتیانەوە، تا ئەو ڕۆژەی وەزعەکە باشتر دەبێت، پاشان وێنەکانیان برد بۆ لای نووسەری میسری (محەممەد عیسا داوود)و داوایان لێکرد کە بڵاوی بکاتەوە بە ناوی خۆیەوە، ئەویش وێنەکان و باسەکەی لە پەڕاوێکدا بڵاو کردەوە بۆ جیهان لە ساڵی (٢٠٠٣)ع بە ناوی (القنبلة / یهود مسخهم الله قردة وخنازیر اکتشاف القریة حاضرة البحر) تا ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ هەموو ئەوانەی کە سنوور شکێنی دەکەن و گوێ نادەن بە فەرمانەکانی خودا[1].

---

(١) موقع عبدالکحیل الدائم. یهود مسخهم الله قردة وخنازیر اکتشاف القریة حاضرة البحر

# ڕۆچوونی زەوی

لە نیشانەکانی نزیکبونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی ڕۆچوونی کۆمەڵە کەسێکە کە خوای گەورە سزای ئەم ئومەتەی پێداوە..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (يَكُونُ فِي أُمَّتِي خَسْفٌ وَمَسْخٌ وَقَذْفٌ)[1].

واتە: سەردەمانێك بەسەر ئومەتم دێت ڕۆچوون و بوون بە سەگسارو بەردباران کردن و بورکان ڕوودەدات.

دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ:

(يَكُونُ فِي آخِرِ هَذِهِ الأُمَّةِ خَسْفٌ وَمَسْخٌ وَقَذْفٌ

قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟

قَالَ: نَعَمْ إِذَا ظَهَرَ الخُبْثُ)[2].

واتە: ڕووداوێك ڕوودەدات لە کۆتایی ئومەتەکەم ئەویش

ڕۆچوون بە ناخی زەوی و

بە سەگسارکردنەوەو

بەردباران کردنە

---

(١) سنن الترمذي، (٤/ ٤٥٦) كتاب: الفتن، باب: بعد ما جاء في أشراط الساعة، برقم: (٢١٥٣). وقال الإمام الترمذي: وَهَذَا الْحَدِيثُ لَا نَعْلَمُهُ يُرْوَى عَنْ عَبْدِ اللَّهِ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) إِلَّا بِهَذَا الْإِسْنَادِ.

(٢) سنن الترمذي، (٤/ ٤٥٦) كتاب: الفتن، باب: بعد ما جاء في أشراط الساعة، برقم: (٢١٥٣). وقال الإمام الترمذي: وَهَذَا الْحَدِيثُ لَا نَعْلَمُهُ يُرْوَى عَنْ عَبْدِ اللَّهِ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) إِلَّا بِهَذَا الْإِسْنَادِ.

عائیشە دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئێمە لە ناو دەچین ئەگەر پیاو باشان لەناودا بێت؟

فەرمووی: بەڵێ ئەگەر پیسی زۆر بوو.

دەگێڕنەوە لە محەممەدی كوڕی ئیبراهیمی التیمی دەڵێت:

گوێم لە بەقیرەی خێزانی قەعقاعی كوڕی ئەبی حدرەد بوو كە گوتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو كە لەسەر مینبەر دەیفەرموو: (إِذَا سَمِعْتُمْ بِجَيْشٍ قَدْ خُسِفَ بِهِ قَرِيبًا فَقَدْ أَظَلَّتِ السَّاعَةُ)[1].

واتە: ئەی خەڵكینە ئەگەر بیستتان سوپایەك لەو نزیكانە نغرۆ بوو، ئەوا ڕۆژی دوایی نزیك بۆتەوەو سێبەری كردووە.

زەوی ڕۆچوون ڕوویداوە لە زۆر شوێن، لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە پێش ئەم سەردەمەی ئێمە، وە لەم ڕۆژگارەشدا لە زۆر شوێنی جیاواز ڕوویداوە، كە ئەمەش ترسێكە بۆ نزیكبوونەوەی سزایەكی بە ئێش، وە ترسانێكە لەلایەن خوای گەورەوە بۆ بەندەكانی، تاكو بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگاریان.

جا پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەكەی دا دەفەرموێ: لەو نزیكانە ڕەنگە مەبەستی ئەو سوپایە بێ كە لە نزیك شاری مەدینە نغرۆ دەبێ.

پرسیارێك: ئێمە دەمانزانی كە هەمیشە لە ئەنجامی بومەلەرزەی وێرانكەرەوە ڕۆچوون ڕوودەدات شارێك یان گوندێك.. یان ناوچەیەكی زۆر گەورە وێران دەكات، بەڵام ڕۆچوونی تەنهاماڵێك، ئەمە چۆن ڕوودەدات؟

لە هەواڵەكانی ساڵی (٢٠١٣)ع لە ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا زەویەك شەقی بردو خانوویەكی قوتدا، تەنها شوێنی خانووەكە بە ڕووبەری پەنجا مەترێك بە شێوەیەكی زۆر كتوپڕ بە زەویدا ڕۆچوو، ئەو خانووە لە ناكاوێكدا دیار نەماو نقووم بوو بۆ قوڵایی ٣٠ یان ٤٠ مەتر.

---

(١) مسند الإمام أحمد (٦/ ٣٧٨) برقم: (٢٧٦٧٠).

ئەم دیاردەیە زانایان دەڵێن: تازە دەرکەوتووە پێشتر نەزانراو بووە، کەس نەیدیوە تەنها خانوویەك یان ئۆتۆمبێلێك یان ناوچەیەکی دیاریکراو ڕۆبچێت!!

زانایان دەڵێن: لەوانەیە پێشبینی بومەلەرزە بکرێت!! بەڵام بە هیچ شێوەیەك ناتوانرێت پێشبینی ڕۆچوون بکرێت یان بزانیت چی لە ژێرتا ڕوودەدات!! ئەی ئەمە چۆن ڕوودەدات!؟

زانایان دەڵێن: دوای ئەوەی خاك و زەوی لە ڕووی ئەندازەوە جێی خۆی دەگرێت، بەڵام لەگەڵ هۆکارەکانی کات و دزەکردنی ئاو بۆ ژێر خاك، کار لە خاکەکە دەکات و دەبێتە هۆی شین بوونەوەی خاکی ڕەقی ژێر زەوی واتە: خاکەکە شین دەبێتەوەو بۆشایی دروست دەبێت ئەو کاتە هەر قورساییەك لەسەر ئەو شوێنە دەبێتە هۆی ڕۆچوونی زەویەکە، واتە: بە شێوەیەکی کتوپڕ لەگەڵ کاتدا ڕوودەدات..

## ڕووی ئیعجاز لەم فەرموودەیەی کە باسی نیشانەی قیامەت دەکات

- لە ئێستادا بە دەنگ و ڕەنگەوە دەبینین کە چۆن تەنها خانوویەك ڕۆدەچێت و ڕۆچوون ڕوودەدات.

- لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ڕۆچوون و شێوە گۆڕین ڕوودەدات، واتە: ڕووداوەکانی ڕۆچوون زۆر دەبێت.

بێگومان ئەمە وانەیەکە بۆ ئێمە تا دونیا ویست نەبین و چاومان لەوانە نەبێت کە خوای گەورە پارە یان ناوبانگ یان شتی تری پێداوین، چونکە هەر کەسێك مەبەستی دونیا بێت وەك قارون بەجێی دەهێلێت و تا سەر بۆی نابێت بۆیە دەبێت مەبەستمان تەنها ڕازی بوونی خوای گەورە بێت.

شێخ محەممەد ڕەسول بەرزنجی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

- لە ساڵی (٢٠٨)ی کۆچی، سێزدە ڕۆچوون لە گوندێکی مەغریب ڕوویدا.
- لە ساڵی (٨٣٤)ی کۆچی، لە مانگی شەعبان لە غەرناتە ڕوویدا.
- لە ساڵی (٥٩٧)ی کۆچی گوندێك لە بوصرا ڕۆچوو بەناخی زەوی[1].

---
(١) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ٩٠.

# ئاژاوەیەک عەرەب لەناو دەبات

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر لەناوچوونی عەرەب و دەسەڵات نەمانیانە.. ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

• ژمارەیەکی زۆر لە عەرەب دەکوژرێن، هەتا زۆر کەم دەمێنن.

• یان لەبەر ستەمکردنیان دەسەڵات دەدەن بە غەیری خۆیان.

• یان بەواتای ئەوەی دوژمنان و ڕۆمەکان زاڵ دەبن بەسەریاندا.

• یان ئەوەتا زۆر حەز بە خۆشەویستی دونیا دەکەن، وە لە کۆتاییشدا بۆیان دەبێتە نەگبەتی.

پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ئاگادارمان دەکاتەوەو دەفەرموێ: (إِنَّ مِنَ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ هَلاكُ الْعَرَبِ)[1].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر لەناوچوونی عەرەبە.

پێشەوا قیننوجی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: لەناوچوونی عەرەب: بە واتای ئەوە دێت کە دەسەڵاتیان نامێنێ[2].

نیشانەیەکی تر لەوانەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی کردوون، ڕوودانی ئاژاوەیەکی گەورەیە تووشی عەرەب دەبێت، کوشتاری زۆر تیایاندا ڕوو دەدات.

پێشەوا عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (تَكُونُ فِتْنَةٌ تَسْتَنْظِفُ الْعَرَبَ، قَتْلاَهَا فِي النَّارِ، اللِّسَانُ فِيهَا أَشَدُّ مِنْ وَقْعِ السَّيْفِ)[3].

---

(١) سنن الترمذي، كتاب: المناقب، باب: في فضل العرب، بة ذمارة (٣٩٢٩).

(٢) الإذاعة، (١٠٣-١٠٤).

(٣) سنن الترمذي (٤/ ٤٣) برقم: (٢١٧٨). قال الترمذي: حديث ضعيف.

واتە: بە شێوەیەك ڕوودەدات عەرەب لە نێو دەبات و کوژراوەکانیان لە دۆزەخدا دەبن، زمان تیایدا کاریگەرترە لە شمشێر.

(قَتْلاَهَا فِي النَّارِ) چونکە شەڕیان لەسەر دونیاو شوێنکەوتنی شەیتانە، واتە: بەهۆی ئەو شەڕەوە شایستەی سزا دەبن، بەڵام ئەگەر لەسەر یەکتا پەرستی بمرن بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا نامێننەوە.

مەبەست لە کوژراوەکانیان ئەوانەن کە لەو جەنگەدا تیادەچن، چونکە مەبەستیان لە شەڕکردن بەرزکردنەوەی ئایینی خواو بەرەنگاری ستەمکارو یارمەتیدانی خاوەن ماف نەبوو، بەڵکو مەبەستیان ستەم و ناکۆکی بوو، وەکو تەماع بۆ ماڵ.

(اللِّسَان) واتە: بە هاندانی بۆ شەڕکردن و هەڵگیرساندنی بۆ شەڕی جەنگ.

لە ریوایەتێکی تریشدا هاتووە کە ئازادکردن و درێژکردنەوەی زمان کاریگەرترە لە لێدانی شمشێر[1].

خوای گەورە خۆی دەزانێ مەبەستی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لەم فیتنەیە چییە.. خۆتان دەزانن کەوا فیتنە لەم سەردەمەدا چەند زۆربووە، بەڵام نە بەعەقڵ و نە دادپەروەرییە کەوا عاقڵێك بە بەڵگەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) قسە بکات بڕیار بدات کەوا ئەم فیتنەیە مەبەستی دەزگاکانی ڕاگەیاندنە، (بۆ نمونە) بە هەموو شێوازەکانی بینراو و بیستراو و خوێندراو.

ئوم حەبیبەی کچی ئەبو سوفیان لە زەینەبی کچی جەحش (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێکیان بە ترسەوە هاتە ژوورەوە بۆ لای و دەیفەرموو:

(وَيْلٌ لِلْعَرَبِ مِنْ شَرٍّ قَدِ اقْتَرَبَ، فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مِثْلُ هَذَا، وَحَلَّقَ إِبْهَامَهُ بِالَّتِي تَلِيهَا، قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟ قَالَ: نَعَمْ، إِذَا كَثُرَ الْخَبَثُ)[2].

---

(١) مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح، للقاري (١٥/ ٣٦٩).

(٢) صحيح البخاري (١٣/ ١٠٦) كتاب الفتن، باب يأجوج ومأجوج، برقم: (٣٥٩٧).

واتە: خاك بەسەر عەرەب، لەو ڕووداوە خراپەی کە نزیك بۆتەوە، ئەمڕۆ بەربەستەکەی یەئجوج و مەئجوج هێندەی ئەمە کراوەتەوە (بەسەر هەردوو پەنجە گەورەو پەنجەی شایەتمانی بازنەیەکی دروست کرد

زەینەبی کچی جەحش (ڕەزای خوای لیّ بیّت) دەڵێت:

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا لەناو دەچین لە کاتێکدا کە پیاوانی چاکمان لەناو دابێت؟

فەرموی: بەڵێ ئەگەر داوێن پیسی زۆربوو.

پێشەوا محەممەد ڕەسول بەرزنجی (ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ) دەڵێت: لەناوچوونی عەرەب بە واتای نەمانی دەسەڵاتی عەبباسیەکانە[1].

بەڕاستی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەکو موعجیزەیەك هاتە دی، لەسەردەمێك داین ئەزانین عەرەب چۆن زەلیلی وڵاتانی ئیسرائیل و ئەمریکاو ئەوروپا بوونە.

هەر کاتێك عەرەب بوونە پیاوی خودا و لە خوای گەورە ترسان و سیلەی ڕەحمیان جێبەجێکرد ئەو کات عیززەت بۆیان دەگەڕێتەوە، ئەگینا هەمیشە کێشەو ئاشوب و دووبەرەکی لە نێو وڵاتەکانیان بەردەوام دەبێت.

زیاتر لە چەندین فەرموودە ئاماژە بە لەناوچوونی عەرەب کراوە، بەڵام هەتا ئێستاش چاك نابن و ژیان بە بەکرێگیراوی بەسەر دەبن.

تەنانەت وڵاتانی عەرەبی لەم سەردەمەدا هەمیشە لە غەمی ئەوەدان چۆن بتوانن وڵاتانی ڕۆژئاواو ئەمریکا لە خۆیان ڕازی بکەن، لە غەمی ئەوەدا نین میللەت لێیان ڕازی بێت.



---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، لا (٨٧).

## زۆربوونی بازرگانی و بەشداریکردنی ئافرەت

یەکێکی تر لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی زۆربوون و گەشەندنی بازرگانیە لە نێوان خەڵکی، تا وای لێدێت ئافرەت لەگەڵ پیاواندا بەشداری دەکات لە بازرگانیدا.

لە کۆندا خەڵکی دەشتەکی بازاڕیان نەبوو، لەبەر ئەوەی کۆمەڵگای بچوکی جوتیاران لەیەکەوە دووربون، ئەو کاڵایانەش بەرهەمیان دەهێنا، بەشی خۆیانی نەدەکرد، چ جای کڕین و فرۆشتن، دوای ئەوە مرۆڤایەتی پێشکەوت، خەڵکی لە بۆنە ئاینیەکاندا کۆدەبوونەوەو بازرگانانیش چاوەڕێی ئەو بۆنانەیان دەکرد تا کاڵاکانیان تیایدا بفرۆشن، بەم جۆرە لەسەردەمی کۆندا بازاڕ دروست دەبوو.

لە ڕاستیدا وشەی «ڤیر»ی ئینگلیزی کە بەواتای پیشانگای بازرگانی دێت، لە وشەی «فێریا» ی لاتینیەوە وەرگیراوە کە مانای «ڕۆژی جەژن» یان «پشو» دەدات.

میسریە کۆنەکان بازاڕی کڕین و فرۆشتنیان لەو کاتەدا دەبوو، کە لەسەر گۆڕی مردوەکانیان کۆدەبوونەوە بۆ ئەنجامدانی نەریتێکی ئایینی، یۆنانیەکانیش لە کاتی ئاهەنگ گێڕانی خواوەندەکانیاندا بازرگانیان دەکرد، وە پێش هاتنی ئیسلامیش عەرەبەکان دەهاتنە مەککە کە مەڵبەندێکی ئاینی و بازرگانی بوو، حەفتەیەکیان لە پەرستنی بتەکاندا دەبردە سەرو پاشان لە شاردا دەمانەوە بۆ بازرگانی کردن، ئەو مەڵبەندە بازرگانیانەش لە هیندستان و چین و ئێران و لە نێوان ئەزتەکەکانی مەکسیکیشدا هەیە، بازاڕی بازرگانی لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیشدا پەیوەند بوە بە ئاهەنگ گێڕانی بەرو بومەوە، جوتیارەکان لەو کاتەدا بەروبومی خۆیانیان بردۆتە بازاڕو بە جل و بەرگ و پیتاکی تر گۆڕیویانەتەوە.

لەسەردەمی کۆنیشدا کردنەوەی بازاڕی بازرگانی مافی شارێکی تایبەتی بوە، پادشاو دەرەبەگەکان ئەو مافەیان داوە بە گەورەی ئەو شارە ، بازاڕی جاران یاساو ڕێسای تایبەتی خۆی هەبووە، کە گرنکترینیان فێڵ نەکردن و

پاراستنی ئەمانەت بووە، لەبەر ئەوەی لە شارستانیەتە کۆنەکاندا ، بازاڕیان بەشوێنێکی پیرۆز زانیوە، بۆیە کاتێك لە بازاڕدا بەیەك گەیشتوون جەنگ و شەڕو شۆڕیان وەستاندووە، ئەو بازاڕانەی کۆنیش ڕۆڵی گرنگیان بینیوە لە پێشخستنی بازرگانیدا، هەر ئەوەش وای کرد بازرگانی لە نێوان ڕۆهەڵات و باکوری ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا دروست ببێت.

یەکیّ لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەیە بازرگانی ئەوەندە زۆر دەبێت کەوا کەس توانای ئەوەی نامێنێت پەرستشەکانی خوای پەروەردگار جێبەجیّ بکات.

ئەگەر سەیری وڵاتانی جیهانی بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە بازرگانی ئێجگار زۆرە لەسەر ڕووی هەموو جیهانەوە، ئەم خەڵکانەی دوێنیّ شوان بوون.. ئەمڕۆ هەموویان بازرگانی دەکەن بە ماڵەوە بۆیە پێغەمبەرمان(ﷺ) زۆربوونی بازرگانی بە یەکێك لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی هەژمارکردووە..

پێشەوا ئیبنو مەسعود(رضي الله عنه) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویّ: (أَنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ تَسْلِيمَ الْخَاصَّةِ، وَفُشُوَّ التِّجَارَةِ ، حَتَّى تُعِينَ الْمَرْأَةُ زَوْجَهَا عَلَى التِّجَارَةِ ، وَقَطْعَ الأَرْحَامِ ، وَشَهَادَةَ الزُّورِ ، وَكِتْمَانَ شَهَادَةِ الْحَقِّ ، وَظُهُورَ الْقَلَمِ)(١).

واتە: لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی سڵاو لە کەسانێکی تایبەت دەکریّ و بازرگانی بڵاودەبێتەوە تا وای لیّ دێت ژن یارمەتی مێردەکەی دەدات لە بازرگانی و پەیوەندی خزماتی دەپچڕیّ و شایەدی درۆ دەدریّ و شایەدی ڕاست و ڕەوا دەشاردرێتەوەو پێنوسیش دەردەکەویّ.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم فەرمودەیە ئاگادارمان دەکاتەوە کە یەکیّ لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە بازرگانی زۆر دەبێت و ئافرەت یارمەتی مێردەکەی دەدات لە بازرگانی، ئەگەر چاوێك بە هەموو جیهان بخشێنین زۆربەی زۆری وڵاتان تەنها بازرگانیان بەهۆی شت و مەکی وڵاتانی جیهانیەوە خەریك کردووە، وەکو عێراق و صین و دوبەی و.. هتد، جا زۆربوونی بازرگانیش بە یەکێك لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی دادەنرێت.

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد ، (٢/ ٧٩١) برقم: (٣٩٤٧) وقال الشيخ أحمد بن شاكر : إسناده صحيح.

# بە ئاشکرا کافربوون بە خوای گەورەو قورئان

یەکێکی تر لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی زۆربوون و پەرەسەندنی کەسانێکە کە هەڵدەگەڕێنەوە لە ئیسلام و کافر دەبن بە خوای گەورەو قورئان..

پێشەوا رافیعی کوری خدیج (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (یكون قوم من أمتي یكفرون بالله وبالقرآن.. ثم یخرج الدجال على أثر ذلك قریبا..)[١].

واتە: قەومێك لەم ئوممەتەی من پەیدا دەبن کافر دەبن بە خوای گەورەو قورئان.. لە پاشان دەجال دەردەچێت...

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم فەرمودەیە ئاگادارمان دەکاتەوە کە یەکێ لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە بەشێك لە خەڵکی بڕوا بە قورئان ناهێنن و هەڵدەگەڕێنەوە.

لەم سەردەمە ئەم موعجیزەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە دی وەکو ڕۆژی ڕووناك.

گرنگە منداڵەکانمان فێری خۆشەویستی قورئان بکەین، نەك دژایەتی خودا و قورئان بکەن.

عەبدوڵلای کوڕی عیسا (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

ئەم ئوممەتە هێشتا لە خێرو چاکەدا دەمێنێتەوە، هەتاکو منداڵەکانی فێری قورئانیان دەکات[٢].

---

(١) ضعیف: المعجم الكبیر، (٤/ ٢٤٦) وإتحاف الخیرة المهرة (١٨٠/١) خلاصة حكم المحدث: ضعیف لضعف ابن لهیعة.

(٢) موسوعة ابن ابي الدنیا (٨/ ٧٥).

## خۆشویستنی پارەو دۆلار

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر خەڵکی پارەی زۆر خۆش دەوێت، هەتا وای لێدێت ئامادەیە نوێژەکەی خۆی بچوێنێت لە پێناو پارەو سەروەت و سامانی دونیا.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لا تَقومُ السّاعَةُ حتى يُعْبَدَ الدِّينارُ والدِّرْهَم)[1].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت، هەتا خەڵکی دینارو دیرهەم دەپەرستێت و خۆشی دەوێت.

لەم ڕۆژگارەدا ئەم فەرموودەیە بە چاوەکانی خۆمان وەکو ڕۆژی ڕووناك دەبینین..

پێشەوا سوفیانی ثەوری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

سەردەمێك بەسەر خەڵکی دێت دڵیان پڕ دەبێت بە خۆشەویستی دونیا، ئەو دڵەیان وای لێ دێت هیچ خشوعی تێدا نامێنێت

هەرگیز ڕەوشتت مەگۆڕە تا پارەو سەروەت و سامان بە دەست بهێنیت، بەڵکو پارەو سەروەت و سامانت بفرۆشە بۆ ئەوەی خۆشەویستی خوای گەورە بە دەست بهێنیت.

باشترین مرۆڤەکان ئەوانەن کە ماڵ و سەروەت و سامانی خۆیان بەخت دەکەن لە پێناوی (الله).

ئەبو جەعفەر محەممەدی کوڕی عەلی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

(كان لي أخ في عيني عظيم، وكان الذي عظمه في عيني صغر الدنيا في عينه) [2].

واتە: برایەکم هەبوو لە پێش چاوم زۆر گەورە بوو، هۆکاری گەورەبوونی لە پێش چاوم بریتی بوو لە بچووکی دونیا لە پێش چاوی.

---

(١) صحيح رواه الإمام أحمد في مسنده (٢/ ١٩٩).

(٢) حلية الأولياء (٣/ ١٨٦).

بەرگی دووەم

## دەوڵەمەندەکان دەست بەسەر بازاڕدا دەگرن

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی سەرمایەدارەکان دەست بەسەر بازاڕی جیهاندا دەگرن..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يَفْشُوَ الْمَالُ وَيَكْثُرَ، وَتَفْشُوَ التِّجَارَةُ، وَيَظْهَرَ الْعِلْمُ، وَيَبِيعَ الرَّجُلُ الْبَيْعَ فَيَقُولَ: لَا حَتَّى أَسْتَأْمِرَ تَاجِرَ بَنِي فُلَانٍ.. )[1].

واتە: لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر، ماڵ و سەروەت و سامان زۆر دەبێتەوەو

بازرگانی تەشەنە دەکات و نەفامی سەرهەڵدەدات، پیاو شتێك دەفرۆشێت و دەڵێت: نەخێر، تاکو ڕای فلانە بازرگان وەربگرم..

لەم فەرمودەیە تێدەگەین کە هەندێ بازرگانی گەورە لەوانە سەرمایەدارەکان یان ئەو بریکارە متمانە پێکراوانەی کە کاڵا و شتومەك دەنێرن و دەهێنن، لەوانەیە ئەوانە دەست بگرنە سەر بازاڕ، خۆیان بەرزو نزم بە نرخەکان بکەن، ئیتر بازرگانە بچوکەکان نەتوانن بازرگانی بکەن بە مۆڵەتی ئەوان نەبێت.

وە سەرمایەدارەکان دەست دەگرن بەسەر بازاڕداو گەمە بە نرخی کاڵاکان دەکەن، بە جۆرێ بازرگانە بچووکەکان بەبێ ئیزنی ئەوان ناتوانن کاڵای خۆیان بفرۆشن.

ئەم فەرموودەیە گەورەترین موعجیزەمان نیشان دەدات لەم سەردەمە کە بە چاوەکانمان دەبینین بەرپرسەکان و دەوڵەمەندەکان دەستیان بە تەواوی بازاڕدا گرتووە.

نابێ ئەوە لە بیر بکەین هەر کڕین و فرۆشتنێك ئازاری موسڵمانان بدات ئەوە گەورەترین موسیبەتی بەسەر هاتووە کە خۆشەویستی ماڵەکەیەتی.

---

(١) صحيح: سنن النسائي (٧/ ٢٤٤) برقم: (٤٤٥٦). قال الألباني: صحيح.

## ڕاییکردنی مامەڵەکان لە ڕێگای کۆمپیوتەر

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر، ڕاییکردنی مامەڵەی خەڵکیە لە ڕێگای کۆمپیوتەر..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ .. وَيُلْتَمَسَ فِي الْحَيِّ الْعَظِيمِ الْكَاتِبُ فَلَا يُوجَدُ)[١].

واتە: یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر .. لە گەڕەکی گەورەیشدا دەگەڕێن بە دوای نوسەرێکدا دەستیان ناکەوێت.

لەگەڵ ئەوەشدا نوسین زۆر بڵاودەبێتەوە لەوانە بڵاوبوونەوەی ئالەتەکانی نووسین وەك کۆمپیوتەرو تەلەفۆنی دەستی و دەزگای تەرجومەکردنی شتەکان، وای لێدێت خەڵکی ناتوانن بە دەست شتەکان بنووسن بەبێ بوونی دەزگای نووسین، نووسەرێکیان دەست ناکەوێت کە ئەم کڕین و فرۆشتنەی ئەوان تۆمار بکات یان بەڵێننامەکانیان بۆ بنووسێت بە قەڵەم.

سەبارەت بە کەمبوونەوەی نوسەریش (سەرەڕای ئەوەی کە فەرموودەی تر هەیە ئاماژە دەکات بۆ بڵاوبوونەوەی نووسین) دەتوانین ئەوەی لێ حاڵی بین کە دەزگاکانی نوسین بڵاودەبێتەوە وەکو کۆمپیوتەرو مۆبایل و دەزگاکانی وەرگێڕانی دەنگ بۆ دەقی نوسراو و شتی لەو جۆرە ئیترە نەوەیەك پێ دەگات نووسین نازانێت یان بە باشی شارەزای نییە.

یان لەوانەیە مەبەست لەو وشەی (الکتابە) لێرەدا گرێبەستی بازرگانی و کارامەیی بێت لە مەرجەکانی فرۆشتن و مەرجەکانی.

(١) سنن النسائي (٧/ ٢٤٤) برقم: (٤٤٥٦). قال الألباني: صحيح.

## هاتنی سەردەمێک پیاو سەر پشک دەکرێت
## لە نێوان بێ دەسەڵاتی و خراپەکاری (واتە: ئازادی)

یەکێکی تر لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر کە پێغەمبەر (ﷺ) پێی ڕاگەیاندووین، سەر پشککردنی پیاوە لە نێوان ئەنجامدانی خراپەکاری و تۆمەتبارکردنی بەبێ دەسەڵاتی و دواکەوتن و، چەندین وشەی تری ناپێشەکەوتووخوازانە لە پێناسەی گەندەڵەکاندا، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ئامۆژگاری ئەو جۆرە کەسانەی کردووە بە هەڵبژاردنی بێ دەسەڵاتی و دوورکەوتنەوە لە خراپەکاری.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يُخَيَّرُ الرَّجُلُ فِيهِ بَيْنَ الْعَجْزِ وَالْفُجُورِ، فَمَنْ أَدْرَكَ ذَلِكَ فَلْيَخْتَرِ الْعَجْزَ عَلَى الْفُجُورِ)[1].

واتە: سەردەمانێك دێتە سەر خەڵکی پیاوی تیا سەر پشك دەکرێت لە نێوان بێ دەسەڵاتی و خراپەکاریدا، هەر کەسێك لە ئێوە گەیشتە ئەو سەردەمە، با بێ دەسەڵاتی هەڵبژێرێت بەسەر خراپەکاریدا.

ئەم بابەتە زۆر ئاشکرایە لەم سەردەمەی ئێمەدا، چونکە ئەو ئافرەتەی کە پابەندە بەسەر پۆشەوە تۆمەتبار دەکرێت بە دواکەوتن، یان هەر کەسێك واز لە بەشداری کردن بهێنێ لە سووخواردن، یان بەرتیل خواردن، یان بەدواداچوونی کەناڵە خراپەکان، خەڵکی بە دواکەوتوو و نەتوانینی پێشەکەوتن ناویان دەبەن، بۆیە مرۆڤ لە کۆمەڵگادا سەر پشك دەکرێت لە نێوان خراپەکاری و سەر پێچی کردنی خوا، یان بەبێ دەسەڵاتی ئەژماری بکەن.

---

(١) صحيح: أخرجه الحاكم في (المستدرك) كتاب: الفتن والملاحم، باب: سيأتي زمان يخير فيه الرجل بين العجز والفجور (٤/ ٤٨٤) برقم: (٨٣٥٢) قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

## خۆدەرخستن و کەشخەیی ڤیزەوەن و خزمەتکاری

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر خۆدەرخستن و کەشخەییەکە کە خۆت بە گەورەتر بزانیت لە خەڵکی تر، لە ڕاستیدا ئەم نیشانەیە لە نێو موسڵمانان سەری هەڵداوە، کە ئەمڕۆ پێپەتیەکی هەژار لەوپەڕی خۆشی و شادیەو جلی حەریر لەبەر دەکات و ئەوەی سەیارەی چاکە سواری دەبێت و بەسەر خەڵکیەوە فیز لێدەدات.

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِذَا مَشَتْ أُمَّتِي الْمُطَيْطَاءَ، وَخدَمَتْهُمْ أَبْنَاءُ الْمُلُوكِ أَبْنَاءُ فَارِسَ وَالرُّومِ سَلَّطَ اللَّهُ شِرَارَهَا عَلَى خِيَارِهَا)[1].

واتە: ئەگەر بەسەر ئوممەتەکەی من بەفیزو گەورەییەوە ڕۆیشت، وە منداڵانی پادشاکان خزمەتی فارس و ڕۆمەکانیان کرد، ئەو کات خراپەکاران زاڵ دەبن بەسەر چاکەکاران.

ئەمڕۆ بە چاوی خۆمان ئەم فەرموودەیە بەدی دەکەین کە چۆن موسڵمانان بونەتە خزمەتکاری ئێران و ئەوروپا و ئەمریکا.

بەداخەوە.. لەم ڕۆژگارەدا خەڵکێکی زۆر تووشی بەڵایەك بوون ئەویش هەبوونی خزمەتکاری ئافرەتە لە ماڵدا، ئەم خزمەتکارانەی ئێستا هێنانیان ئاسانە، لە کاتێکدایە زۆر لەوانەی دەیان هێنن پێویستیان پێی نییە و بەڵکو بۆ خۆبادان و فەخرکردنە پێوەی و ئافرەتان لە ماڵ دەردەچن و خزمەتکارەکانیان لە دواوەیانەو کاتێ دەگەنە دوکانەکە دەڵێن: فلان ئەوەم بۆ بێنە، و فلان شتم بۆ بێنە، و هەندێ لە ماڵ دەردەچن و خزمەتکارەکە لە ماڵ بەجێ دەهێڵن، تەنها لەگەڵ کوڕە گەنجەکانیدا، جا دەبێ چ ڕوویدات، هەر چەند بە تەقوا و لە خوا ترس بن.

---

(١) صحيح: سنن الترمذي (٤/ ٥٢٦) برقم: (٢٢٦١). قال الترمذي: هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَقَدْ رَوَاهُ أَبُو مُعَاوِيَةَ. رواه الطبراني في الأوسط وإسناده حسن. وصححه الأرناؤوط في (الإحسان) (١٥/ ١١٢).

## سەرهەڵدانی شەیتان پەرستەكان

لە نیشانەكانی نزیكبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی، شەیتان پەرستەكان لە خاكی عێراقەوە سەرهەڵئەدەن..

پێغەمبەر (ﷺ) پێی ڕاگەیاندووین كە ڕەشەبای فیتنەو ئاشوب لە كوێوە هەڵدەكاتە سەر موسڵمانان، ئاماژە بەوەش دەكات كە زۆری فیتنەكان لە خۆر هەڵاتەوە سەر هەڵدەدەن، خۆر هەڵاتیش مەبەست پێی خۆر هەڵاتی شاری مەدینەیە كە عێراق و ئێران بە گشتی دەگرێتەوە بە تایبەتی باشوری عێراق.

پێشەوا سالمی كوڕی عەبدوڵلای كوڕی عومەر(ﷺ) دەڵێت: (يَا أَهْلَ الْعِرَاقِ مَا أَسْأَلَكُمْ عَنِ الصَّغِيرَةِ، وَأَرْكَبَكُمْ لِلْكَبِيرَةِ سَمِعْتُ أَبِي عَبْد اللهِ بْنَ عُمَرَ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: إِنَّ الْفِتْنَةَ تَجِيءُ مِنْ هَاهُنَا، وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ مِنْ حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنَا الشَّيْطَانِ، وَأَنْتُمْ يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ...)[1].

واتە: ئەی خەڵكی عێراق چەند پرسیار لە شتی بچوك دەكەن و گوناهی گەورە ئەنجام دەدەن ، گوێم لە باوكم بوو دەیگوت : گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: فیتنەو ئاشوب ئا لێرەوە دێت جا ئیشارەتی بۆ خۆر هەڵات دەكرد لەو شوێنەی كە قۆچی شەیتانی لێ هەلدێت ئێوەش ئەی خەڵكی عێراق بە شمشێر گەردەنی یەكتر دەپەڕێنن.

لە ریوایەتێكی تر دەفەرموێ: (رَأْسُ الْكُفْرِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ، وَالْفَخْرُ وَالْخُيَلَاءُ فِي أَهْلِ الْخَيْلِ وَالْإِبِلِ الْفَدَّادِينَ، أَهْلِ الْوَبَرِ وَالسَّكِينَةُ فِي أَهْلِ الْغَنَمِ)[2].

واتە: سەری بێباوەڕی لە ڕۆژهەڵاتەوەیەو لە خۆبایی بوون و فیزی لە نێو دەوارنشینی خاوەن وڵاخ و حوشتری قەڵەو و ئارامی لە نێو خاوەن مەڕان دایە.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٢٩) باب: الفتنة من المشرق، برقم: (٢٩٠٥).

(٢) صحيح مسلم، (١/ ٧٢) باب: تفاضل أهل الإيمان فيه، برقم: (٥٢).

بەرگی دووەم

پێشەوا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(ﷺ) دەڵێت: ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) لە پاڵ مینبەر ڕاوەستاو دەستی بەرەو خۆر هەڵات درێژ کردو فەرموی: (إِنَّ الْفِتْنَةَ هَهُنَا إِنَّ الْفِتْنَةَ هَهُنَا مِنْ حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ)[1].

واتە: ئاشوب ئەوەتا لێرەیە، لێرە کە شاخی شەیتان دێتە دەرێ یان فەرموی شاخی خۆر.

پێشەوا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي شَأْمِنَا، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي يَمَنِنَا، قَالُوا وَفِي نَجْدِنَا، قَالَ اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي شَامِنَا، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي يَمَنِنَا، قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَفِي نَجْدِنَا فَأَظُنُّهُ قَالَ فِي الثَّالِثَةَ هُنَاكَ الزَّلَازِلُ وَالْفِتَنُ، وَبِهَا يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ)[2].

واتە: خوایە بەرەکەتمان بۆ بخەیتە شامەوە خوایە بەرەکەتمان بۆ بخەیتە یەمەنەوە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بۆ نەجدیش[3]؟ پێم وایە لە سێهەمدا فەرموی: بومەلەرزەو ئاشوب لەوێ ڕوودەدات و لەوێوە قۆچی شەیتان هەڵدێت.

بەرگی دووەم

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٢/ ٩١) برقم: (٥٦٥٩) قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

(٢) صحيح البخاري (٩/ ٥٤) باب: قول(ﷺ) الفتنة قبل المشرق، برقم: (٧٠٩٤).

(٣) پێشەوا ئیبنو حەجەر دەفەرموێ:
نەجد: لە زمانی عەرەبیدا مەبەست پێی شوێنێکی بەرزەو خەڵکی مەدینەش بە بیابانی عێراقیان دەگوت: نەجد، (نەجد)یش مەبەست پێی شوێنێکی بەرزە پێچەوانەی (غەورە) کە هەموو زەویەکی نزمە، جا تیهامە هەمووی غەورەو مەککەش دەکەوێتە تیهامە. الفتح (١٣/ ٥٨).
(خەطابی) دەڵێت: نەجد لای ڕۆژهەڵاتە هەر کەسێك لە مەدینە نیشتەجێ بێ نەجدەکەی بریتیە لە دەشتی عێراق و دەوروبەری کە خۆر هەڵاتی دەوری مەدینەن، بێگومان عێراقیش دەکەوێتە لای ڕۆژهەڵات بە گوێرەی مەدینەش بە نەجد دادەنرێت . الفتح (١٣/ ٥٨).
ڕای پەسندیش لە نێو زانایانی ئیسلام ئەوەیە کە (نەجد) بە عێراق دەگوترێت(٢) نەك عەرەب.. سەرچاوە/ علامات الساعة الصغرى والكبرى، لا ٢٧ .

## شاخدار شاخدار ناوەشێنێ

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە ژیانلەبەرە شاخدارەکان شەڕ لەگەڵ یەکتری ناکەن و بە ئاشتی دەژین..

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى لَا تَنْطِحَ ذَاتُ قَرْنٍ جَمَّاءَ)[1].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا شاخدار شاخدار ناوەشێنێ، واتە: هەموویان بەبێ شەڕە قۆچانێ بە ئاشتی دەژین.

ئەم فەرموودەیەش زۆر بە ڕاشکاوانە باس لەم سەردەمەی ئێمە دەکات کە تیایدا دەژین..

بەداخەوە.. کەسانێك هەن ژیان لەبەرەکان بەشەڕ دەهێنن بۆ دامرکاندنی حەزو ئارەزووەکانی خۆیان، با ئەو کەسانە دڵنیابن هەر کەسێك خۆی ئامۆژگاری خۆی نەکات، فەرمان بە چاکە نەکات و نەهی لە خراپە نەکات لە خۆیدا ئەوە هیچ ئامۆژگاریەك سوودی پێ ناگەیەنێت.

بۆیە هەر چەند دەتوانیت ئامۆژگاری خەڵکی بکە، تا لەم کارە قێزەوەنە دوور بکەوێتەوە، چونکە دڵنیابە خوای گەورە ئەجرو پاداشتی زۆر زۆرت دەداتەوە.

ئاژەڵەکان شەڕانگێز نین، ئەوە مرۆڤەکانن فێری شەڕانگێزیان دەکەن و لەناویان دەبەن.

ئاژەڵەکان عەقڵیان نییە، بەڵام ئەوە مرۆڤەکانن کە عەقڵیان هەیە بەڵام میهرەبانیان لە دڵدا نییە.

---

(١) صحيح: رَوَاهُ الْإِمَامُ أَحْمَدُ فِي مُسْنَدِهِ، عَنْ عَمَّارِ بْنِ مُحَمَّدٍ، فَوَقَعَ مُوَافَقَةٌ لَهُ عَالِيَةٌ، وَإِسْنَادُهُ حَسَنٌ.

## بازرگانەکان هیچ قازانج ناکەن

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر بازرگانەکان خۆیان زۆر ماندوو دەکەن و پارەیەکی کەمیش بە دەست دەهێنن و قازانجێکی زۆر کەمیان دەست دەکەوێت..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَبْلُغَ التَّاجِرُ بَيْنَ الأُفُقَيْنِ فَلا يَجِدُ رِبْحًا)[١].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا بازرگان دونیا لە بن پێ دەنێ و هیچ قازانج ناکات.

ئەمەش کینایەتە لە بری ئەوەی کە بەرەکەت لە بازرگانی کردن نامێنێ لەبەر زۆری درۆکردن و خیانەت کردنی بازرگانەکان.

لەم سەردەمەشدا زۆر بە ڕوون و ئاشکرایی دەبینرێت کە بازرگانەکان هەر گلەیی و گازاندە ئاراستەی خەڵکی دەکەن بە دەست قازانجی بازرگانی کردنەوە.

هەر کاتێك دڵەکان پڕبوون لە ئیمان و باوەڕ، ئەوا ژیان پڕ دەبێت لە ئەمان و خۆشگوزەرانی بازرگانەکانەوە.

هەندێك بازرگان هەن ئیستیغلالی خەڵکی فەقیرو هەژار دەکەن و دەیانچەوسێننەوە ، ئەگەر هاتوو خوای گەورە بە هۆی هەژارێکەوە سزاتت بدات ئەوە بازرگانیەکەت چ سوودێکی دەبێت؟

کە لە دایکبوون بە دەوڵەمەندی نەهاتوونەتە دونیا، خوای پەروەردگار هیچ شتێکی دروست نەکردووە مەگەر یەکەم جار بچووك بووە دواتر گەورە بووە، بازرگانیش بە هەمان شێوەیە.

بۆیە هەر کەسێك وا گومان ببات کە ماڵی بازرگانی بەبێ ماندووبوون بە دەست دەکەوێت ئەوە هەڵەی کردووە.

---

(١) المعجم الكبير، للطبراني، بە ژمارە (٩٣٨١).

# پیرەمێرد زۆر دەبن و گەنج کەم دەبنەوە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر ژمارەی گەنجان کەم دەبێتەوەو پیرەمێردەکانیش زۆر دەبن..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَبْعَثَ الْغُلامُ الشَّيْخَ بَرِيدًا بَيْنَ الأُفُقَيْنِ)[1].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا پیرەمێرد دەبێتە ژێر دەستەی گەنجان.

ئەم فەرموودەیە دوو واتا دەبەخشێت، لەوانە:

- گەنجەکان حوکم دەگێڕن و بە تەمەنەکان خزمەتیان دەکەن.
- گەنج کەم دەبێتەوەو پیرەمێرد زۆر دەبن.
- وە واتایەکی تریش هەڵدەگرێت کە ڕێزی گەورەکان ناگیرێت و سۆز بەزەییش بە بچوکەکاندا نایەتەوە..

ئەگەر سەیری حاڵی ئەمڕۆی خۆمان بکەین ئەوەندەی گەنج دەمرن لە ڕێگای ڕووداوە سەختەکانەوە پیرەمێردێك نامرێت، ڕۆژانە لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان هەواڵی مردنی ئەوەندەی گەنج بڵاودەبێتەوە مامە پیرەیەك زۆر بە دەگمەن بەر چاوت دەکەوێت بمرێت..

جا مردنی گەنجانیش بۆ زۆر هۆکار دەگەڕێتەوە لەوانە، شەڕو کوشتار، ڕووداوی سەیارە، ئەشکەنجەو ئازار.. هتد.

ئاگاداری کەسی بە تەمەن بن بە تایبەتی دایك و باوك، مەرج نییە هەموو شتێکیان بۆ دابین کردبیت لە دونیا، بەڵام بە تەواوەتی دڵنیابە ئەوان هەرچیان هەبووە پێشکەشتیانی کردووە.

---

(١) المعجم الكبير، للطبراني، بە ژمارە (٩٣٨١).

## زۆربوونی ڕۆمەکان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر زۆری ژمارەی ئەوڕوپیەکان و ئەمریکیەکانە، کە پێشتر پێیان دەوترا: ڕۆم..

ڕۆمەکان مەبەست لەوانەن ئەمڕۆ پێیان دەوترێت ئەوڕوپی و ئەمریکی، ڕەچەڵەکیشیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەصفەری ڕۆمی کوڕی عیصوی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم بۆیە پێیان دەوترێت نەوەی زەردەکان.

پێشەوا عەمری کوری عاص(ﷺ) دەڵێت:

گوێم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو دەیفەرموو:

(تَقُومُ السَّاعَةُ وَالرُّومُ أَكْثَرُ النَّاسِ، فَقَالَ لَهُ عَمْرٌو: أَبْصِرْ مَا تَقُولُ، قَالَ: أَقُولُ مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ(ﷺ)، قَالَ: لَئِنْ قُلْتَ ذَلِكَ، إِنَّ فِيهِمْ لَخِصَالًا أَرْبَعًا:

إِنَّهُمْ لَأَحْلَمُ النَّاسِ عِنْدَ فِتْنَةٍ

وَأَسْرَعُهُمْ إِفَاقَةً بَعْدَ مُصِيبَةٍ

وَأَوْشَكُهُمْ كَرَّةً بَعْدَ فَرَّةٍ

وَخَيْرُهُمْ لِمِسْكِينٍ وَيَتِيمٍ وَضَعِيفٍ،

وَخَامِسَةٌ حَسَنَةٌ جَمِيلَةٌ: وَأَمْنَعُهُمْ مِنْ ظُلْمِ الْمُلُوكِ)[١].

واتە: ڕۆژی دوایی دێت ڕۆم لە هەموو خەڵکی زیاترن، جا عەمری کوری عاص گوتی: جوان سەیرکە کە چی دەڵێی، گوتی: دەڵێم ئەوەی لە پێغەمبەرم(ﷺ) گوێ لێ بووە، جا مادەم وادەڵێی دەنا ڕۆمەکان چوار ڕەوشتی جوانیان هەیە:

بەڕاستی ڕۆم لە هەموو کەس نەرمترن لە کاتی ئاشوبدا.

وە لە گشت کەس بە پەلەترن بۆ ڕابوونەوەی لە دوای موصیبەتدا.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٢٢) باب: تقوم الساعة والروم أكثر الناس، برقم: (٢٨٩٨).

بەرگی دووەم

وە بەپەلەترینی دۆڕاوانن لە جەنگدا بۆ ڕووبەڕووبوونەوە.

وە باشترینیانن بۆ هەژارو بێهێزەکان.

وە پێنجەمیش چاکەی بە ڕێك و جوانی ئەنجام دەدەن، پاشاکانیان قەدەغە کراون لە ستەم کردن لە خەڵك.

پێم وایە ئەم سیفاتانە لە هەندێك لە ڕۆمەکان هەیە نەك هەموویان، بۆیە سیفەتی ڕۆمەکان ئەوەیە کە نەرم و نیانن، چونکە ئەوان لە جەوێکی باراناوی دەژین، هەروەها لە دوای هەموو شەڕێکیش هەڵدەستنەوە شارەکان بنیات دەنێنەوە.

ئەگەر بگەڕێینەوە سەبارەت بە زۆری ژمارەی ڕۆمەکان، ئەوا چەند واتایەك لە خۆی دەستەبەر دەکات، لەوانە:

- زەوی پڕ دەکەن لە دروستکراوەکان و داهێنانەکانی خۆیان.
- یان ئەوەی وڵاتانی ئیسلامی بێت داگیری دەکەن و دەستکەوتەکان بۆ خۆیان دەبەن.
- یان مەبەست پێی مەسیحیەکانە.

دایکمان ئوم شورەیك (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَيَفِرَّنَّ النَّاسُ مِنَ الدَّجَّالِ فِي الْجِبَالِ،

قَالَتْ أُمُّ شَرِيكٍ:

يَا رَسُولَ اللهِ فَأَيْنَ الْعَرَبُ يَوْمَئِذٍ؟

قَالَ: هُمْ قَلِيلٌ)[١].

واتە: خەڵکی لە دەجال هەڵدێن بەرەو چیاکان

ئوم شورەیك گوتی:

ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەرەب لەو ڕۆژەدا لە کوێن؟ فەرمووی: ئەوان لەو ڕۆژەدا کەمن.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٦٦) باب: في بقية من أحاديث الدجال، برقم: (٢٩٤٥).

لەوانەشە بوترێت واتای زۆربوونی ڕۆم ئاماژەیەکە بۆ بڵاوبوونەوەی زمانی ئینگلیزی و سەرەتای واز لێهێنانی زمانی عەرەبی.

تەنانەت هەندێك لە زانایان دەڵێن:

عەرەب ئەو کەسەیە بە عەرەبی قسە بکات، بیابان نشینیش ئەو کەسەیە نیشتەجێی بیابان بێت با عەرەبیش نەبێت.

١) ئەمڕۆ عێراق و سوریا خەریکە بە فارس بکرێت و نەفرەت لە جنسیەی عێراقی بکەن.

٢) ئەمڕۆ لوبنان خەریکە بە مارۆنی بکرێت و هەستان عروبەتیان لەبەر داکەناندراو دەڵێین: ئێمە گەلێکی فینیقین.

٣) لە مەغریب کەسانێك پەیدابوون، دژایەتی عەرەبیان دەکردو لە میصریش دەیانەوێت بانگەوازی فیرعەونی و قیبتی بەربڵاوبکەنەوە.

٤) ئەمڕۆ زۆر لە عەرەبەکان لە چاوەڕێی ئەوەدان ناسنامەی عەربیان بگۆڕن بۆ ئەوروپی، تەنانەت هەندێکیان دەیانەوێت خۆیان ڕزگار بکەن لە ئەهلی جەزیرەی ئیسلام و بەرەو وڵاتانی تر.

پێشەوا ئیبنو قەییم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

زانراوەکان کۆبوونەتەوە لەسەر ئەوەی کە هەموو خێرو چاکەیەك بنچینەکەی سەرخستنی خوای گەورەیە بۆ بەندەکانی

وە هەموو شەڕو خراپەیەك بنچینەکەی لادانی بەندەکەیەتی لە ڕێگەی ڕاستەکەی خوای گەورە[1].

کەواتە با ئاگاداری عەقیدەو ئیمان و باوەڕمان بێت، زەردەخەنەیەکی ئەوان بە واتای ئەوە نایەت کە ئەوان دۆستی ئێمەن.. هەرگیز !!!

---

(١) فوائد الفوائد، (لا ٧٩).

## ئازادکردنی (ڕۆما)ی پایتەختی ئیتاڵیا

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر کە تا ئێستا نەهاتۆتە دی ئەویش ئازادکردنی ڕۆمای پایتەختی ئیتاڵیایە..

ڕۆما دەکەوێتە هەردوو دوورگەی قوبرص و رودس یان لای بۆسنەو هەرسك، یان لای ئەستەنبوڵ، ئەمانەش هەموویان موژدەی داهاتوون..

لە دیدی ئاینی ئێمەدا فتحکردن و ئازادکردنی وڵاتان بۆ وەرگرتن یان وەرنەگرتنی ئەم ئایینە بە دوو شێوە دەکرێت: فەتحی سەربازی و فەتحی ڕۆشەنبیری، لە دەقە ئایینەکاندا ئەمە ڕۆشنەو لە واقیعی ئێستای موسڵمانانیشدا ئەمەش هەر ڕۆشنە.

ئیمامی ئەحمەد لە پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە(ﷺ) ڕیوایەت دەکات کە لێیان پرسیوە کام شار سەرەتا ئازاد دەکرێت، ئەویش داوای کرد سندوقێکی بۆ بهێنن کە بە زنجیر دایخستبوو، کتێبێکی لە سندوقەکە دەرهێناو عەبدوڵلا گوتی: ڕۆژێکیان لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) بووین شتمان دەنووسی، یەکێ پرسی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)! کام شارەیان لە پێشدا فەتح دەکرێت، قوستەنتینە یان ڕۆما؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (مَدِينَةُ هِرَقْلَ تُفْتَحُ أَوَّلًا، يَعْنِي: قُسْطَنْطِينِيَّةَ)[1] واتە: شاری هیرەقل ئازاد دەکرێت یەکەمجار، واتە: قوستەنتنیە.

ئەگەر سەیری وشەی (تُفْتَح) بکەین بە کرداری ڕانەبردوو هاتووە، واتە: بە بەردەوامی ئەم وڵاتە ئازاد دەکرێت، بەڵام تا ئێستا (ڕۆما) کە پایەتەختی (ئیتاڵیا)یە ئازاد نەکراوە.

---

(١) صحيح: رواه الإمام أحمد في (المسند) (٢/ ١٧٦)، والحاكم في (المستدرك) (٣/ ٤٢٢) برقم: (٨٣٠١) وصححه ووافقه الذهبي/ والألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة برقم: (١٩٣٤).

وه (قسْطَنْطِينِيَّة) پێی دەوترا (ئیسلامبۆل) کە پایتەختی تورکیا بوو، دواتر ناوەکەی گۆڕدرا بە (ئەستەنبۆڵ).

دەی ئەوە ڕۆشنە کە محەممەدی فاتح فەتحی قوستەنتنیەی کرد لە ساڵی (١٤٥٣)ع، ئەوەی ماوەتەوە فەتحی (ڕۆما)ی پایتەختی ئیتالیا بکرێت و ئیسلام بچێتە ئەوێ و دەسەڵات پەیدا بکات، ئەم فەتحەش مەرج نیە فەتحێکی سەربازی بێت، بەڵکو دەکرێ فەتحێکی ڕۆشنبیری و فیکری و ژیاری بێت وەك چۆن ئەو هەموو وڵاتەی دی ئیسلام تیایاندا بڵاوبوویەوەو گەشەی کردو دەسەڵاتیشی پەیدا کردو یەك سەربازی موسڵمانیش نەچوویە ناوی.

ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) موژدە دەدات بە ئازادکردنی شاری قوستەنتنیە، مانای ئازادکردنیش ئەوەیە کە سەر لە نوێ ئیسلام دەگەڕێتەوە بۆ ئەوروپاو فەتحی ئەو کیشوەرە دەکات جارێکی تر، هەر چەندە دووجار دەرپەڕێنراوە، جارێك لە ئەندەلوس و جارێکیش لە بەلقان.

مەرجیش نیە ئەم فەتحەی کە فەرموودەکە دەیکاتە وەعدو هەر دەبێ بێتە دی، حەتمەن دەبێت لە ڕێگەی شەڕو شمشێرەوە بێت..

بە بڕوای من.. فەتحی ئەم جارەی ئەوروپا بە چەکی فیکرو بانگەواز دەبێت.. نەك بە شمشێرو تۆپباران، فەتحی ئاشتیانەش لە ئیسلامدا بەڵگەو بناغەی هەیە، ئەوەتا لە ئاشتینامەی حودەیبیەدا خوای گەورە دەفەرموێ: [إِنَّافَتَحْنَالَكَ فَتْحًامُّبِينًا] پێشەوا عومەر پرسی: باشە قوربان (ئەمە ئاشتییە) فەتحە؟ فەرمووی: بەڵێ ئەوە فەتحە.. چونکە عومەر وای ئەزانی بەبێ شەڕ فەتح دروست نابێت.

بەڵێ ئەوەبوو ساڵی (١٩٩٥)ع واتە: بە زیاتر لە (١٤٠٠) ساڵ پاش فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لە شاری ڕۆما منارەی یەکەمین مزگەوت چوو بە ئاسمانداو بوویە خێرو بەرەکەت بۆ ئەو وڵاتە، ئەم مزگەوتەی ڕۆما لە جوانترین گەڕەکی شاردا دروستکراوە کە گەڕەکی (یاریولی)یە کە تەنیا(١٠) کم لە ڤاتیگانەوە دوورە، پاش ماوەیەکی زۆر کەم یەك ملیۆن موسڵمان ئیسلامەتیان ڕاگەیاندو ئەمەش بووە هۆی ئەوەی قەشەو پیاوانی کڵێسە لێیان بکەونە تەقەو

بەر دەرگای دادگایان پێ بگرن و بکەونە کێشە نانەوە بۆیان، بەڵام پشت بەخوا سەرکەوتوو نەبوون، نەك ئەوە بەڵکو لە ماوەیەکی زۆر کەمدا زیاتر لە (٥٠٠) گاوری کاسۆلیکی ئیسلام بوونی خۆیان ڕاگەیاند.

موسڵمانانی ڕۆما چوار دەوری ئەو مزگەوتەیان کردووە بە باخ و باخات و گوڵ و گوڵزارو ئەوەندەی تر گەڕەکەکەیان ڕازاندۆتەوە، سەیر ئەوەیە شارەوانی ڕۆما ویستی لە دووری (١٥٠)م لە مزگەوتەکەوە کۆگای خۆڵ و خاشاك دابنێ و تێیدا کۆیبکاتەوە، خوا کردی ئەم هەوڵەشیان شکستی خواردو بۆیان نەچوویە سەرو موسڵمانان بەردەوام بوون لە بڵاوکردنەوەی پەیامی خۆیاندا، کەواتە دوور نیە ئەمجارەیان ئیسلام لە ڕێگەی فیکرو بەها باڵا ژیاریەکانیەوە فەتحی ئەوروپا بکات نەك لە ڕێگەی سەربازییەوە.

پێشەوا موعازی کوڕی جەبەل (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (عِمْرَانُ بَيْتِ الْمَقْدِسِ خَرَابُ يَثْرِبَ، وَخَرَابُ يَثْرِبَ خُرُوجُ الْمَلْحَمَةِ، وَخُرُوجُ الْمَلْحَمَةِ فَتْحُ الْقُسْطَنْطِينِيَّةِ، وَفَتْحُ الْقُسْطَنْطِينِيَّةِ خُرُوجُ الدَّجَّالِ)[1].

واتە: ئاوەدانکردنەوەی (بيت المقدس) کاول بوون و وێرانبوونی مەدینەی بەدوادا دێت، دەرچونی جەنگە گەورەکەش ئازادکردنی (قوسطنطنية)[2] ی بەدوادا دێت، ئازادکردنی (قوسطنطنية)یەش دەرچونی دەجالی بەدوادا دێت.

وە ئەوەندەی بۆی بچم کە ئەم فەرموودەیەی باسی ڕۆما دەکات ئیشارەتە بۆ گەڕانەوەی ئەندەلوسی دووەم بۆ ژێر دەسەڵاتی موسڵمانان.

---

(١) المستدرك على الصحيحين (٤/ ٥٨٣) برقم: (٨٣٦٦). قال الإمام الحاكم: إِسْنَادُهُ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الرِّجَالِ.

(٢) (قوسنطنطيه) ئێستا پێی دەگوترێ (ئەستەمبوڵ) یەکێك لە شارە گەورەکانی وڵاتی (تورکیا) لە کۆندا پێی گوتراوە (بیزه نطه)، بەڵام کاتێك (قوسطنطين)ی گەورەی ڕۆمەکان دەستی بەسەردا گرت، شورایەکی بەدەوریدا کردو ناوینا (قوسنطنطيه)و کردیە پایتەختی ناوەندی دەسەڵاتەکەی. (المنجد فی الاعلام ٤٣٨ ٤٣٩ .. معجم البلدان ٤/ ٣٤٧ ٣٤٨).

## لەناوچوونی هۆشمەندو پیاوچاکان و دەرکەوتنی خەڵکانی نەفام

ئەوەش یەکێکە لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر کە سەران و پیاو ماقوڵ و هۆشمەندو زانایان بمرن و ئەوانەش کە دێنە جێگایان نەفام و ئاژاوەچی و نزم بن، چونکە گۆڕەپانەکانیان بۆ چۆڵ بووە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى .. يَهْلِكَ الْوُعُولُ، وَيَظْهَرُ التُّحُوتُ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الْوُعُولُ وَمَا التُّحُوتُ؟ قَالَ: الْوُعُولُ وُجُوهُ النَّاسِ وَأَشْرَافُهُمْ، وَالتُّحُوتُ الَّذِينَ كَانُوا تَحْتَ أَقْدَامِ النَّاسِ لَا يُعْلَمُ بِهِمْ)[1].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت تاکو (وعول) لە نێو نەچن و (تحوت) سەر هەڵنەدەن، وتیان: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو دوو شتە واتای چیە؟ فەرمووی: (الوعول) لەناوچوونی سەران و پیاو ماقوڵان و (التحوت)یش دەرکەوتنی ئەوانەی کە لە ژێر پێی خەڵکیدا بوون و کەس نەیدەناسین لەوانەشە دەرکەوتنی ئەو جۆرە کەسانە بە وەرگرتنیان بێت بۆ هەندێ پۆست و پلەو پایەو خزمەتکردنیان لەلایەن کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و تەپڵ لێدەر بۆیان، (وعول)یش مەبەست لەو پیاوە سالارو هۆشمەندو ئامۆژگارە نادیارانەن کە دوور دەخرێنەوە لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن.

ئیتر ئەوانە ناوبانگ دەردەکەن لە نێو خەڵکیدا ئەوانەن کە خەریکی گۆرانی و سەماو بەدڕەوشتین، بەڵام زاناو داهێنەرو کارامە لە پزیشکی و ئەندازیاری و شتی لەو شێوە جێگایان نییە.. ئەم نیشانەیەش زۆر بە ئاشکرایی دیارە سەرەڕای بایەخدانی خەڵکی بەوانەو کۆڕی ئایینی و لە زۆر وڵاتاندا دەبینی چۆن موسڵمانان ڕێز لە زانایان دەگرن و گرنگی دەدەنە کۆڕەکانی یادکردنەوەو بەدواداچوونی بەرنامە ئایینیەکانی کەناڵە ئاسمانیەکان کە ڕۆژ دوای ڕۆژ لە زیادبووندان، تەنانەت تەماشاکردنی ئەوانەش کە موسڵمان نین بۆ بەرنامە ئایینیەکان مەسەلەیەکی بەرچاوەو سوودی زۆری لێ کەوتووەتەوە.

---

(١) المستدرك على الصحيحين (٤/ ٥٩٠) برقم: (٨٦٤٤).

## خەڵکی خۆی لە حەرام ناپارێزێ!

ئەگەر موسڵمان لە خوا ترسانی کەم بێتەوە دینداری لاواز دەبێت دەکەوێتە مەسەلەی گومان لێکراوو قەدەغە کراوەوە، ئینجا بێ باك دەبێت لەوەی سەرچاوەی مامەڵەی لە حەڵاڵ بێت یان لە حەرام.. ئەمەش لەسەردەمی خۆمان ڕوویداوە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:

(لَيَأْتِيَنَّ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ لاَ يُبَالِي الْمَرْءُ بِمَا أَخَذَ الْمَالَ ، أَمِنْ حَلاَلٍ أَمْ مِنْ حَرَامٍ)[1].

واتە: سەردەمێك بەسەر خەڵکی دێت ئینسان گوێ نادات کە پارەکەی لە کوێوە پەیدای دەکات لە حەڵاڵەوە یان لە حەرامەوە.

ئەگەریش ئەمڕۆ سەرنج بدەیت دەبینی خەڵکێکی زۆر هەوڵی بێ وچان دەدەن بۆ ماڵ کۆکردنەوە بە هەر شێوازێك بێت.

هەر بۆیە مەسەلەکان لە دەست دەرچوونەو خەڵکی کەمتەرخەمی دەکەن و هەڵدەستن بە ئەنجامدانی کارو بازرگانی کردن بە جگەرەو ئارەق و بیرەو فرۆشتنی جل و بەرگی ناشەرعی بۆ ئافرەتان و مامەڵەکردن بە سوو بە کرێدانی دوکان بە کەسێك بازرگانی حەرامی تێدا ئەنجام دەدات.

ئەوانەش کە خۆیان لە حەرام دەپارێزن نامۆ بوونە لە نێوان خەڵکیدا، لەوانەشە نەتوانێت بەردەوام بێت ئەگەر بەرتیل وەرنەگرێت، بۆیە هەر کەسێك خۆی بپارێزێت لە شتی گومان لێکراو ئایین و ئابڕووی خۆی پاراستووە، ئەوەشی بکەوێتە شتی گومان لێکراوەوە، دەکەوێتە حەرامەوە.

---

(١) صحيح البخاري (٣/ ٥٩) باب: قول الله تعالى: (يا أيها الذين ءامنوا..) برقم: (٢٠٨٣).

ئەو کەسەی لە خوا نەترسێ باکی نییە لەوەی سامان لە کوێ بە دەست دەهێنێ و لەچی خەرجی دەکات؟

بەڵکو مەبەستی تەنیا زیادکردنی ڕێژەی سامانەئەگەر چی بە حەڕامی و ڕێگای ناشەرعی بێت، وەکو دزی، یان بەرتیل، یان دەست بەسەر داگرتن، یان تەزویرو گزی کاری، یان مامەڵەی حەڕام، یان ڕیبا، یان خواردنی ماڵی هەتیو، یان کرێ وەرگرتن لەسەر کارێکی حەڕام، وەکو جادوو داوێنپیسی و گۆرانی، یان وەکو دەستدرێژی کردن بۆ سەر ماڵی موسڵمانان و سامانی گشتی، یان بردنی ماڵی غەیری خۆی بەناچارکردن یان سواڵ کردن بەبێ پێویستی وێنەی ئەمانەش، پاشان ئەو لێی بخوات و لەبەری بکات لەوە ئۆتۆمبێل دابین بکات و خانوی پێ دروست بکات و کرێی پێ بدات و کەل و پەلی پێ دابین بکات و ماڵی حەڕام بخاتە ناو سکیەوە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

هەرچی گۆشتێك لە حەڕامەوە زیادی کردبێت ئەوا ئاگر شایستەترە بۆی[1].

لە ڕۆژی دواییش پرسیار لە سامانی دەکرێتەوە لە کوێوە بە دەستی هێناوە؟

لەچی دا خەرجی کردووە؟

لەوێ وە لەناوچوونی و دۆڕانی پێ دەبرێ، جا ئەو کەسەی سامانی حەڕامی لەلایە پێویستە لەسەری پەلەی بکات بەوەی خۆی لێ ڕزگار بکات، جا ئەگەر مافی مرۆڤێك بێت بەپەلە بیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنی لەگەڵ ئەوەی داوا لێبوردنی لێ بکات بەر لەوەی ڕۆژێك دابێت بە پارەو پول چارەی نەکرێ، بەڵکو بە چاکەو خراپە مامەڵەی لەگەڵ دا بکرێ..

هەرگیز مەڵێ.. ئەگەر پارەم لە ڕێگای حەڕام پەیدا کردبوایە دەوڵەمەند دەبووم، شتێکت بیر بێت ئەگەر هەموو دەرگایەك لە ڕودا دابخرێ بەڵام دەرگای خوای گەورە هەرگیز داناخرێت.

---

(١) صحيح الجامع، برقم: (٤٤٩٥).

## شەڕکردن لەگەڵ ڕۆمەکان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی کە لەم سەردەمەدا سەری هەڵدا شەڕکردنە لەگەڵ ڕۆمەکان..

شتێکی زانراوە کە شەڕ کردن لەگەڵ ڕۆمەکان لە دێر زەمانەوە هەبووە بە تایبەتی ئەو کاتانەی کە موسڵمانان شام و ئەندەنوسیان ئازاد کرد.. دواتر شەڕکردن لەگەڵ خاچپەرستەکان و لەم ڕۆژگارەشدا وڵاتێکی وەکو ئەمریکا نمونەی ڕۆم دەگێڕێت لەم سەردەمەدا، بە تایبەتی چەندین وڵاتی تریشی لەگەڵدایە لەوانە (پۆڵەندا و بەریتانیاو ئیسپانیا.. هتد) وە شتێکی زانراوە کە زۆربەی جوولەکەکانی ئەم سەردەمە لە ڕۆمەکانن..

لەوانەیە کەسێك پرسیار بکات و بڵێت: ئایا ئەمەریکا پێی دەوترێت ڕۆم ؟

لە وەڵامدا دەتوانم بڵێم بەڵێ.. چونکە ئەمریکا زۆربەی دەوڵەتانی ئەوروپی لە خۆی گرتووە، تەنانەت هیندیە سورەکانی ئەمریکای ئیبادە کرد، بۆیە خەڵکێکی زۆری لە هەر یەکێك لە وڵاتانی ئیسپانیا و ئینگلیزو پورتوگال و ئێرلەندییەکان بە شێوەیەکی گشتی کۆچیان کرد بەرەو ئەمریکای باکوور..بۆیە بە پێی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کۆتایی بونەوەردا وڵاتێکی وەکو ئەمریکا پەیمان شکێنی لەگەڵ موسڵمانان دەکەن..

پێشەوا عەوفی کوڕی مالیك (ﷺ) دەڵێت: لە شەڕی تەبووك چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) کە لە ژێر خێوەتێکی چەرمدا بوو دەیفەرموو: (اعْدُدْ سِتًّا بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ مَوْتِي .. ثُمَّ هُدْنَةٌ تَكُونُ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ بَنِي الأَصْفَرِ فَيَغْدِرُونَ فَيَأْتُونَكُمْ تَحْتَ ثَمَانِينَ غَايَةً تَحْتَ كُلِّ غَايَةٍ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا)[1]. واتە: شەش شتان بژمێرە لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی: پاشان ڕێککەوتنامەیەك لە نێوان ئێوەو بەنی ئەسفەر واتە: (وڵاتانی ڕۆژئاوا) دەبێ ئینجا بەنی ئەسفەر غەدر دەکەن و پەیمانەکە دەشکێنن، بە لەشکرێکی هەشتا ئاڵاییەوە دێنە سەرتان، وە هەر ئاڵایەك دوانزە هەزار کەسی لەگەڵ دایە.

---

(١) صحيح البخاري (١١/ ٣٠٦) كتاب: الفتن، باب: ما يحذ من الغدر، برقم: (٧١٢٠).

## سەرهەڵدانی بێ ئابڕوویی

یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر دەرکەوتنی بێ ئابڕوییە، وەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَظْهَرَ الْفُحْشُ..)[١].

واتە: سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بە دەستە، ڕۆژی دوایی هەڵناسێت تاکو بێ ئابڕوویی سەر هەڵنەدات.

لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: (مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ الْفُحْشُ وَالتَّفَحُّشُ، وَقَطِيعَةُ الْأَرْحَامِ..)[٢].

واتە: لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی خراپەکاری و داوێن پیسی و بێ ئابڕوویی و پچڕاندنی سیلەی ڕەحم دەپچڕێت.

واتای (الفحش والتفاحش) چییە؟

ئیبنو مەنظورو ئیبنو ئەثیرو جگە لەوان لە ئەهلی زمانەوانی فەرموویانە: (الفحش والتفاحش) بریتییە لە هەموو وتەو کردەوەیەکی ناشیرین و ناقوڵا[٣].

بە زمانی کوردەواری خۆمان ئەو کارەیە کە خواو پێغەمبەرەکەی نیگەران و تورە دەکات ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) کارێکی خراپەکاری ببینیایە ڕووبەڕووی دەبۆوەو دژایەتی دەکرد.

هەر یەکێك لە ئێمە دەتوانین لە ڕێی قورئان و سوننەتەوە پێوانەیەك بۆ خراپەکاری بە زمان و بە کردەوە دیاری بکەین.

---

(١) صحيح: رواه الحاكم في (المستدرك) (١/ ١٣٧) برقم: (٢٥٣) وقال الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

(٢) المعجم الأوسط (٢/ ٩٣) برقم: (١٣٥٦). ومسند البزار (٢/ ٣٦٣) برقم: (٧٥١٨). وقال الهيثمي في مجمع الزوائد (٢٨٤/٧) رجاله ثقات. وصححه الألباني: في (صحيح الجامع) برقم: (٥٨٩٤).

(٣) لسان العرب (٦/ ٣٢٥) ماددة: (فحش).

کاتێك بەدڕەوشتی بەرپا دەبێت (الفحش) واتە: ئەنجامدانی بەدڕەوشتی بە کردەوە (التفاحش) واتە: باسکردنی بەدڕەوشتی بە زارەکی..

بۆ نموونە ئەو ئافرەتانەی لە نمایشکردنی جلوبەرگی ڕووت و دانەپۆشراودا بەشداری دەکەن ئەوە جۆرێکە لە بەدڕەوشتی بەڵام گواستنەوەی ئەو پێشبڕکێیە بە هۆی گۆڤارو باس و خواسی (التفاحش)ە واتە: بڵاوکردنەوەی خراپەکاری لە نێو باوەڕداراندا.

(الفحش) مەبەست لە بێ ئابڕوویی و شلڕەوییە لە جل و بەرگ و قسەی ناشیرین کە جێگای شەرمەو جنێودان و نەفرین لێکردن، پێغەمبەریش(ﷺ) هەرگیز قسەی ناشیرینی بە دەمدا نەهاتووە..

بەڕاستی وتەو کردەوەی ناشیرین و ناقۆڵاو نارێك بڵاوبووتەوە بە شێوەیەکی وا کەسی باوەڕدار باوەڕەکەی بە فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) زیاترو زۆرتر دەبێت کەوا ئەم فەرموودانەی فەرمووە، چونکە ئەوانە چەند وشەیەکن لە چرای پێغەمبەرایەتیەوە دەردەچن.

لەم سەردەمەدا وشەی خراپ و ناشیرین و سووك و ریسوا زۆر بووە بە تایبەتی لە ماڵ و دەزگاکانی ڕاگەیاندن و فیلمەکان و کەناڵە ئاسمانیەکان تەنانەت چەندەها کەناڵ بە تەواوی تایبەت کراوە بۆ وێنە گرتنی خراپەکاری و داوێنپیسی.

پێشەوا زوهەیری بابی عابید (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

(إن كنت سلمت من المعاصي فإنك في عافية وإلا فلا داء أدوي من الذنوب)[1].

واتە: ئەگەر سەلامەت بووی لەتاوانکردن و خراپەکاری ئەوە تۆ لە عافیەو سەلامەتیدایت، ئەگەر نا ئەوا هیچ نەخۆشیەك خراپتر نییە لە تاوانکردن.

کەواتە با هەوڵ بدەین باشترین و جوانترین تەوبە ئەنجام بدەین کە ببێتە هۆی ڕەزامەندی خوای گەورە.

---

(١) التوبة لإبن أبي الدنيا (لا ٥٠).

## لەبەرکردنی جل و بەرگی تەیلەسانی

یەکێك لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر دەرکەوتنی ئەوانەن کە جل وبەرگی تەیڵەسانی لەبەر دەکەن.

پێشەوا ئەبو زەری غیففاری (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إذا اقتَرَبَ الزمانُ كثُرَ لَبْسُ الطَيَالِسَةِ..)[1].

واتە: لەگەڵ نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی لەبەرکردنی جل وبەرگی تەیڵەسانی زۆر دەبێت..

وشەی (طيالسه) کۆی (طيلسان)ە، وە بە (تەیلەسان) یان (تەیلوسان) دەخوێندرێتەوە لە بنەڕەتدا وشەیەکی عەجەمیەو بە عەرەبی کراوە، لە کتێبی (معيار اللغه)شدا بە واتای جل و بەرگێکی چنراو هاتووە کە نادورێت، بەسەر شاندا دەدرێت و لەش دادەپۆشێت.

(طەیلسان) پۆشاکێکە وەکو عەبا دەدرێت بەشانداو لەشی مرۆڤ دادەپۆشێت و بە زۆری ڕەنگی سەوزەو زیاتر زانایانی ئاینی جولەکەو موسڵمان لەبەری دەکەن[2].

لە ساڵی ٢٠٠٩ ع خۆم لە شاری ئەسفەهان زانایە جولەکەکانم بینی کە ئەم تەیلەسانەیان لەسەر شان بوو.

---

(١) رواه الحاكم برقم: (٥٤٦٥).. قال الحاكم: هذا حديث تفرد به سيف بن مسكين عن المبارك بن فضالة، والمبارك بن فضالة ثقة..

(٢) الرقائق للعريفي، د. محمد بن عبدالرحمن العريفي، لا ٣٨٧.

# فەرمانڕەوایەتی نادانان

چاکی زۆربەی خەڵکی پەیوەستە بە چاکی فەرمانڕەواکانیانەوە، خراپیشیان بە هەمان شێوە، پێغەمبەریش(ﷺ) ئاگاداری کردوینەتەوە کە یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر سپاردنی کارەکانە بە نادان کە پەیڕەوی ناکەن بە قورئان و سوننەت و ئامۆژگاری لێ وەرناگرن.

پێشەوا جابری کوڕی عەبدوڵلا (ﷺ) دەڵێت:

جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە کەعبی کوری عوجەرەی فەرموو:

(أَعَاذَكَ اللَّهُ يَا كَعْبُ مِنْ إِمَارَةِ السُّفَهَاءِ قَالَ: وَمَا إِمَارَةُ السُّفَهَاءِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: أُمَرَاءُ يَكُونُونَ بَعْدِي، لَا يَهْدُونَ بِهَدْيِي، وَلَا يَسْتَنُّونَ بِسُنَّتِي، فَمَنْ صَدَّقَهُمْ بِكَذِبِهِمْ، وَأَعَانَهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ، فَأُولَئِكَ لَيْسُوا مِنِّي، وَلَسْتُ مِنْهُمْ وَلَا يَرِدُونَ عَلَى حَوْضِي، وَمَنْ لَمْ يُصَدِّقْهُمْ بِكَذِبِهِمْ وَلَمْ يُعِنْهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ فَأُولَئِكَ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُمْ، وَسَيَرِدُونَ عَلَيَّ حَوْضِي، يَا كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ، الصَّوْمُ جُنَّةٌ، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الْخَطِيئَةَ، وَالصَّلَاةُ قُرْبَانٌ - أَوْ قَالَ: بُرْهَانٌ - يَا كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ، لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ لَحْمٌ نَبَتَ مِنْ سُحْتٍ أَبَدًا، النَّارُ أَوْلَى بِهِ، يَا كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ، النَّاسُ غَادِيَانِ فَمُبْتَاعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُهَا - أَوْ قَالَ: فَمُوبِقُهَا)[١].

واتە: خوای گەورە پەنات بدا لە فەرمانڕەوایەتی نادانان، وتی: واتای فەرمانڕەوایەتی نادان چیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: هەندێ فەرمانڕەوا لە دوای من دێن پەیڕەوی لە ڕێنموونی من ناکەن و لەسە ڕێبازی من ڕێ ناکەن، هەرکێ باوەڕ بە درۆیان بکات و یارمەتیان بدات لە ستەمکردنیاندا، ئەوانە لە من نین و من لە ئەوان نیم و نایەنە سەر حەوزەکەم، هەر کەسیش باوەڕیان پێ نەکات و یارمەتیان نەدات لە ستەمەکەیاندا، ئەوانە لە منن و من لە ئەوانم و بەخشیش تاوان دەکوژێنێتەوە، نوێژیش نزیکبوونەوەیە (یان فەرمووی

---

(١) المستدرك (٤/ ٤٦٨) برقم: (٨٣٠٢). قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

بەڵگەیە) ئەی کەعبی کوڕی عوجەرە هیچ گۆشتێك ناچێتە بەهەشتەوە بە حەرام پەروەردە کرابێت، بەڵکو دۆزەخ پێی لە پێشترە، ئەی کەعبی کوڕی عوجەرە خەڵکی دوو جۆرن: یان خۆیان دەکڕن و ئازادی دەکەن یان فەرمووی تیای دەبەیت.

(السفیه) واتە: ئەقڵ سووك و کەم شارەزایی، کە ناتوانی کاروباری خۆی بەڕێوە ببات نەخوازەڵا کاروباری خەڵکی.. یان بە شێوازێکی تر بڵێین: ئەو کەسەیە کە دەرك بەو کارە ناکات کە ئەنجامی دەدات لەگەڵ ئەمەشدا عەقڵی هەیە.. بەڵام وشەی (إِمَارَةُ السُّفَهَاءِ) کە لەفەرموودەکەدا هاتووە، واتە: بەرپرسێك دەبینێت لە دەزگایەکدا بە چاکی بەڕێوەی نابات و هەڵسوکەوت و ڕەفتاری دروست ئەنجام نادات و دژایەتی خاوەن ژیرییەکان دەکات ئەوانەی کە خاوەن بەڵگەو ژیری تەواون.

جا ئەگەر پادشاو سەر گەورەو فەرمانڕەوایانی موسڵمانان بەم شێوەبن، هەموو هەل و مەرجەکان ئاوەژوو دەبن، درۆزن متمانەی پیٚ دەکرێت و دەستپاك بە ناپاك دادەنرێت و نەفام قسە دەکات و زانا بێدەنگ دەبێت.

پێشەوا شەعبی (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت: کۆتایی بونەوەر نایەت تا زانست نەبێتە نەفامی و نەفامی نەبێتە زانست.

ئەمەش هەمووی لە ئاوەژوویبوونەوەی ڕاستیەکانە لە کۆتایی بونەوەر.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عومەرەوە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يُوضَعَ الْأَخْيَارُ وَيُرْفَعَ الْأَشْرَارُ)[1].

واتە: یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر ئەوەیە پیاوچاکان سووکایەتیان پیٚ بکرێت و خراپەکاران بەرز دەبنەوە.

---

(١) صحيح: رواه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٥٥٤) برقم: (٨٦٥٩) وصححه ووافقه الذهبي، وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة (٢٨٢١).

بەرگی دووەم

## زۆربوونی زینا و داڕووخانی بەها ڕەوشتیەکان

بەها ئەخلاقیەکان چاکترین ڕێکخەری ژیانە لە ناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی، بەڵام ئەمرۆ ئەم بەها ئەخلاقیانە کە لە کۆمەڵگادا دەمانپارێزێ وا خەریکە چوار دەوری گیراوەو کەوتۆتە بەر هەڕەشە، ئەو نیشانانەو هێمایانەش کە ئاماژە دەرن بۆ داڕوخان و ڕەوشت و ئەخلاق کە دووچاری زۆرێك لە کۆمەڵگاکاندا هاتووە کە ئەمانەن: لادانی سێکسی، بازرگانی کردن بە ئافرەتانی بێ ئابڕو، زینا کردن، لەشفرۆشی، تەعەدا کردن لە منداڵ، زیادبوونی ئەو نەخۆشیانەش کە لە ڕێگای کاری بەدرەوشتیەوە ئەنجام ئەدرێت، ئەم کارە قێزەوەنەش وا دەکات کە دوو چاری مرۆڤ ببن.

فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بە ڕوونی پێمان ڕادەگەینێت کە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی ئەم کردەوە خراپانە زۆر دەبێ و بەبێ شەرم و ئابڕوییش ئەنجام ئەدرێت.

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە پەرتوکی (فتح الباری) لە تەبەرانیەوە دەگێڕێتەوە لە بارەی کەم تەرخەمی و بێ شەرمی ئافرەتان لە کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی کە دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ڕۆژی دوای نایەت هەتا وای لێدێت ئافرەتێك بە لای کۆمەڵێ پیاوا کە دانیشتوون ڕادەبوێرێ و یەکێ لەو پیاوانە لە جێگەی خۆی بەرز دەبێتەوەو هەڵدەستێ گیانی وەکو کلکی ئاسکی مێچکە بەرز دەبێتەوە، ئینجا لەگەڵ ئەم ئافرەتە دەست دەکەن بە کاری ناڕەوا بە بەرچاوی ئەم کۆمەڵەوە یەکێ لەم کۆمەڵە ئەم کارەی زۆر پێ ناخۆشەو بەڵام چاری نیە ئەوەندە نەبێ کە دەڵێ دەبوایە لای کەمی بچونایەتە پاڵ دیوارێ، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ئەوەی لەو کاتەدا ئەوەیان پێ دەڵێ پلەو پایەو پاداشی وەکو ئەوانە وایە کە لەگەڵ ئێوە دانیشتوون واتە: ئەبوبەکرو عومەر.

بە ڕاستی فەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هەمووی هاتۆتە دی، بۆیە دەیان ڕووداوی لەم جۆرە لە کوچەو کۆڵانەکانی شارێکی وەك ئەستەنبۆڵ دەبینرێت کە بۆ ماوەی (٥٠٠) ساڵ بنکەی خیلافەتی ئیسلامی و سەرچاوەی خوا پەرستی و ڕەوشت و بەها پیرۆزە ئیسلامیەکان بوو، تەنانەت لەو شارەدا بازاڕی وای تێدایە، کە ئافرەت وەکو هەموو کاڵایەکی تر بە ڕووتی بە بێ بەرگ و پۆشاکێك لە جامخانەی تیاترۆخانەکاندا دانراوەو نرخی تایبەتیان لەسەرە..

بێگومان زیناکردن کۆمەڵگا تووشی بەدبەختترین چارەنوس دەکات، لەوانەش دەبێتە هۆکاری تێکەڵبوونی (نەسەب) و (ڕەچەڵەك) و کۆتایی بە ماڵکاولبوون دێت، کە لە زۆرترین هۆکارەکان سەردەنێ بەرەو تاوانکردن، لەوانەش چەندان هەزار لەباردەبرێن چونکە بەرهەمی زیناکردن کوشتنی چەندان کچ و ژنی بەدوای خۆیدا هێنا بە ناوی ناموسچوون و ڕووسپیکردنەوەی خێزان و بنەماڵەو چەندان مێرد ژنەکەی کوشتووە، چەندان کەس دلبەرەیەکی کوشتووە یان هەردووکیان کوژراون لەسەر خیانەتکاری و داوێنپیسی.

پێشەوا ئیبنو تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت:

تاوانی زینا ئەوەندە گەورەیە کە هەموو تاوانەکانی لەگەڵیدا کۆ دەبێتەوە لە بێدینی و خوانەناسی و نەمانی پیاوەتی و بێغیرەتی، کەس نابینێ کەوا زینا بکات و خواناس بێ و وەفاداربێ و ڕاستگۆبێ بە پارێزەری برادەرو کەسوکاری بێ تەواوی، ئەو کۆمەڵگایانەی کە زینا لە ناویاندا بڵاوبۆتەوە کە لە ڕێگای خودا لایان داوە، لەو پەڕی چەرمەسەری دەناڵێنن و بەدەست زیناوە گیریان خواردووەو بنەمای ڕەوشت لەناویاندا ڕووخاوە، بە تایبەتی بناغەی ئایین، بەڕاستی پێغەمبەر(ﷺ) ڕاستی فەرمووە کە دەربارەی میللەتانی زیناکەر هەواڵی داوە بەراوردی کردووە لەگەڵ ڕوودانی قیامەت کە دەفەرموێت: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لا تَفْنَى هَذِهِ الأَمَّةُ حَتَّى يَقُومُ الرَّجُلُ إِلَى الْمَرْأَةِ فَيَفْتَرِشُهَا فِي الطَّرِيقِ فَيَكُونُ خِيَارُهُمْ يَوْمَئِذٍ مَنْ يَقُولُ لَوْ وَارَيْتَهَا وَرَاءَ هَذَا الْحَائِطِ)[1].

---

(١) صحيح: صحيح ابن حبان (١٥/ ١٧١)، ورواه ابو يعلى في مسنده (٦١٨٣/ ٣٤٤)، قال الهيثمي

واتە: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەم ئوممەتە لەناو ناچێت، تا پیاو بۆ ژن هەڵدەستێ و لە چەقی ڕێگا ڕایدێخی، جا چاکترین کەسێکی ئەو رۆژە ئەو کەسەیە کە بڵێ: ئەگەر بتبردایە پەنا ئەو دیوارەی باشتر بوو.

پێشەوا (قورتبی) لە کتێبی (المفهم) دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێت: لەم فەرموودەیە نیشانەیەکی گەورە هەیە لە نیشانەکانی پێغەمبەرێتی موحەممەد (ﷺ) لەبەر ئەوەی هەواڵی بەشتێ داوە کە دەبێ و بووە بەتایبەتیش لەم ڕۆژگارەدا[1].

پاڵپشتێکی تریش هەیە لە فەرمودەی پێشەوا نەواسی کوڕی سەمعان(رضي الله عنه) دەربارەی دەجال و یەئجوج و مەئجوج لە کۆتاییەکەیدا دەفەرموێ: (فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ بَعَثَ اللهُ رِيحًا طَيِّبَةً، فَتَأْخُذُهُمْ تَحْتَ آبَاطِهِمْ، فَتَقْبِضُ رُوحَ كُلِّ مُؤْمِنٍ وَكُلِّ مُسْلِمٍ، وَيَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ، يَتَهَارَجُونَ فِيهَا تَهَارُجَ الْحُمُرِ، فَعَلَيْهِمْ تَقُومُ السَّاعَةُ)[2].

واتە: کاتێك لەو بارەی دان خوای گەورە سروە بایەك دەنێرێ و بەبن هەنگڵیان ڕەت دەبێ و، گیانی هەر بڕوادارو موسڵمانێك دەکێشێ و، تەنیا بەدکارترینی خەڵکی دەمێنن، وەکو گوێدرێژ لە نێوەندی ڕێگادا سواری یەك دەبن، جا قیامەت لەسەر ئەوان هەڵدەستێ.

بەڵێ.. بەڕاستی لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، توێژینەوەیەك کراوە کە دەرکەوتووە (٧٣٪) ژنانی بەمێردی ئەمریکا لە خیانەتی هاوسەری بەدەرنین، چونکە دۆخەکە لەبارەو یاسا لەبارە بێگومان ڕێژەی پیاوانیش لەوە گەورەترە، ئەم ڕێژەیەش مانای وایە کەوا کۆمەڵگاکە هەمووی زینا ڕەوا دەکات و بە خراپی نابینێ..

هەروەها توێژینەوەیەکی دیکە لەکەنەدا دەریخستووە کە (٥٠٪) ژن و مێردان ئامادەن کە زینا بکەن ئەگەر بەرامبەرەکەی دانی پێدابنێن کە ئەمەش هۆکار

---

في (مجمع الزوائد) (٣٣١/٧) رواه أبو يعلى، ورجاله رجال الصحيح.

(١) فتح الباري (١/ ١٧٩).

(٢) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٥٠) باب: ذكر الدجال وصفته، برقم: (٢٩٣٧).

گەلێکی ماقوڵە بۆ خیانەتکردن و هاوسەری داوێن پیس هیچ بەرگری نیەو لێی دەبوورێ و چاوپۆشی لێ دەکات، لەبەر ئەم هۆکارانەیە کە دەبینین ئەو کۆمەڵگایانەی دوژمنایەتی سروشت یاساو ڕێساکانی خودا دەکەن و کەوتونەتە داوی ئارەزووبازی خۆیان و بەبێ ڕێسای نە ئایین و نەڕەوشت، ئەمڕۆ لە کەمبوونەوەی ژمارەی دانیشتوانی دەناڵێنن، هەڕەشەی لەناوچونیان لێ دەکرێت یان ڕەنگە لەناو بێگانە بزربن بەهۆی دووركەوتن لە هاوسەرگیریو هەوڵدان بۆ خۆ تێرکردنی جنسی بەحەڕامی پاش ئەوەی متمانە لە نێوان ژن و مێرد نەماوە، پاش بڵاوبونەوەی چەندان دەردی کوشندەی سێکسی لەناویاندا، کە سەرژمێریەکانی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی دەڵێن: ئەوانەی کە بەنەخۆشی ئایدز دەمرن ژمارەیان دەگاتە (٢٢) ملیۆن لەماوەیەك کە ناگاتە (٢٠) ساڵ[1].

لەم سەردەمە هەموو ئەو دەرگایانەی کە مرۆڤ بەرەو زینا دەبات لەسەر پشتە، شەیتانیش بە فێل و تەڵەکەی خۆیی و دۆستانی ڕێگای ئاسان کردووەو جا گوناهباران و خراپەکارانیش بە دوای کەوتوون و ڕووت و قوتی و بەرەڵاییش بڵاوبۆتەوەو نەزەرو چاوپیسیش بە دوایدا کەوتووەو تێکەڵاویش پەرەی پێدراوە، هەروەها گۆڤارەکانی ناپاکی و فیلمی بەرەڵایی بایەخی پێدراوەو گەشتکردنیش بەرەو وڵاتی گوناه و تاوان زۆر بووەو، بازاڕی بازرگانی بە لەشفرۆشی کراونەوە، ئینجا شکاندنی شەرەف و ناموس زۆربووەو ژمارەی منداڵی حەرام زادە زیادی کردووەو حاڵەتی کوشتنی کۆرپەلەش سەری هەڵداوە.. بۆیە خراپترین پارەو پولیش ئەو ماڵەیە کە بەرامبەر زینا لە کەسی زیناکار وەردەگیرێ، کەسی زیناکەریش بێبەشە لە گیرابوونی دۆعا لە نیوە شەودا[2].

---

(١) احصائيات المنظمة الصادرة لمناسبة اليوم العالمي للأيدز.

(٢) صحيح الجامع، برقم: (٢٩٧١).

## دەست گرتن بە ئایینی ئیسلام زەحمەت دەبێ

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی دەستگرتن بە ئایینی ئیسلام زەحمەت دەبێت..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ الصَّابِرُ فِيهِمْ عَلَى دِينِهِ كَالقَابِضِ عَلَى الجَمْرِ)[1].

واتە: ڕۆژێك دێ بەسەر خەڵکی، ئەو کەسەی کە ئارام دەگرێت لەسەر دینەکەی وەکو ئەوە وایە کە دەستی بە پشکۆوە گرتبێ!

پشکۆی ئاگرین! ئەوەندە زەحمەت و ناڕەحەتە!

ئەم فەرموودەیەش کینایەتە لە بڕی ئەوەی کەس یارمەتی و هاوکارت نابێت لەسەر ئیسلامەتی[2].

ئەمەش هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئاشوب و ناخۆشی و ناڕەحەتی و بەدڕەوشتی زۆر دەبێ، لەبەر ئەوە دین زەحمەت دەبێ، دوژمنایەتی موسڵمانان دەکرێ، ئەو کەسەی دەست بەدینەوە دەگرێ وەکو ئەوە وایە دەستی بەپشکۆوە گرتبێ، جا پشکۆ عادەتێکی هەیە یا دەستت دەسوتێنێ

واتە: ئەگەر دینەکەت بگری دەستت دەسوتێ، ئازار دەبینی، ناڕەحەت دەبی لەدونیا، ئەگەر توشی ناڕەحەتیش نەبی

واتە: بەباشی دەستت بەدینەوە نەگرتووە، جا دەستت بسوتێ باشترە نەوەك دینەکەت لەدەست بچێ..

---

(١) سنن الترمذي (٩/ ٤) باب: الصابر على كالقابض، برقم: (٢٤٢٨).

(٢) الإشاعة لأشراط الساعة، (لا ١٢٣).

بۆیە ئەوانەی دینەکەیان سەلامەت دەبێت ئەوانەن کە دەچنە چیاکان و دۆڵەکان، بەو دەشتاییە دەکەون ئەمەش هەموو لەبەر گوناهو تاوانکردنی خەڵکیەوە، لەو سەردەم پیاو لەناو دەچێت بەهۆی دایك و باوکیەوە یان بە دەست ماڵ و منداڵیەوە، یان بە دەست خزم و دراوسێکانیەوە... ژیان زۆر سەخت دەبێت.. کەس ئەمین نابێت لە باوەڕەکەی..

تەنانەت مرۆڤی موسڵمان تووشی تاقیکردنەوەی زۆر دەبێت، پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:

(يَنْزِلُ بِأُمَّتِي فِي آخِرِ الزَّمَانِ بَلَاءٌ شَدِيدٌ مِنْ سُلْطَانِهِمْ لَمْ يُسْمَعْ بَلَاءٌ أَشَدُّ مِنْهُ ، حَتَّى تَضِيقَ عَنْهُمُ الْأَرْضُ الرَّحْبَةُ..)[١].

لە کۆتایی بوونەوەر بەڵایەکی زۆر لە سەرکردەکانەوە ڕوو لە خەڵکی دەکات، بەڕاستی هیچ بەڵایەك نییە لەو بەڵایە بە ئازارتر بێت.. بۆیە دەستگرتن بە ئیسلام زەحمەت دەبێت و پیاوی دەوێت خۆی لەبەر ڕابگرێت.. کەس ڕزگاری نابێت مەگەر کەسێك بە تەواوی لە ئیسلام گەیشتبێت و خۆڕاگر بێت...

لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی:

(إِنَّهُ سَيُصِيبُ أُمَّتِي فِي آخِرِ الزَّمَانِ بَلَاءٌ شَدِيدٌ مِنْ سُلْطَانِهِمْ، لَا يَنْجُو فِيهِ إِلَّا رَجُلٌ عَرَفَ دِينَ اللَّهِ بِلِسَانِهِ وَقَلْبِهِ وَيَدِهِ ...)[٢].

واتە: بە دڵنیایی ئەو ڕووداوەی ڕوودەدات لە کۆتایی بونەوەر تاقیکردنەوەیەکی زۆر توندە لەلایەن بەرپرسەکانیانەوە، هیچ کەسێك ڕزگاری نابێت مەگەر پیاوێم بە تەواوی ئایینی خودای ناسیبێت بە زوبان و دڵ و دەست..

---

(١) صحيح: رواه الحاكم في (المستدرك) برقم: (٨٤٣٨)، قال الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ .

(٢) ضعيف: رواه أبو نعيم في «تاريخ أصبهان» (١/ ١١٢) وهذا الحديث ذكره الألباني في الضعيفة (٦٧٢٥) وقال : ضعيف .

# سوێند خواردن زۆر دەبێ

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی سوێند خواردن زۆر زۆر دەبێت.. بۆ هیچ کەسێك سوێند بە غەیری خوا بخوات، لەو قسانەی بەسەر زمانی زۆرێك لە خەڵکان دادێت، ئەویش سوێند خواردنە بە غەیری خوا، سوێند خواردنیش بە خوای گەورە جۆرێکە لە بە گەورەگرتن، ئەویش تەنیا شیاوی خوای گەورەیە..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:

(خَيْرُ أُمَّتِي الْقَرْنُ الَّذِينَ يَلُونِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ يَجِيءُ قَوْمٌ تَسْبِقُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ)[١].

واتە: باشترین خەڵك ئەوەیە کە لەسەردەمی من دایە، پاشان ئەوانەی دواتر دێن، پاشان ئەوانەی دواتر دێن، پاشان قەومێکی تر دێن سوێند دەخۆن، شاهێدیدانیان بە پێش سوێندەکەیان دەکەوێتەوەو سوێندەکەیان بە پێش شاهێدی دانیان دەکەوێتەوە.

واتە: ئەوەندە شاهێدی دەدەن و ئەوەندە سوێند دەخۆن خەریکە سوێند خواردنەکەو شاهێدیدانەکە بە پێش یەکتری دەکەونەوە!

بۆیە سوێند خواردن یەکێکە لە کارە ناپەسندەکان ..

لە ریوایەتێکی تر فەرموویەتی: (من اقتراب الساعة إذا رأيتم الناس .. وحُلف بغير الله)[٢].

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ١٩٦٣) باب: فضل الصحابة ثم الذين يلونهم، برقم: (٢٥٣٣).

(٢) أخرجه أبو داود ، كتاب: المهدي، باب، أول المهدي، برقم: (٤٢٩٠) وهو منقطع، وكنز العمال (٥٧٣/١٤) برقم: (٣٩٦٣٩).

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بوونەوەر هەر کاتێك خەڵکتان بینی.. سوێندی خوارد بە جگە لە خوای گەورە..

لە ریوایەتێکی تر فەرموویەتی: (سيأتي على الناس زمان يكثر فيه الحلف ويفشو فيه..)[١].

واتە: سەردەمێك بەسەر خەڵکی دێت سوێند خواردن زۆر دەبێت و بڵاودەبێتەوەو پەرە دەسەنێت..

لەم سەردەمە سوێند خواردن بە جگە لە خوای گەورە زۆر زۆر بووە.. وەکو بەسەری بابم.. بەسەری من.. بە گۆڕی فلان شێخی.. یان بە ئەمانەت.. بە کەعبە.. بە شەڕەف.. بە بەرەکەتی فلان.. بە قەدرو ڕێزی پێغەمبەر(ﷺ).. بەسەری ئەولاد هتد.. تەنانەت خوای پەروەردگار قەدەغەی کردووە سوێند بە باوك یان دایك بخۆن.. چونکە بەشێکە لە شیرك، ئەگەر بڕواشی پێی هەبێت کافر دەبێت.. هەر کەسێك دووچاری ئەمانە هات کەفارەتەکەی ئەوەیە بڵێت: (لا اله الا الله).

بە هەمان شێوە کۆمەڵێك وشەی حەرامی شیرك هەیە، کە موسڵمانان بەسەر زاریان دا دێت، وەکو ئەوەی بڵێ: پەنا دەگرم بە خوا و بە تۆ، من پشتم بە خواو بە تۆ گرتووە، ئەوە لەلایەن خوا و لەلایەن تۆوەیە، من تەنیا خوا و تۆم هەیە، لە ئاسمان خوام هەیە و لە زەوی تۆم هەیە، لەبەر خواو فلان نەبوایە، من بەریم لە ئیسلام، ئەی نائومێدی ڕۆژگار، ئەوە ڕۆژگارێکی خراپە، ئەو کاتە کاتێکی بێ فەڕە، ئەوە زەمانێکی ستەمکارە، عەبدالمسیح، عەبدالنبی، عەبدالرسول، عەبدالحوسین، ئیشتراکیەتی ئیسلام، دیموکراسیەتی ئیسلام، ویستی گەل لە ویستی خوای، دین بۆ خودایەو نیشتیمان بۆ هەمووان، بەناوی عەرەبایەتی، بەکارهێنانی وشەی (ئەگەر) کە واتای نارەزایی و پەشیمانی و خەفەت دەگەیەنێت و، ڕێگای کاری شەیتان دەکاتەوە، وەکو ئەوەی بڵێی: خوایە لێم خۆش بە، ئەگەر ویستت لەسەر بێ[٢].. هتد..

---

(١) ضعيف: أخرجه ابو داود، قال الالباني: ضعيف الإسناد.

(٢) المحرمات استهان بها كثير من الناس، محمد بن صالح المنجد، لا (٤٢ ٤٣) .

## دەرچوونی سوپایەک لە خاکی یەمەن

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی سوپایەك لە خاکی یەمەنەوە دەردەچێت، وە دینی خوای گەورە زیندوو دەکەنەوە، وە باشترین کەسن..

پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (يَخْرُجُ مِنْ عَدَنِ أَبْيَنَ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا، يَنْصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، هُمْ خَيْرُ مَنْ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ)[1].

واتە: لە خاکی عەدەنەوە (١٢٠٠٠) هەزار کەس دەردەچن، دینی خواو پێغەمبەری خوا سەردەخەن..

هەر چەندە ئەم نیشانەیەی کۆتایی بونەوەر نەهاتۆتە دی، بەڵام دڵنیاین ڕۆژێك دێتە دی و وەکو هەموو موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دێتە دی.

دوای وردبوونەوەم لەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشتمە ئەو دەرەنجامەی کە وشەی (هُمْ خَيْرُ مَنْ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ)

- ئیشارەتە بۆ باشترینی و چاکسازیترین کەسایەتی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) شایەتی بۆ داون.
- یان ئیشارەتە بۆ باشترین جێگاو ڕێگا.
- یان ئەوەتا سەردەمەکە باشترینی سەردەمە ئەو سات.
- بەڕای بەندە لەوانەشە خیلافەی ئیسلام لەو سەردەمە لە شاری عەدەن بێت لە وڵاتی یەمەن.

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٥/ ٢٠٠) برقم: (٣٠٧٩). وأخرجه ابن أبي حاتم في الجرح والتعديل (٢٤٢/٨)، والطبراني برقم: (١١٠٢٩) وقال: رواه أبو يعلى والطبراني، ورجالهما رجال الصحيح غير منذر الأفطس، وهو ثقة.

## ئاوەدانکردنەوەی خاکە بیابانیەکان

پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی ئەوەی پێداوین کە لە کۆتایی بونەوەر خاکە بیابانییەکان ئاوەدان دەکرێتەوە، بۆیە بە یەکێك لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی هەژمار کراوە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: (ثلاث إذا رأيتهن فعند ذلك تقوم الساعة خراب العامر وعمار الخراب ..)[1].

واتە: سێ نیشانە هەن هەر کاتێك بینیتان ئەو کات چاوەڕێی هاتنی ڕۆژی دوایی بن، ئاوەدانەکان تێك دەدرێن، وە تێکدراوەکان چاك دەکرێت..

لە فەرموودەیەکی تر دەفەرموێ: (إِنَّ مِنْ أَعْلَامِ السَّاعَةِ وَأَشْرَاطِهَا أَنْ يُعَمَّرَ خَرَابُ الدُّنْيَا، وَيُخَرَّبَ عُمْرَانُهَا)[2].

واتە: لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەیە وێرانەکانی دونیا ئاوەدان دەکرێنەوەو ئاوەدانەکانیشی وێران و کاول دەکرێن .

ئەگەر سەیری ئەم سەردەمەی خۆمان بکەین بوونی ئەم هەموو بیناو خانووانە ئەمڕۆ لە بیابەنەکانی دوێنێ دروست دەکرێن و ئاوەدان دەکرێتەوەو دەبێتە شارێکی سەربەخۆ.. جاری وایە زەوی کشتوکاڵی دەکەن بە گەورەترین شار..

وە واتایەکی تریش لە خۆی دەگەیەنێت کە پایتەختەکان بگوازرێتەوە لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر وەکو:

پایتەختی فوسطاط گواسترایەوە بۆ قاهیرە

کوفە بۆ نەجەف

ئەکرە بۆ دیلهەمی، سورە بۆ مومبی.. هتد..

---

(١) ضعيف: رواه الطبراني وابن عساكر، وقال الالباني حديث ضعيف.

(٢) المعجم الكبير (١٠/ ٢٢٨) برقم: (١٠٥٥٦).

# تێپەڕبوونی پیاو بە ناو مزگەوت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر مزگەوتەکان دەبنە ڕێگا بۆ تێپەڕبوونی خەڵکی ..

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: (إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يَمُرَّ الرَّجُلُ فِي الْمَسْجِدِ لَا يُصَلِّي فِيهِ رَكْعَتَيْنِ..)[١].

واتە: لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی پیاو بەلای مزگەوتدا تێدەپەڕی و نوێژی تێدا ناکات.

ئەوەندەی وردبوومەتەوە لەم فەرمایشتەی پێغەمبەری پێشەوا(ﷺ) چەند واتایەك دەبەخشێت، لەوانە:

• خەڵکی تێپەڕدەبن بۆ مەسڵەحەتێکی دونیایی تەنانەت ئامادە نین دوو رکات نوێژ لە مزگەوت بکەن، نمونەی ئەمەش وەکو تەعزیەو مەولود و... هتد .

• خەڵکی تێپەڕدەبن بە نێو مزگەوت تەنها بۆ جوانکاری و ڕەنگاوڕەنگی و وێنەی لێدەگرن، وەکو وڵاتانی ئەوروپا کە بۆ پیاسەکردن دەچن.

• کەسانێك دەیانەوێت بۆ قەزای حاجەت خۆی بەتاڵ بکات و گوێ نادا بەوەی کە ئەوە مزگەوتەو بۆ خواپەرستی دروست کراوە!

یەکێك لە شێوازەکانی رێز نەگرتنی مزگەوت و ماڵی خوا لە لایان موسڵمانانەوە ئەوەیە کە ژمارەیەکی زۆری مزگەوتەکان وەکو ڕێگەی لێ هاتووە خەڵکی هاتوو چۆی پێدا دەکەن و تەنانەت دوو ڕکات نوێژیشی تێدا ناکەن کە ئەم ڕەفتار و کردەوەیە بەرامبەر بە ماڵی خوا هەرگیز لە سەردەمانی پێشوودا لەناو کۆمەڵگای ئیسلامیدا نەبووە، بەڵام ئەمڕۆ هێندە زۆر بووە، بووەتە شتێکی ئاسایی.

---

(١) صحيح ابن خزيمة، كتاب: الصلاة، باب: كراهة المرور في المساجد من غير أن تصلي فيها والبيان أنه من أشراط الساعة، برقم: (١٣٢٦).

بەرگی دووەم

## وازهێنان لە
## فەرمانکردن بەچاکەو ڕێگریکردن لە خراپە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی خەڵکی فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە ناکات، دەڵێت: کڵاوی خۆم دەگرم با نەیبات.. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەموو خراپەکاریە بە چاوەکانی خۆی دەبینێت..

پێشەوا ساذان (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: گوێم لە حوزەیفەی کوڕی یەمان (ﷺ) بوو دەیگوت: (لَيَأْتِيَنَّ عَلَيْكُمْ زَمَانٌ خَيْرُكُمْ فِيهِ مَنْ لاَ يَأْمُرُ بِمَعْرُوفٍ وَلاَ يَنْهَى عَنْ مُنْكَرٍ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أَيَأْتِي عَلَيْنَا زَمَانٌ نَرَى الْمُنْكَرَ فِيهِ فَلاَ نُغَيِّرُهُ؟ فَلاَ وَاللهِ لَنَفْعَلَنَّ...)[1].

واتە: سەردەمێك بەسەر ئێوە دێت باشترینتان ئەوە دەبێت فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە نەکات

پیاوێك لە گەلەکە گوتی: ئایا سەردەمێك بەسەر ئێمە دادێت مونکەر ببینین و نەیگۆڕین؟

نەخێر سوێند بەخوا دەیگۆڕم..

ئەگەر سەیری ژیانی ئەم سەردەمە بکەین زۆر ڕاشکاوانە ئەم فەرموودەمان بۆ بەدەردەکەوێت کە موسڵمانان زۆر بێ هێز بوونە لە فەرمانکردن بە چاکەو نەهیکردن لە خراپە.

یەکێك لە کەمتەرخەمی موسڵمانان ئەوەیە زۆر کاری نەشیاو دەبینێت و لێی بێدەنگ دەبێت، ئەگەر پرسیاری لێ بکەیت بۆ ڕێگری لێ ناکەیت؟

لە وەڵامدا دەڵێت: کڵاوی خۆم گرتووەو با نەیبات، ئەمەش ئەو پەڕی بێ دەسەڵاتی موسڵمانان دەبێت، چونکە باوەڕ لەناو ناخیاندا نەچەسپیوە.

---

(١) مصنف ابن ابي شيبة (١٥/ ٩٠) برقم: (٣٨٥٠٤).

# خەڵکی خوێندەوار زۆر دەبێت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر خەڵکی خوێندەوار زۆر دەبێت و کردەوە کەم دەبێت.. دەرچووی پەیمانگا و کۆلێژ و ماستەرو دکتۆرا زۆر دەبێت و دووربوون لە ئایینی خودا زیاتر دەبێت..

پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (أَنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ .. وَظُهُورَ الْقَلَمِ)[1].

واتە: بە دڵنیایی لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی .. پێنوس دەردەکەوێ.

زانایانی سەردەم یەکێك لە ڕاڤەکانی وشەی (وَظُهُورَ الْقَلَمِ) بە خوێندەواری لێکداوەتەوە.

ئێستاش هەستی پێ دەکەی و دەیبینی، وە ئێستاش شوێنەواری ئەو حاڵەتە دیارە، وادیارە و هیچ ماڵێك نیە لانی کەم خوێندەوارێکی تێدا نەبێ و خوێندەواری زۆرە!

لێکۆڵینەوەیەکی نوێی زانستی جەخت لەسەر گرنگی و زانست و فێربوون و ئەو سوودە پزیشکی و دەرونییە بێ ئەژمارانەی ئەو مرۆڤانە دەکاتەوە کە بەردەوام زانست و زانیاریان لە زیادبووندایە.

لێکۆڵینەوەیەکی نوێ دەریخستوە ئەو کەسانەی خوێندەوارن و بەردەوام هەوڵی زیادکردنی زانست و زانیاری خۆیان دەدەن، کەمتر دووچاری خەمۆکی دەبن، هەروەها زۆرتر دەستکەوت بەدەست دەهێنن و چێژ لە تەندروستیەکی باشتر دەبینن.

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد ، (٢/ ٧٩١) برقم: (٣٩٤٧) وقال الشيخ أحمد بن شاكر : إسناده صحيح .

بەرگی دووەم

لێکۆڵەرەوان دەڵێن: فێرکردن یارمەتی مرۆڤ دەدات لەبەڕێوەبردنی ژیان بە شێوەیەکی باشترو چاکتر، جگە لەوەش یارمەتیت دەدات بۆ زاڵبوون بەسەر کێشەو گرفتەکاندا کە ڕۆژانەو دووچاریان دەبێتەوەو، بۆ نمونە بەتاڵی و تەڵاق و مردنی نزیکان و دۆستان و هاوڕێیان.

هەروەها ئەو لێهاتوویيانەی مرۆڤ لەسەرو بەندی خوێندندا فێریان دەبێت، یارمەتی دەدەن تا تێبگات کە پێویستی بە لێهاتوویی زۆرتر هەیە.. هەروەها یارمەتی دەدات لەسەر چۆنیەتی بەکار هێنانی لێهاتووییەکانی کەسانی دی.

پرۆفیسۆر (جۆن باینەر) دەڵێت: لێکۆڵەرەوان لەم لێکۆڵینەوەیە ویستویانە ئەو سوودە نائابوریانە بۆ فێربوون دەربخەن، هەروەها جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە زۆر گرنگە هەموو تاکێکی کۆمەڵگە هانبدرێت، لەسەر فێربوون و داواکردنی زانست، لەبەر ئەوەی چەندین سوودی تری هەیە، کە فێرخواز بەدەستی دەهێنێت، لە ڕێگەی فێربوونەوە.. هەمیشە فێرخواز خاوەنی توانایەکی زیاترە، بۆ چارەسەری کێشەو گرفتەکان.

ئەوانەی هەستان بەو لێکۆڵینەوانە دەڵێن:

پێویستە هەلی زیاتر بڕەخسەنرێت بۆ زۆرینەی خەڵکی و گرنگیەکی زیاتر بدرێت بە بڵاوکردنەوەی زانست لە نێوان خەڵکی، ئەمەش هۆکاری یارمەتیدەرە بۆ گەشە پێدان و بەرەو پێش بردنی ئاستی کۆمەڵایەتی و هاوکاریکردنیان بۆ ژیان و گوزەرانێکی باشتر.

لێکۆڵینەوەکانی پێشوو جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، کە بەردەوامبوونی مرۆڤ لەسەر فێربوون و بەدەستهێنانی زانیاری لە زوو پیربوون دەیپارێزێت، لەگەڵ ئەوەشدا وا لە مرۆڤ دەکات بە تەندروستی جەستەیەکی چالاك و دەروون بەرزییەوە بژی.

لێکۆڵینەوە زانستیەکە جەخت لەسەر گرنگی زانست و خوێندنەوە دەکاتەوە، هەموو ڕۆژێك زانایان سوودی زیاترو تازەتر سەبارەت بە زانست دەدۆزنەوە.

## زۆربوونی مونافیق و دووڕووەکان لە نوێژی هەینی

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی زۆربەی مونافیق و دووڕوو و کافرو بێبڕوایە دەچن بۆ نوێژی هەینی.. بەداخەوە زۆرێك لەوانەی باوەڕ لە دڵیاندا نەچەسپاوە، بەرەو کۆڕی لاڕێیان و خراپەکاران دەچن، بەڵکو زۆر جاران لەگەڵ کەسانێکی وا دادەنیشنکە تانەو تەشەر لە شەریعەتی ئیسلام دەدەن و گاڵتە بە دین و دۆستانی خوای گەورە دەکەن، بێگومان ئەوە کارێکی حەرامەو بیروباوەڕ لەکەدار دەکات..

پێشەوا حوزەیفەی کوڕی یەمان (ﷺ) دەڵێت: (يَأْتِ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ لَوْ رَمَيْتَ بِسَهْمٍ يَوْمَ الْجُمُعَةِ لَمْ يُصِبْ إِلَّا كَافِرًا أَوْ مُنَافِقًا)[1].

واتە: سەردەمانێك دێن بەسەر خەڵکیدا ئەگەر تیر بوەشێنیت لە ڕۆژانی هەینی (لەناو مزگەوتەکان) تیرەکە ئیلا بەر کافر یان مونافیق دەکەوێت.

واتە: مزگەوتەکان پڕ دەبن لە مونافیق، هەر چۆنێك تیر بوەشێنیت بەریان دەکەوێت ئەوەندە زۆرن.

زۆر جاران ئەو جۆرە مونافیقانە گاڵتە بە ڕیش و سیواك و شەو نوێژ دەکەن، یان فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ڕەت دەکەنەوە.. چونکە ئا ئەوانە ستەمکارن.. بۆیە لەو حاڵەتانەدا دروست نییە لەگەڵیاندا دابنیشین، با هەر چەندە خزمی زۆر نزیکیش بن و، یان بە گفت و لفت و زمان شرین بن.

ئەگەر بە وردی سەرنج بدەینە ئەو سەردەمە دەبینین کە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هاتوونەتە دی و ڕۆژانی هەینی مزگەوتەکان بەر ناکەوێت.

---

(١) كتاب الإبانة، ابن بطة (١/ ١٧٥).

بەرگی دووەم

# هەڵگیرانی قورئان و گرنگی نەدان بە لەبەرکردنی

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر ئەهلی قورئان وەفات دەکەن و خەڵکی گرنگی نادەن بە لەبەرکردنی قورئان..

پێشەوا حوذەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (يَدْرُسُ الْإِسْلَامُ كَمَا يَدْرُسُ وَشْيُ الثَّوْبِ، حَتَّى لَا يُدْرَى مَا صِيَامٌ وَلَا صَدَقَةٌ وَلَا نُسُكٌ، وَيُسْرَى عَلَى كِتَابِ اللَّهِ تَعَالَى فِي لَيْلَةٍ فَلَا يُتْرَكُ فِي الْأَرْضِ مِنْهُ آيَةٌ، وَتَبْقَى طَوَائِفُ مِنَ النَّاسِ فِيهِمُ الشَّيْخُ الْكَبِيرُ، وَالْعَجُوزُ الْكَبِيرَةُ، يَقُولُونَ: أَدْرَكْنَا آبَاءَنَا عَلَى هَذِهِ الْكَلِمَةِ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَنَحْنُ نَقُولُهَا..)[1]. واتە: ئیسلام دەپوکێتەوە وەکوو چۆن نەخشی جل و بەرگ کاڵ دەبێتەوەو دەپوکێتەوە هەتا وای لیَ دێت نازانرێت ڕۆژوو چیەو قوربانی چیەو پارە بەخشین چیە، لە شەوێکدا شەو ڕۆیی بە کتێبەکەی خوا (قورئان) دەکرێت، ئیتر تەنها یەك ئایەتی ئەو قورئانە لەسەر زەوی نامێنێت، وە کۆمەڵێك لە خەڵك دەمێننەوە، پیرەمێردی گەورەو بە تەمەن دەڵێن: باو و باپیرانمان کە پێیان گەیشتوین لەسەر (لا إله إلا الله) بوون، ئێمەش وەکوو ئەوان دەیڵێینەوە.

لەم فەرموودەیە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە خەڵکانێك پەیدا دەبن کە زۆر بایەخ بە ڕازاندنەوەی قورئان و جوانیەکانی ئەدەن، هەتا وای لێدێت هەندێك لە موسڵمانەکان بایەخ نەدەن بە خوێندنەوەی سورەتی (الكهف) لە ڕۆژی هەینیدا.

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص(ﷺ) دەڵێت: (إن الله تعالى يرفع القرآن من صدور الرجال..)[2]. واتە: بە تەئکید خوای گەورە ئەو قورئانە هەڵدەگرێت لە سینگی پیاوەکان و مرۆڤەکان... پشت بە خوا دواتر ئەم بابەتە بە درێژی ڕوون دەکەینەوە لە دوای هاتنی نیشانە گەورەکانی کۆتایی بونەوەر.

---

(١) صحيح: المستدرك على الصحيحين (٤/ ٥٢٠) برقم: (٨٤٦٠) وقال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

(٢) صحيح: رواه الأزرقي (رقم ٤٧٤) وهذا سند قوي إذا توبع أو كان له شواهد، فالحديث حسن.

# زۆربوونی زەوی لەرزین

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر زۆربوونی بومەلەرزەیە..

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی:

(لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُقْبَضَ الْعِلْمُ ، وَتَكْثُرَ الزَّلاَزِلُ ، وَيَتَقَارَبَ الزَّمَانُ ، وَتَظْهَرَ الْفِتَنُ ، وَيَكْثُرَ الْهَرْجُ وَهْوَ الْقَتْلُ الْقَتْلُ ..)[١].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت تا زانست هەڵدەگیرێت و بومەلەرزە زۆر دەبێت و کاتەکان لێك نزیك دەبنەوەو ئاشوب سەرهەڵدەدات و هەرەج زۆر دەبێت، گوتیان هەرەج چیە ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟ فەرمووی: کوشتن کوشتن.

خوای گەورە لە قورئان باسی درزمان بۆ دەکات و دەفەرموێ: [وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجۡعِ ﴿١١﴾ وَٱلۡأَرۡضِ ذَاتِ ٱلصَّدۡعِ ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ لَقَوۡلٞ فَصۡلٞ ﴿١٣﴾ وَمَا هُوَ بِٱلۡهَزۡلِ ﴿١٤﴾ ][٢].

واتە: سوێند بە ئاسمانی خاوەن باران و بە زەوی خاوەن قلێش، بەڕاستی ئەم قورئانە گوفتارێکی ڕاست و دروستە و کۆمەڵە دەستورێکی بەرزەو گاڵتە نیە.

قورئان شایستەی ئەوەیە کە هەموو کەسێك بیری لێ بکاتەوەو بە پێی خۆی بەهرەی لێ وەرگرێ، ڕووی زەوی هەروەك چۆن درز و قلێشی زۆری تێدایە، ئەوهاش چینەکانی ژێرەوەی زەوی درزو قلێشی زۆری تێدایە، چینەکانی زەوی یەك پارچە نین کە ئەمەش حیکمەتێکی گەورەی تێدایە بۆ بەردەوام بوونی ژیان، چونکە لە (٩٠٪)ی بورکان و زۆربەی بومەلەرزەکان لە دەوری ئەو

---

(١) صحيح البخاري (٤/ ٨٥٩) كتاب: الإستسقاء، باب ما قيل في الزلال والآيات، برقم: (٤٤٠).

(٢) سورة الطارق: (١١ ١٤)

قلێشانەی زەویدان، ئەگەر ئەو بوومەلەرزە و بوڕکانانە نەبوایە ئەوا زەوی کە لە ناویدا ئەو هەموو پاڵە پەستۆیە هەیە تەنفیسی نەدەبوو، بەمەش ڕەنگ بوو بە یەکجاری بتەقێتەوەو کەسی تیا نەمێنێ.

لە (٢٠٠٠/٦/٢) کەناڵی (النیل الثقافیة) بەرنامەی (رأیت الله)ی پرۆفیسۆر عبدالباسط محمد السید لە (مرکز الدراسات والبحوث العلمیة) کە دکتۆرای هەیە لە جیۆلۆجیدا (٣) شتی باس کرد دوانیان بیستومانە، بەڵام یەکێکیان بۆمان نوێ بوو کە باسی کرد کەوا لە نێوان گڕکان و بومەلەرزەدا پەیوەندیەك هەیە ئەمە بیستوومانەو زانست سەلماندویەتی و دەرکەوتووە، هەروەها ئاژانسی ناسای (ئاسمانی) ئەمریکی پەیوەندی کردووە لەگەڵ ئەم سەنتەرە زانستیەدا لە میصر (قاهیرە) پێی گوتوون: دوا بوومەلەرزە کە داویەتی لە مەدینەی پیرۆز بوەتە هۆی ئەوەی مەدینە دووربخاتەوە لە بازنەی ئەگەری بوومەلەرزە.. ئەمەش بەهۆی کۆتایی بوومەلەرزەوە جولەیەك ڕوویداوە لە ژێر زەویدا، چینەکانی زەوی گۆڕانکاری بەسەردا هاتووەو بووەتە هۆی ئەوەی کە مەدینە بچێتە دەرەوەی ئەو فیلدە، ئەمەش وەك هەواڵێك لە ساڵی (١٩٩٩)ع بە (مرکز الدراسات والبحوث العلمیة) لە قاهیرە دراوە، دەستەی زانستی ئیعجازیش وەڵامی داونەتەوە کە ئێمە پێش ئێوە ئەوە دەزانین، ئەوانیش گوتیان: چۆن؟ گوتیان: ئەو بوومەلەرزەی کە ئێوە باسی دەکەن لە سەردەمی عومەری کوری خەتاب(ﷺ) بووە... ئەمەش لە ساڵی (٢٠) کۆچی بوو کە بەیەکەم بومەلەرزە دادەنرێت لەسەردەمی زێڕینی ئیسلام[١].

لەم ئایەتەی سەرەوە خوای گەورە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە ڕۆژی دوایی (قیامەت) بە بوومەلەرزە گەورەکە دەست پێ دەکات، کە بەهۆیەوە جیهان کۆتایی پێ دێت، ئەوەی لێرەدا شایەنی باسە نهێنیە شاراوەو نەزانراوەکانی کاتی هەردوو ڕووداوی هاتنی ڕۆژی دوایی و ڕوودانی بوومەلەرزەیە، هەروەکو چۆن کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی جگە لە خوا هیچ مرۆڤێك نایزانێت و ناشتوانێت بیزانێت،

---

(١) وتاری عەلی دەدە، بە تەحقیقی: عبدالله عبالعزیز امین.

بەرگی دووەم

بە هەمان شێوە زانست بە هیچ شێوەیەك ناتوانێت کاتی ڕوودانی بوومەلەرزە دیاری بکات و بیزانێت، بەڵکو ئەو زانیاریانەی کە دەربارەی هەردوو ڕووداوەکە دەزانرێت، تەنها نیشانەکانی ڕووداوەکەیەو هیچی تر، واتە ناتوانرێت کاتی ڕووداوەکە بزانرێت، هەروەکو ناشتوانرێت ڕێگە لە ڕووداوەکە بگیرێت، زانای بەناوبانگی جیۆلۆجی د.زەغلول نەجار دەڵێت: ڕەنگە بتوانرێت بەبەکارهێنانی ئامێری زۆر هەستیاری بوومەلەرزە، پێشبینی ڕوودانی بوومەلەرزە بکرێت (واتە نیشانەکانی بزانرێت) ئەویش بە چاودێریەکی زۆر وردی ئەو دەنگانەی کە پەیدا دەبن، ئەمەش زیاتر لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی وەکو ئەمریکاو یابان، یا زانینی نیشانەی تری وەکو گۆڕانی تۆپۆگرافی ناوچەکە، یان زیادبوونی لاری چینەکان و دروست بوونی درز لەسەر زەوی، یان گۆڕانی ئاستی ئاوی بیرەکان و دەریاچەکان، یاخود دەرچوونی گاز وەکو گازی ڕادیۆم و زیاد بوونی گازی کانەکان و کۆچ کردنی کتوپڕی گیانلەبەران، بەڵام مرۆڤ بە هیچ شێوەیەك نەیتوانیوەو ناشتوانێت پێشبینیەکی ڕاست و ڕەوانی کاتی ڕوودانی بوومەلەرزە بکات، هەروەها ناشتوانێت ڕوو بەڕووی ئەو کارەساتانە بێتەوە، پرۆفیسۆری جیۆلۆجی (Roger Bilham ) مامۆستای زانکۆی (Colorodo) دەڵێت: (ناتوانرێت بەهیچ شێوەیەك کاتی ڕوودانی بوومەلەرزە بزانرێت، بەڵکو ئەو زانیاریەی دەست مرۆڤ دەکەوێت، تەنها هۆکاری ڕوودانی بوومەلەرزەکەیە.

هەندێ گیانلەبەر هەن، کە پێش ڕوودانی بومەلەرزە هەست پێ دەکەن، هەروەکو لە دانیشتوانی (لیاونگ)ی صینی دەیانزانی کە زنجیرەیەك بوومەلەرزە ڕوودەدات، بەڵام کەی؟ سەرەتا نەیانتوانی وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە، لە ساڵانی (٧٠) دا چەندین توێژینەوە لەم بارەیەوە کرا، پاش چوار ساڵ توانیان هەندێك باری نا ئاسایی گیانلەبەر بکەن بە نیشانە پێش ڕوودانی بومەلەرزە، یەکێك لەو نیشانانە کە مار لە زستاندا لە ژێر زەویەوە دێتە دەرەوە بۆ ناو بەفر، ئەمە دیاردەیەکی سەیرە، چونکە مار لە زستاندا لە سووڕی سست بووندایە، یان هاتنە دەرەوەی مشك و جورج لە کون و کەلەبەری ماڵەکان بۆ سەرجادەو کۆلانەکان، هەروەها بە کۆمەڵ کۆچ کردنی قازو نیشتنەوەیان بە سەردارەکانەوە،

ئەم دیاردەیەش سەیرە، چونکە قاز هەرگیز بەسەر دارەوە نانیشێتەوە، یەکێکی تر لەو نیشانانە تێکچوونی دەم و چاوی مانگاو هاتنە خوارەوەی ئاو بە چاویدا لە شێوەی گریان.

لە ساڵی (١٨١٥)ع لە دوورگەی (زەمباوە)ی ئەندەنوسی تەقینەوەی بورکانێك ڕوویداو بەردو خۆڵی بۆ بەرزایی (١٥٠)کم هەڵداو تۆزو خۆڵی ئەم بورکانە لە ساڵی (١٨١٦)ع لە ناوچەکانی ئەمریکای باکوورو ئەوروپادا (٢-٥) پلەی گەرمی دابەزاند، لەبەر ئەو هەورە چڕەی کە لە نیوەی باکووری زەویدا دروستی کردو بەری تیشکی خۆری گرت.

لێکۆڵینەوەی قڵێش و درزی چینەکانی زەوی لەم سەدانەی دواییدا دەستی پێکرد، کەچی قورئان ئەوەندە گرنگی پێدەدا، خوای پەروەردگار سوێندی پیٚ دەخوات پێش زیاتر لە (١٤) سەدە.

لەم ساڵانەی دواییشدا لە دەریای (ئیجە) و دەوروبەری کۆمەڵیٚ وێنەو شوێنەوار دۆزرایەوە کە زانایان دەڵێن: ئەم وێنەو شوێنەوارانە بۆ (٢٠٠٠) هەزار ساڵ لەمەوپێش دەگەڕێتەوە، دەڵێن: لە ساڵی (١٦٨٠) پێش لە دایکبوونی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لیٚ بیٚ) بورکانێکی گەورە تەقیەوە، کە چەند ڕۆژێکی خایاندو هەوری ڕەش بە جۆرێك ئاسمانی گرت، کە خەڵکی ناوچەکە شەو و ڕۆژیان بۆ جیا نەدەکرایەوە، دواتر بوومەلەرزەیەکی گەورە ڕوویدا، کە بووە مایەی دروستبوونی هەرەسهێنان و درزی زۆر لە زەویدا، هەمان باسیش لە نووسینی فیرعەونەکاندا هاتووە، کە ئەوان دوورتریش بوون، پاش لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی زۆر دەرکەوت کە لەو ساڵەدا، لە ئەنجامی بورکان و بومەلەرزەیەکی گەورەوە، ناوچەی دەریای ئیجەی ئێستا زەویەکەی چاڵ بووەو ئاوی دەریای ناوەڕاستیش پری کردۆتەوە، بەوەش دەریای ئیجە دروست بووە، پاش ئەوەی کە تەنها زمانەیەکی بچکۆلەی دەریای ناوەراست بووەو بەمەش دوورگەی ئەتلانتا و شارستانیەکەی لە ناوچوون.

ئیستا زانیمان کە ڕووداوە سروشتیەکان چ کارەساتێکی لێدەکەوێتەوەو چی لە شارە گەورەکان دەکات، هەروەها زانیشمان کە مرۆڤ بە دەستی خۆی چ وێرانەیەك بۆ خۆی و خاکەکەی دروست دەکات، و بە چ شێوەیەك شارە جەنجاڵەکان دەکاتە گۆڕستانێك، یان بە شێوەیەکی وردتر ئەگەر سەرنج لە کارەساتەکان بدەین، تێبینی دەکەین کە هەندێکیان بەڵگەو هاتنی نزیك بوونەوەی ڕۆژی دواییین، لە نێو ئەو بەڵگەو نیشانانەش کە بە شێوەیەکی زۆر لە فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە زەمین لەرزینە یان بومەلەرزەیە، لە ئەنجامی ئەم بوومەلەرزانەش یاخود بڵێین ئەم زەمین لەرزانەش دەیەها هەزار کەس کوژراون و دەیەها هەزاریش بریندار بوون، ئەم ژمارەیەش زۆر زیادی کردووە لە چاو ساڵەکانی پێش خۆی.

ناوچەیەك کە زۆرترین بومەلەرزە لێی بدات یابانە، بە درێژایی ڕۆژەکانی ساڵ بومەلەرزە تیایدا ڕوو دەدات، بەڵام هێندە سوکە هیچ زیانێکی لێ ناکەوێتەوە، هەروەها شوێنێکی تریش کە بومەلەرزەی زۆر بەخۆیەوە ببینێت ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، بۆیە ڕاڤەی ئەوەش بەوە دەکرێت کە توێکڵی زەوی لە هەموو شوێنێکدا وەکو یەك نیە، لە هەندێك شوێندا توێکڵی زەوی بە شێوەیەکی چەسپاو جێگیر نەبووە، جا لە هەر شوێنێکی زەویدا شکاوی هەبوو، ئەوا قەبارەیەکی بەردی گەورە بەهێزێکی بەردی گەورە دەخشێت و وزەی ئەو لێك خشانەش دەگۆڕێت بۆ لەرینەوەو لەرزاندنەوەی بەردەکان، لە کاتێکدا ئەو لەرینەوەو لەرزینە هەزاران میل دەبڕێت، هەمیشە بومەلەرزە لەنزیکی هێڵی (شکاو)ەکەوە بەهێزترەو ئەو گۆڕانکاریانەی دوای بومەلەرزەکە ڕوودەدات، بۆیە لەسەر ڕووی زەوی بە درێژایی هێڵی شکاوەکە ڕون و ئاشکرایە، ئەو بەشەی کە لەکاتی لەرزینەوەکەدا هەستی پێ دەکرێت بە شێوەیەکی بەهێزتر لە شوێنەکانی تر پێی دەگوترێت (سەنتەری سەرووی بومەلەرزە)، ئەگەر ئەو سەنتەرە لە نزیك شارێکدا بێت، ئەوا بێگومان وێرانکاری زیاتری لێ دەکەوێتەوە، جا کاتێك سەرنج لە زۆری زەمین لەرزەکان و زۆری قوربانیەکانی زەمین لەرزەکان دەدەین.

## ئاماری بومەلەرزە و مەرگ:

جیهان هەر لە سەدەی (١٣)ەوە هەتا ئەمڕۆ بومەلەرزەی زۆرو هەمەچەشنی هێزو پلەی دیوە، ملیۆنان كەس بوونەتە قوربانی بە هۆی ئەمەوە شوێنەواری جوگرافیاو شارستانی جۆر بە جۆر سڕاوەتەوە، ئەمەش گەورەترینی ئەم بوومەلەرزانەیە:

| ساڵ | وڵات | ڕێژەی قوربانی |
|---|---|---|
| ١٢٢٧ | فەڕەنسا | ٥٠٠٠ |
| ١٤٥٦ | ئیتاڵیا | ٣٠٠٠ |
| ١٥٥٦ | چین | ٨٣٠٠٠٠ |
| ١٧٠٣ | یابان | ٢٠٠٠٠ |
| ١٧٥٩ | بعلبك | ٢٠٠٠٠ |
| ١٩٠٨ | ئیتالیا | ٨٤٠٠٠٠ |
| ١٩٢٠ | چین | ١٨٠٠٠٠ |
| ١٩٢٣ | تۆكیۆ | ٩٩٣٠٠ |
| ١٩٦٠ | مەغریب | ١٥٠٠٠ |
| ١٩٧٧ | چین | ٧٠٠٠٠٠ |

## (16) ئاماری بومەلەرزە و مەرگی تر:

١) لە ساڵی (١٩٠٦)ع بومەلەرزەیەكی گەورە دای لە (فرانیسكۆ) لە ئەمریكای باكوور، دوای بومەلەرزەكەش ئاگرێكی گەورە كەوتەوەو نزیكەی سەد هەزار كەسی كوشت، وە بڕی زیانە ماددیەكانی بومەلەرزەكەش لەو سەردەمەدا بە (٤٢٥) ملیۆن دۆلاری ئەمریكی مەزندە دەكرا .

٢) لە ساڵی (١٧٥٥)ع بومەلەرزەیەك شاری (لشبۆنەی پرتوگالی) وێران کردو کەمتر لە (٣٠٠٠٠) هەزار کەسیشی کوشت.

٣) لە ساڵی (١٩٠٨)ع دا بومەلەرزەیەك لە (کالابریاو سەقلیە) ڕوویدا نزیکەی (٧٥٠٠٠) کەسی کوشت.

٤) لە ساڵی (١٩١٥)ع دا بومەلەرزەیەك لە ناوەڕاستی ئیتاڵیادا ڕوویدا، سەدان لادێ و شاری وێران کردو(٣٠٠٠٠) کوشتاریشی لێکەوتەوە.

٥) دوو بومەلەرزەی زۆر گەورە بووە هۆی زیانێکی زۆر لە تۆکیۆی ژاپۆن و هەرێمی کانسۆی چین دا، بومەلەرزەکەی تۆکیۆی ژاپۆن، لە ساڵی (١٩٢٣)ع ڕوویداو زیاتر لە (١٠٠٠٠٠) هەزار کەسی کوشت و شارەکەشی وێران کرد، و یۆکۆهاماشی لەگەڵ خۆیدا ڕووخاند، هەروەها بومەلەرزەکەی کانسۆی چینیش لە ساڵی (١٩٢٠) دا ڕووی داو ڕووبەری (٣٠٠) میلی چوار گۆشەی گرتەوەو نزیکەی (٢٠٠٠٠٠) هەزار کوشتاری لە شوێن خۆی بەجێهێشت، بۆیە دەشێت بومەلەرزەی زۆر گەورە ببێت، بەڵام زۆر بەکەمی ڕوودەدات، بۆ نمونە لە ساڵی (١٨١١) و (١٨١٢) دا لە نزیك شاری «نیومەدرید»ی ویلایەتی مەیزوری ئەمریکا بومەلەرزەیەك ڕوویدا، خەڵکی لە دوری (٤٠٠) میللەوە هەستیان بە لە رزەکەی کرد کە زیاتر لە (١٨٧٣) لەرزینەوە دەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی چڕی دانیشتوان لەو ناوچانەدا کەم بوو، زیانێکی ئەو تۆی لێ نەکەوتەوە.

شێخ محەممەد ڕەسول بەرزنجی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

٦) لە سەردەمی یەکەم خەلیفە (متوکل) لە ساڵی (٢٣٢) بومەلەرزەیەکی گەورە ڕوویدا، و نزیکەی (٥٠٠٠٠) هەزار کەس مردن لەشاری دیمەشق هەتا موسڵ بەردەوام بوو.

٧) لە ساڵی (٢٤٢) بومەلەرزەیەکی گەورە ڕوویدا لە تونس و خوراسان و نەیسابورو طبرستان و ئەصبهان، تا وای لێهات چیاکان هەمووی شەق شەق بوون.

٨) لە ساڵی (٢٤٥)کۆچی بومەلەرزەیەکی گەورە ڕوویدا لە سەرتاسەری جیهان.

٩) لە سەردەمی (المعتضد) لە ساڵی (٢٨٠)کۆچی بومەلەرزەیەکی گەورە لە شاری (دوبەیل) ڕوویدا، زیانی قوربانی یەکانی نزیکەی (١٥٠٠٠٠) کەس بوو .

١٠) لە ساڵی (٤٦٠)کۆچی بومەلەرزەیەکی گەورە لە شاری (ڕەملە) ڕوویدا، هەتا وای لێهات ئاو لەناو چیاکانەوە هەڵدەقوڵا، و ژمارەی قوربانیەکان نزیکەی (٢٥٠٠٠) کەس بوو، پاش ئەوەی ئاوەکە نەماو ڕۆیشت خەڵکەکە نیشتەجێ بوونەوە، دووبارە ئاوەکە هەڵقوڵایەوە ئەو جارە هەموو خەڵکەکە نقوم بوون.

١١) لە ساڵی (٥٠٢) کۆچی بومەلەرزەیەکی گەورە ڕوویدا لە شام و حەلەب و شیرازو ئەنتاکیەو تەڕابولس، خەڵکێکی یەکجار زۆر بوونە قوربانی، و لە شاری شیراز کەس دەربازی نەبوو، تەنها ئافرەتێك و خزمەتکارێك ڕزگاریان بوو، خەڵکێکی گەلێك زۆر بوونە قوربانی، لە بەیروت و تەرابولس عەککاو صور، و هەموو شارەکانی (فەرانج)یشی گرتەوەو ژمارەی قوربانیەکانی نزیکەی یەك ملیۆن زیاتر بوو.

١٢) بەڵگەنامەکانی بومەلەرزەی جیهان ئاماژە بە بومەلەرزەیەك دەکەن لە ساڵی (٥٢٦) لە شاری ئەنتاکیەی تورکیاو چارەکە ملیۆنێك خەڵکی کوشت.

١٣) لە ساڵی (٦٦٢)کۆچی بومەلەرزەیەکی گەورە لە میسر ڕوویدا.

١٤) لە ساڵی (٤٣٣)کۆچی بومەلەرزەیەکی تر ڕوویدا، و خەڵکێکی یەکجار زۆر بوونە قوربانی .

١٥) لە ساڵی (٩٢٢)کۆچی بومەلەرزەیەکی گەورە لە (ئەزرنکان یان ئازربایندجان) ڕوویدا کە بە هۆیەوە خەڵکانێکی زۆر بوونە قوربانی .

١٦) لە ساڵی (١٠٠٠)کۆچی لەشاری (لار) بومەلەرزەیەکی گەورە ڕوویدا، و بووە هۆی ئەوەی کەماڵێکی یەکجار زۆر خاپوور بوو[1].

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ٩٠ ٩١ .

ئەمە چەند نمونەیەك بوو لەم نموونانەی بومەلەرزە، بۆیە هەتا ئەمرۆش بومەلەرزە بەردەوامە، ئەگەر چاوێك بە مێژوودا بخشێنین دەبینین زۆر وولات بەهۆی بومەلەرزەوە کەوتونەتە ژێر خاکەوە.

بە هەمان شێوە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) نیشانەکانی ڕۆژی دوایی دەستنیشانکراوەو زانراوە، بەلام سەبارەت بە کاتی هاتنی ڕۆژەکە هیچ مرۆڤێك تەنانەت پێغەمبەریش (ﷺ) نەیزانیوەو ناشزانرێت، هەروەکو لە زۆربەی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکاندا نهێنی کاتی هاتنی ئەو ڕۆژە ڕوونکراوەتەوە .

لە ساڵی ٢٠١٠ع زەمین لەرزەیەك ڕوویدا لە شاری (هایتی) کە ژمارەی قوربانیانی ئەم زەمین لەرزەیە گەیشتە (٢٠٠) هەزار کەس، بۆیە ڕۆژنامەیەکی ئەمەریکی باس لەوە دەکات، کە باڵەخانەی پەرلەمان و زۆر لەفەرمانگە حکومیەکان لە (بوور ئەویرنسی) هەرەسیان هێناوە.

ئەو بومەلەرزەیە کە لەهەژارترین وڵاتی ڕۆژئاوای زەوی داوە، بەهەزاران کارەساتی مرۆیی بەدوای خۆیدا هێناوە، دانیشتوانی وڵاتی (هایتی) (١٠) ملیۆنن، زۆربەیان هەژارو کەم دەرامەتن، و هەمیشە لە شەڕو ئاژاوەدا ژیاون ئەمەش هەموو بەڵگەیە لەسەر هاتنی ڕۆژی دوایی.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: [يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٞ ﴿١﴾ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ ﴿٢﴾][1].

واتە: ئەی خەڵکینە لە پەروەردگارتان بترسن و خۆتان لە خەشمی بپارێزن، چونکە بەڕاستی زەوی لەرزەی ڕۆژی دوایی، کارەساتێکی زۆر گەورەیەو

---

(١) سورة الحج ، الآية : (١ - ٢) .

ڕووداوێکی سامناکە، لەو ڕۆژەدا کە کارەساتەکە دەبینن، هەموو شیردەرێك لە شیرە خۆرەکەی بێئاگا دەبێت و فەرامۆشی دەکات، هەروەها هەموو سکپڕ و دوو گیانێکیش کۆرپەلەی لەبار دەچێت، خەڵکی لەو ڕۆژە سامناکە وەکو سەرخۆشن، لە ڕاستیدا سەر خۆش نین، بەڵکو سزای خوایی زۆر سەخت و سامناکەو سەری لێشێواندوون.

هۆکاری هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە، ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) لەسەفەر بوو، جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو بە هاوەڵەکانی فەرموو: دەزانن ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە، گوتیان: خواو پێغەمبەرکەی دەزانن پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی :ئەمڕۆ ئەم ڕۆژەیە کە خوا دەفەرموێت بە ئادەم هەر لە (١٠٠٠)کەس (٩٩٩) کەس بۆ ئاگرە یەکیان بۆ بەهەشتە، لەو کاتە هاوەڵەکان دەستیان کرد بە گریان پاشان پێغەمبەر(ﷺ) موژدەی دانێ.

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: « يَا آدَمُ، فَيَقُولُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالخَيْرُ فِي يَدَيْكَ، فَيَقُولُ: أَخْرِجْ بَعْثَ النَّارِ، قَالَ: وَمَا بَعْثُ النَّارِ؟ قَالَ: مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَ مِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ، فَعِنْدَهُ يَشِيبُ الصَّغِيرُ، وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا، وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى، وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَأَيُّنَا ذَلِكَ الوَاحِدُ؟ قَالَ أَبْشِرُوا، فَإِنَّ مِنْكُمْ رَجُلًا وَمِنْ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ أَلْفًا)[١].

واتە: خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی ئادەم، ئەویش دەڵێت: بەڵێ.. بۆ فەرمانت ئەی خوای گەورە، خێریش هەر لە دەست تۆدایە، خوای گەورەش دەفەرموێت: ئەوانەی کە دەنێردرێن بۆ ئاگر جیایان بکەوە، ئەویش دەڵێت: نێردراوەکانی ئاگر کێن؟ دەفەرموێت: لە هەموو هەزارێك نۆسەدو نەوەدو نۆ، ئا لەو کاتەدا منداڵ سەری سپی دەبێت و هەموو ئافرەتێکی سك پڕ، سکەکەی دادەنێت و خەڵکی دەبینیت سەرخۆشن و هیچیشیان سەرخۆشی مەی نین، بەڵام ئازار و تۆڵەی خوا توندە، گوتیان: جا باشە کام لە ئێمە ئەو کەسە دەبێت؟

---

(١) صحيح البخاري (٤/ ١٣٨) باب: قصة يأجوج ومأجوج، برقم : (٣٣٤٨).

پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی: موژدە بێت بۆ ئێوە، لە ئێوە یەك پیاو و لە یەئجوج مەئجوج هەزار.

مەبەست لەم فەرمودەیە ئەوەیە هەتا لەم ئومەتە یەك پیاو دەچێتە ئاگر لە یەئجوج و مەئجوج هەزار دەچێت کە ئەمەش ئاماژەیە بۆ بێباوەڕیان، هەروەها بۆ زۆری ژمارەیان.

کۆمەڵێك زاناو لێکۆڵەری ئەمریکی، لە ئەنجامی دیراسەی زەمین لەرزەی (لۆس ئەنجەلۆس) لە ساڵی (١٩٩٤)ع کە پلەکەی (٧،٦) پلەی ڕێختەر بوو، کە بووە مایەی زەرەر و زیانی (٤٠) ملیار دۆلار، جا بۆیان دەرکەوت ئەو زەمین لەرزەیە بووەتە هۆی خێراکردنی منداڵبوون، چونکە وێلاش هەر بە تەنها ڕێڕەوێك نیە بۆ گواستنەوەی مەواد لە دایکەوە بۆ کۆرپەلە، بەڵکو وێلاش هۆکاری دەرەکی کاری تێدەکات و هەندێ هۆرمۆنات دەر ئەدات و کار دەکاتە سەر کاتی منداڵ بوون.

باشە زەمین لەرزەیەکی دونیا ئەم کارە بکات، دەی ئەبێ زەمین لەرزەی ڕۆژی دوایی چۆن بێت بەو هەموو سامناکی و بەهێزیەوە، دیارە بێگومان دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەرچی ئافرەتێك منداڵی لە سکدا بێت، لەباری بچێ و پێش وەخت بیبێت.

پێشەوا سەعید نەورسی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: چەند وەڵامێك هاتنە دڵمەوە بۆ هەندێ لەو پرسیارانەی کە لەبارەی بوومەلەرزە تازەکەی ئێستاوە دەکرێن، چەند جارێك ویستم بە درێژی وەڵامی ئەم پرسیارانە بنووسم، بەڵام مۆڵەت نەدرام، بۆیە وائێستا لێرەدا بە کورتی و پوختی دەنوسرێن.

## پرسیاری یەکەم:

ئەم بوومەلەرزە گەورەیە کارەساتێکی مەعنەوی گەلێ دژوارتری لە کارەساتی ماددیە دڵتەزێنەکەی دەرخواردی خەڵکیدا، کە بریتیە لە سام و ترس و نائومێدی، و باڵیان بەسەر دەروونی ئەو خەڵکەدا کێشا، چونکە ئەم ترسە هێندە

بەردەوام بوو کە لەشەویشدا حەوانەوەی لە زۆربەی خەڵکی سەندەوەو پشێوی ئاڵۆزی زۆربەی ناوچەکانی وڵاتی گرتەوە، ئایا سەرچاوەو هۆی ئەم ئازارە سەختە چیە؟

بە یارمەتیدانی ئاگادارکردنەوەیەکی مەعنەوی، ئەم وەڵامەی خوارەوەم بۆ هات:

ئەو بەرەڵایی و بەدڕەوشتیەی کە بەئاشکراو لە ڕۆژی ڕۆشناو لە مانگێکی پیرۆزی وەك ڕەمەزاندا، و لە دەمی نوێژی تەراویحدا ڕوودەدەن، و پڕکردنی گوێی خەڵکی بەو گۆرانییە هەست بزوێنانەی کە بە دەنگی ئافرەت دەوترێن لە ڕێی ڕادیۆ و جگە ڕادیۆ لە هەموو شوێنێکی ئەم وڵاتەی کە مەڵبەندێکی خاوێنی ئیسلام بوو، هەموو ئەمانە چەشتنی ئەم ئازاری ترسەی بەرهەم هێنا[1].



پرسیاری دووەم:

بۆچی ئەم ئەشکەنجە پەروەردگاری و تەمێ کردنە خواییە توشی وڵاتی کوفر نابێت، و موسڵمانە لاواز و هەژارەکانی پێوە گیرۆدە دەبن؟

وەڵام: هەروەك تاوانە مەزنەکان بۆ دادگا گەورەکانی جەزا ڕەوانە دەکرێن و دواخستنی سزاکانیان بەو دادگایانە دەسپێرێت، کەچی هەر لە مەڵبەندی قەزا و ناحیەکاندا تاوانە بچوکەکان یەکلایی دەکرێنەوەو سزاکانیان دەست نیشان دەکرێن.. بەهەمان جۆر، بەشی هەرە زۆری تۆڵەی تاوانی بێباوەڕان بۆ دادگایی حەشری مەن دوا دەخرێن، بەڵام هەر لەم دنیایەدا و لەسەر داخوازی دانستێکی پەروەردگاریی گرنگ، باوەڕداران لەسەر هەندێ هەڵەو گوناهی خۆیان سزا دەدرێن.

---

(١) سەرجەمی پەیامەکانی نوور (١/ ٢٤٦)، نوسینی: سەعیدی نورسی، فاروق ڕەسول یەحیا کردوویەتی بە کوردی.

## پرسیاری سێیەم:

بۆچی ئەم موسیبەتە سەرجەمی وڵات دەگرێتەوە، مادەم ئەنجامی چەند هەڵەو گوناهێکە هەندێ کەس دەیانکەن؟

وەڵام: زۆربەی خەڵکی لەگەڵ ئەو چەند ستەمکارە کەمانەدا بەشدارن، چونکە یان بە «کردەوە» یان بە «شوێنکەوتن» یان بە « گوێڕایەڵی فەرمایشتەکانیان» لەناوەڕۆك لەگەڵیاندان، و ئەمەش کارێك دەکات موسیبەتەکە ئەو شێوە گشتیە بگرێتە خۆ، چونکە موسیبەت بەهۆی بێ گوێی و ملنەدان و گوناهی زۆربەی خەڵکەوە دەتەنێتەوەو گشت لایەك دەگرێتەوە[1].

## پرسیاری چوارەم:

مادەم ئەم بوومەلەرزەیە بە هۆی تاوان و خراپەکاریەکان و بۆ مەبەستی کەفارەتی گوناهەکان ڕوویداوە، ئەی بۆچی بێ تاوانەکانیش دەگرێتەوەو بەبڵێسەکەی دەسووتێن، لە کاتێکدا کە ئەوان توخنی هیچ هەڵەو گوناهێك نەکەوتوون، تاکو کەفارەتەکەی بدەن. ئایا دادگەریی پەروەرگار چۆن بەمە ڕازی دەبێت؟

هەروەها بە یارمەتی ئاگاداریەکی مەعنەوەی ئەم وەڵامەم بۆ هات:

ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بە نهێنی «قەدەری خوا» وە هەیە، بۆیە حەواڵەی «پەیامی قەدەر»ی دەکەین و لێرەدا ئەم ئەندازەیەی خوارەوە دەخەینە ڕوو: [ وَٱتَّقُواْ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٥﴾ ].

واتە: خۆتان لە بەڵاو گیروگرفتێك بپارێزن، کە نەك تەنها ستەمکاران دەگرێتەوە، بەڵکو بێتاوانەکانیشی پێوە گیرۆدە دەبن.

---

(١) سەرجەمی پەیامەکانی نوور (١/ ٢٤٧).

نهێنی ئەم ئایەتە بریتیە لەوەی کە ئەم دونیایە خانەی تاقیکردنەوەو موجاهەدەو تەکلیفە، خۆ تاقیکردنەوەو تەکلیفیش داخوازی ئەوەن کە ڕاستیەکان شاراوە و پەنهان بن، تاکو پێشبڕکێ دروست ببێت، و لە ڕێی موجاهەدەوە ڕاست و ڕاستگۆیان لەگەڵ ئەبوبەکری صدیق دا بۆ »أعلی علیّین» بەرز ببنەوەو درۆزنانیش لەگەڵ موسەیلەمەی درۆزندا بەرەو «أسفل السافلین» بەرببنەوە.

خۆ ئەگەر کەسانی بێتاوان لەو موسیبەتانەدا دەرباز ببن و هیچ پریشك و ئازارێکیان بەر نەکەوێت، ئەوا »باوەڕ» دەبوو بەشتێکی ئاشکراو سەلماو لای هەمووان، کافران و باوەڕداران وەك یەك و بێ جیاوازی ملیان بۆ کەچ دەکردو ئەو کارەش تەکلیف لە گۆڕێدا نەدەماو پێویستیش بۆ مرۆڤ نەدەمایەوە کە بە پلەو پایەکانی باوەڕ سەربکەوێت و بەرز ببێتەوە[١].

مادەم بە پێی دانایی خواوەندو بەبێ جیاوازی موسیبەت توشی ستەمکارو ستەم لێکراو دەبێت، ئایا بەشی ئەو ستەم لێکراوانە لە جگەری خواوەندو میهرەبانیە فرەوانەکەی دا کامەیە؟

وەڵام: لە ناوەندی ئەو بەڵایەدا درەوشانەوەیەکی میهرەبانی هەیە، چونکە سامانی لەناوچووی ئەو بێتاوانانە بە هەمیشەیی لەدوا ڕۆژدا دەمێنێتەوە، وەکو صەدەقە بۆیان پاشکەوت دەکرێت، ژیانە لەناوچووەکەشیان لەبەر ئەوەی جۆرە شەهیدبوونێکی بەخۆیەوە دیوە، بۆیان دەگۆڕێت بە ژیانێکی هەمیشەیی، واتە: ئەو بەڵایە سەبارەت بەو بێتاوانانەوە جۆرێکی میهرەبانی خواوەندە لە دووتوێی ئەو ئازارە سەخت و کاتیەدا، چونکە بە ئازارو سەختیەکی کاتی و تا ڕادەیەك کەم، دەستکەوتێکی گەورەو بەردەوامیان پێ دەبەخشرێت.

## پرسیاری پێنجەم:

بێ ئاگایان لەناو خەڵکیدا ئەوە بڵاو دەکەنەوە کە ڕوودانی «بوومەلەرزە» تەنها ئەنجامی ئال وگۆڕو پشێوی کانزاکانی ناوجەرگەی زەویە، و وەك ڕووداوێکی بێ

---

(١) سەرجەمی پەیامەکانی نوور، (١/ ٢٤٨).

مەبەست، و بە ئەنجامی «ڕێکەوت»و کاری «سروشت»ی دادەنێن، و هۆکارو ئەنجامە مەعنەویەکانی ئەم ڕووداوە نابینن تام لەو بێ ئاگاییەی تیایدان بێدار ببنەوە، ئایا هیچ ڕاستیەك هەیە پاڵپشتی بۆچونەکەیان بێت؟

**وەڵام:** جگە لە گومڕایی هیچیان بە دەستەوە نییە، و بۆچونەکەیان داوای هیچ ڕاستیەك نیە، چونکە بەچاوی خۆمان دەبینین، کە هەموو چەمکێك لەو هەزاران جۆرانەی زیندەوەران کە لەسەر گۆی زەویدا لە پەنجا ملیۆن زیاتر دەبن، بەڵام خواوەندی خاوەن توانستی ڕەها بەپێی خواستی دانستە ڕەهاکەی خۆی، هۆکارە ڕواڵەتیەکانی کردووە بە پەردەی ڕوو کەش لەبەردەم کارو هەڵسوکەوتەکانیدا، و هەر کات ویستی لەسەر ڕوودانی بوومەلەرزە ببێت ئەوا هەندێ جار فەرمان بە یەکێك لە کانزاکان دەدات کە بجوڵێت[١].

وا دابنێ «بوومەلەزە» بە ڕوودانی ئاڵوگۆڕ و پشێوی کانزاکان پەیدا ببێت، خۆ هێشتا لەم کارەشدا هەرگیز بەبێ فەرمانی خوای گەورەو بێ ئەوەش لەگەڵ دانستی ئەودا بگونجێت ڕوونادات.

بۆ نموونە: ئەو سەرپێچیە تاریك و نوتەك و ستەمکارانەیەی کە گرۆهی مرۆڤ لەم دەمانەی دواییدا بەرامبەر فەرمانەکانی خواوەند نواندی و هەموو جیهانی گرتەوە، بە ڕادەیەك ماکە گشتیەکانی هەژاندو هەمویانی تووڕە کرد، بگرە لە ئەنجامی ئەوانەوە پەروەردگارێتی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویش بە سیفەتی «رب العالمین» و فەرمانڕەوای هەموو گەردوون نەك بە سیفەتی پەروەرگارێتیەکەی هەندەکی تایبەت لەسەرانسەری جیهاندا، و لە بازنەیەکی هەمەکی و فرەوەاندا دەرکەوت، و بەبەڵاو گیروگرفتی گشتی سامناکی وەك: جەنگی جیهانی و بوومەلەرزەو لافاوە لامالەرەکان و ڕەشەبا توندوتیژو هەورە بروسکە سوتێنەر و تۆفان و زریان ڕووخێنەرەکان، زللەی لە گرۆهی ئادەمیزاد وەشاند، تاکو ئەم مرۆڤە نوقم بووەی ناو بێئاگایی بێداربێتەوەو هانی بدات واز لە ستەم و سنوور شکاندن و لە خۆبایی بوونە ترسناکەکانی بهێنێت، و

---

(١) سەرجەمی پەیامەکانی نوور، (١/ ٢٤٩).

پەروەردگارە مەزنەکەی خۆی پێ بناسێنێت کە پشتی لێ هەڵکردووە، بەمەش خوای گەورە بە ئاشکراو ڕوونی دانست و توانست و دادگەری و قیمەت ویست و فەرمان ڕەوایەتی خۆی ئاشکرا کرد.

کەچی سەرباری ئەمە، چەند شەیتانێکی نەفام کە لە شێوەو ڕووخساری مرۆڤدان، سەرسەختیەکی ئابڕوویەر لە ڕووی ئەو ئاماژە پەروەردگارییە هەمەکی و پەروەردە خواییە گشتیانە بۆ مرۆڤایەتی دەنوێنن، و دەڵێن: ئەوانە چەند هۆکارێکی سروشتین.. تەقینەوەو تێکەڵبوونی کانزاکان.. تەنها بە ڕێککەوت ڕوودەدەن، گەرمای خۆرو کارەبا بەر یەك کەوتن و بۆ ماوەی (٥) کاتژمێر لە ئەمریکادا مەکینەکانی لە کارخست.. ئاسمانی شاری قەستەمۆنی سوور هەڵگەڕاو دەڵێی ئاگری تێ بەربووە[1]!

## پرسیاری شەشەم:

چۆن دەزانرێت ئەم ڕووداوەی گۆی زەوی بە تایبەت ئاراستەی موسڵمانەکانی ئەم وڵاتە کراوەو مەبەست ئەوانە؟ بۆچی بە زۆری لەلای «ئیزیمر» و «ئەزرنجان»ەوە ڕوو دەدات؟

**وەڵام:** ئاماژە زۆرە کە مەبەست لەم ڕووداوە بەرکەوتنی ئەهلی ئیمانە، چونکە ڕوودانی لەم زستانە ساردەو لە دەمی تاریکایی شەو و سەختی سەرمادا، بە تایبەت لەم وڵاتەی کە ڕێزی مانگی ڕەمەزان ناگرێت.

هەروەها بەردەوامبوونی ئەم ڕووداوەش بە سووکی و لەسەر خۆیی، کە ئەنجامی پەند لێوەرگرتنەو بە مەبەستی بێدارکردنەوەی بێ ئاگایانە.. ئەمانەو ئاماژەکانی تری هاوچەشنیان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە مەبەست لەم ڕووداوە بەرکەوتنی ئیماندارانەو بە تایبەتی ڕووی لەوانە، تاکو ڕایان بچەڵەکێنێت، و بۆ نوێژ و نزاو لالانەوە لەبەردەم خوای گەورەدا هانیان بدات.

---

(١) سەرجەمی پەیامەکانی نوور، (١/ ٢٤٩).



بەرگی دووەم

سەبارەت بە توندو تیژی بوومەلەرزەکەش لە ئەرزنجانی کلۆڵدا، ئەوا دوو ڕووی تێدایە:

**یەکەمیان:** ئەوانی زوو تێوە گلاند تاکوببێت بە کەفارەتی گوناهە بچوکەکانیان.

**دووەهەم :** دەگونجێ لە پێشدا ئەم بوومەلەرزەیە زللەی خۆی لەو شوێنانە بۆ ئەوە وەشاندبێت، کە ئەهلی زەندەقەو ئیلحاد مەڵبەندێکی بەهێزیان بۆ چالاکیەکانی خۆیان لەو شوێنانە دامەزراندووەو دەرفەتیان لە کەم ژمارەیی پارێزگارە بەهێزو ڕەسەنەکانی باوەڕو ئیسلام بیبنیوە[1].

---

(١) سەرجەمی پەیامەکانی نوور (١/ ٢٥٠).

## سڵاو لە کەسانی تایبەت دەکرێت

یەکێکی تر لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە پیاو سڵاو ناکات تەنیا لەبەر ئەوە نەبێ کە دەیناسێ.

پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يُسَلِّمَ الرَّجُلُ عَلَى الرَّجُلِ ، لاَ يُسَلِّمُ عَلَيْهِ إِلاَّ لِلْمَعْرِفَةِ)[١].

واتە: لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە پیاوێك دەگاتە پیاوێکی دیکە سڵاوی لێناکات تەنیا لەبەر ناسیاوی نەبێت.

لەم فەرموودەیە بۆمان دەردەکەوێت کە سەلامکردن لە کەسانی تایبەت ئەوانە دەگرێتەوە:

**یەکەم:** پادشاو سەرۆکەکان سەلام لە خەڵکی ناکەن.

**دووەم:** سەلام تەنها لە دەوڵەمەندەکان دەکرێت.

**سێیەم:** سەلامکردن تەنها لە کەسایەتیە نزیك و خزمەکان دەکرێت.

**چوارەم:** سەلام تەنها لە ماڵەوە دەکەن.

لە فەرموودەیەکی تر پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (أَنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ تَسْلِيمَ الْخَاصَّةِ، وَفُشُوَّ التِّجَارَةِ ، حَتَّى تُعِينَ الْمَرْأَةُ زَوْجَهَا عَلَى التِّجَارَةِ ، وَقَطْعَ الأَرْحَامِ ، وَشَهَادَةَ الزُّورِ ، وَكِتْمَانَ شَهَادَةِ الْحَقِّ ، وَظُهُورَ الْقَلَمِ)[٢].

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (١/ ٤٠٦) برقم: (٣٨٤٨) وقال الشيخ أحمد بن شاكر : إسناده صحيح .

(٢) صحيح: مسند الإمام أحمد ، (١/ ٧٩١) برقم: (٣٩٤٧) وقال الشيخ أحمد بن شاكر : إسناده صحيح .

واتە: لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی سڵاو لە کەسانێکی تایبەت دەکرێ و بازرگانی بڵاودەبێتەوە تا وای لێ دێ ژن یارمەتی مێردەکەی دەدات لە بازرگانی و پەیوەندی خزماتی دەپچڕێ و شایەدی درۆ دەدرێ و شایەدی ڕاست و ڕەوا دەشاردرێتەوەو پێنوسیش دەردەکەوێ.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەم فەرمودەیە ئاگادارمان دەکاتەوە کە یەکێ لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە سڵاو لە کەسانێکی تایبەت دەکرێ، واتە: موسڵمان سڵاو لەو کەسانە دەکات کە دەیانناسێ.

هەروەها لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتووە کە دەفەرموێ: (إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ إِذَا كَانَتِ التَّحِيَّةُ عَلَى الْمَعْرِفَةِ)[1].

واتە: یەکێ لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە سڵاو تەنها لە ناسیاران دەکرێ.

بەڕاستی ئەمە کارێکی زۆر پێش چاوە لەم سەردەمەدا، چونکە زۆرێك لە خەڵکی سڵاو ناکەن تەنیا لەو کەسانە نەبێ کە دەیانناسن، کە ئەمەش پێچەوانەی سوونەتی پێغەمبەرە(ﷺ)، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر پێداگر بووە لەسەر سەلامکردنی موسڵمانان لە یەکتری لەو کەسانەی کە دەیناسی یان نایناسی.

جا ئەمەی کە پێغەمبەر(ﷺ) پێی ڕاگەیاندووین هەمووی پێشتر ڕوویداوەو بەردەوامە، وە لەم سەردەمەی ئێمەشدا دیاردەیەکی بینراوو بەرچاوە، ڕۆژ بە ڕۆژیش لە زیادبوون دایە.

هەروەها دوور بکەوە لەوانەی کە دژایەتی خوای پەروەردگارو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەون و سەلامیان لێ مەکەن، بۆ ئەوەی دووڕوویی و زندیقیەتی ئەوانت تووش نەبێت.

---

(١) مسند الإمام أحمد ، (١/ ٣٨٧) برقم: (٦٦٤٩٤٧) وقال الشيخ شعيب الأرنؤوط : حسن وهذا إسناد ضعيف لضعف مجالد.

## سێ شت زۆر بە عیززەت دەبن

یەکێك لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی سێ شت لە نێو خەڵکی زۆر بە عیززەت و شکۆمەندی سەیر دەکرێت..

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (لا تقوم الساعة حتى يعز الله فيه ثلاثاً: درهما من حلال

وعلما مستفادا

وأخا في الله)[١].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا خوای گەورە سێ شت بە عیززەت دەکات:
درهەمێك لە حەڵاڵ
وە زانستێك سوودی هەبێت
وە برایەك لە پێناوی خوای گەورەت خۆش بوێت.
واتە: ئەم سێ شتە زۆر کەم دەبێت لەلای خەڵکی.. لەم سەردەمە بە چاوی خۆمان دەبینین کە خەڵکی ئەمانە بە شکۆمەند سەیر دەکات..

هەرگیز مرۆڤی عاقڵ بەهەشت نافرۆشێت بە چەند سەعاتێکی شەهوەت و دونیا، چونکە هەر کەسێك پەنا بۆ ئەم کارە ببات ئەوە عیززەتی لە دەست دەدات و نامێنێت.

پێشەوا ئیبنو ڕەجەبی حەنبەلی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەی بەنی ئادەم.. گەر قەدری نەفسی خۆتت زانیبوایە ئەوا بە تاوانکردن ئیهانەت نەدەکرد، تۆ هەڵبژێردراوی لە نێو دروستکراوەکاندا، وە هەر بۆ تۆش بەهەشت دروست کراوە[٢].

---

(١) رواه الديلمي برقم: (٧٥٣٣).

(٢) لطائف المعارف، (لا ١٨٣).

# زۆربوونی ڕژدی و ڕەزیلی لە نێو خەڵکی

یەکێ لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەیە ڕژدی لەناو موسڵمانان زۆر دەبێت، جا چ لە ڕووی ماڵ بێت یان زانست یان هەر شتێکی تر، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بە یەکێ لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی داناوە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت: (إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ: أَنْ يَظْهَرَ الشُّحّ)[1].

واتە: لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی ڕژدی سەرهەڵدەدات.

لە فەرموودەیەکی تر پێشەوا ئەبو هوریرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (يَتَقَارَبُ الزَّمَانُ وَيَنْقُصُ الْعِلْمُ وَيُلْقَى الشُّحّ..)[2].

واتە: کات لێك نزیك دەبێت و، کردەوەی چاك کەم دەبێت و، ڕەزیلی دەکەوێتە دڵەکان..

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لَا يَزْدَادُ الْأَمْرُ إِلَّا شِدَّةً، وَلَا يَزْدَادُ النَّاسُ إِلَّا شُحًّا)[3].

واتە: کارەکان لە دونیادا هەر بەرەو زیاتر تەنگی و ناخۆشی دەچن، وە خەڵکیش جگە لە ڕەزیلی چیتر پەرە پێ نادەن.

ڕەزیلی ڕەوشتێکی قێزەوەنەو ئیسلام پێی ڕازی نیە، بۆیە هەر کەسێك دڵ و دەروونی لەم ڕەوشتە پاك بکاتەوە ئەوا سەرفرازو بەختەوەر دەبێت.

---

(١) رواه الطبراني في (المعجم الأوسط) (١/ ٢٢٨) برقم: (٧٤٨). قال الهيثمي: في مجمع الزوائد (٧/ ٣٢٧) ورجاله رجال الصحيح، غير محمد بن الحارث بن سفيان وهو ثقة.

(٢) صحيح البخاري (٨/ ١٤) باب: حسن الخلق والسخاء، برقم: (٦٠٣٧).

(٣) المستدرك (٤/ ٤٨٨) برقم: (٨٣٦٤) قال الإمام الحاكم: حديث صحيح.

پێشەوا جابری کوڕی عەبدوڵلا (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:

(اتَّقُوا الظُّلْمَ، فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ

وَاتَّقُوا الشُّحَّ

فَإِنَّ الشُّحَّ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، حَمَلَهُمْ عَلَى أَنْ سَفَكُوا دِمَاءَهُمْ وَاسْتَحَلُّوا مَحَارِمَهُمْ)[1].

واتە: خۆتان دوورخەنەوە لە ستەم، چونکە ستەم تاریکاییە لە ڕۆژی دوایی

وە خۆتان دوورخەنەوە لە ڕەزیلی

لەبەر ئەوەی ڕەزیلی گەلانی پێش ئێوەی بە هیلاك برد، کە وای لێکردن خوێن بە ناهەق بڕێژن و قەدەغە کراوەکانی خوا حەڵاڵ بکەن لە دژی یەکتر.

پێشەوا قازی عیاز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

لەوانەیە ئەو بە هیلاك چوونە ئەو هیلاکە بێت کە هەواڵی پێداون لە دونیادا بەوەی خوێنی یەکتری حەڵاڵ دەکەن و دەیڕێژن، وە لەوانەیە کە بە هیلاك چوونی ڕۆژی دوایی بێ، جا ئەوەی دووەم دیارو بەرچاوترە لە ڕاستی، وە لەوانەیە ئەم بە هیلاك چوونەیان لە دونیاو دوا ڕۆژ بێت[2].

لەم سەردەمەدا بە چاوی خۆمان دەبینین کە خەڵکی چەندە ڕەزیلن، پیاو ئەوەندە ماڵ و سەروەت و سامانی هەیە، بەڵام ئامادە نیە یارمەتی هەژاران بدات..

وە ئەگەر مرۆڤ بیەوێت دۆعای قەبوڵ بێت و ڕەت نەکرێتەوە ئەوا هەمیشە دەبێت یارمەتی دەری خەڵکی بێت و ڕەزیلی و ڕژدی بەکار نەهێنێت.

هەمیشە پیاو خۆی و دەوروبەری دڵتەنگ دەکات بە چروکی و ڕەزیلی، کە ئەمەش پێچەوانەی داب و نەریتی ڕەوشتی پێغەمبەری خوایە (ﷺ).

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ١٩٩٦) باب: تحريم الظلم، برقم: (٢٥٧٨).

(٢) شرح صحيح مسلم (١٦/ ١٣٤).

# چۆلکردنی شاری مەدینەی پێغەمبەر(ﷺ)

ئەم نیشانەیە یەکێکی ترە لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەرو تەواوکارە بۆ هەواڵی چۆڵبوونی لە نیشتەجێبوانی.

مەدینە ئاوەدان کرایەوەو گەشەی کرد لە پاش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی بۆ کرد، ساڵ بە دوای ساڵیش دانیشتوانی لە زیادبووندا بوون، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هەوڵی پێ ڕاگەیاندووین کە یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر ڕازی نەبوونی خەڵکە بە نیشتەجێ بوونی ئەو شارە.

پێغەمبەر(ﷺ) زۆر هاندەر بووە لەسەر نیشتەجێ بوون لە مەدینەدا، وە هەواڵی داوە کەوا هەر کەسێك کە لەم شارەدا بە ویستی خۆی دەربچێ، ئیلا خوای گەورە لەو چاکتر جێگیر دەکاتەوە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: ڕۆژێ دێت خەڵکی مەدینە شاری مەدینە چۆڵ دەکەن.

بۆ وە ڕاستگێڕانی ئەم فەرموودەیە ئێستا دەبینین خەڵکی زۆر مەدینەیان چۆڵ کردووەو دەچن لە شوێنی تر نیشتەجێ دەبن.. وە ئەوانەی لە دەوروبەری مەدینەن دەچنە ئەو شارە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت:

لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیست دەیفەرموو: (يَتْرُكُونَ الْمَدِينَةَ عَلَى خَيْرِ مَا كَانَتْ، لَا يَغْشَاهَا إِلَّا الْعَوَافِي - يُرِيدُ عَوَافِيَ السِّبَاعِ وَالطَّيْرِ - ثُمَّ يَخْرُجُ رَاعِيَانِ مِنْ مُزَيْنَةَ يُرِيدَانِ الْمَدِينَةَ، يَنْعِقَانِ بِغَنَمِهِمَا، فَيَجِدَانِهَا وَحْشًا، حَتَّى إِذَا بَلَغَا ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ خَرَّا عَلَى وُجُوهِهِمَا)[١].

---

(١) صحيح مسلم (٢/ ١٠١٠) باب: في المدينة حين يتركها، برقم: (١٣٨٩).

واتە: شاری مەدینە بەجیٚ دەهیٚڵن لە خۆشترین و باشترین حاڵیدا، تەنها گیاندار و باڵندە نەبیٚت تیٚی ناچیٚت، وە کۆتا کەسیش کە حەشر دەکریٚن و هەڵدیٚن دوو شوانن لە خیٚڵی (مزینە) بەرەو مەدینە دەچن، هاوار لە مەڕ و ماڵاتەکەیان دەکەن، کە دەبینن شارەکە چۆلە، هەتا کاتیٚك کە دەگەنە (ثنیة الوداع) ئەوانیش بەدەمدا دەکەون.

بە واتایەکی تر: خەڵکی واز لە مەدینە دەهیٚنن و لیٚی دەردەچن سەرەڕای ئەوەی مەدینە گونجاوە بۆ نیشتەجیٚ بوون، چونکە بەروبومی چاکەو گوزەرانی خۆشە بەڵام ئەوەندە ئاژاوەو سەختی پەیدا دەبیٚت کە خەڵکی بەجیٚی بهیٚڵن و بچنە شویٚنەکانی تر، تاکو لە دواییدا کەسی تیایدا نامیٚنیٚتەوە، بەڵکو دەبیٚتە کۆمەڵیٚك ماڵ و ڕیٚگەویان و مزگەوتی چۆل و سامناك، باڵندەو دڕندەیش دەگەڕیٚن بەناو شارەکەداو میزو پیسی پیا دەکەن، چونکە کەسی تیا نییە ڕیٚگریان بیٚت.

پیٚشەوا مالیك (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەگیٚڕیٚتەوە لە ئەبو هورێرە(ﷺ) کە پیٚغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویٚ:

شاری مەدینە بەجیٚ دەهیٚڵن لەسەر چاکترین ڕەوش تاکو سەگ یان گورگ دیٚنە ناوی و لەلای هەندیٚك دینگەکانی مزگەوت یان لەسەر مینبەرەکەی میز دەکەن، گوترا ئەی پیٚغەمبەری خوا(ﷺ) ئەی باشە بەرو بوومی ئەو سەردەم بۆ کیٚیە؟ فەرمووی: بۆ باڵندەو دڕندەکانە[١].

ئەمەش بەڵگەیە کەوا دەرچوونی خەڵك بە گشتی لە شاری مەدینە لە کۆتایی بونەوەر ڕوودەدات، ئەمەش لە دوای دەرچوونی دەججال و هاتنە خوارەوەی پیٚغەمبەر عیسا.

بەم شیٚوەیە دوای نەمانی باوەڕداران لەسەر زەویدا شاری مەدینە کاول و خاپوور دەکریٚت و کەسیش دڵی پیٚیان تەنگ بیٚت یان خەمیان لیٚ بخوات.

---

(١) الموطأ (٢/ ٨٨٨).

# دابەش نەکردنی میرات و دڵخۆش نەبوون بەدەستکەوت

ئەمانەش دوو نیشانەی ترن لە کۆتایی بونەوەر ڕوودەدەن بەهۆی فرەبوونی شەڕو کوشتارو هەڵگیرسانی جەنگ لەگەڵ گاورەکان.

پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِنَّ السَّاعَةَ لَا تَقُومُ حَتَّى لَا يُقْسَمَ مِيرَاثٌ وَلَا يُفْرَحَ بِغَنِيمَةٍ .. وَنَحَّى بِيَدِهِ نَحْوَ الشَّامِ..)[1].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت تاکو ڕۆژێك نەیەت ئیتر میراتی دابەش نەکرێت و کەس دڵی خۆش نەبێت بە دەستکەوت، ئینجا دەستی بەرەو لای شام ئاراستە کرد.

بەداخەوە.. لەم سەردەمە خەڵکانێکی بەناو موسڵمان هەن کە میراتی ئافرەتان نادەن و بە عەیبەی سەیر دەکەم.

خوشکی ڕێزدارم..

ئیسلام مافی تۆی داوە لە میرات و دەسکەوت، بەڵام ئەوە ئەو بەناو مرۆڤانەیە کە دەیانەوێت تۆ بێبەش بکەن لە میراتێك کە خودای گەورە بەشی بۆ داناویت.. ئەوان دەزانن تۆ لە گەوهەر بە نرختری هەموو کەسێك شایستەی ئێوە نییە.. بەڵام لەگەڵ ستەمکاران هیچ ناکرێت.

لەسەردەمی جاهیلی خەڵکی میراتیان نەدەدایە ئافرەتان، کە سەیری ژیانی هەندێك لە بەناو موسڵمانان دەکەی هەمان سەردەمی جاهیلم بیر دێتەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەهی لێکردووەو بە یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەری داناوە.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٢٣) باب: إقبال الروم في كثرة القتل، برقم: (٢٨٩٩).

## جیهاد کردن لە پێناوی خوای گەورە پەک دەخرێت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی خەڵکی جیهاد کردن لە پێناوی خوای گەورە پەك دەخات و خۆی بە ماڵی دونیا سەرقاڵ دەکات..

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ تُعَطَّلَ السُّيُوفُ مِنَ الْجِهَادِ)[1].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر.. شمشێرەکان پەك دەخرێن لە جیهاد کردن لە پێناوی خوای گەورە.

لەم سەردەمە زۆر ڕوون و ئاشکرا دەبینین کە جیهاد کردن لە پێناوی خوای گەورە پەکخراوە، ئەمەش موعجیزەیەك بوو کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی ڕاگەیاندین..

ئەگەر لەم سەردەمە باسی جیهاد بکرێت خەڵکی بەنامۆ سەیرت دەکات، بۆیە هەر کەسێك حەقی قبوڵ نەکات ئەوا خوای گەورە تاقی دەکاتەوە.

ڕێگای ڕاست ڕێگای ئەو کەسانەیە کە خوای پەروەردگار نیعمەتی زانستی ڕاست و کردەوەی باشی بەسەردا ڕشتوون، چونکە ئەوانە حەقیان ناسیوە لەسەرچاوەی قورئان و فەرمووده وە ئیشیشیان پێکردووە.

زۆر کەسیش دەبینین خۆی هەڵدەکێشێت و دەڵێت:

جیهاد کردن پەك خراوە، لە کاتێکدا خۆی شەرم لە خودا ناکات و هەموو شەوەکە دەخەوێت و هەڵناسێت دوو ڕکات شەو نوێژ بکات.

بۆیە هەر کەسێك پشتی بەخوای گەورە ببەستێت، ئەوا دڵی بەهێز دەبێت و هیچ لە خەمەکان کاریگەر نابێت بەسەریەوە.

---

(١) أخرجه الخطيب البغدادي في (تالي تلخيص المتشابه) (١٧٨/١)وقال قال ابن عساكر : حديث معروف .

## وێرانبوونی شارە گەورەکان و شەڕو نەهامەتیەکان

یەکێ لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی وای لێدێت شارە گەورەکان وێران دەبن دەسڕێنەوە وەك ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان بوونیان نەبوبێت..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (ثَلَاثَةٌ إِذَا رَأَيْتَهُنَّ فَعِنْدَكَ عِنْدَكَ: خَرَابُ الْعَامِرِ..)[1].

واتە: سێ نیشانە هەن هەر کاتێك بینیتان ئەو کات چاوەڕێی هاتنی ڕۆژی دوایی بن، ئاوەدانەکان تێك دەدرێن.

لە فەرموودەیەکی تر دەفەرموێ: (إِنَّ مِنْ أَعْلَامِ السَّاعَةِ وَأَشْرَاطِهَا أَنْ يُعَمَّرَ خَرَابُ الدُّنْيَا، وَيُخَرَّبَ عُمْرَانُهَا)[2].

واتە: لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەیە وێرانەکانی دونیا ئاوەدان دەکرێنەوەو ئاوەدانەکانیشی وێران و کاول دەکرێن .

پێشکەوتنی تەکنەلۆجیایی سەردەمی سەربازی لە سەدەی بیست ئازارێکی ترسناك بوو کە توشی مرۆڤەکان هات، خراپترین کاریگەریش لەسەر شارە گەورەکان بوون وەکو چوکی سەربازی بۆمبە وێرانکەرە ترسناکەکان موشەکی لێزەری ئاراستە کرا، بەکارهێنانی ئەم چەکانە لە شەڕەکانی ئەم دواییەدا دەستی پێکرد، ئەم چەکانە ماڵ وێرانیەکیان خستەوە کە لەمەو پێش نەبینرابوو، بەکارهێنانی بۆمبی ئەتۆمی لە هەردوو شاری گەورەی یابان و ئێرەو شیباو ناکازاکی ئەوە دەخاتە ڕوو.

---

(١) الجهاد لإبن أبي عاصم (٢/ ٧١٤) برقم: (٣٢٠).

(٢) المعجم الكبير (١٠/ ٢٢٨) برقم: (١٠٥٥٦).

ئەورپییە سەرمایەدارەکان بە درێژایی ئەو ڕێگایانەی زەویەوە کە لە ئەنجامی ململانێی بۆمبەکان بووە، مێژوو شاهێدە بەسەر کاولکاری هەردوو شەرەکە لە سەدەی بیست، ئەو کاولکاریەش ناخی دانیشتوانی شێواندو تەنها دەستی مرۆڤی تێدا نەبوو، کارەساتە سروشتیەکان، بوومەلەرزەکان، لافاوەکان، تەنگیان بە چەند شارێکی جیهان هەڵچنی و وێرانیان کرد.

ئێستا چەند ڕاستیەکی بەڵگە نەویستمان بۆ بە دەردەکەوێ کە خۆمان تیایدا شاهێد بووین، لە هەمان کاتدا ژێری پێی ناخەڵمێنرێت، بۆیە ئەمانە لە هەموو نەهامەتیەکانی مێژوو باس دەکرێت، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە بۆ نزیکی هاتنە دی ڕۆژی دوایی.

پێشتر زانیمان کە چەکی بایەلۆجی و ئەتۆمی[1] چ وێرانەیەك و کاولگەیەکی دروست کرد، ئەم وێران کردنەش زۆرتر شارە گەورەکانی گرتەوە لە شارە بچوکەکان، وە زۆر کۆنیش نیە کە مرۆڤ چەکی ئەتۆمی بەکار هێناوە، شاری زۆر گەورەش بە هۆیەوە وێران کراوە، ئەوە بێجگە لە بەکار هێنانی بۆمبی ناپاڵم و ئەو موشەکانەی کە بە لێزەر ئاراستە دەکرێن، ئەو چەکە ترسێنەرانەش بوونەتە هۆی خاپوور کردن و وێران کردنی شار گەلێکی زۆر گەورەو فرەوان کە لە هیچ ماوەیەکی مێژوودا کارەساتی وا گەورە ڕووی نەداوە بۆ نمونە: لێدانی بۆمبی ئەتۆمی لە دوو شارەکەی یابان ئەمەش وای لە شاری یابان کرد ئەم دوو شارە ناویان لەسەر نەخشەی یابان بسرێتەوەو نەمێنێ، هەروەها شارەکانی ئەوروپاش بە هۆی ئەو تۆپ بارانە چڕە و زۆرەی هەردوو شەڕی جیهانی وەك وێرانەیەکی لێ هات، ئەو شەڕە زۆرانەی کە لە سەدەی بیستەم دا ڕوویاندا لە مێژوودا بە هیچ شێوەیەك نمونەیان نەبووە، بەڵام زۆرێکی تر لەو شارانەی کە وێران بوون

---

(١) ئێستا زاناکان بۆیان ئاشکرا بووە هەر کاتێك تەقینەوەی ئەتۆمی ڕوویدات، ئەو تەقینەوەیە دەبێتە هۆی گۆڕینی هەموو ئاوەکانی سەر زەوی بە ئاگر، چونکە لە چاوتروکانێکدا هەرچی گازی هایدرۆجینی پێکهاتەی ئاوەکانە لە گازە ئۆکسجینەکەی ئەو پێکهاتەیە ئاوەکە جیا دەبێتەوەو گازە ئۆکسجینەکەی دەسوتێت.

و زیانیان لێکەوتەوە بە هۆی مرۆڤەوە نەبووە، بەڵکو بە هۆی کارەساتە سروشتیەکانەوە بووە، وە زۆر لە شوێنەکانی ئەم دونیایە بە هۆی گەردەلول و لافاوو زەمین لەرزین و وێران و خاپوور بووە، لێرەشدا دەبێ هەڵوێستەیەك بکەین و ڕابوەستین و بیرێك بکەینەوە، لێکۆڵەرەوەکان گەیشتونەتە ئەنجامێك کە بە ڕاستی مایەی تێڕامانەو مرۆڤ سەرسام دەکات، چونکە ئەو کارەسات و ڕووداوە سروشتیانەی ئێستا ڕوودەدەن بە شێوەیەکی زۆر سەیر لە زیادبووندایە، زیادبوونێکی ناسروشتیش لە ڕووی توندی و ژمارەوە، لە کارەساتەکانی سەدەی بیستەم بۆمان دەرکەوت کە کارەساتی سەدەی بیستەم گەلێك شەڕ و کوشتار تیایدا ڕوویدا، ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوونە لە بەڵگەکانی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی.

ئیستا زانیمان کە ڕووداوە سروشتیەکان چ کارەساتێکی لێدەکەوێتەوەو چی لە شارە گەورەکان دەکات، هەروەها زانیشمان کە مرۆڤ بە دەستی خۆی چ وێرانەیەك بۆ خۆی و خاکەکەی دروست دەکات، وە بە چ شێوەیەك شارە جەنجاڵەکان دەکاتە گۆڕستانێك، یان بە شێوەیەکی ووردتر ئەگەر سەرنج لە کارەساتەکان بدەین تێبینی دەکەین کە هەندێکیان بەڵگەو هاتنی نزیکبوونەوەی ڕۆژی دواییـن، وە لە نێو ئەو بەڵگەو نیشانانەش کە بە شێوەیەکی زۆر لە فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتووە .

# حەسودی زۆر دەبێت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی مرۆڤی حەسود زۆر زۆر دەبێت..

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ( لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى.. يظهر الحسد)[١].
واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت.. هەتا حەسودی سەرهەڵدەدات..

هەر چەندە هەندێك لە زانایانی فەرموودەناس دەفەرموون: ئەم فەرمووده بێ هێزە.. بەڵام لە واتادا زۆر واقیعیە.. بۆیە حەسودی هەر دەمێنێت هەتا ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لە ئاسمان دێتە خوارەوە و دادپەروەری بەدی دەهێنێ، ئەو کات حەسودی کۆتایی دێت..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (.. وَلَتَذْهَبَنَّ الشَّحْنَاءُ وَالتَّبَاغُضُ وَالتَّحَاسُدُ، وَلَيَدْعُوَنَّ إِلَى الْمَالِ فَلَا يَقْبَلُهُ أَحَدٌ)[٢].

واتە: .. دوژمنانەتی و رق و کینە و ئیرەیی (حەسودی) بەرامبەر یەکتر نامێنێ، خەڵك بانگ دەکرێ ماڵی پێ بدەن هیچ کەس قبوڵی ناکات.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:
(طوبى لعيشٍ بعدَ المسيحِ يُؤذنُ للسماءِ في القِطَر، ويؤذنُ للأرض في النبات، حتى لو بُذِرَتْ حبَّةٌ على الصفا لَنَبَتَ، وحتَّى يمرَّ الرجلُ على الأسدِ فلا يضُّرهُ، ويطأ على الحيَّةِ فلا يَضَّرهُ ولا تشاحَ ولا تحاسد ولا تباغض )[٣].

---

(١) ضعيف: أخرجه ابن عساكر في تاريخ دمشق (٤٥٣/٧) والطبراني في المعجم الكبير (٣٧٦/٢٢/ ١ ٩٤)، وابن عساكر في «التاريخ « (١٠٢٩/٨) وقال الألباني في السلسلة الضعيفة : ضعيف.

(٢) صحيح مسلم، كتاب الإيمان، باب نزول عيسى: (١٣٥/٤) برقم: (١٥٥).

(٣) صحيح: رواه أبوبكر الأنباري والديلمي والضياء، سلسلة الأحاديث الصحيحة للألباني(٥٥٩/٤)

واتە: ئافرەین و خۆشی بۆ ژیانێك کە لە دوای مەسیح دێت، فەرمان دەدرێت بە ئاسمان کە ببارێت، وە فەرمان دەدرێت بە زەوی کە سەوز بێت، تەنانەت ئەگەر دەنکە تۆوێك لەسەر بەردی رەق بچێنرێت دەروێت، وە پیاو بەلای شێردا بڕوات زیانی پێ ناگەیەنێت، وە پێی بنێت بەسەر ماردا زیانی پێ ناگەیەنێت، نەناکۆکی دەمێنێت، نەحەسودی، نە ڕق و کینە.

هەمیشە لە خودای گەورە بپاڕێوەو بڵێ:

پەروەردگارا! پەنات پێدەگرم لە حەسودی خراپەی ئەوانەی حەسودیمان پێدەبەن.

وە باشترین چارەسەری نەمانی حەسودی دروستکردنی دڵێکی نەرم و پاك و لەسەرخۆیـە.

بۆیە هەر کەسێکتان بینی کە حەسودی دەبات بەخەڵکی، ئەوا دۆعایان بۆ بکەن تا خوای پەروەردگار ئەو حەسودیەیان لە دڵدا نەهێڵێت.

وە یەکێك لە نیشانەکانی دڵخۆشبوونت کە پێداگربیت لەسەر هەق و ڕاستی نەبوونی حەسوودیە لە نێو ناخدا!

چونکە هەمیشە موسڵمانان دەبێت پارێزراو بن و سەلامەت بن لە زمان و دەستتان بە تایبەتی حەسودی.

بزانن سەرکەوتن لەسەر نەفس و دوژمن وەستاوە بەوەی کە هیچ شتێك لە نێو ناخت بوونی نەبێت لە حەسوودی.

ئێمە بۆ ئەوە دروست نەبووین تا حەسوودی بە خەڵکی ببەین، بەڵکو بۆ ئەوە دروست بووین تا خالیقی هەموو شتێك ڕازی بکەین.

حەسودی بردن نەخۆشیەکە هەموو شتێکی جوانت دەکوژێت و لەناوی دەبات، بۆیە دەبێت زۆر وریا بیت.

---

برقم: (١٩٢٦).

## کەمکردنی پێوانەو تەرازوو

یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر کەمکردنی پێوانەو تەرازوو بەرەو ئاستێکی زۆر کەم دەڕوات.

پێشەوا ئەبو زەرری غیففاری (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إذا اقترَبَ الزمانُ كثُرَ لَبْسُ الطَيَالِسَةِ وطُفِّفَ في المكْيَالِ والْمِيزَانِ)[١].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی لەبەرکردنی جل وبەرگی تەیلەسانی زۆر دەبێت.. وە لە تەرازوو پێوانەکان کەم کرا..

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕۆژگاری ئەمڕۆ.. زۆر بە ڕاشکاوانە بۆمان بە دەردەکەوێت کە کەمکردنی تەرازوو پێوانەکان بەرەو ئاستێکی زۆر دەڕوات بە هۆی خیانەت و دزیکردنەوە..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:

(يا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ خَمْسٌ إِذَا ابْتُلِيتُمْ بِهِنَّ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ تُدْرِكُوهُنَّ: لَمْ تَظْهَرِ الْفَاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قَطُّ، حَتَّى يُعْلِنُوا بِهَا، إِلَّا فَشَا فِيهِمُ الطَّاعُونُ، وَالْأَوْجَاعُ الَّتِي لَمْ تَكُنْ مَضَتْ فِي أَسْلَافِهِمُ الَّذِينَ مَضَوْا، وَلَمْ يَنْقُصُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ، إِلَّا أُخِذُوا بِالسِّنِينَ، وَشِدَّةِ الْمَئُونَةِ، وَجَوْرِ السُّلْطَانِ عَلَيْهِمْ، وَلَمْ يَمْنَعُوا زَكَاةَ أَمْوَالِهِمْ، إِلَّا مُنِعُوا الْقَطْرَ مِنَ السَّمَاءِ، وَلَوْلَا الْبَهَائِمُ لَمْ يُمْطَرُوا، وَلَمْ يَنْقُضُوا عَهْدَ اللَّهِ، وَعَهْدَ رَسُولِهِ، إِلَّا سَلَّطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ غَيْرِهِمْ، فَأَخَذُوا بَعْضَ مَا فِي أَيْدِيهِمْ، وَمَا لَمْ تَحْكُمْ أَئِمَّتُهُمْ بِكِتَابِ اللَّهِ، وَيَتَخَيَّرُوا مِمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ، إِلَّا جَعَلَ اللَّهُ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ)[٢].

---

(١) رواه الحاكم برقم: (٥٤٦٥).. قال الحاكم: هذا حديث تفرد به سيف بن مسكين عن المبارك بن فضالة، والمبارك بن فضالة ثقة..

(٢) صحيح: أخرجه الحاكم في (المستدرك) كتاب: الفتن والملاحم، باب: ذك خمس بلاء أعاذ النبي منها للمسلمين (٤/ ٥٤ ٥٤١) وصححه ووافقه الذهبي.

واتە: ئەی کۆمەڵی موهاجیرەکان پێنج بەڵا هەن ئەگەر دوو چاریان ببن پەنا بەخوا دەگرم لەوەی پێیان بگەن، داوێن پیسی لەهەر میللەتێکدا سەری هەڵدابێت و ئاشکرا بووبێت، ئەوا جۆرە تاعون و دەردو نەخۆشیەکی وایان لەناودا پەیدا دەبێت کە هەرگیز لە باوو باپیرانی پێشتریاندا نەبینراوە، وەکو نەخۆشی ئایدز کە پێشتر نەبینراوە، وە ئەگەر کێشانەی پێوانەو تەرازووەکانیان کەمکەن، ئەوا دووچاری گرانی و بارقورسی و ستەمی دەسەڵات داران دەبن، وەئەگەر زەکاتیماڵەکانیان نەدەن ئەوا بارانیان لە ئاسمانەوە لێ دەگیرێتەوەو لەبەر خاتری ئاژەڵیش نەبوایە هیچ نەدەباری، وەهەرکات پەیمانی خواو پێغەمبەرەکەتان شکاند ئەوا خوای گەورە دوژمنێکی دەرەکیتان بەسەردا زاڵ دەکات کە بەشێکی دەسەڵاتەکەی ژێر دەستان لێ بستێنن، وەئەگەر پێشەواو سەرکردەکانیشتان حوکم بە بەرنامەی خوا نەکەن و بەئارەزووی خۆیان هەندێکی لێ وەرگرن و ئەوی تری وەلا بنێن، ئەوا خوای گەورە لە ناو خۆیاندا کوشتار دەخاتە نێوانیان.

ئەو کاتەی دەکەونە تەرازووبازی ئیتر خوای گەورە قات و قڕی و کەمی ڕۆزییان بۆ دەنێرێت، کاتێك دەچیتە بازاڕەکان دەبینیت خەڵکانێك تەرازووبازی دەکەن، یاخود دەچیت بۆ لای کوتاڵ فرۆشێك (٣) مەتر قوماشی لێدەکڕیت کوتاڵ فرۆش وا خۆی دەردەخات کە زیاتری بۆ بڕیوە کاتێك دەچێتەوە بۆ ماڵەوە سەیری دەکەین دوو مەترو سێ چارەکە ئەمە ئەو کارەیە کە پێی دەوترێت هەڵپەکردن یان تەماع.

دیارە لە باس کێشدا پاراستن نیە، بەڵکو باسەکە مامەڵەیە من دەمەوێت ستەم لە هەموو مافەکانی خێزانەکەم بکەم و قەرەبووی بۆ ناکەمەوە بە دوای ئەوەدا ساڵانێکی قات و قڕی و کەمی ڕۆزی دێت بەسەرماندا.

هەروەها دەسەڵاتدار ستەمی لێ دەکات، ئایا پەیوەندی ستەمی دەسەڵاتدار چییە بە تەرازوو بازییەوە؟

وەڵام: کاتێك ئادەمیزاد لە تەرازو و مامەڵەدا ستەمێك دەکات خوای گەورەش کەسێکی بەسەردا زاڵ دەکات کە ستەمی لێ بکات دیارە پاداشت لە جۆری کارەکەیە.

بەرگی دووەم

# گەڕانەوەی خەڵکی بۆ چەک و سوارکراوە کۆنەکان و لە کارکەوتنی کۆمپیوتەرو تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان

ئەم نیشانەیە گرنگترینیانە لە نیشانە بچوکەکانی هاتنی کۆتایی بونەوەر، کە تا ئێستا نەهاتۆتە دی، ئەویش لە کارکەوتنی تەکنەلۆژیای سەردەم و کۆتایی هاتنە بە کارەباو ئالاتی میکانیکی و سەیارەو تەیارە.. هتد.. ئەوانەی کە لە شاردا بە دی دەکرێت..

خوای گەورە باسی ئەم مەشهەدەمان بۆ دەکات و دەفەرموێ:

[إِنَّمَا مَثَلُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلْأَنْعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَآ أَنَّهُمْ قَٰدِرُونَ عَلَيْهَآ أَتَىٰهَآ أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَٰهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِٱلْأَمْسِ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾][١].

واتە: بێگومان نمونەی ژیانی ئەم دونیایە هەروەکو ئەو بارانە وایە کە لە ئاسمانەوە دەیبارێنین، ڕووەکی هەمە ڕەنگی زەوی پێ دەڕوێ لەوەی مرۆڤ و مەڕو ماڵات دەیخۆن، هەتا ئەو دەمەی زەوی بۆ خۆی ڕەنگا و ڕەنگ دەبێ و جوانی خۆی دەردەخاو خۆی ئارایش دەدا و خاوەنەکەی وا دەزانێ لە ژێر دەسەڵاتی ئەودایەو چۆنی بوێ دەتوانێ سوودی لێ وەرگرێ و، هیچ کەسێك نییە لێی تێك بدات!! جا لە ناکاو بە شەو، یان بەڕۆژ، فەرمانی ئێمە بۆ وێرانکردنی دێت (گژەبا، یان بروسکە لێی دەدا)و دەیسوتێنێ، وای لێ دەکەین دەڵێی دروێنە کراوە، وا دەزانێ دوێنێ نەبووە، ئێمە ئا بەو شێوەیە نیشانەو بەڵگەکانی خۆمان بۆ خەڵکێك بیریکاتەوەو پەند وەربگرێ شی دەکەینەوە[٢].

---

(١) سورة يونس، (٢٤).

(٢) تەفسیری ڕامان، لا ٣٤٣ .

ئەوەی ئەمڕۆ لەم شارستانیەتەی سەر زەوی دەبینین وەکو دەبابەو تەیارەو کارەبا.. هتد، هەموو کاتێکی دیاریکراوی هەیە و کۆتایی پێ دێت، هەر چەندە بە هێزیش بن، بۆیە ژیانی پێشوو دێتە ئاراوە کە شمشێرو تیروکەوان و رومحە.. هتد، تەنانەت پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەی سەردەمی یەئجوج و مەئجوج ئاگادارمان دەکاتەوە کە ئەوان تیرەکانیان بەرەو ئاسمان هەڵدەدەن...

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ:

(فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ سَمِعُوا بِبَأْسٍ هُوَ أَكْبَرُ مِنْ ذَلِكَ، فَجَاءَهُمُ الصَّرِيخُ أَنَّ الدَّجَّالَ قَدْ خَلَفَهُمْ فِي ذَرَارِيهِمْ، فَرَفَضُوا مَا فِي أَيْدِيهِمْ، وَيَقْبِلُونَ، فَيَبْعَثُونَ عَشْرَ فَوَارِسَ طَلِيعَةً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ): إِنِّي لَأَعْرِفُ أَسْمَاءَهُمْ، وَأَسْمَاءَ آبَائِهِمْ، وَأَلْوَانَ خُيُولِهِمْ، هُمْ خَيْرُ فَوَارِسَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ يَوْمَئِذٍ)[1].

واتە: لە کاتێکدا ئەمانە لەم حاڵە دەبن گوێیان لێدەبێت وە بەڵایەکی لەوە گەورەتر دامێن گیریان بووە کاتێ بانگگەر دێتە لایان و هاواری لێدەکات دەججال لە دوای خۆیانەوە بەربۆتە ناو ماڵ و منداڵیانەوە، ئەوانیش چیان پێیە هەر هەمووی فڕێ دەدەن و ڕوو دەکەنە ماڵەوە، دە سوار چاك لە پێش خۆیانەوە دەنێرن، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ:

من زۆر چاك ناوی خۆیان و باوکیان و ڕەنگ و شێوەی ئەسپەکانیان دەزانم ئەوان لەو ڕۆژەدا چاکترین سواری سەر زەوین.

ئەم فەرموودە ئەوە دەسەلمێنێت کە جەنگەکە تەقلیدیە بە چەکی کۆن جەنگەکە بەرپا دەبێت، چونکە فەرموودەکە زۆر ڕاشکاوانە باسی شمشێرو حەرب و ئەسپ دەکات، وە شەڕەکەش کۆتایی دێت بە هاتنی شەو کە ئەوەش بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە شەڕەکە بە چەکە کۆنەکان ئەنجام دەدرێت نەك بە دبابەو تەیارە صەواریخ و مەدفەع.. هتد، چونکە چەکە پێشکەوتووەکانی سەردەم بە شەو و ڕۆژ ڕاوەستانی نییە.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٢٣) باب: إقبال الروم وكثرة القتل، برقم: (٢٨٩٩).

بەرگی دووەم

لێرەدا ڕووبەڕووی پرسیارێك دەبینەوە، باشە لەو سەردەم ئەو چەکە پێشکەوتووانە چیان لێ دێت؟

لە وەڵامی ئەو پرسیارە دەڵێین:

بەندە دوای توێژینەوەیەکی زۆر گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە ئەو چەکانە هەموویان لە کار دەکەون چونکە تیشکی کەونی کە لە داهاتوودا ئەنجامێك دروست دەکات ئەویش کونبوونی چینی ئۆزۆنە کە هەموو چەکەکان لە کار دەخات.. هەروەها بەندە بە دووری نازانێت کە هۆکاری لە کارکەوتنی چەکە پێشکەوتووەکان نەمانی نەفت بێت لە جیهان، لە ڕاستیدا زانایان ئێستا بەدوای بەدیلێك دەگەڕێن کە جێگای نەفت بگرێتەوە، بۆیەش هەموو وڵاتان لە ئێستادا خەریکی خەزنکردنی پترۆڵ و نەفتن، وە سێ وڵات بە بەردەوامی بە دوای بەدیلی نەفت دەگەڕێن، ئەوانیش: هەر یەك لە وڵاتانی ئەمریکا و ئەوروپا و یابانە.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

لە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) دانیشتبووین ئەویش باسی لە فیتنەکان کردو درێژەی بە باسەکەدا هەتا باسی فیتنەی ئەحلاسی[1] کرد.

یەکێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فیتنەی ئەحلاس چیە؟

فەرموی: (هِيَ هَرَبٌ وَحَرْبٌ، ثُمَّ فِتْنَةُ السَّرَّاءِ، دَخَنُهَا مِنْ تَحْتِ قَدَمَيْ رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي يَزْعُمُ أَنَّهُ مِنِّي، وَلَيْسَ مِنِّي، وَإِنَّمَا أَوْلِيَائِي الْمُتَّقُونَ، ثُمَّ يَصْطَلِحُ النَّاسُ عَلَى رَجُلٍ كَوَرِكٍ عَلَى ضِلَعٍ، ثُمَّ فِتْنَةُ الدُّهَيْمَاءِ، لَا تَدَعُ أَحَدًا مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ إِلَّا لَطَمَتْهُ لَطْمَةً، فَإِذَا قِيلَ: انْقَضَتْ، تَمَادَتْ يُصْبِحُ الرَّجُلُ فِيهَا مُؤْمِنًا، وَيُمْسِي كَافِرًا، حَتَّى يَصِيرَ النَّاسُ إِلَى

---

(١) (ئەحلاس) کۆی (حلس)ە کە بە واتای ئەو جلە دێ کە دەخرێتە سەر پشتی حوشتر، بۆیەش فیتنەکەی وێ چێنراوە، چونکە ئەو جلە بە حوشترەوە دەنوسێ، فیتنەکەش ئاوا بە خەڵکەوە دەنوسێ. سەرچاوە: القیامە الصغری (لا ٢٠٤).

پێشەوا (خەتابی) دەڵێت: واتە: ڕەنگە ئەو فیتنە لەبەر ڕەشی و تاریکی بە جلی حوشتر شوبهێنرابێ. وە پێشەوا (حەرب)یش دەڵێت: واتە: لە دەست چوونی ماڵ و کەس و کار. سەرچاوە: القیامە الصغری (لا ٢٠٥).

فُسْطَاطَيْنِ، فُسْطَاطِ إِيمَانٍ لَا نِفَاقَ فِيهِ وَفُسْطَاطِ نِفَاقٍ لَا إِيمَانَ فِيهِ، فَإِذَا كَانَ ذَاكُمْ فَانْتَظِرُوا الدَّجَّالَ، مِنْ يَوْمِهِ، أَوْ مِنْ غَدِهِ)[1].

واتە: ڕاکردن و ئاوارەیی و سەرو ماڵ تیاچوونە.

پاشان فیتنەی خۆش گوزەرانی[2] دێت کە هەڵگیرسانی دووکەڵەکەی لە ژێر پێی پیاوێکەوە دەبێت لە ئال و بەیتی من، لافی ئەوە لێ دەدات کە لە منە بەڵام لە من نیە، بەڵکو تەنها کەسانی لە خوا ترس و پارێزگار دۆستی منن.

پاشان خەڵکی ئاشت دەبنەوەو ڕێك دەکەون لەسەر پیاوێك کە باری لارەو وەك پەراسوو خوارە.

پاشان فیتنەی کارەساتە ڕەشەکان دێت کە کەس نامێنێت لەم ئوممەتە کە لێدانی ئەو فیتنەیەی بەرنەکەوێت، هەر کە گوترا تەواو بوو درێژ دەبێتەوە، پیاو بە باوەڕداری ڕۆژ دەکاتەوەو بە بێباوەڕی خۆری لێ ئاوا دەبێت.

هەتا وای لێدێت خەڵك دەبن بە دوو بەشەوە بەشێکی باوەڕدار کە هیچ نیفاقێکی تێدا نیە.

وە بەشێکی مونافیق کە باوەڕداری تێدا نیە، هەر کاتێکیش ئەوە ڕوویدا ئیتر ئەمڕۆ سبەی چاوەڕێی دەجال بکەن.

فیتنەی دوهەیما ئەو ئاشووب و تێکهەڵپڕژانەیە کە حوکمی برولیتاریا لە ڕووسیا ئەنجامیدا ، وە ئەو ئاشوبەش بڵاوبوویەوە هەتا سەری ڕەسئمالی خوارد.

تەنانەت هەندێك لە زانایانی سەردەم دەڵێن:

---

(١) صحيح: سنن أبي داود (٦/ ٢٩٤) باب: ذكر الفتن (٤٢٤٢). وقال شعيب الأرناؤوط: صحيح.

(٢) (السراء) بریتیە لەو نیعمەتەی خەڵکی تێدا شاد و ئاسوودە دەبن لەبەر زۆربوونی ماڵ و سامان و کەوتنە خۆشی، بۆیەش بەو فیتنەو ئاشوبە دانراوە، چونکە خەڵك بە هۆی ئەو خۆشیەی تێیدان تووشی گوناه و تاوان دەبن. سەرچاوە: القيامه الصغرى (لا ٢٠٥).

فیتنەی دوهەیما ئەوەیە کە کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت یەکسەر لە کار دەخرێت، وە خەڵکی سەد ساڵ دەچنە پاشەوە.. حکومەتەکانی هەموو جیهان سەریان سوڕدەمێنێت، کارەبا نامێنیت پەیوەندیەکان نامێنێت، بە هێز بێهێز دەخوات بەبێ گومان[1].

ڕاپۆرتی (نیوساینتیست) ئاماژە بە بایەکی بەهێز دەکات و دەڵێت:

بایەکی بەهێز بە ڕێگاوەیە کە دەبێتە هۆی پچڕانی هێڵی کارەبا لە هەموو خزمەتگوزاریەکان و، جیهان دەگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمی تاریکی، تەنانەت مانگە دەستکردەکان و تۆڕی پەیوەندی و ئینتەرنێت و پەخشی ڕادیۆو تەلەفزیۆن.. ئەو بایە بەهێزە جیهان تووشی کارەساتێکی ئابووری دەکات، چونکە هەموو چالاکیەکانی ژیان لەسەر کارەبایە..

(ریتشارد کارینجتون) زانایەکی گەورەی ئەستێرەناسی بەریتانیە دەڵێت:

ماوەیەکی زۆرە لەچاودێریکردنین، جولانەوەیەکی ناسروشتی دەبینین لە دەوری ڕۆژو کۆبونەوەی سەراب و تیشك و تەنەکان کە لە دەوری ڕۆژ کۆدەبنەوەو دەسوڕێنەوەوچەند کیژەڵۆکی هایدرۆجینی گەرم پێك دێنن و لە زەوی نزیك دەبنەوە کە دەبێتە هۆی کارەسات.

---

(١) العراق في أحاديث وآثار الفتن، (لا ٧٦٧ ٧٦٨).

# فرۆشتنی ئایینی ئیسلام بۆ ئیقامە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر کە لەم سەردەمەدا لەناو خاکی موسڵمانان سەری هەڵداوە خەڵك کردنە بە گاور یان زەردەشت یان بێ دین.. یان ئایینی خۆی دەفرۆشێت بۆ ئەوەی ئیقامەی وڵاتانی ئەوروپای پێ بدەن..

ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕایگەیاند ئەمڕۆ هاتە دی و بە چاوەکانی خۆمان دەیانبینین.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (بَادِرُوا بِالْأَعْمَالِ فِتَنًا كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ، يُصْبِحُ الرَّجُلُ مُؤْمِنًا وَيُمْسِي كَافِرًا، وَيُمْسِي مُؤْمِنًا، وَيُصْبِحُ كَافِرًا، يَبِيعُ دِينَهُ بِعَرَضٍ مِنَ الدُّنْيَا)[1].

واتە: پەلە بکەن لە ئەنجامدانی کردەوەی چاك لە پێش ئاشوب گەلێك وەکو پارچەی ڕەشی شەو.

پیاو سەر لەبەیانی باوەڕدار دەبێت و بۆ ئێوارە پاشگەز دەبێتەوە، یان ئێوارە باوەڕدار دەبێت و بۆ بەیانی پاشگەز دەبێتەوەو دەبێتە بێباوەڕ، دینی خۆی دەفرۆشێت بە شتێکی بێ بایەخ لە دونیا.

زانای ناودار صدیق حسن خان (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە لەم سەردەمەدا کەسانێك ئایینی خۆیان دەفرۆشن بە دونیا لەسەرتاسەری جیهان مەگەر ئەو کەسەی کە خوای گەورە پاراستویەتی[2].

---

(١) صحيح مسلم (١/ ١١٠) باب: الحث على المبادرة، برقم: (١١٨).

(٢) الإذاعة (لا ٣٠).

بۆیە هیچ فیتنەیەك لە کوفر گەورەتر نییە، ئەی نابینین لە زۆربەی وڵاتان پاڵپشتی دەکرێن بۆ ئەوەی خەڵکی لابدەن لە ڕێگای ئیسلام.

تەنانەت لە زۆربەی وڵاتان ئینجیل دابەش دەکرێت بۆ بە گاورکردنیان لەوانە (کوردستان عێراق نیجیریا سەنیگال مالی ئەسیوبیا سودان پاکستان بەنگلادیش مورو (فلیپین) کە لە سەردەمی ئیسلام پایتەختەکەی ناوی (أمان الله) بوو دواتر ناوەکەیان گۆڕی بە (مانیلا).. هتد).

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

(مِنِ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ خَصْلَةً : إِذَا رَأَيْتُمُ النَّاسَ.. وَبَاعُوا الدِّينَ بِالدُّنْيَا)[١].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر حەفتاو دوو تایبەتمەندە: هەر خەڵکانێکتان بینی دینی بە دونیای فرۆشت..

لە ریوایەتێکی تر فەرموویەتی:

(سيأتي على الناس زمان ..تباع الآخرة بالدنيا)[٢].

واتە: سەردەمێك بەسەر خەڵکی دێت قیامەت دەفرۆشرێت بە دونیا..

بەداخەوە.. زۆربەی ئەوانەی ئیسلامیان فرۆشت ماڵ و منداڵیشیان فرۆشت، کە ناتوانیت منداڵ بەخێو بکەیت بۆ منداڵ دەهێنیتە سەر دونیا، ئەم سەردەمە تێك دەدەن بە هۆی پەروەردەیەکی سەقەت.

---

(١) ضعيف: حلية الأولياء، لأب نعيم (٣/ ٤١٠)، برقم: (٤٥٥٥). حديث مرفوع، غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ ، لَمْ يَرْوِهِ عَنْهُ فِيمَا أَعْلَمُ إلا فَرَجُ بْنُ فَضَالَةَ . وهو ضعيف كما قال الحافظ العراقي ( ٢٩٧/٣).

(٢) ضعيف: أخرجه ابو داود، قال الالباني: ضعيف الإسناد.

بەرگی دووەم

# قورئان بە پارە دەخوێنرێت

لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر کەسانێك پەیدا دەبن زانست و زانیاری و قورئان دەخوێنن و دەچنە لای دەوڵەمەندو پیاوانی دونیاو دەڵێن:

دەچین بۆ لایان ماڵی دونیا بە دەست دەهێنین و ئاینیشمان دەپارێزین و لێیان دووردەکەوینەوە، بەڵام ئەمە هەرگیز ناگونجێ کەسێ بچێتە لای پیاوی دونیایی و بتوانێ ئاگاداری باوەڕو ئاینی خۆی بێتت..

چونکە لە داری (زی دڕك) نەبێ هیچی دەست ناکەوێ هەروەها نزیك بونەوەش لە پیاوی دونیاو دەوڵەمەندی دونیا ویست گوناە و تاوان نەبێ هیچ دەست ناکەوێ، چونکە هەردەبێ بە دڵی ئەو قسە بکات دیارە هەر زانایەك بچێتە بەر دەرگای پیاوی دونیایی ئەوە خراپترین زانای ئەو سەردەمەیە.

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب(ﷺ) دەفەرموێ:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (إِنَّ مِنَ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ.. وَتَعَلَّمَ عُلَمَاؤُكُمُ الْعِلْمَ لِيَجْلِبُوا بِهِ دَنَانِيرَكُمْ وَدَرَاهِمَكُمْ، وَاتَّخَذْتُمُ الْقُرْآنَ تِجَارَةً)[1].

واتە: لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەیە ئەگەر زاناکانتان بۆ ئەوە فێری زانست دەبوون کە دینارو درهەمی پێ کۆبکەنەوەو بەدەستی بهێنن، وە قورئانیشتان کرد بە بازرگانی.

پێشەوا ئەنەسی کوری مالیك (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە گوتیان:

ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەی دەست لە فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە هەڵگرین؟ ئەویش فەرمووی:

---

(١) ترتيب الأمالي (٢/ ٣٥٢) برقم: (٢٧٢٥).

(إِذَا ظَهَرَ فِيكُمْ مَا ظَهَرَ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ، إِذَا كَانَتِ الْفَاحِشَةُ فِي كِبَارِكُمْ، وَالْمُلْكُ فِي صِغَارِكُمْ، وَالْعِلْمُ فِي رُذَالِكُمْ)[١].

واتە: هەر كاتێك گەورەكانتان دەستیان دایە داوێن پیسی و دەسەڵاتیش بە دەست منداڵ و هەرزەوە بوو، زانست و زانیاریش لەلای كەسانی كەم نرخ بوو، پیاو چاكەكانیش دوورو ماستاو چی بوون .

بەڵام شێخ محەممەد ڕەسول بەرزنجی (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) خاوەنی پەرتوكی (الإشاعة لأشراط الساعة) دەڵێت: مەبەستی فەرمودەكە ئەوەیە قورئان بە پارە دەخوێنن نەك بۆ خوا . لە فەرموودەیەكی تر فەرموویەتی: (سَيجِيءُ أقوامٌ يَقرؤُونَ القرآنَ يَسألُونَ بِهِ الناسَ)[٢]. واتە: خەڵكانێك دێن و پەیدا دەبن قورئان دەخوێنن بۆ ئەوەی داوای كریٚ و بەرامبەری پیٚ لە خەڵكی بكەن..

ئەو كاتەی محەممەدی كوڕی سولەیمان ئەمیری بەصرە بوو، چووە لای (حەمادی كوری سەلەمە) كە یەكێك بوو لە زانایانی ئەو سەردەمەی شاری بەصرەو دوای ئەوەی چۆكی دادا بەرامبەری لێی پرسی:

ئەی ئەبا سەلەمە بۆچی هەر جارێك سەیری تۆ دەكەم ترس هەموو گیانم دادەگرێت و لە ترساندا دەكەومە لەرزین؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی:

ئەو كەسەی كە زانایە ئەگەر ئەو زانیاریەی بۆ خوا فێر بوو بیٚ ئەوە هەموو شتێك لێی دەترسیٚ.

بەڵام ئەگەر بۆ كۆكردنەوەی ماڵ و سامان و دارایی فێری زانیاری بێت ئەوە لە هەموو شتێك دەترسیٚ.

خۆزگە ئەو بەناو زانایانەی كە دینیان بە دونیا فرۆشتووەو قورئانیان كردۆتە دەست مایە بۆ پارە پەیدا كردن و بەردەوام لەبەر دەرگای بەرپرسەكان و سەركردەكاندا كەوتوون و قیامەتیان بە دونیای ئەوان دەفرۆشن و گیرفانیان پڕە

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٣/ ١٨٧) برقم: (١٢٩٦٦) وقال شعيب الأرنؤوط : إسناده قوي.

(٢) صحيح: أخرجه الترمذي (٢٩١٧) ، وأحمد (١٩٨٨٥)، من حديث عمران بن الحصين.. حسن .

لە فەتوای لۆك و ئامادە کراو بۆ ڕەزامەندی سەرکردەکان و خزمەت کردنی بەرژەوەندیەکانیان، خۆزگە چاوێکیان بەم فەرموودانەدا دەخشاندەوە و هۆشێکیان وە بەر خۆیاندا دەهێنایەوەو بیرێکیان لە حاڵی خۆیان دەکردەوە، بەڵکو شەرم بیانگرێت و چی دی لەوە زیاتر نەبن بە مشە خۆر لەسەر ئیسلام و ئیسلام ناشیرن نەکەن.

چەند بابەتێکی فیقهی لەبارەی وەرگرتنی پارە لەسەر قورئان خوێندن و گوتنەوە:

زانایانی ئیسلام دەربارەی ئەو کەسانەی کە پارە وەردەگرن لەسەر ئەوەی کە قورئان بە خەڵك دەڵێنەوە سێ وتەیان هەیە:

هەندێ دەفەرموون:

دروست نیە کرێ و پارە وەربگری لەسەر قورئان گوتنەوە، چونکە ئەرکێکی شەرعی سەرشانیەتی کە ئەم قورئانە بگەیەنێتە خەڵکی، لەسەر واجباتیش کرێ وەرناگیرێ، بەڵکو ئەبێ چاوەڕوانی پاداشتی قیامەت بکەی لە لای خوای گەورە.

هەندێکیش دەفەرموون:

دروستە پارە لەسەر قورئان گوتنەوە وەربگیرێ و هیچی تێدا نیە، بەڵگەشیان ئەوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (إِنَّ أَحَقَّ مَا أَخَذْتُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا كتاب الله)[1].

هەندێکی تر دەفەرموون: پێویستە پارەکە لەسەر ئەوە وەربگرێ کە فێری خوێندنەوەو قورئان لەبەرکردنی دەکات، نەك فێری خوێندنی قورئانی دەکات.. زانایان تەقسیم بەندیەکی جوانیان کردووە بۆ ئەم بابەتەو لەناو ڕێزبەندیەکەدا حوکمی هەر بەشەیان بە جیا باس کردووە.

پێشەوا نەصری کوڕی محەممەدی سەمەرقەندی لە پەرتووکی (بستان العارفين) دەفەرموێ: قورئان گوتنەوە بە خەڵکی سێ شێوەی هەیە:

---

(١) صحيح البخاري (٧/ ١٣١) كتاب الطب ، باب الشرط في الرقية بقيع من الغنم، برقم: (٥٧٣٧).

بەرگی دووەم

• لەبەر خاتری خوا دەیلێتەوەو بەتەما نیە کرێی لەسەر وەربگرێ، ئەوا خوای گەورە پاداشتی باشی دەداتێ و ئەو کارەشی کاری پێغەمبەرانە.

• ئەوەی بەکرێ کارەکە دەکات، ئەوا زانایان دوو قسەیان لەسەر هەیە، هەندێ دەفەرموون: دروست نیە، هەندێکیش دەفەرموون: دروستە، بەڵام واباشە مامۆستاکە مەرجەکە بۆ (حفظ وکتابة)ەکە دابنێ نەك قورئان خوێندنەکە ئەگەر مەرجەکەشی بۆ قورئان خوێندنەکە دانا ئومێد دەکەم هیچی تێدا نەبێت، موسڵمانانیش پشت بە پشت ئەمەیان هێناوەو پێویستیان پێی بووە.

• بەبێ مەرجی پێش وەخت قورئان دەخوێنێت بەڵام ئەگەر دیاریەکیان بۆ هێنا وەریدەگرێت. ئەوەی بەبێ مەرجی پێش وەخت قورئان دەخوێنێ بەڵام ئەگەر دیاریەکیان بۆ هێنا وەریدەگرێت، ئەوا زانایان هەموویان هەر بە دروستی دەزانن، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) خۆی مامۆستای هەموو خەڵکی بوو، هەر دیاریەکی بۆ بهاتایە قەبوڵی دەکرد.

بەداخەوە لەم سەردەمە گەنجانێك تازە پەیدابوون قورئان بە ئاوازەوە دەخوێنن، گوایە پێغەمبەر(ﷺ) بەو جۆرە خوێندوویەتیەوە، نابێ خوێندنەوەی قورئان تەنها بە بیستن یان بە ئیجتیهاد وەربگرین، بەڵکو پێویستی بە زنجیرەیەك سەنەد هەیە، بۆ نمونە دەڵێین: فڵانە کەس لە فیسارە کەسەوە ئەویش لە فڵانی ترەوە ئەمیش لە فڵانێکی ترەوە ئەویش لە پێغەمبەر(ﷺ)، لەبەر ئەوە دەوترێت: لە (حفص)ەوە ئەویش لە عاصیمەوە، دەبێت بەم شێوە بێت.

ئەوەی بەبێ بوونی سەنەدەکان قورئان دەخوێنێتەوە هیچ بنەمایەکی ڕاستی تێدا نیە، کەسانێك هەن قورئان وەك خەڵکی عاشق و ئارەزووبازەکان دەخوێننەوە ئەمە دروست نیەو ئەو کەسە لۆمە کراوە.

بەرگی دووەم

## بەدرۆخستنەوەی سزای ناو گۆڕ

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی کۆمەڵێکی سەرلێشواو و گومڕا سزای گۆڕ بە درۆ دەخەنەوە.

ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە ئینکاریکردنی سزای ناو گۆڕ ئینکاریکردنی بابەتێکە کە سەلمێنراوە بە فەرموودەیەکی زۆری متەواتیرو ئاحاد کە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) پێمانگەیشتووە، بۆیە ئەو کەسەی کە عیلم و زانستی هەبێت و پاشان ئینکاری بکات، دەبێت لە ئیمان و باوەڕی خۆی بترسێت..

خودای گەورە فەرموویەتی: [ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا]. واتە: ئاگریان پێ نیشان دەدرێت لە بەیانیان و ئێواران..

ئەم ئایەتەش لەسەر سزای بنەماڵەی فیرعەون دابەزیوە، بۆیە ئەو کەسەی کە ئینکاری سزای ناو گۆڕ دەکات بەرپرچی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودە دەداتەوە.. بۆیە بەم هۆیەوە ئیقامە حوجەجەی لەسەر دادەمەزرێت.

پێشەوا ئیبنو عەباس(ﷺ) دەڵێت: جارێکیان پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) وتاری بۆ داین و پاش سوپاس و ستایشی خوا فەرمووی: (سَيَكُونُ مِنْ بَعْدِكُمْ قَوْمٌ يُكَذِّبُونَ بِعَذَابِ الْقَبْرِ..)[1].

واتە: لە دوای ئێوە کەسانێك دێن سزای گۆڕ بەدرۆ دەخەنەوە..

لە ڕیوایەتێکی تر دەفەرموێ: (إِنَّهُ سَيَخْرُجُ بَعْدَكُمْ قَوْمٌ يُكَذِّبُونَ بِعَذَابِ الْقَبْرِ..)[2].

واتە: لە پاش ئێوە گەلێك دەردەچن، کە سزای گۆڕ بە درۆ دەخەنەوە.

کەواتە مولحیدو زندیق و فاسق و مونافیق و نەخوێنەوارەکان زۆر بێ ئاگان لە شەریعەتی گەورەی ئیسلام بۆیە بڕیارەکانیان زوو دەردەبڕن.

---

(١) ضعيف: مسند الإمام أحمد (١/ ٢٣) برقم: (١٥٦) . قال شعيب الأرناؤوط: إسناده ضعيف.

(٢) السنة لإبن أبي عاصم (١/ ١٥١) برقم: (٣٤٣).

## پەیدابوونی گرانی و قاتو قڕی

پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی پێ ڕاگەیاندووین کە یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر قاتوقڕی و برسیەتی سەرهەڵدەدات..

پێشەوا سەمورە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى .. تَرَوْنَ الْأُمُورَ الْعِظَامَ الَّتِي لَمْ تَكُونُوا تَرَوْنَهَا)[1].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت تاکو کارەساتگەلێکی گەورە نەبینن کە پێشتر نەتانبینیبوو.

شێخ محەممەد رەسول بەرزنجی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەم کارەساتە بریتیە لە قات و قڕی و برسیەتی[2].. بە نموونە:

• لەسەردەمی زاهیر عوبەیدی لە وڵاتی میصر گرانیەك ڕوویدا کە هاوشێوەی نەبووە، حەوت ساڵان خەڵکی یەکتریان دەخوارد لە برسان، هەتا دەگێڕنەوە کەوا یەك نان بە پەنجا دیناری ئەو سەردەم دەست دەکەوت.

• لە ساڵی (٥٩٦) لە وڵاتی میصر برسیەتیەك ڕووی لەو وڵاتە کرد، هەتا کار گەیشتە ئەوەی کە خەڵکی لاشەی بۆگەنیان دەخوارد..تەنانەت ئەگەر مردوویەك ناشترابوایە دەریاندەهێناو دەیانخوارد لە برسان.. ئەبو شامە دەڵێت: لەو سەردەم ٢٢٠٠٠٠ هەزار کەس لە برسان مردن.

• لە ساڵی (٧١٨)ی کۆچی لە دیاربەکرو موسڵ و هەولێرو ماردین و جزیرەو میافارقین.. گرانیەکی وا ڕوویدا کە خەڵکێکی زۆر لە برسان مردن..

---

(١) صحيح: المعجم الكبير، للطبراني (٧/ ٢٠٧) برقم: (٦٨٥٧) وصححه الألباني في (السلسلة الصحيحة)، برقم: (٣٠٦١).

(٢) الإشاعة لأشراط الساعة، (لا ٩٦).

پێشەوا عەوفی کوڕی مالیك (ﷺ) دەڵێت:

لە شەڕی تەبوك چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) کە لەژێر خێوەتێکی چەرمدا بوو، فەرموی:

(اعْدُدْ سِتًّا بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ... ثُمَّ اسْتِفَاضَةُ الْمَالِ حَتَّى يُعْطَى الرَّجُلُ مِائَةَ دِينَارٍ فَيَظَلُّ سَاخِطًا)[1].

واتە: شەش شتان بژمێرە لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی... پاشان ماڵ ئەوەندە زۆر دەبێت کەوا سەد دینار دەدەیت بە یەکێك کەچی توڕە دەبێت و بە کەمی دەزانێ.

بۆیە وای بۆ دەچم کە زۆری ماڵ موافیقی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا بێت.. وە هۆکاری توڕەبوونەکەش بەرزبوونەوەی کاڵاکان دەگەڕێتەوە کە پارە دەبێت بەڵام لەهەمان کاتدا گرانیەو ناتوانی پێویستیەکانی خۆت جێ بەجێ بکەی..

ئەگەر ئەمڕۆ سەیری کوردستانی خۆمان بکەین ئەم دیاردەیە بە چاوی خۆمان بەدی دەکەین، پارە باشەو بەڵام ئامانجەکانی ناپێکێت..

تەنانەت ئەمڕۆ دیاردەیەکی تریش هەیە ئەویش زیادکردنی نرخی کاڵاکانە بۆ فریودانی خەڵکی.

بەو شێوەیە کەسێ نرخی کاڵا زیاد دەکات کە نایەوێ بیکڕێ بۆ ئەوەی فێڵ لە غەیری خۆی بکات و پەلکێشی بکات بۆ ئەوەی نرخی زیاتر بکات و گرانی ڕوویدات بەسەر ماڵە هەژارەکان.

بەداخەوە.. زۆرێك لە دەڵاڵەکان لە جێگای مەزات کردن و پێشەنگەکانی ئۆتۆمبێل پیشەکانیان پیسە لەبەر چەندین حەڕام، کە ئەنجامی دەدەن، هەندێ لەو حەڕامانە لەگەڵ مامەڵەی فریودانی نرخی کاڵایە کە زیادی دەکەن و گرانی دروست دەکەن.. یان فێڵ لە فرۆشیار دەکەن کە لە دەرەوە دێت، ڕێك دەکەون لەسەر ئەوەی نرخی کاڵایەکەی کەم بکەنەوە.

---

(١) صحيح البخاري (١١/ ٣٠٦) كتاب: الفتن، باب: ما يحذر من الغدر، برقم: (٣١٧٦).

## فیتنەیەک هەموو ماڵەکان دەگرێتەوە

لە نیشانەکانی نزیکبونەوەی کۆتایی بونەوەر هیچ ماڵێك نامێنێت فیتنەی تێ نەچێت.

ئەگەر سەیری حاڵی ئەمڕۆی خۆمان بکەین فیتنە ماڵەکانی پۆشیوە، بە نمونە ئەگەر کەسێك ئینتەرنێت یان تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕێگای خراپەوە بەکار بهێنێت ئەمەش فیتنەیەکە ئەمڕۆ ماڵەکانی گرتۆتەوە.

پێشەوا عەوفی کوری مالیك (ﷺ) دەڵێت: لە شەڕی تەبوك چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) کە لە ژێر خێوەتێکی چەرمدا بوو دەیفەرموو: (.. بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ .. فِتْنَةٌ لاَ يَبْقَى بَيْتٌ مِنَ الْعَرَبِ إِلاَّ دَخَلَتْه ..)[١].

واتە: لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی.. فیتنەیەك پەیدا دەبێت هیچ ماڵێك لە عەرەب نامێنێ نەچێتە ناویەوە...

تێبینی: فەرموودەکە بەڕاشکاوانە باسی گەلی عەرەب دەکات، بەڵام ئەمڕۆ جگە لە عەرەبیش فیتنەکانی گرتۆتەوە..

کەسێك بە یەقینەوە بیەوێت لە فیتە دەربازی ببێت ئەوا خوای گەورە دەپارێزێ و ڕێزداری دەکات، وە لە چاوی خەڵکی بەهاداری دەکات، بەڵام کەسێك بیەوێت فیتنە بۆ ماڵ دروست بکات ئەوا خوای گەورە لە چاوی خەڵکی شەرمەزاری دەکات.

بۆیە زۆر جار گوتومە: هەر کەسێك بیەوێت بەهەشت بە دەست بهێنێت ئەوە با گوێڕایەڵی (الله) بێت و خۆی دەرباز بکات لەو فیتنانەی کە تووشی ماڵەکان هاتوون.

بەڵام چی بۆ خۆشت پێ خۆش بێت، دەبێ بۆ برای بڕواداریشت ئەوە پێ خۆش بێت و دەربازی بکەیت لە فیتنەی ماڵ.

---

(١) صحيح البخاري (١١/ ٣٠٦) كتاب: الفتن، باب: ما يحذ من الغدر، برقم: (٧١٢٠).

# وازهێنانی خەڵکی لە نوێژ کردن

یەکێ لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە خەڵکانێك پەیدا دەبن نوێژ واز لێدەهێنن یان هەندێکی دەکەن و نایکەن، ئەمەش ئەم فەرموودانە دەگەیەنێت کەوا پێشەوامان بە یەکێ لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی داناوە.

لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەیە خەڵکان نوێژ لە بیر دەکەن و نایکەن و لێی بێ ئاگان، کاتێ کە بانگ دەدرێ بە پەرۆشەوە بەرەو مزگەوت نایەن و وەڵامی بانگ نادەنەوە، وا دەزانن ئەم بانگە بۆ مردووانەو کەس وەڵامیان ناداتەوە .

پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەڵێت: (إِنَّ أَوَّلَ مَا تَفْقِدُونَ مِنْ دِينِكُمُ الْأَمَانَةَ، وَآخَرَ مَا يَبْقَى مِنْ دِينِكُمُ الصَّلَاةُ، وَلَيُصَلِّيَنَّ قَوْمٌ لَا دِينَ لَهُمْ..)[1].

ئەوانەی نوێژ واز لێدەهێنن زۆرن بەڵام ئەوانەی نوێژ دەکەن کەمن .

لەم سەردەمە زۆر کەس هەن گەمەو گاڵتە بە نوێژ دەکەن و بە شتێکی سادەو عادەتی دەزانێ! وا دەزانێ شتێکە لە باب و باپیری ماوەتەوەو بەس، ئایا ئەوان نەیانزانیوە کە بەینی مرۆڤ و کوفر نوێژە.

پێشەوا ئەبو ئومامەی باهیلی (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (لَتُنْتَقَضَنَّ عُرَى الْإِسْلَامِ عُرْوَةً عُرْوَةً، فَكُلَّمَا انْتُقِضَتْ عُرْوَةٌ، تَشَبَّثَ النَّاسُ بِالَّتِي تَلِيهَا، فَأَوَّلُهُنَّ نَقْضًا: الْحُكْمُ، وَآخِرُهُنَّ: الصلاة)[2].

---

(١) صحيح: رواه الطبراني في (المعجم الكبير) (٩/ ١٤١) برقم: (٨٧٠٠) وذكره ابن حجر في الفتح (٥٠٧/١٤) وقال : سنده صحيح موقوف ، والهيثمي في مجمع الزوائد (٥٤:٥٥/٧) ورجال الطبراني رجال الصحيح غير شداد بن معقل وهو ثقة ، وقال: صحيح الإسناد ولم يخرجاه. ووافقه الذهبي.

(٢) صحيح ابن حبان (١١١/١٥) برقم: (٦٧١٥) إسناده قوي، عبد العزيز بن إسماعيل روى عنه

واتە: قولفەکانی خێمەی ئیسلامەتی یەك یەك دەپچرێت، هەر کاتێك یەکێکیان پچرا خەڵکی دەست بەویتریانەوە دەگریٚ، یەکەمینیان حوکمەو دواهەمینیان نوێژە .

بەڕاستی هەروا دەرچوو دوژمنان هەر ڕۆژەو بیانوویەك بە ئیسلام دەگرن و خەڵکانێکی زۆریش وازیان لە نوێژ کردن هێناوەو تەنها بەناو موسڵمانن.

نوێژ پەیوەندیەکی ڕۆحیە لە نێوان خودا و بەندەکان، نوێژ یەکێکە لە پایەکانی ئیسلام واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێکی عاقڵ و ژیر جێبەجێی بکات، نوێژکردن پەیوەندی بەکەسێکەوە نیە کە هەژارە یان دەوڵەمەندە بە دەسەڵاتە یان بیٚ دەسەڵاتە بە توانایە یان بیٚ توانایە، ئەبیٚ بە تێکڕایی هەر هەمووومان ئەنجامی بدەین، وەکو حەج نیە ئەگەر کەسێك هەژارو نەداریێت دەتوانیٚ نەچێت بۆ حەج، بەڵام نوێژ لەسەر دەوڵەمەند و هەژارانیش واجبە دەبیٚ بیگرتە ئەستۆی خۆیان.

موسڵمانی خۆشەویست بۆ خودا پێت دەڵێم: ئاگاداری نوێژەکانت بە، چونکە ئەوەی نوێژ نەکات و بڕوای پیٚ نەبێت، یاخود گەمەی پیٚ بکات ئەوە کافر دەبێت و لە ئاینی ئیسلام دەردەچێت، وە لەسەر حاکم پێویستە تەوبەی پیٚ بکات، ئەگەر نەگەڕاوە ئەوە دەبێت بکوژرێت، نابێت نە نوێژی لەسەر بکرێت و نە کفن بکرێت و نە نوێژی لەسەر بکرێت، نابێت لە گۆڕستانی موسڵمانان ژێر خاك بکرێت، چونکە موسڵمان نیە، بەڵام ئەگەر باوەڕی پیٚ هەبوو بەڵام لە تەمبەڵی نەیدەکرد، ئەوە دەبێت حاکم فەرمانی پیٚ بدات کە تەوبە بکات و نوێژە فەوتاوەکان قەزا بکاتەوە، ئەگەر ڕازی نەبوو ئەوە دەبێت بکوژرێت وەکو (حەد) ێك، بەڵام مامەڵەی موسڵمانانی لەگەڵ دەکرێت لە شوشتن و کفن و نوێژو شاردنەوە لە گۆڕستانی موسڵمانان[1].

---

جمع، ووثقه المؤلف٧/١١٠، وقال ابن أبي حاتم ٥/٣٧٧: سألت أبي عنه، فقال: ليس به بأس، وباقي رجاله ثقات.

(١) الفقه المنهجي (١/ ١٠٤) حكم تارك الصلاة .

لە ریوایەتێکی تر فەرموویەتی: (سيأتي على الناس زمان تمات فيه الصلوات ..)[1].

واتە: سەردەمێك بەسەر خەڵکی دێت نوێژەکانیان دەمرێنن، واتە: دەیچوێنن و ئەنجامی نادەن..

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مِنِ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ خَصْلَةً: إِذَا رَأَيْتُمُ النَّاسَ أَمَاتُوا الصَّلاةَ ..)[2].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر حەفتاو دوو تایبەتمەندە... کاتێك خەڵکانێکتان بینی وازیان لە نوێژ هێنا و مراندیان..

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (من اقتراب الساعة إذا رأيتم الناس أضاعوا الصلوات .. وصعدت الجهال على المنابر)[3].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر هەر کاتێك خەڵکتان بینی نوێژەکانیان نەکردو چواندیان، وە نەخوێنەوارەکان بەسەر مینبەر کەوتن..

بەڕاستی مرۆڤ بەرامبەر خوای گەورە سپڵەیە، دروستی کردووەو هێزی پێ بەخشیوە بەڵام نوێژ ناکات.

نوێژ ئەوەندە گرنگە، تەنانەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەر موسڵمانێك کە دەمرێ، چل کەس نوێژی لەسەر بکەن کە شەریك و هاوەڵیان بۆ خوا بڕیار نەدابێ، ئەوا خوای گەورە بە هۆی شەفاعەت و تکای ئەوانەوە دەیبەخشێت)[4].

---

(١) أخرجه ابو داود، قال الالباني: ضعيف الإسناد.

(٢) ضعيف: حلية الأولياء، لأبي نعيم (٣/ ٤١٠)، بە ژمارە (٤٥٥٥). حديث مرفوع، غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ ، لَمْ يَرْوِهِ عَنْهُ فِيمَا أَعْلَمُ إِلا فَرَجُ بْنُ فَضَالَةَ . وهو ضعيف كما قال الحافظ العراقي ( ٢٩٧/٣).

(٣) البحور الزاخرة في علوم الآخرة، محمد بن أحمد بن سالم السفاريني الحنبلي، (لا ١/ ٤٣٢).

(٤) صحيح مسلم، كتاب: الصلاة، برقم: (٩٤٨).

بەشی دووەم

## بە درۆخستنەوەی ڕەجم

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی ڕەجم کردن بەدرۆ دەخرێتەوە..

سەرەتا دەبێت ئەوە بزانین کە هیچ خیلافێك نییە لە حەددی ئەو کوڕو کچانەدا نییە کە هاوسەرگیریان نەکردووە و زینا ئەکەن، کە سزاکەیان ١٠٠ جەلدە، بەڵام ئەوەی کە ئەم خیلافەی تێدا دروست بووە بۆ ئەو کەسانەیە کە زینا ئەکەن و هاوسەریان هەیە، چ پیاو بێ یان ئافرەت..

پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) لەسەر مینبەری پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە کە محەممەدی ناردوە بە هەق کتێبی ناردۆتە خوارەوە بۆی کە بۆی نێردراوەتە خوارەوە ئایەتی ڕەجم بوو ئێمە دەمان خوێندەوەو بەرچاو ڕۆشنی بووین و لێی تێنەگەیشتین، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕەجمی کردووەو ئێمەش رەجمان کردووە[1].

ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوەی کە ئایەتی ڕەجم لە قورئاندا هەبووە بەڵام خوێندنەوەکەی نەسخ بۆتەوە، بەبەڵگەی ئەوەی ئەفەرموێت: ئەو ڕەجمی کردو ئێمەش دوای ئەو ڕەجممان کرد.

کەواتە ئەمە ڕوونە کە ڕەجم کردن لە قورئاندا حوکمەکەی جێگیرەو کاری پێ ئەکرێ بەڵام دەقەکەی لە قورئاندا نەسخ بۆتەوە، یەکێك لە حیکمەتەکانیش ئەوەیە کە ئێمە بە تەنها قورئان نەکەینە سەرچاوەی تەشریع.

بەڵام لە پێش هاتنی کۆتایی بونەوەر کەسانێك ڕەجم کردن ڕەفز دەکەنەوە، هەروەکو عەبدوڵلای کوڕی عەباس(ﷺ) دەڵێت: جارێکیان عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) وتاری بۆ داین و پاش سوپاس و ستایشی خوا فەرمووی: (سَيَكُونُ مِنْ بَعْدِكُمْ قَوْمٌ يُكَذِّبُونَ بِالرَّجْمِ..)[2].

---

(١) صحيح البخاري، برقم: (٦٨٣٠).

(٢) ضعيف: مسند الإمام أحمد (١/ ٢٣) برقم: (١٥٦) . قال شعيب الأرناؤوط: إسناده ضعيف.

واتە: لە دوای ئێوە کەسانێك دێن ڕەجم کردن بەدرۆ دەخەنەوە..

لە ریوایەتێکی تر فەرموویەتی: (إِنَّهُ سَيَخْرُجُ بَعْدَكُمْ قَوْمٌ يُكَذِّبُونَ بِالرَّجْمِ..)[1].

واتە: لە پاش ئێوە گەلێك دەردەچن، رەجم بە درۆ دەخەنەوە..

جا پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) فەرمووی لەو وتارەی کە بەشی یەکەمیم لەسەرەتاوە باسکرد فەرمووی: من لەوە ئەترسم کە سەردەمێك بێت خەڵکانێك بڵێن: ڕەجم لە کتێبەکەی خوادا نابینین! جا گومڕا ببن بە وازهێنان لە فەرزێك کە خوا دایبەزاندۆتە خوارەوە..

ئەم فەرموودەیە زۆر بە ڕاشکاوانە ئاماژە بەوە کراوە کە لە پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت کەسانێك پەیدا دەبن ڕەجم کردن بە درۆ دەخەنەوە.. وەکو موعتەزیلەکان و بەناو قورئانییەکان.

ئەوەی پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) ئەو کات فەرمووی ئایا ئێستا ئەو سەردەمە نییە؟!

بۆیە هەروا ئاسان نییە فەرزیەیەك لە فەرزەکان بە کۆمەڵێ بیرکردنەوەی عەقڵی ڕەفزبکرێتەوە کە چەندین فەرموودەی لەسەر هاتووە، بۆ هەموو ئەو گەنجانەشی کە خۆیان لەم جۆرە فیکرانە ئەدەن پێویستە لەسەریان پێش ڕەدکردنەوەی هەر فەرموودەیەك یاخود حوکمێك شارەزایی تەواوتان هەبێت لە قورئان و زمانی عەرەبی و ڕاڤەو تێروانینی زانایان، ڕاستە زانایان مرۆڤ بوونە بەڵام خۆ هیچ نەبێ لەمن و تۆ زیرەکتربوونە لە قورئان و فەرموودەو زمانی عەرەبی.

وە پێویستە هەر کاتێك کە لەسەر حوکمێك قسەمان کرد لە قورئان و فەرموودەدا لێکۆڵینەوە بۆ هەموو ئەو ئایەت و فەرموودانە بکەین کە باسی لێوە ئەکەن، نەك ئەو دەقە وەربگرین کە فکرەکەمان سەردەخات.. خوای گەورە هەموو لایەکمان پارێزراو بکات.

---

(١) السنة لإبن أبي عاصم (١/ ١٥١) برقم: (٣٤٣).

## بەدرۆخستنەوەی شەفاعەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی خەڵکانێك پەیدا دەبن کە شەفاعەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە درۆ دەخەنەوە..

پێشەوا ئیبنو عەباس(رضي الله عنه) دەڵێت: پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب(رضي الله عنه) وتاری بۆ داین و پاش سوپاس و ستایشی خوا فەرمووی: (سَيَكُونُ مِنْ بَعْدِكُمْ قَوْمٌ يُكَذِّبُونَ بِالشَّفَاعَةِ ..)[1].

واتە: لە دوای ئێوە کەسانێك دێن شەفاعەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەدرۆ دەخەنەوە..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی ڕۆژی قیامەتمان بۆ دەکات، کە شەفاعەتکاران شەفاعەت دەکەن بۆ ئەو موسڵمانانەی دەچنە ناو دۆزەخەوە، بۆ هێنانە دەرەوەیان، وەخوای پەروەردگاریش شەفاعەتیان قەبوڵ دەکات، وە دوایی بە فەزڵ و ڕەحمەتی خۆی ئەوانە دەردەهێنێت کە بەر شەفاعەت نەکەوتوون لە ئەهلی تەوحید.

ئێمە وەکو باوەڕدار باوەڕمان بەوە هەیە کە لە ڕۆژی دواییدا خەڵکی دەچن داوا لە پێغەمبەران دەکەن شەفاعەتیان بۆ بکەن و، شەفاعەت هەیە لەو ڕۆژەدا، بە هەمان شێوەش باوەڕی تەواویشمان هەیە بە شەرعیەتی داواکردنی دوعای خێر لە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێ) و پیاوچاکان تا لە ژیانی دونیادا مابن و نەمردبن.

بەڵام لە پێش هاتنی کۆتایی بونەوەر کەسانێکی نەخوێنەوار هەڵدەستن بە ڕەدکردنەوەی شەفاعەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە لەم سەردەمە زۆر ڕاشکاوانە گوێمان لێدەبێت و دەبیستین کە چۆن چۆنی خەڵکی دژ بە شەفاعەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەوەستنەوە.. ئەم دژ وەستانەوەیەش دەبێت بێتە دی لە پێش هاتنی قیامەت.

---

(١) ضعيف: مسند الإمام أحمد (١/ ٢٣) برقم: (١٥٦) . قال شعيب الأرناؤوط: إسناده ضعيف.

## بەدرۆخستنەوەی ئەوانەی لە ئاگری جەهەننەم دەردەچن

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی کەسانێك پەیدا دەبن کە خەڵکی موسڵمان بە هۆی تاوانەکانیانەوە چوونەتە ئاگری دۆزەخ لە دوای سوتانیان دەردەچن بە درۆدەخەنەوە..

پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) دەڵێت: (إِنَّهُ سَيَخْرُجُ بَعْدَكُمْ قَوْمٌ يُكَذِّبُونَ بِقَوْمٍ يَخْرُجُونَ مِنَ النَّارِ)[1].

واتە: لە پاش ئێوە گەلێك دەردەچن.. ئەوانەی کە گوناهبارن کەوتونەتە ئاگری دۆزەخەوە پاش دەرچوونیان لە ئاگر بە درۆی دەخەنەوە.

هەر کەسێك باوەڕی بەخوا و پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەبێت ئەوا دەبێت بڕوای هەبێت کە موسڵمانان لە ئاگری دۆزەخ دەردەچن!

هەر کەسێك هاتنە دەرەوەی موسڵمانان لە ئاگری دزەخ بە درۆز بزانێت ئەوە لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت لە ڕۆژی قیامەت.

وا مەزانن خوای گەورە بێ ئاگایە لە درۆخستنەوەی ئەو موسڵمانانەی لە ئاگری دۆزەخ دەردەچن، بەڕاستی خوای گەورە سزاکەیان دوا دەخات بۆ ڕۆژێك کە چاوەکانیان تیایدا ئەبڵەق دەبن.

هەمیشە سەیری زاناکان بکەن کە چی دەڵێن! سەیری نەزان و نەخوێنەوارو ناپسپۆڕەکان مەکەن کە شوبهە لە نێو ناخی موسڵمانان دروست دەکەن.

موسڵمانی وا هەیە لە ڕۆژی دوایی دێت تاوانەکانی بە وێنەی چیاکان گەورەن، بەڵام بەهۆی زمانیانەوە کە دەڵێن: خەڵکی لە ئاگری دۆزەخ دەرناچن هەموو ئەو چیایانە خاپور دەکات.

---

(١) السنة لإبن أبي عاصم (١/ ١٥١) برقم: (٣٤٣).

بەرگی دووەم

## بەدرۆخستنەوەی حەوزی کەوسەر

لە پێش هاتنی قیامەت کۆمەڵێکی گومڕاو سەر لێشێواو پەیدا دەبن حەوزی کەوسەر بەدرۆ دەخەنەوە.

پێشەوا ئیبنو عەباس(ﷺ) دەڵێت: عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) وتاری بۆ داین و پاش سوپاس و ستایشی خوا فەرمووی: (إِنَّهُ سَيَخْرُجُ بَعْدَكُمْ قَوْمٌ.. يُكَذِّبُونَ بِالْحَوْضِ..)[1].

واتە: لە پاش ئێوە گەلێك دەردەچن کە حەوزی کەوسەر بەدرۆ دەخەنەوە..

ماڵوێرانی بۆ ئەوانەی کە حەوزی کەوسەر بە درۆ دەخەنەوە.. تەنانەت لە قورئاندا سورەتێك هەیە بەناوی کەوسەر..

هەموو پێغەمبەرێك حەوزێکی هەیە، بەڵام حەوزەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموویان زۆرترە.. وە هەموو ئەوانەی بەرەو حەوزی کەوسەر دەڕۆن مەرج نییە لێی بخۆنەوە، لە دوای سیڕات فریشتەکان هەندێك لە خەڵکی دەگێرنەوەو پاڵیان پێوە دەنێن، پێغەمبەر (ﷺ) دەڕوات هەتا بیانهێنێتەوە، فریشتەکان دەڵێن: ئەی محەممەد کاری وەها مەکە، تۆ نازانی دوای تۆ چی کردووە.

وە ئەوەی لە حەوزی کەوسەر بخواتەوە دوو شت لێی بەدوور دەبێت:

**یەکەم:** هەرچی ڕق و کینەو ئیرەیی و سۆزداریەکەی دونیای نامێنیٚ.
**دووەم:** وەکو باوکە ئادەمی گەشە دەکات و گەورە دەبێت هەتا دەگاتە (٦٠) باڵ لە ئاسماندا.

(کەوسەر) سیفەتە نەك ناو، کەوسەر لای عەرەب شتێکی زۆرە، کاتیٚ پرسیاریان لە دەشتەکیەك کرد بەچی کوڕەکەت گەڕایەوە؟ وتی: بە کەوسەر، واتە: شتێکی ڕوون[2].

---

(١) السنة لإبن أبي عاصم (١/ ١٥١) برقم: (٣٤٣).

(٢) موعد الساعة، د. عمر عبدالكافي، (لا ٢٥٢ ٢٥٣).

## بەدرۆخستنەوەی دەجال

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی کەسانێك هاتنی دەجال بە درۆدەخەنەوە..

پێشەوا ئیبنو عەباس(ﷺ) دەڵێت: جارێکیان عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) وتاری بۆ داین و پاش سوپاس و ستایشی خوا فەرمووی: (أَلا وَإِنَّهُ سَيَكُونُ مِنْ بَعْدِكُمْ قَوْمٌ يُكَذِّبُونَ بِالرَّجْمِ ، وَبِالدَّجَّالِ ، وَبِالشَّفَاعَةِ، وَبِعَذَابِ الْقَبْرِ ..)[1].

واتە: لە دوای ئێوە کەسانێك دێن ڕەجم و دەجال بەدرۆ دەخەنەوە، وە شەفاعەت و سزای گۆڕیش بەدرۆ دەخەنەوە..

لە ریوایەتێکی تر دەفەرموێ: (إِنَّهُ سَيَخْرُجُ بَعْدَكُمْ قَوْمٌ يُكَذِّبُونَ بِالرَّجْمِ، وَيُكَذِّبُونَ بِالدَّجَّالِ، وَيُكَذِّبُونَ بِالْحَوْضِ، وَيُكَذِّبُونَ بِعَذَابِ الْقَبْرِ، وَيُكَذِّبُونَ بِقَوْمٍ يَخْرُجُونَ مِنَ النَّارِ)[2].

واتە: لە پاش ئێوە گەلێك دەردەچن، ڕەجم بە درۆ دەخەنەوە، دەجال بە درۆدەخەنەوە، حەوزی کەوسەر بەدرۆ دەخەنەوە، سزای گۆڕ بە درۆ دەخەنەوە، وە ئەوانەی کە گوناهبارن کەوتونەتە ئاگری دۆزەخەوە پاش دەرچوونیان لە ئاگر بە درۆ دەخەنەوە.

ئەبو هورەیرە (ﷺ) پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (ثَلَاثٌ إِذَا خَرَجُوا لَمْ يَنْفَعْ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا: الدَّجَّالُ وَالدَّابَّةُ، وَطُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا)[3].

---

(١) مسند الإمام أحمد (١/ ٢٣) برقم: (١٥٦) . قال شعيب الأرناؤوط: إسناده ضعيف.

(٢) السنة لإبن أبي عاصم (١/ ١٥١) برقم: (٣٤٣).

(٣) سنن الترمذي (١١/ ٣٢٤) باب: ومن سورة الأنعام، برقم: (٣٣٥١).

واتە: سێ شت هەن هەر کاتێ دەرچوون، ئەوەی پێشتر باوەڕی نەهێنا بێت، لە دوای ئەوان باوەڕهێنان سوودی پێ ناگەیەنێت: دەجال و دابەو هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە.

پێشەوا ئەبو ئومامە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّهَا لَمْ تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ أَعْظَمَ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ، وَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى لَمْ يَبْعَثْ نَبِيًّا إِلَّا حَذَّرَ أُمَّتَهُ، وَأَنَا آخِرُ الْأَنْبِيَاءِ، وَأَنْتُمْ آخِرُ الْأُمَمِ، وَهُوَ خَارِجٌ فِيكُمْ لَا مَحَالَةَ)[١].

واتە: ئەی خەڵکینە! هەتا ئێستا هیچ فیتنەیەك نەبووە لەسەر ڕووی زەوی، لەو ڕۆژەوەی کە خوای گەورە نەوەی ئادەمی لەسەر زەوی بڵاوە پێ کردووە لە فیتنەی دەجال گەورەتر بێت، وە خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە کە ئومەتەکەی لە دەجال ئاگادار نەکردبێت، منیش کۆتایی پێغەمبەرانم و ئێوەش کۆتایی ئوممەتانن، بە دڵنیاییەوە لەناو ئێوەدا دەردەچێت.

جا فیتنەیەك هێندە گەورە بێت کە هەموو پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) ئومەتەکانی خۆیان لێ ئاگادار کردبێتەوەو، ئێمەش دڵنیابین کە چار ناچارەو هەر لەناو ئێمەدا دەردەچێت، بۆیە پێویستە هەموو موسڵمانێك زانیاری تەواوی دەربارەی ئەو فیتنە گەورەیە هەبێت، تا لە کاتی هاتنیدا پێی هەڵنەخەڵێت و بزانێت چۆن خۆی لێ دەپارێزێت.

پێشەوا جابری کوری عەبدوڵلا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (من كذَّب بالدجال فقد كَفَرَ..)[٢]. واتە: هەر کەسێك دەجال بە درۆ بزانێت، ئەوە کوفری کردووە.

پشت بەخوای گەورە لە باس کردنی هاتنی دەجال زیاتر درێژە بەم بابەتە دەدەین کە بۆچی کەسایەتیە گومڕاکان بە درۆی دەخەنەوە.

---

(١) صحيح الجامع الصغير (٢٧٣/٦) ورقمه (٧٧٥٢) واسناده صحيح.

(٢) أخرجه الإمام أبوبكر الإسكاف، في (فوائد الأخبار)، كذا رواه أبو القاسم في (شرح السيرة) له.

## بەدرۆخستنەوەی هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی کەسانێك هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە بە درۆدەخەنەوە..

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عومەر (ﷺ) دەگێرێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (إِنَّ أَوَّلَ الْآيَاتِ خُرُوجًا طُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا..)[1].

واتە: یەکەمی نیشانەکان هەڵهاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە..

پێشەوا ئیبنو عەباس(ﷺ) دەڵێت: جارێکیان عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) وتاری بۆ داین و پاش سوپاس و ستایشی خوا فەرمووی:

(سَيَكُونُ فِيكُمْ قَوْمٌ مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ يُكَذِّبُونَ بِالرَّجْمِ، وَيُكَذِّبُونَ بِالدَّجَّالِ , وَيُكَذِّبُونَ بِطُلُوعِ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا)[2].

واتە: لە دوای ئێوە کەسانێك دێن لەم ئوممەتە ڕەجم کردن بە درۆ دەخەنەوە، وە هاتنی دەجال بەدرۆ دەخەنەوە، وە هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە بەدرۆ دەخەنەوە..

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا، فَإِذَا طَلَعَتْ مِنْ مَغْرِبِهَا آمَنَ النَّاسُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ. فَيَوْمَئِذٍ لَا يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْل..)[3].

---

(١) صحيح: المستدرك (٤/ ٥٤٧) برقم: (٨٦٤٣).قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

(٢) ضعيف: مسند الإمام أحمد (١/ ٢٣) برقم: (١٥٦) . قال شعيب الأرناؤوط: إسناده ضعيف.

(٣) صحيح مسلم (١/ ١٣٧) باب: بيان الزمن الذي لا يقبل فيه، برقم: (١٥٧).

واتە: ڕۆژی دوایی هەڵناسێت هەتا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت، کە هەڵهات و خەڵك بینیان هەر هەموویان باوەڕی پێ دەهێنن، بەڵام ئەوە کاتێکە کە هیچ نەفسێك باوەڕهێنانەکەی سوودی پێ ناگەیەنێت ئەگەر پێشتر باوەڕی نەهێنا بێت.

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ يَبْسُطُ يَدَهُ بِاللَّيْلِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ النَّهَارِ، وَيَبْسُطُ يَدَهُ بِالنَّهَارِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ اللَّيْلِ، حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا)[1].

واتە: خوای گەورە بەشەو دەستی دەکاتەوە هەتا خراپەکاری ڕۆژ تەوبە بکات، وە بەڕۆژ دەستی دەکاتەوە هەتا خراپەکاری شەو تەوبە بکات، هەتا ئەو کاتەی کە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت.

لە فەرمودەیەکی تر پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ:

(لا تَنْقَطِعُ الْهِجْرَةُ مَا تُقُبِّلَتِ التَّوْبَةُ، وَلا تَزَالُ التَّوْبَةُ مَقْبُولَةً حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنَ المَغْرِبِ، فَإِذَا طَلَعَتْ طُبِعَ عَلَى كُلِّ قَلْبٍ بِمَا فِيهِ، وَكُفِيَ النَّاسُ الْعَمَلَ)[2].

واتە: کۆچکردن لە پێناوی خوا پچڕاندنی نیە مادەم تەوبە قەبوڵ بکرێت، تەوبەکردنیش بەردەوام قەبوڵە هەتا ئەو کاتەی کە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت، هەر کاتێك هەڵهات، ئیتر هەموو دڵێك بەوەی کە تێی دایە مۆری لێ دەدرێت، ئیتر خەڵکی پێویستیان بەکار نامێنێت.

پشت بەخوای گەورە لە باس کردنی هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە زیاتر درێژە بەم بابەتە دەدەین کە بۆچی کەسایەتیە گومڕاکان بە درۆی دەخەنەوە.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢١١٣) باب: قبول التوبة من الذنوب، برقم: (٢٧٥٩).

(٢) صحيح: مسند الإمام أحمد (١/ ١٩٢) برقم: (١٦٧١) وقال شعيب الأرناؤوط: إسناده حسن.

## هاتنی سەردەمانێک کەس نامێنێ نەچێتە شام

له نیشانه‌كانی نزیكبوونه‌وه‌ی هاتنی ڕۆژی دوایی سه‌رده‌مانێك دێن كه خه‌ڵكانێك به‌ره‌و شام ده‌ڕۆن..

شام ناوێكه ئه‌مڕۆ به سوریاو ده‌وروبه‌ری (لوبنان و ئوردن و فه‌له‌ستین) ده‌وترێت، هه‌روه‌ها جێگای حه‌شركردنی خه‌ڵك و دابه‌زینی زۆرێك له په‌یامه‌كانی خوایه، شام و دانیشتوانی پله پایه‌و تایبه‌تمه‌ندیان هه‌یه.

پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) ده‌فه‌رموێ:

(إِذَا فَسَدَ أَهْلُ الشَّامِ فَلاَ خَيْرَ فِيكُمْ، لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي مَنْصُورِينَ لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ)[١].

واته: ئه‌گه‌ر خه‌ڵكی شام خراپ بوون، ئیتر ئێوه چاكه‌تان تیا نه‌ماوه، هه‌میشه كۆمه‌ڵێك له ئوممه‌تی من سه‌رخراون، پشت به‌ردانی خه‌ڵكی بۆیان زیانیان پێ ناگه‌یه‌نێت تاكو كۆتایی بونه‌وه‌ر دێت.

پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) ئامۆژگاریمان ده‌كات بۆ نیشته‌جێبوون له شام، چونكه له پێش ڕوودانی قیامه‌ت شام ده‌بێته قه‌ڵای موسڵمانان و جێگای نیشته‌جێ بوونیان.

پێشه‌وا ئه‌بو ده‌رداء(رضي الله عنه) ده‌ڵێت:

پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) فه‌رمویه‌تی: (إِنَّ فُسْطَاطَ الْمُسْلِمِينَ يَوْمَ الْمَلْحَمَةِ بِالْغُوطَةِ، إِلَى جَانِبِ مَدِينَةٍ يُقَالُ لَهَا: دِمَشْقُ، مِنْ خَيْرِ مَدَائِنِ الشَّامِ)[٢].

---

(١) صحيح: سنن الترمذي (٨/ ٣٨١) باب: ما جاء في الشام، برقم:(٢٣٥١) قال الترمذي: حديث حسن صحيح.

(٢) صحيح: سنن أبو داود(٦/ ٢٥٦) باب: في المعقل من الملاحم، برقم: (٤٢٩٨) قال الأرناؤوط: حديث صحيح.

واتە: بەشی موسڵمانان لە ڕۆژی داستانەکە لە (غوطة) دەبێت، لە تەنیشت شارێك (دیمەشق)ی پێ دەوترێت، لە چاکترین شارەکانی (شام)ە.

(فُسْطَاطَ)یش لە بنچینەدا چادرە، لێرەدا مەبەست لە شوێنی موسڵمانان و جێگای کۆبوونەوەیان لە ڕۆژی ئەو داستانە بریتیە لە جەنگێکی گەورە لە نێوان موسڵمانان و گاورەکان.

(الْغُوطَة) ئەمڕۆ پێی دەوترێت (غوطة دمشق)، (دیمەشق)یش شارێکی ناسراوە، وە پایتەختی سوریایە.

ئەو داستانەش کە لەفەرموودەکەدا باس دەکرێت لە پێش هاتنی موحەممەدی مەهدی ڕوودەدات، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) هانی داوە بۆ نیشتەجێ بوونی شام، چونکە جێگای کۆبوونەوەیەو شوێنی باوەڕدارانە، یەکێکیش لە هاوەڵان ڕاوێژی کردە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ کوێ کۆچ بکات، پێی فەرموو بۆ شام کۆچ بکە.

پێشەوا بەهزی کوری حەکیم(ﷺ) لە باوکیەوە لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ کوێ فەرمانم پێ دەکەیت؟

فەرمووی: بەرەو ئەولا بەدەستیشی ئاماژەی کرد بەرەو شام[1].

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عەمر (ﷺ) دەڵێت: سەردەمانێك دێت باوەڕدار هەمووی خۆی دەگەیەنێتە شام.

بەڕاستی ئەم فەرموودانە گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەرمان(ﷺ) نیشان دەدەن.

گەورەترین و دیارترین نیشانەی کۆتایی بونەوەرن کە دەبێت ڕوویدات و بە چاوەکانمان بیانبینین.

---

(١) صحيح: رواه الترمذي، وقال حديث حسن وصححه الحاكم.

## زیادەڕەوی لە جۆرەها خواردن و خواردنەوە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر خەڵکی هەڵدەستن بە سازدانی جۆرەها خواردن و خواردنەوە.. وە پارەیەکی ئێجگار زۆر بە فیڕۆ دەدرێت لە پێناوی.. وە ئەمەش دەبێتە هۆکارێك بۆ فڕێدان و لەناوبردنی خواردن و خواردنەوە..

وە لە پێش هاتنی قیامەت جۆرەها خواردن و خواردنەوە لەسەر سفرەکان دەڕازێنرێنەوە.. وە هەژارەکانیش لەو پەڕی ناخۆشی ژیان دەگوزەرێنن..

پێشەوا ئەبو ئومامە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (سَيَكُونُ رِجَالٌ مِنْ أُمَّتِي يَأْكُلُونَ أَلْوَانَ الطَّعَامِ، وَيَشْرَبُونَ أَلْوَانَ الشَّرَابِ.. فَأُولَئِكَ شِرَارُ أُمَّتِي)[1].

واتە: پیاوانێك لە ئوممەتی من پەیدا دەبن، جۆرەها خواردن دەخۆن و دەخۆنەوە.. ئا ئەوانە خراپترین کەسی ئوممەتی منن.

لێرەدا مەبەست پێی ئەو جۆرە کەسانەیە کە خواردنەکانیان دەمێننێتەوەو لە دواییشدا فڕێی دەدەن و وە نازو فیزیش بەسەر خەڵکی دا دەکەن..

بێگومان لەم سەردەمە زۆر کەس ئیسراف و زێدەڕەوی دەکەن لە خواردن و خواردنەوەو، بەڕاستی ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی فەرمووە هەمووی وەکو ڕۆژی ڕووناك هاتۆتە دی.

تەنانەت لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: بخۆن و بخۆنەوەو جل بپۆشن و ماڵ ببەخشن، بەبێ ئەوەی ئیسراف بکەن و خۆتانی پێ هەڵکێشن..

بێگومان هەموومان هەست بەوە دەکەین کە لەمانگی ڕەمەزان خەڵکێکی زۆر خواردن و خواردنەوەیەکی بێ ئەندازەو جۆرەها میوە لەسەر سفرەکانیان دادەنێن و زۆربەیان فڕێ دەدرێتە نێو زبڵدانەوە.

---

(١) حسن: رواه الطبراني في (المعجم الكبير) (٨/ ١٠٧) برقم: (٧٥١٢). قال الألباني في صحيح الترغيب (٢/ ٤٧٩): حسن لغيره.

# دژایەتی کردنی فەرموودەکان و سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر کۆمەڵێك کەس دروست دەبن و دژایەتی فەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەکەن و بە هەموو ڕێگاکان و کەناڵەکان و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، بۆیە زۆر جار چەندین کۆنگرەو کۆنفراس و کۆبوونەوەو نوسراو بانگەشەی ئەوە دەکەن کە واز لە سوننەت بهێنرێت و بچینەوە سەر قورئان، یان دەڵێن: پێویستە دووبارە بە فەرموودەدا بچینەوە، هەیانە نکوڵی لە فەرموودەی جادووکردنی پێغەمبەری خوا دەکات، یان نکوڵی لە فەرموودەی مێش ئەگەر کەوتە ناو شلەمەنیەك دەکات، یان نکوڵی لە ڕەشکە دەکات... هتد... دەیانەوێت خەڵکی بەرەو گومڕایی ببەن..

پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (سَيَلِي أُمُورَكُمْ بَعْدِي، رِجَالٌ يُطْفِئُونَ السُّنَّةَ، وَيَعْمَلُونَ بِالْبِدْعَةِ، وَيُؤَخِّرُونَ الصَّلَاةَ عَنْ مَوَاقِيتِهَا فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ أَدْرَكْتُهُمْ، كَيْفَ أَفْعَلُ؟ قَالَ: تَسْأَلُنِي يَا ابْنَ أُمِّ عَبْدٍ كَيْفَ تَفْعَلُ؟ لَا طَاعَةَ، لِمَنْ عَصَى اللَّهَ)[1].

واتە: لە دوای من کاروبارتان دەکەوێتە دەست کەسانێك، پیاوانێك دەیانەوێت سوننەت بکوژێننەوەو کار بە بیدعە دەکەن و، نوێژ لە کاتەکانی خۆیان دوا دەخەن، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر گەیشتم بەم جۆرە کەسانە چی بکەم؟ فەرمووی: پرسیارم لێ دەکەیت کە چی بکەم ئەی کوڕی دایکی عەبد؟ گوێڕایەڵی کەسێك مەبە کە سەرپێچی خوای گەورە دەکات..

---

(١) سنن ابن ماجة (٤/ ١٢٣) باب: لا طاعة في معصية الله، (برقم): (٢٨٢٦). قال الشيخ الأرناؤوط: إسناده حسن.

پێشەوا حوزەیفەی کوڕی یەمان (ﷺ) دەربارەی ئەم جۆرە کەسانە دەڵێت: (.. دُعَاةٌ عَلَى أَبْوَابِ جَهَنَّمَ مَنْ أَجَابَهُمْ إِلَيْهَا قَذَفُوهُ فِيهَا، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، صِفْهُمْ لَنَا، قَالَ: نَعَمْ، قَوْمٌ مِنْ جِلْدَتِنَا، وَيَتَكَلَّمُونَ بِأَلْسِنَتِنَا، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَمَا تَرَى إِنْ أَدْرَكَنِي ذَلِكَ؟ قَالَ: تَلْزَمُ جَمَاعَةَ الْمُسْلِمِينَ وَإِمَامَهُمْ، فَقُلْتُ: فَإِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُمْ جَمَاعَةٌ وَلَا إِمَامٌ؟ قَالَ: فَاعْتَزِلْ تِلْكَ الْفِرَقَ كُلَّهَا، وَلَوْ أَنْ تَعَضَّ عَلَى أَصْلِ شَجَرَةٍ حَتَّى يُدْرِكَكَ الْمَوْتُ وَأَنْتَ عَلَى ذَلِكَ)[1].

واتە: .. کۆمەڵێك پەیدا دەبن خەڵکی بۆ دەرگاکانی دۆزەخ بانگ دەکەن، هەر کەسێ بە گوێیان بکات هەڵی دەدەنە ناو دۆزەخ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) باسیانم بۆ بکە، فەرمووی: ئەوانە لە خۆمانن و بە زمانی ئێمە دەدوێن، گوتم: ئەگەر گەیشتمە ئەو سەردەمە چیم پێ دەفەرمووی؟ فەرمووی: پابەندی کۆمەڵ و پێشەوای موسڵمانان بن، گوتم: ئەی ئەگەر کۆمەڵ و ڕابەریان نەبوو؟ فەرمووی: کەواتە لە هەموو ئەو کۆمەڵانە کەنار بگرە تا مردنت دەگاتێ.

لەم سەردەمەدا ئەوانەی خەڵکی بانگ ئەکەن بەرەو ئاگری دۆزەخ زۆر زۆرن، لە هەموو سەردەم و شارێك، بەتایبەتی لەم سەردەمەی ئەمڕۆ نکوڵی دەکەن لە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ).

بە پێویستم زانی چەند ووتەیەکی زیندوو دەربارەی فەرموودەناسان (أهل الحديث) بخەمە ڕوو:

• پێشەوا ئیبنو قەطان(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ:

هیچ بیدعەچیەك نیە لەم دونیایە، ئیلا ڕقی لە ئەهلی فەرموودەیە.

• پێشەوا شێخ عبدالقادر گەیلانی) دەفەرمووێ:

نیشانەی ئەهلی بیدەع (بیدعەچیەکان) تانە گرتن و جوێن دانە بە ئەهلی فەرموودە .

• پێشەوا داودی کوڕی عەلی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووی:

---

(١) صحيح مسلم (٣/ ١٤٧٥) باب: الأمر بلزوم الجماعة، برقم: (١٨٤٧).

هەر کەسێ فەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) نەناسێ و ساغ و ناساغەکان لە یەکتری جیانەکاتەوە، ئەو کەسە زانا نیە.

• پێشەوا ئیبن و زەریع (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: بۆ هەر ئایینێك سوار چاکێك هەیە، سوارچاکی ئەم ئایینەش خاوەن ئەسانیدن.

• پێشەوا (مالیك) دەفەرمووێ: پێم گەیشتووە کە زانایان (واتە: ئەهلی فەرمووده) دەربارەی گەیاندنی زانست پرسیاریان لێ دەکرێت، هەروەکو چۆن پێغەمبەران پرسیاریان لێ ئەکرێت.

• پێشەوا (سوفیانی سەوری) دەفەرموێ: گوێگرتن لە فەرمووده سەربەرزیە بۆ ئەوانەی دونیایان پێ دەوێ، سەرفرازیشە بۆ ئەوانەی ڕۆژی دواییان پێ دەوێت، هیچ زانستێك ناناسم چاکتر بێ لە زانستی فەرمووده، بۆ ئەوانەی کە مەبەستیان پێی ڕەزامەندی خوا بێ، خەڵکی پێویستیان پێیەتی زیاتر لە خواردن و خواردنەوە.

• پێشەوا سوفیانی سەوری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووی: ئیسناد چەکی ئیماندارانە، ئەگەر چەکی لا نەبێ جا بەچی دەجەنگێ.

• پێشەوا (داره قوطنی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووی: کەسێ نیە لەم ئوممەتە بە زۆری سەلەوات بدەن لە پێغەمبەرەکەیان وەکو ئەهلی فەرمووده .

• پێشەوا (ئەبو نەصر بن سلام الفقیه) دەفەرموێ: هیچ شتێك نیە گران و کوشندەتر بێ لەسەر ئەهلی ئیلحادو مایەی ڕق لێبوونەوەیان بێ وەك گوێ گرتن لە فەرمووده .

• پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی موبارەك(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئیسناد لە ئایین دایە، ئەگەر ئیسناد نەبێ ئەوا هەر کەسە ئەوەی بیویستایە دەیگوت .

• پێشەوا حاکمی نیسابوری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) ئەفەرموێ: ئەگەر کۆمەڵێ فەرموودەناس بەم شێوە زۆرە سەریان هەڵنەدابایە و بایەخیان بە لەبەرکردنی پاڵپشت (سەنەد) لای فەرموودەکان نەدابوایە، ئەو کاتە ئایین لەناو دەچوو، بێباوەڕان و ئەهلی بیدعە بەسانایی دەیانتوانی فەرمووده هەڵبەستن و پاڵپشتەکانی ئاوەژوو بکەن.

# فەرمووده ناسان هەمیشه سەرکەوتوون

یەکێك لە نیشانەکانی هاتنی دوا ڕۆژ وای لێدێت فەرموودەناسەکان سەرکەوتوو دەبن، زانستێکی باش لەم بابەتەوە پەیدا دەکەن و دەبنە مەشخەڵ بۆ هەموو گەلانی جیهان .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ يُقَاتِلُونَ وَهُمْ أَهْلُ الْعِلْمِ)[١].

واتە: کۆمەڵێك هەن لە ئومەتەکەم کە لەسەر هەق دەمێننەوەو شەڕ دەکەن کاری پێدەکەن کە ئەوانیش زانست خوازانن . واتە: ئەهلی فەرموودەن..

پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي مَنْصُورِينَ لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ)[٢].

پێشەوا ئیبنو حەجەری عەسقەلانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێت: ئەوانە کۆمەڵێکن شوێنی سەرەکییەکان (بيت المقدس)ە، واتە: لە شام، هێزێکی وایان دەبێت کە بتوانن جیهادی دوژمنی پێ بکەن زۆر بەتواناو توندو تیژیەوە[٣].

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەفەرموێ: دەگونجێت ئەو کۆمەڵە چەند چینێکی باوەڕدارین کە ئازاو شارەزایی شەڕبن و تێگەیشتوو و شارەزابن لە فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، فەرمان دەکەن بە چاکەو بەرگری دەکەن لە خراپە، خۆیان داناوە بۆ خواپەرستی و مەرجیش نیە لە یەك وڵات کۆببیێتنەوەو دەگونجێت لە چەند هەرێمێکی زەوی دابن[٤].

---

(١) صحيح البخاري (٩/ ١٢٥).

(٢) صحيح: سنن الترمذي (٤/ ٥٥) باب: ما جاء به في الشام، برقم: (٢١٩٢). وقال حَدِيثٌ حَسَن.

(٣) فتح الباري (١٣/ ٢٩٥).

(٤) شرح صحيح مسلم (٤/ ٥٨٣).

پێشەوا عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەربارەی ئەم فەرموودەیە فەرمویەتی: بەلای منەوە ئەو کۆمەڵەن کە شارەزای فەرموودەکانی پێغەمبەرن(ﷺ)[1].

کۆمەڵی سەرکەوتوان (الطائفة المنصورة) ئەوانەن کە بەپێی بەڵگەی ڕاست فەرمان و یاسا وەردەگرن.

بە پێی چەند فەرمودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) دوو پرس هەیەو ئێمەی موسڵمان چەمکەکانی لە فەرمودەکان و ڕاڤەی زانایانەوە وەردەگرین ئەویش ئەوەیە:

• ئەو تاقم و دەستەیەی کە لە ڕۆژی دواییدا براوە دەبێت و لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری دەبێت، ئەو کەسانەن کەلەسەر مەنهەجی پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشتوون و بەو کەسانە دەگوترێ (فیرقەی ناجیە) دەستەی ڕزگار بوو.

• چەمکی دووەم بریتیە: لەوەی لەناو ئەم فیرقە ناجیەدا بە بەردەوام (طائفە) یەك زاڵ و سەرکەوتووەو بڕیار لە دەستی خۆیدایەو خاوەنی بەرنامەو قەوارەی خۆیەتی.. بەمەیان دەگوترێت (طائیفەی مەنصورە).

پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەربارەی ئەو فەرمودەیە دەفەرمووی: ئەوانە ئەگەر ئەهلی فەرموودە نەبن نازانم کێی ترن[2]؟

پێشەوا عەلی کوری مەدینی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەوانە ئەهلی فەرموودەن.

پێشەوا بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: مەبەست پێی زانایانی ئەهلی فەرموودەیە.

پێشەوا ئەحمەدی کوری سینان (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەوانە ئەهلی زانست و فەرموودەن.

---

(١) شرف أصحاب الحديث، لا ٢٦.

(٢) شرف أصحاب الحديث، لا ٢٧ .

## کوشتنی برا و خزم و دراوسێ

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی کەسانێکی دوور لە ئیمان هەڵدەستن بە کوشتنی دراوسێ و براو مام و کوڕی مام.. لەسەر کەمێك لە خۆشیەکانی دونیا..

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (أَنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ الْهَرْجَ..

إِنَّهُ لَيْسَ بِقَتْلِكُمُ الْكُفَّارَ، وَلَكِنَّهُ قَتْلُ بَعْضِكُمْ بَعْضًا حَتَّى يَقْتُلَ الرَّجُلُ جَارَهُ، وَيَقْتُلَ أَخَاهُ، وَيَقْتُلَ عَمَّهُ ، وَيَقْتُلَ ابْنَ عَمِّهِ

قَالُوا : سُبْحَانَ اللهِ ومَعَنَا عُقُولُنَا؟ قَالَ: لاَ، إِلاَّ أَنَّهُ يَنْزِعُ عُقُولَ أَهْلِ ذَاكُم الزَّمَانِ حَتَّى يَحْسَبَ أَحَدُكُمْ أَنَّهُ عَلَى شَيْءٍ وَلَيْسَ عَلَى شَيْءٍ)[1].

واتە: لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی، کوشتن ڕوودەدات مەبەستیش کوشتنی کافران نیە بە دەستی ئێوە، بەڵکو یەکتر کوشتنە لە نێو خۆتاندا، تا وای لێ دێت پیاو دراوسێ و براو مام و ئامۆزای خۆی دەکوژێت..

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ئەو ڕۆژە ئێمە عەقڵمان هەیە؟

فەرمووی: خەڵکی ئەو کاتی عەقڵ و هۆشیان نامێنێ، خەڵکێکی پوك دەبنە جێنشینیان و زۆربەیان وا دەزانن لەسەر ئاینێکن بەڵام لەسەر هیچ نین .

پاکو بێگەردی بۆ خوای گەورە کە فەرموودەکان هەمووی هاتوونەتە دی و لە هەرێمی کوردستان ئەم کوشتنە زۆر بە ئاشکرا بەدی دەکرێت.. خەڵکی ئەوەندە خراپ بوونە هەڵدەستن بە کوشتنی کچ و کوڕو دایك و باوك.. هتد.

---

(١) مسند الإمام أحمد (٤/ ٤٠٦) برقم: (١٩٦٥٣).

# خەونەکان نایەنە دی و بەبادەچن

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی قیامەت خەونەکانی مرۆڤ نایەتە دی..

پێشەوا ئەبی سەعلەبەی خوشەنی دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إن من أشراط الساعة أن تنتقص العقول، وتعزب الأحلام، ويكثر الهم)[١].

واتە: لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر خەڵك بیروهۆشی لای خۆی نامێنێت و خەونەکان بە با دەچن و غەم زۆر دەبێت.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عومەر(رضي الله عنه) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (من أشراط الساعة أن تعزب العقول، وتنقص الأحلام، ويكثر القتل، وترفع علامات الخير، وتظهر الفتن)[٢].

واتە: لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر خەڵك بیروهۆشی لای خۆی نامێنێت و خەونەکان بە با دەچن و کوشتن زۆر دەبێت و، نیشانەکانی خێر هەمووی هەڵدەگیرێ و فیتنە سەرهەڵدەدات.

هەموو مرۆڤێك بە ئاواتە بگات بە خەونەکانی بۆ ئەوەی زیاتر سوودی لە ژیان بینیبوایە، بەڵام ئەمرۆ ئەوە نەماوە، سەلامەتی و ڕزگار بوون لە فیتنەکان باشترینی خەونی مرۆڤەکانە.

ئەگەر تا ئێستا بڕیاری هاتنە دی خەونەکانت نەداوە، ئەوا هەر لە ئێستادا بڕیار بدە هەم خەونەکانت و هەم ئاواتەکانت بهێنە دی بە پشت بەست بە خوای گەورە.

---

(١) رواه نعيم بن حماد في «الفتن» من حديث كثير بن مرة مرسلاً مثله.

(٢) ضعيف: رواه الطبراني ، وفيه عافية بن أيوب وهو ضعيف. برقم: (١٢٤٦٤)

## خێرا ڕۆیشتنی مانگی ڕەمەزان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر مانگی ڕەمەزان زۆر بەخێرایی دەڕوات.

هەر چەندە هیچ فەرموودەیەك نییە بە ڕاشکاوانە باسی خێرا ڕۆیشتنی مانگی ڕەمەزان بکات، بەڵام ئەم فەرموودەیەی کە هێناومەتەوە باسی خێرایی مانگ و ساڵ دەکات..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَقَارَبَ الزَّمَانُ، فَتَكُونَ السَّنَةُ كَالشَّهْرِ، وَيَكُونَ الشَّهْرُ كَالْجُمُعَةِ، وَتَكُونَ الْجُمُعَةُ كَالْيَوْمِ، وَيَكُونَ الْيَوْمُ كَالسَّاعَةِ، وَتَكُونَ السَّاعَةُ كَاحْتِرَاقِ السَّعَفَةِ)[١].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا کات لێك نزیك دەبێتەوە ساڵ وەك مانگی لێ دێت و مانگ وەکو هەفتەی لێ دێت و هەفتە وەکو ڕۆژی لێ دێت و ڕۆژێك وەکو سەعاتێکی لێ دێت سەعاتێکیش وەك و سووتانی پوشکی دارخورمای لێ دێت.

بۆیەش باس لە خێرایی مانگی ڕەمەزان دەکەم چونکە لە ساڵانی (٢٠١٧ ٢٠١٨ ٢٠١٩) مانگی ڕەمەزان زۆر بەخێرایی ڕۆیشت.

خێراترینی ڕەمەزان کە بڕوات لە داهاتوو مانگی ڕەمەزانەکانی داهاتووە لەسەر هەسارەی زەوی، چونکە ئێمە بەرەو کۆتایی دونیا دەڕۆین و نیشانەکانی کۆتایی هاتوونەتە دی، بۆیە ئەم سێ ساڵەی ڕابردوو خێراترین مانگ بوو کە ڕۆیشت، وە ساڵانی داهاتووش زۆر زیاترە لەوەی کە ئێمە چاوەڕوانی دەکەین..

---

(١) صحيح ابن حبان (٢٥٦/١٥) ، رقم : (٦٨٢٤) ، وقال محققه شعيب الأرناؤوط : إسناده صحيح عى شرط مسلم . وذكره ابن كثير في النهاية في الفتن والملاحم (٢٣٤/١) بهذا الإسناد وقال : زعم سهل أن هذا الإسناد على شرط مسلم . وابن حجر في الفتح (١٩/١٣) ، وعزاه لأحمد والترمذي عن أبي هريرة وأنس . والتبريزي في مشكاة المصابيح ، رقم : (٥٤٤٨) .

بۆیە خۆشبەخت ئەو کەسەیە کە بتوانێت کردەوە ئەنجام بدات لەم مانگەی ڕەمەزان..

زانایانی فەلەك تێبینیان کردووە کە خێرایی قوتبی موگناتیسی زەوی تا ساڵی ١٩٧٠ع بە خێرایی ١٠کم لە ساڵێکدا دەجولا، لەم ساڵانەی دواییدا ئەو خێراییەی گەیشتۆتە ٤٠ کم لە ساڵێکدا .. تەنانەت لە ژێر ئەو بوارە موگناتیسیەدا بەیەکجار لە ساڵی ٢٠٠١ع قوتبی موگناتیسی زەوی ٢٠٠کم خزاوە.. ئەمەش وا دەکات کە لە داهاتوودا هەردوو قوتبە موگناتیسیەکەی زەوی جێگۆڕکێ بکەن و بەمەش زەوی بە پێچەوانەوە بخولێتەوە، ئەمەش یانی هەڵهاتنی خۆر لە خۆر ئاواوە..

ئەمە لە ساڵی ٢٠٠١ ئەگەر ئەوەندە بێت، ئەی دەبێت لە ساڵی ٢٠٢٠ چەند نزیك ببێتەوەو خزا بێت.

بەڕاستی لەم سەردەمە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەمووی هاتوونەتە دی.

هەموو ساڵێك مانگی ڕەمەزان ماڵئاواییمان لێدەکات، وە ساڵ بە ساڵیش ئەو مانگە بەرزو پیرۆزە بە خێرایی لە نێوماندا دەڕوات بە تایبەتی لەم چوار ساڵەی کۆتایی.

کەواتە باشترینی خەڵات بۆ بەدەست هێنانی ئیمان و باوەڕ لەم مانگەدا بە دەست هێنانی ڕەزامەندی خوای پەروەردگارە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

موژدەتان لێبێ ئەم قورئانە جەمسەرێکی بە دەست خواوەیەو جەمسەرەکەی تری بەدەستی ئێوەوەیە، جا توند دەستی پێوە بگرن، چونکە لە دەست گرتنتان بە قورئانەوە دەبێتە هۆی ئەوەی هەرگیز نافەوتێن و گومڕا نابن[1].

---

(١) رواه الطبراني وصححه الشيخ الألباني في صحيح الجامع الصغير (٣٤).

بەرگی دووەم

# سەرهەڵدانی نەفامی

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی کەسی نەفام زۆر دەبێت..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرزەنشتی نەفامی دەکات و فەرمویەتی: (إِنَّ اللَّهَ يَبْغَضُ كُلَّ جَعْظَرِيّ جَوَّاظٍ سَخَّابٍ فِي الأَسْوَاقِ جِيفَةٌ بِاللَّيْلِ حِمَارٌ بِالنَّهَارِ عَالِمٌ بِالدُّنْيَا جَاهِلٌ بِالآخِرَةِ)[١].

واتە: خوای گەورە ڕقی لە هەموو لاسارو زۆر خۆرو دەنگ بەرزێکە لە بازاڕەکاندا، لاکە بە شەو گوێدرێژە بەڕۆژ زانایە بە کاروباری دونیا، نەزانە بە کاروباری دوا ڕۆژ.

هەروەها پێی ڕاگەیاندووین کە یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر بڵاوبوونەوەی نەفامییەو فەرموویەتی: (إِنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ أَيَّامًا يُرْفَعُ فِيهَا الْعِلْمُ، وَيَنْزِلُ فِيهَا الْجَهْلُ)[٢].

واتە: پێش هاتنی کۆتایی بونەوەر ڕۆژانێك هەیە زانستی تێدا بەرز دەکرێتەوەو نەفامی تێدا بڵاو دەبێتەوە.

هەروەها فەرموویەتی: (يأتي على الناس زمان لَا يُدْرَى مَا صِيَامٌ وَلَا صَلَاةٌ وَلَا صَدَقَةٌ)[٣].

واتە: ڕۆژگارێك دێت بەسەر خەڵکی نازانێت نوێژ چیە؟ ڕۆژوو چیە؟ صەدەقە چییە؟

---

(١) صحيح: موارد الظمآن إلى زوائد ابن حبان، باب: ما جاء في الفحش (١/ ٤٨٥) برقم: (١٩٧٥).

(٢) صحيح البخاري (٢٣/ ٢٥٠) باب: ظهور الفتن، برقم: (٧٠٦٤).

(٣) رواه الطبراني.

هەر کەسێك ئەمڕۆ ورد بێتەوە لە حاڵی خەڵکی لە زۆرێك لە وڵاتە ئیسلامییەکان، دەبینێت ئەوان تەنها ئەو شتانە دەزانن کە پەیوەندی هەیە بە ژیان و بەرژەوەندیەکانیانەوە، بۆ نموونە دەزانن چۆن مامەڵە بکەن لەگەڵ کۆمپیوتەرو مۆبایل و سەیارەو شتی تر، بەڵام ئەگەر پرسیاری لێ بکەیت واتای (الله الصمد) چیە؟ کەی سوجدەی سەهوو دەبەیت، پێش سەلامە، یان دوای سەلام؟ دەبینی هیچی پێ نیە. بەڵێ.. نەفامی سەر هەڵدەدات.

جگە لەوانەش، خەڵکی نەزانینێکی زۆریان هەیە بەرامبەر حوکمەکانی کڕین و فرۆشتن و عیبادەتەکان سەرەڕای ئەوەش کە پێویستی زۆریان پێیەتی.

## لێکترازانی خێزان (تەلاق)

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر، لێکترازانی خێزان و تەلاق سەرهەڵدەدات و زۆر دەبێت..

لەم سەردەمە کەم خێزان ماون کە بتوانن لەگەڵ یەك بژین، بۆیە دوای چەند مانگێك لە هاوسەرگیری وشەی (تەلاق) لە نێو هاوسەرەکانەوە دەست پێدەکات.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگاداری ئێمەی کردۆتەوە کە زۆربوونی تەلاق و سوێند خواردنی بە تەلاق بە یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر هەژمار کردووە..

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( مِن اقْتِرَابِ السَّاعَةِ اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ خَصْلَةً .. وَكَثُرَ الطَّلَاقُ)[1].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر حەفتاو دوو تایبەتمەندە... زۆربوونی تەلاق.

لە ریوایەتێکی تر فەرموویەتی: (من اقتراب الساعة إذا رأيتم الناس .. تهاوناً بالطلاق)[2].

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بوونەوەر هەر کاتێك خەڵکتان بینی.. زۆر سوێندیان بە تەلاق خوارد.

لەوانەیە کەسێك پرسیار بکات و بڵێت: زۆربوونی تەلاق چ پەیوەندی بە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دواییەوە هەیە؟

---

(١) ضعيف: حلية الأولياء، لأب نعيم (٣/ ٤١٠)، برقم: (٤٥٥٥). وهو ضعيف كما قال الحافظ العراقي ( ٢٩٧/٣).

(٢) ضعيف: رواه أبو داود كتاب المهدي باب أول المهدي برقم (٤٢٩٠) وهو منقطع، وكنز العمال (٥٧٣/١٤) برقم: (٣٩٦٣٩).

لە وەڵامدا دەڵێم: کۆمەڵگا بە هۆی تەڵاقەوە لەبەر یەك هەڵدەوەشێت، دیارە ئەوەی ئێستا دەیبینین بەڵگەیە لەسەر نەبوونی پێکەوە ژیان و خۆشەویستی، خێزانەکان دوورن لە دینداری و لەسەر بنەمای دین پێك نەهاتوون، ئەوەتا ڕێژەی تەڵاق لەوڵاتی موسڵمانان بەرزبووەتەوە بۆ ٣٦٪ لە هەر (٤٠) حاڵەتی هاوسەرگیری یەك ئافرەت تەڵاق دەدرێت.. بەڵام ئێستا ئەو ڕێژەیە بەرزبۆتەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر نەبوونی تێگەیشتن و ڕێزنەگرتن لە مافەکانی یەکتر لە ژیانی هاوسەرگیری..

ئەگەر سەیری هەرێمی کوردستان بکەین، ئەو کات ئەزانین کە ڕێژەی لێکترازانی کۆمەڵگا ژمارەی پێوانەیی شکاندوە.. وە خەڵکانێك فێربوون زۆر سوێند بە تەڵاق دەخۆن، ئەمانەش هەمویان بە نیشانە هەژمار دەکرێن.

لێکترازانی کۆمەڵگا: واتە نەمانی سنوری هاوسەرگیریو لێکترازانی ژن و مێرد لە یەکتری، کە لە ئیسلامدا حاڵەتێکی ناچاریە لەسەر پەیوەندی هاوسەری، چونکە بنچینەی ئەم پەیوەندیە هەموو زەمانەتێك ئامادە دەکات لە پێناوی ئاسودەییو بەختەوەری لە پێناوی ئەم مەبەستەش ئەوەندە بە پیرۆزی داناوە کە بەرزی کردۆتەوە بەرەو پلەو پایەی خواپەرستیو لەسەر دەوڵەتی پێویست کردووە کەوا بە سامانی وڵات هەژارەکان یارمەتی بدات بۆ هاوسەرگیری.

تەڵاق لە نێو کۆمەڵگا بووەتە ڕووداوێکی ڕۆژانە لەناو خەڵکی، لێشاوێکی زۆری منداڵی نا ئاسایی دەکەونەوە، نەمانی بەها ڕەوشتە بەرزەکانی وەك دار ئاشتی، خۆشەویستی، سۆز و هەست، دڵ پاکی، شەرەف، بەرگری کردن لە مافی کەسانی تر کە لە ئاییندا هاتووە ئەمەش بەرەو هەرەسی کۆمەڵایەتی سەردەکێشێت، ئەم پرۆسەی هەرەس هێنانە کۆمەڵایەتیانەش بەچەند شێوازێکی جیاواز خۆی دەردەخات وەکو هەرەسی خێزان، تەلاق، لە دایك بوونی منداڵی بێ سەرپەرشت، نەمانی ئیش و بازرگانی، خراپەکاری، لافاو، توندوتیژی، دڵە ڕاوکێ، نەمانی قەناعەت و دڵنیایی، زۆربوونی مەی خواردنەوە، سەربەخۆیەکی ئازادیەکی، سەرەنجامی ئەوانەی خولیای ئولفەتی ڕوحی دەبن ناتوانن لەم خورپەیەش ڕاکەن، چونکە تووشی دووره پەرێزی خەڵوەتگەری دەبن،

ئەو ڕاستیەی هەموو ئەوانەی ئاماژەی بۆ دەکەن لەم کۆتا سەدەیەدا ئەوەیە کە هاتنی ڕۆژی دوایی زۆر نزیك بۆتەوە.

گوتمان زۆربوونی تەڵاق نیشانەیەکە لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر! بەڵام ئەمە چ پەیوەندیەکی هەیە بە بەرپابوونی ڕۆژی دواییەوە؟!

لەبەر ئەوەی کۆمەڵگا بەهۆی تەڵاقەوە لەبەر یەك هەڵدەوەشێت، دیارە ئەوەی ئێستا دەیبینین بەڵگەیە لەسەر نەبوونی پێکەوە ژیان و خۆشەویستی، خێزانەکان دوورن لە دینداری و لەسەر بنەمای دین پێك نەهاتوون، ئەوەتا دەبینی ڕێژەی تەڵاق لە وڵاتانی ئیسلامیدا بەرزبۆتەوە بۆ ٣٦٪ لە هەر (٤٠) حاڵەتی هاوسەریدا یەك ئافرەت تەڵاق دەدرێت، بەڵام ئێستا ئەو ڕێژەیە بەرز بۆتەوە بۆ ٥٠٪ ئەمەش بەڵگەیە لەسەر نەبوونی تێگەیشتن و ڕێزنەگرتن لە مافەکانی یەکتر لە ژیانی هاوسەریدا.

سەرەڕای ئەم هەموو زەماناتانەش ژیانی واقعی مرۆڤ هەندێکجار وا ڕوودەدات تووشی گێرەو کێشەو دارمان بێ، کە پێویستە ئەم حاڵەتانەش بە شێوازێکی زانستی ڕووبەڕووی بوەستین و دان بنێین بە واقیعی ڕاستەوانەو کە ژیانی هاوسەری دەخاتە مەترسییەوەو ماڵەکان کاول و وێران دەبن، بەڵکو جاریش هەیە دەستگرتن هەیە بەم پەیوەندیە هاوسەریە لەوانەیە زۆر خراپتر بێ لە خودی تەڵاقدانیش، کە ئەمەش لەو خێزانە دەبینین کەوا زۆر توندڕەون لە مەسەلەی خێزانداری و تەڵاقیان لەلا زۆر گرنگ و عەیبدارێکی گەورەیە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر بە وردی دەڕوانێتە درێژەی ئەو دووبەرەکیەی کە لە پێش هاتنی ڕۆژی دواییدا ڕوو دەدات و دەفەرمووێ: ڕۆژی دوایی هەڵناسێت تاکو کوشتار زیاد نەبێت.

لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووی:

کاتی بەرپابوونی ڕۆژی دوایی ساڵانێکی سەر لێشێواویە خەڵکی بڕوا بە درۆزن ئەکەن و بڕوا بەوە ناکەن کە ڕاستی دەڵێن، خەڵکی متمانە ناکەن بە

کەسێك کە جێگەی متمانە بێت و متمانە ئەدەن بە کەسێك کە جێگەی متمانە نیەو ناپاکە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوامان لێ دەکات لەگەڵ ئافرەتان و خێزانەکانمان چاك بین، ئەوا دەبێت باش بزانیت کەوا عاقیبەت و سەرەنجامی پشتگوێ خستنیان، مایەی کارەساتی دڵتەزێن و لێکترازانی گرنگترین بناغەی کۆمەڵگایە کە ئەویش خێزانە.

**با سەرنجێکی ئەم ئامارانە بدەین:**

تەنها ئەمریکا بە نموونە دێنینەوە، چونکە ئەو سەر مەشقی وڵاتە پێشکەوتوەکانە؟! بەڵێ.. لەم وڵاتەدا کە ئامارەکان زۆر ووردن، بەتایبەت لەسەر هاوسەرگیری‌و لێك جیابوونەوە لە هەندێك ساڵدا ڕێژەی تەڵاق دەگاتە٥٠٪ [1].

شایەنی باسە پارێزەرانی ئاگادار بە دادگاکانی هەرێمی کورستانیش هۆشداری دەدەن لەمەڕ لە ڕادەبەری بەرزبونەوەی ڕێژەی تەڵاق کە بە جۆرێك بۆتە مەسەلەیەکی دیار و ئاشکرا..

بەداخەوە.. زۆرێك لە ژنان لە کاتی پەیدابوونی کەمترین ناکۆکی داوای جیابوونەوە لە پیاوەکانیان دەکەن، یاخود ژن داوای جیابوونەوە دەکات ئەگەر ئەو ماڵ و سامانەی دەیەوێ لە پیاوەکەی پێی نەدات، هەندێ جاریش لەلایەن هەندێ لە خزمانی یان جیرانە تێکدەرەکانی هان دەدرێ، جاری واش هەیە بە چەند دەستەواژەیەکی بێزارکار ڕووبەرووی مێردەکەی دەبێتەوە، وەکو ئەوەی بڵێ: ئەگەر تۆ پیاوی تەڵاقم بدە.. شتێکی ڕوون و ئاشکرایە لە دەرەنجامی تەڵاق چەندین خراپەی گەورە دێتە ئاراوە، وەکو لێك هەڵوەشانەوەی خێزان و، پرش و بڵاوبوونی منداڵ، بێگومان کاتێکیش پەشیمان دەبێتەوە کە پەشیمانی دادی نادات، جا لەبەر ئەو هۆکارەو غەیری ئەوەش کار لە جێی شەریعەت دەردەکەوێ کاتی هاتووە ئەو کارەی حەڕام کردووە.

---

(١) www.kaheel7.com

پێشەوا ثەوبان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی:

هەر ژنێك بەبێ ئەوەی هیچ بیانویەکی هەبێت داوای تەڵاق لە مێردەکەی بکات، ئەوا بۆنی بەهەشتی لەسەر حەرامە"[1].

بەڵام ئەگەر بێت و بە هۆکارێکی شەرعی ئەو کارە بکات، وەکو نوێژنەکەری و ئالوودەبوونی مێردەکەی بە ماددەی هۆشبەرو سەرخۆشکارەکان، یان مێردەکەی ناچاری بکات کارێکی حەرام ئەنجام بدات، یان ستەمی لێ بکات بە سزادانی لەو کاتەدا ژنەکە هیچ تاوانی لەسەر نییە ئەگەر بۆ ڕزگاربوونی خۆی دینەکەی داوای جیابوونەوە بکات.

تەنها لە هەرێمی کوردستان لە (٢٠٠٩/١/٢) تاوەکو (٣٠/ ٩/ ٢٠١٩) مارەبڕین و تەڵاق بەم شێوەیە بوو:

| جۆری مامەڵە | هەولێر | سلێمانی | کەرکوك | دهۆك | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|
| مارەبڕین | ١١١٤٤ | ١١٠٣٣ | ١٩٣٣ | ٨٣٢٢ | ٣٢٤٣٢ |
| تەڵاق | ٣١١٥ | ٣٤٤٨ | ٦٨٩ | ١١٢٩ | ٨٣٨١ |

وە دڵنیابن لە ساڵی ٢٠٢٠ ڕێژەی تەڵاق زۆر زۆر زیاترە لە چاو ساڵی ٢٠١٩ بە پێی ئەو کێشانەی کە ئەمڕۆ خێزانەکان توشی یەکتر دەبن و بەرەزامەندی هەردوولا لە یەکتری جیا دەبنەوە.

---

(١) رواه الإمام أحمد (٥/ ٢٧٧) وهو في صحيح الجامع برقم: (٢٧٠٣).

# پێشبڕکێکردن لەسەر ماڵی دونیا

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر خەڵکانێك پێشبڕکێ دەکەن لەسەر داهاتی وڵات کە کامیان لە هەموویان دەوڵەمەندترە..

پێشەوا سەوبان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:

(إِنَّ اللهَ زَوَى لِي الْأَرْضَ، فَرَأَيْتُ مَشَارِقَهَا وَمَغَارِبَهَا، وَإِنَّ أُمَّتِي سَيَبْلُغُ مُلْكُهَا مَا زُوِيَ لِي مِنْهَا، وَأُعْطِيتُ الْكَنْزَيْنِ الْأَحْمَرَ وَالْأَبْيَضَ..)[١].

واتە: خودا زەوی بۆ ویك هێنامەوە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوام بینی، وە موڵکی ئومەتی منیش هەموو ئەو شوێنانە دەگرێتەوە کە من بینیم، وە هەردوو گەنجینەی سوور و سپیشم پێ بەخشراوە..

ئەمڕۆ بە چاوی خۆمان دەبینین کە موسڵمانەکان چۆن پێشبڕکێ دەکەن لەسەر ماڵی دونیا، هەتا وای لێ دێت هەندێك هەندێکی تر لەناو دەبات..

بە چاوی خۆمان بینیمان کە چۆن وڵاتی عێراق چووە سەر وڵاتی کوێت ئەمەش لەبەر خاتری نەفت و ماڵ بوو، ئەمەش درێژەی کێشا هەتا کار گەیشتە ئەو ئاستەی کە دوژمنان پەلاماری عێراق بدەن..

ئەگەر مرۆڤ هێز بداتە خۆی، دەگاتە مەبەست و ئامانجی تەنانەت دەتوانێت پێشبڕکێش ئەنجام بدات، لەبەر لەسەر حیسابی دینەکەی نەبێت.

هەر کەسێك بە ڕاستۆگیانە ڕێ بکات بەرەو خواناسی، ئەوا کۆسپی ڕێگاکانی بۆ ئاسان دەبێت و پێشبڕکی ناکات لەسەر ماڵی دونیا.

ناشبێ ئەوە لە بیر بکەین کەسانێك تووشی چەندین ناخۆشی بوونە، بەهۆی پێشبڕکێکردنی دونیا لە کاتێکدا ئاگایان لە قیامەت نەماوە.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢١٥) كتاب: الفتن، باب: هلاك هذه الأمة، برقم: (٢٨٨٩).

# پەیدابوونی وێنەی فۆتۆگرافی

لە نیشانە بچوکەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر کە ئەمڕۆ بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر سەری هەڵداوە کامێرای فۆتۆگرافیە..

لە سەردەمانی ڕابردوو درروستکردنی وێنە بە پێنوس بوو یان دروست دەکرا لە ڕێگای جل و بەرگەوە، بەڵام لەم سەردەمەی ئەمڕۆ کە مرۆڤایەتی پێش کەوتووە کامێرای فۆتۆگرافی دروست کراوە، بۆیە دەتوانین بە کامێرای فۆتۆگرافی وێنەی مرۆڤ و ئاژەڵ و گژوگیا و بێگیان بگرین لە چرکەیەك، تەنانەت مزگەوتەکانی ماڵی خوای گەورەش وێنەیان دەگیرێت کە لە فەرموودەی پێغەمبەری خواوە هاتووە.

پێشەوا حوزەیفەی کوڕی یەمان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مِنِ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ خَصْلَةً: إِذَا رَأَيْتُمُ النَّاسَ .. وَصُوِّرَتِ الْمَسَاجِد ..)[1].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر حەفتاو دوو تایبەتمەندە: هەر خەڵکانێکتان بینی.. وێنەی مزگەوتەکانیان گرت.

تەنانەت لە هەندێك لە دەوڵەتەکان وەك تورکیا ژمارەیەکی زۆر لە مزگەوتە کۆن و ناودارەکان کراونەتە مۆزەخانەو هەوارگەی گەشتیاران، کە ڕۆژانە هەزار گەشتیار لە (جوولەکەو گاورو بوزی و گاپەرستەکان) بە شۆرت و مایۆی غەربیەوە ڕووی تێدەکەن و تیایدا دەسوڕێنەوەو بە کامێرەکانیان وێنەی دەگرن ، وە تەنها نوێژی جومعە نەبێت ڕێ نادرێت نوێژەکانی تری تێدا بکرێت، ئەگەر لە ڕۆژەکانی تردا لە عەدەسەی دەیان کامیرای گەشتیارە بیانیەکان ڕووی تێدەکەن و وێنەی دەگرن وەك ئەوەی شتێکی زۆر سەیرو سەمەرەیان بینیبێ کەسێك لە ناو مزگەوتدا نوێژ بکات..

---

(١) حلية الأولياء، لأب نعيم (٣/ ٤١٠)، بة ذمارة (٤٥٥٥). وهو ضعيف كما قال الحافظ العراقي ( ٢٩٧/٣).

# پەیدابوونی قورئان خوێنە فاسقەکان

لە نیشانە بچوکەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بوونەوەر قورئان خوێنی فاسق زۆر دەبێت..

پێشەوا حوزەیفەی کوڕی یەمان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مِنِ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ خَصْلَةً :... وَالْقُرَّاءُ فَسَقَةً...)(١).

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر حەفتاو دوو تایبەتمەندە:.. کە قورئان خوێنەکان فاسق بوون..

ئەم فەرموودەیە زیاتر ئەوە دەگەیەنێت کە قورئان خوێنەکان و زاناکان خوا پەرستیان پێوە دیار نامێنێت، تەنانەت هەندێکیان ئەوەندە دووڕوو دەبن وەکو جولەکەکانیان لێ دێت، یان جاری وا هەیە خۆی ئەوەندە بە پیاو چاك نیشان دەدات لە کاتێکدا گورگە لە پێستی مەڕی.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يَخْرُجُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ رِجَالٌ يَخْتِلُونَ الدُّنْيَا بِالدِّينِ، يَلْبَسُونَ جُلُودَ الضَّأْنِ مِنَ اللِّينِ، أَلْسِنَتُهُمْ أَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ، قُلُوبُهُمْ قُلُوبُ الذِّئَابِ، يَقُولُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَفَبِي يَغْتَرُّونَ أَمْ عَلَيَّ يَجْتَرِئُونَ؟ فَبِي حَلَفْتُ لأَبْعَثَنَّ عَلَى أُولَئِكَ مِنْهُمْ فِتْنَةً تَدَعُ الْحَلِيمَ فِيهِمْ حَيْرَانَ)(٢).

زمانیان کە شرینە وەکو هەنگوین بەڵام دڵیان دڵی گورگە، کوردەواری دەڵێت: گورگن لە پێستی مەڕدان.. وە کردەوەی خواپەرستیان ئەوەندە جوان ئەنجام دەدەن لە پێش چاوی خەڵکی زۆربەیان بۆ ڕووبامایيە.

---

(١) ضعيف: حلية الأولياء، لأبي نعيم (٣/ ٤١٠)، بە ژمارە (٤٥٥٥). وهو ضعيف كما قال الحافظ العراقي ( ٢٩٧/٣).

(٢) ضعيف: تخريج أحاديث المصابيح ، الصفحة أو الرقم: (٤٢٠/٤) خلاصة حكم المحدث: في سنده يحيى بن عبيد الله بن عبد الله بن موهب، قال الذهبي ضعفوه ..

## خۆچوواندنی پیاوان بە ئافرەتان و ئافرەتانیش بە پیاوان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر کە ئەمڕۆ بە هەردوو چاوانی خۆمان دەیانبینین خۆچواندنی پیاوانە بە ئافرەتان و ئافرەتانە بە پیاوان.

پێشەوا حوزەیفەی کوڕی یەمان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مِنِ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ خَصْلَةً : إِذَا رَأَيْتُمُ النَّاسَ .. وَتَشَبَّهَ الرِّجَالُ بِالنِّسَاءِ ، وَالنِّسَاءُ بِالرِّجَالِ ..)[1].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر حەفتاو دوو تایبەتمەندە: هەر خەڵکانێکتان بینی.. پیاوان خۆیان بە ئافرەتان چواند یان ئافرەتان خۆیان بە پیاوان چواند.

ئەگەر سەیری ئەم فەرمودەیە بکەین دەزانین کە ئەمڕۆ خوشکانمان جلی پیاوان لەبەر دەکەن و جلیان کورتەو قژیان کورت دەکەنەوە وەکو پیاوان و پانتۆڵ لەبەر دەکەن بە هەموو جۆرەکانیەوە.. بەهەمان شێوە پیاوان جلی ئافرەتان لەبەر دەکەن جا بۆ شانۆ بێت یان شتی تر... دواتر پیاوان خەناوکە لە مل دەکەن و گوارە بە گوێچکەکانیانەوە بەدی دەکرێ بەناوی ئازادی..

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی پیاوانێك خۆیان دەچوێنن بە ئافرەتان و بە پێچەوانەوەش... یان گۆڕانکاری دەکەن بەسەر دروستکراوەکانی خوای گەورە..

---

(١) ضعيف: حلية الأولياء، لأب نعيم (٣/ ٤١٠)، به ژماره (٤٥٥٥). وهو ضعيف كما قال الحافظ العراقي ( ٢٩٧/٣).

خۆچواندنی ڕەگەزی نێرو مێ بە یەکتر لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەرە، دەرچوونی مرۆڤ لە سروشتی خۆی دنیا بەسەریەکدا تێك دەدات.. چونکە دەرچوونی مرۆڤ لە فیترەتی خۆی بە ئاگا هێنانەوەیە بە تیاچوونی بوونەوەر.

سەبارەت بە خۆشوبهاندنی پیاوان بە ئافرەتان و ئافرەتان بە پیاوان، پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێت: خوا نەفرەتی کردووە لەو ئافرەتانەی کە خۆیان بی پیاو دەشوبهێنن، وە لەو پیاوانەش کە خۆیان بە ئافرەت دەشوبهێنن.

لە فەرمودەیەکی تر فەرموویەتی: خوا نەفرەتی کردووە لەوانەی کە خاڵ دەکوتن و لەوانەش کە خاڵەکەیان بۆ دەکوتیٚ، وە لەوانەش کە موو هەڵکێشی دەم و چاون و لەوانەش کە بۆیان هەڵدەکێشرێت، وە لەوانەش کە نێوانی دانەکانیان بڵاودەکەنەوە بۆ جوانی و ئەوەی خوا دروستی کردووە دەستکاری دەکەن و دەیگۆڕن.

یەکیٚ لەو سروشتەی خوای گەورە بۆ بەندەکانی دایناوە ئەوەیە پیاو پارێزگاری لەسەر ئەو پیاوەتیەی خۆی بکات، کە خوا لەسەر ئەو شێوەیە دروستی کردووە، هەروا ژن پارێزگاری لەسەر مێینایەتی خۆی بکات، کە خوا لەسەر ئەوە دروستی کردووە، ئەوەش یەکێکە لەو هۆکارانەی، کە ژیانی خەڵك بەبیٚ ئەوە ڕاست نابێت، خۆوێچواندنی پیاوان بە ژنان و، ژنان بە پیاوان پێچەوانەی ئەو سروشتەیە، هەروەها دەرگایەکە بۆ خراپەکاری و، بانگەشەیە بۆ لەبەر یەکهەڵوەشانەوەی کۆمەڵگا، یاسای شەرعیش بەرامبەر ئەو شتە حەرامکردنە، ئەگەر لە دەقێکی شەرعیدا نەفرەت لە بکەری کارێك کرا، ئەوە بەڵگەیە لەسەر حەرامی ئەو کارەو یەکێکیشە لە گوناهە گەورەکان.

تەنانەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفرەتی کردووە لەو پیاوانەی خۆیان بە ژنان دەچوێنن هەروا لەو ژنانەی خۆیان بە پیاوان دەچوێنن[1].

بۆیە دروست نییە بۆ پیاوان ملوانکەو بازن و خرخاڵ و گوارەو وێنەی ئەمانەش بەخۆیانەوە بکەن، هەروەها دروست نییە بۆ ژنان شتێك لەبەر بکەن تایبەت بیٚ بە پیاوان وەکو بەرگ و پۆشاك و وێنەی ئەمانەش، بەڵکو واجبە پێچەوانەی پیاوان بێت لە شێوەو هەڵسوکەوتی دا، بەڵگەشمان لەسەر ئەوەی واجبە هەر یەك لە هەردوو ڕەگەزەکە پێچەوانەی یەکتربن لە بەرگ و پۆشاکدا..

---

(١) صحيح البخاري (١٠/ ٣٣٢).

# دڵخۆشبوون بە هۆی سوجدە بردن

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی سوجدە بردن ئەوەندە دڵخۆشی بە مرۆڤ دەبەخشێت تەنانەت ئامادەیە هەموو شتێك لە پێناویدا بکات بە قوربانی، تەنها بۆ بە دەست هێنانی دڵخۆشی خۆی..

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لا تقوم الساعة حَتَّى تَكُونَ السَّجْدَةُ الْوَاحِدَةُ خَيْرًا مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا)[١].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا وای لێ دێت تاکە سوژدەیەك بۆ خوای گەورە چاکتر دەبێ لە دونیا و ئەوەی تێی دایە.

ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوونە کە خەڵکی لە گەندەڵیەکی زۆر دەژیەت و واز لە خوا پەرستی دەهێنن و بە دوای شەهەوات و ئافرەت دەکەون، وە ئەوانەی ڕوو لە مزگەوتن ژمارەیان ئەوەندە کەمە بۆیە خوای گەورە پاداشتیان بە چەندین جار دەداتەوە ئەگەر ڕوو لە خوا بکەن.

پێشەوا مەعدانی کوڕی ئەبی تەڵحە (ﷺ) دەڵێت: گەیشتم بە سەوبان خزمەتکاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) و گوتم: هەواڵم بدەرێ بە کردەوەیەك کە ئەنجامی بدەم و بە هۆیەوە خوای گەورە بمخاتە بەهەشتەوە، ئەویش بێدەنگ بوو (هەتا سێ جاران)، ئینجا فەرمووی: منیش ئەو پرسیارەم کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش فەرمووی: زۆر سوجدە ببە بۆ خوای گەورە، چونکە تۆ یەك سوجدە نابەیت بۆ (الله) بەهۆی ئەو سوجدەیەوە پلەت بەرز دەبێتەوەو تاوانێکیشت لەسەر لادەچێت[٢].

---

(١) موارد الظمآن بزوائد ابن حبان (١٨٨٨) ورواه بسند صحيح كما يقول الهيثمي..

(٢) صحيح مسلم، برقم: (١٠٩٣).

# بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی گۆی زەوی

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی گۆی زەویە، هەتا وای لێدێت لە تینی گەرمای وەرزی هاوین باران دەبارێت..

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مِنِ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ خَصْلَةً: .. وَكَانَ الْمَطَرُ قَيْظًا ..)[١].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر حەفتاو دوو تایبەتمەندە.. وە هەتا باران لە تینی گەرمایی وەرزی هاوین دەبارێت .

لە ڕیوایەتێکی تر دەفەرموێ: (لا تقوم الساعة حتى ... يكون الشتاء قيظًا)[٢].

ئەم دوو ڕیوایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە وەرزی زستان گەرم دەبێت، بەڵام لێرەدا پرسیارەك دروست دەبێت، ئایا ئەم فەرموودەیە هەواڵی ئەوەمان پێدەدات کە وەرزی زستان بکەوێتە نێو وەرزی هاوینەوە؟

ئەوەی کە دیارە وەرزی زستان لە مانگی کانونی یەکەم لە مانگی دوانزە دێت و، وە وەرزی هاوین لە حوزەیران کە دەکاتە مانگی شەش دەست پێدەکات..

لێرەدا پرسیارەك دروست دەبێت کە ئایا ئەم فەرموودەیە باسی ئەوە دەکات وەرزی زستان لە مانگی دوانزە زۆر گەرم دەبێت ؟

---

(١) رواه الطبراني في الأوسط والكبير، وفيه سيف بن مسكين وهو ضعيف. وحلية الأولياء، لأبي نعيم (٣/ ٤١٠)، برقم: (٤٥٥٥). حديث مرفوع، غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ، لَمْ يَرْوِهِ عَنْهُ فِيمَا أَعْلَمُ إلا فَرَجُ بْنُ فَضَالَةَ . وهو ضعيف كما قال الحافظ العراقي ( ٢٩٧/٣).

(٢) ضعيف: أخرجه ابن عساكر في تاريخ دمشق (٤٥٣/٧) والطبراني في « المعجم الكبير» (٢٢/٣٧٦/ ٩٤١) وابن عساكر في التاريخ(١٠٢٩/٨) وقال الألباني في السلسلة الضعيفة: ضعيف.

دەتوانین بڵێین:

ئەمە دوو تەفسیری لە خۆی دەگرێت..

**یەکەم:** وەرزی زستان لە مانگەکانی هاوین دێت، کە نامەوێت بچمە ناو قوڵایی بابەتە زانستیەکەوە..

**دووەم:** وەرزی زستان دەکەوێتە ناو وەزری زستانەوە لە مانگی دوانزەی کانونی یەکەم، بەڵام مرۆڤ هەست بە ساردی ئەم وەرزە ناکات.. ئەمەش بە هۆکاری گەرمبوونی گۆی زەویەوە پلەکانی گەرما لە بەرزبوونەوەدایە.. بۆیە ئەمەش فەرموودەکانی پێغەمبەری خۆشەویستی تێدا دەسەلمێنرێت..

ئەمەش لە وڵاتانی ئەفەریقیاو ئەمریکای باشور بەدی دەکرێت.. وە لەوانەشە هەموو جیهانیش بگرێتەوە..

چونکە ئەو ساتەی خۆم لە وڵاتی سودان بووم لە کاتی تاقیکردنەوەکانی ماستەرو دکتۆرا لە لە مانگی حەوتی هاوین باران دەباری..

بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی گۆی زەوی چیە؟

یەکێکە لەو مەترسیانەی کە بووەتە جێگای سەرنجی زانایان و پسپۆران بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی گۆی زەویە..

زاناکان لەم بڕوایەدان کە زۆرترین پلەی گەرما لە ماوەی نێوان سەردەمە سەهۆڵیەکاندا کەمێك لە گەرمی ئێستاکە بەرزتر بووە، بەڵام گومانیان هەیە لەوەی کە گەرمتر بوویێت تا ٦ پلەی سیلیزی.

گەرمبوونی گۆی زەوی هەڕەشەیەکە بۆ ئاوارە بوونی ملیۆنەها کەس لە جیهاندا، بۆیە لە (٦ نیسانی ساڵی/٢٠٠٧) لە لایەن کۆمەڵێ پسپۆڕی کەشناسییەوە لە (برۆکسڵ) سەبارەت بە دیاردەی گەرمبوونی زەوی، ڕاپۆرتەکی (١٤٠٠) لاپەڕەیی بڵاوکرایەوە، کە ئەگەر پلەی گەرمی بە راورد لەگەڵ ساڵی (١٩٩٠) دوو تا سێ پلەی سەدی بەرز بێتەوە، ئەوا کاریگەریەکی سلبی

بەرگی دووەم

لە سەرجەم ناوچەکانی جیهان دەبێ، زاناکان وای دادەنێنن کە (٢,٣) ملیار کەس دووچاری بێ ئاوییەکی زۆر دەبن و (٦٠٠) ملیۆن کەسیش دووچاری کەمی خۆراك دەبنەوە ئەمەش بە هۆی تێکچوونی خاکەوە، وە نزیکەی (٢ هەتا ٧) ملیۆن کەس دەکەونە ژێر لافاوەوە، بە تایبەتی لە کەنارەکانی دەڵتای ڕۆژئاوای ئاسیاو ئەفەریقیاو میسرەوە، وە ئەگەر پلەی گەرمی بە تێکڕای (٥,١-٥,٢) پلەی سەدی بەرز بێتەوە ئەوا بە ڕێژەی (٢٠-٣٠٪) لە جۆرەکانی ڕووەك و گیاندار لە ناودەچن.. تانموری دەڵێ: ترسناکترین ڕێگە چارە ئەوەیە، کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی بێ دەنگی لەو کارەساتە بکات[1].

د.لویس سایم دەڵێ:

دەرەنجامەکانمان ئەوە دەردەخەن کە جەمسەری باشور لەناکاو گەرم داهاتووە بەڵام لە ماهیەتی گەرمیەکە هیچ نازانین و، لەوانەشە بەهۆی ئاستی بەرزتری دوانە ئۆکسیدی کاربۆن لەو شوێنەی گۆی زەویدا سیستەمی گەرمایی جەمسەری باشور تۆزێك هەستیار بێت بۆ گۆڕانی لەناکاو.

پسپۆڕی بواری ژینگە لە زانکۆی ئالاسکا (جۆن ولش) دەڵێ:

ئێمە دڵنیایین کە لە تواناماندا نیە بەم زووانە شەمەندەفەرە خێراکە بوەستێنن، من دڵنیام لە ڕاگرتنیدا دەستەوسانین، وە هەندێك لە زانایان پێیان وایە بارودۆخەکە لە کۆنترۆڵکردن دەرچووە، تەنانەت زۆرێك لە زانایانی کەش و هەوا دەڵێن: کە ئێمە گەیشتووینەتە قۆناغێك کە گەڕانەوەی تێیدا نیەو کارەساتەکانی پەنگخواردنەوەی گەرمایی تەنیا چەند دەیەیەك لە ئێمەوە دوورەو پرۆسەی دواخستن و ڕاگرتنیشی پێویستی بە هەوڵێکی چڕی دوو لایەنە هەیە، کە دەبێ بەرپرسەکان و هاوڵاتیان بەشداری تێدا بکەن..

کۆنگرەیەکی زانستی لە ساڵی ٢٠٠٨ ع لە بەریتانیا جەختی کردوە کە بەرزبوونەوەی پلەکانی گەرمای زەوی بە ڕێژەی (٣) پلە، چەندین کارەساتی ژینگەیی لێ دەکەوێتەوە، وەکو توانەوەی بەستەڵەکی (گیریلاند).

---

(١) ڕۆژنامەی سارێژ، ژمارە ٣٨/١٥-٤/٢٠٠٧، کوردستان

بە پێی لێکۆڵینەوە مەیدانیەکانی ئەو بوارەش کە زاناکان دەستیان کەوتووە ڕوون بووەتەوە کە ڕێژەکانی گەرمایی ئێستا لە هەرێمی بەستەڵەکی باشوردا، زۆر لەو گەرمایە نزیکە کە دوورگەی گیریلاند (١٣٠) هەزار ساڵ بەر لە ئێستا بەو هۆیەوە بینیویەتی، کاتێك ئەو توێژە بەفرە چڕەی کە زۆربەی ڕووی زەوی داپۆشیبوو لە ئاکامی بەرزبوونەوەی پلەکانی گەرما کەوتە توانەوە، ئەگەر بارودۆخەکەیش وەکو ئێستا بەردەوام بێ ئەوا پێشبینی دەکرێ لە دەوروبەری ساڵی (٢١٠٠) ع هەرێمی بەستەڵەکی باشوور بەرزبوونەوەیەکی زۆری پلەکانی گەرما بەخۆیەوە ببینێ، بە تایبەتی لە هەردوو وەرزی هاوین و بەهاردا، بەمەیش ئەو حاڵەتە دووبارە دەبێتەوە کە هەزاران ساڵ بەر لە ئێستا ڕوویدا، کاتێك قەبارە بەفرییە گەورەکان یەك لە دوای یەك دەتوانەوە، بە تێپەڕبوونی کاتیش بەفرە تواوەکە دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی ڕاددەی ئاو لە دەریاو ئۆقیانوسەکان و نغۆربوونی چەندین شاری گەورەی جیهان و ژێر ئاوکەوتنی چەندین دوورگە وەکو دورگەی (باهاما).

ڕیچارد ئالی دەڵێت: قەبارەی بەفرە گەورەکان هەرێمی بەستەڵەکی باشورو گیریلاند زۆر لەو خێراییە زووتر دەتوێنەوە کە زانایان پێشبینیان دەکرد، چونکە (٥) ساڵ لەمەوبەر توێژەران پێشبینیان کردبوو قەبارە بەفرییە گەورەکان کۆببنەوەو تا ساڵی (٢١٠٠) نەتوێتەوە، بەڵام پرۆسەی توانەوەکە سەدەیەك بەر لە وادەی چاوەڕوانکراو دەستی پێ کردو ئەوەیش بەڵگەیە لەسەر ئاڵۆزیی بارودۆخەکەو مەترسی لەسەر زۆربەی ئەو ناوچانەی کە هەڕەشەی نغۆربوونیان لێ دەکرێ.. بەڕاستی پلەی گەرمی گۆی زەوی ئەم هەسارەیەمان دەخاتە مەترسیەوە. وە دیاردەی قەتیسبوونی گەرماو گۆڕانی ئاو و هەوای سەر زەوی، بووەتە کێشەیەکی جیهانی، لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەکان ئەوە نیشان دەدەن کە هەستکردن بەم دیاردەیە، مێژوویەکی دووری هەیە، بەڵام کاردانەوەی مرۆڤ لەمبارەیەوە سست بووە.

لیندرۆن جۆنسۆن سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی (١٩٦٥) لە نامەیەکیدا بۆ کۆنگرێسی ئەمریکی نووسیویەتی و دەڵێت: ئەوەی

بەرگی دووەم

ئێستامان بە دیاردەیەك ئاشنا دەبێت، کە لەسەر ئاستی جیهان دەبێت کە ئەویش دیاردەی بڵاوبوونەوەی گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆنە لە ئەنجامی سووتانی سووتەمەنی پیشە سازیەکانەوە، کە دەبێتە هۆی گەرمبوونی گۆی زەوی..

(مارگرێت تاتچەری) سەرۆك وەزیرانی پێشووی بەریتانیا، لە ساڵی (١٩٨٨) دەڵێت: کێشەی گۆڕانی ئاوو هەوای جیهان یەکێکە لەو کێشانەی کە کاریگەری لەسەر هەمووومان دەبێت.. وە هەر یەکێك لە شارەکانی (داکاو مانێلاو جاکارتا) سەرەکیترین ئەو شارانەی کیشوەری ئاسیان، کە بەهۆی گۆڕانکاری کەش و هەواوە ڕووبەڕووی مەترسیەکانی بەرزبوونەوەو نزمبوونەوەی ئاستی ئاوی دەریا دەبنەوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی ئەو شارانە چەند مەترێك لە ئاستی دەریا بەرزترن.. بۆیە گەرمبوونی گۆی زەوی لە ڕووی ئابووریەوە وڵاتەکان توشی زەرەرو زیانێکی یەکجار گەورە دەکەنەوە، ئەمە لە کاتێکدایە کە تێچوونی بەرەنگاربوونەوەی ئەو دیاردەیە تەنها لە ١٪ تێکڕای بەرهەمی ناوخۆیی جیهانە کە ئەو ڕێژەیەش بەبەراورد لەگەل ئاستی زەرەرو زیانەکان ڕێگەیەکی زۆر کەمە.. وە ئەو زیانانەی کە بەهۆی گەرمبوونی گۆی زەوی ڕووبەڕووی جیهان دەبێتەوە زۆر گەورەو چاوەڕواننەکراوە، تەنانەت لەسەرتاسەری جیهان نزیکەی ٩٠٪ ی ڕووداوە سروشتیەکان کەوتونەتە بەر هەڕەشەو مەترسیەوە، کە جیهان لە ماوەیەکی کەمدا کۆتایی پێ بێت و حەشرو حیساب دەست پێ بکات.. چونکە جیهان ڕووبەڕووی گەلێك کێشەی گەورە دەبێتەوە، ئەویش بەهۆی گۆڕانکارییەکانی ئاوو هەواوەو سەرتاپای مرۆڤایەتی دەکەونە ڕەوشێکی نا ئارام و مەترسی، ئەمەش هەڕەشە لە زۆرێکی دانیشتوان دەکات.

وە کارەساتێکی دڵتەزێن لە ڕێگادایەو گەورەترین مەترسیش لەسەری کارەساتێکی گەورەی مرۆییە، کە بە هۆی نەپاراستنی ژینگەوە ڕەنگە ڕووبەڕووی بونەوەر ببێتەوە.

بەرگی دووەم

# تووشبوون بە وەسوەسەی شەیتان سەبارەت بە بوونی خوای گەورە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی هاتنی بونەوەر خەڵکی تووشی وەسوەسەی شەیتانی دەبێت سەبارەت بە بیرکردنەوەی خوای گەورە..

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يُوشِكُ الناسُ يتساءلونَ، حتى يقولَ قائِلُهم: هذا اللهُ خلق الخَلْقَ فمَن خلق اللهَ ؟ فإذا قالوا ذلك فقولوا: اللَّهُ أَحَدٌ، اللَّهُ الصَّمَدُ، لَمْ يَلِدْ ، وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ ثم لِيَتْفُلْ عن يَسَارِهِ ثلاثًا ولْيَسْتَعِذْ من الشيطانِ)[1].

واتە: نزیك بۆتەوەو هێندەی نەماوە وای لێ بێت، خەڵکی پرسیار بکەن و یەکێکیان بڵێت: ئەوە خوایە مەخلوقاتی دروست کردووە، ئەی کێ خوای دروست کردووە؟ جا ئەگەر وایان وت: ئێوەش بڵێن: (اللَّهُ أَحَدٌ ، اللَّهُ الصَّمَدُ ، لَمْ يَلِدْ ، وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ) ئینجا با سێ جار تف بکاتە چەپی و پەنا بەخوا بگرێت لە شەیتان..

پێویستە ئەو کەسەی دووچاری ئەو وەسوەسەیە بوو بە گوێرەی توانا لەسەر خۆی لا ببات، وە لابردنی بە زۆر بە زیکرو یادی خودا کردن دەبێت، و پارێزگاریکردن دەبێت لە زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران و زیکری چوونە ماڵ و جگە لەمانەش، هەروەها زۆر بپاڕێتەوە بەوەی خودا ئەو وەسوەسەی لەسەر لابەرێت و، زۆر پێداگری بکات لەسەر پاڕانەوەدا، وە پێویستە لەسەری تەسلیمی وەسوەسەی شەیتان نەبێت، و بزانێت هەموو ئەو شتانەی کە تووشی دەبن بە قەزاو قەدەری خودایە، هەمیشە پشت بەخوا ببەستێت و کارەکانی بداتە دەستی، و بزانێت کە هەموو خەڵکی کۆببنەوە بۆ ئەوەی سوودێکی پێ بگەیەنن ناتوانن ئەو سوودەی پێ بگەیەنن تەنها ئەوە نەبێت کە خودا بۆی نوسیوە، وە ئەگەر

---

(١) صحيح الجامع ، بە ژمارە: (٨١٨٢).

بەرگی دووەم

هەموو خەڵکی کۆببنەوە بۆ ئەوەی زیانێکی پێ بگەیەنن، ناتوانن ئەو زیانەی پێ بگەیەنن تەنها ئەوە نەبێت کە خودار لەسەری نوسیوە.

## بەرزکردنەوەی پایەی مینبەرو بڵندگۆکان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر کە لەم سەردەمەدا دەیبینین بەرزکردن و درێژکردنی پایەی مینبەرە، کە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سێ پایە بوو، بەڵام ئەمڕۆ زیاتر گەیشتۆتە بیست پایە..

سەرەتا بڵندگۆکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دارخورمایەك بوو، پاشان فەرمووی: بڵندگۆیەکم بۆ دروست بکەن، کاتێك بۆیان دروست کرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەریدا سەرکەوت، بڵندگۆی دارخورماکە بە جۆرێك ئازاری پێگەیشت ئەوەی لەو مزگەوتەدا بوو گوێی لە گریان و هەنسکی ئەو بڵندگۆ دارخورمایە بوو پاش هاتنە خوارەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

پاشان فەرمووی: ئەو لقە دارە بخەنە ژێر سەربانی مزگەوتەکە نەبادا خۆڵ دایبرژێنێ چونکە زۆر خزمەتی کردین، ئەمەش جۆرێك بوو لە وەفاداری پێغەمبەر (ﷺ) بۆ دارێك.

هەر کاتێك پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ﷺ) سێ پلە بەسەر بڵندگۆکەدا سەر بکەوتایە ئەو کاتە ڕووخسارو دەست جولاندن و شێوە نیگای دەم و چاوی دەردەکەوت، بەڵام ئەو کاتەی بڵندگۆکان بەرزکرانەوە ئیتر خەڵکی لێیان دابڕاو ئەو پێککگەیشتنە تەواو بوو دڵەکان بەرەو دارمان چوون..

ئەگەر دڵەکان بوونە وێرانە ئەوا باوەڕیش دەبێتە هەڵم بە جۆرێك دڵ ڕەق و کینەو ئێرەیی بردن وێرانی دەکەن و سنورەکانی خوا پەکیان دەکەوێت، دیارە سنوری خوا قورئانی بە پێزە، داوێن پیسی و دزی و ناوزڕاندن و تۆمەت خستنە پاڵ ئافرەت و لەکەدارکردنی، پەکخستنی سنورەکانی پەروەردگار

مایەی نەگبەتین بۆ خەڵكی، چونكە سنورەكانی خوای گەورە كۆمەڵگە بەرەو چاكسازی دەبات ئەگەر یەك سنوور لە سنورەكان لە نێو كۆمەڵگادا جێبەجێ بكرێت باشترە بۆیان لەوەی (٧٠) پایز بارانیان بۆ ببارێت.

پێشەوا حوزەیفەی كوری یەمان(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مِنِ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ خَصْلَةً: .. وَطُوِّلَتِ الْمَنَائِرُ)[1].

واتە: لە نیشانەكانی نزیكبوونەوەی كۆتایی بونەوەر حەفتاو دوو تایبەتمەندە.. لەوانە درێژكردنەوەی مینبەرەكانە.

زۆر جاران هەندێ مزگەوت دەبینین زۆر گەورەیە تەنانەت منارەكان و مینبەرەكانیان زۆر ڕازانراوەتەوە، جا لە هەمووی سەیرتر ئەو كاتەی ئیفرنجیەكان چوونە ناو مزگەوتی ئەقصا مینبەرەكەیان دزی كە هەمووی لە زێر دروست كرابوو.

هەندێك مزگەوت لە شاری كوردستانی خۆمان و هەولێر بەتایبەتی هەن منارەكان و مینبەرەكانیان ئەوەندە بەرزكراونەتەوە بە دەیان سەدان هەزار دۆلاری تێچووە، كە هیچ گومانیش نییە لەوە كە ئەمە ئیسرافە.

بەداخەوە.. ئەم سەردەمە سەردەمی فیتنەو ئاشوبە، تەنانەت حەقی مینبەر زۆر بە كەمی دەدرێت، ئەگەر ئامادە نەبووی قسەی حەقیش بكەیت ئەوە ئامادە مەبە كە قسەی ناحەقیش بكەیت.

گەورەترین پێگەی مرۆڤایەتی و گەورەكردنیان مینبەری پێغەمبەری خوایە (ﷺ) كە هەمیشە مرۆڤەكان و وتاربێژەكان گەورە دەنرخێنێت.

---

(١) حلية الأولياء وطبقات الأصفياء، ژمارە (١١٨١).

# خواردنەوەی مەی بە ئاشکرا

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر مەی خواردنەوە بە ئاشکرا دەخورێتەوە..

خوای گەورە دەفەرمویٚ: [يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾][1].

واتە: ئەی کۆمەڵی باوەڕداران بە ڕاستی خواردنەوەی ئارەق و قومارکردن و پەرستنی بتەکان و بەکارهێنانی ئەزلام پیسن و کردەوەی شەیتانن دووربکەونەوە لێیان تاکو براوەو سەربەرزبن و خوای گەورە پاداشتی گەورەتان پیٚ بدات .

لەم ئایەتەدا خوای گەورە فەرمانی کردووە بە دوورکەوتنەوە لە ئارەق کە بە هێزترین بەڵگەیە لەسەر حەرام بوون.

فەرمان کردن بە وشەی (اجتناب) خۆ بەدورگرتن لە بەهێزترینی بەڵگەکانە لەسەر حەرامکردن.. بێگومان خوای گەورە (خمر) شەراب (الأنصاب)ی بەرامبەر یەك کردووە، کە پەرستراو و بتەکانی بیٚ باوەڕان بوون، هیچ بەڵگەیەك بە دەستی ئەو کەسانەوە نەماوە، کە دەڵێن: نەی فەرمووە حەرامە، بەڵکو فەرموویەتی خۆی لیٚ بە دوور بگرن.

جاران هەندیٚ کەس دەیانگوت:

خواردنەوەی مەی بە کەمێك هیچ زیانێکی نیە، تا دکتۆرە (سارا لویس) لە زانکۆی بریستۆڵ و کۆمەڵێك لێکۆڵەری تر سەلماندیان خواردنەوەی کەمێکی مەی زیانبەخشەو کاریگەری بۆ دمیەها ڕۆژ دەمێنێت لەسەر لەش، ڕەنگە ئەمەش هۆیەکی ئەوە بێت کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووی: ئەوەی مەی بخواتەوە تا چل ڕۆژ نوێژی لیٚ وەرنا گیرێت.

---

(١) سورة المائدة، الآية: (٩٠).

پێشەوا ئەنەسی كوری مالیك (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يُرْفَعَ الْعِلْمُ ، وَيَثْبُتَ الْجَهْلُ ويظهر الزنا ويشرب الخمر)[1].

واتە: لە نیشانەكانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە كە زانست هەڵدەگیرێت و نەزانین دەچەسپێت، وە زینا سەرهەڵدەدات و مەی خواردنەوە زۆر دەبێت و بە ئاشكرا دەخورێتەوە.

هەروەها با ئەوەشمان لە یاد بێت كە دەفەرموێت: (إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَجْعَلْ شِفَاءَكُمْ فِيمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ)[2].

واتە: خوا چارەسەری ئێوەی نەخستۆتە ئەو شتانەوە كەلەسەری حەرام كردوون.

پزیشكەكانی زانكۆی بەریتانی دڵ جەخت دەكەنە سەر ئەوەی كە هەرگیز مەی دەرمان نیەو ئەمەش هەمان فەرمودەكەی پێغەمبەر(ﷺ) دەسەلمێنێت.

پێشەوا جابری كوری عەبدوڵلا (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (إِنَّ عَلَى اللهِ عَزَّ وَجَلَّ عَهْدًا لِمَنْ يَشْرَبُ الْمُسْكِرَ أَنْ يَسْقِيَهُ مِنْ طِينَةِ الْخَبَالِ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَا طِينَةُ الْخَبَالِ؟ قَالَ: عَرَقُ أَهْلِ النَّارِ أَوْ عُصَارَةُ أَهْلِ النَّارِ)[3].

واتە: خوای گەورە پەیمانێكی داوە بە هەر كەسێك كە ئارەق بخواتەوە ماددەیەكی سەرخۆشكەری پێیان دەدات كە (طِينَةِ الْخَبَالِ) پێیان فەرموو:

ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) (طِينَةِ الْخَبَالِ) چیە؟

فەرمووی: عەرەق و كێم و زوخاوی دۆزەخە.

بەڵێ.. مەی خواردنەوە ئەمرۆ بۆتە شتێكی عادەتی و هیچ غەریب نیە بە هەر شارو شارۆچكەو ئاواییەكی موسڵمانانادا بڕۆیت چەندین باڕو مەی خانەو دوكانی

---

(١) صحيح البخاري (٩/ ٣٣٠) كتاب: النكاح باب: يقل الرجال ويكثر النساء، برقم: (٥٢٣١).

(٢) صحيح البخاري (٧/ ١٤٣) باب: شراب الحلواء والعسل، برقم: (٥٦١٣).

(٣) صحيح مسلم (٣/ ١٥٧٨) باب: بيان أن كل مسكر خمر، برقم: (٢٠٠٢).

مەی فرۆشتن دەبینیت، تەنانەت دوکانەکانی مەی فرۆشتن لە هەر شارێکدا بگەڕێیت دەیان ئەوەندەی کتیبخانەکان دەبن، وە لە هەوارگەو سەیرانەکانیشدا زۆربەی خانەوادەکان بە پیاو ژن و منداڵەوە بەشدار دەبن لە مەی خواردنەوە.

مەی لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان بە شێوەیەکی بەرفرەوان بڵاوبۆتەوە، ڕاستە ئەوانە گەیشتوونەتە سەر مانگ بەڵام قاچەکانیان تا ئێستاش لەناو قوڕدا نغرۆربووە، لە ڕاستیدا گرفتێکی ڕاستەقینە کاتێك دەزانن کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زیاتر لە (١١) ملیۆن ئالوودە بووە بە عەرەق و زیاتر لە (٤٤) ملیۆن عەرەق خۆری تێدایە.

ساڵانە زیاتر لە (٢٠٠٠) هەزار کەس لە بەریتانیا بە هۆی عەرەقەوە گیان لە دەست دەدەن.

وڵاتێکی دیموکراتی سەربەست بە زۆرینەی ڕەزامەندی گەل لە ساڵی (١٩١٨) ع خرایە بەردەم ڕای گشتی لە ساڵی (١٩١٩)ع خرایە دەستووری ئەمریکی و هۆیەکانی ڕاگەیاندن و وشیارکردنەوەو پاڵپشتی ئەم یاسایە بوون (٦٠) ملیۆن دۆلار بۆ دیعایەکردن دژی عارەق سەرف کرا (١٠) هەزار ملیۆن پەڕە بۆ ئەم مەبەستە نوسرا، (٢٥٠) ملیۆن جونەیهی غەرامە کرا (٤٠٤) ملیۆن جونەیە صادرە کرا کەچی ناچار لە ساڵی (١٩٩٣)ع ئەم یاسایە هەڵوەشێنرایەوە، چونکە سەرنەکەوتن لە حەرام کردنی عەرەق.

خەڵکی ئەسڵی ئوسترالیا چەوساوەترین چینن لەو وڵاتەدا، بۆیە زۆریان بێکارن و ئالوودەی مەی و مادە بێهۆشکەرەکان دەبن و سەرەنجامی ئەوانەش دووچاری بەندیخانەو ناڕەحەتی زۆر دەبن .

ئامارەکان وادەردەخەن کە ژمارەیەکی زۆر لەوانەی ڕوویان کردۆتە ئیسلام و بە قەناعەتەوە موسوڵمان بوون و دەڵێن: بەڕاستی ئیسلام هێزێکی دەروونی گەورەمان دەداتێ بەرامبەر ئەو هەموو ناڕەحەتی و چەوسانەوەیەی کە توشی دەبین، شایانی باسە سەدو پەنجا ساڵێك دەبێت ئوسترالیەکان ئیسلامیان ناسیوە بەهۆی قافڵەی ئەو ئەفغانیانەی کە چوونەتە ئەو وڵاتە.

بەرگی دووەم

ڕەنگە کەسێك بڵێت ئەوسا لە کوێو ئێستا لە کوێ، ئەو بەڕێزانە باسی هەوڵی ئەو کۆمەڵە موسڵمانە ئەمریکیە دەکەن کە بەسەرکردایەتی (مالکۆڵم ئێکس) لە ئەمریکا لە ساڵانی شەستەکان توانیان ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك موسڵمان بکەن و لە بەڵای تلیاك و مەی ڕزگاریان بکەن، (مالکۆڵم ئێکس) لە یاداشتەکەیدا دەڵێت:

کاتێك یەکێك لە تلیاك خۆرەکان موسڵمان دەبوو، دەبینی چۆن هاوەڵە موسڵمانەکانی ڕێزی لێدەگرن و بەهانایانەوە دێن، کاتێکیش حاڵی لێدەهات بۆ تلیاك، هاواری دەکردو دەلەرزیو دەپاڕایەوە سا بەڵکو تۆزێك تلیاکی بدەنێ، ئا لەم کاتە ناهەموارەدا برا موسڵمانەکانی ئیرادەیان بەرز دەکردەوەو دەست و قاچیان دەگرت و نەیاندەهێشت خۆی بدات بەسەر دارو بەردا، پاشان ئامۆژگاریان دەکردو یاداشتی خوایان دەهێنایەوە یاد، بەو پەڕی دڵسۆزیو خۆشەویستیەوە بەدەورو خولیدا دەهاتن، تا برادەرەکە دەهاتەوە سەر خۆی، ئینجا شۆربایەکی گەرم و خواردنێکی باشیان دەدایە تا هێزو توانای زیاد بکات. چەند سەرژمێریەکی گرنگ لەسەر مەی و هاوشێوەکانی:

(سیناتوری ئەمریکی ولیم فولبرایت) دەربارەی کێشەی مەی خواردنەوە دەڵێت:

ڕاستە ئێمە گەیشتوینەتە سەر مانگ، بەڵام قاچەکانمان لەناو قوڕو لیتەدا چەقیوە، بەڕاستی کێشەیەکی گەورەیە لە نەتەوە یەکگرتووەکان زیاتر لە (٤٤) ملیۆن عەرەق خۆر هەیە کە (١١) ملیۆنیان بەردەوام دەیخۆنەوە.

گۆڤاری (ادمان)ی بەریتانی دەڵێت:

ئەو زیانانەی کە لە کێشەی عەرەق خواردنەوە دەکەوێتەوە تەنها لە ساڵی (١٩٨٣)ع گەیشتە (٦٤٠) ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی، (٦٩) ملیۆنی تریش لە نەخۆشخانەکاندا بۆ چارەسەریان سەرف کراوە.

ئەو زیانە ماددیانەی کە لە عەرەقەوە دەکەوێتەوە لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە شەستەکاندا بۆ هەر ساڵێك گەیشتۆتە دوو ملیار دۆلار.

لە ساڵی (١٩٨٧)ع وەزارەتی تەندروستی ئەمەریکی لە ڕاپۆرتێکدا بڵاوی کردەوە کە: ئەو زیانانەی لە ئابووری دەکەوێت لە بوارەکانی تەندروستی و کۆمەڵایەتی و پیشەسازی لە ساڵێکدا دەگاتە نزیکەی (٤٣) ملیۆن دۆلار.

پرۆفیسۆر (شاکیت) بەڕاشکاوی دەڵێت: (٩٣٪)ی دانیشتوانی نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکا مەی دەخۆنەوە (٤٠٪ - ٥٠٪) تووشی نەخۆشی دەبن و چاك دەبنەوە (٥٪) لە ئافرەتان و (١٠٪) لە پیاوان تووشی نەخۆشی درێژخایەن دەبن.

سەر ژمێریەکی ئەمەریکی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە: نیوەی حاڵەتە خۆکوژیەکان بەهۆی سەرخۆشیەوەیە لە (٣٤٪) تاوانی فڕاندن و دەست درێژی و (٦٤٪) ڕووداوی هاتووچۆی لیٚ دەکەوێتەوە[1].

تەنها لە بەریتانیا ساڵانە زیاتر لە (٣٣٠٠٠) سی وسیٚ هەزار کەس بەهۆی ئەم (شەرابە ڕۆحی)یەوە دەمرن، کە زۆربەیان لە نێوان تەمەنی (٢٧-٣٠) ساڵی دایە! لە کاتێکدا کە ساڵانە (١٦٤) ملێون ئیستەرلینیی بۆ چارەسەری نەخۆشەکان تەرخان دەکات و زیاد لە (٣) ملیۆن ئیستەرلینییش زیانی لیٚ دەکەوێت، زیاد لەمەش لە نەخۆشخانەکانی ئەم وڵاتەدا زیاتر لە (٢٠ - ٣٠) هەزار کەس توشی نەخۆشی عەقڵی و دەروونی دەبن.

بڕی ئەو زیانانەی کە بە هۆی عەرەقەوە لە کۆمەڵگا دەکەوێت، دەگاتە: (١٦٦) بلێون دۆلار لە ساڵێکدا! سێیەکی وڵاتانی پیشەسازی، عەرەق بووەتە هۆی نەخۆشکەوتنیان.

لە وڵاتی ئیرلەندا (٤٠٪)ی نەخۆشەکانی بەم هۆیەوەیە.

لە ڕووسیا ساڵانە نزیکەی (٤٧٠٠٠) کەس دەکوژێت، (٤٠٪)یان بەهۆی نەخۆشیی ترسناك یان هۆکارەکانی هاتوچۆوە دەبێت.

چەندین کێشەی تری کۆمەڵایەتی لەبەر لاوازیی پەیوەندیان و ئارام نەگرتن و چاوپۆشی نەکردنیان، دێتە ڕێگا، لە لێکۆڵینەوەیەکی نوێدا هاتووە کە: ڕێژەی

---

(١) الموسوعة الذهبية: (١٠٤١).

بەرگی دووەم

تەڵاق لەناو گەلی ئەمریکی، ئەوانەی کە دەخۆنەوە هەردووکیان یان یەکێکیان سێ قاتی ئەوانی ترە کە ئارەق ناخۆنەوە.

هەر لەبەر خراپ مامەڵە کردنیان بەرامبەر منداڵان (١) ملیۆن منداڵ دەفەوتێن و دەست درێژی دەکرێتە سەریان (٨١٪)یان بەهۆی ئەم دیۆەزمەیەوە دەبنە قوربانی، ئەو منداڵانەی کە لە خێزانێکی عەرەق خۆردا لەدایك دەبن و گەورە دەبن، پێویستیان بە چارەسەری (٣٢٪) زیاترە لەوانی دی، کە ئەمەش بەپێی ئەو سەرژمێریەی ساڵی (١٩٩١)ع بەلایەنی کەمەوە دەگاتە (٦, ٢٨) ملیۆن منداڵ، (٤٣٪)یان هەر لە تەمەنی منداڵیەوە تووشی شەکرە دەبن.

لێکۆڵینەوەیەك ئاشکرای کردووە کە عەرەق کلیلی (٨٦٪)ی کوشتنی بە هەڵە و (٥٤٪)ی کوشتنی بە ئارەزوو و (٦٢٪)ی دەستدرێژی و، (٤٨٪)ی دزی و، (٤٤٪) ی خۆ فڕێدان و، (٦٦٪)ی بەکارهێنەری ماددەسەرخۆش و سرکەرەکانە.

چوار ملیۆن کەس لە ئێران بەدەست ماددەکانی تلیاك و هاوشێوەکانی گرفتارەو پێنج هەزار کەسیشی کوشتووە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەسێ مردو لەسەر مەی خواردنەوە بەردەوام بوو کاتێ بەخوا دەگاتەوە وەکو بت پەرست مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ[١]..

لە ڕاستیدا لەسەردەمی ئێمەدا جۆرەکانی مەی بەرێژەیێکی زۆر زیادی کردووەو چەندین ناوی لێ نراوە بە عەرەبی و غەیری عەرەبی..

بێگومان شەریعەت بنەمایەکی گەورەی داناوە بابەتەکە یەکلایی دەکاتەوەو فیتنەی ئەو فێڵ و تەڵەکەیە بن بڕ دەکات ئەویش ئەوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هەموو هۆشبەرێك بە مەی (شەڕاب) دادەنرێ، هەموو هۆشبەرێکیش حەڕامە.

جا هەر شتێك ژیری تێك بدات و سەرخۆشی بکات ئەوە کەم و زۆری حەڕامە.. هەر چەندە چەند ناوێکی هەبێت و ناوەڕۆکەکانیشیان لە یەکتر جیا بێت شەریعەت یەك بڕیاری یەك بڕیاری لەسەردراوە.

---

(١) صحيح الجامع، برقم: (٦٥٢٥).

# دوای مردنێکی زۆر بە هۆی ڤایرۆسێکەوە بومەلەرزەیەک ڕوودەدات

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر بومەلەرزەیەك ڕوودەدات و سەرتاپای جیهان دەگرێتەوە، ئەمەش لە دوای بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسێك دەبێت کە خەڵکێکی زۆری پێ لەناو دەچن و دەمرن... جا ئەم ڤایرۆسە کۆرۆنا یا هەر ڤایرۆسێکی تر بێت..

پێشەوا سەلەمەی کوری نوفەیل(ﷺ) دەڵێت: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووین، فەرمووی: (بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ مَوْتَانٌ شَدِيدٌ وَبَعْدَهُ سَنَوَاتُ الزَّلَازِلِ)[1].

واتە: لە نزیکی هاتنی ڕۆژی دواییدا مردنێکی زۆر ڕوو دەدات وە لە دوای ئەمەدا ساڵانێکی پڕ لە زەوی لەرزین ڕوودەدات.

پێشەوا ئیبنو حەجەر(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: بێگومان لە زۆرێك لە وڵاتانی شیمالی و خۆر هەڵات و خۆر ئاوا دا زەوی لەزرینی زۆر ڕوویداوە بەڵام مەبەست لەم فەرموودە ئەوەیە کە هەموو شوێنێك بگرێتەوەو ماوەیەکی باش بەردەوام بێت[2].

پێشەوا عەوفی کوری مالیك (ﷺ) دەڵێت:

لە شەڕی تەبووکدا چوومە لای پێغەمبەر(ﷺ) کەوا لە ژێر خێوەتێکی چەرمدا بوو، فەرمووی: (اعْدُدْ سِتًّا بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ مَوْتِي ثُمَّ فَتْحُ بَيْتِ الْمَقْدِسِ ثُمَّ مُوتَانٌ يَأْخُذُ فِيكُمْ كَقُعَاصِ الْغَنَمِ..)[3].

---

(١) المستدرك (٤/ ٦١٤) برقم: (٨٤٥٠) قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

(٢) فتح الباري (١٣/ ٨٧).

(٣) صحيح البخاري (٤/ ١٠٢) كتاب: الجزية والموادعة، باب: ما يحذر من الغدر، برقم: (٣١٧٦).

واتە: شەش شتان بژمێرە لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی: مردنی من واتە: پێغەمبەر (ﷺ) پاشان ئازادکردنی قودس، پاشان دەردێکتان تێدەکەوێ وەکو ئەو دەردەی تووشی مەڕ دەبێ و ئاوی لەبەر لوتی دەڕوا کە زۆرتان پێی دەمرن.

(مُوتَان) واتە: زۆری مردن، وەکو پەتاو نەخۆشی کە دەکەوێتەوەو خەڵکانێکی زۆر لەناو دەبات[1].

(قُعَاص) یان (عُقاص) پەتاو نەخۆشیەکە ئاژەڵ دەگرێتەوەو شتێك لە لوتیەوە ڕێ دەکات تاکو لە پڕ دەمرێت.

چونکە سەرەتا لە لووتیان زیبکەیەك سەرهەڵدەدات هەتا کتوپڕ دەیکوژێت.. وە پێغەمبەر(ﷺ) بۆیە ئەو ناوەی لێناوە چونکە سەرەتا پەتاو نەخۆشیەکان لە جەستەدا وەك برین دەرئەکەوتن لە دواییدا لە پڕێکەوە ئەو کەسەی ئەکوشت..

لەم فەرموودە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو مردنەی پێغەمبەر(ﷺ) باسی دەکات زۆر خەڵك پێی دەمرێت، یەکێکە لە نیشانەکانی هاتنی نزیك بوونەوەی ڕۆژی دوایی.

## دروستبوونی گومانێك و وەڵامدانەوەی !

لەوانەیە کەسێك پرسیار بکات چۆن چۆنی دەوترێ لە دوای ئەم ڤایرۆسەوە بومەلەرزە ڕوودەدات؟

بەندە دوای وردبوونەوەیەکی زۆر توێژینەوەیەکی بێ هاوتا گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە وشەی (موتان شدید) لە فەرموودەی یەکەم هاتووە، کە بە واتای مردنێکی زۆر دێت، لە فەرموودەی دووەم وشەی (موتان یأخذ فیکم) هاتووە بەکار هاتووە وەکو ئەو دەردەی کە تێدەکەوێتە ناوتان کە پەسیو و ئیلتیهاباتە..

کەواتە لە هەردوو وشە (موتان) بەکار هاتووە بۆیە یەکێکیان تەفسیری ئەوەی تر دەکات.

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، (لا ١٠٢).

## بە حەڵاڵکردنی خواردنەوەی مەی و هاوشێوەکانی

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی خواردنەوەی مەی حەڵاڵ دەکرێت لەلایەن کەسانی گومڕاو خراپەکاران.. لەم سەردەمەی ئەمڕۆ جۆرەکانی مەی و سەرخۆشکەرەکان زۆرن، وە ناوەکانیشیان زۆرن، هەر لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتووە کە کۆمەڵانێکی زۆر ئەمڕۆ مەی خواردنەوە بە حەرام نازانن و پێشی ناڵێن مەی بەڵکو پێی دەڵێن: (مەشروباتی ڕۆحی و ئارتین و سیکۆتین و بیرەو فودکاو شەمپانیاو، ویسکیو.. هتد، پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پێداوین و دەفەرموێ:

(يَشْرَبُ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي الْخَمْرَ، يُسَمُّونَهَا بِغَيْرِ اسْمِهَا)[1].

واتە: لە ئومەتەکەی من خەڵکانێك مەی دەخۆنەوە ناوی دەنێن بە ناوی ترەوە غەیری ناوی خۆی.

پێشەوا عوبادەی کوری صامت(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَيَسْتَحِلَّنَّ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي الْخَمْرَ بِاسْمٍ يُسَمُّونَهَا إِيَّاهُ)[2].

واتە: کۆمەڵانیك لە ئوممەتەکەم مەی حەڵاڵ دەکەن و بە ناوی تر ناوی دەبەن.

پێشەوا ئیبنولعەرەبی بە حەڵاڵ کردنی عارەقی بە دوو شێوە شیکردۆتەوە:

**یەکەم:** باوەڕی بەوە هەبێت کە حەڵاڵە خواردنەوەی.

**دووەم:** ئەوەیە کە ڕێ پێدان و دڵ پێخۆشبوونە بە خواردنەوەی وەکو دڵخۆش بوون و ڕێپێدراو بە حەڵاڵ.. وە باسی دەکات کەوا ئەو گوێ بیست بووەو دیویەتی ئەوەی کاری وای ئەنجام داوە[3].

---

(١) صحيح ابن حبان (١٥/ ١٦٠) كتاب: تاريخ، باب: إخباره (ﷺ) عما يكون في أمته من الفتن والحوادث، برقم: (٦٧٥٨).

(٢) مسند الإمام أحمد (٣٧/ ٣٨٢) برقم: (٢٢٧٠٩).

(٣) فتح الباري (١٠/ ٥١).

زۆر لەوەش گەورەتر ئەوەیە کە بە ئاشکرا دەفرۆشرێ، وە بەئاشکرا لە هەندێ وڵاتانی ئیسلامی دەخوریتەوە، بەڕاستی بڵاوبوونەوەی ماددە بێهۆشکەرەکان بە جۆرێکی وا بەربڵاوە لە پێشوودا وێنەی نەبووە، کە ئەوەش زەنگێك لێدەدات بۆ مەترسیەکی گەورەو گەندەڵیەکی مەزن.

هەشیانە دەڵێن: ئارەق حەرامە بەڵام بیرە حەڕام نیە.

هەندێکیشیان دەڵێن: ئەگەر زۆر بخۆیتەوە حەرامە بەڵام لە موناسەباتدا حەڕام نیە.

هەندێکیشیان دەڵێن: بۆ گورچیلە باشەو دکتۆر بۆی نووسیوم، بەم شێوەیە هەزارو یەك بڕو بیانوو دروست دەکەن بۆ حەڵاڵکردنی مەی خواردنەوە، پێیان وایە ئەگەر توانیان خۆیان خەڵکی هەڵخەڵەتێنن، خواشیان پێ هەڵدەخەڵەتێت .

هەموویان بونەتە موفتی بەسەر ئیسلام و موسڵمانانەوە، لە کاتێکدا وا بیردەکەنەوە کە فێڵ لە خوای گەورە دەکەن.

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (ﷺ) دەڵێت: (إن من أعلام الساعة وأشراطها .. إذا استحلت هذه الأمة الخمر بالنبيذ)[١].

لەم فەرموودەیە زۆر بە ڕاشکاوانە بۆمان بە دەردەکەوێت کە لە پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت ناوی ئارەق دەگۆڕدرێت بە شەراب..

پێشەوا ئەبو مالیکی ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت:

گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو دەیفەرموو:

(يَكُونَنَّ مِنْ أُمَّتِي أَقْوَامٌ
يَسْتَحِلُّونَ الحِرَ وَالحَرِيرَ
وَالخَمْرَ وَالمَعَازِفَ

---

(١) كنز العمال في سنن الأقوال والأفعال، برقم: (٣٨٤٩٥).

لَيَنْزِلَنَّ أَقْوَامٌ إِلَى جَنْبِ عَلَمٍ

يَرُوحُ عَلَيْهِمْ بِسَارِحَةٍ لَهُمْ، يَأْتِيهِمْ - يَعْنِي الفَقِيرَ - لِحَاجَةٍ فَيَقُولُونَ:

ارْجِعْ إِلَيْنَا غَدًا، فَيُبَيِّتُهُمُ اللَّهُ، وَيَضَعُ العَلَمَ، وَيَمْسَخُ آخَرِينَ قِرَدَةً وَخَنَازِيرَ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ)[1].

واتە: کۆمەڵانێك لە ئوممەتی من پەیدا دەبن کە

بەدڕەوشتی و

ئارموش و

مەی و

مۆسیقا حەڵاڵ دەکەن

وە کۆمەڵە قەومێکیش لە پاڵیانەوە ئاڵا هەڵدەدەن، گاوان و شوانیان بەرانەوە بەسەردا دەگەڕێن بۆ پێداویستیەك دێنە لایان و دەڵێن:

بەیانی وەرەوە لامان، جا خودا شەویان بەسەردا دێنێ و ئاڵاکە دادەگرێ و ئەوانی تریش تا ڕۆژی دوایی دەکاتە سەگسارو شێوەیان دەکاتە مەیمون و بەراز.

واتای حەڵاڵکردنیان بۆ ئەو شتە حەڕامکراوانە دوو شتە:

١) باوەڕیان وایە کە ئەو شتانە حەڕام نەکراون.

٢) لەبەر ئەوەی خەڵك ڕاهاتووە لەسەر کردن و ئەنجامدانی ئەو شتانەی بڵاوبوونەتەوە لە نێو خەڵکیدا تا وای لێهاتووە خەڵکی نە بە زمان و نە بەدڵ بە خراپی نازانن، بۆیە خەڵکی هەست بە حەڕامبوونی ناکەن لەکاتی ئەنجامدانیان.

ماڵ وێرانی قیامەت بۆ ئەو کەسەی کە دوکان و ئیجازەو تەوقیع و... هتد بۆ دوکاندارە ئارەق فرۆشەکان دەکات، هەر کەسێك سوننەتێکی خراپ دابمەزرێنێت و زیندووی بکاتەوە ئەوا تاوانی ئەو هەموو خەڵکەی دەکەوێتە ئەستۆ، بەبێ ئەوەی لە تاوانی ئەوانیش کەم بکاتەوە.

---

(١) صحيح البخاري (٧/ ١٠٦) باب: ما جاء فيمن يستحل الخمر، برقم: (٥٥٩٠).

## درۆزنەکان لە ڕاگەیاندنەکان قسە لەسەر ئیسلام دەکەن

پێغەمبەر(ﷺ) پێی ڕاگەیاندووین کە ئەو پێوەرانەی پیاوان هەڵدەسەنگێنن بەر لە هاتنی ڕۆژی دوایی لاسەنگ دەبێت، جا درۆ بە ڕاست وەردەگیرێ و ڕاستیش بە درۆ دادەنرێت و ڕەت دەکرێتەوە، ماڵ و ناموس ئەسپەردەی ناپاك و دەست بڕان دەکرێ و دەست پاك و ڕاست کردارانیش بە ناپاکی تۆمەت بار دەکرێن، پیاوی نابوت و نا کەس قسان دەکەن کە بۆ هەموو خەڵکی گرنگن، ئینجا بێجگە لە ڕاو بۆ چوونی پوچ و هیچی دیکە نادەن بۆ ڕێچکەی خوار و خێچ نەبێ ڕێبەری ناکەن.

پێشەوا ئەبو هوریرە(ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ:

(إِنَّهَا سَتَأْتِي عَلَى النَّاسِ سِنُونَ خَدَّاعَةٌ

يُصَدَّقُ فِيهَا الْكَاذِبُ

وَيُكَذَّبُ فِيهَا الصَّادِقُ

وَيُؤْتَمَنُ فِيهَا الْخَائِنُ

وَيُخَوَّنُ فِيهَا الأَمِينُ

وَيَنْطِقُ فِيهَا الرُّوَيْبِضَةُ

قِيلَ: وَمَا الرُّوَيْبِضَةُ؟ يَا رَسُولَ اللهِ

قَالَ: السَّفِيهُ يَتَكَلَّمُ فِي أَمْرِ الْعَامَّةِ)[1].

---

(١) صحيح: أخرجه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٥٥٧) برقم: (٨٥٦٤). قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وصححه ووافقه الذهبي.

واتە: ساڵانێکی هەڵخەڵەتێنەر بەسەر خەڵکی دێت، درۆزنی تێدا دەکرێت بە ڕاستگۆ، وە ڕاستگۆشی تێدا دەکرێت بە درۆزن، وە خیانەت کاری تێدا دەکرێت بە دەست پاك، وە دەستپاکی تێدا دەکرێت بە خیانەتکار، (رويبضة) قسەی تێدا دەکات؟ گوتیان: (رويبضة) چیە ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: کەسانی نا کەس بەچەو بێ نرخ قسە لە کاروباری گشتی خەڵکدا دەکەن.

لە نیشانەکانی ئەم سەردەمە بەرزبوونەوەی پڕوپووچەکانە بەسەر پیاوچاکانانەوەو کاروباری خەڵکی دەکەونە دەستی کەسە ئاست نزمەکان، ئەویش مەسەلەیەکی باوە لەم ڕۆژگارەی خۆماندا.. وە پێویستە ئەهلی زانست و هۆش و شارەزایی پێش بخرێنە سەر کەسانی تردا بۆ پێسپاردنی کاروباری خەڵکی و بەڕێوەبردنیان، ئەو کەسەیش تەماشای حاڵی خەڵکی بکات لەم ڕۆژەدا دەبینێت لەگەڵ هەواو ئارەزووەکانیاندا دەگۆڕێن، ئەگەرچی زیانیش بە ئاینەکەیان بگەیەنن، ئەو جۆرە کەسانە دەبنە گەورەیان.

بەدڵنیایی لەو سەردەمە نەخوێنەوارو یاریزان و گۆرانی بێژو بەندبێژ دەبێتە ئەستێرەی نێو کۆمەڵگا لە نێو کۆمەڵگای موسڵمانان کە لە هەموو کاروبارێکی ژیانی خەڵکی و شەرعی و ئایینی قسە دەکەن و فەتوا دەدەن.

بەڕاستی وەکو ڕۆژی ڕووناك ئەم فەرموودەیە بە چاوی خۆمان دەبینین، چەندین کەسی عەلمانی و شیوعی و مولحید بە ڕاستگۆ دانران، وە چەندین زاناو داناو ژیرو لێهاتوو بە درۆزن هەژمار کران، چەندین کەسایەتی درۆزن و نا پسپۆر لەسەر ڕاگەیاندنەکان بانگهێشت دەکرێن بۆ ئەوەی قسە لەسەر پرەنسیپە شەرعیەکان بکەن و حەڵاڵەکان بە حەرام بزانن و حەرامەکانیش بە حەڵاڵ هەژمار بکەن.

# زۆربوونی درۆ و پڕوپاگەندە

یەكێك لە نیشانەكانی هاتنی ڕۆژی دوایی وای لێدێت مرۆڤ درۆو پڕوپاگەندە زۆر دەكات، ئەگەر سەیری ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بكەین ئەم نیشانەیە زۆر بەدی دەكەین.

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَظْهَرَ الْفِتَنُ، وَيَكْثُرَ الْكَذِبُ..)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت تا فیتنەو ئاشوب سەرهەڵدەدات و درۆكردن زۆر دەبێت.

بە ڕاستی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) هاتۆتە دی لەم سەردەمەی ئێستا تیایدا دەژین، چونكە هەندێك كەس وا دەزانن و دەڵێن: درۆ كردن كات هەتا كات جیاوازی هەیە هەندێ جار گوناهو هەندێ جاریش باشە، وەكو درۆی مانگی نیسان[2]..

---

(١) صحيح ابن حبان (١٥/ ١١٤) برقم: (٦٧١٨). إسناده صحيح، رجاله ثقات رجال الشيخين غير سعيد بن سمعان فقد روى له البخاري في «رفع اليدين» وقال الأرناؤوط: إسناده صحيح.

(٢) هەندێك داب و نەریت هەن، كە مرۆڤەكان لە دێر زەمانەوە لەسەری دەچن، هۆی دروست بوونی ئەو داب و نەریتانەش تا ڕادەیەكی زۆر تا ئێستا نەزانراوە، ڕۆژی یەكی نیسان ڕۆژێكە، كە لەم ڕووەوە گرنگیەكی تایبەتی هەیەو بەڕۆژی «درۆی سپی» دەناسرێت لەسەرانسەری جیهان، لەم ڕۆژەدا خەڵكی بە نوكتەو میوانداری كردنی درۆو فێڵ لەیەكتر كردن و یەكتر گۆڵ دان ڕۆژ دەبەنە سەر، جا مێژووی ئەم درۆیە دەگەڕێتەوە بۆ پێش ساڵی (١٥٦٤)ع، لەبەر ئەوەی لە سەرانسەری ئەوروپادا ڕۆژژمێرێك هەبوو یەكی نیسانی بەسەری ساڵ دادەنا، بۆیە خەڵكی لەو ڕۆژەدا جەژنیان دەگێڕا.

پێشەوا ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (يَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ، يَأْتُونَكُمْ مِنَ الْأَحَادِيثِ بِمَا لَمْ تَسْمَعُوا أَنْتُمْ، وَلَا آبَاؤُكُمْ، فَإِيَّاكُمْ وَإِيَّاهُمْ، لَا يُضِلُّونَكُمْ، وَلَا يَفْتِنُونَكُمْ)[١].

واتە: لە ئاخیر زەمان كەسانێكی جادووكەرو درۆزن پەیدا دەبن قسەی واتان بۆ دێنن كە نە ئێوەو نەباوك و باپیرانتان قسەی واتان نەبیستووە، خۆتانیان لیٚ بپارێزن، سەرتان لیٚ نەشێوێنن و توشی فیتنەتان نەكەن.

حوزەیفەی كوری یەمان (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مِنِ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ خَصْلَةً .. وَاسْتَحَلُّوا الْكَذِبَ..)[٢].

واتە: لە نیشانەكانی نزیكبوونەوەی كۆتایی بونەوەر حەفتاو دوو تایبەتمەندە... درۆ كردن حەڵاڵ دەكرێت..

پێشەوا عەبدوڵلای كوری مەسعود(ﷺ) دەڵێت: (إِنَّ الشَّيْطَانَ لَيَتَمَثَّلُ فِي صُورَةِ الرَّجُلِ، فَيَأْتِي الْقَوْمَ، فَيُحَدِّثُهُمْ بِالْحَدِيثِ مِنَ الْكَذِبِ، فَيَتَفَرَّقُونَ، فَيَقُولُ الرَّجُلُ مِنْهُمْ: سَمِعْتُ رَجُلًا أَعْرِفُ وَجْهَهُ، وَلَا أَدْرِي مَا اسْمُهُ يُحَدِّثُ)[٣].

واتە: بێگومان شەیتان خۆی دەخاتە سەر شێوەی پیاوێك جا دێتە لای كۆمەڵیٚ و فەرموودەیەكی درۆیان پیٚ دەڵێت، جا پەرتەوازە دەبن، جا پیاویٚ لەوان دەڵیٚ: گوێم لێبوو پیاویٚ قسەی بۆمان كرد كە بە ڕەنگ دەیناسمەوە بەڵام نازانم ناوی چیە.

پێشەوا عەبدوڵلای كوڕی عەمری كوڕی عاص(ﷺ) دەڵێت:

بەرگی دووەم

---

(١) صحيح مسلم، (١/ ١٢) باب: في الضعفاء والكذابين، برقم: (٧).

(٢) ضعيف: حلية الأولياء، لأبي نعيم (٣/٤١٠)، برقم:(٤٥٥٥) وهو ضعيف كما قال الحافظ العراقي (٣/٢٩٧).

(٣) صحيح مسلم، (١/ ١٢) باب: في الضعفاء والكذابين، برقم: (٧).

بێگومان لە دەریادا هەندێ شەیتانی بەندکراو هەن کە پێغەمبەر سلێمان (سەلامی خوای لێ بێت) بەندی کردوون، نزیکە کە دەرچن و قسە بۆ خەڵکی بکەن و بڵێن ئەمە قورئانە[١].

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: واتای وایە کەوا شتێك دەخوێننەوە کە قورئان نیە بەڵام ئەم شەیتانە دەڵێ ئەمە قورئانە تاکو خەڵکی پێ لە خشتە بەرێ جا لە خشتە دەچن[٢].

لەم سەردەمە فەرموودەی ضعیف و نامۆ چەند زۆرن، تا وای لێهاتووە کە هەندێ لە خەڵکی خۆ پارێزی ناکەن لە درۆی زۆرو وەرگرتنی فەرمووده بەبێ ئەوەی کە دڵنیابێ لە ڕاستیەتیدا، لەمەشدا بەڕاستی گومڕابوونی خەڵك بەرپا دەبێ و دەبێتە مایەی فیتنە بۆیان، جا لەبەر ئەمە پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداری کردوینەتەوە لەبەڕاست زانینیان، وە بێگومان زانایانی فەرموودەناس ئەم فەرموودانەیان کردۆتە ئەصل و بناغەیەك بۆ حەکەمی واجب بوونی دڵنیایی لە وەرگرتنی ڕاستیەتی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) و لێکۆڵینەوەی گێڕەوانی فەرموودەکە بۆ ناسینی مرۆڤی ڕاستگۆو مرۆڤی درۆزن کە فەرموودە نەقل دەکەن بۆمان.

## ئیعجازی قورئان سەبارەت بە کەشفکردنی درۆکردن:

ساڵانێکی زۆرە کە بەشێکی زۆر لە زانایان بەردەوام لە باس و لێکۆڵینەوە، وەبەرهێنانی ئامێرێکن کە بتوانن کەم تا زۆرێك یارمەتی دەریان بێت بۆ ئاشکراکردنی ئەو مرۆڤانەی کە لە گوفتارەکانیاندا پەنا بۆ درۆکردن دەبەن، بە تایبەتی مرۆڤە تاوان بارەکان، بەڵام بەردەوام زانایان نەیانتوانیوە سەرکەوتوبن و ئامێرێك دروست بکەن کە بتوانن لە ١٠٠٪ پشتی پێببەستن بۆ ئاشکرا کردنی درۆکردن لە مرۆڤەکان.. لەگەڵ ئەوەی زۆرترین ڕێگایان گرتە بەر بۆ بەدەست هێنانی ئامێرێکی باوەڕ پێکراو بەڵام سەرەنجام توانیان بگەنە ڕێگایەك بۆ

---

(١) صحيح مسلم (١/ ٧٩ ٨٠) مع شرح النووي.

(٢) صحيح مسلم (١/ ٨٠) مع شرح النووي.

ئاشکراکردنی درۆ لە مرۆڤەکان، کە ئەوانیش لە ڕێگای بینین و گوێگرتن لە ڕێگای موگناتیسی.. قورئانی پیرۆزیش ١٤٣٦ ساڵ بەر لە ئێستا باس لە ئاشکراکردنی ئەم دیاردەیەی کردووە.. لەم باسەدا ئاماژە دەدەین و ئاشنایەتیەك پەیدا دەکەین لەو (٣) ڕێگایەی کە زانایان پێی گەیشتوون بۆ ئاشکراکردنی درۆ، دوای گەلێك تاقیکردنەوەی بەردەوام، گەیشتنە باشترین سێ ڕێگا بۆ ئاشکرا کردنی درۆ، ڕێگاکانی دیتن و بیستن و ڕێگای موگناتیسی.

خوێنەری بەڕێز! ڕەنگە سەرسام ببی ئەگەر زانیت قورئانی پیرۆز بەڕوونی ئاماژەی بەم سێ ڕێگایەی داوە!

ـ ئاشکراکردنی درۆ لە ڕێگای بینین یاخود سەرنجدان.. بەشێك لە زانایان سەرەنجی ئەوەیاندا کە مرۆڤەکان گۆڕانکاری بەسەر بەشەکانی ڕوخساریاندا دێ لە کاتی درۆکردندا.. بەمەش هەستان بە وێنەگرتنی مرۆڤەکان لە کاتی قسەکردنی ئاسایی و لە کاتی درۆکردندا.. سەرەنجام دەرکەوت کە گۆڕانکاری ڕوودەدات لە ڕوخسارەکان کە پەنا بۆ درۆکردن دەبەن لە کاتی قسەکردن بەڵام ئەم گۆڕانکارییانە زۆر بەکارا و خێران هەستی پێناکرێت، ئەگەر بێت و بە وێنەگرتنێکی خێراو چاو پێداخشاندنەوەیەکی وردو ئارام سەرنج نەدرێت ئەوا ئاسان نیە بۆ بەدی کردنی ئاسایی..

هەر بۆیە زانایان هەستان بە وێنە گرتن و سەرنجدان سەرەنجام بۆیان دەرکەوت کە گۆڕانکاری ڕوودەدات لە ڕوخسارەکان، هەروەها زانایان باسیان لەوە کرد کە بە تەنها گۆڕانکاری ڕوونادات لە ڕوخسارەکان لە کاتی درۆکردندا، بەڵکو سەرجەم لەشی مرۆڤ گۆڕانکاری بەسەردا دێت.. ئەمەش بەو واتایەی کە هەر بەشێك لە بەشەکانی لەشی مرۆڤ گوزارشت لە خۆی دەکات لە کاتی هەڵسوکەوتوو جوولەکردن..

هەروەها ئەوەشیان دەرخست کە زمانی گفتوگۆکردنی لەشی مرۆڤەکان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە، وە زۆر جیاوازتریش دەبێت لە کاتی درۆکردندا.. چونکە مرۆڤەکان ناتوانن زاڵ بن بەسەر جوڵەکانیاندا لە کاتی درۆکردندا.

- ڕێگای گوێگرتن بۆ ئاشکراکردنی درۆ..

زۆرێك لە زانایان زیاتر سەرنجیان خستۆتە سەر ڕێگای گوێگرتن بۆ ئاشکراکردنی درۆکردن لە مرۆڤەکان، بەمەش هەستان بە تۆمارکردنی دەنگی مرۆڤەکان.. دەرکەوت کە شەپۆڵەکانی دەنگی مرۆڤ لە کاتی درۆکردن زۆر جیاوازترە لە کاتی قسەکردنی ئاسایی، وە ئەو شەپۆلانەی کە ئەو ئامێرە تۆماری دەکات پێکهاتووە لە (٢) شێواز.. یەکەمیان شێوازی درۆکردن.. دووەمیان قسەکردنی ئاسایی.. هەر بۆیە جیاوازییەکی ئاشکرا لە نێوانیاندا بەدی دەکرێت.

- ڕێگای موگناتیسی بۆ ئاشکرا کردنی درۆ..

تیمێك لە زانایان هەوڵی ئەوەیاندا کە بتوانن لە ڕێگای زانستی نوێوە بتوانن بچنە ناو مێشکی مرۆڤەکان و بزانن لە کاتی درۆکردندا مێشکی مرۆڤەکان چی بەسەر دێت، بۆ ئەم کارەش ڕێگای موگناتیسیان بەکارهێنا کە ئامێرێکە بە شەپۆڵە موگناتیسیەکان کار دەکات دەتوانرێت لە ڕێگایەوە چالاکی مێشك بەدی بکرێت.

سەرەنجام لە دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر دەرکەوت کە مرۆڤ لە کاتی درۆکردن گۆڕانکاریەکی لەناکاو لە بەشی پێشەوەی مێشکیدا ڕوو دەدات، بۆیە زانایان توانیان ئەو کەسانەی درۆ دەکەن جیایان بکەنەوە..

لێرەدا کاتی ئەوە هاتووە کە باسی موعجیزەی قورئانی پیرۆز بکەین و ئاشکرای بکەین کەوا قورئانی پیرۆز زۆر لە مێژەوە ئاماژەی بەو دیاردەیە کردووە، هەر چەندە زانایانی ڕۆژئاوا باس لەوە دەکەن کەس پێش ئەوان نەیتوانیوە ئەم ڕێگایە بدۆزێتەوە..

کەواتە لێرەدا دەپرسین لە کوێوە ئەم زانستە بۆ قورئان هاتووە..؟؟ کەواتە ئەوەی ئەم قورئانەی ناردۆتە خوراەوە نهێنی ئەم زانستەشی لەلایە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخْفَىٰ عَلَيْهِ شَىْءٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٥﴾ ][1].

واتە: بێگومان هیچ شتێك لە خوا ون نابێت نە لەزەوی و نە لە ئاسمانەکاندا.

---

(١) سورة آل عمران ، الآية: (٥).

بەرگی دووەم

خوای پەروەردگار لە ئایەتێکی تر باسی مونافیقەکان دەکات و دەفەرموێت: [وَلَوۡ نَشَآءُ لَأَرَيۡنَٰكَهُمۡ فَلَعَرَفۡتَهُم بِسِيمَٰهُمۡۚ وَلَتَعۡرِفَنَّهُمۡ فِي لَحۡنِ ٱلۡقَوۡلِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ أَعۡمَٰلَكُمۡ ﴿٣٠﴾][1].

واتە: خۆ ئەگەر بمان ویستایە ئەوانەمان پیشان دەدایت ئەو کاتە دەتناسینەوە.. سوێند بەخوا لە شێوازو ناوەڕۆکی قسەو گفتارەکانیاندا دەیانناسیتەوە خوا خۆشی بە ئاگاو زانایە بە کردەوەکانتان .

لەم ئایەتەدا ئەگەر ووردببینەوە دەبینین کە خوای گەورە دەفەرموێ: [وَلَوۡ نَشَآءُ لَأَرَيۡنَٰكَهُمۡ فَلَعَرَفۡتَهُم بِسِيمَٰهُمۡۚ]

کەواتە ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بوایە ئاوای لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد کە بتوانێت درۆکردنی ئەو کەسانە لە ڕێگای ڕوخسارەکانیانەوە هەڵکەوتەی ڕوخساریانەوە ببینێت.. ئەمەش نیشانەیەکی ئاشکرایە بۆ ئاشکرا کردنی درۆ کە ئێستا زانایان لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەن و لەسەری دەدوێن.

بەشی دووەم لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: [وَلَتَعۡرِفَنَّهُمۡ فِي لَحۡنِ ٱلۡقَوۡلِۚ] لەم وشە جوانانەی ئەم ئایەتە پیرۆزە زۆر ئاشکرا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە درۆ ئاشکرا دەکرێت لە ڕێگای شەپۆڵەکان و لەڕێگای دەنگەوە، ئەمەش لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێکراوە.

بەشی سێیەم کە زانایان باسی لێوە دەکەن کە مرۆڤ لە کاتی درۆکردندا گۆڕانکاریەکی خێرا دێت بەبەشی پێشەوەی مێشکیدا کە هەر ئەم گۆڕانکاریەشە کە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێکراوە وەکو دەفەرموێ:

[نَاصِيَةٖ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٖ ﴿١٦﴾ فَلۡيَدۡعُ نَادِيَهُۥ ﴿١٧﴾ سَنَدۡعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾ كَلَّا لَا تُطِعۡهُ وَٱسۡجُدۡۤ وَٱقۡتَرِب ۩ ﴿١٩﴾][2].

خوای پەروەردگار بەشی پێشەوەی مێشکی مرۆڤ بە [نَاصِيَةٖ] وەسفکردووە.. زۆرێك لە ڕەتکەرەوەکانی موعجیزەی قورئان باس لەوە دەکەن کە بەشی پێشەوەی

---

(١) سورة محمد ، الآية: (٣٠).

(٢) سورة العلق ، الآية: (١٦-١٩).

مێشکی مرۆڤ پەیوەندی نیە بەسەر درۆکردنەوە، هەر بۆیە لێکۆڵەرەوان لە زانکۆی (بنسلڤانیا) هەستان بە تاقیکردنەوە لەسەر (١٨) خوێندکار کە سەرەنجام زانایان ئەمەیان بۆ دەرکەوت.

لە کاتێکدا کە خوێندکارەکان درۆیان کرد ئەو بەشانەی مێشك کە دەورێکی گرنگ دەبینن لە ئاگادارکردنەوەو خۆ گرتن لە هەڵەکان، ئەم بەشانە لە زۆرترین وزە بە کارابووندا بوون لە کاتی درۆکردندا..

ئەم بەشانە دەکەوێتە بەشی پێشەوەی مێشك وەپارچەکەی تر هەمووی ئەکەوێتە بەشی پێشەوەی مێشك کە نزیکترین خاڵن لە ڕوکاری دیار و پێشەوەی سەر.

ئێستا ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە تاقیکردنەوەی زانایان و لێکۆڵەرەوان هەمان بەڵگەو باسی قورئانی پیرۆزە کە بۆمان دواوەو ئاشکرای کردووە..

بۆیە لێرەدا دەڵێین:

مرۆڤەکان توانیویانە بە ئامێری سەرەتای و ساکارەوە درۆکان ئاشکرا بکەن و بیخەنە ڕوو ..

ئەی چۆن لە پەروەردگارێکی باڵا دەست و بەکارا و خاوەنی دروست کەری هەموو بونەوەر ئاشکرای ناکات؟[1].

گەورەترین چەکی دەستی تۆ دوعاو پاڕانەوەیە لە خوای پەروەردگار، هەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان لە بیری ئەوە نەبیت کە درۆ لەگەڵ خودا بکەی، ئەگینا سەرشۆڕی دونیاو قیامەت دەبیت.

هەر چەند لە دونیا درۆت کردووە بەڵام تەوبەکردنت دەبێتە هۆی سڕینەوەی تاوانەکانت، بۆیە لە ڕەحمەتی خوای گەورە بێ ئومێد مەبە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە بڕوادارین، وە ناشگونجێ مرۆڤی بڕوادار درۆ لەگەڵ یەکتری بکات.

خوای گەورە بمانپارێزێت

---

(١) www.telegraph.com.

# زۆربوونی قەڵەوی لە نێو خەڵکیدا

یەکیٚ لە نیشانەکانی نزیك بوونەی کۆتایی بونەوەر سەرهەڵدانی قەڵەویە.

پێشەوا عیمرانی کوری حصین (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:

(إِنَّ خَيْرَكُمْ قَرْنِي

ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ

ثُمَّ يَكُونُ بَعْدَهُمْ قَوْمٌ يَشْهَدُونَ وَلَا يُسْتَشْهَدُونَ

وَيَخُونُونَ وَلَا يُؤْتَمَنُونَ

وَيَنْذِرُونَ وَلَا يُوفُونَ

وَيَظْهَرُ فِيهِمُ السِّمَنُ)[١].

واتە: چاکترینی ئوممەتم ئەوانەن کە لەسەردەمی خۆمدان، ئینجا ئەوانەی بەدوای ئەواندا دێن

بەڵام لە پاش ئەوان کەسانێك دێن شایەتی دەدەن بیٚ ئەوەی داوای شایەتیان لیٚ بکرێت و

ناپاکی ئەنجام دەدەن و جێگەی متمانە نین و

نەزر دەکەن و بەجێی ناهێنن و

قەڵەویان تێدا پەیدا دەبێت.

---

(١) صحیح مسلم (٤/ ١٩٦٤) باب: فضل الصحابة ثم الذين يلونهم، برقم: (٢٥٣٥).

بەرگی دووەم

بۆیە ئەمڕۆ قەڵەوی بووەتە دیاردەیەك لە نێو ئوممەتی ئیسلامی هەتاوەکو خەڵکی زۆریەیان تەمبەڵی دەنوێنن لە جێبەجێکردنی خواپەرستی، بۆیە بوونی قەڵەوی چەندین نەخۆشی بەدوای خۆیدا دەهێنێت..

لەوانەشە زۆربوونی قەڵەوی لە کۆتایی بونەوەر هۆکارەکەی بڵاوبوونەی خۆشگوزەرانی بێت وەکو خواردن و خواردنەوەی جۆراو جۆرو شیرینی و خواردەمەنی خۆش و بەتام، هەروەها کەم جولەیی، بۆیە قەڵەوی زیادی کرد بە شێوەیەکی بەرچاو لەلای گەورەو بچوکەکان.

تەنانەت ئامارەکان باس لەوە دەکەن شەش یەکی دانیشتوانی بونەوەر بە دەست قەڵەویەوە دەناڵێنن.

هەر بۆیە دەبینین داو و دەرمان زۆر بووە بۆ یارمەتیدانی کێش دابەزاندن و قەڵاچۆکردنی قەڵەوی و نەشتەرگەری بەستنەوەی گەدە.

قەڵەوی: بریتیە لەو لاشەیەی کە تیایدا ڕێژەی چەوری لە پێکهاتەی کێشی لەشدا بەڕێژەی ٥٪ لەباری ئاسایی زیاترە.

بەپێی پێناسەی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی: کەسی قەڵەو ئەو کەسەیە کە تێکڕای بارستایی لەشی زیاتربێت لە ٣٠٪، قەڵەویش بەدووەم هۆکاری مردن دادەنرێت لە جیهاندا لە دوای جگەرە کێشان.

قەڵەوی بەشێوەی پەتایەك هەموو جیهانی گرتۆتەوە، پێش بیست ساڵ لەمەوپێش تەنیا وڵاتانی خۆرئاواو ئەمریکای گرتبۆوە بەڵام لەم چەند ساڵانەی ڕابردوو تەشەنەی کرد بۆ گەلێك لە وڵاتە دواکەوتووەکان.

بەپێی ئامارەکانی رێکخراوی تەندروستی جیهانی ژمارەو ڕێژەی قەڵەوی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

لە ئەمریکا گەورەترین ڕێژەی قەڵەوی هەیە، لە ئێستادا زیاتر لە ١٠٠ ملیۆن کەسیان قەڵەون.

لە بەریتانیا زیاتر لە ١٠ ملیۆن کەس و ١ ملیۆن منداڵ قەڵەون.

لە ئەوروپاو کەنەدا زیاتر ١٥٪ لە پیاوان و ٢٢٪ لە ئافرتان قەڵەون.

لەم ساڵانەی دواییدا هەمان ڕێژەی قەڵەوی لەزۆربەی وڵاتە دواکەوتووەکان لە کیشوەری ئاسیاو ئەمریکای باشور لەهەندێك وڵاتی کیشوەری ئەفەریقیا تۆمارکراوە. لە کاتێکدا لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەتایبەتی وڵاتە عەرەبیەکان ڕێژەی قەڵەوی لەسەرووی ٤٠٪ تێکڕای دانیشتووان دەگرێتەوە.

خوێنەری بەڕێز:

پێویستە لەسەرمان هەوڵبدەین خۆمان قەڵەو نەکەین، هەروەها پێوستە زۆر بجووڵێین، چونکە لەشی مرۆڤ وا بەدی هێنراوە زۆر پێویستی بەجووڵەو وەرزش هەیە، لەو جوڵە بەسوودانەش ڕۆیشتن بەپێ، ڕاکردنی هێواش، سەرکەوتن بە قادرمەداو پاسکیل سواری و مەلەوانی، بەڵام مەرجە بە بەردەوامی و ڕێکو پێکی ئەنجامیان بدەین و نابێ زۆریش خۆمان ماندوو و هیلاك بکەین.

کەمکردنەوەی چالاکیی فیزیکی و جووڵە جۆرەها نەخۆشیی بەدواوەیە وەك نەخۆشی دڵ و بەرزی فشاری خوێن، قەڵەوی و سەر ئێشەو زۆر تووڕەبوون و پشت ئێشە..

لە وڵاتە پێشکەوتووەکان قەڵەوی بە گەورەترین کێشەی لەش ساغی دادەنرێت کە ئەنجامی کۆبونەوەی چەوریی زۆرە لە لەشی مرۆڤ داو بەمەش کێشی لەش زۆر زیاد دەکات و لە ڕووی تەندروستیەوە زۆر ترسناکە.

وە باشترین چارەسەر بۆ ڕێگرتن لە قەڵەویی و ئەو گرفتە تەندروستیانەی کە بەهۆیەوە پەیدا دەبن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئامۆژگاریمان دەکات و دەفەرموێ: (تا برسیتان نەبێ لەسەر سفرە و خوان دامەنیشن و، پێش ئەوەی تێر ببن لەسەر خوانەکە هەستن).

بەرگی دووەم

# دەرکەوتنی خەڵکانێک شایەتی دەدەن بەبێ ئەوەی داوایان لێ بکرێت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی دەرکەوتنی کەسانێکن کە شایەتی دەدەن بەبێ ئەوەس داوایان لێ بکرێت..

پێشەوا عیمرانی کوری حصین (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِنَّ خَيْرَكُمْ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ يَكُونُ بَعْدَهُمْ قَوْمٌ يَشْهَدُونَ وَلَا يُسْتَشْهَدُونَ)[1].

واتە: چاکترینی ئوممەتم ئەوانەن کە لەسەردەمی خۆمدان، ئینجا ئەوانەی بەدوای ئەواندا دێن

بەڵام لە پاش ئەوان کەسانێك دێن شایەتی دەدەن بێ ئەوەی داوای شایەتیان لێ بکرێت.

ئەم سیفەتەش لە بایەخ پێنەدانی شایەتیە لەسەر کەسانی تر بەبێ زانست، وە ئەمەش ئاماژەیە بۆ لاوازی ئایینی خەڵکی و دابەزینی باوەڕیان.

ئەگەر سەیری ئەم فەرموودە بکەین هەموو موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەکو خۆی و ڕۆژی ڕووناك هاتۆتە دی.

زۆر جاران دڵتەنگ دەبم کەسانێك هەن شایەتی دەدەن بەبێ ئەوەی داوایان لێ بکرێت تەنها بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئەوانەوە، لەبەرامبەر ئەوەدا پارەیەکی زۆر کەم نرخی لێ وەردەگرێت.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ١٩٦٤) باب: فضل الصحابة ثم الذين يلونهم، برقم: (٢٥٣٥).

# دەرکەوتنی کەسانێک
# نەزر دەکەن و جێ بەجێی ناکەن

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی دەرکەوتنی کەسانێکن کە نەزر دەکەن و جێبەجێی ناکەن..

پێشەوا عیمرانی کوری حصین (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِنَّ خَيْرَكُمْ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ يَكُونُ بَعْدَهُمْ قَوْمٌ يَشْهَدُونَ وَلَا يُسْتَشْهَدُونَ، وَيَخُونُونَ وَلَا يُؤْتَمَنُونَ، وَيَنْذِرُونَ وَلَا يُوفُونَ..)[1].

واتە: چاکترینی ئوممەتم ئەوانەن کە لەسەردەمی خۆمدان، ئینجا ئەوانەی بەدوای ئەواندا دێن، بەڵام لە پاش ئەوان کەسانێك دێن شایەتی دەدەن بێ ئەوەی داوای شایەتیان لێ بکرێت و وە نەزر دەکەن و بەجێی ناگەیەنن..

ئەم سیفەتەیش لە بایەخ پێنەدانی خەڵکیە، بۆیەش زۆربوونی نەزرکردن لەگەڵ جێ بەجێ نەکردنیان، ئاماژە دەکەن بۆ لاوازی ئایینی خەڵکی و دابەزینی باوەڕیان..

زۆر جار لە خەڵکی دەبیستم و دەڵێت: ئەگەر خودا شیفای دام ئەوە یەك ساڵ بەڕۆژوو دەبم یان ئەگەر لە پۆلی شەش دەرچوم ئەوە یەك ساڵ مزگەوت دەمێنمەوە، ئەم جۆرە نەزرانە ناپەسندە، بەبەڵگەی ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کردووە لەوەی مرۆڤ ساڵێك بەڕۆژوو بێت.

کەسێك بیەوێت نەزر بکات ئەوە پێویستە بەپێی توانا بەجێی بێنێت خۆ گەر نەیتوانی بەجێی بێنێ ئەوا وەك قەرز لەسەری دەمێنێت، خۆ ئەگەر لە تواناییدا نەبوو ئەوا خودا تەکلیفی شتێك لە مرۆڤ ناکات ئەگەر لە توانای نەبێت.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ١٩٦٤) باب: فضل الصحابة ثم الذين يلونهم، برقم: (٢٥٣٥).

## پەیدابوونی نەخۆشی وا
## کە هەرگیز لە باوو باپیرانی پێشتریان نەبینراوە

یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر بڵاوبوونەوەی چەندین نەخۆشیە، کە لەسەردەمی باوو باپیرانمان نەخۆشی وا سەری هەڵنەداوە.. بە نمونە: نەخۆشی ئایدز بە پەتای سەردەم ناسراوە، ترسناکترین نەخۆشیە کە تووشی مرۆڤ دەبێت، چونکە چاکبوونەوەی زۆر ئەستەمەو تاکو ئێستاش لە سەرانسەری جیهان چارەسەری گونجاوی بۆ نەدۆزراوەتەوە، بۆیە ئەوەی گرنگ و جێگەی ئاماژە پێکردنە، زۆر کەس هەیە تووشی ئەو نەخۆشیە بووە بێ ئەوەی بزانێ هەڵگری ڤایرۆسەکەیە.. یان ڤایرۆسی کۆرۆنا..شێرپەنجە ..هتد..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (يا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ خَمْسٌ إِذَا ابْتُلِيتُمْ بِهِنَّ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ تُدْرِكُوهُنَّ: لَمْ تَظْهَرِ الْفَاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قَطُّ، حَتَّى يُعْلِنُوا بِهَا، إِلَّا فَشَا فِيهِمُ الطَّاعُونُ، وَالْأَوْجَاعُ الَّتِي لَمْ تَكُنْ مَضَتْ فِي أَسْلَافِهِمُ الَّذِينَ مَضَوْا..)[1].

واتە : ئەی کۆمەڵی موهاجیرەکان پێنج بەڵا هەن ئەگەر دوو چاریان ببن پەنا بەخوا دەگرم لەوەی پێیان بگەن، داوێن پیسی لەهەر میللەتێکدا سەری هەڵدابێت و ئاشکرا بوویێت، ئەوا جۆرە تاعون و دەردو نەخۆشیەکی وایان لەناودا پەیدا دەبێت کە هەرگیز لە باوو باپیرانی پێشتریاندا نەبینراوە، وەکو نەخۆشی ئایدز کە پێشتر نەبینراوە..

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر خوای گەورە سروشی بۆ نەناردبێ چۆن دەتوانێت ئاوا بە وردی قسەی زاناکانی ئەم سەردەمە بکات، لەکاتێکدا زانایانی سەردەم لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی زۆرەوەو لە ئەنجامی سەرهەڵدانی نەخۆشیەکانەوە ئەو دیاردەیەیان باسکردووە.

---

(١) صحيح: أخرجه الحاكم في (المستدرك) كتاب: الفتن والملاحم، باب: ذك خمس بلاء أعاذ النبي منها للمسلمين (٤/ ٥٤ ٥٤١) وصححه ووافقه الذهبي.

دەبینین چۆن ئەمڕۆ ئەم فەرمودەیە هاتۆتە دی، ئەگەر بەپەلە سەیری ئامارەکانی بڵاوبونەوەی نەخۆشیەکان بکەین سەرمان سوڕ دەمێنێت: هەروەکو بنکەی (میرك)ی پزیشکی کە گەورەترین بنکەی پزیشکی جیهانیە دەڵێت: ئەو نەخۆشیانەی پەیدا دەبن لە پەیوەندی زیناوەیە وەکو نەخۆشی ئایدزو زوهری و سووزنەك و سارس.

لەم فەرمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) کە باسمان کرد ئەوەبوو هەرکاتێك داوێن پیسی لە ناو قەومێك دا سەری هەڵدا، هەتا گەیشتە ئەو ڕادەیەی کەوا ئاشکرای بکەن، ئەوا تاعون و نەخۆشی گەلێکی ئەوتۆیان لە ناودا بڵاودەبێتەوە کە لەناو ئەوانەی پێش خۆیاندا نەبووە .

بۆیە زانستی نوێ و واقیعی سەردەم مانای ئەم فەرمودەیەیان دووپات کردۆتەوە، ڕاستی پێغەمبەریەتی پێغەمبەریان سەلماندووە، چونکە خەڵکی هەقیقەتی ئەمەیان درك پێ نەکرد بوو تەنیا لە دوا ساڵەکانی سەدەی بیستەم نەبێت کە داوێن پیسی بە شێوەیەکی ترسناك تیایدا بڵاوبۆوە، وە زۆرێك لە نەخۆشیە سێکسییەکان تێیدا پەرەی سەند کە لە پێشدا نەبوون، هەموو ئەوەش بە هۆی سەرهەڵدانی داوێن پیسیە.

کاتێك داگیرکاری ڕۆژئاوایی شاڵاویان بردە سەر وڵاتە موسڵمانەکان ئەو نەخۆشیەیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتبوو کە ئەو کاتی عەرەبەکان ناوی دەردە فەرەنجیان پێگوتووە، هەتا ئەمڕۆشی لەگەڵ دابێ ئەو ناوە هەر بەکاردێت .

بەڵێ.. ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی فەرمووە کێ توانیویەتی شتی وابڵێت .. ئەمڕۆش پاش (١٤٤١) ساڵ زیاتر لە ئەنجامی ئاشکراکردنی بەدڕەوشتی پڕوپاگەندە کردن بۆی و هەوڵدان بۆ بە یاسایی کردنی .. دەبینین کە فەرموودەکان وەکو خۆی هاتۆتە دی.. لەم سەردەمەدا نەخۆشی وا هاتۆتە کایەوە کە لە باو و باپیرانی پێشیندا نەبووە.. وەکو ئایدز کە زۆر لە وڵاتانی گرتۆتەوە.

بە نمونە: لە ئەفەریقیا گوندی وا هەیە هەموویان بە ئایدز قڕبوون و هێشتا حکومەت نەیزانیوە..

## ئـــایدز چــیە؟

نەخۆشیەکی درێژخایەن و ترسناکە، بەهۆی ڤایرۆسی کەمی بەرگری لەش (HIV) ڕوودەدات، وە بە دوا قۆناغی هەوکردنی ڤایرۆسەکە دادەنرێت کە تیایدا نەخۆشەکە کۆمەڵێك نیشانەی کلینیکی تایبەت و جیاکەرەوەی لێ بەدیار دەکەوێت، کەواتە بەتەنها تووشبوون بە ڤایرۆسی کەمی بەرگری لەش مانای ئایدز نیە، بەڵکو ئایدز واتە: «کۆنیشانەی دەسکەوتوو بەهۆی کەمی بەرگری لەش».

جیهازی بەرگری لەشی ئادەمیزاد نیشانەی دەسەڵاتی خوایە.. ئەو خانانەی بەرگری دەکەن دێنە لای ملەوەو لەلای غودەی (ثیموس) شفرەی سی هەزار خانەیان دەدرێتێ کە لەلاشەی ئەو کەسەدا هەیە.. تا بیانناسێتەوە، هەرکاتێك میکرۆبێ یان ڤایرۆسێکی بێگانە بێتە ناوەوە پەلەماری دەدەن و لەناوی دەبەن.. کەچی ئەو میکرۆبانە لە ئەنجامی نەخۆشی جنسیەوە بن ئەوا خانەکانی بەرگری بەرگری لێ ناکەن.

ئایدز ترسناکترین پەتای میکرۆبی (ڤایرۆسی) یە کە لەسەرەتای سەرهەڵدانیەوە لە ساڵی ١٩٨١ع تاوەکو ئێستا بە بەردەوامی هەڕەشە لە ژیان و چۆنایەتی ژیانی مرۆڤ دەکات بەهۆی کاریگەری هەمەلایەنە لەوانەش:

کاریگەری ئابووری: زۆربەی توشبوان گەنجن یاخود هێزی کارای ناو کۆمەڵن، توانایەکی ئابوری گەورەی دەوێت بۆ چارەسەرو هەوڵەکانی دۆزینەوەی کوتان و کردارە خۆپارێزیەکان.

کاریگەری کۆمەڵایەتی: جیاکردنەوەو دورخستنەوەیان لەناو کۆمەڵ، دروستکردنی درز لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان.

دوا ئاماری نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی (٢٠٠٨)ع لە هەر هەموو شاشەی میدیاکانی جیهان پەخش کرا کە تەنیا نەخۆشی ئایدز دوا ڕۆژە ترسناکەکەی لە (شەپۆڵە ڕەشەکانی تسۆنامی!) زیانبەخش ترە.

لە سەردەمی نوێدا نەخۆشی (هربس) وەکو پەتایەکی سێکسی بڵاوبویەوە بە شێوەیەکی فرەوان سەری هەڵدا هەتا تێکڕای ساڵانەی تووشبوون بەو نەخۆشیە لە وویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەگاتە نیو ملیۆن حاڵەت .

لە ساڵی (١٩٧٩)ع بۆ یەکەم جار لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا نەخۆشی لە دەست دانی بەرگری وەرگیراو ناسراو بە (ئایدز) سەری هەڵدا کە ڤایرۆس گەلێکن بە دوای خرۆکە سپیەکانی بەرگری لەشی مرۆڤ دەکەون و یەك لە دوای یەك تەفروتونایان دەکەن و هەتا وای لێدیت لەش گرنگترین هۆکارەکانی بەرگری کردن لە دەست دەدا، دوا بە دوای ئەمەش بە تەواوی دەستەوسان دەبێت لەبەرەنگاربوونەوەی ئەو نەخۆشیانەی لەشی ساغ لە بارو دۆخی ئاساییدا بەسەریدا زاڵ دەبێت، هەروەها خاوەنەکەی بەم شێوەیە دەمێنێتەوە هەتا دەیکوژێت.

لە هەر خولەکێك ئادەمیزادێك دەمرێت بە نەخۆشی ئایدز، لە هەر خولەکێك دوو ئادەمیزادی تریش تووشی ئایدز دەبن، بۆیە وا چاوەڕوان دەکرێت لە ساڵی (٢٠٣٠)ع زیاتر لە (١٠٠) ملیۆن کەس توشی ببێت و لە ساڵی (٢٠٥٠) ع سێیەکی دانیشتوانی زەوی بەم نەخۆشیەوە بناڵێنن ئەگەر لە بەد ڕەوشتی دوورنەکەونەوە.

**مەترسیەکانی زیناکردن و بەدڕەوشتی:**

١- نەخۆشی سەیلان.

٢- نەخۆشی زوهری.

٣- نەخۆشی برینە جنسیەکان.

٤- نەخۆشی برینی نەرم.

٥- نەخۆشی زوو پێگەیشتنی جنسی.

# پەیدابوونی منداڵی ناشەرعی و فڕێدانیان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر زۆربوون و پەیدابوونی منداڵی ناشەرعیە لە ڕێگای زیناوە..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لاَ تَزَالُ أُمَّتِي بِخَيْرٍ مَا لَمْ يَفْشُ فِيهِمْ وَلَدُ الزِّنَا، فَإِذَا فَشَا فِيهِمْ وَلَدُ الزِّنَا، فَيُوشِكُ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بِعِقَابٍ)[١].

واتە: ئومەتی من جارێ لەسەر خێرە تا وەکو لە ناویاندا منداڵی نا شەرعی پەیدا نەبووە، بەڵام ئەگەر منداڵی نا شەرعی پەیدا بوو لە ناویاندا ئەوا زۆر ناخایەنێت خودای گەورە سزایەکیان بۆ بنێرێت بۆ هەموویان .

لەم فەرموودەیەدا زۆر ڕاشکاوانە ئەوەمان بۆ بەدەردەکەوێت کە ئێستا ئێمە لەم سەردەمەداین...

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (إن من أعلام الساعة .. أن تكثر أولاد الزنا)[٢].

واتە: بە دڵنیایی لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی.. منداڵی زینا زۆر دەبێت.

ئەگەر سەیری ژیانی خۆمان بکەین هەموو ڕووداوەکان وەکو موعجیزەیەك پێمان نیشان دەدرێت.

---

(١) حسن: مسند الإمام أحمد (٦/ ٣٣٣) برقم: (٢٦٨٨٣٠) وذكره المذري في (الترغيب) (٣/ ٤٦٨) وقال: إسناده حسن.

(٢) ضعيف: أخرجه الطبراني في (المعجم الكبير) (٢٢٨/١٠)، والحديث ضعفه البيهقي كما في «البداية والنهاية» لابن كثير (٢٧٤/١٩) .

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى.. تكثر أولاد البغية)[1]

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت.. هەتا منداڵی زینا زۆر دەبێت..

هەر چەندە زانایانی فەرموودەناس دەفەرموون: ئەم سێ فەرموودەیە بێهێزە، بەڵام لە واقیعدا زۆر ڕوون و ئاشکرا ئەم موعجیزەیە دەردەکەوێت.

تەنانەت لە شەریعەتی ئیسلام منداڵی زینا هیچی بەسەر باوکییەوە نییە، واتە: نە بانگ دەکرێت بەناوی باوکیەوە نە بەشدار دەبێت لە میراتی باوکی لە دوای مردنی.

هەروەها مافی بەخێوکردن و مەسرەفی ژیانیشی هەر ناکەوێتە سەر باوکەکەی، بەڵکوو هەموو ئەمانە دەکەوێتە سەر دایکی!

ئەمە ڕای جمهوری زانایانە و بەلای ئەمانەوە دەڵێن: لەبەر ئەوەیە کە نەسەب زۆر گەورەیە لە ئیسلامدا و نابێت بە هیچ جۆرێك منداڵی زینا بدرێتە پاڵ نەسەبی باوك.

هەر چەندە هەندێ زانای تر بە پێچەوانەی ڕای جمهور دەڵێن و ئەوانیش قسەی جوانیان هەیە، لەوانە:

پێشەوا حەسەنی بەسری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: پیاوی زیناکار لە دوای ئەوەی حوکمی خوای لەسەر ئەنجام دەدرێت، منداڵەکەی دەکرێت بەناوی میراتیش وەردەگرێ.

پێشەوا ئیبراهیمی نەغەعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: منداڵەکە دەخرێتەوە سەر پیاوەکە بە یەکێك لەم دوو شتە:

- یان حوکمی حەددی بەسەر ئەنجام بدرێت .
- یاخود حەلاڵی بکات لە خۆی بە مارەکردنی.

---

(١) الترغيب والترهيب برقم: (٤١٩٣) (٣/ ٢٤٣).

# دەستخۆشی کردن لەسەر خوێندنەوەی قورئان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر قورئان خوێنەکان جگە لەوەی کە پارەی وەردەگرن لە چاوەڕوانی دەستخۆشین بۆ ئەوەی خەڵکی پێیان بڵێت: دەنگتان خۆشە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: (اقرءوا فكل حسن وسيجيء أقوام يقيمونه كما يقاح يتعجلونه ولا يتأجلونه)[١].

واتە: قورئان بخوێننەوە بۆ هەر خوێندنەوەیەك خێرێکە کۆمەڵە خەڵکێك دەردەچن زۆر خۆیان ماندوو دەکەن لە خوێندنەوەی، وە پەلەی ئەوەیانە کە خەڵك دەستخۆشیان لێ بکات، خۆ ماندوو دەکەن لەبەر ڕووپامایيان، پاداشتەکەی لە دونیا لە خەڵکی وەردەگرن.

لەم سەردەمە ئەوە بەدی دەکەین کە زۆربەی قورئان خوێنەکان حەزیان لە پێدا هەڵگوتن و مەدح کردنە.

هەوڵ بدە لە کاتی خوێندنەوەی قورئان دەنگت زۆر بەرزو نزم نەبێت، وە پێویستیت بە دەستخۆشی هیچ کەسێك نەبێت، چونکە قورئان سام و هەیبەتی خۆی هەیە، هەر کەسێك قورئان بخاتە نێو دڵ و دەروونیەوە ئەوا خوای پەروەردگار بەرزی دەکاتەوە..

کاتێك قورئان دەخوێنیتەوە ڕوو لەکەس مەکە بۆ ئەوەی دەستخۆشیت لێ بکەن، هەر کەسێك ویستی قسەت لەگەڵ بکات بە دەست ئیشارەتێکی بۆ بکەو داوای لێبووردنی لێ بکە، چونکە ڕێزی قورئان و هەیبەتەکەی پێویستە لەسەر هەموو کەسێك.

---

(١) صحيح: سنن ابي داود، وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة، (٢٥٩).

## قورئان لەسەر ئاوازی گۆرانی دەخوێنرێ

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی کۆمەڵە قورئان خوێنێك پەیدا دەبن، هەڵدەستن بە خوێندنەوەی قورئان لەسەر ئاوازی گۆرانی و بەند..

پێشەوا عابیسی غەفاری (ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (بَادِرُوا بِالْمَوْتِ سِتًّا: إِمْرَةَ السُّفَهَاءِ، وَكَثْرَةَ الشُّرَطِ، وَبَيْعَ الْحُكْمِ، وَاسْتِخْفَافًا بِالدَّمِ، وَقَطِيعَةَ الرَّحِمِ، وَنَشْوًا يَتَّخِذُونَ الْقُرْآنَ مَزَامِيرَ يُقَدِّمُونَهُ يُغَنِّيهِمْ ، وَإِنْ كَانَ أَقَلَّ مِنْهُمْ فِقْهًا)[١].

واتە: دەست پێشخەری بکەن بە چاکە پێش ئەوەی شەش شت ڕوو بدات و بێتە پێشەوە:

دەسەڵات کەوتنە دەست کەسانی بێ نرخ

زۆربوونی پۆلیس

فرۆشتنی حوکمی خوا

بە سوك سەیرکردنی خوێن ڕشتن

پچراندنی پەیوەندی خزمایەتی

پەیدابوونی کەسانێکی تازە پێگەیشتوو کە قورئان دەکەنە ئامێر بۆ ئاوازەکانیان، کەسێکیان پێش دەخەن بۆ پێش نوێژی کە تەنها بە ئاوازی خۆش قورئانیان بۆ بخوێنێت هەر چەندە لە هەمووشیان زانیاری و تێگەیشتنی لە ئایین کەمترە.

لەم سەردەمە کۆمەڵێك گەنجی تازە پێگەیشتوو پەیدا بوون کە قورئان بە ئاوازی گۆرانی دەخوێننەوە گوایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو جۆرە خوێندویەتیەوە..

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٣/ ٤٩٤) برقم: (١٦٠٤٠)، والطبراني في (الكبير) (١٨/ ٣٦/ ٦١) وقال الأرناؤوط: حديث صحيح.

نابێت خوێندنەوەی قورئان تەنها بە بیستن یان بە ئیجتیهاد وەربگرین، بەڵکو پێویستی بە زنجیرەیەك سەنەد هەیە، بۆ نموونە دەڵێین: فڵانە کەس لە فیسارە کەسەوە ئەویش لە فڵانی ترەوە ئەمیش لە فڵانێکی ترەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) وەرگرتووە، لەبەر ئەوە دەوترێت: لە (حفص)ەوە ئەویش لە عاصمەوە، دەبێت بەم شێوەیە بێت..

بۆیە ئەوەی بەبێ بوونی سەنەدەکان قورئان دەخوێنێتەوە هیچ بنەمایەکی ڕاستی تێدا نییە، کەسانێك هەن قورئان وەك خەڵکی عاشق و گۆرانیبێژەکان دەخوێننەوە کە ئەمەش دروست نییەو ئەو کەسە لۆمە کراوە.. بۆیە ئەم جۆرە خوێندنەی کە بەشێکی زۆر لە قورئان خوێندنەکان دەیخوێننەوە بە یەکێك لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی هەژمار دەکرێت..

لە ریوایەتێکی تر دەفەرموێ: (اقرأوا القرآن بلحون العرب وأصواتها وإياكم ولحون أهل الفسق فإنه سيجيء بعدي قوم يرجعون القرآن ترجيع الغنا والرهبانية والنوح لا يجاوز حناجرهم مفتونة قلوبهم وقلوب الذين يعجبهم شأنهم..)[1].

واتە: قورئان بخوێنن بە لەحنی عەرەبی و دەنگەکەی، بەڵام تکایە ئاگاداری لەحنی فاسقەکان بن، چونکە لە دوای من قەومانێك دێن قورئان لەسەر ئاوازی گۆرانی و گاورەکان و گریان دەخوێنن، کە لە قورگیان تێپەڕ ناکات، دڵیان بووەتە فیتنە وە ئەوانەی بەوانیش سەرسوڕمانن.

ئەگەر سەیری ژیانی خۆمان بکەین لەم سەردەمە زۆر بە ڕوونی و ئاشکرا ئەوانەمان بۆ بە دەردەکەون کە چۆن قورئانیان کردووەتە قوربانی ئاوازی خۆیان (خوای گەورە پەنامان بدات).

ئەمەش سەلماندنی موعجیزەیەکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، خودای گەورە هەموو لایەکمان پارێزراو بکات.

---

(١) رواه ابن وضاح.

## ڕق لێبونەوەی منالّ و بەخێوکردنی توتکە سەگ

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بوونەوەر کۆمەلّێك لە خەلّکی پەیدا دەبن، لە ژێر ناوی پێشکەوتن و ئازادی خوازی هەلّدەستن بە بەخێوکردن و پەروەرکردنی سەگ..

یەکێك لەو مەترسیانەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەوالّی پێداوین، کە هەڕەشەیەکی گەورەیە بۆ لەناوبردنی خێزان و خانەوادە، حەز ناکات مندالّی ببێ، وە دەیانەوێت ئەو کۆمەلّگەیەی بەرەو داڕوخان ببەن.

هەروەکو پێغەمبەر خوا(ﷺ) دەفەرموێ: (اذا اقترب الزمان.. ويربي الرجل جرو كلب خير له من أن يربي ولدا له[1]...

بە خەیالّی هیچ مرۆڤێك دانەدەهات کە ڕۆژێك لە ڕۆژان خەلّکی ڕقیان لە پەروەردەکرنی مندالّ ببێتەوە هەلّبستن بە بەخێوکردن و پەروەرکردنی سەگ و تولە.. بە تایبەتی لە نێو میللەتی کوردی خۆمان..

خوای گەورە ئەوەی ئاشکرا کرد بۆ پێغەمبەری(ﷺ) کە ڕۆژێك دێت ئەم دیاردەیە سەرهەلّدەدات و شانازیشی پێوە دەکەن.. وە هەوالّی داوینێتی کە ئەمە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی..

توتکە یان توتکە سەگ (بە ئینگلیزی puppy) بەچکە سەگە، کە هەندێکیان کێشیان لە ١ بۆ ١,٥ کیلۆگرامە لە کاتێکدا هەندێکیان کێشیان ٧ بۆ ١١ کیلۆگرامە، بە زۆری ئەو توتکانە کە زۆر مندالّن زۆربەی کاتیان بە خەوتن و خواردنەوە بەسەر دەبەن، کاتێك لە دایك دەبن زۆربەی کاتیان بە خواردن و خەوتن بەسەر دەبەن، وە هەستی بینیان زۆر چاکە بەلاّم ناتوانن چاویان بکەنەوە لە سێ مانگی یەکەمدا[2].

---

(١) المستدرك على الصحيحين:(٣٨٦/٣) برقم: (٥٤٦٥).

(٢) توتکە ویکیپیدیا ئینسایکلۆپیدیای ئازاد.

# گرنگی بە ڕازاندنەوەی قورئان دەدرێت

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەڕەشەی لە ناوچوون و کاول بوون لە ئوممەتەکەی دەکات هەر کاتێك مزگەوت و قورئانەکانیان بە نەقش و نیگار ڕازاندەوە.

پێشەوا ئەبو زەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (إِذَا زَوَّقْتُمْ مَسَاجِدَكُمْ، وَحَلَّيْتُمْ مَصَاحِفَكُمْ، فَالدَّمَارُ عَلَيْكُمْ)[1].

واتە: هەر کاتێك مزگەوتەکانتان جوان و پڕ زەوق کردو قورئانەکانتان نەخشاوەو ڕازاوە کرد، ئەوا کاولکاری و تیا چوون بەشتانە.

پێشەوا مەنناوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان و ڕەنگاو ڕەنگردنی قورئانەکان ناپەسند کراوە لە شەرعدا، لەبەر ئەوەی ئەم کارە دڵەکان بێئاگا دەکاو ڕامان و پەرستشەکان لەگەڵ خودای گەورە دوور دەکاتەوە[2].

کەواتە لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت هەر کاتێ وای لێهات مزگەوتەکانیان ڕازاندەوەو نوێژیان تێدا نەکردو قورئانەکانیان بە ئاوی ئاڵتون دەنوسیەوە بەڵام نەیان دەخوێندەوەو بە فەرمانەکانیان ئیشیان نەدەکرد، ئەوە کاتی لەناوچونە کەوابێ تەوبە بکەن یا بە گوناهباری نەمرن.

قورئانەکان ئەمڕۆ دەنەخشێنرێن و بە ئاوی ئاڵتون ڕووکەش دەکرێن، بەڵام چەند کەمن ئەوانەی ڕێز لە قورئان دەگرن و هەقی خۆی دەدەنێ و کاری پێ دەکەن .

---

(١) حسن لغيره: أخرجه ابن أبي شيبة (٦/ ١٤٩) كتاب: الصلوات، باب: في المصحف يحلى، برقم: (٣٠٢٣٧). وهو مروي ايضاً من كلام أبي الدرداء وأبي هريرة وأبي ذر، وهو حسن لغيره.

(٢) فيض القدير (١/ ٣٦٧).

کەسانێك پەیدابوون کە قورئانیان بە ئاوی ئاڵتون نووسیوەتەوە یان بە ئاڵتون دەنووسنەوە ئەمەش نمونەیەکە لەو نمونە زۆرانە:

لە ئیمارات ماوەی ساڵ و نیوێکە لە پڕۆژەی دروست کردنی گەورەترین قورئانی پیرۆز لە جیهاندا کاری بۆ دەکرێ و چاوەڕوان دەکرێ لەماوەیەکی کەمدا تەواو ببێت.

ئەندازیاری ئەم پڕۆژەیە کابرایەکی میصریە بەناوی (عبدالعزیز حطب)ە هێلکاری ئەم قورئانەی کێشاوە.. کێشی ئەم قورئانە ١٠ تەنەو ٦٥٠ لاپەڕەی هەڵکەنراوە لە مسی پالاّوتە بە ئاڵتونی عەیار ٢٤ رووپۆش کراوە.

ئەم پرۆژەیە پاش تەواو بوونی دەخرێتە سەر لاپەڕەکانی مێژوو لە مەوسوعەی (کنگیز) هەڵدەگیرێ.. درێژی ئەم قورئانە ١٤٠ سم ەو پانی ١٠٠ سم کێشی هەر لایەك ٣٠ تا ٣٥ کیلۆگرامە و ئەستوری هەر لاپەڕەیەکی (١/٥-٢ ملم)ە.

هەروەها وڵاتی لیبیا نوسخەیەکی قورئانی پیرۆز کە گەورەترین قورئانە لەسەرتاسەری جیهان و سەرتاپاش لە زێڕ دروست کراوەو کێشەکەشی (٥٠٠) کیلۆ گرامەو ناویشی لێنراوە قورئانی زێڕین و لاپەڕەکانیشی بە فۆنتی (٥٨) نوسراوە[١].

بەداخەوە.. دیاردەیەکی نوێ لە بازاڕەکانی جیهانی ئیسلامی سەریهەڵداوە، ئەویش قورئانە ڕەنگاوڕەنگەکانن، کە بووەتە جێگەی نیگەرانی لەلایەن بەشێك لە موسڵمانان.

دکتۆر محەممەد ئەلعرێفی کۆمێنتێکی لەسەر ئەو بابەتە نوسیوەو دەڵێت:

لەم سەردەمە قورئانە ڕەنگاو ڕەنگەکان بە شێوەی نامۆ دەردەکەون، کە ناوەکانی خوای گەورە و پێغەمبەران و شارەکان بۆ هەر یەکێکیان ڕەنگێکی تایبەت کراوە.

وە قورئانەکان ڕەنگ کراون بە ڕەنگی سوور و پەمەیی و زەردو سەوز.. هتد، هەر کەسەو بە گوێرەی زەوق و مەزاجی خۆی هەڵدەبژێرێت و بازرگانی پێدەکات، بۆیە تکا دەکەم با هەیبەتی قورئان پارێزراو بکەین.

---

(١) ماڵپەڕی هەواڵی موحیت.

بەرگی دووەم

# گرنگی دان بە ڕازاندنەوەی مزگەوتەكان و شانازی پێكردنیان

لە نیشانەكانی نزیكبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی بایەخ زۆر بە مزگەوتەكان دەدرێت و خۆیانی پێوە هەڵدەكێشن، وە نەك مزگەوتێك بكەن خۆیانی پێوە هەڵدەكێشن، بەڵكو ئەگەر بەرماڵێكی بۆ بكڕن لە هەزار جێگە باسی دەكەن..

پێشەوا ئیبنو جەوزی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

هەر كەسێك ناوی خۆی لەسەر ئەو مزگەوتە بنوسێت كە دروستی دەكات، ئەو كەسە نیازی دورە لەوەی بۆ خوابێ[1].

باش وایە مرۆڤ خۆی بەدوور بگرێ لە ڕازاندنەوەو نەخشو نیگاركردنی مزگەوت، چونكە كارێكی نەشیاوە بەو جێگە پیرۆزە، جگە لەوەی زیادە ڕەویە لەماڵ بەفیڕۆدان و سەرقاڵ بونی نوێژ خوێنانیشە لەلایەكی ترەوە، مزگەوت تا سادەو ساكار بێت چاكترە، تاوەكو مۆرك و شوێنەواری پەرستش و چێژی خواناسی پێوە دیاربێت و مەبەستی دین داری بێتە جێ.

پێشەوا ئەنەسی كوڕی مالیك (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَبَاهَى النَّاسُ فِي الْمَسَاجِدِ)[2].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا خەڵكی گرنگی زۆر دەدەن بە ڕازاندنەوەی مزگەوتەكان و شانازی پێوە دەكەن.

هەروەها دەفەرموێ: من بەهیچ جۆرێك فەرمانم پێ نەكراوە مزگەوتەكان بەرزبكەمەوە لە دروست كردنیدا.

---

(١) فتح الباري (١/ ٦٣٨).

(٢) مسند الإمام أحمد (٣/ ١٣٤)(١٢٤٠٢).وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم

پێشەوا ئیبنو عەباس (ﷺ) دەڵێت: (لتُزَخْرِفُنَّهَا كَمَا زَخْرَفَتِ اليَهُودُ وَالنَّصَارَى)[1].

واتە: بە نەقش و نیگار دەیرازێننەوە هەروەکو چۆن جولەکەو دیانەکان بە نەقش و نیگار کڵێسەکانیان دەرازێننەوەو جوانی دەکەن بەڵام خواپەرستی تێدا ناکەن.

هاوەڵان خاوەن پارە بوون بەڵام ئەوان دڵەکانیان بنیات دەنا نەك نەخش و نیگارو ڕوکەش، دانایی ئەو شتەیە کە لە باوەڕدار ونە، وەریبگرە ئەگەر لە ناموسڵمانیشەوە بێت.

پێشەوا عومەر (ﷺ) نەهی کردووە لە نەخشاندن و ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان، چونکە خەڵکی لە نوێژدا خەیاڵیان پەرت دەکات، کاتێك کە مزگەوتەکەی پێغەمبەریان (ﷺ) لە سەردەمی ئەودا تازە کردەوە فەرمووی: (أَكِنَّ النَّاسَ مِنَ المَطَرِ، وَإِيَّاكَ أَنْ تُحَمِّرَ أَوْ تُصَفِّرَ فَتَفْتِنَ النَّاسَ)[2].

واتە: وا دروستی بکەن خەڵکی باران لێیان نەدات، بەڵام نەکەن سووری بکەن یان زەردی بکەن و خەڵکی تووشی فیتنە و ئاشوب بکەن.

پێشەوا ئەبو ذەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (إِذَا زَوَّقْتُمْ مَسَاجِدَكُمْ، وَحَلَّيْتُمْ مَصَاحِفَكُمْ، فَالدَّمَارُ عَلَيْكُمْ)[3].

واتە: هەر کاتێك مزگەوتەکانتان جوان و پڕ زەوق کردو قورئانەکانتان نەخشاوەو ڕازاوە کرد، ئەوا کاولکاری و تیا چوون بەشتانە.

پێشەوا ئەنەسی کوری مالیك(ﷺ) دەڵێت: (يَتَبَاهَوْنَ بِالْمَسَاجِدِ لَا يَعْمُرُونَهَا إِلَّا قَلِيلًا)[4].

---

(١) صحيح: أخرجه ابن حبان (٤/ ٤٩٤) كتاب: الصلاة، باب: المساجد عنوانه النهي عن تباهي المسلمين في بناء المساجد وزخرفتها، برقم: (١٦١٥).

(٢) صحيح البخاري (١/ ٩٦) كتاب: الصلاة، باب: بنيان المسجد، برقم: (٤٤٦).

(٣) حسن لغيره: أخرجه ابن أبي شيبة (٦/ ١٤٩) كتاب: الصلوات، باب: في المصحف يحلى، برقم: (٣٠٢٣٧). وهو مروي ايضاً من كلام أبي الدرداء وأبي هريرة وأبي ذر، وهو حسن لغيره.

(٤) صحيح البخاري (١/ ٩٦) كتاب: الصلاة، باب: بنيان المسجد، برقم: (٤٤٦).

واتە: مزگەوتەکان دەڕازێننەوە بەڵام زۆر بە کەمی ئاوەدان دەبێت و خەڵك ڕووی تێدەکات.

پێشەوا مەنناوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان و ڕەنگاو ڕەنگردنی قورئانەکان ناپەسند کراوە لە شەرعدا، لەبەر ئەوەی ئەم کارە دڵەکان بێ ئاگا دەکاو ڕامان و پەرستشەکان لەگەڵ خودای گەورە دوور دەکاتەوە[1].

پێشەوا شافیعی(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) ڕای وایە کەوا مزگەوت جوان کردن هەر چەند کەعبەش بێت بە زێڕ یان بە زیو جوانکردنی حەرامە، وە بە جگە لەم دوانە ناپەسندە[2].

بۆیە یەکەمین کەس کە گرنگیان بە ڕازاندنەوەی مزگەوتەکاندا شیعەی فاتیمیەکان بوون، وە هەر ئەوان بوون ئەو هەموو نەخش و نیگارەیان دروست کرد[3].

بەڕاستی خەڵکی ئەمڕۆ تەنها ئامۆژگاریەکەی عومەریان پشت گوێ نەخستووەو بەس، بەڵکو کار لە سوور کردن و زەردکردن تێپەڕیوەو مزگەوتەکانی ئەمڕۆ بە هەزارو یەك شێوە نەقش و نیگار ڕازێندراوەتەوەو هەموو جۆرەکانی هونەری نەخشاندن و نیگار کێشان پێشبرکێ تێدا دەکەن، خەڵکی ئەمڕۆ وا دەزانێ مزگەوت و ئاوەدان کردنەوەی لە ڕێگەی ڕازاندنەوەو دیکۆرکاریەوە دەبێت، بێ ئاگا لەوەی کە ئاوەدان کردنەوەی مزگەوت لە ڕێی عیبادەت و زیکرو قورئان خوێندن و خوێندنی زانستی شەرعی و هاتوو چۆی بەردەوامیەوە دەبێت.

ڕازاندنەوەو نەخش و نیگارکردنی مزگەوت لە ئیسلامدا نیە، وەك دەگوترێ یەکەم کەسێك ئەم باوەی داهێنا (وەلیدی کوری عبدالملك) بووە، لە کۆتایی

---

(١) فیض القدیر (١/ ٣٦٧).

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٣) علامات الساعة الصغری والکبری، عبدالله عبدالعزیز امین، لا ٦٣.

چاخی هاوەڵان، زۆرێك لە ئەهلی عیلم کە بێدەنگیان لەم کارەی کرد وە نەبێت پێی ڕازی بووبن، بەڵکو لە ترسا بوو، نەوەك تووشی خراپەیەك ببن، ئەگەر شتێکی باش و چاك بوایە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆی فەرمانی پێدەکرد، یا کەسێکی وەك عومەری کوری خەتاب(ﷺ) کە لە سەردەمی ئەودا فتوحات زۆر بوو، هەروەها ماڵ و داراییش ئێجگار فرەوان بو لە ژێر دەستیدا، بەڵام دەستی لە مزگەوتەکەی مەدینە نەدا، بەکورتی: سوننەت وایە لە مزگەوتدا زیادەڕەوی نەکرێت لە ڕازاندنەوەیدا[1].

وە نابێت مزگەوت ڕەنگاو ڕەنگ بکرێت، چونکە خەڵکی توشی ئاشوب دەبن، دەی ئەگەر لەم چاخەدا بوایە چی لەبارەی مزگەوتەکانی ئەم سەردەمە بوتایە!

پێشەوا بەغەوی (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت:

جولەکەو گاورەکان کاتیٚ دەستیان دایە ڕازاندنەوەو نەخش و نیگاری جێگە پەرستشەکانیان، کە پەڕاوە پیرۆزەکانیان دەستکاری کردو گۆڕییان[2].

ئەمڕۆ لە کاتێکدا مزگەوتەکان هەزاران هەزار دینار بۆ دروست کردنی گومەزە و منارە و دیکۆر سازییەکەی بەکار دەهێنرێت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ڕیٚ دەگیرێت لە موسڵمانان کە بە بەردەوامی هاتوو چۆی بکەن و ئاوەدانی بکەنەوە و شەرعی خوای تێدا فێر بن ، ئێستا مزگەوتەکان وەك فەرمانەگەکانی تری میری کاتی دەوامیان داگیر کراوە، چارەکێك پێش بانگ دەکرێنەوەو چارەکێکیش دوای بانگ دادەخرێن.

لە الموسوعة الفقهية (١١/ ٢٧٥) باسکراوە دەڵێت:

حەڕامە مزگەوت بڕازێندرێتەوە بە نەخش بە پارەی وەقف، حەنەفی و حەنابلە بۆ ئەوە چوون واجبە زەمانەتی ئەو ماڵە بات کە لە نەخشی مزگەوت سەرف دەکات، چونکە هیچ مەسڵەحتێکی تێدا نییە.

---

(١) فتح الباري (١/ ٦٣١).

(٢) فتح الباري (٦٣٢).

# كوشتنی پێشەواكان و مامۆستایانی ئایینی

لە نیشانەكانی نزیكبوونەوەی كۆتایی بونەوەر كوشتنی پێشەوایەكان و مامۆستایانی ئایینیە..

پێشەوا حوزەیفەی كوری یەمان(ﷺ) دەفەرموێ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَقْتُلُوا إِمَامَكُمْ..)[1].

واتە: سوێند بەوەی كە گیانی منی بە دەستە كۆتایی بونەوەر نایەت هەتا پێشەواكانتان و مامۆستای ئایینیەكانتان دەكوژن..

ئەم نیشانەیەی قیامەت زۆر ڕاشكاوانە لەم سەردەمەدا هاتۆتە دی.. بەردەوام و مامۆستایانی ئایینی و بانگخوازان لە كەمین دان...

بۆیە ئەم فەرموودەیە هەم كەسایەتیە بەرپرسەكان دەگرێتەوە هەم مامۆستایانی ئایینیش..

لە فەرموودەیەكی تر فەرموویەتی: (يأتي على الناس زمان يُقتل فيه العلماء..)[2].

واتە: سەردەمێك بەسەر خەڵكی دێت زانایانی تیایدا كوژراوە.

تەنانەت خوای گەورە خێری بۆ یەكێك بوێت توشی ئازاری دەكات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: كەسێك خوا بیەوێ توشی خێری بكات، توشی ناخۆشی و ئازاری دەكات[3]. چونكە بە هۆی ئەو ناخۆشی و ئازارانەوە خوای گەورە لە تاوانەكانی خۆش دەبێت و پاكی دەكاتەوە لە گوناهەكانی.

---

(١) سنن الترمذي -تحفة الأحوذي (٦/ ٣١٩) -أبواب الفتن- باب ما جاء في الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر ، وقال الترمذي: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ عَمْرِو بْنِ أَبِي عَمْرٍو.

(٢) ضعيف: رواه أبو عمرو الداني في سننه (٣٠٢). قال ابن سعد: ضعيف، وقال الجرجاني: واهي الحديث (ميزان الاعتدال) (١٢٤ ١٢٥).

(٣) صحيح البخاري، برقم: (٥٦٤٥).

## نەفرەت کردن زۆر دەبێت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر خەڵکی نەفرەت لە یەکتری دەکەن.

بەداخەوە.. زۆرێك لە خەڵکان زمانی خۆیان پێ ناگیرێ ئەگەر توڕەبوون دەست بەجێ نەفرەت دەکەن، نەفرەت لە مرۆڤ و گیاندارو بێ گیان و شەوو ڕۆژو کاتەکان دەکەن، لەگەڵ ئەوەش دا نەفرەت لە خۆیان و منداڵەکان دەکەن، هەروا پیاو نەفرەت لە ژن دەکات و بە پێچەوانەوەش.. بۆیە زۆربوونی ئەم نەفرەتانە بە یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر هەژمار دەکرێ.

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يَكُونُونَ فِي آخِرِ الزَّمَانِ تَكُونُ تَحِيَّتُهُمْ بَيْنَهُمْ إِذَا تَلَاقَوا التَّلَاعُنُ..)[1].

واتە: لە کۆتایی هاتنی ڕۆژی قیامەت.. سڵاوکردنی نێوانیان هەر کاتێك بە یەکتری بگەن نەفرەت لە یەکتری دەکەن..

ئەم نیشانەیەی قیامەت زۆر ڕاشکاوانە لەم سەردەمەدا دەبینین.. پێغەمبەر (ﷺ) چۆنی فەرمووبوو بەو شێوەیە هاتە دی.. بە تایبەتی لە نێو گەنجەکان کاتێك بە یەکتری شاد دەبن لە جیاتی سەلامکردن جوێن ئاراستەی یەکتری دەکەن..

لە ریوایەتێکی تر فەرموویەتی: (سيأتي على الناس زمان .. ويكثر فيه التلاعن ويفشو فيه..)[2].

واتە: سەردەمێك بەسەر خەڵکی دێت نەفرەتکردن لەیەکتری زۆر دەبێت و پەرەدەسەنێت و بڵاودەبێتەوە.

---

(١) صحيح: المستدرك على الصحيحين للحاكم (٤/ ٤٩١، رقم ٨٣٧١) هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ). وقال الذهبي: (منكر).

(٢) ضعيف: اخرجه ابو داود، قال الالبا ن: ضعيف الإسناد.

# ژن بۆ دەوڵەمەندیەکەی دەخوازرێت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر کەسانێك هاوسەرگیری دەکەن تەنها بۆ دەوڵەمەندیەکەیان دەیانخوازن..

پێشەوا ئەبو ئومامەی باهیلی (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری (ﷺ) فەرموویەتی:

(لا تقوم الساعةُ حتى يعمَدَ الرجلُ إلى النَّبَطيَّةِ فيتَزَوَّجُها على معيشته، ويترك بنت عمِّه لا ينظرُ إليها)[1].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا پیاو پشت بە بەدەوڵەمەندیەکەی ئافرەت دەبەستێت و دەیخوازێت لەسەر بژێوی خۆی، واز لە کچە مامەکەی دەهێنێت و سەیری ناکات (لەبەر هەژاریەکەی).

ئەم نیشانەیەی قیامەت زۆر ڕاشکاوانە لەم سەردەمە دەبینین.. پێغەمبەر (ﷺ) چۆنی فەرمووبوو بەو شێوەیە هاتە دی.. بە تایبەتی لە نێو گەنجەکان زۆر دەوترێت ئەگەر ئافرەتێك پارەو خانوو و زێڕی نەبێت نایخوازم..

وە ناشبێ ئەوەمان لە یاد بچێت کە ئافرەت بۆ چوار مەبەست مارە دەکرێت:

- بۆ ماڵەکەی.
- بۆ ناوداریەکەی.
- بۆ جوانیەکەی.
- بۆ دینەکەی.

---

(١) ضعيف: رواه الطبراني في (الكبير) برقم: (٧٩٦٤). قال الهيثمي: رواه الطبراني في (المعجم الكبير) وفيه جعفر بن الزبير، وهو كذاب (مجمع الزوائد) (٤/ ٢٦٠).

## بەزەیی نامێنێت

لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی مرۆڤی بێبەزەیی زۆر دەبێت..

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری (ﷺ) فەرموویەتی: (لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا وَلَضَحِكْتُمْ قَلِيلًا، يَظْهَرُ النِّفَاقُ، وَتُرْفَعُ الْأَمَانَةُ، وَتُقْبَضُ الرَّحْمَةُ..)[1].

واتە: ئەوەی من دەیزانم ئەگەر ئێوە بیزانن زۆر دەگرین و کەم پێدەکەنن، دوو ڕوویی سەر هەڵدەدات و، ئەمانەت هەڵدەگرێت و، بەزەیی هەڵدەگیرێت و نامێنێت..

ئیسلام ئایینی سۆز و بەزەیی و لێبوردەییە، لە هەمان کاتدا ئایینی سەربەرزی و کەرامەتە کە داوای بەزەیی و لێخۆشبوون دەکات لە نێوان هەموو خەڵکدا، چونکە ئەمە ڕەوشتی ئیسلام و پێغەمبەرو هاوەڵە بەڕێزەکانی بووە، تەنانەت ئەگەر سەیری ژیاننامەی پێغەمبەری (ﷺ) بکەین هەمووی بەڵگەن لەسەر بەزەیی هاتنەوە.

ئیسلام بۆ هەموو شتێك بنەماو ڕێسایەکی داناوە بۆ ئەوەی هیچ شتێك پێچەوانەی باوەڕو ئایین نەبێت، ئەمەش لەسەر بنەمای دوو مەرجی سەرەکی:

- کاتێك بەرامبەر بە یەکێك بە بەزەیی دەبیت ئەوە خوای گەورە پاداشتێکی گەورەی دەداتەوە.

- نابێت و حەرامە هەندێ جار بەزەیی هاتنەوە ببێتە مایەی بێباوەڕی و سەرشۆڕی و دووڕوویی.

ئەگەر سەیری ژیانی ئەم سەردەمەی خۆمان بکەین زۆر ڕاشکاوانە ئەوە بەدی دەکەین کە بەزەیی زۆر زۆر کەم بووە لە نێو ئوممەتی ئیسلام، خوای گەورە هەموو لایەکمان پارێزراو بکات و بەزەیی بخاتە نێو دڵەکانمان.

---

(١) صحيح: رواه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٦٢٢) برقم: (٨٧٢٥) وقال الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيح.

# مزگەوت قسەی دونیایی تێدا دەکرێت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی مزگەوتەکان قسەی دونیاییان تێدا دەکرێت..

بەداخەوە.. خەڵکانێکی زۆر لەو موسڵمانانەی کە هاتوو چۆی مزگەوت دەکەن و ڕووی تێدەکەن بێ ئاگان لە ئادابی مزگەوت و چۆنیەتی پاراستنی حورمەتی ئەو جێگە پیرۆزە، زۆر جار دەبینین هەندێك لە پیاوە بە ساڵا چووەکان یان کەسانێك تازە ڕوویان لە مزگەوت کردووە، مزگەوت بە شوێنی حەوانەوەو کۆڕو کۆبوونەوەی دونیایی دەزانن، دەنگی تێدا بەرز دەکەنەوەو باسی چەندین مەسەلەو کاروباری دونیایی تێدا دەکەن و ڕێی نوێژو قورئان خوێندنیش لە خەڵك دەگرن، کە ئەمەش کارێکە خوای گەورە غەزەبی پێ دەگرێت.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (يأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَكُونُ حَدِيثُهُمْ فِي مَسَاجِدِهِمْ فِي أَمْرِ دُنْيَاهُمْ، فَلَا تُجالِسُوهُمْ، فَلَيْسَ لِلَّهِ فِيهِمْ حَاجَةٌ)[1].

واتە: سەردەمێك دێت بەسەر خەڵکی قسەی ناو مزگەوتەکانیان هەر باسی کاروباری دونیا دەبێت، ئێوەش لە کۆڕو مەجلیسیان دامەنیشن، چونکە خوای گەورە کاریان پێ نیە.

لەم سەردەمە هەندێ کەس پەیدا دەبن کاروبارو قسەی دونیایان دەبەنە مزگەوت، جا ئەوەی کە خواناسە با لەگەڵ ئەوانە دانەنیشن، چونکە خوا هیچ کارێکی بەوانە نیەو هیچیان لێ وەرناگرێت.

ئەگەر خوای گەورە دەرگای مزگەوتی بۆت کردەوە ئەوا یادی خوای گەورەی تێدا بکەو سەیری خەڵکی مەکە کە مزگەوتیان کردۆتە دوکان و قسەی دونیایی تێدا دەکەن.

---

(١) شعب الإيمان (٤/ ٣٨٧) برقم: (٢٧٠١). هكذا جاء مرسلًا.

# خەوبینین وەکو خۆی دەردەچێت

یەکێك لە نیشانەکانی هاتنی دوا ڕۆژ وای لێدێت، خەڵکان کاتێك خەو دەبینین خەوەکانیان بۆ بەیانی دێتە جێ.

پەروەردگار شەو و ڕۆژی داناوە، کە مرۆڤ لە ڕۆژدا هەوڵ و کۆششی خۆی بکات و لە شەویشدا پشو بدات و بخەوێت، جا لە کاتی نوستنیش مرۆڤ خەو دەبینێت کە ڕەنگە زیاتر بەهۆی روحەوە بێت.

پێشەوا ئەبو هوریرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ رُؤْيَا الْمُسْلِمِ تَكْذِبُ، وَأَصْدَقُكُمْ رُؤْيَا أَصْدَقُكُمْ حَدِيثًا، وَرُؤْيَا الْمُسْلِمِ جُزْءٌ مِنْ خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ..)[1].

واتە: لە کۆتایی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی وای لێدێت زۆر بە کەمی خەون بینینی موسڵمان بە درۆ دەردەچێت، وە دیتنی خەوی موسڵمانیش بەشێکە لە چل و پێنج بەشی پیغەمبەرایەتی.

پێشەوا ئیبنو ئەبی حەمزە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەم فەرمودەیە پێ دەچێت مەبەستی ئەوە بێت خەو بینینی موسڵمان لە ئاخیر زەمان وەك خۆی دەربچێت و پێویست بە لێکدانەوە نەکات، بە پێچەوانەی پێشتر، چونکە لەوانەیە خەونەکانی ڕاست دەرنەچوویایە.

حیکمەتیش لە ڕاستی خەوەکان لە ئاخیر زەمان ئەوە دەگەیەنێت کە لەو کاتەدا موسڵمانەکان غەریب بووبن.

ئەو سودانەی لەو فەرمودەوە دەستمان دەکەوێت ئەمانەن:

---

(١) صحيح البخاري، كتاب التعبير ، باب القيد في المنام (١٢ / ٤٠٤ - مع الفتح) و صحيح مسلم، كتاب: الرؤيا ، (١٥ / ٢٠ - مع شرح النووي).

بەرگی دووەم

١) ڕاستی خەوی موسڵمان لە کاتی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی، هەروەکو چۆن ئەو کەسەی لەکاتی گیان کێشاندایەو گەیشتنی بە قیامەت نزیك بوەتەوە.. پەردە لەسەر چاوی لادەبرێ و هەندێ لە ڕاستیەکانی ئەو دونیا دەبینێ.

٢) ڕاستی خەوەکە پەیوەستە بە ڕاستگۆیی خەو بینەرەکەوە، چونکە موسڵمانی باوەڕ دامەزراو شەیتان ناتوانێ یاری بە عەقڵی بکات، بەڵام مرۆڤی درۆزن ئەو خەوانەی دەیبینن خەوی بۆش و بەتاڵ و درۆن وەك خۆیان، چونکە شەیتان بەهەموو شێوەیەك یاریان پێ دەکات.

٣) خەوی ڕاست بەشێکە لە ئیلهام، چونکە لەلایەن خوای پەروەردگارەوەیە.

٤) خۆ ڕزگارکردن لە شەڕی خەوی خراپ بەنوێژکردن و پاڕانەوەو نەگێڕانەوەی بۆ کەس.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فێرمان دەکات کە خۆمان لە شەڕی خەوی خەراپ بپارێزین، کە دەفەرموێ: ئەگەر یەکێ لە ئێوە خەوێکی دی و دڵی پێی خۆش بوو ئەوە سوپاس و ستایشی خوای مەزن بکات و بیگێڕێتەوە.. وە ئەگەر خەوێکتان دی پێی دڵخۆش نەبوو ئەوە ئەو خەوە لە شەیتانەوەیە.. با پەنا بگرێت بەخوا لە کردەوەی شەیتان و بۆ هیچ کەسێکی نەگێڕێتەوە.

پێشەوا ئەبو هوریرە(ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (لَمْ يَبْقَ مِنَ النُّبُوَّةِ إِلاَّ الْمُبَشِّرَاتُ قَالُوا وَمَا الْمُبَشِّرَاتُ قَالَ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ)[١].

واتە: لە پێغەمبەرێتی هیچ نەماوەتەوە جگە لە موژدەدەرەکان، گوتیان موژدەدەرەکان چین ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟ فەرمووی: خەوی باشە موسڵمان دەیبینێت.

---

(١) صحيح البخاري (٩/ ٤٠) باب المبشرات، برقم: (٦٩٩٠).

بەرگی دووەم

دەتوانین چەند وانەیەکی ئیعجازی بیرکاری لەچەند ئایەتێکی خوای پەوەردگارەوە بخەینە ڕوو وەکو کە دەفەرموێ: [أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٤﴾][1].

واتە: ئاگاداربن بێگومان دۆستانی خوا ترسیان لەسەر نیە خەفەتیش ناخۆن، ئەوانەی باوەڕیان هێناوە هەمیشە خۆیان دەپارێزن و لە خوا دەترسن، هەر بۆ ئەوانە مزگێنی لە ژیانی دونیا، وە لە دوا ڕۆژدا گۆڕان نیە بۆ وتەو بەڵێنەکانی خوا، هەر ئەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە.

لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) بە پلەی یەکەم (أَوْلِيَآءَ)، واتە: وەلیەکان خەوی باش دەبینن، یان پێیانەوە دەبینرێت، وەلیەکان زۆرتر خەوی باش دەبینن، ئەگەر سەرنجی ئایەتی (٦٤)ی سورەتی (یونس) بدەین پاشان لە ئایەتی (١٠٠)ی سورەتی (یوسف) بە وردی ئەوا ئەم خاڵانە بەدی دەکەین :

١) خەوی باش (الرؤيا الصالحة) بەشێکە لە (٤٦) بەشی نبوەت، واتە: بەشێکە لە (٤٦) بەشی وەحی پێغەمبەرایەتی، دەبینین کە ئایەتی «خەوی باش» واتە: ئایەتی دەستەواژەی [وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ ٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ ﴿٤٦﴾]ی سورەتی (یونس) (٤٦)ەمین ئایەتی سورەتی (یونس)ە لەلای چەپەوە، سورەتەکەش بەناوی یەکێك لە پێغەمبەرانەوە ناو نراوە کە بریتیە لە پێغەمبەر (یونس)، جا هەروەك خەوی باش بەشێکە لە (٤٦) بەشی نبوەت، ئایەتەکەی سورەتی (یونس)یش ئایەتێکە (٤٦) ئایەتەکەی کۆتایی سورەتی (یونس).

٢) (تەوا فوقەکە) پێچەوانەیە، واتە : ژماردنی ئایەتەکان لەلای چەپەوەیە وەك لە خاڵی یەکەمدا خستمە ڕوو، ڕەنوسی ئایەتەکە (٦٤)هەمینە، ئەگەر لە مێشکی خۆماندا پێچەوانەی بکەینەوە دەبێت بە (٤٦).

---

(١) سورة يونس ، الآية : (٦٢ ٦٤) .

٣) (ولی) کە واتاکەی دۆستی خوداو ڕوو لە خودا دەگەیەنێت، جەمعەکەی بریتیە لە (أَوْلِيَآءَ)، مادام (ولی)یەکان خەوی باش زۆرتر دەبینن، یان زۆرتر پێیانەوە دەبینرێت ئەوا پەیوەندی لە نێوان خەوی باش و (ولی)دا بەهێزە، وشەی (ولی) بە حیسابی جوممەل دەکاتە (٤٦): ولی و+ل+ی= (٦+٣٠+١٠=٤٦).

٤) لە سورەتی (یونس) تەنها یەکجار ژمارە (یەك) هاتووە، بێگومان ئەویش بە عەرەبی هاتووە کە بریتیە لە وشەی (واحدة) کە دەکەوێتە ئایەتی (١٩)ەوە لە دەستەواژەی (أمة واحدة)، جا ئەگەر لەم ئایەتەوە لەلای ڕاستەوە بەرەو لای چەپ ئایەتەکانی سورەتی (یونس) بژمێرین، ئەم ئایەتەی کە وشەی (واحدة)ی تێدایە ئایەتی (١) بێت لە ژماردندا ، ئەوا ئایەتی خەوی باش واتە: ئایەتی [وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ ٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ ﴿٤٦﴾] ی سورەتەکە (٤٦)ەمین ئایەت دەبێت لەم جۆرە ژماردنەدا.

٥) هەر لەسەرەتای سوورەتی (یونس)ەوە تا کۆتایی ئایەتی دەستەواژەی [لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٤﴾] ژمارەی ئایەتەکان = (٦٤) ئایەت ، ئەگەر ڕەنوسی گشت خانەکانی ژمارە (١ تا ٦٤) کۆبکەینەوە ئەوا ئەنجامەکەیان دەکاتە (٤٦٠)، کۆی ڕەنوسی گشت خانەکانی ژمارە بیرکاریەکانی (١ تا ٦٤)ی ئایەتەکانی سورەتی (یونس) = ١+٢+٣+٤+٥+٦+٧+٨+٩+١+٢+٣+٤+٥+٦+٧+٨+٩+١٠ +٢+٣+٤+٥+٦+٧+٨+٩+١٠+١١+٣+٤+٥+٦+٧+٨+٩+١٠+١١+١٢+ ٤+٥+٦+٧+٨+٩+١٠=(٤٦٠)، (٤٦٠) ژمارەیەکە بەسەر (٤٦)، زنجیرەی سورەتی (یونس)یش کە ژمارە (١٠)یەو دابەش دەبێت، بڕوانە: (٤٦٠ ÷ ١٠=٤٦)، (٤٦٠ ÷ ٤٦ = ١٠)، (٤٦٠ = ٤٦ × ١٠) = زنجیرەی سوورەتەکە ×٤٦.

٦) لە ئایەتەکەدا وشەی (کلمت) موفرەدەکەی بریتیە لە (کلمە)، لە قورئان ئەو وشانەی کە واتای (وشە) دەگەینن، واتاکەیان پەیوەندی بە وشەوە هەیە، کە بریتین لە وشەی (کلمت)، (كَلِمَ)، (كَلِمَة)، ژمارەی گشت ووشەکانی (کلمت + کلم+ كَلِمَة) لە قورئاندا = (٤٦) وشە .

بەرگی دووەم

ئەو شەش خاڵەی کە باسکران لەبارەی سورەتی (یونس)و ئایەتی (٦٤)ی (یونس)ەوە بوون، لێرە بە دواوە باس لە نمونەی تر دەکەین کە پەیوەندی بە خەوی باش و وشەی (ولی)ەوە هەیە.

خەو بینینی پێغەمبەران سروشەو خەوبینینی موسڵمانانیش (بەمەرجێك لە چوار چێوەی فەرمانەکانی قورئان و سوننەت دەرنەچێت، واتە: شتێکی تێدا نەبێت کە پێچەوانەی شەرعی خوا بێت) ، ئەوە موژدەیە بۆ ئەو کەسە.

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [ وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى الْعَرْشِ وَخَرُّوا لَهُ سُجَّدًا وَقَالَ يَا أَبَتِ هَذَا تَأْوِيلُ رُؤْيَايَ مِنْ قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا وَقَدْ أَحْسَنَ بِي إِذْ أَخْرَجَنِي مِنَ السِّجْنِ وَجَاءَ بِكُمْ مِنَ الْبَدْوِ مِنْ بَعْدِ أَنْ نَزَغَ الشَّيْطَانُ بَيْنِي وَبَيْنَ إِخْوَتِي إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِمَا يَشَاءُ إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ (١٠٠) ][1].

واتە: وە باوك و دایکی لەسەر تەختی حوکمڕانی خۆی دانان، وە هەموو کەوتن بە ڕوودا بۆی بە سوژدە بردنەوە (یوسف) گوتی: ئەی باوکی خۆشەویستم ئەمە لێکدانەوەی خەوەکەم بوو کە لەمەو پێش (بینیم) بێگومان پەروەردگارم بەڕاستی گێڕا، بەڕاستی خوا چاکەی لەگەڵ کردم کاتێ لە زیندان دەری هێنام، وە ئێوەشی لە لادێ و بیابانەوە هێنا بۆ (ناو شار) دوای ئەوەی شەیتان ناخۆشی و ناکۆکی خستە نێوان من و براکانم، بەڕاستی پەروەردگارم بە سۆزە بەرامبەر ئەوەی بیەوێ، بەڕاستی هەر ئەو زانای کار دروستە .

ئەم ئایەتە باسی هاتنە دی خەوەکەی پێغەمبەر (یوسف) دەکات، ئەم خەوەی لەسەردەمی منداڵیدا بینیوە، خەو بینینەکەی لەسەردەمی پێغەمبەرایەتی خۆیدا نەبووە، ژمارەی وشەکانی ئەم ئایەتەی سورەتی (یوسف) کە باسی هاتنە دی خەوی باش دەکات = (٤٦) وشەیە .

---

(١) سورة يوسف، الآية: (١٠٠).

## جۆرەکانی خەو بینین:

زۆربەی کەس دوودڵن بەرامبەر بەو واتاو مەبەستانەی کە لەبینینی خەودا ڕاڤە دەکرێ.. جا ئەو مەبەستانە ئاشکرابن یان شاراوە، هەندێکی تر بە هیچ شێوەیەك باوەڕییان پێی نیەو هەتاکو لەباسی خەوەکەدا پێغەمبەر یعقوب (سەلامی خوای لێ بێ) بینویەتی دەڵێن: ئەمە یەکێك بووە لە موعجیزەی پێغەمبەر یعقوب (سەلامی خوای لێ بێ).

یان دەڵێن: پاشای میصر بینی و پێغەمبەر یوسف (سەلامی خوای لێبێ) بۆی واتا کرد.. بەڵگەیەکی خوای مەزن بوو کە ویستی بەهۆیەوە خۆشەویستی خۆی کە پێغەمبەر یوسفە (سەلامی خوای لێبێ) لە بەندیخانە ڕزگاربکات بە ویست و ئیرادەی خوای مەزن.

هەندێ کەسیش بیروبۆچونیان دەگێڕنەوە سەر بیردۆزی (فرۆید) لە خەوبینین دا.. وە دەڵێن: هەرچی خەو هەیە ڕەنگدانەوەی ڕۆژانی ژیانمانە بەڵام هەموو خەونێك بخەینە ناو ئەم دۆسیەوە ئەوە شتێکی بێ ماناو بەربەرچ دراوەیە.

بەدڵنیاییەوە دەڵێین: لە فەرمودەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) هاتووە کە هەندێ لە خەوەکانمان پەیوەستن بە ژیانی خودی خۆمانەوە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: (إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ رُؤْيَا الْمُسْلِمِ تَكْذِبُ، وَأَصْدَقُكُمْ رُؤْيَا أَصْدَقُكُمْ حَدِيثًا، وَرُؤْيَا الْمُسْلِمِ جُزْءٌ مِنْ خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ..)[1].

واتە: لە کۆتایی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی وای لێدێت زۆر بە کەمی خەون بینینی موسڵمان بە درۆ دەردەچێت، وە دیتنی خەوی موسڵمانیش بەشێکە لە چل و پێنج بەشی پیغەمبەرایەتی.

---

(١) صحيح البخاري، كتاب التعبير ، باب القيد في المنام (١٢ / ٤٠٤ - مع الفتح) و صحيح مسلم، كتاب: الرؤيا ، (١٥ / ٢٠ - مع شرح النووي).

بۆیە بەدەگمەن دەبینین كە خەوی موسڵمان دەقاو دەق ڕاست نەبیٚ.. ئەو كەسانەی كە ڕاستگۆن ئەوانە ڕاسترین خەو دەبینن.. خەوی موسڵمانیش بەشێكە لە چل و پێنج بەشی ئیلهامی پێغەمبەرایەتی.

پێشەوا ئیبنو سیرین (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) خەوی دابەش كردووە بە سیٚ جۆرەوە:

١) خەوی باش و دڵخۆشكەر موژدەی خواییە بۆ ئەو كەسەو ئەو ناوچەیە.

٢) خەوی ناخۆش و دڵتەنگكەر فێڵ و تەڵەكەو كاری شەیتانە ئەگەر ئەم جۆرە خەوەتان دی هەستن نوێژ بكەن و بۆ كەسی مەگێڕنەوە.

٣) خەونێك كە پەیوەست بیٚ بە ژیانی ڕۆژانەمانەوە، ئەمەیان ڕەنگ دانەوەی ڕۆژانی ڕابردوومانە.

لە باسی جۆرەكانی خەوبینین باس لەوەكرا كە هەندیٚ خەوبینین ڕەنگدانەوەی ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤە، هەندێكیان بۆ ترساندنی باوەڕدارانە لەلایەن شەیتانەوە، هەروەها باسمان كرد كە چۆن خۆمان ڕزگار بكەین لە شەڕی خەوی خراپ، بە نوێژكردن و پاڕانەوەو پەناگرتن بەخوا لە شەڕی شەیتان، وە نەگێڕانەوەی ئەو خەوە بۆ خەڵكی .. بۆیە لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە كە ئایا نهێنی چیە لەو جۆرە خەوە ڕاستانە كە لە داهاتوو (غیب) باس دەكات و هەروەكو خۆی دێتە پێشەوە.. هەروەكو ئەو خەوەی كە پاشای میصر بینی و پێغەمبەر یوسف (سەلامی خوای لێبیٚ) بۆی واتا كرد و لە ئاكامدا دەقاو دەق خەوەكەی هاتە دی؟

لە وەڵامدا دەڵێین: نهێنی ئەم جۆرە خەوانە ئەوەیە كە خەوی ڕاست بەشێكن لە ئیلهامی خوایی.. ئیلهام و نیگا تایبەتە بە پێغەمبەرانەوەو ناگونجیٚ بۆ كەسانی تر باس لە ئیلهام و نیگا بكەن بۆیان لەلایەن خواوە.. بەڵام خوای مەزن بەسۆزو بەزەیی خۆی هەندیٚ كەسی شەرەفدار كردووە بە بەخشینی ئیلهام بۆیان، بەڵام لە كاتی خەوتندا نەك لە كاتی بەخەبەری، تاكو زیاتر بڕوایان دابمەزریٚ بەدەسەڵاتی خوای مەزن و گەورەیی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەر

خەڵكیەوە، وە تا باش بزانن كە ئەم ژیانە ماددیەی تیایدا دەژین هێزێكی تری نادیار لە پشتمانەوەیە هەڵی دەسوڕێنێت و چۆنی بوێت وەها فەراهەمی دێنێت.

خەوتن چەندەها نهێنی سەرسوڕهێنەرو گەورەی تێدایە هەر كەسێ پەی ببات بەو نهێنیانە زۆر لای ئاسان دەبێت كە هەندێ لە نادیار (غەیب) لە خەودا پەردەی لەسەر لاببرێ.. بە كورتی و بەكوردی خەوتن بریتیە لە مردنێكی بچووك.. لە مردنی گەورەدا گیان (ڕۆح) دەردەچێت و دەگاتە ژیانی بەرزەخ، وە لەوێ زۆر شتی بۆ ئاشكرا دەبێ كە لە ژیانی دونیادا پەی پێ نەبردووە، وە بەخەیاڵیدا نەهاتووە یان هەر بڕوای پێ نەبووە، دوای گەیشتن بە ژیانی بەرزەخ هەر كەسەو بەقەدەر هیدایەت و زانیاری باوەڕەكەی و كردەوە چاكەكانی سۆزو بەزەیی خوای میهرەبانی بەردەكەوێ.. كەواتە لە ژیانی دونیادا چەند لەخواوە نزیك بیت لە ژیانی بەرزەخدا ئەوەندە لە خۆشحاڵی و سۆزو بەرەكەتی خواییدا دەبیت...

دەتوانین بڵێین كە مرۆڤ لە كاتی خەوتندا (كە مردنێكی بچوكە) گیانی لە لاشەی دوور كەوێتەوە و دەشێ هەندێ لە نادیارو نهێنییەكانی بۆ ئاشكرا بكرێت، ئایا ئاشكرا كردنەكە بەشێوەی ڕاستەقینەیی بێت یان بە واتا بێت.. بەڵام ئەو كەسە ئەگەر لەلایەنی نەفسی زاڵ بووبێ بەسەر ژیانی ڕۆژانەیدا ئەوە بەهەمان شێوە لە خەونەكانیشدا هەر زاڵە بەسەریداو خەمەكانی بەخەوی ڕاستەقینە (نابژێرێن؟) دەیانگۆڕێ بۆ خەوی هەڵەج.. هەروەكو شەیتان چۆن وەسوەسە دەخاتە دڵ و دەروونی موسڵمانەوە لەكاتی بەخەبەریدا، هەروەها لەكاتی خەویشدا ئەمە دەتوانێ.. دەبینین خەوەكانی بریتی دەبن لە خەوی ترسناك و دڵتەنگی.. كەواتە هەر كەسێ لەم جۆرە خەوانەی بینی با پەنابگرێ بەخوای مەزن لە شەڕی شەیتان و ئەو خەوە بۆ كەس نەگێڕێتەوە..

بەڵگەمان بۆ ئەوەی كە بزانین نوستن مردنێكی بچوكە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبۡعَثُكُمۡ فِيهِ لِيُقۡضَىٰٓ أَجَلٞ مُّسَمّٗىۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٦٠﴾][1].

---

(١) سورة الأنعام، الآية: (٦٠).

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: [ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلۡأَنفُسَ حِينَ مَوۡتِهَا وَٱلَّتِي لَمۡ تَمُتۡ فِي مَنَامِهَاۖ فَيُمۡسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيۡهَا ٱلۡمَوۡتَ وَيُرۡسِلُ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ ][1].

لەم دوو ئایەتە بۆمان دەدەکەوێت کە (ڕۆح)ی مرۆڤ لەکاتی خەوتندا جیا دەبێتەوە لە لاشەی، هەر بۆیە مرۆڤ لەخەودا دەتوانێ هەندێ شتی نادیارو نهێنی بۆ ئاشکرا ببێ.. ئەویش بە ویستی خوای گەورە بۆ ئەو کەسانەی کە خۆی مەبەستیەتی، بەڵگەشمان بۆ ئەوەی کە دەڵێن مرۆڤ لەکاتی خەوتندا مردنی بەسەر دادێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبۡعَثُكُمۡ فِيهِ لِيُقۡضَىٰٓ أَجَلٞ مُّسَمّٗىۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٦٠﴾ ][2].

[يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ ] واتە: لەکاتی مردندا گیانتان دەکێشرێ.

[ثُمَّ يَبۡعَثُكُمۡ فِيهِ ] بە ڕاشکاوی دیاری دەکات کە بەخەبەر بوونەوە بریتیە لە زیندوبوونەوەیەکی تازە دوای مردن، پێغەمبەر(ﷺ) کە پێش خەوتن دەیفەرموو: (بسمك اللهمَّ أموت وأحيا) واتە: ئەی خوای مەزن بەناوی تۆوە دەمرم و زیندوو دەبمەوە، وە لەکاتی لەخەو هەستاندا دەیفەرموو: (الحمدلله الذي رد على روحي وعافاني) واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە گیانی بۆ گێڕامەوەو بەلەش ساغی ژیانی پێ بەخشیمەوە..

لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت ئەویش ئەوەیە ئەگەر لە کاتی نوستندا (ڕۆح) لەلاشە دەردەچێ چۆن لاشە بەبێ (ڕۆح) بە زیندوویی دەمێنێتەوەو لەکار ناکەوێت؟

لە وەڵامدا دەڵێین: لەکاتی خەوتندا دەرچوونی ڕۆح بەتەواوەتی نیەو نابێتە هۆی مردنی خانەو شانەکانی لەش.. هەر چەندە ئەمە بە ئاشکرا لە شوێنی تردا دەبینرێ.. چونکە زیندەگی خانەکانی لەش و ژیانی مرۆڤ جیاوازن لە

---

(١) سورة الزمر، الآية: (٤٢).

(٢) سورة الأنعام، الآية: (٦٠).

یەکتری، ئەی نابینی کۆرپەلە هەر لە یەکەم ڕۆژی ناو ڕەحمی دایکیەوە جۆرە ژیانێکی تایبەتی هەیە (ڕۆحی تێدا نیە تا تەمەنی دەگاتە چوار مانگ) بەڵگەمان لەسەر ژیانی ئەم کۆرپەلەیە زیادبوونی خانەکانیەتی کە لەماوەیەکی زۆر کەمدا چەندە جار دەبنەوە.. ئەم جۆرە ژیانەی کە تیایدایە بەهۆی گیانێکی تایبەتیەوە کە ناو دەبرێ بە (الروح الحیوانیه) واتە: گیانی گیانلەبەری هەروەکو پێشتر باسمان کرد، دواچ چوار مانگ بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم دروستکراوە ئامادە دەبێت بۆ پێشوازی کردن لە بەهاترین بەخشینی خوایی کە پێی دەبێ بە بەڕێزدارترین دروستکراوی ئەم بوونەوەرە ئەویش بریتیە لە بەخشینی ڕۆح کە ئەم دروستکراوەی پێ دەبێ بە مرۆڤ، وە ئەم بەخششەی خوایی یاوەری ئەم کەسە دەبێت هەتا لە دونیا دەردەچێ و لێی جیانابێتەوە.. مەگەر لە کاتی مردندا کە ئیتر ئەو لاشەیە بەشیاو نازانرێ بمێنێتەوە، چونکە ئەو دینەمۆیەی هەڵی دەسوڕاندا تیایدا نەماوە ئیتر شایەنی ئەوە نیە پێی بگوترێت مرۆڤ، بەڵام لەکاتی نووستندا بەشێوەیەك لە شێوەکان ڕۆح لە لاشە دوور دەکەوێتەوە، بەڵام (روح الحیوانی) هێشتا هەر تیایدا دەمێنێتەوەو خانەو شانەکانی لەش هەر بە زیندوویی دەمێنیتەوە لەسەر ئەم بنەمایەی باسمان کرد، ژیان خانەکانی لەشی پەیوەستە بە گیانی حەیوانییەوە کە بناغەیە بۆ دامەزراندن و پێشوازی کردن گیانی مرۆڤ ئەگەر یەکەم نەبوایە ئەوە گیانی مرۆڤی بە هیچ شێوەیەك لەو لاشەیدا جێگای نەدەبویەوە، هەر چۆن دروست نیە ئەم گیانە ئینسانیە بکێشرێ بەبەری شتێکدا تا ببێت بە ئینسانێکی زیندوو، لێرەدا دەتوانین دوو نمونە بهێنینەوە بۆ زیاتر ڕۆشن کردنەوەی ئەم باسەمان:

نموونەی یەکەم: ئەگەر دوو گڵۆپی کارەباییمان هەبێت، هەر یەکێکیان بەسترابێت لە سویچێك.. گڵۆپی یەکەمیان سویچەکەی کوژابێتەوە، بەڵام گڵۆپی دووەمیان ئەو وایەرەی کارەبای پێ دەگەیەنێ لە ڕێگادا بچڕابێ.. گڵۆپی یەکەمیان وەکوە کەسێکی نووستوو وایەو گڵۆپی دووەمیان وەك کەسێکی مردوو.. هەر چەندە هیچ لەو گڵۆپانە کارەبایان تێدا نیە، بەڵام بەدەست لێدانێکی کەم لە سویچی یەکەم و داگیرساندنی دەبێتە هۆی داگیرساندنی گڵۆپەکەو

گەڕانەوەی هێزی کارەبا بۆی، هەروەها کەسێك کە نوستبێت هەر چەندە ڕۆح لە لەشیدا نیە بەڵام گڵۆپی دووەم هەر چەندە سویچەکەی دابگرسێنی هیچ ئاسەوارێکی کارەبا لە گڵۆپەکەدا نابینی، هەروەها کەسی دووەم کە مردووە و گیانی لەلاشەیدا نەماوەو بە تەواوەتی لێی بچڕاوە هەر چەندە ئەو کەسە بانگ بکەیت و ڕایبوەشێنی بەهیچ جۆرێك جوڵەو یانی بۆ ناگەڕێتەوە..

نموونەی دووەم: ئەگەر بزانین دەرکەوتنی وێنە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنێك پەیوەستە بە گەیشتنی تەزووی کارەبا بۆ ئەو ئامێرە کە مەرجێکی تریشی تێدا هەیە، ئەویش ئەوەیە کە هیچ یەکێك لە پارچەکانی ناو ئامێرەکەی تێك نەچوویێ کە ببێتە هۆی دەرنەکەوتنی وێنە لەسەر شاشەکە.. دەتوانین لێرەدا ئەم نموونە بخەینە سەر باسەکەمان، گەیشتنی تەزووی کارەبا بۆ ئامێرەکە بریتی بێت لە ڕۆحی حەیوان لەلاشەی مرۆڤدا کە ئەم مەرجە پێویستە بۆ پێشوازی کردنی ڕۆحی ئینسانی هەروەك سەلامەتی پارچەکانی ئامێرەکە مەرجە بۆ دەرکەوتنی ئاسەواری کارەباکە کە دەرکەوتنی وێنەیە لەسەر شاەی تەلەفزیۆنەکە.. هەر کاتێك ئەم تەلەفزیۆنە کەم و کوڕییەکی تێدا بێت کە ببێتە هۆی نەگەیشتنی تەزووی کارەبا بۆ ئامێرەکە ئەوە هەرچی بکەین لەو ئامێرە بۆ خستنە گەڕی بێ سوودە.. هەر چەندە پارچەکانی تری ئامێرەکە ساغ بێت.. هەروەها کاتێك ڕۆحی ئینسان لەلاشە دەردەچێ دەمرێ دەبێتە هۆی لەناوچوونی خانەو شانەکانی لەشی مرۆڤ [1].

---

(١) تابلۆ ناوازەکان، (لا ٦٣) .

# زۆربوونی بەرپرس

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر کە لەم سەردەمە بە چاوی خۆمان دەبینن زۆربوونی سەرکردەیە لە وڵاتانی موسڵمانان..

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (ﷺ) دەڵێت:

(كَيْفَ أَنْتُمْ .. إِذَا كَثُرَتْ أُمَرَاؤُكُمْ ..)[1].

واتە: حاڵتان چۆن دەبیٚ کاتێك سەرکردەکانتان زۆربوون .

بوونی ئەم هەموو دەوڵەتە بە بیری هیچ یەکێك نەدەهات کە ڕوویدات، چونکە ئیسلام حەرامی کردووە دەوڵەتی موسڵمانان پارچە پارچە بێت، چونکە موسڵمانان تیایدا بیٚ دەسەڵات دەبن و دوژمنان پەلامارمان دەدەن، هەروەکو ئەمڕۆ بە چاوەکانی خۆمان دەبینین.. لەم ڕۆژگارەشدا دەوڵەتی موسڵمانان خۆی لە (٢٥) دەوڵەت دەبینێتەوە، کە ئەمەش ڕاستیەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەردەخات.

ئەگەر سەیری بارودۆخی ژیانی موسڵمانان بکەین لەم سەردەمە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە چەندین بەرپرس وڵاتێك یان شارێك بەڕێوە دەبەن، کە ئەمەش هەموو هاتنە دی موعجیزەکانی پێغەمبەری خوایە (ﷺ).

بەرپرسیارەتی گەورەترین و ئەستەمترین ڕێگا دەگرنە بەر لە دونیا وە لە ڕۆژی دواییش لێپرسینەوەیان زۆر قورستر دەبێت، چونکە مافی خەڵکیان بەسەرەوە هەیە.

خەڵکی لە دونیا زۆر بە دوای لێپرسراویەتی کۆشش دەکەن، تەنانەت هەندیٚ جار ریشوەی بۆ دەدەن بۆ ئەوەی بگەن بەو جێگایانەی کە خۆیان مەبەستیانە، بەڵام لە کۆتاییدا فەشەل دەهێنێت و ناتوانێت کارەکان بەرێکوپێکی ئەنجام بدات.

---

(١) السنن الواردة في الفتن (٣/ ٦١٨) برقم: (٢٨١).

بەرگی دووەم

## بانگ بەکەسانی لاواز دەسپێردرێ

یەکێك لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی بانگدان بە کەسانی لاواز دەسپێردرێت. ئەگەر دەتانەوێ ئەو کەسە بناسن کە خوای پەروەردگار لاشەکەی قەدەغە کردووە لە ئاگری دۆزەخ، ئەوە بانگ بێژەکانە.

پێشەوا عومەری خەتاب (ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُؤَذِّنِينَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُؤَذِّنِينَ)[1].

واتە: خوایە! لە بانگ بێژەکان خۆش ببە، خوایە! لە بانگ بێژەکان خۆش ببە.. منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا وابزانم بەشێوەیەك بەجێمان دەهێڵی کە دوای تۆ لەسەر بانگدان بەشمشێر بەربببینە یەکتری، فەرموی: (كَلَّا يَا عُمَرُ، إِنَّهُ سَيَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَتْرُكُونَ الْأَذَانَ عَلَى ضُعَفَائِهِمْ، وَقَالَ: لُحُومٌ حَرَّمَهَا اللَّهُ عَلَى النَّارِ، لُحُومُ الْمُؤَذِّنِينَ).

واتە: نەخێر ئەی عومەر ڕۆژێك دێت بانگ بە لاوازەکانیان دەسپێرن، ئەو گۆشتەش کە خودا لە ئاگری قەدەغە کردووە گۆشتی بانگ بێژانە.

بەندە ڕای وایە.. کەسی لاواز مەبەست پێی دەنگ ناخۆشەکان و نەشارەزاکانن کە بانگ دەدەن، وە ئەوانەی دەنگیشیان خۆشە زۆر بە کەمی بانگ دەدەن یانیش لێیان ناگەڕێن بانگ بدەن.. کە ئەمەش زۆر جار بووەتە کێشەی هەندێك لە شارو گەڕەکەکان، وە خەڵکیش دەناڵێنن بەدەست ئەم جۆرە بانگبێژانەوە.

ئەمانەش هەموو هاتنە دی موعجیزەکانی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە پێش هاتنی قیامەت ئەم ڕووداوانە ڕوودەدات و خەڵکیش دوورکەونەوە لە مزگەوت بە هۆی دەنگە ناخۆش و نەشارەزاییەکەیانەوە.

---

(١) الترغيب في فضائل الأعمال (١/ ١٦١) برقم: (٥٦٦).

# ئاوات خواستن بە بینینی پێغەمبەر محەممەد (ﷺ) لە خەودا

یەکێك لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی خەڵکی ئاواتە خوازن بە دیتنی پێغەمبەر(ﷺ) لە خەو.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَيَأْتِيَنَّ عَلَى أَحَدِكُمْ يَوْمٌ لا يَرَانِي، ثُمَّ لأَنْ يَرَانِي أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ مِثْلِ أَهْلِهِ وَمَالِهِ مَعَهُمْ)[١].

واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە ڕۆژێك دێت بەسەر ئێوە کە نامبینیێ، ئەگەر بیەوێت بمبینێت بەلایەوە خۆشەویسترە لە خێزان و ماڵ و خانەوادەکەی ..

ئیبنو محەممەدی کوڕی سوفیان (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

واتای ئەم فەرموودەیە لەلای من بەم شێوەیە: ئەگەر منی لەگەڵ ماڵ و منداڵی بینی منی پێخۆشترە، بەڵام نامبینێ..

لە ڕیوایەتێکی تر فەرموویەتی: (مِنْ أَشَدِّ أُمَّتِي لِي حُبًّا نَاسٌ يَكُونُونَ بَعْدِي يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ رَآنِي بِأَهْلِهِ وَمَالِهِ)[٢].

واتە: خۆشەویسترین کەس بۆ من لە ئوممەتم کەسانێکن دوای من دێن، هەر یەکێ لەوانە خۆزگە دەخوازێ ماڵ و منداڵی ببەخشێت لە پێناو بینینی مندا..

زۆر کەس هەیە خەو بە پێغەمبەرەوە دەبینن، ئەو خەوانە ئەگەر پێچەوانەی شەرع نەبێت و لەچوارچێوەی قورئان و سوننەتدا بێت، ئەوا ئەو خەوە جێگای سەرنج و باسە، ئەگینا گرنگی پێ نادرێت.

---

(١) إكمال المعلم بفوائد مسلم(٧/ ٣٢٦)، باب: فضل النظر إليه وتمنيه، برقم: (٢٣٦٤).

(٢) صحيح مسلم (٤/ ٢١٧٨) كتاب الجنة، باب فيمن يود رؤية النبي عليه الصلاة والسلام بأهله وماله، برقم: (٢٨٣٢).

پێشەوا ئیبنو سیرین (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەگەر کەسێك لە خەودا پێغەمبەری (ﷺ) بینی، بە مەرجێك هەموو سیفات و ڕەنگ و ڕوخساری پێغەمبەری (ﷺ) تێدابێت، هەروەکو بۆمان گێڕاوەتەوە، نە کورت بوو نەدرێژ، نە قەڵەوبووەو نەلاواز، ڕوخساری پیرۆزی وەکو مانگی چواردە دەدروشاوەیەوە، ئەوە بەڕاستی پێغەمبەری (ﷺ) بینوە، چونکە شەیتان ناچێتە بەرگی پێغەمبەر (ﷺ).

ئەگەر سەیری دەستەواژەی ئەم فەرموودەیە بکەین وشەی (من) بەکارهاتووە (مِنْ أَشَدِّ) لێرەدا (من) بۆ (تەبعیض)ە، واتە: ئەوانەی زۆر زۆر پێغەمبەری خوایان (ﷺ) هەندێکیان حەز دەکەن پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە خەودا ببینن.

لە پاشاندا وەسفیان دەکات بە دوو سیفەت:

**یەکەم:** (يَكُونُونَ بَعْدِي) لە پاش پێغەمبەری خوا (ﷺ) دێن.

**دووەم:** (يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ رَآنِي بِأَهْلِهِ وَمَالِهِ) هەر یەکێك لەوانەی کە ئاواتە خوازە بە بینینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە شێوەیەك ئامادەیە هەموو ماڵ و سەروەت و سامانی خۆی ببەخشێت لە پێناویدا، هەتا لەبەرامبەر ماڵ و منداڵەکانیشی بێت..

لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: (إن ناساً من أمتي يأتون بعدي يود أحدهم لو اشترى رؤيتي بأهل وماله)[1].

واتە: بە دڵنیایی کەسانێك هەن لە ئوممەتم لە دوای من دێن، هەر یەکێ لەوانە خۆزگە دەخوازێ بینینێکی من بکڕێت لە پێناویدا ماڵ و منداڵی ببەخشێت.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ هاوەڵانی ڕوون دەکاتەوە کە لە دوای وەفاتکردنی خەڵکی تامەزرۆی بینینی دەبن.. وە چەندین سەدە بەسەری تێپەڕێت بینینی خۆشەویستیەکە زیاتر دەبێت، کەواتە ئەم فەرموودەیە ئەوەمان پێ دەفەرموێ: کە لە هەموو سەردەمێك خەڵکانێك هەن کە پێغەمبەریان (ﷺ) خۆش دەوێت.

---

(١) صحيح: رواه الحاكم في (المستدرك) كتاب: معرفة الصحابة، باب في ذكر فضائل التابعين (٤/ ٨٥) وقال: صحيح الإسناد ولم يخرجاه، ووافقه الذهبي.

بەرگی دووەم

# تەمەنی مرۆڤ کەم دەبێت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی تەمەنی مرۆڤەکان لە کورتی دەدات..

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى.. يَنْقُصَ عُمْرُ الْبَشَرِ)[١].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت.. هەتا تەمەنی مرۆڤ کورت دەبێت.

هەر چەندە زانایانی فەرمووده ناس دەفەرموون: ئەم فەرموودە بێ هێزە.. بەڵام لە واتادا زۆر واقیعیە، چونکە مرۆڤەکان تەمەنیان زۆر زۆر کەمە لەم سەردەمەدا.. بەڕاستی لە واقیعی ئەمڕۆ مرۆڤەکان کەم دەژین (٢٥ ٣٠ ٤٠ ٥٠ ٦٠ ٧٠) کەم هەیە لە هەفتا تێپەڕ بکات.

لەناو جەنجاڵی ژیاندا و پێویستیەکانی سەردەم بە کار و بیرکردنەوەی بەردەوام، وایان لە مرۆڤ کردووە بەبێ جیاوازی تەمەن و ڕەگەز زۆر نیگەرانبن.

توێژینەوەیەکی نوێی تەندروستی لە کۆلێژی پزیشکی زانکۆی هارڤارد ئاشکرای دەکات کە زۆر بیرکردنەوە ئەگەری هەیە ببێتە هۆی کورتکردنەوەی تەمەنی مرۆڤ.

لەو توێژینەوەیەدا، توێژەران شانەکانی مێشکی چەند کەسێکی مردوویان شی کردەوە کە تەمەنیان لە نێوان (٦٠ ٧٠) ساڵ بوو و ئەنجامەکانیان بە شیکردنەوەی مێشکی کەسانێك بەراورد کرد کە تا تەمەنی نزیکەی (١٠٠) ژیاون، توێژەران گەیشتنە ئەو دەرەنجامەی کە ئەو کەسانەی لە تەمەنێکی زوودا مرجوون، ڕێژەیەکی پرۆتینی (REST) یان هەبووەکە کار بۆ هێورکردنەوەی چالاکی مێشك دەکات[٢].

---

(١) ضعيف: أخرجه ابن عساكر في تاريخ دمشق (٤٥٣/٧) والطبراني في (المعجم الكبير) (٢٢/٣٧٦/١ ٩٤) ، وابن عساكر في «التاريخ » (١٠٢٩/٨) وقال الألباني في السلسلة الضعيفة : ضعيف.

(٢) ئەم توێژینەوەیە لە ماڵپەڕی (ماشابل) بڵاوکراوەتەوە.

## دەرکەوتنی مرۆڤی دوو ڕوو

لە نیشانەکانی قیامەت مرۆڤی دووڕوو زۆر دەبێت..

پێشەوا ئەبو هورێرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا وَلَضَحِكْتُمْ قَلِيلًا، يَظْهَرُ النِّفَاقُ، وَتُرْفَعُ الْأَمَانَةُ، وَتُقْبَضُ الرَّحْمَةُ..)[1].

واتە: ئەوەی من دەیزانم ئەگەر ئێوە بیزانن زۆر دەگرین و کەم پێدەکەنن، دوو ڕوویی سەر هەڵدەدات و، ئەمانەت نامێنێ و، بەزەیی هەڵدەگیرێت ..

بەڕاستی ئەم موعجیزەیەی پێغەمبەری خوا وەکو ڕۆژی ڕووناك بەدیار کەوتووە لەم سەردەمە پڕ لە فیتنەیەدا.

چۆن خۆمان بپارێزین لە دووڕوویی:

- دوورکەوتنەوە لە شوێن کەوتنی هەواو ئارەزوو.
- حەزکردن لە دوا ڕۆژ و تامەزۆری بەهەشت بوون.
- زۆر داوای لێخۆشبوون کردن.
- تۆمەتبارکردنی نەفس لە کەمتەرخەمی و نیفاق.
- بەردەوام بوون لەسەر زیکرو یادی خوای گەورە.
- سووربوون لەسەر خوێندنەوەی قورئان.
- ماڵ بەخشین لە پێناوی خوای گەورە.
- زۆر پاڕانەوە لە خوای گەورە کە بتپارێزێت لە دووڕوویی.
- دوورکەوتنەوە لە گوێ گرتن لە مۆسیقا، چونکە دووڕوویی لە دڵدا دەڕوێنێت.
- هەوڵدان و خۆ ڕاهێنان لەسەر ئیخلاس و دڵسۆزی بۆ خودای گەورە.

---

(١) صحيح: رواه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٦٢٢) برقم: (٨٧٢٥) وقال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيح.

بەرگی دووەم

## بەرزبوونەوەی ساختمانەکانی مەککە

مەککە لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتوانی کەم بوون، هەروەها بونیاتەکانیشی، جا پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداری کردوینەتەوە کە یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر بەرزبوونەوەی ساختمانەکانی مەککەیە بەرزتر لە چیاکانی، پێشەوا ئیبنو ئەبی شەیبە بە سەنەدی خۆی بۆ (یەعلای کوری عەطاء) لە باوکیەوە فەرموویەتی: (كُنْتُ آخُذًا بِلِجَامِ دَابَّةِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرُو، فَقَالَ: كَيْفَ أَنْتُمْ إِذَا هَدَمْتُمْ هَذَا الْبَيْتَ، فَلَمْ تَدَعُوا حَجَرًا عَلَى حَجَرٍ؟ قَالُوا: وَنَحْنُ عَلَى الإِسْلاَمِ؟ قَالَ: وَنَحْنُ عَلَى الإِسْلاَمِ، قُلْتُ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: ثُمَّ يُبْنَى أَحْسَنَ مَا كَانَ، فَإِذَا رَأَيْتَ مَكَّةَ قَدْ بُعِجَتْ كَظَائِم، وَرَأَيْتَ الْبِنَاءَ يَعْلُو رُؤُوسَ الْجِبَالِ، فَاعْلَمْ أَنَّ الأَمْرَ قَدْ أَظَلَّك)[1]. واتە: هەوساری وڵاغەکەی عەبدوڵلای کوری عەمرم بە دەستەوە بوو فەرمووی: چۆن بێت حاڵتان کاتێك ماڵی خوا دەرووخێنن و بەردی بەسەر بەردەوە ناهێڵن، وتیان: ئایا ئەو کاتە هەر لەسەر ئیسلام ماوینەتەوە؟! فەرمووی: بەڵێ، وتی: ئیتر چی؟ فەرمووی: ئینجا لە جاران چاکتر دروست دەکرێتەوە، جا ئەگەر بینیت لە ناخی مەککە تونێل لێ دراو بینیت بیناکان لە چیاکان بەرزتر بوونەوە، ئەو کاتە بزانە کە کۆتایی بونەوەر نزیك بۆتەوە.

(بُعِجَتْ كَظَائِم) واتە: تونێل[2] لە ژێر زەوی و چیاکانی مەککە لێدراو لولەی زەبەلاحی تێخرا بۆ ئاوی زەمزەم. کاتژمێرەکەی مەککە بە نمونە: کاتژمێرەکەی شاری مەککە بە گەورەترین تاوەری جیهانی دادەنرێت، تەنها ڕووی ئەم تاوەرە زیاتر لە (٤٠) مەترە، درێژیەکەی زیاتر لە (٦٠١) مەترە لەسەر ئاستی زەوی،درێژی پیتی ئەلیف لە وشەی (الله) لەسەر کاتژمێرەکە زیاتر لە (٣٢) مەترە، درێژی مانگی یەك شەوەی سەر تاوەرەکە دەگاتە(٢٣) مەتر، کاتژمێرەکەی سەر تاوەرەکە نزیکەی(١٢٠٠٠) تەن دەبێ کاتژمێری تاوەرەکە پەیوەستە بە شەبەکەی جیهانی (یو تی سی) کە مەقەرەکەی لە پاریسە.

---

(١) مصنف ابن ابي شيبة (٣/ ٦٩٨) برقم: (١٤٣٠٦).

(٢) (ابن الأثير) و (ابن منظور) و خەڵکی تریش لە زماننناسەکان باسیان کردووە.

## پچڕاندنی پەیوەندی لە نێو خزم و کەس و کار

یەکێك لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی پچڕاندنی پەیوەندی نێوان خزم و کەس و کارە.

کێن ئەوانەی بە (ڕەحم) ناو دەبرێن؟

وەڵام: ئەو کەسانەن کە تۆ مردیت میراتیەکەت حەڵاڵە بۆیان، بە دوای ئەواندا خزمە پلە یەك و دوو سێکانە..

پێشەوا عەبدوڵڵای کوری بوریدە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

(..لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَظْهَرَ الْفُحْشُ وَالتَّفَاحُشُ، وَقَطِيعَةُ الرَّحِمِ..)[١].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا خراپەکاری و داوێن پیسی و پچڕاندنی سیلەی ڕەحم و خزمایەتی ئاشکرا دەبێت..

لە فەرمودەیەکی تر دەفەرموێ: (مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ .. وَقَطِيعَةُ الْأَرْحَامِ..)[٢].

واتە: لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی .. پچڕاندنی سیلەی ڕەحم دەپچڕێت.

موحەممەدی کوری جوبەیر ئەویش لە باوکیەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: (لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَاطِعُ رَحِمٍ..)[٣].

واتە: ناچێت بۆ بەهەشت ئەوەی پچڕاندنی سیلەی ڕەحم بە جێ نەگەیەنێت.

---

(١) المستدرك، (١/ ١٣٧) برقم: (٢٥٣) وقال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ فَقَدِ اتَّفَقَ الشَّيْخَانِ..

(٢) المعجم الأوسط (٢/ ٩٣) برقم: (١٣٥٦). ومسند البزار (٢/ ٣٦٣) برقم: (٧٥١٨). وقال الهيثمي في مجمع الزوائد (٢٨٤/٧) رجاله ثقات.

(٣) صحيح مسلم، (٤/ ١٩٨١) باب: صلة الرحم، برقم: (٢٥٥٦).

بەرگی دووەم

پێشەوا ئەبو هوریرە (ﷺ) دەڵێت: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاموشۆی خزمەکانم دەکەم و سەردانیان دەکەم بەڵام ئەوان بە خراپە وەڵامم دەدەنەوە، گرنگیان پێ دەدەم ئەوان فەرامۆشم دەکەن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەبو هورەیرە لەسەر کردەوەکانی خۆت بەردەوام بە.

بە دوای کارێکدا بگەڕێ کە تەرازووی کردەوە چاکەکانت قورستر بکات، قورسترین کردەویەك کە بخرێتە ناو تەرازووی بەندەکانی خواوە لە ڕۆژی دوایی کەمێك کینەیە لە هەناویدا هەڵیگرتووەو دەشتوانێت لەو کەسە خۆش ببێت، پچڕانی پەیوەندی خزمایەتی لەم سەردەمەدا زۆر بڵاوبۆتەوە بۆتە سیمایەکی بەرچاوی ئەمڕۆ.

پێشەوا عابیسی غەفاری (ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (بَادِرُوا بِالْمَوْتِ سِتًّا: إِمْرَةَ السُّفَهَاءِ، وَكَثْرَةَ الشُّرَطِ، وَبَيْعَ الْحُكْمِ، وَاسْتِخْفَافًا بِالدَّمِ، وَقَطِيعَةَ الرَّحِمِ، وَنَشْوًا يَتَّخِذُونَ الْقُرْآنَ مَزَامِيرَ يُقَدِّمُونَهُ يُغَنِّيهِمْ ، وَإِنْ كَانَ أَقَلَّ مِنْهُمْ فِقْهًا)[1].

واتە: دەست پێشی بکەن بە چاکە پێش ئەوەی شەش شت ڕوو بدات بێتە پێشەوە: دەسەڵات کەوتنە دەست کەسانی بێ نرخ و هیچ و پوچ، زۆر بوونی پۆلیس و، فرۆشتنی حوکم، بە سوك سەیرکردنی خوێن ڕشتن و، پچراندنی پەیوەندی خزمایەتی و پەیدابوونی کەسانێکی تازە پێگەیشتوو کە قورئان دەکەنە ئامێر بۆ ئاوازەکانیان، کەسێکیان پێش دەخەن بۆ پێش نوێژی کە تەنها بە ئاوازی خۆش قورئانیان بۆ بخوێنێت هەر چەندە لە هەمووشیان زانیاری و تێگەیشتنی لە ئایین کەمترە.

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٣/ ٤٩٤) برقم: (١٦٠٤٠)، والطبراني في (الكبير) (١٨/ ٣٦/ ٦١) وقال الأرناؤوط: حديث صحيح.

(مِنِ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ خَصْلَةً : إِذَا رَأَيْتُمُ النَّاسَ وَتَقَطَّعَتِ الأَرْحَامُ)[١].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر حەفتاو دوو تایبەتمەندە: هەر خەڵکانێکتان بینی.. سیلەی ڕەحمی پچڕاند.

لەناو توێژینەوە کۆمەڵایەتیەکاندا ئاراستەیەکی بیرکردنەوە هەیە کە سیستەمی خزمایەتی لە کۆمەڵگەدا بە کۆئەندامی دەماری لە مرۆڤدا بەراورد دەکات، پێی وایە هەڵس وکەوتەکانی کۆمەڵگە لە ژێر کاریگەری ئەم سیستەمە دایە، بابەتی خزمایەتی یەکێکە لە بابەتە سەرەکیەکانی توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان، بە تایبەتی ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەڵگا سەرەتاییەکان[٢]..

لە ڕووی چەمکەوە خزمایەتی واتە: ئەو پەیوەندیەی هەر منداڵێك یان لە دایك بوویەکی نویٚ بەو گروپەوە دەبەستێت کە تیایدا لە دایك بووەو دەژیت، ئەو پەیوەندیەش لە بنەڕەتدا پشت بە پەیوەندی خوێن دەبەستێت لە نێوان ئەو منداڵەو خوشك و براو دایك و باوك و کەس و کارەکانیاندا[٣]، واتە: ئەم ناوەندی مرۆڤ تێیدا لە دایك دەبێت بناغەو سەرچاوەی پەیوەندیە خزمایەتیەکانی ئەون، ئەمیش بریتیە لە خێزان.

خێزان لە هەموو شارستانیەکاندا هەیەو بە هۆی خێزانیشەوە خزمایەتی دروست دەبێت ئەم سیستەمەش یاساو ڕێسای تایبەتی خۆی هەیە بۆ ڕێکخستنی مافی هەریەك لە ژن و مێردی منداڵەکان بەرامبەر تۆڕی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەگەڵ خزمە دوورو نزیکەکان، ئەمیش پەیوەستە بە شێوەکانی هاوسەرگیریەوە لە ڕووی ناوخۆیی و دەرەکیەوە، چونکە ژن و ژنخوازی لەنێوان ئەندامانی بنەماڵیەکی دیاریکراودا داخراو بێت، پلەی خزمایەتی و هاوخوێنی و پتەوترو بەهێزتر دەبیٚ، بە پێچەوانەشەوە هاوسەرگیری لە نێوان ئەندامانی چەند

---

(١) ضعيف: حلية الأولياء، لأب نعيم (٣/ ٤١٠)، (٤٥٥٥). وهو ضعيف كما قال الحافظ العراقي (٣/٢٩٧).

(٢) البناء الإجتماعي، ابو زيد الدكتور أحمد، لا ٥٢٦.

(٣) علم اجتماع العائلة، الدكتور صبيح عبدالمنعم، لا٤١.

بنەماڵەیەکی جیاوازدا، ئەو سنورە تەسکەی خزمایەتی کە لە نێوان ئەندامانی یەك بنەماڵەی دیاریکراودا هەیە دەشکێنێ و وردە وردە کەوشەنی بنەماڵەکە فراوانتر دەبێ، خوێنی نوێ تێکەڵاوی خوێنی ئەندامانی بنەماڵەکە دەبێ و پلەی خزمایەتییان لە نێوان ئەندامانی بنەماڵەدا دوورتر دەکەونەوە، تا ئەو جۆرە هاوسەرگیریەش پتر بێ ئەندامانی بنەماڵەکە لە یەکتر دوور دەکەونەوەو خزمایەتیەکەش لاوازتر دەبێت[١].

لەبەر ئەوەی خێزان لە بنچینەی پەیوەندییە خزمایەتیەکەیانەو لە ڕێگای پەیوەندی خێزانداری و هاوسەرگریەوە تۆڕی پەیوەندیە خزمایەتیەکەیان دروست دەبن ئیتر هەموو ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر سیستەمی خزمایەتیدا هاتووە بەشێکی زۆریان پەیوەندیان بە گۆڕانی شێوازو چۆنیەتی پێکهێنانی خێزانەوە هەیە، هەتا پرۆسەکانی هاوسەرگیری لە چوارچێوەی یەك بنەماڵەو تیرەو خێڵ و هۆزدا ئەنجام دەدرا تۆڕی پەیوەندیە خزمایەتیەکان زۆر فراوان نەبوون، چونکە بەر لە ئەنجامدانی هاوسەرگیریەکەش ئەو خێزانانە هەر خزمی یەکتربوون، بەڵام کاتێك هاوسەرگیری لە نێوان گروپە کۆمەڵایەتییە دوورەکاندا ئەنجام درا بەهۆی پەیوەندی هاوسەرگیریەوە ئەم گروپانە بوون بە خزمی یەکتری، بۆیە دەبینین زۆرجار لە چارەسەرکردنی هەندێك لە گرفتە کۆمەڵایەتیەکان وەکو ڕووداوی کوشتن و ڕفاندن و دەست درێژی کردن چەندین تاوانی لەو جۆرە چارەسەریەکەی بە پێدانی ئافرەت و دروستکردنی پەیوەندی خزمایەتی و تێکەڵاو بوون کراوە، یان لەنێوان دوو خێڵی ناکۆکدا بۆ لە یەکتر نزیك بوونەوە کچیان بەیەك داوە، بەمەش دەستکاری سیستەمی خزمایەتیان کردووە.

ئەگەر سەرنج بدەینە حاڵی ژیانی خۆمان ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە هاتنی ڕۆژی دوایی زۆر نزیك بێت، چونکە پچڕاندنی ئەو خزمایەتیە لەو سەردەمە گەلێك زۆر بووە، دڵەکان ڕەق بوونە، کەس سەردانی کەس ناکات، کەس هەواڵی کەس ناپرسێت.. بەداخەوە بۆ ئەم جۆرە خزمایەتیە.

---

(١) علم الاجتماع، أ.د.مجدالدين عمر خيري، (لا ٨٠ ٩٠).

## خراپ مامەڵەکردن لەگەڵ دراوسێ

یەکێك لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر خراپ مامەڵەکردنە لەگەڵ دراوسێ.

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی بوریدە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (..لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَظْهَرَ الْفُحْشُ وَالتَّفَاحُشُ، وَقَطِيعَةُ الرَّحِمِ، وَسُوءُ الْمُجَاوَرَةِ..)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا خراپەکاری و داوێن پیسی و پچڕاندنی صیلەی ڕەحم و خزمایەتی و دراوسێی خراپ زۆر دەبێت..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەرامی کردووە لەسەر ئەوەی ئازاری دراوسێ بدرێت، هەروەك دەفەرمووێ: هەر کەسێك باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە نابێ ئازاری دراوسێ کەی بدات.

ئازاردانی دراوسێ چەند شێوەیەکی هەیە، یەکێ لە شێوەکان ئەوەیە ڕێگری لە دراوسێ بکات سینگە دارێك لە دیواری هاوبەش بکوتێت، یان بەبێ مۆڵەتی ئەو خانووی بەسەر خانووی ئەودا بەرز بکاتەوەو ڕێگای تیشکی خۆرو هەوای لێ بگرێ، یان پەنجەرەو کولانکەی بەسەردا بکاتەوە بۆ ئەوەی عەیب و عاری ئاشکرا بکات، یا بە دەنگی بێزارکار بێزاری بکات، وەکو کوتە کوت و دەنگ بەرزکردنەوە بە تایبەتیش لە کاتی خەوتن و پشوودانددا، یان وەکو لێدان لە منداڵەکانی و، فڕێدانی زبڵ بۆ پێش دەرگای، گوناهیش ئەگەر بەرامبەر دراوسێ بکرێ بۆ خاوەنەکەی گەورەترەو دوو چەندانە دەکرێتەوە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر گوێبیستی دراوسێکانت بووی دەیانگوت: چاکەت کردووە، ئەوا بێگومان چاکەت کردووە، ئەگەریش گوێ بیستیان بووی دەیانگوت: بەڕاستی خراپەت کردووە، ئەوا بێگومان خراپەت کردووە[2].

---

(١) صحيح: رواه الحاكم في (المستدرك) (١/ ١٣٧) برقم: (٢٥٣) وقال الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

(٢) صحيح الجامع، برقم: (٦٣٤٨).

## شانازیکردن بە زۆری سەیارەو خانوو

لە نیشانە بچوکەکانی کۆتایی بونەوەر وای لێ دێت مرۆڤ دوو سەیارە یان دوو خانوو زیاتری دەبێت، کەسی وام بینیوە دە خانوو و ٣ سەیارەی هەبووە، وە خۆشی تەنها لە یەك خانوو دادەنیشێت.. ئەمەش بە واتای حەرامبوون نییە، بەڵکو تەنها شانازی پێوە دەکات..

بۆیەش پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی پێداوین و دەفەرموێ: (تَكُونُ إِبِلٌ لِلشَّيَاطِينِ وَبُيُوتٌ لِلشَّيَاطِينِ)[1].

واتە: بەردەوام حوشترێك بۆ چەند شەیتانێکە، وە کۆمەڵە خانوویەکیش بۆ چەندین شەیتانە.

کە ئەمەش چوار واتا لە خۆی دەگەیەنێت، لەوانە:

• پیاو واز لە ماڵ و منداڵی دەهێنێت هەتا شەیتان حوکم بەسەری دادەکات، بۆیە ئەوکات هیچ هەست بەبەرەکەت ناکات، وە یادی خوای تێدا ناکرێت هەتا شەیتانەکان ماڵەکە دەکەن بە هی خۆیان.

• خەڵکی شانازی بە ماڵ و منداڵیەوە دەکات لە کاتێکدا لەبەردەم چاوی خەڵکی مناڵەکانی بە ناشرین ترین جل و بەرگ ڕەوانەی دەرەوە دەکات.

• لە نەزانینی خاوەن ماڵەکەوە زۆر بە وردی جادووی لێدەکرێت بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکات، ئەو کات شەیتانەکان پڕ دەبن لە ماڵەکەی.

• مەبەستیش لە شەیتانەکان شەیتانەکانی مرۆڤن کە زیانیان زۆر زۆرترە لە شەیتانەکانی جن.

ئەوەش موعجیزەیەکی زۆر ئاشکرا و ڕوونە کە لەم سەردەمەدا بەدی دەکەین و دەیانبینین

---

(١) سنن أبي داود، كتاب الجهاد، باب في الجنائب، بە ژمارە (٢٥٦٨).

بەرگی دووەم

## کار بە بیدعە دەکرێت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر کۆمەڵێك کەس دروست دەبن و دژایەتی فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکەن و ئیش و کاریان تەنها ئاژاوە نانەوەو کارکردنە بە بیدعە..

پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:
(سَيَلِي أُمُورَكُمْ بَعْدِي
رِجَالٌ يُطْفِئُونَ السُّنَّةَ
وَيَعْمَلُونَ بِالْبِدْعَةِ
وَيُؤَخِّرُونَ الصَّلَاةَ عَنْ مَوَاقِيتِهَا
فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ أَدْرَكْتُهُمْ، كَيْفَ أَفْعَلُ؟ قَالَ: تَسْأَلُنِي يَا ابْنَ أُمِّ عَبْدٍ كَيْفَ تَفْعَلُ؟ لَا طَاعَةَ، لِمَنْ عَصَى اللَّهَ)[1].

واتە: لە دوای من کاروبارتان دەکەوێتە دەست کەسانێك
پیاوانێك دەیانەوێت سوننەت بکوژێننەوەو
کار بە بیدعە دەکەن و
نوێژ لە کاتەکانی خۆیان دوا دەخەن
گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر گەیشتم بەم جۆرە کەسانە چی بکەم؟ فەرمووی:

پرسیارم لێ دەکەیت کە چی بکەم ئەی کوڕی دایکی عەبد؟ گوێڕایەڵی کەسێك مەبە کە سەرپێچی خوای گەورە دەکات..

---

(١) صحيح: سنن ابن ماجة (٤/ ١٢٣) باب: لا طاعة في معصية الله، (برقم): (٢٨٢٦). قال الشيخ الأرناؤوط: إسناده حسن.

پێشەوا حوذەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەربارەی ئەم جۆرە کەسانە دەڵێت:

(.. دُعَاةٌ عَلَى أَبْوَابِ جَهَنَّمَ مَنْ أَجَابَهُمْ إِلَيْهَا قَذَفُوهُ فِيهَا

فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، صِفْهُمْ لَنَا

قَالَ: نَعَمْ، قَوْمٌ مِنْ جِلْدَتِنَا، وَيَتَكَلَّمُونَ بِأَلْسِنَتِنَا، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَمَا تَرَى إِنْ أَدْرَكَنِي ذَلِكَ؟

قَالَ: تَلْزَمُ جَمَاعَةَ الْمُسْلِمِينَ وَإِمَامَهُمْ

فَقُلْتُ: فَإِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُمْ جَمَاعَةٌ وَلَا إِمَامٌ؟

قَالَ: فَاعْتَزِلْ تِلْكَ الْفِرَقَ كُلَّهَا، وَلَوْ أَنْ تَعَضَّ عَلَى أَصْلِ شَجَرَةٍ حَتَّى يُدْرِكَكَ الْمَوْتُ وَأَنْتَ عَلَى ذَلِكَ)[1].

واتە: .. کۆمەڵێك پەیدا دەبن خەڵکی بۆ دەرگاکانی دۆزەخ بانگ دەکەن، هەر کەسێ بە گوێیان بکات هەڵی دەدەنە ناو دۆزەخ.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) باسیانم بۆ بکە.

فەرمووی: ئەوانە لە خۆمانن و بە زمانی ئێمە دەدوێن.

گوتم: ئەگەر گەیشتمە ئەو سەردەمە چیم پێ دەفەرمووی؟

فەرمووی: پابەندی کۆمەڵ و پێشەوای موسڵمانان بن.

گوتم: ئەی ئەگەر کۆمەڵ و ڕابەریان نەبوو؟

فەرمووی: کەواتە لە هەموو ئەو کۆمەڵانە کەنار بگرە بە دانیشت بنکی دارت بگەزی تاکو لەسەر ئەم بارە مردنت دەگاتێ.

لەم سەردەمەدا ئەوانەی خەڵکی بانگ دەکەن بەرەو ئاگری دۆزەخ زۆر زۆرن، لە هەموو سەردەم و شارێك، بەتایبەتی لەم سەردەمەی ئەمڕۆ نکوڵی دەکەن لە سوننەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

---

(١) صحيح مسلم (٣/ ١٤٧٥) باب: الأمر بلزوم الجماعة، برقم: (١٨٤٧).

# نوێژی زۆربەی خەڵکی وەرناگیرێت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر خەڵکێکی زۆر لە مزگەوت نوێژ دەکەن بەڵام خوای گەورە نوێژی کەسیان قەبوڵ ناکات..

پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (من اقتراب الساعة أن يصلي خمسون نفساً لا تقبل لأحدهم صلاة)[1].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر وای لێدێت پەنجا کەس نوێژ لە مزگەوت دەکەن و خوای گەورە نوێژی هیچ کەسیان وەرناگیرێت..

ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوونە کە لە پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت خەڵکی نوێژ دەکەن لە هەمان کات نوێژەکانیان قەبوڵ نابێت، چونکە دزینی زۆری تێدایە لە رکوع و سجود.. لەگەڵ ئەوەش لە ڕووی عەقیدەوە زۆر شلەژاون... عەقیدەو باوەڕ لە دەست دەدەن بۆیە خوای گەورە لێیان قەبوڵ ناکات..

بۆیە زۆر هۆکار هەن کە نوێژەکەیان قەبوڵ نەبێت، لەوانە:

- پێکەنینی بە دەنگ.
- ئەنجام نەدانی پایەیەکی نوێژ.
- قسەکردن لەناو نوێژ.
- تێپەڕبوونی گوێ درێژ بە بەردەم نوێژدا.
- تێپەڕبوونی سەگی ڕەش بە بەردەم نوێژدا.

---

(١) ضعيف: كنز العمال في سنن الأقوال والأفعال (٩/ ٢٧٠) برقم: (٣٨٤٢٧). وقال عبدالكريم بن عبدالرحمن بن إبراهيم الغانم في كتاب الديوان الجامع لأطراف الأحاديث الضعيفة (١/ ٢٨٩) حديث ضعيف.

## ڕاگەیاندنی کوفر و بێ باوەڕی

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر ڕاگەیاندنی کوفرو بێ باوەڕیە..

پێشەوا ئەبو هوریرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُكْفَرَ بِاللَّهِ جَهْراً..)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت تا خەڵکی بە ئاشکرا ئینکاری بوونی خوا نەکەن و کافر نەبن.

بە درێژایی مێژوو کەسانێك هەبووە باوەڕیان بە بوونی خوا هەبووە، لە هەمان کاتیش کەسانێك هەبووە باوەڕیان بە بوونی خودا نەبووە واتە : کافر بوونە .

تا ناوەڕاستی سەدەی (١٩) باوەڕ نەبوون و کافر نەبوون بە خودا نەگەیشتە ئەو ئاستەی کە لەسەدەی (١٩)م ڕوویدا، لە پاش ئەم بەرواره بەرە بەرە تەوژم و ڕەوتی ئیلحادی بێ باوەڕی لە ئەوروپا سەری هەڵدا وەکو داروین و شیوعیەت و فاشیەت سەرانی ئەم تەوژمانە لەگەڵ هەوا دارەکانیان بەبێ پێچ و پەنا بە ئاشکرا لەبەر چاوی خەڵکی ئینکاری خودای دەکردو دەیانگوت: خودا هەر نیە.

نمونەشمان لەسەر ئەو وتەیە زۆرە وەك: (لینین) دامەزرێنەری یەکێتی سۆڤیەتی دەڵێت: پروپاگەندەکەمان برەودان بەبێ باوەڕی دەگرێتە خۆی، هەروەها بڵاوکردنەوەی کارە زانستیە پێویستیەکان بۆ ئەم مەبەستە، هەرچیەکیش کە حکومەتە دەرەکیەکان تا ئەمرۆکە قەدەغەیان کردووە دەبێ بیکەینە بەشێك لە پرۆگرامەکانی حیزبمان، پێویستە ئەو کتیبانەش تەرجەمە بکەین کە ڕۆشنبیرو بێ باوەڕەکانی فەرەنسا لە سەدەی (١٨) نووسیویانە، زۆربەی زۆری ئەم

---

(١) المعجم الكبير (٤/ ١٥٠) برقم: (٣٨٤٣). وقال: لَمْ يَرْوِ هَذَا الْحَدِيثَ عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ إِلاَّ إِسْمَاعِيلُ.

بێباوەڕانە پشتیان دەبەستن بە تیۆرەکانی (داروین)، ئەم بیرو بۆ چوونەش ناراستەی خۆشیان لە ڕێگەی کتێب و گۆڤار و سیمینار و تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت بڵاودەکەنەوە .

ئەمڕۆ زۆر بە ڕوونی لە کتێب و گۆڤارو تەلەفزیۆن و ماڵپەرەکانی ئینتەرنێت دەبینین، هەروەها لە فیلمەکانیش بە ئاشکرا هێرش دەکرێتە سەر خوداو دەڵێن: خودا بوونی هەر نیەو ئەم بوونەوەرەش بە ڕێککەوت دروست بووە، بە کورتی ئەمڕۆ بارودۆخێك دروست بووە سەدان ساڵە جیهان بارودۆخی وەهای بەخۆوە نەدیوە، ئەمڕۆ خەڵکانێك هەن زۆر بە ڕاشکاوی و بێ ئابڕوویی ئینکاری بوونی خودای گەورە دەکەن، ئەمەشیان نیشانەیەکە لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی کە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە، بێگومان ئەم نیشانەش خودای گەورە بە پێغەمبەری ڕاگەیاندووە .

لە هەمان کات کەسانێك هەبوون دەیانزانی خودا بوونی هەیە بەڵام لەبەر چەند هۆکارێك باوەڕیان بە خوای گەورە نەهێنا :

١) گەورەیی و خۆبەزل زانین، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا ۗ لَقَدِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ وَعَتَوْ عُتُوًّا كَبِيرًا ﴿٢١﴾ يَوْمَ يَرَوْنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ لَا بُشْرَىٰ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ وَيَقُولُونَ حِجْرًا مَّحْجُورًا ﴿٢٢﴾][1].

واتە: ئەوانەی کە بە هیوای دیداری ئێمە نین (لە ڕۆژی دواییدا) دەڵێن: ئەوە بۆ فریشتە نانێردرێتە خوارەوە بۆ سەرمان، یاخود پەروەردگارمان نابینین، سوێند بە خوا بە ڕاستی ئەوانە لە دەرونی خۆیاندا خۆیان بە گەورە دەزانی، وە سەر کەشیەکی گەورەیان کرد.

---

(١) سورة الفرقان : ٢١ ٢٢.

٢) زوڵم و ستەم، خوای گەورە دەفەرموێ: [يَسۡـَٔلُكَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيۡهِمۡ كِتَٰبٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِۚ فَقَدۡ سَأَلُواْ مُوسَىٰٓ أَكۡبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓاْ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهۡرَةٗ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ بِظُلۡمِهِمۡۚ ثُمَّ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ فَعَفَوۡنَا عَن ذَٰلِكَۚ وَءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينٗا ﴿١٥٣﴾ ][1].

واتە: (ئەی موحەممەد (ﷺ)) خاوەن نامەکان داوات لێ دەکەن، کە بۆیان بێنیتە خوارەوە پەڕاوێك لە ئاسمانەوە، جا بە ڕاستی داوایان کرد لە موسا گەورەتر لەوە کە گوتیان: خوامان نیشان بدە بە ئاشکرا، جا بروسکەیەك لێی دان و گرتنی بە هۆی ستەم کردنیانەوە، پاشان گوێرەکەیەکیان کرد بە پەرستراوی خۆیان پاش ئەوەی بۆیان هات، بەڵگە ئاشکراکان، ئینجا ئێمە چاوپۆشیمان لەوەش کرد (لەو گوێرەکە پەرست یە یان) وە بەخشینمان بە مووسا موعجیزەو بەڵگەی بە ئاشکرا (تا باوەڕ بێنن).

٣) نەزانین ، خوای گەورە دەفەرموێ: [وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ لَوۡلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوۡ تَأۡتِينَآ ءَايَةٞۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّثۡلَ قَوۡلِهِمۡۘ تَشَٰبَهَتۡ قُلُوبُهُمۡۗ قَدۡ بَيَّنَّا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ﴿١١٨﴾].

واتە: نەزانەکان گوتیان: بۆچی خوا خۆی قسەمان لەگەڵ ناکات یان نیشانەیەکمان بۆ نایەت، ئەوانەی کە لە پێش ئەمانیش دابوون هەمان شتیان دەگوت: دڵ و دەروونیان لە یەك دەچێت، بێگومان نیشانەی زۆرمان باس کردووە بۆ کەسانێك بە شوێن دڵنیایی دا دەگەڕێن.

زۆربەی زانایانیش هەبوون کە لە بێباوەڕیەوە هاتنە ناو ئایینی ئیسلام و باوەڕیان هێنا بە پەروەردگاری ڕاستەقینە وەکو:

١) (ڕوبرت صوریس بیج): زانای سروشتی، یەکەم کەس بوو ڕاداری داهێنا، ئەم زانایە باوەڕی تەواوی بە پەروەردگار هێناو دەڵێ: ئەو خوایەی گەردوونی

---

(١) سورة النساء: ١٥٣.

بەرگی دووەم

دروست کردووه له مادده، خۆی مادده نیه، بۆیه هەست به بوونی گەردوون دەکەین بەڵام هەست به بوونی پەروەردگار ناکەین چونکه پەروەردگار مادده نیه.

٢) (میریت ستانلی کونجدن) زاناو فەیلەسوفی سروشتی دەڵێ: ئەم گەردوونه که دروست کراوه مادده نیه بەڵکو ماددەیەو رۆحه، لەبەر ئەوه ناتوانین به هەموو شتێك بڵێین مادده، هەروەکو لەشی ئادەمیزاد - ماددەیەو ڕۆح .

٣) (لورد کیلفی): له گەوره زانایانی سروشتی جیهانەو دەڵێ: ئەگەر بیر بکەینەوه به بیرکردنەوەیەکی قوڵ، زانست ناچارت دەکات بۆ باوەڕ هێنان به پەروەردگار.

٤) (وولتر أوسکار لندبرج) : زانای فسیۆلۆجی و کیمیا دەڵێ: سەرنەکەوتنی هەندێ له زاناکان و ڕازی نەبوونیان بەو بەڵگه زانستیانەی دەیسەلمێنێ گەردوون دروست کراوی پەروەردگاره دەگەڕێتەوه بۆ دوو هۆ:

أ- کوفرو ئیلحاد، ئەمەش دەگەڕێتەوه بۆ هەندێ ڕێکخراوو کۆمەڵ یان دەوڵەت که دەیانەوێ به کوفر دژایەتی بوونی پەروەردگار بکەن، چونکه ڕای ڕاستی زاناکان دژی بەرژەوەندی ئەمانەیه.

ب- ئەگەر هەندێ له زاناکان ئەم ترسەیان نەبێت که له خاڵی یەکەمدا باسم کرد، دەمار توندی و خۆبەڕاست زانینی کوێرانه وایان لێ دەکات ڕاستی نەڵێن، بەڵام هەموو بەڵگه زانستیەکان ڕامان دەکێشن بۆ باوەڕی تەواو به بوونی پەروەردگار.

٥) (فرانس بیکون) فەیلەسوفی ئینگلیزی دەڵێ: کەمێك فەلسەفه نزیکمان دەکاتەوه له کوفرو ئیلحاد بەڵام زۆر زانین له فەلسەفه دەمانخاته سەر ئاین و خواپەرستی .

٦) (لۆرد کالڤن): داهێنەری پێوەری کالڤن دەڵێ: ئەگەر به زانستیانه بیر بکەینەوه زانست ڕامان دەکێشێ بۆ باوەرهێنان به بوونی پەروەردگار .

لێرەدا کۆتایی دەهێنم بەناوی زاناکان، چونکه ئەگەر باسی هەموو زاناکان بکەین پێویستیمان به چەند پەرتوکێك هەیه نەك تەنها ئەم پەرتووکه، کەوابوو

بەرگی دووەم

بۆمان دەرکەوت چۆن گەورە زانایانی جیهان بە هۆی زانستەوە باوەڕیان بە پەروەردگار هێنا.

باوەڕ سروشتە لەناخی مرۆڤدا، خوای پەروەردگار دەفەرمویێ: [ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ][1].

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾].

واتە: کاتێ خوای گەورە نەوەی ئادەمی دروست کرد، پەیمانی لێ وەرگرتن، خۆیانی لەسەر گرت بە شایەت کە: ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم، گوتیان: بەڵێ.. ئێمە شایەتین لەسەر ئەوەی کە تۆ پەروەردگاری ئێمەیت.

وشەی «فیترەت» واتای ئەو شتانە دەگرێتەوە کە ئادەمیزاد بە سروشت و چێژی ساغی خۆی مەیلی بەلایاندا هەیە.

زۆر لە زانایان وشەی (الفطرة) ی فەرمودەکەیان بە «سوننەت» لێکداوەتەوە. واتە: «شا ڕێگای پێغەمبەران» کە خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەری خۆشەویستی خۆی داوە لەو ڕێگایەدا شوێن پێیان هەڵبگرێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ ۗ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا ۖ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٠﴾].

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە چەند زانایەکەوە دەگێڕێتەوە کە گوتویانە: مەبەست لەم وشەیە (ئایین)ە.

---

(١) سورة الروم، الآية: (٣٠).

پێشەوا بەیزاوی (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت: مەبەست ئەو ڕێبازەیە کە سەرجەم پێغەمبەرانی لەسەر بووەو شەریعەتەکان یەکیان گرتووە لەسەری، وەك بڵێی شتێکە لە سروشتیاندا بەدیهاتووە.

کاتیٚ خوای گەورە نەوەی ئادەمی بەدیهێناوە، لەسەر سروشتی »باوەڕبوون بە خوای گەورە» بەدی هێناون، واتە: ئەگەر کاریگەریی سلبی دەوروبەر لەسەر ئادەمیزاد لاببرێت، هەر لەسەرەتاوە کاتیٚ لە دایك دەبێت باوەڕی بە (خوایەکی تاك و تەنیاو بەدیهێنەرو زاناو داناو بەتوانا) هەیە کە ئادەمیزادو هەموو گەردوونی دروست کردووە. خۆ ئەگەر هاوکات لەگەڵ ئەم باوەڕە سروشتیەدا، سروشی خوای گەورەش (قورئان و سوننەت) وەك فاکتەرێك بۆ کۆنترۆڵ کردنی هەڵسوکەوتی تاك و کۆمەڵ نەتەوەکان بکرێت بە بەرنامەی ژیان، ئەوا سەرجەم ڕەفتارو ئاکارەکانی ئادەمیزاد بە ئاڕاستەیەکی تەبا لەگەڵ سروشتی خۆیان و دەوروبەرو گەردووندا دەڕوات، ئاسوودەیی هەردوو ژیانی ئەوی پیٚ دێتە دی، بەڵام ئەگەر مەڵبەندەکانی ئاڕاستە کردنی هەڵسوکەوتی مرۆڤ (نزیکەکان: وەك دایك و باوك و دوورتر لەوان: وەك گومڕایانی ناو کۆمەڵگا و شەیتانەکان) لەو ڕاستە ڕێیە بیترازێنن، ئەوا بەم ڕەفتارەیان سروشتی ئەو مرۆڤە سەرەو خوار هەڵدەگێڕنەوەو، لە ژیانی بەختەوەری دووری دەخەنەوە، ئیمجا دووچاری چەندان کێشەی دەروونیو کۆمەڵایەتیو جەستەییو فیکریشی دەکەن.

شارستانێتی ماددی سەردەم باشترین نمونەیە بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەم چەمکەی کە لە فەرمودەکانەوە وەردەگیریٚ، ئەوەتا لەبەر ئەوەی لەسەر دژایەتی ئەم فیترەت و سروشتەی مرۆڤ دامەزراوەو برەوی بە فەلسەفە ئیلحادییەکان داوەو ژیان مرۆڤ و تەنانەت زانست و ژیاریشی لە خوای گەورەی بەدیهێنەر دابڕیوە، دەبینی ئادەمیزادی گرفتاری کۆمەڵێك نەخۆشی جەستەییو دەروونیو کێشەی هەمە جۆر کردووە، کە بێجگە لە گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورەو دەستگرتن بەو ئایینە پیرۆزەوە کە سەروەرمان پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی، هیچ چارەسەرێکی تر لەبەر دەستدا نیە بۆ دەربازبوونی مرۆڤ لەو گرفتانەی کە پێیانەوە دەناڵێنیٚ.

## زانستی سەردەم و ئاوەڕدانەوە لە فیترەت:

هەندێ لە توێژینەوە زانستیە تازەکانی ئەم دواییە پتر گرنگی «ئاین» و «باوەڕ بەخوا» پێش چاو دەخەن، چونکە توێژەرانی ئەم بوارە سەرنجیان داوە کە: زیاترین ڕێژەی خۆکوژی لە نێوان مولحیدان دایە.. هەروەك بەرزترین ڕێژەی نەخۆشیە دەروونیەکان لەناو کەسانی بێ بڕوادایە.. زۆرترین ڕێژەی ئایدزو نەخۆشیە ڕەگەزیە درمەکان لە نێوان ئەوانەدایە کە بە ئاشکرا بەدڕەوشتی ئەنجام دەدەن!

لە کۆنەوە بێباوەڕان برەو بە بیرو بۆچوونیان دەدەن، ئادەمیزاد بە ئاڕاستەیەکی پێچەوانەی سروشتی خۆیدا دەبەن، وا ئێستا بەری ڕەنجیان لە کۆمەڵگای ئادەمیزاددا بەو نەخۆشیو گرفتانە دەرکەوتووە کە ئاماژەمان بە هەندێکیان دا، هەر لەبەر ئەوەیە کە زانایان لەم ڕۆژگارەدا دەستیان داوەتە توێژینەوەی سروشتی ڕاستەقینەی مرۆڤ و کاردانەوەی «ئیمان» لەسەر ڕەفتارەکانی، ئەم هەواڵەی خوارەوە نمونەیەکە لەسەر ئەو توێژینەوە نوێیانەی کە زانایانی ئەم سەردەمە ئاوڕیان لێ داوەتەوە: ڕۆژنامەی تەلیگرافی بەریتانی لە مانگی (١١)ی ساڵی (٢٠٠٨)ع هەواڵێکی بە پێنوسی (مارتن بیکفۆرد) بڵاوکردۆتەوە، کە هەواڵنێری ڕۆژنامەی ناوبراوە لە کاروباری ئایینیدا.

دەقی هەواڵەکە بەم مانێشتە دەست پێ دەکات: چەند توێژەرێك دەگەنە ئەو دەرەنجامەی کە منداڵەکان کاتێ لە دایك دەبن باوەڕیان بە «خوا» هەیە, وەکو کەسێکی ئەکادیمی دەڵێ: پاشان بابەتەکەی بە پوختی لەم خاڵانە دەخاتە ڕوو: دکتۆر (جاستن باریت – Dr.justin barrett) کە توێژەرێکی پێشکەوتووە لە سەنتەری «زانستی مرۆڤ و ژیری» لە زانکۆی «ئۆکسفۆرد» دەڵێ: منداڵە بچووکەکان ئامادەیی پێشتریان تێدایە بۆ »ئیمان هێنان بە بوونەوەرێکی بەرز» چونکە باوەڕیان وایە کە هەموو شتێك لەم جیهانەدا لەبەر هۆیەك دروست کراوە.

ئەم توێژەرە دەڵێت: منداڵە بچووکەکان ئەگەر لە ڕێی قوتابخانەو کەسوکاریشەوە نەبێت، هەر بە خۆیان»ئیمان»یان هەیە، تەنانەت ئەگەر لە دوورگەیەکی بیابانیشدا بە تەنیا گەورە ببن، بۆ خۆیان دەگەنە دەرەنجامی «باوەڕ بەخوا».

هەر هەمان توێژەر تاقیکردنەوەی دەرونیی لەسەر چەندین منداڵ بە جیا جیا ئەنجام داوەو، بۆی دەرکەوتووە کە هەموو یەکێکی ئەوان بە یەقینەوە باوەڕی خۆیان دەربڕیوە کە هەموو شتێك لەبەر هۆیەکی دیاریکراو دروست کراوە.

ئەو زانایە دەڵێت: ئەگەر منداڵەکان کاریگەریی قسەی مامۆستایان و کەسوکاریان لەسەر نەبیٚ، باوەڕیان بە «بەدیهێنان» هەیە نەك بە»پەرەسەندن»!

هەروەها دەڵێت: زانایان لە فەرهەنگی هەندیٚ میللەتاندا بینویانە منالەکان باوەڕیان بە «خوا» هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕێنمایی ئایینی لەبەر دەستدا نەبووە!

ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کە مرۆڤ بەخۆیدا بڕواتەوەو ڕۆڵی»ئیمان» لە ژیانی خۆیدا هەست پیٚ بکات و بە کردارو ئاکارە جوانەکانی پێش چاوی بخات، تا بزانیٚ چەندە لە قوڵایی سروشتیدا ڕەگ و ڕیشەی هەیە.. هەروەها تێبگات کە «ئیلحاد» چەندە بیٚ بنج و ڕیشەیە لە سروشتدا؟ خۆ ئەو قۆناغە شکست خواردووە بەسەرچوو کە بێباوەڕان»زانست» یان دەکردە قەڵغان و بیانووی ئیلحادیان، وا ئەمڕۆ زانست لایەنگری «ئیمان»ە، تەنانەت خۆیشی یەکێکە لە باوەڕداران!

(w.Mark Richardson) لە بنکەی (لاهوت و زانستی سروشت) دەڵێت: زانست ناتوانێت ببێتە شاهێدێك کە بەچاوی خۆی بینیوە.. بۆ بوونی (الله) ئەگەر بیەویٚ و نەیەویٚ، شاهێدە لەسەر حوکمی ڕەوای (بیٚ هاوتایی خودا) لە ساڵی (١٩٧١)ع زانای بایو کیمیائی (Aurther Peacocke) بانگهێشتی کرد کەوا هەتا بیردۆزی داروین بۆ پەرەسەندن کە ئێستا لە تەوەرەی مرۆڤدا بەکەمی (پەرەسەندنی مرۆڤ) بووەتە کەلەپورێکی زانستی وەك چیرۆکێك لە چیرۆکی پیرەژنەکانی لیٚ هاتووە!! ناتوانێت ئینکاری بوونی (الله) بکات، هێندەی پیٚ نەچوو ئەم زانایە بوو بە قەشە لە کڵێسا!!

(Billy Crackette) سەرۆکی دەزگای (ئەرشیفی فریشتەی ماشون) لە (Dallas) دەسەلمێنێ کەوا لێکۆڵینەوەکانی (میکانیکی کم) ئیمان بەهێز دەکات:- (زۆر نهێنی هەیە لە سروشتی شتەکان).

لەم دواییانەدا کۆنگرەیەکی جیهانی لە شاری (Berkeley) لە ویلایەتە یەکگرتووەکان چەندین زانای ئایینە ئاسمانیە جیاوازەکان بەشدارییان تێدا کرد هەموو ئەم زانایانە سەلماندیان کەوا ئەو ڕاستیە کە بنەماکانی ئایینە ئاسمانییەکان لێی هاوبەشن و زانست دەیان سەلمێنێ و دەچەسپێنێ ئەویش (الله)یە دروستکەری گەردوونە...) بێبڕواکان کە (گریمانی گومڕا) (فرضية الإلحاد) یاخود گریمانە هاو شێوەی وەردەگرن وەك بەڵگە کە هەڵەو گفتوگۆ قەبوڵ ناکات و سیستەمە ڕێك و پێکە سەیرەکەی لەشیان زیندەوەرانی دەوروبەریان قایلیان ناکات هەتا جیهانی زیندەوەران و زەوی و کۆمەڵەی خۆرو گەردوون و میکانیکی.. هتد، ئەمانە هەموویان قایلیان ناکات بۆ بڕوا هێنان بە (الله).

ئەمەش وەڵامێکی ساکارە بۆ پرسیارێکی ساویلکە هەندێ جاریش بێ تاوانە کە دەڵێت:

(ئەگەر ئەمە ڕاستە بۆ دەبینن زۆر لە زانایان و بەهرەداران.. باوەڕیان بەشتێك نیەو گوێ نادەنە (الله)؟!! ئەوەی باوەڕ دەکات یان لەبنەڕەتەوە باوەڕدارە (ئیماندارە) کەوا (هێزێکی مەزن) هەیەو زاڵە بەسەر ئەم گەردوونە یان ئەو کەسەیە بەدوای ڕاستی دەگەڕێت و لێکۆڵینەوەی بەسەردا دەکات بەهەر شێوەیەك بێت.. ئەم دوو جۆرە جیاوازن لە جۆری یەکەم (بێباوەڕن) کە شتی پێشتر ڕەت دەکەنەوەو گریمانی بۆ دادەنێن باری ئەمانە بەو کەسانە دەچێت لە ناوەڕاستی ڕۆژدا وەستاوەو بەدەستەکانی بەرچاوی گرتووەو هاوار دەکات و دەڵێت:(بێ هاوتام نابینم)! کێشەی ئەم کۆمەڵە زانایە لەناخدایە چونکە ئەو (ژیریێژی کۆششی بیرکاری) (المنطق الإسقرائي الرياضي) کە عەقڵیان بەکاری دەهێنێت بۆ سەلماندنی ئاڵۆزترین کێشەکان و دۆزینەوەی ڕاستییەکانی گەردوون و ماددە هەمان ژیریێژییە کە بەهۆیەوە بوونی (الله) و گەورەیی دەسەلمێنن بەڵام لەباری یەکەمدا قەبوڵی دەکەن و پشگیری دەکەن (واتە ژیریێژی) بەڵام کەچی لەباری

بەرگی دووەم

دووەمدا ڕەتی دەکەنەوە! ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئەمانە بە ئەنەقەست پێشتر زانیاری بە هەڵە دەزانن!!

لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە لە ولاّتە یەکگرتووەکان کرا لە ساڵی (١٩٩٧)ع (٤٠٪) زاناکان لە وولاّتە یەکگرتووەکان عیبادەت دەکەن چونکە بنەمای بڕوایان وایە دەبێت دروستکەرو خاوەنی ئەم ژیانە هەبێت. (Charhles Townes) (کە خەلاّتی نۆبلی بە هاوبەشی بەدەست هێناوە، وە بنەمای بیردۆزی تیشکی لێزەری دۆزییەوە) دەیسەلمێنیٚ کە مرۆڤێکی بەدینم، بۆیە هەست بە بوون و گەورەیی (الله) دەکەم لە گەردووندا، وە دووبارە (Townes) کە ئێستا لە زانکۆی (Berkeley) لە کالیفۆرنیا لەبابەت دۆزینەوەی ئەم دواییانەی گەردووناسی دەڵێت: (وێنەی گەردوون دەکێشین کە گونجاوە لەگەڵ ئەو وێنەیەی کە ئایین پیشانی دەدات) وە دوبارە دەڵێت: (یاساکانی فیزیای گەردوون دیاری دەکات کەوا ئەم گەردوونە لەلایەن (توانایەکی زۆر بەهێزەوە) دانراوە بەلاّم گەردووناس (S.jocelyn Bell Burnell) دۆزەرەوەی (بلسارات) کە ئەندامە لە (کۆمەڵەی ئایینی بۆ هاوەلاّن) لە وەلاّمدانەوەی ئەو کەسانە کە ئایین دارەکان تۆمەتبار دەکەن کەوا بۆچونی زانستییان بۆ گەردوون بە (فیلتەر) ی ئاییندا دەڕوات، وەدەیسەلمێنیٚ کە دەڵێت: (ئایا تیڕوانینم بۆ زانست و بینین و هەڵس و کەوتم لەگەڵ وشەکانی دەگۆڕا ئەگەر بیٚ دین بوومایە! وەلاّمی خۆی دەداتەوە (بەهیچ شێوەیەك گومانم لەوەدا نیە)[1].

هەموو لێکۆڵینەوەکان بە سەرکوتکردنی ڕای بێباوەڕەکان دەشکێنەوە، لەم لێکۆڵینەوە نوێیەشدا زانایان جەختدەکەنەوە کە ئاین یارمەتی مرۆڤ دەدات بۆ مانەوە بە بەختەوەری و گەشبینی.

لە زنجیرەیەك لێکۆڵینەوەی زانستیدا زانایان لە (University of British Columbia) جەختدەکەنەوە لەسەر ئەوەی، ئەگەر ئایین نەبوایە، ژیان لەسەر زەوی بەردەوام نەدەبوو.

---

(١) وەرگیراوە لە گۆڤاری (News week) ئەمریکی... حقائق العلم الحديث، عبدالرحمن العصافي.

بەرگی دووەم

ئاین لە ڕابردوو ئێستاشدا پێویستیەکی سەرەکی بووە بۆ مانەوەی مرۆڤەکان بە چوار چێوەی کۆمەڵگە ڕێکخراوەکاندا، ئەم ئەنجامەش دوای چاودێرییەکی زۆری کۆمەڵێك بێباوەڕو کۆمەڵێکی تری باوەڕدار بە هەبوونی درووستکەری گەردوون (الله) یارمەتی مرۆڤ دەدات بۆ ژیانێکی کۆمەڵایەتی باشتر.

لێکۆڵینەوەکانی پێشوو جەختیانکردبووەوە لەسەر ئەوەی کە باوەڕبوون بەخودا یارمەتیدەرە بۆ چارەسەری زۆری نەخۆشییە درێژخایەنەکان، هەروەها یارمەتیدەریشە بۆ چارەسەری ڕەشبینی و خەمۆکی.

لێکۆڵینەوە نوێیەکان جەختدەکەنەوە، کە باوەڕبوون بەخوا وا لە مرۆڤ دەکات زیاتر بەخشندە بێت! حەز بە یارمەتیدانی خەڵکی تر بکات و چاکەی بۆ جگە لەخۆشی بوێت، ئەم لێکۆڵینەوەیەش لێکۆڵینەوەیەکی زانستی چەسپاوە، نەك بیروباوەڕێکی ئاینی، بەڵکو لێکۆڵینەوەیەکی ڕووتی دوور لەهەموو بیروبۆچوونێکە.

پرۆفیسۆر (Norenzayan) لە بەشی زانستی دەروونی لە زانکۆی ناوبراو دەڵێت: ویستمان بەڵگەی زانستی کۆبکەینەوە دەربارەی کاریگەریی ئاین لەسەر هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان، دەرکەوت کە ئاین یارمەتی مرۆڤی داوە بۆ مانەوە بەشێوەی کۆمەڵ، بەبێ ئاین لەوانەیە مرۆڤەکان لە ماوەیەك لە ماوەکاندا ڕووبەڕووی لەناوچوون ببونایەتەوە.

لێکۆڵەرەوەکان جەخت دەکەنەوە، کە ئاین باوەڕبوون بەکەسانی تر زیاد دەکات، دڵەڕاوکێ کەمدەکات و ڕێگە لە مرۆڤ دەگرێت، کە فرۆفێڵ ئەنجام بدات، ئاین ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوە لە گەشە پێدانی کۆمەڵگا مرۆڤیەکان و گرەنتی مانەوەو بەردەوامبوونیان بەرامبەر جۆرەها هەڕەشە، باوەڕبوون بە خودا وا لە مرۆڤ دەکات کە زیاتر بەختەوەر بێت و زیاتر تێکەڵاو بێت و زیاتر بیرۆکەی مردن بە شتێکی ئاسایی وەربگرێت، بە پێچەوانەی ئەو بێباوەڕانەوە، کە گرفتیان لە ڕووی بەختەوەری و تێکەڵاوبوون لەگەڵ دەوروبەردا هەیە، دەتوانین بڵێین: لە هەر خانەیەك لە خانەکانی لەشی مرۆڤدا گەواهیدەرێك و بەڵگەیەکی ڕوون لەسەر هەبوونی خودا هەیە، ئەم خانەیە دروستکەرەکەی دەناسێت، چۆن نایناسێت لە کاتێکدا هەر خودایە یەکەمجار دروستی کردوە؟ چۆن نایناسێت، کە هەموو شتێك سوپاس و ستایشی خوا دەکات.

پرسیارەکەشمان بۆ هەموو بێباوەڕێك ئەوەیە: بۆچی عەقڵی منداڵ بیری دروستبوونی گەردوون بەڕێککەوت قەبوڵ ناکات؟ بۆچی منداڵان پرسیار لە نهێنی دروستبوونیان دەکەن؟ تەنها بە وەڵامدانەوەیان بەوەی کە خودا بەدیهێنەری ئەوانە، یەکسەر ئەم ڕاستیە بە ئاسانی وەردەگرن و قبوڵی دەکەن، بەڵام کاتێك باسی بیردۆزەکانی گەشەسەندن و ڕێکەوتنیان بۆ دەکەیت، هیچ منداڵێك ئەم بیرە بەتاڵە قبوڵناکات، دەزانی بۆ؟ لەبەر هۆیەکی زۆر سادە، ئەویش چونکە ئەمە ڕاست نیە..

قورئان جەخت لەسەر ئەم ڕاستیە دەکاتەوە، خوای گەورە بەڵێنی بەهەموو مرۆڤێکی باوەڕدار داوە، کە ژیانێکی خۆش و بەختەوەر دەژیت، هەروەك دەفەرموێت:

[ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ ][(١)].

واتە: ئەوەی کارو کردەوەی چاکەی کردبێت، پیاو بێت یان ئافرەت لە کاتێکدا بڕوادار بێت، سوێند بە خوا بە ژیانێکی کامەران و ئاسوودە لە دنیادا دەیژێنین، لە قیامەتیشدا پاداشتیان بەجوانتر دەدەینەوە لەوەی کە ئەوان دەیانکرد.

لەبەر ئەمە دەبینین کە مرۆڤی باوەڕدار لە ژیانێکی زۆر پارێزراوتر لە بێباوەڕەکان دەژین، لە بەدواداچوونێکی تایبەت کە خۆم ئەنجاممدا، کە ڕووی چەند پرسیارێکم لە هەندێك بێباوەڕو هەندێك باوەڕدار (هەندێکیان قورئانیان لەبەر بوو) کرد، بینیم کە جیاوازییەکی گەورە لە نێوان ئەم دوو دەستەیەدا هەیە، بێباوەڕ بەردەوام لە ژیاندا هەڵدەگەڕێتەوەو بە دەست دوو دڵی و نەبوونی جێگرییەوە دەناڵێنێت، ئەمەش لەکاتی هەڵچوونەکانیداو تەنانەت لە ڕێگەی وەڵامدانەوەی پرسیارەکانیشەوە دەردەکەوێت، لە کاتێکدا باوەڕدار لەهەموو بارەکاندا سوپاس و ستایشی خوا دەکات، هیچ جۆرێك لە جۆرەکانی دوو دڵی و ڕەشبینی لەلا دروست نابێت و هەست بەخۆشیەك دەکات کە وێنەی نیە، دەرکەوتووە هەر کات مرۆڤ باوەڕو پشتبەستنی بەخوا زیادیکرد، ئەوەندە زیاتر بەختەوەر دەبێت و لە خەمۆکی دوور دەکەوێتەوە.

---

(١) سورة النحل: ٩٧ ٩٨.

# گەمارۆدانی شاری مەدینەی پێغەمبەر(ﷺ)

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی موسڵمانەکان شپرزە دەبن و، ستەمکردن دەردەکەوێت و، دوژمنان گەمارۆی شاری مەدینەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەدەن.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری پێشەوا عومەر(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرموویەتی: (يُوشِكُ الْمُسْلِمُونَ أَنْ يُحَاصَرُوا إِلَى الْمَدِينَةِ حَتَّى يَكُونَ أَبْعَدَ مَسَالِحِهِمْ سَلَاحِ)[1].

واتە: نزیکەو هێندەی نەماوەموسڵمانەکان گەمارۆ بدرێن لە شاری مەدینە، هەتا دوورترینی جێگا کە بترسن لە دوژمنانتان دەگاتە سەلاح.

(سلاح): جێگایەکە لە خەیبەر.

لە بەرگی یەکەم ئەوەمان ڕوون کردوە کە چەندین جار شاری مەدینەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەمارۆدراوە.. وە لە پێش هاتنی یەئجوج و مەئجوجیش بۆ جارێکی تر گەمارۆ دەدرێتەوە، کە ئەمەش هەموو بەڵێنەکانی پێغەمبەری خوایە (ﷺ).

شاری مەدینە: یەکێکە لە شارەکانی عەرەبستانی سعودییە کە لەناوچەی حیجاز هەڵکەوتووە کە تیایدا ئیسلام پەرەی سەندوەو گەشەی کردووەو بڵاوبۆتەوە.

شاری مەدینە: بە یەکەم پایتەختی دەوڵەتی ئیسلام دادەنرێت، نزیکەی ٤٠٠ کم دوورە لە شاری مەککەی پیرۆزەوە.

پێش زیاتر لە ١٦٠٠ ساڵ لە هاتنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناوی ئەو شارە یەسریب بوە کە بە واتای مانگا دێت، دواتر پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناوەکەی گۆڕی بۆ مەدینە کە بە واتای شار دێت.

---

(١) صحيح: رواه أبو داود (٤٢٥٠) وصححه الألباني في صحيح أبي داود .

## ئیش بە گومان دەکرێت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی حوکم لەسەر بنەمای گومان ئەنجام دەدرێت..

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ( لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى.. يقضي بالظن..)[1].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت.. هەتا حوکم لەسەر گومان دەدرێت.

هەر چەندە هەندێك لە زانایانی فەرموودەناس دەفەرموون: ئەم فەرموودە بێ هێزە.. بەڵام لە واتادا زۆر واقیعیە.. وە لەم سەردەمەدا خەڵکێکی زۆر پەنای بردووەتە بەر گومان و دوودڵی.. وە بڕیاردان لەسەر گومان...

ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەر(ﷺ)، لەسەر ئەوەش کە لەلایەن خوای گەورەوە ڕەوانە کراوە.

گومانی خراپ واتە: تۆمەتبارکردن بەبێ بەڵگە کە زانایان ناویان بردووە بی غەیبەتی دڵ و باسکردنی براکەی لەدڵەوە بە خراپە.

نیشانەکانی گومانی خراپ:

- بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە بەبێ بەڵگە.
- تۆمەتبارکردنی خەڵکی .
- خۆ هەڵکێشان و بەزۆر زانین.
- بێ ڕێزی و کەمکردنی خەڵکی.
- زوڵم کردن لە براکەی و پێشێڵ کردنی مافی.
- نا لێبوردەیی لە کەسێك کە هەڵە بکات.

---

(١) ضعيف: أخرجه ابن عساكر في تاريخ دمشق (٤٥٣/٧) أخرجه الطبراني في (المعجم الكبير) (٢٢/٣٧٦/ ١ ٩٤) ، وابن عساكر في «التاريخ « (١٠٢٩/٨) وقال الألباني في السلسلة الضعيفة: ضعيف.

## فەرمان بە چاکەکردن کەم دەبێت

لە نیشانە بچووکەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر زانایانی ئیسلام ئاوات بە مردن دەخوازن.

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (من اقتراب الساعة قلة الأمر بالمعروف..)[١].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەمر بە چاکەکردن کەم دەبێتەوە..

لەم سەردەمەدا زۆر ڕاشکاوانە ئەوە دەبینین کە فەرمانکردن بە چاکە زۆر زۆر کەم بووە.. بۆیە بە پێویستی دەزانم بە کورتی و کوردی چەند ئادابێکی فەرمان کردن بە چاکەو ڕێگری کردن لە خراپە باس بکەم، لەوانە:

- فەرمان کردن بە چاکەو ڕێگری کردن لە خراپە فەزڵ و ڕێزێکی زۆری هەیە.
- شەریعەتی ئیسلام ئەسڵە لە دەست نیشانکردنی کاری چاك و خراپدا.
- زانینی مەرجی ئینکاری کردن لە خراپە.
- زانینی پلەو دەرەجەکانی ئینکاری کردنی خراپە.
- لەبەرچاوگرتنی مەسڵەحەت و مەفسەدەت.
- دڵنیابوون و پەلەنەکردن لە کارەکاندا.
- ئەو شتانەی کە پێویستە لە کەسی فەرمانکار بەچاکەو ڕێگری کار لە خراپەدا هەبێت.

---

(١) أخرجه ابو نعيم في (الحلية).

• پیاو ئینکاری ئەو خراپەیە دەکات کە توانای گۆڕینی هەیە.

• کاتێ کۆمەڵێ کەسی هەرزەو سەفیهی بینی کاری خراپەیان ئەنجام دەدا چی بکات؟

• فەرمان دەکات بە چاکەو ڕێگری دەکات لە خراپە گەر گومانی وابوو لێی قەبوڵ دەکەن.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عەمر (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إذا رأيت أمتي تهاب فلا تقول للظالم يا ظالم فقد تودع منهم)[1].

واتە: هەر کاتێك ئوممەتەکەی منت بینی ترسان، بە ستەمکاریان نەدەگوت ئەی ستەمکار ئەوا ماڵئاواییان لێ بکە.

ئەم خیتابەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ هەموو سەردەمێك و جێگایەکە کە مەبەست پێی موسڵمانانە لە هەر وڵات و شارێك بن.. لە کاتێکدا سنوری خوای پەروەردگار دەپچڕێندرێت بە هۆی مامەڵەی حەڕام و خیانەت و دزی و وازهێنان لە نوێژو نەدانی زەکات و .. هتد.

پێشەوا ئەبو هورێرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (كيف بكم إذا تركتم الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر؟ قالوا: يا رسول الله (ﷺ) إن هذا لكائن؟ قال: نعم، وأشد منه)[2].

واتە: ئێوە حاڵتان چۆن دەبێت کاتێك فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە واز لێهێنرا؟ گوتیان: ئەوە ڕوودەدات ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟ فەرمووی: بەڵێ، لەوەش خراپتر..

---

(١) صحيح: أخرجه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٩٦) كتاب: الأحكام، باب: الخصمان يقعدان بين يدي الحاكم، وقال: صحيح الإسناد ولم يخرجاه.. وأخرجه أحمد (١١/ ٧٣) برقم: (٦٥٢١).

(٢) ضعيف: أخرجه ابو يعلى (١١/ ٣٠٤) برقم: (٦٤٢٠). في إسناد أبي يعلى موسى بن عبيدة وهو متروك.



بەرگی دووەم

# خوا پەرستە نەخوێنەوارەکان زۆر دەبن

لە نیشانە بچوکەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بوونەوەر خوا پەرستی نەخوێنەوار زۆر دەبێت...

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (یکون في آخر الزمان عبّاد جهّال ..)[1].

واتە: ئەوەی کە ڕوودەدات لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر خواپەرستی نەخوێنەوارەکان زۆر دەبێت..

واتای ئەم فەرموودەیە زیاتر ئەوە دەگەیەنێت کە خوا پەرستەکان زانستی شەرعیان نامێنێت و بڕیار لەسەر خوا پەرستی خۆیان دەدەن نەك زانستی شەرعی..

هەر چەندە زانایانی فەرمووەدەناس ئەم فەرمووەدەیان بەبێهێز داناوە، لەگەڵ ئەوەشدا لە واقیعی ئەمڕۆ بە چاوەکانمان دەیانبینین..

نەخوێنەواری لە زۆرێك لە وڵاتان بۆتە دیاردەیەکی زەق و بەربڵاو، بە تایبەت لە وڵاتە دواکەوتووەکان، یان هەژارەکان، یاخود وڵاتانی تازە گەشەسەندوو، ئەوەش کاریگەری زۆری کردۆتە سەر دۆخی ژیانی تاکەکانی کۆمەڵگە لەو وڵاتانە، هەر ئەوەش بووە هۆکاری ئەوەی کە نەتەوە یەکگرتووەکان ڕۆژی (٨)ی ئەیلولی هەموو ساڵێك تایبەت بکات بە ڕۆژی جیهانی نەخوێندەواریی، بەڵام ئەوەی ڕوودەدات لە پێش هاتنی کۆتایی بونەوەر ئەوەیە کە خەڵکە خواپەرستەکە زۆربەیان نەخوێنەوارەکان دەبن.

---

(١) موضوع: المستدرك للحاكم: (٣١٥/٤) برقم: (٧٨٨٣) والبيهقي في (الشعب) (٦٩٥٤) وفيه يوسف بن عطية كثير المناكير.. قال ابن حبان: كان ممن يقلب الأسانيد ويلزق المتون الموضوعة بالأسانيد الصحيحة ويحدث بها، لا يجوز الإحتجاج به بحال (المجروحين ٣/ ١٣٥). وقال الألباني: موضوع (ضعيف الجامع) (٦٤٤٠).

بەرگی دووەم

## ڕیشوە ناو دەبرێت بە دیاری

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر، ڕیشوە ناودەبرێت بە دیاری.. بۆیە پێدانی بەرتیل بە قازی و ئەوەی دادوەری دەکات لە نێوانی خەڵکدا بۆ ئەوەی مافی کەسێك پێشێڵ بکات یان کارێکی ناڕەوا بکات، تاوانە چونکە سەردەکێشێ بۆ ستەمکردن لە فەرمانڕەوایەتی و ستەم کردن لە خاوەن ماف و بڵاوکردنەوەی گەندەڵی..

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (ﷺ) دەڵێت: (إن من أعلام الساعة وأشراطها .. إذا استحلت هذه الأمة السحت بالهدية)[1].

واتە: لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی هەر کاتێك لە نێو ئوممەتەکەم ریشوە ناو برا بە دیاری..

لەم فەرموودەیە زۆر بە ڕاشکاوانە بۆمان بە دەردەکەوێت کە لە پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت ناوی ڕیشوەو وەرگرتنی پارەی حەڕام ناو دەبردرێت بە دیاری.. ئەمەش موعجیزەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرایە کە لەم سەردەمەدا ئێمە بەدی دەکەین..

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إن من أمارتها أن تقطع الأرحام ويؤخذ المال بغير حقه وتسفك الدماء ويشتكي ذو القرابة قرابته لا يعود عليه بشئ، ويطوف السائل لا يوضع في يده شئ)[2].

تەنانەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفرەتی لە بەرتیل دەرو بەرتیل وەرگر کردووە لە حوکم و دادوەری.

---

(١) كنز العمال في سنن الأقوال والأفعال، برقم: (٣٨٤٩٥).

(٢) رواه الحاكم في المستدرك (٨٦٦٣) قال الحاكم: هذا حديث صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه.

تێبینی: ئەوەی بۆ گەیشتن بە مافێك یان لادانی ستەمێك ئەنجام دەدرێ، کە ناگونجێ تەنیا لە ڕێگەی بەرتیلەوە نەبێت ئەوا ناچێتە ناو ئەو هەڕەشەوە.

لەم سەردەمە بە ڕێژەیەکی وا بەرتیل بڵاوبۆتەوە بە ئەندازەیەك پێگەی لە پلەو پایە گەورەترە بە لای هەندێك لە فەرمانبەرانەوە، بەڵکو بۆ بەندو خاڵێك لە میزانیەی زۆرێك لە کۆمپانیاکان بە چەندین ناونیشانی شاراوەو، زۆرێك لە گرێبەستەکان سەرەتاو کۆتایی یان تەنیا بە بەرتیلەوەیە لەوەشدا هەژاران زیانی گەورەیان بە بەردەکەوێ و زۆرێك لە کەفالەو بەڵێننامەکان گەندەڵ دەبن بەو هۆیەوە، ئەمەش دەبێتە هۆکار بۆ تێکدانی کرێکارەکان لە بەرامبەر خاوەن کارەکان و خزمەتی چاك پێشکەش ناکرێ تەنیا بە بەرتیل دەر نەبێ، ئەوەی بەرتیلیش نەدات کەم خزمەت دەکرێ یان دوا دەخرێ و پشتگوێ دەخرێ، بەرتیل دەرەکانیش کە لە دوای ئەو دەستیان پێ کردووە بە ماوەیەکی زۆر پێشی ئەو کۆتاییان پێ هێناوە، بەهۆی بەرتیلەوە سامانێکی زۆری خەڵکی بردراوەو دەچێتە گیرفانی نوێنەرانی کاڵای فرۆشراو و کڕدراو، لەبەر ئەوە هۆکاری تریش جێگای سەرسوڕمان نییە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دۆعا لە بەشداربووانی ئەو تاوانەو ئەندامانی ئەو تاوانە بکات بەوەی خوا لە ڕەحمەتی خۆی بەدەریان خات.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: نەفرەتی خوا لەسەر بەرتیل دەرو بەرتیل خۆر بێت[١].

خودای گەورە فەرموویەتی: [ وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٨﴾ ][٢].

لە ریوایەتێکی تر فەرمویەتی: (سيأتي على الناس زمان .. يفشو فيه الرشا..)[٣].

واتە: سەردەمێك بەسەر خەڵکی دێت ریشوە زۆر پەرەدەسەنێت و بڵاودەبێتەوە..

---

(١) صحيح الجامع، برقم: (٥١١٤).

(٢) سورة البقرة، الآية: (١٨٨).

(٣) ضعيف: أخرجه ابو داود، قال الالباني: ضعيف الإسناد.

# پێش كەوتنی زانست و تەكنەلۆجیا

لە نیشانەكانی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەیە وای لێدێت تەكنەلۆجیاو زانست ئاوا پێش دەكەوێت كە مرۆڤ لە ژیانی دا بە چاوی خۆی نەیدبێت .

(اللە) سبحانە وتعالی فەرموویەتی: [حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ زُخۡرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتۡ وَظَنَّ أَهۡلُهَآ أَنَّهُمۡ قَٰدِرُونَ عَلَيۡهَآ][1].

واتە: هەتا كاتێ زەوی (بە سەوزی و ڕوەك) ڕەونەق و جوانی خۆی وەردەگرێ و خۆی دەڕازێنێتەوە دانیشتوان و خەڵكی ئەو (زەوی)یە وا دەزانن كە بەڕاستی ئەوان بە توانان بەسەر (دروێنە كردن)یدا.

بەندە وای بۆ دەچێت كە ئەم ئایەتە قورئانیە بەڵگەیەكی ڕاشكاوانەیە بۆ سەرهەڵدانی پێشكەوتنی زانستی تەكنەلۆژیا، كە لە ئێستادا لەو پەڕی پێشكەوتن و پێشكەشكاریدایە، چونكە ئەم ئایەتە ئیشارەتە بە هەستانی قیامەت لە كاتێكدا زەوی ئاوەدان دەكرێتەوەو جوان دەكرێت، وە گومان دەبەن توانایان بەسەر هەموو شتێك هەیە لە كاتێكدا توانای لەناوبردنی ڤایرۆسێكی كۆڕۆنای بە چاو نەبینراویان نییە كە زیاتر لە یەك ملیۆن كەسی كوشتوە، وە تا ئێستاش زۆرینەیان فیزی دەنوێن بەسەر (اللە) سبحانە وتعالی.

سەرچاوە مێژوویەكان ئەوەمان بۆ ڕوون دەكەنەوە كە كۆمەڵگای عەرەب كاتی دابەزینی قورئان هیچ ئامێركی زانستی تەكنەلۆجی پێ نەبوو، بۆ پشكنینی وردەكاریەكانی سروشت و بوونەوەر، واتە: ناتوانێ بە راورد بكرێ لە نێوان ئاستی زانستەكان و تەكنەلۆجیا لەم سەردەمەی ئێستامان، سەرەڕای ئەمەش پێغەمبەر(ﷺ) پێی ڕاگەیاندووین كە پێشكەوتنێكی گەورەی زانستی ڕوودەدات لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی دا.

---

(١) سورة یونس، الآیة: (٢٤).



بەرگی دووەم

ئەمەش جیاوازیەكی گەورە دەردەخات لە نێوان زانست و تەكنەلۆجیایی ئەو سەردەمەو ئەوەی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) كە هەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا فەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ) گەلێك ڕاهێنانی تەكنەلۆجیایی ئاشكرا كردووە كە لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی دا دێنە دی .

ئیستاش با چاوێك بخشێنین بەم پێشكەوتنە زانستیانە :

١) لەو كاتانەی تەمەن درێژ دەبێت، تێكڕای تەمەن ئێستا زۆر لەوە زیاترە كە (١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر هەبووە، بۆیە ئەم زانیاریەش پێغەمبەر(ﷺ) پێی ڕاگەیاندووین، جا لە نێوان دەست پێك و كۆتایی سەدەی بیستەمدا جیاوازی و نەهامەتیەكی زۆر هەیە.

٢) گەشەسەندنی خزمەت گوزارییە تەندروستیەكان، بەهۆی داهێنانەكانی تەكنەلۆجیای پزیشكیەوە ئەمە وای لێكرد بێتە دی، بۆیە هەر نەخۆشیەك دەرمانێكی خۆی هەیە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: خودا هیچ دەردێكی نەناردووە تا وەك و دەرمانەكەشی نەناردبێ .

لەم فەرمودەیەدا ئاماژە دەدرێت بە توانای دۆزینەوەی دەرمانەكان كە بە شێوەیەكی ئەرێنی كاردەكاتە سەر تەندروستی خەڵكی تێكڕای تەمەنی مرۆڤ، لەم سەردەمە جیاواز لەگەڵ تێكڕای مرۆڤ لە پێش چواردە سەدەدا دەبینین، وەك لەم سەردەمەی ئێمەدا تەمەن درێژترە وەك لە پێشان بە پێی سەعات ، تێبینیش دەكرێ كە جیاوازیەكی زۆر هەیە لە نێوان تێكڕای مرۆڤ لە سەرەتای سەدەی بیستەم و كۆتایی یەكەی .

بۆ نمونە: لە یەكێك لە نەخۆشخانەكانی شاری لەندەن نەشتەرگەریەك ئەنجام درا بە شێوازێكی زۆر پێشكەوتوو بۆ نەخۆشێكی تووش بوو بە نەخۆشی ڕژێنی پرۆستات، كە ئەویش پێك هاتبوو لە ئامێرێك كە نەشتەرگەریەكەی بە سەركەوتوویی و ئاسانی ئەنجام دەدا، ئەوەی جێگەی سەرەنجە ئەم جۆرە نەشتەرگەریانە چەند جارێك پێویستیان بە دووبارە بوونەوەی كرداری میكانیكی هەیە.. ئەو خاڵەی كە ئەقڵیەتی داوەتە ئەم ئامێرە بەسەر مرۆڤدا، ئەوەیە

کە دەتوانێ زۆر ووردتر لە دەستی مرۆڤ ئەو کردارە میکانیکیانە چەند بارەبکاتەوە، لەکاتی نەشتەرگەری ئەم ئامێرە دەجولێت بۆ پێکانی مەبەستەکەی و ئامێری مۆدێرنتر لە خۆی بەکار دەهێنێ، جگە لەوەش پێویستە مرۆڤێك یارمەتی بدات بۆ دانانی پرۆگرامێکی وێنە کێشراو لەسەر نەخشەو لەسەرو دەنگەوە، دوا کردار پێش نەشتەرگەریەکە بریتیە لە پێدانی کۆنترۆڵی تەواوەتی بە ئامێرەکە بە شێوەیەك کە هەموو کردارەکان ڕادەپەڕێنێ، مەگەر مرۆڤ هێندە بکات وەکو چاودێرێك لەوکارەدا بەشدار بێت لە نەخۆشخانەی (گای) .

کۆمەڵێك ئەندازیار لە زانکۆی لەندەن هەستان بە ئەنجامدانی نەشتەرگەریەکی سەرکەوتوو بەم ئامێرە بەبێ ئەوەی هیچ مرۆڤێك یارمەتی دەریان بێت، کە بە ڕاستی ئەمە ئاسۆیەکی ڕوونی نیشاندا بۆ کۆنترۆڵ کردن و زاڵ بوون بەسەر ئەو نەخۆشیانەی تووشی رژێنی پرۆستات دەبێ بەتایبەت لە پیاوانی پیرداو ئەمڕۆ لە جیهاندا بە ملیۆنەها کەس گرفتاری ئەم دەردەن.. خەڵکی نەخۆشخانەی (گای) زۆر بە ڕوونی بۆ ئەم هەنگاوە دەڕوانن و لەو بڕوایەدان کە ببێتە هاندەرێك بۆ داهێنکاری زیاترو ئەنجامدانی نەشتەرگەری قوڕس و کاریگەر بۆ نەخۆشیەکانی تری جەستەی مرۆڤ.. بەڵام ئایا مرۆڤ ڕازی ئەبێت بە نەخۆشی خۆی بخاتە بەردەستی ئامێرێك ؟

ئەگەر ئەم داهێنانە نوێیە توانی سەرکەوتووترین هەنگاو بنێ بەبێ بچوکترین گومان، ئەو کات مرۆڤ زۆر بە ئاسایی ڕازی ئەبێت کە ئامێرێکی لەو چەشنە ببێتە سەر پەرشتیاری نەخۆشیەکەی .

جا ئەو گەشەسەندن و تەکنەلۆژیا گەورەیە لە بواری پزیشکی توانای بەخشیە مرۆڤ بۆ بە دەست هێنانی ئەم بەخششە، بەڵکو مرۆڤ لەم کاتەدا لەبەر دەرگای بە دەست هێنانی پازدانێکی گەورەیە لە بواری پزیشکی، پاش ئەوەی گەیشتە دۆزینەوەیەکی زۆر کەوا بەستە بە چینەکانی مرۆڤەوە، بۆیە لە چاخەکانی ڕابردوودا ئەم پێشکەوتنە گەورەیە بە خەیاڵی مرۆڤ دا نەدەهات .

سەبارەت بە کارەکانی پاککردنەوەو چێشت لێنان و چاودێری کردنی منداڵان و کارە ڕۆژانەییەکان وای لێهات لە سایەی داهێنراوەکانی تەکنەلۆجیا ئەنجام بدرێت بەبێ ماندووبوون.

بە کورتی و بە کوردی کاتێ دەڕوانینە تەکنەلۆجیای نوێ دەبینین وا گەشەی سەندووە کە باوەڕبێنین بەوەی کە لە فەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دا هاتووە.

٣) گەشەسەندنی داهێنانە خێراکانی بۆ ماوەیی وەکو پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ڕۆژی دوایی بەرپا نابێت تا خەڵکی پێشبرکێی یەکتر نەکەن لە بنیاتنانی بەرزدا.

ئەگەر سەیری مێژوو بکەین دەبینین زۆربەی زۆری بینا چەند نهۆمیەکان لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەوە دەست کرا بە بنیاتنانیان، بۆیە پێشکەوتنی تەکنەلۆجیایی سەربازی ڕۆشەنبیری ئەزمونیشیان وەرگرت بۆ ملیۆنەها بینای ئاسمانی.

٤) ڕۆژی دوایی نایەت تاکو کات بە خێرایی تێ دەپەڕێت، یان دەفەرمووێ: دووریەکی زۆر لە کاتێکی کەم دا دەبڕدرێت، ئەمڕۆ فڕۆکەکانی سەرو دەنگ و شەمەندەفەرو وێنە داهێنراوەکان دەتوانن بتگوێزنەوە بۆ شوێنێکی دوور لە چەند کاتژمێرێکی کەمدا ، بە دڵنیایی و ئاسودەیی دوور لە مەترسی، لە کاتێکدا ئەمە پێشتر چەند مانگی ویستووە، ئەمەی لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی پێکراوە هەموویان هاتونەتە دی.

ئەوە ڕوونە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی دا شتەکان لە کاتێکی کورت دا تەواو دەکرێن بەراورد لەگەڵ سەردەمەکانی تردا .

بەڵگە نەویستە کە بەهۆی داهێنانە زانستیەکانەوە هەموو پیشەییەکان دەتوانرێ بە کاتێکی کەم کارێکی زۆر ئەنجام بدرێت و ئەنجامەکەشی گەلێك باشتر بێت .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە چەندین فەرموودەی هاوشێوەی تریش ئاماژە بە هەمان مەبەست دەکەن وەکو دەفەرموێ:

بەرگی دووەم

(لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَقَارَبَ الزَّمَانُ، فَتَكُونُ السَّنَةُ كَالشَّهْرِ، وَيَكُونُ الشَّهْرُ كَالْجُمُعَةِ، وَتَكُونُ الْجُمُعَةُ كَالْيَوْمِ، وَيَكُونُ الْيَوْمُ كَالسَّاعَةِ، وَتَكُونُ السَّاعَةُ كَاحْتِرَاقِ السَّعَفَةِ)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا کات لێك نزیك دەبێتەوەساڵ وەك مانگی لێ دێت و مانگ وەکو هەفتەی لێ دێت و هەفتە وەکو ڕۆژی لێ دێت و ڕۆژێك وەکو سەعاتێکی لێ دێت سەعاتێکیش وەك و سووتانی پوشکی دارخورمای لێ دێت .

سەدان ساڵ لەمەوبەر بۆ پەیوەندی نێوان خێڵەکان چەند هەفتەیەکی دەویست کەچی ئێستا لە نزیکەی چرکەیەك دا ڕێك دەخرێت وەکو ئینتەرنێت و مۆبایل و.. هتد، وە هەموو هۆکارە تەکنەلۆجیاکانی پەیوەندی کردن.

زۆربوونی پەرتووك و لە چاپدانی، ئەمڕۆ دەتوانرێ ملیۆنەها چاپی پەرتوك بڵاوبکرێتەوەو لە هەر یەك پەرتوکدا ملیۆنەها ڕووداوی جۆراو جۆری مێژوویی تێدا بێت.

بە هۆی تەکنەلۆجیاوە ئەمڕۆ لە بوارەکانی پاك کردنەوە چێشت لێنان و بەخێوکردنی منداڵ بە کاتێکی زۆر نزیك جێ بەجێ دەکرێت .

ئەوەی ئەمڕۆ دەیبینین لە بوارەکانی تەکنەلۆجیاوە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتونەتە دی وەکو دەفەرموێ: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا کەسێك دەنگی خۆی قسەی لەگەڵ نەکات.

یەکێك لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژە بە داهێنانەکانی بواری پەیوەندی کردن دەکات کەوا لە دەنگی خۆی دەبێت یەکەم جار تۆمار بکرێ و پاشان گوێی لێ دەگرێ، یان تەکنەلۆجیای تۆماری دەنگ و پەخش کردنەوەی سەدەی بیستەم دەگرێتەوە.

---

(١) صحيح ابن حبان (٢٥٦/١٥) ، رقم : (٦٨٢٤) ، وقال محققه شعيب الأرناؤوط : إسناده صحيح عى شرط مسلم . وذكره ابن كثير في النهاية في الفتن والملاحم (٢٣٤/١) بهذا الإسناد وقال : زعم سهل أن هذا الإسناد على شرط مسلم . وابن حجر في الفتح (١٩/١٣) ، وعزاه لأحمد والترمذي عن أبي هريرة وأنس . والتبريزي في مشكاة المصابيح ، رقم : (٥٤٤٨) .

لە فەرموودەکانی تر باسی پێشکەوتنی تەکنەلۆجیایی و پەیوەندی گەیاندن ڕائەگەیەنێت ، ئەمەش ئاماژەیە بۆ نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی .

هەروەها دەفەرمویێ: دەنگێك بە ناوی خۆیەوە بانگی دەکات تەنانەت خەڵکی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەیبستن.

هەروەها دەفەرمووی:

ئەو دەنگەی بڵاودەبێتەوە بەسەر هەموو جیهاندا، بۆیە هەموو نەتەوەیەك بە زمانی خۆی دەیبیستێ، ئەم فەرموودانە باسی دەنگێك دەکەن کە لە هەموو جیهاندا هەر کەسەو بە زمانی خۆی ئەیبیستێت، ئەمانەش هەموویان لە فەرمووده سەرسوڕهێنەرەکانی پێغەمبەرن(ﷺ)، کە (١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر باس لە داهێنانێکی باوەڕ پێنەکراو دەکات، گەر تەنانەت سەدان ساڵ لەمەوبەریش باسبکرایە ئەوە جێگەی سەرسوڕمان بوو نەوەك (١٤٣٧) ساڵ لەمەو پێش.

ئەم فەرموودانە کە باس لە لێك نزیکبوونەوەی کات دەکەن لەلایان زاناکانەوە بە چەند شێوازێکی جیاواز لێکدراونەتەوە کە پێمان وایە گونجاوترینیان ئەوەیە کە باس لە ئەمڕۆی خۆمان دەکات کە توانراوە بە هۆی هۆکارەکانی گواستنەوەی پێشکەوتووی ئەم سەردەمە وەکو ئۆتۆمبێل و فڕۆکەو شەمەندەفەرو مانگی دەستکردەوە، ئەو کاتانەی کە پێشتر پێویستی دەکرد بۆ گواستنەوەو هاتووچۆ لە نێوان شوێنە جیاجیاکاندا کورت بکرێنەوەو لێك نزیك بکرێنەوە تا وای لێ هاتووە ئەو ڕێگەیەی کە بە ساڵێك یان مانگێك یان هەفتەیەك ببڕدرێت ئێستا زۆر بە کەمتر لەو کاتە ببڕدرێت.

بەڵێ..

ئەمڕۆ بەهۆی پێشکەتنی تەکنەلۆجیاو ئامێرەکانی گواستنەوە وەکو (ئۆتۆمبێل و فڕۆکەو کەشتی ئاسمانی و دەریایی و تەلەفۆن و ڕادیۆو ئینتەرنێت و تەلەفزیۆن) کاتەکان نزیك بونەتەوە، ئەمەش زەمینەی بۆ لێك نزیك بوونەوەی شارستانیەکان و ئاشنابونیان بە یەکتری خۆش کردوە.

بەڵێ..

ئەو سەردەمەی ئێستا تیایدا دەژین سەردەمی مۆبایل و ئینتەرنێت و.. هتد، سەرباری ئەوەش ئەولیاکانی خوا بەهۆی فیراسە بەم پەیوەندییە هەڵدەستن، خوای گەورە دەفەرموێت: [ وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ۝٨ ][1].

واتە: ئەسپ و مایین و گوێدرێژمان بۆ سواریو جوانی بۆ دروست کردوون، وەشتی وا دروست دەکات ئێوە نازانن.

ئەمەش بەڵگەیە بۆ هاتنی سەردەمی تەکنەلۆجیاو ئامێری گواستنەوەی خێرا.

وە هەندێکی تر لەو کەسانەی کە ڕاڤەی فەرموودە دەکەن دەفەرموون: زەمەن لەیەك نزیك دەبێتەوە، واتە: ئەوەی جاران بە ساڵێك دەکرا ئێستا بە مانگێك یان زۆر کەمتر دەکرێ، زانست و تەکنەلۆژیا پێشکەوتووە، فڕۆکەو ئینتەنێت و مۆبایل و دەیان شتی تر نزیك بۆتەوە.

لە ساڵی (١٧٨٦)ع لەسەر دروستکردنی تەلەفۆن ناکۆکی کەوتە نێوان دوو کەسەوە کە ناویان (ئیساگری ئەکساندەر)و (گراهام بێڵ)ی ئەمریکایی بوو، لە ئەنجامدا داهێنانەکە بەر لەو (فیلیپ دایزر) یەکەمین دەسگای تەلەفۆنی دروست کردبوو، دوای (گراهام بێڵ) ی قوتابی کەم و کورتیەکانی تەواو کرد و زۆری پێنەچوو کە لە هەموو شارەکانی ئەڵمانیاو ئەمریکادا تەلەفۆن بڵاوبۆوە لە ساڵی (١٧٨٩)ع، بەس لە شاری لەندەن (٥٠) دەسگاو بەرلین (٤٦) هەزار دەسگای تەلەفۆنی لێبوو .

---

(١) سورة النحل، الآية: (٨).

## بڵاوبوونەوەی کتێب جگە لە قورئان

ئەو کتێبانەی ئەمڕۆ دەیزانین لە سەدەکانی ناوەڕاستدا پەیدابوون، نوسین لەسەر داری پاك جۆرێك بوە لە کتێب، پەڕەکانی دارەکە بە کەتیرە بەیەکەوە بۆ ئەوەی تۆمارێکی درێژی لێ دروست ببێت، ڕۆمانیەکان بەم تۆمارانەیان دەگوت «volum» کە لە وشەی «volum»ی ئینگلیزیەوە وەرگیراوەو مانای بەرگ دەدات، لەناوەڕاستی سەدەی پێنجەم پێستەی نەرم جێگەی کاغەزی داری گرتەوە کە لە پێستی ئاژەڵان دروست دەکراو خۆشە دەکرا تا دەکرایە کاغەزو لە دیوێکی دەنوسرا، هەموو پارچەکانی بە ئەندازەی یەکتربوون و لەلایەکەوە هەموبان بە دەزو پێکەوە دەیاندوری وەکو پەرتوکی لێ دەهات، بەڵام پەرتوکەکانی شێوازی ئەمڕۆ بۆ یەکەمجار لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دروست کرا، چوار پارچە پێستە دەخرایە سەر یەك بە جۆرێك کە هەر پارچەیەکی لە دوو لاپەڕە پێك دەهات ، پاشان ئەو پارچانە دەخرانە ناو یەکتر بەجۆرێك کە کۆمەڵێکی هەشت لاپەڕەیی لێ پێك دەهات و پێی دەگوترا «بەش» ئەو بەشانەش دەنێردرا بۆ لای کەسێك ئەو بابەتەی مەبەستە لەسەری بینوسێت ، نوسەرەکەش هەر جارەی پەڕەیەکی وەردەگرت و چەند جارێك لەسەری دەینوسیەوە ، دوای ئەوە هەمووی دەنوسرایەوە، پەڕەکان دەخرایە سەر یەك و دەکرایە بەرگێك و پێکەوە دەزو دەدران، ئیمجا لە دار بەرگێکی بۆ دروست دەکراو بەکەتیرە قایم دەکراو پارچەیەك پێستەی گەورە لە بەرگە دارەکە دەگیراو دوای ئەوە کاری نەخشاندن و ڕازاندنەوە بۆ بەرگەکە دەکرا.

زۆربەی پەرتوکەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بریتی بوون لە ئینجیلەکان و پەرتوکە ئاینیەکان، ئیمجا پەرتوکی قانون و پزیشکی و مێژوویی بەدوای داهات، دوای ئەوەش چیرۆك و ڕۆمان،زۆربەی پەرتوکەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بە زمانی لاتینی نوسرابونەوە.

زۆربوونی قەڵەم یەکێکە لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی، ئیبنو مەسعود دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (أَنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ تَسْلِيمَ الْخَاصَّةِ، وَفُشُوَّ التِّجَارَةِ

، حَتَّى تُعِينَ الْمَرْأَةُ زَوْجَهَا عَلَى التِّجَارَةِ ، وَقَطْعَ الأَرْحَامِ ، وَشَهَادَةَ الزُّورِ ، وَكِتْمَانَ شَهَادَةِ الْحَقِّ ، وَظُهُورَ الْقَلَمِ)[1].

واتە: لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی سڵاو لە کەسانێکی تایبەت دەکرێ و بازرگانی بڵاودەبێتەوە تا وای لێ دێ ژن یارمەتی مێردەکەی دەدات لە بازرگانی و پەیوەندی خزماتی دەپچرێ و شایەدی درۆ دەدرێ و شایەدی ڕاست و ڕەوا دەشاردرێتەوەو پێنوسیش دەردەکەوێ.

زانایان دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێن: مەبەستی ئەوەیە خوێندەوار زۆر دەبێت و کتێب نووسینیش بڵاو دەبێتەوەو زانایان کەم دەبنەوە[2].

چەند سەدەیەك لەمەوپێش مرۆڤ نەیدەتوانی تەنها چەند ژمارەیەکی کەم لە کتێب چاپ بکات، بەڵام ئێستا وای لێ هاتووە کە بتوانرێ ملیۆنەها کتێب چاپ بکرێت لە ماوەیەکی زۆر کورت دا، گەلی کورد کە نەتەوەیەکی موسڵمانەو نزیکەی (٤٠)ملیۆن کەس دەبن[3] ، تەنیا لە ساڵی ١٣٨٠ ١٤٣٠ ك زیاتر لە (٣٠٠٠) پەرتووکی ئایینی نووسیوەو نزیکەی (٤٠) تەفسیر تەنیا بە زمانەکانی تر نووسراون ، ئەمە بێجگە لە بیانیەکان، بێگومان ئەمە لەم سەردەمەدا زۆر بە ڕوونی بەدیارکەوتووە، وە بڵاوەی کردووە لە گشت جیهان، ئەمەش بەهۆی زۆربوونی دەزگاکانی بڵاوکردنەوەو کۆپیکردن کە ئاسان کارن بۆ بڵاوکردنەوەی، وە لەگەڵ ئەمەشدا بەڕاستی نەزانیەکی زۆر بڵاوە لە نێو خەڵکیدا، وە زانستی بە سوود زۆر کەم بووە لە نێوانیاندا کە ئەو زانستەش زانستی قورئان و سوونەتەو کارکردنە پێیان[4].

---

(١) مسند الإمام أحمد ، (١/ ٧٩١) برقم: (٣٩٤٧) وقال الشيخ أحمد بن شاكر : إسناده صحيح .

(٢) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ١٢٨ .

(٣) لە دوا ئامارەکانی کە بۆ گەلی کورد کراوە لەسەرەتای سەدی پازدەی کۆچی: ٧ ملیۆن کورد لە عێراق دەژی، وە (١٨) ملیۆن کورد لە تورکیا دەژی، وە(١٢) ملیۆن کورد لە ئێران دەژی و تەنیا (٤) ملیۆن لە سوریاو لوبنان و ئوردن و یەریڤان و میسر و ئەوروپا دەژین، بۆیە ژمارەی کورد لە هەرێم و بەشەکانی تری عێراق زیاتر لە (٥) ملیۆنە .

(٤) إتحاف الجماعة (١/ ٤٢٨).

## زانایان ئاوات بە مردن دەخوازن

لە نیشانە بچووکەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر زانایانی ئیسلام ئاوات بە مردن دەخوازن.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَيَأْتِيَنَّ عَلَى الْعُلَمَاءِ زَمَانٌ الْمَوْتُ أَحَبُّ إِلَى أَحَدِهِمْ مِنَ الذَّهَبِ الْأَحْمَرِ..)[1].

واتە: سەردەمانێك دێت بەسەر زانایان، مەبەست پێی زانایانی ئایینیە هەریەکەیان مردنی لەلا خۆشترە لە ئاڵتوونی سۆر.

کاتێك ئەبو هورەیرە لەسەرە مەرگ بوو ئەوانەی دەوروبەری دەیانگوت (إن شاء الله) خودا شیفات بۆ دێنێ

ئەویش دەیفەرموو: نەخێر با بمرم پێم خۆشترە

چونکە گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو کە فەرموویەتی: (لَيَأْتِيَنَّ عَلَى الْعُلَمَاءِ زَمَانٌ الْمَوْتُ أَحَبُّ إِلَى أَحَدِهِمْ مِنَ الذَّهَبِ الْأَحْمَرِ).

واتە: سەردەمانێك دێت بەسەر زانایان، مەبەست پێی زانایانی ئاینیە، هەریەکەیان مردنی لەلا خۆشترە لە ئاڵتوونی سوور.

فیتنە ئەوەندە زۆر دەبێت تا وای لێدێت خەڵکی پابەند نابن بە قورئان و سوننەوە، ئەوانیش لەبەر زۆری فیتنەوە حەز بە مردن دەکەن..

پاکوبێگەردی بۆ خوای گەورە خۆم چەندین زانای ئیسلامم بینیوە کە ئاواتیان خواستووە بە مردن، منیش پرسیارم لێدەکردن کە بۆچی ئاوات بە مردن دەخوازن؟ لە وەڵامدا دەیانگوت: لە ترسی ئاشوب و فیتنە، تا باوەڕمان لە دەست نەچێت.

---

(١) صحيح: رواه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٥٦٣) برقم: (٨٥٨١). قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

# وتاری هەینی درێژ دەبێتەوە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی مامۆستایانی ئایینی وتاری هەینی درێژ دەکەنەوە..

پێشەوا عەبدوڵڵای کوری مەسعود (ﷺ) ڕۆژێکیان بە کابرایەکی گوت:

(سَيَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ قَلِيلٌ فُقَهَاؤُهُ

كَثِيرٌ قُرَّاؤُهُ

تُحْفَظُ فِيهِ حُرُوفُ الْقُرْآنِ

وَتُضَيَّعُ حُدُودُهُ

كَثِيرٌ مَنْ يَسْأَلُ

قَلِيلٌ مَنْ يُعْطِي

يُطِيلُونَ فِيهِ الْخُطْبَة ..)[١].

واتە: ڕۆژێك دادێت خەڵکی تێگەیشتوو و زانا کەم دەبێت و قورئان خوێن زۆر دەبێت، پیتەکانی قورئان لەبەر دەکەن بەڵام سنورەکانی دەبەزێنرێت، زۆریان پرسیار دەکەن، کەمن ئەوانەی دەیبەخشن، وتاری هەینی درێژ دەکەنەوە..

لە ریوایەتێکی تر عەبدوڵلای کوری مەسعود (ﷺ) دەڵێت: (إِنَّكُمْ فِي زَمَانٍ قَلِيلٍ خُطَبَاؤُهُ كَثِيرٍ عُلَمَاؤُهُ يُطِيلُونَ الصَّلَاةَ وَيَقْصُرُونَ الْخُطْبَةَ وَسَيَأْتِي عَلَيْكُمْ زَمَانٌ كَثِيرٌ خُطَبَاؤُهُ قَلِيلٌ عُلَمَاؤُهُ يُطِيلُونَ الْخُطْبَةَ)[٢].

---

(١) صحيح: أخرجه مالك (١/ ١٧٣)، والبخاري في (الأدب المفرد) برقم: (٧٩٠)، والطبراني في الكبير، برقم: (٩٤٩٦) وهو موقوف، وقال الهيثمي في المجمع (٧/ ٢٨٥) ورجاله رجال الصحيح.

(٢) المعجم الكبير، للطبراني (٩/ ١١٣) برقم: (٨٥٦٧).

واتە: ئێوە لەسەردەمێکن وتاربێژتان کەمەو زاناتان زۆرە، نوێژ درێژ دەکەنەوەو وتار کورت دەکەنەوە، بەڵام ڕۆژگارێك دێت وتاربێژ زۆر دەبێت و زانایان کەم دەبن، وە وتاری هەینی درێژ دەکەنەوە.

## نوێژ کورت دەکرێتەوە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی مامۆستایانی ئایینی نوێژەکانیان کورت دەکەنەوەو ئایەتی قورئانی لەناو نوێژدا زۆر بە کەمی دەخوێنن..

پێشەوا عەبدوڵڵای کوری مەسعود (ﷺ) ڕۆژێکیان بە کابرایەکی گوت:

(إِنَّكَ فِي زَمَانٍ كَثِيرٍ فُقَهَاؤُهُ

قَلِيلٍ قُرَّاؤُهُ

تُحْفَظُ فِيهِ حُدُودُ الْقُرْآنِ

وَتُضَيَّعُ حُرُوفُهُ

قَلِيلٌ مَنْ يَسْأَلُ

كَثِيرٌ مَنْ يُعْطِي

يُطِيلُونَ فِيهِ الصَّلاَةَ

وَيَقْصُرُونَ الْخُطَبَةَ

يَبَدُّونَ أَعْمَالَهُمْ قَبْلَ أَهْوَائِهِمْ

وَسَيَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ قَلِيلٌ فُقَهَاؤُهُ

كَثِيرٌ قُرَّاؤُهُ

تُحْفَظُ فِيهِ حُرُوفُ الْقُرْآنِ وَتُضَيَّعُ حُدُودُهُ

كَثِيرٌ مَنْ يَسْأَلُ

قَلِيلٌ مَنْ يُعْطِي

يُطِيلُونَ فِيهِ الْخُطْبَةَ

وَيَقْصُرُونَ الصَّلاَةَ..)[1].

واتە: تۆ لەسەردەمێکی مرۆڤی تێگەیشتوو زۆرە، قورئان خوێن کەمە، سنورەکانی خوای گەورە دەپارێزرێن، بەڵام پیتەکانی بە هەدەر دەڕوات، ئەوانەی پرسیار دەکەن تەنها کەمێکن، ئەوانەی دەیبەخشن زۆرن، نوێژی درێژ دەکەن، وتاری کورت دەدەن، بە دوای کردەوە دەکەون و واز لە ئارەزوو دەهێنن، بەڵام ڕۆژێك دادێت خەڵکی تێگەیشتوو و زانا کەم دەبێت و قورئان خوێن زۆر دەبێت، پیتەکانی قورئان لەبەر دەکەن بەڵام سنورەکانی دەبەزێنرێت، زۆریان پرسیار دەکەن، کەمن ئەوانەی دەیبەخشن، وتاری هەینی درێژ دەکەن نوێژی کورت دەکەن..

لە ریوایەتێکی تر عەبدوڵلای کوری مەسعود (ﷺ) دەڵێت:

(سَيَأْتِي عَلَيْكُمْ زَمَانٌ كَثِيرٌ خُطَبَاؤُهُ

قَلِيلٌ عُلَمَاؤُهُ

يُطِيلُونَ الْخُطْبَةَ

وَيُؤَخِّرُونَ الصَّلَاةَ حَتَّى يُقَالَ هَذَا شَرَقُ الْمَوْتَى

فَمَنْ أَدْرَكَ ذَلِكَ فَلْيُصَلِّهَا لِوَقْتِهَا فَإِنِ احْتَبَسَ فَلْيُصَلِّ مَعَهُمْ وَيَجْعَلْ صَلَاتَهُ وَحْدَهُ الْفَرِيضَةَ وَصَلَاتَهُ مَعَهُمْ تَطَوُّعًا)[2].

---

(١) صحيح: أخرجه مالك (١/ ١٧٣)، والبخاري في (الأدب المفرد) برقم: (٧٩٠)، والطبراني في الكبير، برقم: (٩٤٩٦) وهو موقوف، وقال الهيثمي في المجمع (٧/ ٢٨٥) ورجاله رجال الصحيح.

(٢) المعجم الكبير، للطبراني (٩/ ١١٣) برقم: (٨٥٦٧).

واتە: ڕۆژگارێك دێت وتاریێژ زۆر دەبێت و

زانایان کەم دەبن

وە نوێژەکانیان دوا دەخەن هەتا دەگوترێت ئەوە (شرق الموتی)یە

هەر کەسێك بەم کاتە گەیشت نوێژەکانتان لە کاتی خۆی بکەن و نوێژیان لەگەڵدا ببەستن، وە بە تەنیا نوێژی فەرز بکەو لەگەڵ ئەوانیش نوێژ داببەستە وەکو سوننەت.

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم سەردەمەی خۆمان ئەوەمان بۆ بەدەردەکەوێت کە خەڵکی توانای زۆری ڕاوەستانی نییە لە نوێژدا، بە تایبەتی گەنجەکانمان، ئەمەش لەبەر نەبوونی بێ تاقەتی نییە بەڵکو تەمبەڵ و سستن.

## دەرهێنانی نەوت لە ژێر زەوی

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر، دەرهێنانی نەوتێکی زۆرە لە ژێر کانگای زەوی..

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عەمر (ﷺ) دەڵێت: (تخرج معادن مختلفة)[١].

واتە: جۆرەها کانزای جیاواز دەردەهێنرێت..

پیاوێکی لە بەنی سولەیم دەڵێت: جارێکیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ستكون معادن يحضرها شرار الناس)[٢].

واتە: ڕۆژێك دێت کانزاکان دەردەهێنرێن، ئەوانەی ئامادەی دەبن و فەرمان دەردەکەن خراپترینی خەڵکین..

ئەو کانزایانەش ئەو بیرە نەوتانەن کە لەم سەردەمەدا دەردەهێنرێت و بووەتە بژێوی ژیانی مرۆڤایەتی لە بەشێکی وڵاتان..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەو کانزایانە خراپترینی خەڵکی دەریدەکەن و بە فەرمانی ئەوانیش دەبێت... ئەمەش موعجیزەیەکی ڕوونە کە ئەمریکاو سعودیەو ڕووسیا تونێلێکی زۆریان لێداوە بە مەبەستی دەرهێنانی نەوت..

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لا تقوم الساعة حتى تظهر معادن كثيرة لا يسكنها إلا أراذل الناس)[٣].

---

(١) إيضاح المحجة في الرد على صاحب طنجة، لا ٥٨ .

(٢) صحيح: رواه الإمام أحمد، وفيه راو لم يسم، وبقية رجاله رجال الصحيح. وقال الألباني في السلسلة الصحيحة برقم: (٣٦٢٥). صحيح بمجموع طرقه. وإيضاح المحجة في الرد على صاحب طنجة، لا ٥٨ و إتحاف الجماعة بما جاء في الفتن والملاحم - باب ما جاء في المعادن، لا ١٨٣.

(٣) رواه الطبراني في الأوسط وإتحاف الجماعة بما جاء في الفتن والملاحم وأشراط الساعة - باب ما

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا کانزایەکی زۆر دەردەهێنرێت..

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: ( لتظهرن معادن في آخر الزمان، يخرج إليه شرار الناس)[1].

واتە: سوێند بەخوای گەورە کانزاکان دەردەهێنرێت لە کۆتایی بونەوەر، ئەوانەی دەری دەهێنن خراپترینی خەڵکین..

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عومەر (ﷺ) دەڵێت:

جارێکیان پارچە زێرێکیان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێنا، کە یەکەمین زەکاتی کانزا بوو بۆ ئێمە نێردرا، فەرمووی: (إنها ستكون معادن، وسيكون فيها شر الخلق)[2].

واتە: لە داهاتوودا کانزا پەیدا دەبێت، خراپترینی خەڵکی دەستی بەسەر دە گرن..

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو فەرموی: ( يظهر معدن في أرض بني سليم، يقال له: فرعون وفرعان، يخرج إليه شرار الناس)[3].

واتە: کانزا دەردەکەوێت لە خاکی بەنی سولەیم، پێی دەوترێ: فیرعەون و فەرعان، خراپترینی خەڵکی دەریدەهێنن..

پێشەوا ئەبی غەتەفان دەڵێت: گوێم لە عەبدوڵلای کوری عەمری کوڕی عاص (ﷺ) بوو کە گوتویەتی: (تخرج معادن مختلفة، معدن منها قريب من الحجاز،

---

جاء في المعادن، لا ١٨٣ .

(١) رواه عبدالرزاق و إتحاف الجماعة بما جاء في الفتن والملاحم وأشراط الساعة - باب ما جاء في المعادن، لا ١٨٣ .

(٢) صحيح: رواه الطبراني في الصغير، قال الهيثمي: ورجاله رجال الصحيح، وإتحاف الجماعة بما جاء في الفتن والملاحم وأشراط الساعة - باب ما جاء في المعادن، لا ١٨٣.

(٣) صحيح: رواه أبو يعلى. قال الهيثمي: «ورجاله ثقات, إتحاف الجماعة بما جاء في الفتن والملاحم وأشراط الساعة - باب ما جاء في المعادن، لا ١٨٣ .

يأتيه من شرار الناس)[١]. واتە: کانزای جیاواز دەردەهێنرێت، کانزایەکیان نزیکە لە حیجاز، لەلایەن خراپترینی خەڵکی دەبێت..

خودای گەورە وەسفێکی جوانی دەرهێنانی هەزاران تەنە نەوت و کانزامان بۆ دەکات لە سورەتێکی قورئان کە دەفەرموێ: [إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ﴿٢﴾ وَقَالَ ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا ﴿٣﴾ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا۟ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٦﴾ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾][٢].

واتە: کاتێ کە زەوی بە توندی تەکانیداو کەوتە لەرزە لەرزو جوڵە جوڵ بە هەر هۆیەکەوە بێت[٣]، وە زەوی هەرچی باری گران و قورسی هەبوو، فڕێی دایە دەرەوە، وەکو مردووان و نەوت و ئاو و خەزنە و هەزاران هەزار شتی تر، ئەو کاتە مرۆڤی بێباوەڕ دەڵێت: زەوی چیەتی و بۆ وا دەکات، لەو ڕۆژەدا زەوی هەواڵەکانی خۆی چاك و خراپ ڕادەگەیەنێت، ئینجا مرۆڤ تێ دەگات کە ئەو زەمین لەرزەیە سەرەتای ڕۆژێکی سەخت و وێرانبونی دونیایە، ئەویش بە هۆی ئەوەوە کە پەروەردگارت وەحی و فەرمانی پێکردووە، لەو ڕۆژەدا خەڵکی بە پەرش و بڵاوی لە گۆڕەکانیان دەردەچن بۆ شوێنی حیساب، بۆ ئەوەی پاداشت و تۆڵەی کارو کردەوەکانیان نیشان بدرێت، ئینجا هەر کەسێك کێش وردیلەیەك چاکەی ئەنجام دابێت، پاداشتەکەی دەبینێتەوە، وە هەر کەسێکیش کێشی وردیلەیەك شەڕو خراپەی کردبێت تۆڵەکەی دەبینێتەوە.

سورەتی (الزلزلة) بە چەشنێکی گومان بڕ، ڕوونی دەکاتەوە کە گۆی زەوی لە جموجووڵ و بومەلەرزەو تەنانەت لەرینەوە ناوبەناوەکانیشیدا، لە ژێر وەحی و

---

(١) المستدرك على الصحيحين (١/ ٣٢٠). قال الحاكم: هذا حديث صحيح الاسناد.

(٢) سورة الزلزلة، (١ ٨).

(٣) ئیبنو عەباس (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەفەرموێ: ئەوە لە نەفخەی یەکەم دایە بە جۆرە لەرزەیەکی وایە کە شایستەی ئەو بێت، جا ئەو حاڵەتە ئەبێ چ ڕووداوێکی گەورە بێت.

بەرگی دووەم

فەرمانی خوای گەورەدایە، ئەگەر توێکڵی زەوی ڕەق نەبوایە، ئەوا هەمیشە زەوی لە جوڵان و بەرزبوونەوەو دابەزیندا دەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك شوێن لە بەردەکانی توێکڵی زەویدا هەیە، باش یەکتریان نەگرتووەو لەو شوێنانەدا خاڵی لاواز هەیە، بە درێژایی خاڵە لاوازو شکانەکە فشاندنێکی زۆر گەورەو بەهێز دروست دەبێت، کە زەوی لەرزەی لێ دەکەوێتەوە.

لە ڕووی قەبارەوە دوو وەسف هەیە بۆ زەوی لەرزە:

**یەکەم:** هێزی خودی بومەلەرزەکەیە .

**دووەم:** ئەو زیانەی لێی دەکەوێتەوە، هەر چەند کوشتنی مرۆڤ و وێرانبوونی ماڵ و سامان، لە پێوەرە هونەریەکان زیاتر کار لە خەڵکی دەکات، بەڵام بومەلەرزەی گەورە ئەوەیە کە زۆرترین خەڵك لەناو ببات.



## خاڵی ئیعجاز لەم ئایەتە قورئانیە:

لە (٢٠٠٠/٦/٢) کەناڵی (النيل الثقافية) بەرنامەی (رأيت الله)ی پرۆفیسۆر عبدالباسط محمد السيد لە (مركز الدراسات والبحوث العلمية) کە دکتۆرای هەیە لە جیۆلۆجیدا (٣) شتی باس کرد دوانیان بیستومانە، بەڵام یەکێکیان بۆمان نوێ بوو کە باسی کرد کەوا لە نێوان گڕکان و بومەلەرزەدا پەیوەندیەك هەیە ئەمە بیستوومانەو زانست سەلماندویەتی و دەرکەوتووە، هەروەها ئاژانسی ناسای (ئاسمانی) ئەمریکی پەیوەندی کردووە لەگەڵ ئەم سەنتەرە زانستیەدا لە میصر (قاهیرە) پێی گوتوون: دوا بوومەلەرزە کە داویەتی لە مەدینەی پیرۆز بوتە هۆی ئەوەی مەدینە دووربخاتەوە لە بازنەی ئەگەری بوومەلەرزە.. ئەمەش بەهۆی کۆتایی بوومەلەرزەوە جولەیەك ڕوویداوە لە ژێر زەویدا، چینەکانی زەوی گۆڕانکاری بەسەردا هاتووەو بووەتە هۆی ئەوەی کە مەدینە بچێتە دەرەوەی ئەو فیلدە، ئەمەش وەك هەواڵێك لە ساڵی (١٩٩٩) ع بە (مركز الدراسات والبحوث العلمية) لە قاهیرە دراوە، دەستەی زانستی ئیعجازیش وەڵامی داونەتەوە کە ئێمە پێش ئێوە ئەوە دەزانین، ئەوانیش گوتیان: چۆن؟ گوتیان: ئەو بوومەلەرزەی کە ئێوە باسی دەکەن لە سەردەمی عومەری کوری خەتاب(ﷺ)

بووە... ئەمەش لە ساڵی (٢٠) کۆچی بوو کە بەیەکەم بومەلەرزە دادەنرێت لەسەردەمی زێڕینی ئیسلام.

هەندێك لە زانایان دەفەرموون: لە کەراماتەکانی پێشەوا عومەر (ئاو هەوا خۆڵ ئاگر)ە.

لەم ئایەتەی سەرەوە خوای گەورە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە ڕۆژی دوایی (قیامەت) بە بوومەلەرزە گەورەکە دەست پێ دەکات، کە بەهۆیەوە جیهان کۆتایی پێ دێت، ئەوەی لێرەدا شایەنی باسە نهێنیە شاراوەو نەزانراوەکانی کاتی هەردوو ڕووداوی هاتنی ڕۆژی دوایی و ڕوودانی بوومەلەرزەیە، هەروەکو چۆن کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی جگە لە خوا هیچ مرۆڤێك نایزانێت و ناشتوانێت بیزانێت، بە هەمان شێوە زانست بە هیچ شێوەیەك ناتوانێت کاتی ڕوودانی بوومەلەرزە دیاری بکات و بیزانێت، بەڵکو ئەو زانیاریانەی کە دەربارەی هەردوو ڕووداوەکە دەزانرێت، تەنها نیشانەکانی ڕووداوەکەیەو هیچی تر، واتە ناتوانرێت کاتی ڕووداوەکە بزانرێت، هەروەکو ناشتوانرێت ڕێگە لە ڕووداوەکە بگیرێت، زانای بەناوبانگی جیۆلۆجی د.زەغلول نەجار دەڵێت: ڕەنگە بتوانرێت بەبەکارهێنانی ئامێری زۆر هەستیاری بوومەلەرزە، پێشبینی ڕوودانی بوومەلەرزە بکرێت (واتە نیشانەکانی بزانرێت) ئەویش بە چاودێریەکی زۆر وردی ئەو دەنگانەی کە پەیدا دەبن، ئەمەش زیاتر لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی وەکو ئەمریکاو یابان، یا زانینی نیشانەی تری وەکو گۆڕانی تۆپۆگرافی ناوچەکە، یان زیادبوونی لاری چینەکان و دروست بوونی درز لەسەر زەوی، یان گۆڕانی ئاستی ئاوی بیرەکان و دەریاچەکان، یاخود دەرچوونی گاز وەکو گازی رادیۆم و زیاد بوونی گازی کانەکان و کۆچ کردنی کتوپڕی گیانلەبەران، بەڵام مرۆڤ بە هیچ شێوەیەك نەیتوانیوەو ناشتوانێت پێشبینیەکی ڕاست و ڕەوانی کاتی ڕوودانی بوومەلەرزە بکات، هەروەها ناشتوانێت ڕوو بەڕووی ئەو کارەساتانەیش بێتەوە، پرۆفیسۆری جیۆلۆجی (Roger Bilham) مامۆستای زانکۆی (Colorodo) دەڵێت: (ناتوانرێت بەهیچ شێوەیەك کاتی ڕوودانی بوومەلەرزە بزانرێت، بەڵکو ئەو زانیاریەی دەست مرۆڤ دەکەوێت، تەنها هۆکاری ڕوودانی بوومەلەرزەکەیە.

بەرگی دووەم

## باوەڕهێنان بە ئەستێرە ناسەکان و زۆربوونی جادووگەری

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی جادووگەری زۆر دەبێت.

پێشەوا ئەنەسی کوری مالیك (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي بَعْدِي خَمْسًا: تَكْذِيبٌ بِالْقَدَرِ، وَتَصْدِيقٌ بِالنُّجُومِ)[1].

واتە: لەدوای خۆم لە ئوممەتەم دەترسم لە پێنج شت لەوانە خەڵکی قەدەر بە درۆ دەخەنەوە، پاشان باوەڕ بە ئەستێرە ناسەکان دەکەن.

بەڵێ.. بەشی زۆری خەڵکی ئەمڕۆ هەتا بەخت گرتنەوەو جادووگەری و قاوە خوێندنەوەو بورج گرتنەوە هەبێ باوەڕ بە قەزاو قەدەری خوایی ناکەن.

پێشەکی پێم باش بوو چەند ڕوونکردنەوەیەك بخەمە بەردەستان سەبارەت بە جادووکردن و باوەڕهێنان بە ئەستێرە ناسەکان.

### پێناسەی جادووکردن:

جادووکردن: بریتیە لە کوفرو یەکێکە لە حەوت گوناهە گەورە کوشندەکان، وە بریتیە لە زەرەرمەندی و هیچ سودێك نابەخشێ.

حوکمی جادووگەر کوشتنەو کارەکەشی حەڕام و پیسە، تێنەگەیشتوەکان و باوەڕ کەمەکان دەچن بۆ جادووکردن بۆ ئەوەی جادوویان بۆ بکرێت دژی خەڵکی بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆی لە خەڵك بستێنێتەوە بە جادووکردن، هەروەها ئەوەی ئەستێرە گەرەوەن قسە لە شتی نادیار دەکەن ئەمەشیان کافرە وەکو جادووگەرەکە،

---

(١) ضعيف: مسند أبي يعلى (٧/ ١٦٢) برقم: (٤١٣٥) وقال: إسناده ضعيف.

ئەگەر داوای ئەوە بکەن کە شتی غەیب دەزانن، بۆیە کەس شتی غەیب و نادیار نازانێت تەنها خودا نەبێت.

زۆر جار ئەم ئەستێرە گرەوانە بە بەکارهێنانی فرِوفێڵ دەتوانن ماڵی خەڵکی بۆ خۆیان ڕابکێشن وەك نەخشەکردنی سەر لم یان هەڵواسینی حاجیلەو خوێندنەوەی دەست یان قاوەگرتنەوە یان بەکارهێنانی تۆپێکی شوشەو ئاوێنە بۆ ئەوەی نیازی خەڵکی پێ بزانن، ئەگەر جارێك ڕاست بکەن ئەوا لە (٩٩٪) درۆ دەکەن، بەڵام بێ ئاگاو تێنەگیشتووەکان بەس باسی ئەو جارە دەکەن کە ڕاستیان کردووە، وە باسی ئەو جارانە ناکەن کە درۆیان کردووە، بۆیە کۆمەڵێك درۆزن دەچن بۆ لای ئەو کەسانە بۆ زانینی داهاتوویان یان بۆ زانینی بەختەوەری یان کۆسپ و ناخۆشی دێتە ڕێیان لە ژن هێنان، یان گەڕان بە دوای شتێك کە وون بووە لێیان، یان جۆرەها شتی تر، وە حوکمی ئەو کەسەی کە دەچێتە لای ئەم جادووگەرانە ئەگەر بڕوای وابێت کە ئەوەی دەیکەن ڕاستە ئەو کەسە کافر دەبێت و دەردەچێت لە کۆمەڵی موسڵمانان، بەڵگەشمان ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەرە(ﷺ) کە دەفەرموێ:

(مَنْ أَتَى كَاهِنًا أَوْ عَرَّافًا فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ))[1].

واتە: هەر کەسێك بچێت بۆ لای فاڵچیەك یان بچێت بۆ لای ئەو کەسانەی قسە لە غەیب دەکەن و بە ڕاستی بزانێت بەوەی کە دەیڵێت ئەوا بێباوەڕ دەبن بەوەی کە هاتۆتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ).

بەڵام ئەگەر بچێتە لایان و باوەڕی بەوە نەبێت کە ئەوان غەیب دەزانن بۆ ئەوە بچێتە لایان تاکو تاقیان بکاتەوە بزانێ ڕاستی و درۆی چەندە ئەوا ئەو کەسە کافر نابێت، بەڵام نوێژی (٤٠) ڕۆژی دروست نابێت، بەڵگەشمان لەسەر ئەمە ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەرە(ﷺ) کە دەفەرموێ:

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٢/ ٤٢٩) برقم: (٩٥٣٢) وقال الشيخ شعيب الأرنؤوط: حسن رجاله ثقات رجال الصحيح.

بەرگی دووەم

(مَنْ أَتَى عَرَّافًا فَسَأَلَهُ عَنْ شَيْءٍ، لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً)[1].

واتە: هەر كەسێك بچێتە لای ئەو كەسانەی كە قسە لە شتی غەیب دەكەن، وە پرسیاری لێ بكات بۆ شتی نادیار ئەو كەسە نوێژی (٤٠) شەوی لێ وەرنا گیرێت لە لای خوای پەروەردگار .

پێشەوا زەیدی كوڕی خالیدی جوهنی (ﷺ) دەڵێت:

ڕۆژێكیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە حودەیبیە نوێژی بەیانی بۆ كردین، ئینجا هاتە لای خەڵكەكەو فەرمووی: ئایا دەزانن پەروەردگارتان چی فەرمووی؟

ئێمەش گوتمان: خوداو پێغەمبەرەكەی دەزانن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: زۆر لە بەندەكان وایان لێدێت موسڵمان دەبن بە من، وە زۆری تریان بێباوەر دەبن بە من، هەر كەسێك بڵێت باران بارین لەلای خوای گەورەوەیە خوای گەورە دەتوانێت بیبارێنێ، ئەوا ئەو كەسە باوەڕدارە بە من، وەبێ باوەڕە بە ئەستێرەكان، وە هەر كەسێ باوەڕی وابێت ئەو شتانە بە هۆی ڕووداوی ترەوە بۆ بدۆزێتەوە ئەو كەسە بێ باوەڕە بە من و باوەڕدارە بە ئەستێرەكان، یان كەسانێك هەن پەنا دەبەنە بەر ئەستێرەكانی بەخت وەك لە ڕۆژنامەو گۆڤارەكاندا بڵاو دەكرێنەوە

هەر كەسێك باوەڕی پێ هەبێت ئەوا لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەردەچێت، بەڵام ئەوەی كە دەیخوێنێتەوە بۆ كات بەسەر بردن ئەوا پێی گوناهبار دەبێت، لەبەر ئەوە دروست نیە كاتی خۆت بەسەر ببەی بە خوێندنەوەی شتێك كە گومڕایی و سەرلێشێواویە، لەگەڵ ئەوەش شەیتان دەیخاتە دڵتەوە كە باوەڕت پێی هەبێت[2].

باوەڕ بون و پەنابردنیش بۆ بورجەكانی بەخت و قیسمەت كە لە گۆڤارو ڕۆژنامەو شوێنەكانی تردا بڵاودەكرێنەوە دەچێتە ئەو بازنەوە، ئەگەر باوەڕی

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ١٧٥١) برقم: تحريم الكهانه، برقم: (٢٢٣٠).

(٢) فتح الباري (٢/ ٣٣٣).

بەوە هەبێ کە تیایدایە وەکو کاریگەری ئەستێرەکان و گەردون ئەوە موشریکە، ئەگەر بۆ دڵنەوایی خۆشی بخوێنێتەوە ئەوە گوناهبارو تاوانبارە، چونکە دروست بە خوێندنەوەی شیرك دڵنەوایی خۆی بکات وێڕای ئەوەش شەیتان باوەڕی دەخاتە سەر ئەو شتانە دەبێتە هۆکارێك بۆ شیرك.

هەروەها قەناعەت هەبوون بەوەی لە چەند شتێکدا سوودو قازانج هەیە، کە خوای گەورەو بە توانا داینەناوە بە شیرك دادەنرێ، وەکو هەندێ کەس باوەڕی بە نوشتەو گشتەکی شیرکی و جۆرەها موورو و گوێچکە ماسی و ئاڵقەی کانزایی و غەیری ئەوانەش، کە جادوگەرێك یان فاڵچییەك ئاماژەی پێ کردووە یان لە باب و باپیرانەوە بۆیان بەجێ ماوە، ئینجا بە گەردەنیان دا هەڵی دەواسن یا بە ملی منداڵان هەڵدەواسن، بە گومانی خۆیان بۆ چاوزار، یان بە لاشەی خۆیانی هەڵدەواسن یان بە ئۆتۆمبێلەکانیان و ماڵیان هەڵدەواسن یا چەند ئەنگوستیلەیەك لە دەست دەکەن کە سەر ئەنگوستیلەو نقێمی جۆراو جۆری پێوەیە باوەڕیان بە چەند شتێکی دیاریکراو هەیە، کە پێی لابچێ، وەکو لابردن و هەڵگرتنی بەڵاو ناڕەحەتی، ئەوەش گومانی تێدا نییە پێچەوانەی پشت بەستنە بە خوای گەورە، مرۆڤیش بەو شتانە تەنیا ناڕەحەتی بۆ دروست دەبێت چارەسەرکردنە بە شتی حەڕام، ئەو شتانەی هەڵدەواسرێن لە زۆرێکیان شیرکی ئاشکرا هەیە و هاوارکردنە بەر جنۆکەو شەیتانی تێدایە، یا هەندێ نەخشەی ناڕوون و نوسینی گوماناوی تێدایە، هەندێ لە ساختەچیەکان هەندێ لە ئایەتەکانی قورئان دەنوسنەوەو لەگەڵ هەندێ شیرکیاتی تێکەڵ دەکەن، هەندێکیشیان ئایەتەکانی قورئان بە پیسی یان بە خوێنی حەیز دەنوسنەوە، هەڵواسین و بەستانی هەموو ئەوانەی باسمان کرد حەڕامە[1].

پاکو بێگەردی بۆ خوای گەورە کە هەموو موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم سەردەمە هاتۆتە دی.

---

(١) المحرمات استهان بها كثير من الناس، محمد بن صالح المنجد، (لا ٣٥) .

# لە کارخستنی حوکمکردن بە قورئان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر حوکمی خوای گەورە لە کار دەخرێت و حوکمی نەفامەکان بەکار دەکەوێت.

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مِنِ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ خَصْلَةً : إِذَا رَأَيْتُمُ النَّاسَ .. وَعُطِّلَتِ الْحُدُود ..)[1].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر حەفتاو دوو تایبەتمەندە: هەر خەڵکانێکتان بینی.. حوکمی خوای گەورەیان لە کارخست.

لە نیشانەکانی نزیکبونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی پشت کردنە لە بەرنامەو شەرعی خوای گەورە، بۆیە پێویستە بەرنامەو شەرعی خوا جێبەجێ بکرێت و حوکم و دەسەڵاتی خوا بێتەوە مەیدان و تەنها هەر شەرعی خوا پەیڕەو بکرێت، حوکم کردن بە شەرعی خوا بابەتێکە لە بابەتەکانی بیروباوەڕو بەشێکە لە بەشەکانی باوەڕبوون بەخوا، لەبەر ئەوەیە کە مرۆڤی بڕوادار بڕوای وایە کەوا تەنها کردنی خوای پەروەردگار بەوە کە تەنها هەر ئەو مافی حوکم کردن و یاسادانانی هەیەو بەس.

پێشەوا ئەبو ئومامەی باهیلی (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (لَتُنْتَقَضَنَّ عُرَى الْإِسْلَامِ عُرْوَةً عُرْوَةً، فَكُلَّمَا انْتُقِضَتْ عُرْوَةٌ، تَشَبَّثَ النَّاسُ بِالَّتِي تَلِيهَا، فَأَوَّلُهُنَّ نَقْضًا: الْحُكْمُ، وَآخِرُهُنَّ: الصلاة)[2].

---

(١) ضعيف: حلية الأولياء، لأبي نعيم (٣/ ٤١٠)، برقم: (٤٥٥٥). حديث مرفوع، غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ ، لَمْ يَرْوِهِ عَنْهُ فِيمَا أَعْلَمُ إلا فَرَجُ بْنُ فَضَالَةَ . وهو ضعيف كما قال الحافظ العراقي ( ٢٩٧/٣).

(٢) صحيح ابن حبان (١١١/١٥) برقم: (٦٧١٥) إسناده قوي، أورده الهيثمي في (المجمع) (٢٨١/٧) ونسبه إلى أحمد والطبراني، وقال: رجالهما رجال الصحيح.

واتە: قوڵفەکانی خێمەی ئیسلامەتی یەك یەك دەپچڕێت، هەر کاتێك یەکێکیان پچڕا خەڵکی دەست بەویتریانەوە دەگرێ، یەکەمینیان حوکمەو دواهەمینیان نوێژە..

لەم فەرمودەیە پێغەمبەر(ﷺ) باسی دوو شتی گرنگی کردووە:

١- حوکم کردن بە شەرعی خوا.

٢- نوێژ کردن.

حوکم کردن بە شەرعی خواو نوێژکردن هەردوکیان وەکو یەك لە ئاینی ئیسلامدا ئاشکراو بەڵگە نەویستن، هەردوکیشیان فەرزو واجبن، وەك چۆن نوێژکردن فەرزەو واجبە بەهەمان شێوە حوکمکردنیش بە شەرعی خوا فەرزو واجبە، بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمانان پێیانەوە هەڵبەستن و پیادەیان بکەن، هەموو زانایانی ئیسلام یەکدەنگن لەسەر ئەوە کە حوکم کردن بە شەرعی خواو نوێژکردن لە ئایندا یەکسانن و جیاوازییان نیە لە پیادەکردندا، چونکە لەو کاتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) بوو بە سەرکردەی موسڵمانان لە مەدینەدا چۆن نوێژی پێدەکردن بەهەمان شێوەش حوکم و یاسای شەرعی خوا ئیشی کردو میللەت و وڵاتی بەشێوەی سیاسەتی ئاینی خوا بەڕێوە برد، هەتا موسڵمانان گەیشتنە ئەو بیروباوەڕە کە ئەگەر هەر کەس بە حوکم و یاسای خوایی کارنەکات و هەڵسوکەوت نەکات ئەوە ئەو کەسە بەشی بە ئایینەوە نامێنێ، خوای گەورە دەفەرموێ: [ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ][1].

هەتا ئەو خەڵکە تۆ نەکەن بە حەکەم ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە ئەو خەڵکە هەر بڕوادار نین، لەبەر ئەوە حوکم کردن بە شەرعی خوا بوو بە بەشێکی سەرەکی لە بڕوای موسڵماناندا وەکو نوێژکردن.

---

(١) سورة النساء، الآية: (٦٥).

پێشەوا عەبدوڵڵای کوری عومەر (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَأْخُذَ اللَّهُ شَرِيطَتَهُ مِنْ أَهْلِ الْأَرْضِ، فَيَبْقَى فِيهَا عَجَاجَةٌ، لَا يَعْرِفُونَ مَعْرُوفا، وَلَا يُنْكِرُونَ مُنْكَرًا)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت تا خوای گەورە پیاو چاکانی سەر زەوی دەباتەوە بۆ لای خۆی، ئیتر تێکەڵەیەك دەمێنێتەوە نە چاکیان پێ چاکەو نە خراپیان پێ خراپە.

خوای گەورە دەفەرموێ: [ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّۚ أَلَا لَهُ ٱلْحُكْمُ وَهُوَ أَسْرَعُ ٱلْحَٰسِبِينَ ﴿٦٢﴾].

یەکێك لە دیاردە گەورەکانی هاوبەش پەیدا کردن ئەوەیە کە ئینسان بڕوای وابێت کەوا غەیری خوداش بۆی هەیە یاسادانەر بێت هەرچەندەش حوکمی بۆ لانەبا چونکە ئەمە شیرك و هاوبەش پەیداکردنە لە پەروەردگاریەتی خوا، وەپەنابردن بۆ حوکم کردن لەو پەرستنانەیە کە دەبێت تەنها بۆ خوا بکرێت و یەکێکە لە یەکتایی خوا.

خوای گەورە دەفەرموێ: [سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحْتِۚ فَإِن جَآءُوكَ فَٱحْكُم بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْۖ وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْـًٔاۖ وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٤٢﴾].

پێشەوا شافعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە بارەی ئەم ئایەتەوە دەفەرموێ: مەبەست بە وشەی (بِٱلْقِسْطِ) ئەو حوکم و شەریعەتەیە کە خوای گەورە بۆ سەر پێغەمبەرەکەی ناردوە.

هەروەها دەفەرموێ: [أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾][2].

---

(١) صحيح: رواه أحمد في (المسند) (٢/٢١٠) وقال الشيخ أحمد شاكر : إسناده صحيح ، والحاكم في المستدرك (٤/٤٨١) وقال الحاكم : هذا حديث صحيح على شرط الشيخين إن كان الحسن سمعه من عبدالله بن عمرو ، ووافقه الذهبي .

(٢) سورة المائدة، الآية: (٥٠).

ئەوە حوکم و یاسای نەزانی و سەردەمی نەفامیان گەرەکە؟ دەبێ حوکم و یاسای کێ لە حوکم و یاسای خوای پەروەردگار جوانترو چاکتر بێت؟!

پێشەوا سەید قوطب (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: نەفامی-جاهیلیە- هەر نەفامیە لەهەر کاتێکدا بێت، نەفامی چ هەواو ئارەزوی تاك بێت، یان کۆمەڵێك و نەتەوەیەك بێت، مادام بۆ شەریعەت و بەرنامەی خوا نەگەڕێتەوە هەمووی هەواو ئارەزووەو پەیوەندی بە شەرعی خواوە نیە، ئەمانەو بەسەدان ئایەتی تر لەمباریەوە هەیە دەلالەت لەوە دەکەن: هەر کەس و هەر گەل و نەتەوەو میللەتێك کە بە شەریعەت و بەرنامەکەی خوا ڕەفتار نەکات و ئیشی پێ نەکات ئەوە لە کوفرو گومڕاییو نەفامیەتیەوە نزیکترەو بەشی بەخواوە نیە، هەر چەندە نوێژیش بکات و ئیدیعای ئیسلامەتی بکات مادام شەریعەت و بەرنامەی خوا پەیڕەو نەکات و پێی ڕازی نەبێت ئەوە لای کەمەکەی دەبێتە دوو ڕوو.

بە یەکدەنگی هەموو ئوممەتی ئیسلام دامەزرا لەسەر ئەوە کە واجبە حوکم کردن بە شەریعەتی ئیسلامی، هەروەکو چۆن یەکدەنگی ئوممەتی ئیسلامی دامەزرا لەسەر ئەوە کە واجبە جەنگ بکرێت لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە لەشەریعەتی ئیسلامی دەردەچن و سەرپێچی دەکەن و هەر جۆرە کەسێك بێت، پێشەوا ئیبنو تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: موسڵمانان یەکدەنگن لەسەر ئەوە کە هەر کەسێك بەشێك لە بەشەکانی شەریعەتی ئیسلام تەرك بکات و حوکمی پێ نەکات ئەوە جەنگ لەگەڵ کردنی فەرزو واجبە، ئەی دەبێ موسڵمانانی ئەمڕۆ لەگەڵ ئەو کەسانەدا بڵێن چی کە هەموو بەشەکانی شەریعەتی ئیسلامیان وازلێهێناوەو پشتگوێیان خستووە؟

ئەگەر پێشەواو دەسەڵاتداران بە فەرمانی خوا حوکم نەکەن و بە ئارەزووی خۆیان قورئان هەڵبژێرن و بڕوایان بە هەندێکیان هەبێت و بە هەندێکی تر نەبێت ئەوا خوای گەورە جەنگ و دوژمنایەتی دەخاتە نێو خۆیانەوەو وایان لێ دێت بەزەییان بە یەکدا نەیەتەوەو تاوانەکان دەدەن بەسەر یەکتردا و یەکتری داگیر دەکەن.

بەرگی دووەم

# مانگی عەرەبی کەم دەکات

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی مانگ بە زۆری کەم دەکات..

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (من اقتراب الساعة.. نقضت الشهور)[1].

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بوونەوەر.. مانگ بە زۆری کەم دەکات..

ئەگەر سەیری ڕووداوەکانی ژیان و واقیعی ئێستا بکەین ئەوەمان بۆ بەدەردەکەوێت کە مانگی عەرەبی بە زۆری کەم دەکات، زۆربەی ٢٩ یەو ٣٠ پڕ نابێت..

هەندێکیش پێی دەڵێن: ڕۆژژمێری کۆچی کە بەشێکە لە ڕۆژژمێری ئیسلامی ئەویش ڕۆژژمێری (قەمەری)یە، بە گشتی بە ڕۆژمێری کۆچی ناسراوە، پشت بە خولی مانگ دەبەستێت بۆ دیاریکردنی مانگەکان، وە موسڵمانان لە هەموو شوێنێك بەکاری دەهێنن بۆ دیاری کردی مانگی ڕەمەزان و جەژن و حەج و .. هتد.

وڵاتی سعودیە تاکە دەوڵەتە لە جیهاندا کە ئەم ڕۆژژمێرە بە فەرمی بەکار دەهێنێت، هەروەها لەسەر ئاستی خەڵکیدا بەهەمان شێوە ناسراوە و بەکاردەهێنرێت.

ڕۆژژمێری کۆچی لە دوانزە مانگ (خولی مانگ) پێك دێت و، یان ساڵی کۆچی دەکاتە نزیکەی ٣٥٤ ڕۆژ، بە تەواوەتی (٣٥٤,٣٦٧٠٥٦ ڕۆژ)، و مانگ لە ڕۆژژمێری کۆچیدا ٢٩ یان ٣٠ ڕۆژە (لەبەر ئەوەی خولی مانگانە دەکاتە (٢٩,٣٦٧٠٥٦ ڕۆژ)، و بەمەش ١١,٢ ڕۆژ جیاوازی هەیە لەگەڵ ڕۆژژمێری عیساییدا، و هاوکات نەبوونی ئەم دوو ڕۆژژمێرە، ئاڵوگۆڕی لە نێوانیاندا قورسە، بەڵام لە پێ هاتنی ڕۆژی دوایی مانگی عەرەبی یان

---

(١) أخرجه أبو داود كتاب المهدي باب أول المهدي برقم (٤٢٩٠) وهو منقطع، وكنز العمال (٥٧٣/١٤) برقم: (٣٩٦٣٩).

کۆچی کەم دەکات و بە یەکێك لە موعجیزەکان هەژمار دەکرێت کە لەم سەردەمە بە چاوی خۆمان ئەم نیشانەیە بەدی دەکەین.

## پەیدابوونی هاوبەش پەرستی لە ئوممەتی ئیسلام

یەکێك لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی پەیدابوونی چەند کەسانێکن کە هاوبەش بۆ خوای پەروەردگار بڕیار دەدەن، وە هاوبەش دانان لەم ئوممەتەدا هاتۆتە دی، تەنانەت چەند هۆزێك لێیەوە بوون بە هاوبەش دانەرو پەیکەریان پەرست و پەرستگایان دانا لەسەر گۆڕەکان و جگە لە خوای گەورەیان پەرست و ڕووی نیازیان تێکردن بۆ تەبەڕوك و بە پیرۆز زانین و ماچ کردنی کێل و بە گەورە زانینیان.

پێشەوا ثەوبان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَلْحَقَ قَبَائِلُ مِنْ أُمَّتِي بِالْمُشْرِكِينَ، وَحَتَّى يَعْبُدُوا الأَوْثَانَ)[1].

واتە: کۆتایی بوونەوەر نایەت تاکو چەند هۆزێك لە ئوممەتی من دەگەن بە هاوبەش پەرستان و کافر دەبن، وە تاکو چەند هۆزێك بت دەپەرستن.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَضْطَرِبَ أَلْيَاتُ نِسَاءِ دَوْسٍ حَوْلَ ذِي الْخَلَصَةِ..)[2].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا کەفەڵی ژنانی دەوس بە دەوری (ذوالخليصە) دا هەڵتەك هەڵتەك دەکا.

---

(١) صحيح: سنن الترمذي، باب: ما جاء لا تقوم الساعة حتى يخرج، (٤/ ٦٩) برقم: (٢٢١٩). وقال الإمام الترمذي: هذا حديث صحيح.

(٢) صحيح مسلم، (٤/ ٢٢٣٠) كتاب: الفتن، باب: لا تقوم الساعة حتى تعبد دوس ذا الخلصة، برقم: (٢٩٠٦).

(ذی الخلیصە): ئەو بتەیە کە خێڵی دەوس لەکاتی جاهیلیەتدا دەیانپەرست، خۆی لە ئەسڵدا حاکم بوو بەڵام کە کۆچی دوایی کرد هەستان پەیکەرێکیان بۆ تاشی و پەرستیان[١].

بێگومان چۆن پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پێدابوو هاتە دی، لەبەر ئەوەی هۆزی دەوس و ئەوەی لە دەوری دایە لە عەرەب ماڵ وێران بوون بە هۆی (ذوالخلیصە) کاتێك کە نەزانین بۆ شارەکەیان گەڕایەوە، جا گەڕانەوە سەر کاری پێشویان و کردیانە هاوبەشی خوای گەورە، تا دوایی موحەممەدی کوڕی عبدالوهاب هەڵسا بە بانگەوازی بۆ یەکتاپەرستی و گەڕانەوەی تێگەیشتووە لە بیرچووەکان، وە ئیسلامێکی دروستی گەڕاندەوە دوورگەی عەرەب، جا عەبدوالعزیزی کوری محەممەدی کوڕی سعود هەڵسا بە ڕەوانەکردنی کۆمەڵێك بانگخواز بۆ خەڵکی (ذوالخلیصە)، جا ئەم خانووە پڕ بوو لە بت و هەستان وێرانیان کردو نەیانهێشت، کاتێك دەسەڵاتی ئال سعود کۆتایی هات بەسەر حیجازدا نەزانەکان هەستان بە نۆژەنکردنەوەی، کاتێك عەبدوالعەزیزی کوڕی عەبدوالرحمانی ئال سعود دەسەڵاتی گرتە دەست فەرمانی کرد بە سەربازەکانی و کۆمەڵێکی نارد لە سوپاکەی جا وێرانیان کردەوە بە یەکجاری شوێنەواریان لابرد[٢].

دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (لَا يَذْهَبُ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ حَتَّى تُعْبَدَ اللَّاتُ وَالْعُزَّى) [٣].

واتە: شەو و ڕۆژ کۆتاییان نایەت هەتا جارێکی تر (لات و عوزا) دەپەرسترێتەوە) دەڵێت: منیش گوتم: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) من وام دەزانی کە خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: [هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ] . واتە: (خوا خۆی پێغەمبەرەکەی ناردوە بە ڕێنمایی و ئایینی ڕاست، بۆ ئەوەی

(١) علامات الساعة الصغرى والكبرى، لا ٦٥ .

(٢) إتحاف الجماعة (١/ ٥٢٢ ٥٢٣).

(٣) صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب لا تقوم الساعة حتى تعبد دوس ذا الخلصة، (٤/٢٢٣٠)، برقم: (٢٩٠٦).

بەسەر هەموو ئاینەکاندا سەری بخات هەر چەندە بێباوەڕەکانیش پێیان ناخۆش بێت) وام دەزانی ئیتر ئەوە تەواوە.

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (إِنَّهُ سَيَكُونُ مِنْ ذَلِكَ مَا شَاءَ اللهُ، ثُمَّ يَبْعَثُ اللهُ رِيحًا طَيِّبَةً، فَتَوَفَّى كُلَّ مَنْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ، فَيَبْقَى مَنْ لَا خَيْرَ فِيهِ، فَيَرْجِعُونَ إِلَى دِينِ آبَائِهِمْ)[1].

واتە: ئەوە وا دەبێت تا ئەو کاتەی کە خوای گەورە دەیەوێت، لە پاشان خوای گەورە بایەکی پاکو خۆش دەنێرێت، هەر کەسێك بە قەد تۆزقاڵێك دەنکە خەرتەلەیەك باوەڕ لە دڵیدا هەبێت ڕۆحی دەکێشێت، ئیتر تەنها ئەوانە دەمێننەوە کە خێریان تێدا نیە، ئەوانیش دەگەڕێنەوە بۆ ئایینی باب و باپیرانیان.

پاڵپشتێکی تریش هەیە لە فەرمودەی نەواسی کوری سەمعان(ﷺ) دەربارەی دەجال و یەئجوج و مەئجوج لە کۆتاییەکەیدا دەفەرموێ: (فَبَيْنَا هُمْ عَلَى ذَلِكَ إِذْ بَعَثَ اللَّهُ رِيحًا طَيِّبَةً تَأْخُذُ تَحْتَ آبَاطِهِمْ , فَتَقْبِضُ رَوْحَ كُلِّ مُسْلِمٍ، أَوْ قَالَ مُؤْمِنٍ، فَتَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ يَتَهَارَجُونَ تَهَارُجَ الْحُمُرِ وَعَلَيْهِمْ تَقُومُ السَّاعَةُ)[2].

واتە: کاتێك لەو بارەی دان خوای گەورە سروە بایەك دەنێرێ و بەبن هەنگڵیان ڕەت دەبێ و گیانی هەر بڕوادارو موسڵمانێك دەکێشێ و تەنیا بەدکارترینی خەڵکی دەمێنن، وەکو گوێدرێژ لە نێوەندی ڕێگادا سواری یەك دەبن، جا ڕۆژی دوایی لەسەر ئەوان هەڵدەستێ.

لە فەرموودەیەکی تر دەفەرموێ: (فَيَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ فِي خِفَّةِ الطَّيْرِ وَأَحْلَامِ السِّبَاعِ، لَا يَعْرِفُونَ مَعْرُوفًا وَلَا يُنْكِرُونَ مُنْكَرًا، فَيَتَمَثَّلُ لَهُمُ الشَّيْطَانُ، فَيَقُولُ: أَلَا تَسْتَجِيبُونَ؟ فَيَقُولُونَ: فَمَا تَأْمُرُنَا؟ فَيَأْمُرُهُمْ بِعِبَادَةِ الْأَوْثَانِ، وَهُمْ فِي ذَلِكَ دَارٌّ رِزْقُهُمْ، حَسَنٌ عَيْشُهُمْ، ثُمَّ يُنْفَخُ فِي الصُّورِ..)[3].

---

(١) صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب لا تقوم الساعة حتى تعبد دوس ذا الخلصة، (٢٢٣٠/٤)، برقم: (٢٩٠٦).

(٢) مسند الشاميين، للطبراني (١/ ٣٥٤) برقم: (٦١٤).

(٣) صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب خروج الدجال، (٢٢٥٨/٤)، برقم: (٢٩٤٠).

واتە: جا خراپترینی خەڵکی لە سوکی باڵندەو خەونی دڕندەدا دەمێنن، نە چاکەیەك ئەنجام دەدەن و نە ڕێ لە خراپەیەك دەگرن، ئینجا شەیتان خۆیان بۆ ڕادەنوێنێ و دەڵێ: ئەی وەڵامی من نادەنەوە؟ دەڵێن: چ فەرمانێکمان پێ دەدەی؟ جا فەرمانی بتپەرستیان پێ دەدا لەگەڵ ئەوەشدا بژێوییان دەگەڕێ و ژیانیان چاکە، پاشان فوو بە شەیپوردا دەکرێ..

پێشەوا قەیسی کوری میرداس (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (يذْهَبُ الصَّالِحُونَ الْأَوَّلُ فَالْأَوَّلُ وَتَبْقَى حُثَالَةٌ كَحُثَالَةِ الشَّعِيرِ لَا يُبَالِي اللَّهُ تَعَالَى بِهِمْ)[1].

واتە: چاکەکاران یەك لەدوای یەك لەناو دەچن و نامێنن، ئەمجا کۆمەڵێکی گەندەڵ وەکو بن جۆخینی جۆ یان خورما دەمێنێتەوە، هەر خودایان بەخەیاڵدا نایەت.

بەڵێ.. لە دوای هەڵکردنی ئەو بایەو مردنی هەموو باوەڕدارانی سەر زەوی، ئیتر سەر زەوی تەنها بێ باوەڕو خراپەکاری تێدا دەمێنێت و ئەوانیش دەست دەکەنەوە بە بت پەرستیو خراپەکاری، خوای گەورەش هەتا یەك کەس لەسەر زەوی مابێت بڵێت (یا الله) زەوی بۆ ڕادەگیرێت بەڵام لە دوای ئەوە زەوی بۆ بێ باوەڕان ڕاناگیرێت.

لە ڕاستیدا بەشێکی تەواوی ئەم فەرموودەیە بە چاوی خۆمان دەبینین کە خەڵکانێك پەنا بۆ نوشتەو پارچە پەڕۆی سەوزو وشك دەبەن.. کە بەڕاستی ئەمەش مەترسیەکی زۆری بۆ سەر عەقیدەو ئیمان دەبێت ئەگەر واز نەهێنرێ لەم کردارانە..

بەداخەوە یەکێك لە دیاردەی ئەو جۆرە شیرکەی کە لە زۆرێك لە وڵاتی موسڵمانانندا بڵاوبۆتەوە قەبر پەرستنە.. کە هەڵدەستن بە تەواف کردن بە دەوری گۆڕدا و سەلام لە ڕوکنەکانی دەکەن و دەستی پێدا دێنن و کۆسپەکانیان ماچ دەکەن و ڕوویان لە خاك و خۆڵیان وەردەدەن و، کاتێ دەیانبینن سوژدەیان بۆ دەبەن و، بە ملکەچی و سەرشۆڕی لەبەردەمیاندا ڕادەوەستن و پێداویستی و خواستیان لێ دەخوازن.

---

(١) صحيح: سنن الدارمي (٣/ ١٧٨٨) برقم: (٢٧٦١) وقال حسين سليم أسد الداراني: إسناده صحيح.

# خەڵکی قسە لەگەڵ یەکتری ناکەن

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی خەڵکی قسە لەگەڵ یەکتری دا ناکەن، جا بە هەر هۆکارێك لە هۆکارەکانی ژیان بێت.. دایك لەگەڵ منداڵ برا لەگەڵ برا.. باوك لەگەڵ کوڕ ئامۆزا لەگەڵ ئامۆزا ... هتد ..

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ( لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى.. تَبْدُوَ الشَّحْنَاءُ بَيْنَ النَّاسِ)[١].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت.. هەتا خەڵکی پشت لە یەکتری نەکەن و قسە لەگەڵ یەکتری ناکرێت..

دەنگ دابڕین لە موسڵمانان یەکێکە لە هەنگاوەکانی شەیتان، زۆرن ئەوانەی بە دوای هەنگاوەکانی شەیتان دەکەون پشت لە برا موسڵمانەکانیان دەکەن بە هۆکاری ناشەرعی، یان لەبەر ناکۆکی ماددی، یان هەڵوێستێکی کەم بایەخ، ماوەیەکی زۆر ئەو دابڕانە درێژەی دەکێشێ، جاری وایە سوێند دەخوات و قسەی لەگەڵدا نەکات و، لەسەرە خۆی نەزر دەکات نەچێتە ماڵی، کاتێك لە ڕێگایەك دەیبینێ ڕوی لێ وەردەگێڕێ، ئەگەر کاتێکیش لە کۆڕێکدا پێی گەیشت ئەوا تۆقە لەگەڵ ئەوانەی پێش ئەو و دوای ئەودا دەکات و ئەوی دەبوێرێ، ئا ئەوە یەکێکە لە هۆکاری بێ توانایی کۆمەڵگای ئیسلامی، هەر لەبەر ئەوە بڕیاری شەرعی لەو بارەوە یەك لاکەرەوەیەو هەڕەشەکە توندە، تەنانەت پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەیەك فەرموویەتی: بۆ موسڵمان حەڵاڵ نییەزیاتر لە سێ ڕۆژان پشت لە برای خۆی بکات، جا هەر کەسێ زیاتر لە سێ ڕۆژان پشتی تێکرد، ئەگەر مرد دەچێتە دۆزەخەوە[٢].

لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: هەر کەسێ ساڵێك پشتی لە براکەی کرد وەکو ئەوە وایە خوێنی ڕشتبێ[٣].

---

(١) ضعيف: أخرجه ابن عساكر في تاريخ دمشق (٤٥٣/٧) وقال الألباني في السلسلة: ضعيف.

(٢) صحيح الجامع، برقم: (٧٦٣٥).

(٣) صحيح الجامع، برقم: (٦٥٥٧).

# زۆربوونی مردنی پیاوچاکان

لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی، ئەوەی پیاو باش و چاك بێت وەفات دەکات و دەمرێ، ئەگەر لەم سەردەمە سەرنج بدەین دەبینین هێواش هێواش پیاو چاکان بەرەو نەمان دەچن و دەمرن.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عومەر (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَأْخُذَ اللَّهُ شَرِيطَتَهُ مِنْ أَهْلِ الْأَرْضِ، فَيَبْقَى فِيهَا عَجَاجَةٌ، لَا يَعْرِفُونَ مَعْرُوفا، وَلَا يُنْكِرُونَ مُنْكَرًا)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت تا خوای گەورە پیاو چاکانی سەر زەوی دەباتەوە بۆ لای خۆی، ئیتر تێکەڵەیەك دەمێنێتەوە نە چاکیان پێ چاکەو نە خراپیان پێ خراپە.

خوای گەورە خەڵکی چاکەکارو بڕوادار دەگێڕێتەوە لای خۆی، پاش ماوە دەمێنێ خەڵکانێکی گێل و بێ کەڵك و سوود تیا نەماوە، ئەمەش لەو کاتە ڕوو دەدات کەوا خوای گەورە زانستی شەرعی لە زەوی هەڵدەگێرێت بەهۆی مردنی زانایانەوە، ئینجا خەڵك بە گوێی پێشەوایانی نەزان دەکەن و فتوایان بۆ دەدەن و بەبێ زانست و گومڕایان دەکەن.

پێشەوا عەمری کوری شوعەیب ئەو لە باوکیەوە ئەویش لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: (يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يُغَرْبَلُونَ فِيهِ غَرْبَلَةً ، يَبْقَى مِنْهُمْ حُثَالَةٌ ، قَدْ مَرِجَتْ عُهُودُهُمْ ، وَأَمَانَاتُهُمْ ، وَاخْتَلَفُوا فَكَانُوا هَكَذَا وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ ..)[2].

---

(١) صحيح: رواه أحمد في المسند (٢١٠/٢) وقال الشيخ أحمد شاكر : إسناده صحيح ، والحاكم في المستدرك (٤٨١/٤) وقال الحاكم : هذا حديث صحيح على شرط الشيخين إن كان الحسن سمعه من عبدالله بن عمرو ، ووافقه الذهبي .

(٢) صحيح: رواه أحمد في المسند (٢٢٠/٢) وقال الشيخ أحمد شاكر : إسناده صحيح ،وأبو داوود (٤٣٤٢) وابن ماجة (٣٩٥٧) وابن حبان في صحيحه (٥٩٥١) والحاكم في المستدرك (٤٨١/٤) وقال

واتە: سەردەمێك دێت بەسەر خەڵکی چاکەکانیان لە بێژنگ دەدرێن ئیتر کەسانێکی پوچەڵ دەمێننەوە، پەیمان و ئەمانەتیان تێکەڵ بووەو نەماوەو جیاوازی و دووبەرەکی کەوتۆتە نێوانیان و ئاوایان لێ دێت پەنجەکانی دەستی تیکەڵ کرد.

لە فەرموودەیەکی تر پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمویێ: (يَذْهَبُ الصَّالِحُونَ الأَوَّلُ فَالأَوَّلُ ، وَيَبْقَى حُفَالَةٌ كَحُفَالَةِ الشَّعِيرِ أَوِ التَّمْرِ ، لاَ يُبَالِيهِمُ اللَّهُ بَالَةً)[1].

واتە: چاکەکاران یەك لەدوای یەك لەناو دەچن و نامێنن، ئینجا کۆمەڵەکی گەندەی وەکو بن جۆخینی جۆ یان خورما دەمێنێتەوە، هەر خودایان بەخەیاڵدا نایەت.

نەمانی پیاو چاکان بە هۆی زۆری گوناهە کە خەڵکەکە ئەنجامی دەدات، ئەگەر نەیتوانی بەرگری بکات لە چاکەو جڵەو گیری بکات لە خراپە چاوەڕێی هاتنی ڕۆژی دوایی بن.

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب (ﷺ) دەڵێت: مردنی پیاوچاکان حەسانەوەی خۆیەت و، مردنی پیاو خراپیش حەسانەوەی خەڵکە لێی.

پیاوی چاك ئەو کەسەیە کە دووزمانی ناکات بەسەر موسڵمانانەوە، وە هەرگیز قسە ناهێنێت و نایبات، بۆیە خوای گەورە بە زووترین کات ئەمانەتەکەی لێ وەردەگرێتەوە تا لەم دونیایە ئیتر خەم نەخوات.

پێم سەیرە هەندێك خۆیان بە پیاو چاك دەزانن لە کاتێکدا:

گوێ لە گۆرانی دەگرێت چونکە باسی کێشەکانی دەکات، بەڵام گوێ لە قورئان ناگرێت لە کاتێکدا باسی چارەسەری کێشەکانی دەکات.

وە ئەگەر سەیری ئەم سەردەمە بکەین زۆر بە ئاشکرا ئەوە بەدی دەکەین کە پیاو چاکان زوو وەفات دەکەن و دەگەڕێنەوە لای خوای گەورە.

---

الحاكم : هذا حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه ووافقه الذهبي .

(١) صحيح البخاري (٢١/ ٢٩٢) باب: ذهاب الصالحين، برقم: (٦٤٣٤).

بەرگی دووەم

# زۆربوونی ئافرەتان و کەمبوونەوەی پیاو

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی و کۆتایی بونەوەر ڕێژەی ژمارەی ئافرەتان زۆر دەبێت.

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەڵێت:

لە پێغەمبەری خودام بیست دەیفەرمو:

(مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ

أَنْ يَظْهَرَ الْجَهْلُ وَيَقِلَّ الْعِلْمُ

وَيَظْهَرَ الزِّنَا وَتُشْرَبَ الْخَمْرُ

وَيَقِلَّ الرِّجَالُ وَيَكْثُرَ النِّسَاءُ حَتَّى يَكُونَ لِخَمْسِينَ امْرَأَةً قَيِّمُهُنَّ رَجُلٌ وَاحِدٌ)[١].

واتە: لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی زانست هەڵدەگیریّ و نەزانی زۆر دەبیّ و زینا زۆر دەبیّ و مەی خواردنەوە زۆر دەبیّ پیاو کەم دەبنەوەو ژنان زۆر دەبن تا وای لێدێت پەنجا ژن بەرامبەر یەك پیاو دەبێت.

پێشەوا موسلیم دەڵێت: هۆی ئەمەش زۆر بوونی فیتنەو شەڕو کوشتارە لە نێوان پیاواندا لەبەر ئەوەی پیاوان خاوەنی شەڕو جەنگن نەك ئافرەتان[٢].

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لیّ بێت) دەڵیّ: ئەوەی کە دیارە ئەمە نیشانەیەکی قیامەتە خوای گەورە ویستی وابووە کە لە کۆتایی بوونەوەر ڕەگەزی نێرینە کەم لە دایك ببیّ، وە زۆربەی منداڵ دەبیّ مێینە بیّ، وە

---

(١) صحيح البخاري، كتاب العلم ، باب رفع العلم وظهور الجهل ، (١/١٧٨-مع الفتح) ، وصحيح مسلم، كتاب العلم ، باب رفع العلم وقبضه وظهور الجهل والفتن في آخر الزمان ،(١٦/٢٢١ – مع الفتح).

(٢) صحيح البخاري (١/ ١٧٨) مع الفتح.

زۆربوونی ئافرەتان لەو نیشانانەن کە ڕێك بێت لەگەڵ بەدیارکەوتنی نەزانی و نەمانی زانست[١].

منیش ئەوەندەی بۆ بچم هیچ ڕێگریەك نیە لەوەی کە ئیبنو حەجەر باسی کرد، وە هۆی کەم بوونەوەی ژمارەی پیاوان و زۆربوونی ئافرەتان بریتیە لەو شەڕانەی لەو کاتی بەرپا دەبن[٢]، وەکو شەڕی جیهانی یەکەم دووەم و شەڕی عێڕاق و کوێت، یان شەڕی عێڕاق و ئێران، وە چەندان شەڕی تر کە کۆتایی نایەت باسیان بکەین.. هتد، بۆیە لەم شەڕانەدا پیاو زۆر دەکوژرێت جا پیاوان کەم دەبنەوەو ئافرەتان زۆر دەبن، مەبەستیش کوژرانی بێبڕوایان نیە بە دەستی موسڵمانان بەڵکو مەبەست یەکتر کوشتنی خۆ بە خۆی موسڵمانانە، بە شێوەیەك زۆر کات و هۆ و ئامانجی ئەو کوشتنە نازانرێ.

پیاو لە ئافرەت زیاتر لەناوچوون لە هەموو ڕووێکی ژیان ڕووی تێدەکات، وەکو کارکردن لە کارگە گەورەکان و سەفەرکردن بە ئۆتۆمبێل و کەشتی و فڕۆکەکان، هەلاکەت و لەناوچوون بەزۆری ڕوو لە پیاو دەکات لە کاتی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی سەختی بە هیلاك بەرو لە کاتی هەڵگیرسانی شەڕی بەهێز لە نێو دەوڵەتەکان.

ئەمانە وا دەبەخشن کە ژمارەی ئافرەت لە هەموو جێگایەك بە چەند جار زیاتر بێت لە ژمارەی پیاو، ئینجا لەناو گۆمەڵگادا هەر پیاوێك ئافرەتێك مارە بکات بەبێ ئەوەی پیاوێك بەرەبەنی بمێنێتەوە، دەبینن بەشێکی زۆر لە کچانی عازەب بەبێ مێردن و بەشێکی زۆریش لە ئافرەتان کە مێردەکانیان لە شەڕدا بەر هەلاکەت کەوتوون و بەبێ ئیدارەو کەس و کارو مێرد ماونەتەوە.. بەشێك لەوانە بە کچەکان و بێوەژنەکان ژیان وایان لێ دەکات بە نهێنی و بە ئاشکرا ڕوویکەنە خراپەو داوێن پیسی، ئەمەشیان کارێکی دیارو ئاشکرایەو گومان هەڵناگرێت لە وڵاتەکانی ئەوروپا، بەمە کۆمەڵایەتی لە چەند ڕووێکەوە خراپەو شڵەژان ڕووی تێ دەکات[٣].

---

(١) فتح الباري (١/ ١٧٩).

(٢) شرح صحيح مسلم (٧/ ٩٦ ٩٧).

(٣) أشراط الساعة، ماهر أحمد الصوفي، (لا ١٧٤).

لە مەجلیسی (نورنبرج) لە ئەوروپا لە ساڵی (١٦٥٠)ع دوای ئەو شەڕانەی ڕوویدا بڕیاریدا کە پیاو بۆی هەیەو دەتوانێت لە ژنێك زیاتر مارە بکات، کە دیتیان ئەو شەڕانە بەشێکی زۆری لە مرۆڤەکان کوشتووەو ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەتان بەبێ هاوسەرو بەبێ ئیدارەو گوزەران ماونەتەوە.

دوای جەنگی جیهانی دووەم کە چوار ساڵ بەردەوام بوو بەشێکی زۆر لە ئافرەتانی ئەڵمانیا خۆپێشاندانێکیان کرد بۆ ئەوەی ڕێ بدرێت پیاو بتوانێت لە ئافرەتێك زیاتر مارە بکات، چونکە دیتیان ژمارەی ئافرەتان بۆتە نۆ چەندانەی ژمارەی پیاوان.

هەروەها حکومەتی عێراقی لە کاتی خۆی ماددەیەکیان خستە یاسای باری کەسی کە نابێت کەس لە ژنێك زیاتر مارە بکات تەنیا بەڕێدانی قازی نەبێت، بەڵام کە شەڕ لە نێوان عێراق و ئێران ڕوویداو هەشت ساڵی خایاند، دیتیان بە هەزاران کەس کوژراون و ژنەکانیان بە بێوەژنی و بەبێ ئیدارە مانەوە، ئەمە گرفتێکی گەورەی بۆ وڵات نایەوە، بۆیە لە ١٩٨٨/١١/١٢ بڕیاریدا بە لابردنی ئەو ماددەیە لە قانونەکەداو ڕێیدا بە هێنانی ژنێك زیاتر بەبێ ئەوەی پێویستی بە ڕێدانی قازی هەبێت.

بۆ یەکەمجار لە ساڵەکانی دوای جەنگ ژمارەی پیاوانی ژاپۆنی لە چاو ژنان کەم دەبێتەوە.. ڕۆژنامەی ئوترای ڕووسی ڕایگەیاند: کە ژمارەی دانیشتوانی ژاپۆنی لە ساڵی ٢٠٠٤ع گەیشتووەتە ١٢٧ ملیۆن و ٦٨٧ کەس.. لە هەمان ڕۆژنامەدا دەڵێت: ڕێژەی زیادبوونی دانیشتوان لە چاو ساڵی ٢٠٠٣ەوە (٠,٠٥٪) زیاد بووە، بەڵام لەهەمان کاتدا ژمارەی پیاوان بۆ یەکەمجار (٠,١٪) کەم بۆتەوە.

لێرەدا دەمەوێ ئاماژە بە چەند خاڵێك بکەم لەبارەی چەند ژنەیی (تعدد الزوجات):

١) مەسەلەی چەند ژنە یەکێکە لەو مەسەلانەی کە شەریعەت بە ڕوونی بەڕەوای داناوە، ناگونجێ کەسێك خۆی بە موسڵمان بزانێ، یان بیەوێ بە

موسڵمان بزانرێ و نکوولّیی لێ بکات و ڕەخنەی لێبگرێ، کەسێکیش موسڵمان نەبێ ئەوە بڕوای بە شتی گەورەتریش نیەو حیسابێکی دیکەی جیاوازی هەیە.

٢) شتێکی ناشایستە و دزێوە کە موسڵمانان بە گشتی و بەتایبەت کەسانی زاناو شارەزا، لە ژێر گوشاری کەسانێکی ناڕازیی بە شەریعەت و ڕەخنەگر لە یاساکانی داو، بۆ قایلکردنی چەند کەسێکی سیکۆلاریست، یاسای چەند ژنەیان لێ ببێتە بارو کۆڵێکی قورس و نەزانن چۆن لە کۆڵی خۆیانی بکەنەوە، پێن بەندو مەرج (قید شرط) ی وای بخەنە سەر کە سەرەنجام لە نێوەڕۆك خاڵی ببێتەوە، بۆ نموونە: مەرجی ڕازی بوونی ژنی یەکەم یان دووەم و سێیەم، چونکە خوای کاربەجێ، بێجگە لە دادگەریی هیچ مەرجێکی دیکەی بۆ پیاوی چەند ژن هێن دانەناوە.

بێگومان بەهەڵەو ناڕێك بەکارهێنانی یاسا شەرعیەکان لەلایان موسڵمانانی کرچ و کاڵەوە، شتێکی بینراوو زانراوە کەسانێکی وابوون و هەن کە لەبواری چەند ژنەییدا تووشی هەڵەو لادان بوون، بەڵام دیارە بە هەڵەو ناڕاست بەکارهێنانی یاسایەکی شەرعی بەڵگەو پاساوی پەکخستنی نیەو پێویستە هەڵەو کەم و کوڕییەکان چارەسەر بکرێن، نەك یاساکانی شەریعەت پەك بخرێن .

٣) لەم ڕۆژگارەداو لە کۆمەڵگای ئێمەدا مەسەلەی چەند ژنەیی بۆتە شتێکی دەگمەن و ڕەنگە لە سەد کەس یەکێك لە ژنێکی زیاتر هەبێ، بۆیە هێندە ورووژاندنی و زەقکردنەوەی شتێکی سەیرەو بێ پاساوە، دەبوایە ئەوانەی بە تەنگ ئافرەتانەوەن و هەمیشە شیوەنیان بۆ دەکەن لە جیاتی ئەو مەسەلەیە کە ئێستاکە شتێکی لاوەکیە، بێن بە جددی خەریکی چارەسەری ئەو کێشەو گرفتانەی ئافرەتان بن، بە تایبەت ئافرەتانی دوورو بێ بەش لە پەروەردەی ئیسلامی، کە پشویان بێ سوار کردوون و خەریکن فززەیان لێ ببڕن وەکو: داوێن پیسی و فریودانی ئافرەتان و دیاردەی خیانەتی هاوسەریەتی و کوشتنی ئافرەتان.

ئەگەر سەرنجی ئەم سەردەمە بدەین ئەوەمان بۆ بەدیار دەکەوێت کە ڕێژەی ئافرەتان زۆر زۆر لەبەرزبونەوەدایە.

# نەمانی ترس لە دڵی دوژمنان و داگیرکردنی وڵاتی موسڵمانان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی (وەهن) لەناو دڵی موسڵمانان دروست دەبێت، وە لە دڵی کافران ترس نامێنێت.

لەو نیشانانەی کە لە کۆتایی بونەوەردا ڕوودەدەن پەلاماردانی ئوممەتەکانە بۆ ئوممەتی ئیسلامی، بەڵام خوای گەورە ئەم ئوممەتە دەپارێزێت.

لە سەردەمانی پێشوو بێ بڕواکان ئەوەندە لە موسڵمانان دەترسان لە سزای خوا نەدەترسان.. بەڵام ئەمڕۆ پێچەوانە بوەتەوە.



پێشەوا ئەویان (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی:

(يُوشِكُ أَنْ تَدَاعَى عَلَيْكُمْ الْأُمَمُ مِنْ كُلِّ أُفُقٍ كَمَا تَدَاعَى الْأَكَلَةُ عَلَى قَصْعَتِهَا قَالَ

قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمِنْ قِلَّةٍ بِنَا يَوْمَئِذٍ

قَالَ أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ كَثِيرٌ وَلَكِنْ تَكُونُونَ غُثَاءً كَغُثَاءِ السَّيْلِ يَنْتَزِعُ الْمَهَابَةَ مِنْ قُلُوبِ عَدُوِّكُمْ وَيَجْعَلُ فِي قُلُوبِكُمْ الْوَهْنَ

قَالَ قُلْنَا وَمَا الْوَهْنُ قَالَ حُبُّ الْحَيَاةِ وَكَرَاهِيَةُ الْمَوْتِ)[١].

واتە: نزیکە ئوممەتەکان کۆببنەوە لەسەرتان وەکو چۆن بخۆرەکان کۆدەبنەوە لەسەر کاسەی خواردن، کەسێك وتی: ئایا لەو ڕۆژگارەدا ئێمە کەمین؟ فەرمووی: بەڵکو ئێوە زۆرن لەو ڕۆژگارەدا، بەڵام وەکو کەفی لافاون، خوای گەورەیش ترستان لە دڵی دوژمنتاندا دەردەهێنێت و (وەهن)یش دەخاتە دڵتانەوە،

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٥/ ٢٧٨) برقم: (٢٢٤٥٠) قال شعيب الأرناؤوط: إسناده حسن.

فەرموویان: (وەهن) چییە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی: خۆشەویستی دونیاو ڕق لێبوونەوەی مردن.

وشەی (تداعی) کە لە فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتووە بە واتای ئەوە دێت هەندێکیان بانگی هەندێکیان دەکەن، بۆ نمونە: ئەمریکا بانگی بەریتانیا دەکات بەریتانیا بانگی پۆڵەندا دەکات ئەمریکا بانگی چین و یابان دەکات.. هتد، بۆ شەڕی عێراق و سوریا و ئەفغانستان.

ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەندین موعجیزەی گەورەی تێدایە، ئەویش ئەوەیە کە:

دەوڵەتانی ڕۆژئاوا هەڵدەستن بە داگیرکردنی وڵاتانی موسڵمانان بۆ ئەوەی لەسەروەت سامان و نەوت و کانزاکان و بەرهەوبوومەکانی بخۆن، وڵاتی موسڵمان نشینەکان دەبنە خواردنی ناو قاپێك و وڵاتانی ڕۆژئاوا لەبەرهەوبومی قاپەکە دەخۆن.

ئەگەر سەیری ژیانی خۆمان بکەین زۆر ڕاشکاوانە ئەوە بەدی دەکەین کە لەم سەردەمە موسڵمانان ڕێژەیان زۆر زۆرە بەڵام هەموویان پارچە پارچە بوونەو بیروبۆچوون و لێکدانەوەی جیاوازیان هەیە، حەز بە دونیا دەکەن و ڕقیان لە وشەی جیهادو خۆبەخت کردنە لە پێناوی خوای گەورە.

وڵاتانی ڕۆژئاواو ئەوروپا هەمیشە وڵاتی موسڵمانانیان داگیر کردووە وەکو بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتاڵیا و ئەسپانیا.. هتد، دواتر جولەکەکان دەیانەوێت خاکی فەڵەستین داگیر بکەن لەگەڵ کۆمەڵێك خاکی وڵاتە عەرەبیەکانی دەوروبەری وەکو (سینای میصرو جەولانی سوریا و زەففەی غەربی لە ئوردن و باشوری لوبنان)، لە پاشاندا هەموو وڵاتانی دونیا کۆبوونەوە لەسەر خاکی عێراق لە شەڕی خەلیج بۆ لەناوبردنی، بەڵام لە ساڵی ٢٠٠٣ ع ئاواتەکانیان هاتە دی و دەستیان برد بۆ دەسکەوتە زێڕینەکانی عێراق.

لەم فەرموودەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە موسڵمانان هیچ پێگەیەکیان نییە، بەڵکو هەموویان وەکو گەڵای هەڵەوەریو وان.

ئەمڕۆ ڕێژەی موسڵمانان زیاتر لە ٢ ملیارە، بەڵام زۆربەیان تەنها بەناو موسڵمانن.

هەر کاتێك خوای گەورە پەیمانێکی پێداین و نەمان بردەسەر ئەو کات خوای گەورە ستەمکارێکمان بۆ دەنێرێت و دەدات بەسەرمانداو ئەوەی لەناو خاك و وڵاتماندایە بۆ خۆیان دەیبەن.. بەداخەوە داگیرکردنی خاکی ئیسلام و تاڵانکردنی سەروەرت و سامان و خێرو بێرەکەی نیشانەیەکن بۆ شکاندنی پەیمانی خوای گەورە!! چۆن ئەو پەیمانەی درا بە خوای گەورە شکا؟! خوای گەورە پەیمانی لێوەرگرتین نوێژ بکەین ئێمە نایکەین، پاك بین پاك نین وە شەرعی خوا ڕاگرین بەڵام ڕامان نەگرتووە فەرمانەکانی ئەو وەرگرین ئەوەی ئەو نەفرینی لێکردووە ئێمە نەیکەین، نەمانکرد.

کەواتە ئەو بارودۆخەی کە تیایدا خاکی موسڵمانان داگیرکراوەو سەروەرت و سامان و کەرامەتی دزراوە لە گوناە و تاوانەکانی خۆمانە.. باوەڕداری لاواز بە قەزاو قەدەر بیانو دێنێتەوە بەڵام باوەڕداری بەهێز بە قەزاو قەدەری خوا ڕازی دەبێت.

ئەو کەسەی بە مێژوودا بگەڕێت دەبینێ ئوممەتی ئیسلام چەندین جەنگی کردووەو کارەساتی گەورەیشی بەسەردا هاتووە، خوای گەورەیش پارێزەرو پشتگیریتی، گاورەکان کۆبوونەوە لە جەنگەکانی خاچپەرستیدا، بەڵام خوای گەورە موسڵمانانی سەرخست بە سەریاندا.

تەتارەکانیش چەندین جار هێرشیان هێنایە سەر وڵاتە ئیسلامییەکان و خوای گەورە پلانەکانی شکاندەوە بەسەر خۆیاندا، لەم ڕۆژگارەی خۆیشماندا کەسانێکی ناخ بۆگەن لە هەموو لایەکەوە دژایەتی ئیسلام دەکەن، هیواشمان بە خوای گەورەیە موسڵمانان بگەڕێنەوە بۆ ئاینەکەیان بەڵکو سەرکەوتنیان پێ ببەخشێت.

ئەم فەرموودەیە لە بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی و نیشانەکانی کۆتایی بونەوەرە، ئەو ئوممەتانە وا کۆبونەتەوە لەسەر ئوممەتی ئیسلام، هۆی ئەم نەنگیەش کە توشی موسڵمانان بووە کەمیی ژمارەیان نییە، بەڵکو زۆرن، بەڵام وەکو کەفی سەر لافاون، قورساییان نییە، ئەمەیە حاڵی ئوممەتی ئیسلامی ئەمڕۆ، ژمارەیان تێپەڕبووە لە هەزار ملیۆن، بەڵام زۆری ژمارەیە نەك چۆنیەتی..

چونکە ترسیان لە دڵی دوژمنانیاندا دەرچووە، بۆیە ئەوانیش سوکایەتی دەکەن بە موسڵمانان و شەڕیان لە دژ دەکەن، چونکە خودی موسڵمانان دڵیان لاواز بووە بە خۆشەویستی دونیاو ڕق لێبوونی مردن.

ئەمڕۆ بەچاوی خۆمان دەبینین ئێستا لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا چ دوژمنایەتیەکی ئیسلام و موسڵمانان دەکرێ، هەموو شتێك ئازادە جگە لە ئیسلام!

بەداخەوە.. لەم ڕۆژگارەدا هەر بەناو موسڵمانانن داوا لە بێباوەڕان دەکەن بێنە نێو خاکیان و لەبەرەو بومەکەی بخۆن، لە هەموو لایەکەوە دوژمنان گەمارۆی وڵاتە موسڵمان نشینەکانیان داوە بۆ ئەوەی لە بەرهەم و نەوتەکەی بخۆن..

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕاستی فەرموو کە وەکو کەفی سەر دەریا واین.. تەنانەت خۆمان بە خاوەنی وڵات و نیشتیمانمان نازانین چونکە وەکو کەسێکی بێگانە سەیر دەکرێین!

ئەگەر سەیری دەستەواژەی (وَيَجْعَلُ فِي قُلُوبِكُمْ الْوَهْنَ) بکەین، هاوەڵان پرسیار دەکەن لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەوا وەهن چیە؟

پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەڵام دەداتەوە کە فەرموویەتی: بێ هێزی، واتە: دونیای خۆش دەوێت و ڕقی لە مردنە.. تەنانەت خوای پەروەردگار لە سورەتی لوقمان تەفسیری وەهنمان بۆ دەکات کە فەرموویەتی: [ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ ][1].

واتە: فەرمانمان داوە بە ئادەمی (بە چاکی هەڵسوکەوت کردن) لەگەڵ دایك و باوکیدا، دایکی هەڵی ئەگرێ بە دوو گیانی لاوازی لە دوای لاوازی..

کەواتە بۆمان دەرکەوت کە وەهنی نێو ناخی دڵمان لاوازیە، ئەمەش بە هۆی بوونی ماڵ و سەروەت و سامان و حەزکردن بە دونیا.

پاکو بێگەردی بۆ خوای گەورە ئەوە ئەو سەردەمەیە کە پێغەمبەری نازدار (ﷺ) باسی دەکات.

---

(١) سورة لقمان، الآية: (١٤).

## زۆربوون وپەیدابوونی ئافرەتی ڕووت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر زۆربوونی ئافرەتانێکن کە جل و بەرگیان لەبەردایەو مەیلیان بۆ هەواو ئارەزوو ڕابواردنە..

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (صِنْفَانِ مِنْ أُمَّتِي لَمْ أَرَهُمَا: قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ مِثْلُ أَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مَائِلَاتٌ مُمِيلَاتٌ رُءُوسُهُنَّ مِثْلُ أَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ لَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ، وَلَا يَجِدُونَ رِيحَهَا، وَإِنَّ رِيحَهَا لَتُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا)[1].

واتە: دوو کۆمەڵ هەن لە ئەهلی ئاگر من نەمدیون، کۆمەڵێك قامچیان پێیە لە کلکی مانگا دەچێت و پێی لە خەڵکی دەدەن، وە ئافرەتانێك کە پۆشاك و جلیان لەبەردایە، بەڵام بەشی زۆری لەشیان ڕووتەو مەیلیان بۆ هەواو ئارەزوو و ڕابواردنە، کە دەشرۆن بە ڕێگادا لەنجەو لار دەکەن تا زیاتر سەرنج ڕاکێشبن، پرچیان لە دواوە کۆدەکەنەوەو لولی دەکەن و لەسەر سەریان دایدەنێن، هەروەك پشتی حوشتر، ئەو ئافرەتانە نەدەچنە بەهەشتەوەو نەبۆنیشی دەکەن، کە بۆنی بەهەشت لە دووری ئەوەندەو ئەوەندە دەڕوات.

(رُءُوسُهُنَّ مِثْلُ أَسْنِمَةِ الْبُخْتِ) واتە: سەرو پرچی خۆیان گەورە دەکەنەوە بەو قوماش و کڵاوانەی کە دەیدەنە سەری خۆیان تاوەکو وەکو کۆپارەی وشتری لیٚ دیٚت (ئەمە بەناوبانگترین واتایە لە ڕاڤەکردنی فەرموودەکە).

(البخت): جۆرێکە لەو جۆرە وشترە (خوراسانی)یانە کە لە رادەبەدەر ملیان درێژە.

جا پێغەمبەر(ﷺ) وەسفی ئەو ئافرەتە داپۆشراوە ڕووتەی کردووەو شێوەی داهێنانە بەرزەکەی پرچی کە پێی دەڵێن: (برینی شێر) وەکو ئەو کۆپارەی سەر پشتی وشتر.

---

(١) صحیح ابن حبان (١٦/ ٥٠٠) برقم: (٧٤٦١).

پێغەمبەر(ﷺ) ئەو جۆرە ئافرەتانەی خستۆتە ڕیزی کێبل بە دەستەکانەوەو ڕۆژی دوایش لەگەڵ ئەواندا حەشر دەکرێن .

لە ڕیوایەتی فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەردەکەوێت کە ئافرەتان و فیتنەو ئاشووبیان لە ئاخیر زەماندا، سامنکترین و پڕ مەترسیترین ڕۆڵ دەبینن.

بەڵام مەبەست لە (کاسیات عاریات) پۆشتەی ڕووت، ئەوا چەند بۆچوونێك هەیە:

١) پۆشتەن لە نیعمەتەکانی خوای گەورە، بەڵام ڕووتن لە سوپاسگوزاری ئەو.

٢) پۆشتەن لە جل و بەرگدا بەڵام ڕووتن لە ئەنجامدانی چاکەکاری و بایەخ بە دوارۆژی خۆیان و گرنگیدان بە گوێڕایەڵی.

٣) هەندێك لە جەستەی خۆی دەردەخات لەبەر جوانی جا ئەوانە پۆشتەی ڕووتن.

٤) جل و بەرگی تەنك لەبەر دەکەن کە ئەوەی لە ژێرەوەیەتی وەسف دەکات جا ئەوان ڕووتن بەڵام پۆشتەن بە واتا[١].

مەبەست لە (مَائِلَاتٌ مُمِيلَاتٌ)دەڵێن: لە گوێڕایەڵی خوای گەورە لایانداوە لە پاراستنی داوێنی خۆیان و جگە لەوانە، (مُمِيلَات): جگە لە خۆیان کردەوەکانی خۆیان فێر دەکەن.

(مَائِلَات) واتە: بە فیزەوە ڕێ دەکەن..وە (مُمِيلَات) واتە: شانەکانیان لار دەکەنەوە.

(مَائِلَات) واتە: پرچەکانیان بە لارەوە دادەهێنن کە ئەویش شێوەی ئافرەتە داوێن پیسەکانی پێ دەناسرێت.. وە (مُمِيلَات) واتە: بەو شێوە داهێنانە پرچی ئافرەتانی تر دادەهێنن.

(مَائِلَات) واتە: لاردەبنەوەو بەرەو لای پیاوان.. (مُمِيلَات) واتە: جوانیەکانی خۆیان بۆ پیاوان دەردەخەن[٢].

---

(١) علامات الساعة الصغری والکبری، عبدالله عبدالعزیز أمین، لا ٦١ .

(٢) من نبوءات الرسول ، ابراهیم محمد العلي (لا ١٢٨ ١٢٩ ١٣٠).

بەرگی دووەم

پێشەوا مازەری دەڵێت: ڕەنگە مەبەست لە واتاكەی ئەوە بێت: تەماحی پیاوان دەكەن و چاویان داناپۆشن بەرانبەریان و سەریان داناخەن.

پێشەول قازی عیاز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كەوا مەبەست لە لێچوونی بە كۆپارەی وشتر بەرزبوونەوەی پەلكەكانیان لەسەر سەریان و كۆكردنەوەی پرچەكانیان لەوێ، زۆر دەبێتەوە تاوەكو بەلایەكی سەریدا مەیەلان دەكات هەروەكو چۆن كۆپارە مەیەلان دەكات.

دكتور یوسف قەرزاوی (خوای گەورە بیپارێزێت) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) بۆچی وەسفی ئەم جۆرە ئافرەتانەی بە (كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ) كردووە؟ چونكە ئەم ئافرەتانە جلیان لەبەرە بەڵام جلێكی زۆر تەنكەو لاشەیان هەمووی دیار دەكەوێت، ئێستاش ئێمە لەم سەردەمەی خۆماندا ئەو جۆرە جلانە دەبینین كە ئافرەتان لەبەری دەكەن[1].

فەرموودەكەی پێغەمبەر(ﷺ) (لا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ) هەروەكو ئەوانەی پێشوو دوو بۆچوونی لەسەرە:

**یەكەمیان:** مەبەستی ئەوەیە ئەو كەسە شتی حەرامی حەڵاڵ كردووە هەر چەندە دەزانێت ئەوە شتێكی حەرامە بۆیە پێی كافر دەبێت و بە هەتا هەتایی لە ئاگردا دەمێنێتەوەو هەرگیز ناچێتە بەهەشتەوە.

**دووەمیان:** مەبەستی ئەوەیە كە لەگەڵ سەركەوتووەكاندا یەكەم جار ناچێتە بەهەشتەوە، خوایش باشتر دەزانێت[2].

پەرتوكەكانی مێژوو بۆمان دەگێڕنەوەو دەڵێن: لە سەدەكانی پێشوودا كۆمەڵێ ئافرەت بە ئازایەتی و چەك هەڵگرتن ناوبانگیان دەركردووە، كە بە «ئافرەتانی ئەمازۆن» ناسراون، تیپێكی سەربازیان لێ پێكهێنراوەو لە چەندین جەنگی سەختدا بەشداریان كردووە .. بەهەمان جۆر لەم سەردەمەدا كە گومڕایی و بێ

---

(١) الحلال والحرام (لا ٨٣).

(٢) من نبوءات الرسول ، ابراهيم محمد العلي (لا ١٣٠).

بەرگی دووەم

باوەڕی بەرەنگاری ئیسلام بووەتەوەو لە گەڵیدا دەجەنگێت، سامناکترین تیپی هێرش بەری ئەوان بۆ سەر ئیسلام کە بە پێی نەخشەکانی دەروونی بەدخواز کار دەکات و پێشەوایەتیەکەی بە دەستی شەیتان سپێرراوە: تاقمێك ئافرەتی «پۆشتەو ڕووت»ن کە قاچ و قوڵیان دەردەخەن و دەیانکەن بە چەکێکی توندوتیژی بریندار کەرو دژی ئیمانداران بەکاریان دەهێنن، بەم کارەشیان دەرگای خێزانداری و مارەبڕین دادەخەن و هی داوێن پیسیش دەخەنە سەرپشت، چونکە هانیان دەدەن دووچاری تاوانی گەورەیان بکەن و بە چەشنێکی کتوپڕی دەروونی چەندەها کەس بۆ خۆیان دیل دەکەن و چەندین زام و برینی بە سوێ و قووڵ لە گیان و دڵیاندا دروست دەکەن، تەنانەت لەوانەیە هەندێ لەو دڵانە وەها بپێکن کە بەجارێ بیانکوژن و لەناویان ببەن!

کەواتە سزایەکی گەلێك دادگەرانەیە کە ئەو قاچ و قولانەی چەکی بریندارکەری فیتنەیان لەگەڵ خۆدا هەڵگرتووە، ببن بە سووتەمەنی دۆزەخ و یەکەم شت دۆزەخ ئەوان بسوتێنێت، چونکە لە ماوەی چەند ساڵێکی کەم و لەبەردەم کەسانێکدا کە لێیان حەڕام بوون، ڕووتیان کردوون و دەریانخستوون .

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە (هەر لە دونیادا) پیاوی گونجاویان لە دەست دەچێت، بەڵکو هەر دەستیشیان ناکەوێت، کە لە ڕاستی داو بە حوکمی سروشتیان گەلێ پێویستیان پێیەتی، ئەمەش بە هۆی ئەوەی وەفاو باوەڕیان لە دنیادا لە دەست چووە ، بەڵکو لە ئەنجامی گوێ نەدان بە شووکردن و بایەخ نەدان بە مافەکانی، وایان لێدێت کە پشت گوێ بخرێن و بایەخ و چاودێریان لە کیس بچێت.

جا مادەم «ڕاستی» بەم چەشنەیە ..

مادەم هەموو جوانێك جوانی خۆی خۆش دەوێت و بەپێی توانا پارێزگاری دەکات و نایەوێت بە نیازی خراپ دەستی بۆ ببرێت ..

مادەم «جوانی» نیعمەتێکی بەخشراوە، نیعمەتیش ئەگەر شوکرانەی لەسەر بکرێت، زیاد دەکات و گەر ئینکاریش بکرێ نامێنێت و دەگۆڕێت.

بێ هیچ گومانێك ئەو ئافرەتەی خاوەنی ژیری بێت، بە هەموو توانایەکیەوە هەڵدێت لەوەی جوانیەکەی بکات بە هۆی تاوانباری و گوناهکاری و خەڵکی تریشی پێ بە تەڵەی گوناهباریەوە بکات و لەو جوانیەش هەڵدێت کە ببێت بە مایەی ناشیرینی و جوانیەکی ژەهراوی شووم، ئەو نیعمەتەش کە پێی بەخشراوە ئینکاری بکات، ئەمەشی بۆ ببێت بە مایەی ئەشکەنجەو ئازار .

پێشەوا عەبدوڵڵای کوڕی عەمر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەری خودای (ﷺ) بیستووە کە دەفەرمویێ: (سَيَكُونُ فِي آخِرِ أُمَّتِي رِجَالٌ يَرْكَبُونَ عَلَى السُّرُوجِ كَأَشْبَاهِ الرِّجَالِ يَنْزِلُونَ عَلَى أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ نِسَاؤُهُمْ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ عَلَى رُءُوسِهِمْ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْعِجَافِ الْعَنُوهُنَّ فَإِنَّهُنَّ مَلْعُونَاتٌ..)[1].

واتە: لە کۆتایی ئومەتەکەمدا پیاوانێك دەبن سواری زین دەبن هەر دەڵێی ماڵ و خانووەو بە سواری ئەوانە دێنە دەرگای مزگەوتەکان، ژنەکانیشیان ڕووت و قووتە هەر بەناو جل و پۆشاکیان لەبەردایە، پرچی سەریان هەروەك پشتی حوشتر کۆمەڵ کردووە، ئەو ئافرەتانە نەفرەتیان لێ بکەن، چونکە نەفرەتیان لێکراوە .

ئەم فەرموودەیە لە گەورەترین موعجیزەکانی پێغەمبەرە(ﷺ) کە ئاماژە بە پەیدابوونی سەیارەو ئۆتۆمبێل دەکات و هەر دەڵێی لەو ڕۆژەدا ئەم ووتە پیرۆزەی تێدا فەرمووە، بە چاوی پیرۆزی سەیری واقیعی ئەمڕۆی کردووە، چۆن پیاوانی ئومەتەکەی بە سواری سەیارە ڕوودەکەنە مزگەوتەکان، کە چی لەولاشەوە بێ ئەوەی گوێی پێ بدەن ئافرەتاکانیان کچ و خوشکەکانیان ڕووت و سفورن، جلی کورت و تەسك و تەنك لەبەر دەکەن و قژیان لەف دەکەن و دەم چاویان ئارایشت دەکەن و بۆنی خۆش لە خۆیان دەدەن و بە هەزار و یەك شێوە خۆیان دەڕازێننەوە، پاشان دەچنە کۆچەو شەقام و کۆڵانەکان و بە لەنجە و لار پیاسە دەکەن و پێغەمبەریش(ﷺ) دەربارەیان دەفەرموێ: ئەو جۆرە ئافرەتانە نەفرەتیان لێ بکەن، چونکە خواو مەلائیکەتەکانیش نەفرەتیان لێ دەکەن و لە ڕەحم و میهری خوای گەورە بێ بەشن .

---

(١) مسند الإمام أحمد (٣٦/١٢) ، رقم الحديث (٧٠٨٣) تحقيق أحمد شاكر وقال إسناده صحيح

هەندێکی تر دەڵێن: واتای (کاسیات عاریات) واتە: جەستەی دادەپۆشێ بەڵام زۆر توندی دەکات تاکو گرێکانی جەستەی جولەی دیارەو سنگ و بەرۆکی دیار دەکاو هەندێ لە جەستەشی ڕووت دەکات جا لەبەر ئەمە لە ڕۆژی دواییدا سزای توند وەردەگرێت[1].

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عەمر(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (سَيَكُونُ فِي آخِرِ هَذِهِ الْأُمَّةِ رِجَالٌ يَرْكَبُونَ عَلَى الْمَيَاثِرِ حَتَّى يَأْتُوا أَبْوَابَ مَسَاجِدِهِمْ، نِسَاؤُهُمْ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ)[2].

واتە: لە کۆتایی ئومەتەکەم پیاوانێك پەیدا دەبن سواری زینی گەورە دەبن و هاتوو چۆی پێدەکەن، ژنەکانیشیان ڕووت و قووتن هەر بەناو جلیان لەبەردایە.

پێغەمبەر(ﷺ) ئەم کۆمەڵەی لە ئافرەتان بە (کاسیات عاریات) ناوبردووە، واتە: بەرگ لەبەرو ڕووت لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە ئافرەتانە بە جلێکی زۆر تەنك و نەرم لەبەر دەکەن و ئەم جل و بەرگە ناتوانێ ئەرکی داپۆشین بکات لەبەر نەرمی و تەنکیەکەی هەروەکو زۆربەی جل و بەرگی ئافرەتانی ئەم سەردەمەی ئێمە[3].

پێغەمبەر(ﷺ) وەسفی ئەم جۆرە ئافرەتانەی بە دوو وشە کۆکردۆتەوە کەوا (کاسیات عاریات)ە، هەروەها (مَائِلَاتٌ مُمِيلَاتٌ) وە پرچیان وەکو بەرزایی پشتی ووشتر، وە ئەمەش هەواڵدانێکە بۆ کارێکی بینراوی ئەم سەردەمە، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) ئەم سەردەمەی ئێمەی بینیبێ، بەڕاستی لەم سەردەمەی ئێمەدا چەندین شوێن تایبەت کراوە بۆ ڕێك خستنی پرچی ئافرەتان و جوانکردنی و جۆراو جۆرکردنی شێوەکاری بۆی لەو شوێنانەی کە پێی دەگوترێ (صالۆن) کە پیاوان بە پارەیەکی زۆر بە کرێی دەگرن، هەر ئەوەش نا بەڵکو زۆرێك لە ئافرەتان بەمەش وازناهێنن کە خوای گەورە پێی بەخشیون لە موو و پرچی سروشتی پەنا دەبەنە بەر کڕینی پرچی دەست کردو ئافرەت بە پرچیەوە دەبەستێ

---

(١) صحيح مسلم (١٧/ ١٠) بشرح النووي.

(٢) المستدرك (٤/ ٦٠١) برقم: (٨٤١٣). هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

(٣) الحلال والحرام في الإسلام، د. يوسف القرضاوي، (لا ٨٣).

تاکو زیاتر جوانی و نەرمی و ڕەونەقی بەدیارکەوێ و پیاوان پەڵکێش بکەن بۆ ڕووانین و دڵ بۆ چوونیان[١].

## لە ڕووی ئیعجازی زانستی :

نوێترین لێکوڵینەوەی زانستی سەلماندویەتی کە خۆدانەپۆشینی ئافرەتان دەبێت بە مایەی دەردو نەخۆشی ترسناك بۆیان، ئەوەتا ئامارە زانستیەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە نەخۆشی شێرپەنچە بڵاوبۆتەوە لەجەستەی بەشێکی زۆر لەو ئافرەتانەی کە جل و بەرگی ڕووت دەپۆشن، لەگۆڤارێکی پزیشکی بەریتانی ئەو ڕاستییەی ڕوون کردۆتەوە کە نامۆترین و ترسناك ترین جۆری نەخۆشی شێرپەنچەیە کە پێی دەگوترێ: (الميلانوما الخبيثة) کە لە پێشودا ئەم جۆرە شێرپەنچەیە گەلێك کەم و نامۆ بوو بەڵام ئێستا خەریکە بڵاو دەبێتەوە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەتایبەتیش لە نێوانی ئەو ئافرەتە گەنجانەدا کە جلی کورت لەبەر دەکەن و لاق و باسك و جەستەی خۆیان ڕووت دەکەن و بەر تیشکی خۆر دەکەوێت بە شێوەیەکی زۆر، بۆیە تایبەتمەندانی پزیشکی زۆر بوونی ئەم نەخۆشییە دەگەڕێننەوە بۆ بەکارهێنانی جلی ڕووت و خۆپۆشتە نەکردنی ئافرەتان , وە گۆرەوی تەنك و نایلۆن بە هیچ شێوەیەك سوودی نیە بۆ بەرگری کردن لەو تیشکەی بەر ئەوان دەکەوێت، هەروەها ئەم گۆڤارە داوای کرد لە تایبەتمەندانی کەشناسی کە لێکوڵینەوەی زیاتر ئەنجام بدەن بۆ ئەم جۆرە نەخۆشیە نوێیەی کە خەریکە ببێت بە دیاردەیەکی بەربڵاوو مەترسی گەورەی لێ بکەوێتەوە.

ئەوەتا ئەو ئازارە توندەی داوایان دەکرد هاتە جێ بۆیان وەیان بەشێکی ئەو ئازارە لەوێوەی ئەو نەخۆشی شێرپەنچە پیسەدا کە ترسناکترین جۆری شێرپەنچەیە خۆی دەبینێتەوە لە زۆربەی کاتدا توشی ئەو جێگایانە دەبێت کە ڕووتی دەکەن و زۆر بەر تیشکی خۆرو تیشکی سەرو وەنەوشەیی دەکەوێت، بە هۆی ئەو جلە ڕوتانەوە کە لە بەری دەکەن، یان ئەو جلە زۆر ڕووتانەی کە لەسەر لێواری دەریاکاندا لەبەریان

---

(١) الحلال والحرام، د. يوسف القرضاوي (لا ٨٤)

دەكەن دەبیندرێت، زۆربەی جەستەكان دووچاری ئەم نەخۆشییە دەبن بەڵام بە رێژەی جیاواز، سەرەتا وەكو پەڵەیەكی گەلێك بچوك دەردەكەوێت لە پێ یان لە قاچ وە هەندێ جار لەناو چاویشدا دەردەچێت ئینجا بڵاو دەبێتەوە لە هەموو پارچەكانی جەستەدا بەڵام سەرەتا لەو جێگایە بڵاو دەبێتەوە كە لێی دەردەچێت لە یەكەمین جاردا، ئینجا هێرش دەكاتە سەر گرێ، لەمفاوێكان كە لە سەرووی راندایە، ئینجا خوێنیش داگیر دەكات و جێگیر دەبێت لە (جگەر)دا وە جگەر وێران دەكات بە ماوەیەكی كەم، هەندێك جاریش جێگر دەبێت لە ناو ئێسك و هەناودا هەروەكو گورچیلەكان بەو چەشنەی وای لێ دێت نەخۆشەكەی میزی رەش دەكات لە بەر وێران بوونی خانەكانی گورچیلەكانی بە بەشێرپەنچەكە، هەندێك جاریش دەگوازرێتەوە بۆ منداڵ لەناو سكی دایكیدا, ئەم نەخۆشیە زۆر لە سەر خاوەنەكەی راناوەستێ، وە دەرفەتی ئەوەشی بۆ ناهێڵێتەوە كە نەخۆشەكە بە نەشتەرگەری هەڵبستێت بۆ چارە سەركردنی نەخۆشیەكە وەكو هەندێك لە شێرپەنچەكانی دیكەدا هەیە، وە بە هیچ جۆرێك ئەم نەخۆشە سوود وەرناگرێت لە چارەسەر كردن بە تیشك، نهێنی و فەلسەفەی شەریعەتی ئیسلامی پیرۆز سەرچاوە دەگرێت بەوەی كە فەرمان دەكات بە ئافرەتان پەیرەوی فەرمانی پەروەردگار بكەن لە باڵاپۆشیداو جل و بەرگی رووت و تەسك و تروسك لەبەر نەكەن بۆ ئەوەی بە باشترین شێوە خۆیان بپارێزن لە ئەشكەنجەی دونیا كە ئەم نەخۆشیە ترسناكە، هەروەها بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن لە ئەشكەنجەی خوای مەزن لەو دنیادا ..

باشە لەدوای ئەو راستییانەی زانستی نوێ سەلماندویەتی قورئانی پیرۆزی پەروەردگاری مەزن پێش هەزار ساڵ زیاتر فەرمانی پێ كردووە ئایە هیچ بیانویەكی تر هەیە بۆ ئەو ئافرەتانەی كە تاوەكو ئێستاش پەیرەوی فەرمانی یەزدانی مەزن ناكەن لە باڵاپۆشیدا[1].

---

(١) maknoon.com/e3jaz/new_page_52.

## زۆربوونی پۆلیس و دەست و پێوەندی ستەمکاران

یەکێ لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە ستەم زۆر دەبێ تەنانەت ئەو پیاوانەی کە ئەمانیان پێ ئەسپاردە دەکرێ تا ڕێ لە ستەم بگرن، خۆیان گەندەڵ دەبن و دەبنە ستەمکار کەوا بە قامچیەکانیان لە پشتی خەڵکی دەدەن، دیارە ئەمەش بۆتە دیاردەیەکی دیار لە ناو جیهانی ئیسلامی.

پێشەوا ئەبو ئومامە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (يَخْرُجُ مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَنَّهَا أَذْنَابُ الْبَقَرِ، يَغْدُونَ فِي سَخَطِ اللهِ، وَيَرُوحُونَ فِي غَضَبِهِ)[١].

واتە: لە ئاخیر زەماندا پیاوانێك لەم ئومەتەی من پەیدا دەبن، قامچیان پێیە هەر دەڵێی کلکی مانگایە، بەیانی تا نیوەڕۆ لە ڕقی خوادا دەبن و نیوەڕۆش تا ئێوارە لە تووڕەبوونی خوادا دەبن.

مەبەست لەم قامچیانە کە لە کلکی مانگا دەچن ئەو کێبلانەیە کە ئەمڕۆ بۆ لێدان و ئەشکەنجەدانی خەڵکی بەکار دەهێنرێت ، زۆر جاریش جەمسەری کێبلەکە تۆزێك ڕووت دەکرێت و، وایەرەکانی پرژ دەکرێتەوەو هەروەکو کۆتایی کلکی مانگای لێ دێت بە مەبەستی ئەوەی باش لە پشتی ئەو کەسە بچەقێت کە لێی دەدەن.

لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێ: (سَيَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ شَرَطَةٌ، يَغْدُونَ فِي غَضِبِ اللهِ، وَيَرُوحُونَ فِي سَخَطِ اللهِ، فَإِيَّاكَ أَنْ تَكُونَ مِنْ بِطَانَتِهِمْ)[٢].

---

(١) المعجم الكبير (٨/ ٢٥٧) برقم: (٨٠١٦).

(٢) صحيح: رواه الطبراني في (المعجم الكبير) (٨/ ١٣٦) برقم:(٧٦١٦).وصححه الألباني (١٦٨٢).

واتە: لە ئاخیر زەماندا جۆرە پۆلیسێك پەیدا دەبن لە تورەبوونی خوادا رۆژ بەسەر دەبەن و لە رقی خواشدا خۆریان لیٚ ئاوا دەبێت، خۆت بپارێزە نەكەیت لە دەست و پێوەندی ئەوانە بیت.

پێشەوا ثەوبان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: كاتیٚ ئومەتی من ئەو چەك و سیلاحەی كە لەگەڵ بێباوەران پێی دەجەنگێن و خستیانە لاوە یان بە واتایەكی تر لە جیاتی جەنگی بیٚ باوەران شەری برا كوژیان پیٚ كردو ناویان نا غەزا، ئەوە هەتا رۆژی دوایی ناحەسێنەوە ئەو فیتنەیەش لەناویان دەرناچیٚ و رۆژی دواییش بەرپا نابیٚ، هەتا كۆمەڵیٚ لە ئومەتی من دەچنە ریزی بێباوەرانەوە بەشێكی زۆر لەوان دەست دەكەن بە بت پەرستی لەو كاتەدا سیٚ كەس پەیدا دەبن لە ئومەتی من دەڵێن: ئێمە پێغەمبەرین بەڵام درۆ دەكەن كەس لە دوای من پێغەمبەر نیە.

وە لە چەندین فەرموودەی تردا پێغەمبەر(ﷺ) موژدەی ئاگری دۆزەخی داوە بەو قامچی و كێبل بە دەستانە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا، قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ، وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مُمِيلَاتٌ مَائِلَاتٌ، رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ، لَا يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ، وَلَا يَجِدْنَ رِيحَهَا، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا)[١].

واتە: دوو كۆمەڵ هەن لە ئەهلی ئاگر من نەمدیون، كۆمەڵێك قامچیان پێیە لە كلكی مانگا دەچێت و لە خەڵكی دەدەن پێی، وە ئافرەتانێك كە پۆشاك و جلیان لەبەردایە، بەڵام بەشی زۆری لەشیان رووتەو مەیلیان بۆ هەواو ئارەزوو و رابواردنەو كە دەرۆن بە رێگادا لەنجەو لار دەكەن تا زیاتر سەرنج رابكێشن، پرچیان لە دواوە كۆدەكەنەوەو لولی دەكەن و لەسەر سەریان دایدەنێن، هەروەك

---

(١) صحيح مسلم (٣/ ١٦٨٠) باب: النساء الكاسيات العاريات، برقم: (٢١٢٨).



بەرگی دووەم

پشتی حوشتر ئەو ئافرەتانە نە دەچنە بەهەشتەوەو نەبۆنیشی دەكەن، كە بۆنی بەهەشت لە دووری ئەوەندەو ئەوەندە دەڕوات .

پێشەوا نەوەوی دەڵێت: ئەم فەرمودەیە یەكێكە لە موعجیزەكانی پێغەمبەر(ﷺ) چونكە بەڕاستی چۆن هەواڵی دابوو ئاوا ڕوویدا، جا خاوەنانی قامچیەكان منداڵ و تاڵی دارو دەستی كار بەدەستانن[1].

پێشەوا عابیسی غیفاری(ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (بَادِرُوا بِالْمَوْتِ سِتًّا: إِمْرَةَ السُّفَهَاءِ، وَكَثْرَةَ الشُّرَطِ، وَبَيْعَ الْحُكْمِ، وَاسْتِخْفَافًا بِالدَّمِ، وَقَطِيعَةَ الرَّحِمِ، وَنَشْوًا يَتَّخِذُونَ الْقُرْآنَ مَزَامِيرَ يُقَدِّمُونَهُ يُغَنِّيهِمْ ، وَإِنْ كَانَ أَقَلَّ مِنْهُمْ فِقْهًا)[2].

واتە: دەست پێشی بكەن بە چاكە پێش ئەوەی شەش شت ڕوو بدات بێتە پێشەوە: دەسەڵات كەوتنە دەست كەسانی بێ نرخ و هیچ و پوچ ، زۆر بوونی پۆلیس و فرۆشتنی حوكم، بە سوك سەیركردنی خوێن ڕشتن و پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی و پەیدابوونی كەسانێكی تازە پێگەیشتوو كە قورئان دەكەنە ئامێر بۆ ئاوازەكانیان، كەسێكیان پێش دەخەن بۆ پێش نوێژی كە تەنها بە ئاوازی خۆش قورئانیان بۆ بخوێنێت هەر چەندە لە هەمووشیان زانیاری و تێگەیشتنی لە ئایین كەمترە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (إِنْ طَالَتْ بِكَ مُدَّةٌ، أَوْشَكَ أَنْ تَرَى قَوْمًا يَغْدُونَ فِي سَخَطِ اللهِ، وَيَرُوحُونَ فِي لَعْنَتِهِ، فِي أَيْدِيهِمْ مِثْلُ أَذْنَابِ الْبَقَرِ)[3].

---

(١) شرح صحيح مسلم (١٧/ ١٩٠).

(٢) صحيح: مسند الإمام أحمد (٣/ ٤٩٤) برقم: (١٦٠٤٠)، والطبراني في (الكبير) (١٨/ ٣٦/ ٦١) وقال الأرناؤوط: حديث صحيح.

(٣) صحيح: مسند الإمام أحمد (٢/ ٣٢٣) برقم: (٨٢٧٦)، وقال شعيب الأرناؤوط : إسناده قوي على شرط مسلم.

واتە: ئەگەر تەمەن مۆڵەتت بدات هێندەی نەماوە کەسانێك ببینیت، ڕۆژ بە ڕقی خوا دەبەنە سەر و ئێوارەش بە لەعنەتی خوا شتێکیان بە دەستەوەیە وەك کلکی مانگا .

ئەم فەرموودەیەش ئەگەرچی بە ڕاشکاوی باسی ئەوەی نەکردووە کە لە خەڵکی دەدەن، بەڵام حاڵیان لە قین و نەفرینی خوا دان، ئاماژە دەکات بۆ فرە دەست درێژی کردنیان و ستەمیان.

پێشەوا سەخاوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: (وَكَثْرَةَ الشُّرَطِ) واتە: زۆر بوونی پۆلیس ئەوانەن کە یارمەتی ستەمکاران دەدەن[1]..

ئەم فەرموودانە بە واتای ئەوە نایەت کە خەڵکی نەبێت بە پۆلیس بەڵکو یەکێك لە واجبەکانی مرۆڤ ئەوەیە کە پێویستە پارێزگاری بکات لە شارو نیشتیمانەکەی خۆی لە کەسی دزو گەندەڵ و خراپەکارو خوێنمژ، بەڵکو بە واتای ئەوە دێت کە ئەم جۆرە پۆلیسانە ستەم و لە خەڵکی دەکەن و، ئەوەندەی لە دەستیان بێت لە خەڵکی دەدەن و جوێنیان پێ دەدەن بەبێ هیچ هۆکارێك.

لەوانەیە کەسێك پرسیارمان لێ بکات و بڵێت: گوناهی پیاوانی پۆلیس چیە کە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە، لە کاتێکدا ئەوان پارێزگاری دەکەن لە خاك و وڵاتی شار؟

لە وەڵامی ئەو پرسیارە دەڵێم:

تاوانی ئەوان بۆ چوونە ناو ئاگری دۆزەخ و قەدەغەکردنیان لە چوونە بەهەشت پارێزگاری کردن نیە لە وڵات، بەڵکو وازهێنانیانە لە نوێژکردن و کردنی ئەو کارانەیە کە خوای گەورە پێی ناخۆشە وەکو خواردنەوەی ئارەق و داوێنپیسی و وەرگرتنی بەرتیل و ستەمکردنە لە خەڵکی.. بۆیە نابێ ئەوە لە بیر بکەین کە زۆربەی پۆلیسەکان لەوڵاتانی ئیسلامی نوێژنەکەرن و گوناهی گەورە ئەنجام دەدەن و فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە ناکەن، لە کاتێکدا دەسەڵاتیشیان هەیە.

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ١٢٧ .

# کەسانی فاسق و بێ دین خۆشەویست دەبن و مەدحیان دەکرێت لەناو کۆمەڵگادا

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر کەسی فاسق و مونافیق و دووڕوو خۆشەویست دەبن و هەمیشە مەدحیان دەکرێت لە نێو کۆمەڵگادا...

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (وَيُقَالُ لِلرَّجُلِ: مَا أَعْقَلَهُ، وَمَا أَظْرَفَهُ، وَمَا أَجْلَدَهُ، وَمَا فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ..)[1].

واتە: تاکو بە پیاوێك دەڵێن: چەند ژیرە؟! چەند ڕووخۆش و قسە خۆشە، چەند بە غیرەتە؟!، لە پێش خۆی هەڵی دەدەن و بە ناڕەواوە کەسەکە دەپێون، کەچی لە دڵیدا یەك گەردیلە باوەڕی تێدا نییە.

لەم ڕۆژەگارەی ئەمڕۆ زۆر ڕاشکاوانە باس لەم جۆرە کەسانە دەکرێت خوای گەورە پەنامان بدات..

کەمێك لە سیفەتی فاسق و بێدینەکان:

- دوژمنایەتی و حەسودی و دوژمنایەتی بەرامبەر بە باوەڕداران دەردەخەن.
- هەندێك جار گاڵتە بە خودا و پێغەمبەر دەکەن بەناوی نوکتە گێڕانەوە.
- درۆو بوهتان بەلایانەوە شتێکی ئاساییە.
- لە ماڵ بەخشین زۆر ڕەزیلن.
- کاتێك قسە دەکات درۆ دەکات.
- کاتێك پەیمانێك دەدات خیانەت دەکات.
- کاتێك تووشی ناخۆشیەك دەبێت لەگەڵ کەسێك ستەم دەکات و قسەی نەشیاوی پێ دەڵێت.

---

(١) صحيح مسلم (١/ ١٢٦) كتاب الإيمان، باب: رفع الأمانة، رقم الحديث: (١٤٣).

# پاڵپێوەنانی خەڵکی بۆ بەرنوێژی کردن

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر، بڵاوبونەوەی نەفامیە لە نێو خەڵکی، تەنانەت خەڵکی پێش نوێژێکیان دەست ناکەوێت پێش نوێژیان بۆ بکات، ئیتر پاڵ بە یەکترەوە دەنێن و بەڵام کەسیان ناچنە پێشەوە چونکە شارەزاییان نییە لە حوکمە شەرعییەکان و بەباشی نازانن قورئان بخوێننەوە.

سلامەی کچی الحر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يَتَدَافَعَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ لَا يَجِدُونَ إِمَامًا يُصَلِّي بِهِمْ)[1].

واتە: بە دڵنیایی لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر ئەوەیە خەڵکی لەسەر پێش نوێژی کردن پاڵ بە یەکترەوە دەنێن بۆ ئەوەی یەکێك پێشکەوێت و پێش نوێژیان بۆ بکات بەڵام کەسیان دەست ناکەوێت بۆ ئەوەی پێش نوێژیان بۆ بکات.

پێشەوا عەبدوڵڵای کوری عومەر (ﷺ) دەڵێت: ڕۆژگارێك دێت بەسەر خەڵکی کۆدەبنەوە لە مزگەوتەکان و نوێژ دەکەن، یەك باوەڕداریشیان تێدا نیە.

لەم ڕۆژگارە.. ئەگەر سەیری مزگەوتەکان بکەین زۆربەی ئەوانەی کە پێش نوێژی بۆ خەڵکی دەکەن کەسی نەفام و نەزانە، تەنانەت هەندێکیان نازانن قورئانیش بخوێنن، بەڕاستی ئەمەش گەورەترین کێشەیە لەم سەردەمە.. بۆیە پێشبڕکێکردنی خەڵك لەسەر پێشەوایەتی و پێش نوێژی کەسیان دەست ناکەوێت پێشەوایەتیان بۆ بکات پاڵ بە یەکتریەوە دەنێن و دەیانەوێت یەکێکیان پێشکەوێت بەڵام هەر یەکەیان بە هەر بیانوویەك بێت ناچێتە پێشەوە.

---

(١) ضعيف: سنن ابي داود(١/ ٤٣٥) باب: كراهية التدافع على الإمامة، برقم: (٥٨١). قال شعيب الأرناؤوط: إسناده ضعيف.

## لێک نزیکبوونەوەی کاتەکان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتیی بونەوەر کاتەکان لە یەکتری نزیك دەبنەوە، هەتا وای لێ دێت هەفتەو مانگ زۆر بە خێرایی دەڕوات..

زۆر جار بێ وەڵام ، ئەم پرسیارە بە مێشکی هەندێکمان دێت و دەڕوات ، لە سەدەی بیستەمداو پاش دانانی بیردۆزی ڕێژەیی تایبەت (النظرية النسبية الخاصة) لە لەلایەن زانای ئەڵمانی (ئەلبرێت ئەنیشتاین)ەوە ، وەرچەرخانێکی گەورە سەبارەت بە تێگەیشتنمان بۆ کات ڕوویدا.. ئەم بیردۆزە لە یەکێك لە بڕگەکانیدا باس لە کورت بونەوەو چونەوەیەکی کات (تقلص الزمن) دەکات بۆ تەنێك کە بە خێراییەکی یەکجار زۆری نزیك خێرایی ڕووناکی بە تاودانێکی ڕێك بڕوات، واتە: باس لەوە دەکات کە کات شتێکی ڕێژەیی (نسبی)یە و ڕەها (مطلق) نیە، بە واتایەکی تر کات لە سیستەمێکەوە بۆ سیستەمێکی تر لەناو هەمان ئەم گەردونەدا دەگۆڕێت .

بۆ تێگەیشتنی ئەمەش دەڵێین: ئەگەر پیاوێك سواری موشەکێکی ئاسمانی بێت کە خێراییەکی زۆر لە خێرایی ڕوناکیەوە نزیك بێت (خێرای ڕوناکی نزیکەی ٣٠٠,٠٠٠ کم / چرکە)، ئەو پیاوە گەشتێك بە ئاسماندا بۆ ماوەی مانگێك بکات، پاشان بگەڕێتەوە سەر زەوی، دەبینێت منداڵەکەی کە تەمەنی تەنها دوو ساڵ بوو لە کاتی دەرچونی موشەکەکەی ئەم بۆ ئاسمان، پاش گەڕانەوەی ئەم لە گەشتە یەك مانگیەکەی تەمەنی منداڵەکەی بووە بە (١٠) ساڵ !!

هەر چەندە ئەم شتە سەیرو نا ئاساییە لە کاتی بڵاوکردنەوەی ئەم بیردۆزەدا لە لایەن ئەنیشتاینەوە لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، لەلایەن زۆبەی زانا فیزیاییەکانی ئەو سەردەمەوە جێی بەرهەڵستیەکی زۆر بوو، بەڵام بەهۆی هەندێك تەکنەلۆژیای نوێ کە لە تاقیگە فیزیاییە گەورەکاندا بەکار هات و تیایدا هەندێك تاقیکردنەوە لەسەر گەردیلەی هایدرۆجین و تاقیکردنەوە لەسەر

تەمەنی یەکجار کورتی میزۆنەکان کرا، (ئەم تاقیکردنەوانە بابەتێکی دوورو درێژەو لێرەدا بواری باسکردنیان نیە، چونکە مەبەستمان لەم پەرتوکە تەنها نیشانەکانی ڕۆژی دواییە)، بۆیە ڕاستی بۆچونەکەی ئەنیشتاینیان دەربارەی ڕێژەیی کات سەلماند ...

ئێستاش با لە هەندێك لە ئایەت پیرۆزەکانی قورئان بڕوانین و بزانین ئایا لە قورئاندا کات چۆن باس کراوە.

شتێك کە زۆر بە ڕونی لە قورئانی پیرۆزدا باس کراوە بریتیە لە ڕێژەیی و جیاوازبوونی کات، خوای پەروەرگار دەفەرمووی: [ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٥﴾ ][1].

واتە: خودا هەموو کاروبارەکان بەڕێوە دەبات لە ئاسمانەوە تا زەوی (هەتا ڕۆژی دوایی) لە پاشان هەموو ئەو کاروبارە بەرز دەبێتەوە بۆ لای خۆی، لە ڕۆژێکدا کە ئەندازەکەی هەزار ساڵە لەو ساڵانەی ئێوە دەیژمێرن.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: [تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾][2].

واتە: فریشتەو جبریل سەردەکەون بۆ لای خوا لەڕۆژێکدا کە ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە.

هەردوو ڕووداوی (ئیسرا و میعراج) شەوڕەوی و بەرزبوونەوەی پێغەمبەرمان موحەممەد (ﷺ) بۆ ئاسمان، هەروەها بەرزکردنەوەی پێغەمبەر عیسا بۆ لای خودا بە ئاشکراو پاشان گەڕانەوەی بۆ سەر زەوی پێش هاتنی ڕۆژی دوایی، ڕێژەی بوونی کات دەسەلمێنن و پیشانی دەدەن کە قورئانی پیرۆز لە خوای گەورەو باڵادەستەوە سەرچاوەی گرتووە، ناگونجێت کە زیاتر لە (١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەرەوە شتێکی واسەیرو نا ئاسایی لەلایەن مرۆڤەوە هەستی پێبکرێت.

---

(١) سورة السجدة ، الآية : (٥) .

(٢) سورة المعارج ، الآية : (٤) .

ئەمڕۆ دەزانین کە کات بریتیە لە دووری (بعد)ی چوارەم و شتێکە لەگەڵ ماددەو شوێندا جیا ناکرێتەوە، هەروەکو چۆن ئێمە ناتوانین تەنێك بێنین درێژیەکەی لە پانی و بەرزیەکەی جیا بکەینەوە بە هەمان شێوەش هەموو تەنێك بە کاتەوە بەندەو لێی جیاناکرێتەوە، هەروەها بڕی کات شتێکی ڕێژەییەو (نسبی)یەو گۆڕاوە، دیسان ڕابردوو ئێستاو داهاتووی کاتیش شتێکی ڕێژەییەو لە کاتێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە، واتە: دەشێت ڕووداوێك لای کەسێك لە کاتی ئێستادا ڕوویدات، بەڵام کەسێکی تر هەمان ڕووداو لە داهاتوودا ببینێت، گریمان کەسێك لەسەر ڕووی خۆرەو تەقینەوەیەکی گەورەی سەر ڕووی خۆر دەبینێت، هەمان تەقینەوە کەسێکی سەر ڕووی زەوی پاش زیاتر لە (٨) خولەك تێبینی دەکات، کەواتە ئەو ڕووداوەی کە بینەرەکەی سەر ڕووی زەوی بە ڕووداوێکی ئێستا (حاضر) دەیبینێت، بە نیسبەت بینەرەکەی سەر ڕووی خۆرەوە ڕووداوێکی ڕابردووە.

لەو کاتانەی تەمەن درێژ دەبێت، تێکرای تەمەن ئێستا زۆر لەوە زیاترە کە (١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر هەبووە، ئەم زانیاریەش پێغەمبەر(ﷺ) پێی ڕاگەیاندووین، جا لە نێوان دەست پێك و کۆتایی سەدەی بیستەمدا جیاوازی و نەهامەتیەکی زۆر هەیە.

ڕۆژی دوایی نایەت تاکو کات بە خێرایی تێ دەپەڕێت، یان دەفەرموێ: دووریەکی زۆر لە کاتێکی کەم دا دەبڕدرێت، ئەمڕۆ فڕۆکەکانی سەرو دەنگ و شەمەندەفەرو وێنە داهێنراوەکان دەتوانن بتگوێزنەوە بۆ شوێنێکی دوور لە چەند کاتژمێرێکی کەمدا ، بە دڵنیایی و ئاسوودەیی دوور لە مەترسی، لە کاتێکدا ئەمە پێشتر چەند مانگی ویستووە، ئەمەی لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی پێکراوە هەموویان هاتونەتە دی.

ئەوە ڕوونە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی دا شتەکان لە کاتێکی کورت دا تەواو دەکرێن بەراورد لەگەڵ سەردەمەکانی تردا .

بەرگی دووەم

بەڵگە نەویستە کە بەهۆی داهێنانە زانستیەکانەوە هەموو پیشەییەکان دەتوانرێ بە کاتێکی کەم کارێکی زۆر ئەنجام بدرێت و ئەنجامەکەشی گەلێك باشتر بێت .

پێغەمبەر(ﷺ) لە چەندین فەرموودەی هاوشێوەی تریش ئاماژە بە هەمان مەبەست دەکەن وەکو دەفەرموێ: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَقَارَبَ الزَّمَانُ، فَتَكُونُ السَّنَةُ كَالشَّهْرِ، وَيَكُونُ الشَّهْرُ كَالْجُمُعَةِ، وَتَكُونُ الْجُمُعَةُ كَالْيَوْمِ، وَيَكُونُ الْيَوْمُ كَالسَّاعَةِ، وَتَكُونُ السَّاعَةُ كَاحْتِرَاقِ السَّعَفَةِ)[١].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا کات لێك نزیك دەبێتەوە ساڵ وەك مانگی لیٚ دێت و مانگ وەکو هەفتەی لیٚ دێت و هەفتە وەکو ڕۆژی لیٚ دێت و ڕۆژێك وەکو سەعاتێکی لیٚ دێت سەعاتێکیش وەکو سووتانی پوشی دارخورمای لیٚ دێت.

زانایانی ئیسلام چەند قسەو واتایەکیان بۆ وشەی نزیکبوونەوەی کات گوتووە لەوانەدا:

**یەکەم:** مەبەست بە نزیکبوونەوەی کات کەمبوونەوەی بەرەکەتە تیایدا[٢].

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت: بێگومان ئەم کەم بەرەکەتیە ئێستا لە سەردەمی ئێمە هەستی پیٚ دەکریٚ و هەیە، هەروەك دەبینین کە ڕۆژو شەوەکان چەند بە پەلە دێن و دەچن کە ئێمە نەمانبینیوەو نەمان زانیوە کە بەم جۆرەبیٚ لە ڕۆژگارەکانی پێشتر کە بەر لە ئێمە بووە[٣].

ئەگەر پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) لەو سەردەم وا بڵێت.. ئەی دەبێت لە ساڵی ٢٠٢٠ ئێمە چی بڵێین !

---

(١) صحيح ابن حبان (٢٥٦/١٥) ، رقم : (٦٨٢٤) ، وقال الشيخ شعيب الأرناؤوط : إسناده صحيح عى شرط مسلم ..

(٢) معالم السنن (٦/ ١٤١) وجامع الأصول، لإبن الأثير (١٠/ ٤٠٩) وفتح الباري (١٣/ ١٦).

(٣) فتح الباري (١٣/ ١٦).

**دووەم:** مەبەست لە نزیکبوونەوەی کات لەم فەرموودە ئەوەیە: لە سەردەمی موحەممەدی مەهدی و پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) ڕوودەدات لەبەر تام وەرگرتنی خەڵك لە ژیانداو بڵاوبوونەوەی دادپەروەری و ئەمن و ئاسایش[1].

**سێیەم:** مەبەست لەم فەرموودەیە نزیکبوونەوەی ڕەوشی خەڵکەکەیەتی لە کەم دینیدا تا ئەوەی کە یەکێ تیایدا نابێ کە فەرمان بە چاکە بکات و ڕێگری لە خراپە لەبەر زۆری ناشەرعی و خراپەکاری و بەرچاوی خاوەنەکانی کە ئەوەش لەو ساتە ڕوودەدات کە زانست پەیدا کردن وازی لێ دەهێنرێ و خەڵك بە نەزانی ڕازی دەبن لەبەر ئەوەی خەڵك یەك ئەندازە نین لە زانستدا.

**چوارەم:** مەبەست لەم فەرموودە نزیك کەوتنەوەی خەڵکی ئەو سەردەمە بەهۆی زۆربوونی هۆکارەکانی گەیاندن و سەیارەو تەیارەی خێرا کەوا شوێنی دوور بە هۆیانەوە نزیك دەبێتەوە[2].

**پێنجەم:** مەبەست لەم فەرموودە کورت بوونەوەی کاتە، پەلەپیەکەی پەلەیەکی ڕاست و دروستە کە لە کۆتایی بوونەوەر ڕوودەدات.

**شەشەم:** مەبەست لەم فەرموودە ئەوەی کە تەمەنی مرۆڤەکان کورت دەبێتەوە، واتە: مرۆڤ لە تەمەنێکی بچوك کۆچی دوایی دەکات و دەمرێت[3].

جا ئەمە تا ئێستا ڕووی نەداوە بەڵگەشمان ئەوەیە کە هاتووە لە فەرموودە کەوا کاتێ کە دەجال دێ ڕۆژەکان درێژ دەبنەوە تاکو ڕۆژ وەکو ساڵی لێ دێت، وە وەکو مانگ و وەکو هەفتە لە درێژیدا جا هەروەك کە ڕۆژەکان درێژ دەبنەوە بە هەمان شێوە کورتیش دەبنەوە[4].

---

(١) فتح الباري (١٣/ ١٦).

(٢) إتحاف الجماعة (١/ ١٤٢)، والعقائد الإسلامية (لا ٢٤٧).

(٣) التقاء المسيحين في آخر الزمان، (لا ١٦).

(٤) جامع الأصول (١٠/ ٤٠٩).

پێشەوا ئیبنو ئەبی جەمرە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: لەوانەیە کە مەبەست بە نزیك کەوتنەوەی کات، هەروەك کە هاتووە لە فەرمووده کە قیامەت دانایە تاکو ساڵ وەکو مانگ کورت دەبێتەوە، جا لەسەر ئەمە کورت بوونەوەی کات وا دەبێ کە بەر چاوبێ وە واش دەبێ کە نادیار بێ، جا بەر چاویەکەی تا ئێستا ڕووی نەداوە، لەوانەیە لە نیشانەکانی پێش هاتنی ڕۆژی دوایی، ماوەیەکی هەیە لە سەرەتای دەرکەوتنی کە ئەوەش زانایانی ئایینی دەیزانن، وە کەسانێك کە پیتۆڵن لە هۆکارەکانی دونیایی لەبەر ئەوەی ئەوان دەبینن ئەو کەسانەی کەوا ئیش و کاریان دەکرد ناتوانن بەم ئەندازەیە بکەن لەم کات کورتبوونەوەدا و گازاندەی کورتی دەکەن و هۆکارەکەی نازانن، وە لەوانەیە کە هۆکارەکەش بێهێزی بڕوا بێ لەبەر زۆر بوون و بەدیار کەوتنی کارە پێچەوانەکانی شەرع لە چەندین ڕوودا، لە زۆربەی کاتدا کە لەمەشدا حەڕامێکی تەواو هەیە لەگەڵ پێچەوانەکانی کە بەرچاوەو وون نیە تا ئەوەی زۆرێك لە خەڵك لە هیچ شتێك ناسڵەمێتەوە، وە توانای بەر دەستەکردنی هەر شتێکی هەبوو یەکسەر هێرشی بۆ دەکات و هیچ گوێ نادات بە هیچ شتێك.

سەدان ساڵ لەمەوبەر بۆ پەیوەندی نێوان خێڵەکان چەند هەفتەیەکی دەویست کەچی ئێستا لە نزیکەی چرکەیەك دا ڕێك دەخرێت وەکو ئینتەرنێت و مۆبایل و.. هتد، وە هەموو هۆکارە تەکنەلۆجیاکانی پەیوەندی کردن.

نمونەی ئەمەش جاران ڕاگەیاندن لە نێوان کیشوەرەکان هەفتەیەکی دەویست، بەڵام لەم سەردەمەی ئێمەدا لە سایەی مۆبایل و تەلەفۆن و هۆکارە نوێیەکانی ڕاگەیاندن وای لێ هات کرداری پێوست کردن لە چەند چرکەیەك ئەنجام بدرێت.

لەم سەردەمەدا مرۆڤ دەتوانێ فرۆکەی وا دروست بکات خێراتر بێت لە دەنگ، هەروەها دەتوانێ بە هۆی ئامێرەکانی گەیاندنی خێراوە وەك شەمەندەفەرە خێراکان و ئامێری گەیاندنە پێشکەوتنەکانی دیکە بگاتە شوێنە زۆر دوورەکان لە ماوەی چەند کاتژمێرێکی کەم، کە لە ڕابردوودا لە گەشتی چەند مانگی دا دەیبڕی، جا بەم پێیە ئەوەی لەم فەرموودەدا هاتووە جێی خۆی گرتەوە بە

تەواوی، دەتوانریٚ گوزارەی (یتقارب الزمان) لەم فەرمووده پیرۆزه تیٚ بگەین، بەم واتایه ئەو گوزارەیه که پێغەمبەر(ﷺ) بەکاری هێنا وا دەگەیەنیٚ که ئەو کارانەی مرۆڤ پێی هەڵدەستیٚ له ئاخیر زەماندا له ماوەیەکی کورت تردا ئەنجام دەدرێت وەك له جاران، ڕاستیەکەشی ئەو گەشه سەنده زانستیەی ئێستا ئەو توانایەی بەخشیه مرۆڤ که به کارێکی زۆر هەڵبستێت و به شێوازێکی چاکتر .

ئەم فەرموودانه که باس له لێك نزیکبوونەوەی کات دەکەن لەلایان زاناکانەوه به چەند شێوازێکی جیاواز لێکدراونەتەوه که پێمان وایه گونجاوترینیان ئەوەیه که باس له ئەمڕۆی خۆمان دەکات که توانراوه به هۆی هۆکارەکانی گواستنەوەی پێشکەوتووی ئەم سەردەمه وەکو ئۆتۆمبیل و فڕۆکەو شەمەندەفەرو مۆبایل و تەلەفۆن و مانگی دەستکردەوه.

نمونەی ئەمەش جاران ڕاگەیاندن له نێوان کیشوەرەکان هەفتەیەکی دەویست، بەڵام لەم سەردەمەی ئێمەدا له سایەی ئینتەرنیت و هۆکاره نوێیەکانی ڕاگەیاندن وای لیٚ هات کرداری پێوست کردن له چەند چرکەیەك ئەنجام بدرێت.

لەم سەردەمەدا مرۆڤ توانی فرۆکەی وا دروست بکات خێراتر بێت له دەنگ، هەروەها توانی به هۆی ئامێرەکانی گەیاندنی خێراوه وەك شەمەندەفەره خێراکان و ئامێری گەیاندنه پێشکەوتنەکانی دیکه بگاته شوێنه زۆر دوورەکان له ماوەی چەند کاتژمێرێکی کەمدا که له ڕابردوودا له گەشتی چەند مانگی دا دەیبڕی جا بەم پێیه ئەوەی لەم فەرموودەدا هاتووه جێی خۆی گرتەوه به تەواوی، دەتوانریٚ گوزارەی (یتقارب الزمان) لەم فەرمووده پیرۆزه تێبگەین، بەم مانایه ئەو گوزارەیه که پێغەمبەر (ﷺ) بەکاری هێنا وا دەگەیەنیٚ که ئەو کارانەی مرۆڤ پێی هەڵدەستیٚ له ئاخیر زەماندا له ماوەیەکی کورت تردا ئەنجام دەدرێت وەك له جاران، ڕاستیەکەشی ئەو گەشه سەندنه زانستیەی ئێستا ئەو توانایەی بەخشیه مرۆڤ که به کارێکی زۆر هەڵبستێت و به شێوازێکی چاکتر.

## ئیفلیج بوون زۆر دەبێت و بڵاودەبێتەوە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر خەڵکێکی زۆر توشی ئیفلیجبوون دێن و بە ڕێژەیەکی بەرچاو بڵاودەبێتەوە..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يَفْشُوَ الْفَالِجُ)[١].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی ئیفلیج بوون بڵاو دەبێتەوە..

لە ریوایەتێکی تر فەرموویەتی: (من اقتراب الساعة شر الفالج..)[٢].

ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوونە کە لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی ئیفلیج بوون زۆر دەبێت..

خوێنەری بەڕێز: هەر چەندە ئەم فەرموودانە جێگای متمانە بوون نین، چونکە زیاتر کاریگەری شیعە بەسەر ئەم وتانەوە هەیە، هەر چەندە لە لێکۆڵینەوەی فەرموودەدا ئەم فەرموودەیە بێ هێزە..

ئیفلیجی یان شەلەلی (بە ئینگلیزی paralysis) بریتیە لە دەستدانی تەواوی چالاکیەکانی ماسولکە لە کۆمەڵێك ماسولکە یان زیاتر.

لەوانەیە ببێتە هۆی لەدەستدانی هەست یان لە دەستدانی جووڵە لە ماسولکەی تووشبوو، لەوانەیە بەهۆی زەبرێك یان شکانی بڕبڕەی پشت بێت[٣].

---

(١) ضعيف: الكافي: ٣ / ٢٦١، للشيخ أبي جعفر محمد بن يعقوب بن إسحاق الكُليني، المُلَقَّب بثقة الإسلام، المتوفى سنة: ٣٢٩ هجرية ، طبعة دار الكتب الإسلامية، سنة: ١٣٦٥ هجرية/شمسية، طهران إيران.

(٢) ضعيف: الديوان الجامع لأطراف الأحاديث الضعيفة (٤١١/٢)، وقال عبدالكريم بن عبدالرحمن بن إبراهيم الغانم حديث ضعيف.

(٣) ئیفلیجی ویکیپیدیا ئینسایکلۆپیدیای ئازاد.

# بازاڕو فرۆشگەکان لەیەکتر نزیک دەبنەوە

ئەگەر لە سەردەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) واتای ئەو فەرمودەیە نەزانرابێ وەك پێویست کە بەچاوی خۆیانی ببینن، ئێستا زۆر چاك دەزانرێ.

بازاڕەکان لە یەکتر نزیك دەبنەوە واتای چیە؟

ئایا زەوی لەیەکتر نزیك دەبێتەوە؟ نەخێر، بەڵکو هاتووچۆو گەیشتنی مرۆڤەکان بەبازاڕەکاندا زۆر بە نزیکی و زۆر بە ئاسانی دەبێ، بازاڕەکان وەك لەلای یەکبن وایە، بەهۆی چی؟

بەهۆی هۆکارەکانی هاتووچۆ، ئەگەر سەد ساڵ پێش ئێستا یەکێك پێویستبایە لێرەوە بچێتە بەغدا دەبوایە بەلای کەم ١٠ ڕۆژی پێ بچێ بەپێیان تاوەکو دەچێ و دێتەوە! بەڵام ئێستا بەسەیارە دەتوانی بەیانی زوو بڕوات و بۆ نیوەڕۆ بێتەوە، ئەوە لێك نزیك بوونەوەی بازاڕەکانە، ئێستا یابان قیتاری دروست کردوو لەیەك سەعاتدا ٤٠٠ کیلۆمەتر دەڕوات، بەجۆرێك لەیەك ڕۆژدا شانزە هەزار کەس دەگوازێتەوە.

نزیك بوونەوەی بازاڕیش لەم فەرمودەیەدا هەروەك نزیك بونەوەی کات وایە، ئەوەتا بازاڕەکانی جیهان ئەمرۆ بە هۆی هۆکارەکانی گەیاندن و پەیوەندی کردنەوە، وەك یەك بازاڕیان لێ هاتووەو تەواو لێك نزیك بوونەتەوە، بە ڕادەیەك کە سەرکەوتن یان دابەزینی نرخی کاڵاو دراوەکان لە هەر بازاڕێکی جیهانداو کار دەکاتە سەریان، بازاڕەکان بەردەوام ئاگادارن لە یەکتر بەمەش بازاڕەکان لە یەکتر نزیك بوونەتەوەو کاتیش لێك نزیك بۆتەوە، کە ئەمەش بە پێی فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) یەکێکە لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی .

نزیك بوونەوەی بازاڕیش وەکو نزیکبونەوەی کات وایە، ئەوەتا بازاڕەکانی جیهان ئەمرۆ بە هۆی هۆکارەکانی گەیاندن و پەیوەندی کردنەوە، وەك یەك

بازاڕیان لێ هاتووەو تەواو لێك نزیك بوونەتەوە، بە ڕادەیەك کە سەرکەوتن یان دابەزینی نرخی کاڵاو دراوەکان لە هەر بازاڕێکی جیهانداو کار دەکاتە سەریان، وە بازاڕەکان بەردەوام ئاگادارن لە یەکتر، بەمەش بازاڕەکان لە یەکتر نزیك بوونەتەوە و کاتیش لێك نزیك بۆتەوە، کە ئەمەش بە پێی فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) یەکێکە لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی.

سەدان ساڵ لەمەوبەر بۆ پەیوەندی نێوان خێڵەکان چەند هەفتەیەکی دەویست کەچی ئێستا لە نزیکەی چرکەیەك دا ڕێك دەخرێت وەکو ئینتەرنێت و مۆبایل و.. هتد، وە هەموو هۆکارە تەکنەلۆجیاکانی پەیوەندی کرد.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَظْهَرَ الْفِتَنُ، وَيَكْثُرَ الْكَذِبُ، وَتَتَقَارَبَ الْأَسْوَاق..)[١].

واتە: کۆتایی بوونەر نایەت تا ئاشوب سەر هەڵنەدات و درۆ زۆر دەبێ و بازاڕەکان لێك نزیك نەکەونەوە.

پێشەوا حمود التویجری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

نزیك کەوتنەوەی بازاڕەکان هەروەك واتاکەی هاتووە لە فەرموودەیەکی بێهێزدا کە واتای ئەوەیە کڕین و فرۆشتنەکەی کەم دەبێ و قازانجەکەی کەم دەبێتەوە، وە ئەمە ئاماژەیەکە بەوەی کە ڕوودەدات لەسەردەمی ئێمەدا بەهۆی نزیك کەوتنەوەی خەڵکی زەوی لە یەکەوە بە هۆکارەکانی بار هەڵگرانی ئاسمانی و زەوی و دەزگاکانی کارەبایی کەوا دەنگەکان دەگوازنەوە وەکو ڕادیۆو تەلەفزیۆنە ئاسمانیەکان کە بەهۆیانەوە بازاڕەکان لێك نزیکەوتونەوە کە ئەوەش وای لێ دێت کەوا نرخی هەر شتێ کە گۆڕانی بەسەر دابێ ئەوا

---

(١) صحيح ابن حبان (١٥/ ١١٤) برقم: (٦٧١٨). إسناده صحيح، رجاله ثقات رجال الشيخين غير سعيد بن سمعان فقد روى له البخاري في «رفع اليدين» وأصحاب السنن غير ابن ماجة وهو ثقة. وقال الأرناؤوط: إسناده صحيح.

هەموو بازرگانەکانی ولاٌتەکانی تر دەزانن یان زۆربەیان لەسەر تا سەری زەویدا جا نرخەکەی زیاد دەکەن، ئەگەر زیاد بیٚ وەکەم دەکەن گەر کەم بیٚ وە بازرگان هەیە کە سەفەر دەکات بە سەیارەکان بۆ بازاڕەکان لە ولاٌتانی تردا کە ماوەی چەند ڕۆژێك دوورەو کەل و پەلی خۆی دەکڕیٚ و دەگەڕێتەوە بە ماوەی ڕۆژێك یان چەند کاتژمێرێك، وە دەڕوات بە فڕۆکەکان بۆ بازاڕەکانی ولاٌتان کە ماوەی مانگێك لێیەوە دوورەو کارەکانی ئەنجام دەداو دەگەڕێتەوە لە ماوەی ڕۆژێك یان چەند ساتێك دا.

جا بەڕاستی بازاڕەکان نزیك کەوتونەتەوە لە سیٚ ڕوودا:

**یەکەم:** لە ڕووی پەلە کردنی نرخەکەی لە زیادەو کەمیدا.

**دووەم:** پەلەیی ڕۆیشتن و گەیشتن لە بازارێك بۆ بازاڕێکی تر هەر چەند ماوەکەی دوور بیٚ.

**سێیەم:** نزیك بوونەوەی هەندێك لە هەندێکیان لە نرخدا، وە چاو لێکردنی خاوەنەکانیان لە نرخەکانیان لە زیادکردن و کەمکردندا، خوای گەورەش لە هەموو کەسێك شارەزا ترە[1].

تەنانەت نزیکبوونەوە بەهۆی کەمی کاتی تاڵ و گۆڕ کردنی کالاٌکان، کە بەهۆی زانست و تەکنەلۆجیاوەو ئەمەش بازارەکانی سەر ئینتەرنێت دەگرێتەوە کە کالاٌو پێداویستیەکان بە ماوەیەکی کەم دەکڕرێن و دەفرۆشرێن وەك ئەوە وایە ئەو بازاڕە لێت نزیك بێت هەر چەندە لەوپەڕی دونیاش بێت بە ماوەیەکی کەم کالاٌکە دەگاتە دەستت.

پاکو بێگەردی بۆ خوای گەورە کە هەموو موعجیزەی پێغەمبەرەکەی وەکو خۆی هاتە دی.

---

(١) إتحاف الجماعة (١/ ٤٩٨ ٤٩٩).

## پیاوانی چاک غەریب دەبن و بەسەیر تەماشا دەکرێن لەناو خەڵکدا!

هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، دینی خوایان بەباشترین شێوە گرت و بەرجەستەیان کرد لە ژیانی خۆیاندا، دوای ئەوانیش تابیعین هاتن، خوای گەورە بەوان جاهیلیەتی یەکەمی نەهێشت و دەسەڵاتیان گرتە دەست لەسەر زەویداو پڕیانکرد لە دادپەروەری و نوری خوایی، پاش ئەوەی کە پڕ بوو لە گومڕایی و ستەم و تاوان و تاریکی.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری مەسعود (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (إِنَّ الْإِسْلَامَ بَدَأَ غَرِيبًا وَسَيَعُودُ غَرِيبًا كَمَا بَدَأَ فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ قِيلَ وَمَنْ الْغُرَبَاءُ قَالَ النُّزَّاعُ مِنْ الْقَبَائِلِ)[1].

واتە: ئیسلام بەغەریبی دەرکەوتوەو پەیدابووە بەغەریبیش دەگەڕێتەوە هەروەکو دەستی پێکردوە، خۆشبەختی بۆ غەریبەکان (طوبى)[2]، گوتیان: غەریبەکان کێن؟ فەرموی: کۆمەڵە خەڵکانێکن لەناو کۆمەڵگەدا.

کاتێك کار گەیشتە ئەوە، باوەڕداری ئەو کاتە وەکو باوەڕداری کاتی پێغەمبەر (ﷺ) وان، چونکە ئەو کۆمەڵە کەسانە کەمن لەناو کۆمەڵگەدا، کۆچەرو دەربەدەرن لەناو کەس و کاری خۆیان و ماڵ و سەروەت و سامان و خاك و وڵاتیاندا، باوەڕدار ئەوەیە کە باوەڕی بەخوا هێنابێت و خواو پێغەمبەرەکەی بەڕاست بگرێت و بزانێت.

---

(١) مسند الإمام أحمد (١/ ٣٩٨) برقم: (٣٧٨٤). وقال الشيخ شعيب الأرناؤوط: إسناد أحمد صحيح على شرط مسلم رجاله ثقات رجال الشيخين وإسناد ولده صحيح.

(٢) (طوبى) دارێکی زۆر گەورەو تایبەتە لەبەهەشتدا بۆ ئەو غەریبانەیە کە ئیسلام بە غەریبی دەهێننەوە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لَا تَزَالُ مِنْ أُمَّتِي أُمَّةٌ قَائِمَةً بِأَمْرِ اللَّهِ، لَا يَضُرُّهُمْ خِلَافُ مَنْ خَالَفَهُمْ وَلَا مَنْ خَذَلَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ عَلَى ذَلِكَ)[1].

واتە: بەردەوام لە ئومەتەکەمدا کۆمەڵێك دەبن دامەزراو دەبن لەسەر فەرمانی خوا، ئەوانەی کە دەیانەوێت شکستیان بەسەردا بهێنن هیچ زیانێکیان پێناگەیەنن، ئەوانەشیان کە ژیان دەوەستێنەوە ناتوانن زەرەریان پێبگەیەنن تا فەرمانی خوا دێت و دونیا کۆتایی پێدێت، کۆمەڵێك دەبن و بەردەوام دەبن لەسەر دینی خوا.

ئەو ئیسلامە هات زۆر غەریب بوو لەناو ئەهلی مەککە بەغەریبی هات، زۆر جێگای سەرسوڕمان بوو، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لەناو مەککە بانگەوازی دەکرد بۆ ئیسلام خەڵکێك گاڵتەیان پێ دەهات و زۆر بەسەیر تەماشایان دەکرد، تەنها چەند کەسێك بوون، جا ئەم ئایینە لە بچوکی بەرەو گەورەیی هات و لەغەریبی ڕزگاری بوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ (وسيعود غريباً) ئیسلام هەروەکو چۆن بەغەریبی پەیدابوو لە کۆتایی دونیادا بەغەریبی پەیدا دەبێتەوە!

زۆر کەس هەیە شیکردنەوەی ئەم فەرمودەیە بە هەڵە تێدەگات و دەڵێت: ئیسلام بەغەریبی هاتووەو بەغەریبی دەڕواتەوە، نا.. ئەم دەستەواژەیە هەڵەیە، نافەرموێ: (يرجع) دەفەرموێ: (يعود) واتە: دەگەڕێتەوە بۆ مەیدانی ژیان، وە مزگێنی بۆ ئەو غەریبانەی کە لەکۆتایی دونیادا هەڵدەستن بەهێناوەی ئیسلام و خەڵك پێی سەیر دەبێ.

ئەوانە کۆمەڵە خەڵکێکن هەوڵدەدەن بۆ هێنانەوەی ئیسلام لە ئاخیر زەماندا، ساڵحن، ئەوانەی کە بێ فەرمانیان دەکەن و سەرپێچیان دەکەن زیاترن لەوانەی گوێڕایەڵییان دەکەن.

ئەوان بەئاگان و دەزانن غەریبن لەناو کۆمەڵگەو کەسوکاردا، خەڵکانێکی زۆر کەمن و دوژمنانیان زۆر زۆرن، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ناویناون غەریبەکان و سەرکەوتووەکان و سەرفرازان لەدونیادا، ئەمانەش هەمووی ئەوە دەگەیەنێت کە

(١) صحيح: مسند أبي يعلى (١٣/ ٣٧٥) برقم: (٧٣٨٣). وإسناده صحيح.

بەرگی دووەم

کۆمەڵە کەسانێکی کەمن، پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: قاضي عياض فەرمویەتی: دیارە فەرمودەکە ئەوەی لێ تێدەگەین کە ئیسلام دەستی پێکرد لەچەند کەسانێکی کەمەوە، سەردەم و دەوریش وا دەگۆڕێت کە دین لاواز دەبێت وەکو ئەو سەردەمەی دەستییپێکردووەو خەڵکانێکی کەم دەمێننەوە لەسەر دینی ڕاست و ڕەوان هەروەکو چۆن دەستی پێکردووە.

ئەو کۆمەڵانە غەریبن لەناو کۆمەڵگەدا، باوەڕ لەناخی دڵیاندا جێی خۆی گرتووەو بەردەوام لەگوفتارو کردارياندا ڕەنگدەداتەوە، هەروەکو شاعیر وتویەتی:

ملكنا أقــــاليم البلاد فــأذعن.....لنا رغــبة أو رهبة عظـــماؤها

فلما إنتهت أيامنا علقــــت بنا.....شـدائد أيام قــليل رضـــاؤها

وصرنا نلاقي النائبات بـــأوجه.....رقاق الحواشي كاد يقطر ناؤها

إذا ما هممنا ان نبوح بما جنت.....علينا الليالي لم يدعنا حــياؤها

لەسەردەمی غەریبەکان ئەمانەش ڕوودەدەن:

خۆڕوتکردنەو خۆڕازاندنەوەی نەفامی ئەمەش دەستورو هەڵسوکەوت و خۆدەرخستن و ڕەوشتی خەڵکی کۆمەڵگەکانە لەباری ژیانی ڕۆژانەیاندا.

پێشەوا ئیبنو جەوزی دەڵێت: شەش باسکردن لەسەر ئەمە هاتووە:

١) پێشەوا موجاهید دەڵێت: ئافرتان دەردەچوون بۆ بازاڕو دەرەوەو تێکەڵ بەپیاوان دەبون.

٢) پێشەوا قەتادە دەڵێت: ڕەوت و ڕۆشنێکە ئافرەت خۆی دەردەخات و لەشی دەردەکەوێت.

٣) پێشەوا ئیبنو ئەبی نەجیح دەڵێت: لەنج و لارکردن دەگرێتەوە.

٤) پێشەوا کەلبی دەڵێت: ئافرەت جلێکی لەلوئلوئو سەدەف لەبەر دەکردو دەردەچووە دەرەوە.

٥) پێشەوا موقاتیل دەڵێت: ئافرەت سەرپۆشی ئەدا بەسەریدا و زوڵف و گەردەن و سنگی بەدەرەوە بووە.

٦) پێشەوا فەراء دەڵێت: جلوبەرگێکی گرانبەهایان دەپۆشی و هیچ لەشیانی دانەدەپۆشی.

جا ئەمانەی کە تابیعینەکان گوتویانە بەڕاستی مشتێکە لەخەرمانێك لەوەی کە لەم ڕۆژگارەدا دەرکەوتون و زۆر ئاشکرابوون لەهەموو ڕویەکەوە.

هەروەکو گوتراوە:

إذا كان ترك الدين يعني تقدما.....فيا نفس موتي قبل أن تتقدمي

واتە: ئەگەر وازهێنان لە دین بەواتای پێشکەوتن بێت..ئەی نەفس بمرە پێش ئەوەی پێش بکەوێت.

حمية الجاهلية: خۆشەویستی و توڕەبوونی نەفامی، ئەمەش ئەو بیروباوەڕە نەفامییانە دەگەڕێتەوە کە لەسەر شتی ناهەق و شتی لاوەکیەوە هیچ پەیوەندیەکی بەدینەوە نیە، لەسەر قەوم و گەل و هۆزو براو برادەر هەڵدەچن و تێکدەچن لەکاتێکدا ئەگەر هیچ پەیوەندیشیان بەدینەوە نەبێت یان ئەگەرچی ئەوانیش ناهەقی بکەن بەرامبەر بە خەڵکانێکیتر کە ئەمڕۆ سەرتاسەری دونیای گرتۆتەوە.

پێشەوا سەید قوتب (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: هەست و توڕەبوونی نەفامی بەشێوەیەك بوو هاوکاری و یارمەتیدانی یەکتری لەسەر خراپەو جەنگ و دوژمنایەتی دەگرتەوە، زیاتر لەوەی کە یارمەتی و هاوکاریکردنی یەکتر بێت لەسەر کاری خێرو چاکەو لەخوا ترسان، هاوپەیمانێتیش دەکرا لەسەر سەرخستنی یەکتری لەناهەقدا پێش هەق و ڕاستی، نازانین کە هاوپەیمانیەتیەك کرابێتن لەسەردەمی جاهیلیدا لەسەر هەق و ڕەوا بوویێت و پەیمانیان بەستبێت، ئەوەش شتێکی ئاساییە لە کۆمەڵگایەکدا کە هیچ پەیوەندییەکیان نەبوبێت بەخواو دینەکەوە، ڕەوشت و هەڵسوکەوتیشیان دروست نەدەبوو لەسەر خواپەرستی.

## بەدرۆخستنەوەی قەزاو قەدەر و
## بڕواکردن بە بورجەکان

یەکێك لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی قەزاو قەدەر بە درۆ دەخرێتەوە.

**قەزاو قەدەر:** بریتییە لە ئەندازە گیری و مەزەندەو بڕیاری خوای گەورە، سەبارەت بە دروستکراوەکانی بەپێی زانایی پێشینەو بەگوێرەی کاربەجێی و دانایی خۆی.

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: (أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي بَعْدِي خَمْسًا: تَكْذِيبٌ بِالْقَدَرِ، وَتَصْدِيقٌ بِالنُّجُومِ)[1].

واتە: لەدوای خۆم لە ئومەتەکەم دەترسم لە پێنج شت لەوانە خەڵکی قەدەر بە درۆ دەخەنەوە، پاشان باوەڕ بە ئەستێرە ناسەکان دەکەن.

بەڵێ.. بەشی زۆری خەڵکی ئەمڕۆ هەتا بەخت گرتنەوەو جادووگەری و قاوە خوێندنەوەو بورج گرتنەوە وەستا بێت باوەڕ بە قەزاو قەدەری خوایی ناکەن.

خوای گەورە دەفەرموێ: [إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾][2]. واتە: ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازەگیری دروستکردووە.

باوەڕهێنان بە قەزاو قەدەر ئەم خاڵانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

ڕێسای یەکەم: باوەڕهێنان بەوەی خوای گەورە زانیاری دەربارەی هەموو شتێك هەبووەو هەیە بەوردو درشتیەوە لەئەزەلەوەو هەتا هەتایە، خوای گەورە

---

(١) مسند أبي يعلى (٧/ ١٦٢) برقم: (٤١٣٥) وقال: إسناده ضعيف.

(٢) سورة القمر: ٤٩.

دەفەرموێ: [أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ].

ڕێسای دووەم: باوەڕهێنان بەوەی خوای گەورە سەرجەم زانیاریەکانی دەربارەی ژیان و بوونەوەر لە (لوح المحفوظ) تۆمارکردووە، خوای گەورە دەفەرموێ: [أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَٰبٍ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ][1].

ڕێسای سێیەم: باوەڕهێنان بەوەی هەر شتێك لەبونەوەردا ڕوودەدات بە ویستی خوای گەورەیە، خوای گەورە دەفەرموێ: [قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٌ وَقَدْ بَلَغَنِيَ ٱلْكِبَرُ وَٱمْرَأَتِي عَاقِرٌ قَالَ كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ][2].

ڕێسای چوارەم: باوەڕهێنان بەوەی هەرچی لە بونەوەردایە بەخۆی و سیفەت و جوڵەیەوە دروستکراوی خوایە، خوای گەورە دەفەرموێ: [ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ][3].

ڕێسای پێنجەم: باوەڕهێنان بەوەی هەرچی لە بونەوەردا ڕوودەدات سەبارەت بەخوای گەورە چاکەو خێرەو بەپێی کاربەجێی و دادگەریی خۆی ئەنجامی دەدات، خوای گەورە ئەفەرموێ: [كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ][4].

پێشەوا ئیبنو دەیلەمی بۆمان دەگێڕێتەوە کە جارێکیان چووەتە لای ئوبەی کوری کەعب (ﷺ) پێی فەرمووە: ئەگەر خوای گەورە خەڵکی ئاسمانەکان و زەویەکەی سزا بدات، سزایان دەدات و ستەمیان لێناکات، وە ئەگەر ڕەحمیان

---

(١) سورة الحج: ٧٠.

(٢) سورة آل عمران: ٤٠.

(٣) سورة الزمر: ٦٢.

(٤) سورة البقرة: ٢١٦.

بەرگی دووەم

پێ بکات، ئەوا ڕەحمەتەکەی لە کردەوەکانیان چاکترە بۆیان، وە ئەگەر هێندەی چیای ئوحد ئاڵتون لە پێناوی خودا ببەخشێتەوە، خوا لێی وەرناگرێت هەتا باوەڕ بە قەدەر نەهێنێت و نەزانێت کە ئەوەی توشت دەکات بۆ ئەوە نیە بەهەڵەتدا ببات، وە ئەگەر لەسەر غەیری ئەم باوەڕە بمرێت دەچێتە ناو ئاگرەوە.

بۆیە زانستیانە سەلمێنراوە، کە پەنا بردن بۆ پێشبینی و بورجەوە دەبێتە هۆی زۆرێك لە زیانی دەروونی کاریگەر، ئەو کەسەی باوەڕی بە بورجەکان هەیە، هەمیشە شڵەژاو و ناجێگیرەو بەتەمای ئەنجامی چاوەڕوانکراوە؟

بەڵام کاتێك ئەنجامەکان پێچەوانەی ئەوە دەبێت، کە جادووگەر پێی گوتووە، ئەوا تووشی ڕووخان و خەمۆکی دەبێت، کە ئەمانە نەخۆشی دەروونی زۆر زۆر ترسناکن.

بەستنەوەی زیان و قازانج و دڵخۆشی بە ئەستێرەو بورجەکانەوە جۆرێکە لەو هاوبەش بڕیاردانەی کە ئاگر پەرستەکان و بەشێك لە فەیلەسوفەکان و هاوشێوەی ئەوان لە کۆمەڵی بێباوەڕان و هاوبەش بڕیاردەران لەسەری بوون.

وە بانگەشە کردنی خەڵکی بۆ بورجەکان وا پیشان دەدا کە عیلمیان هەیە بەو قسانەی کە دەیکەن لە بارەی بورجەکانەوە لە ڕاستیدا جۆرێکە لە بانگەشە کردنی عیلمی غەیب، و بێگومان ئەو کارە دژایەتی و مونافەسە کردنی خودایە لە کارو حوکمەکانیدا کە تایبەتن بەو و هیچ کەسی عیلمی پێیان نییە جگە لەزاتی (الله).

لە ڕاستیدا بانگەشە کردنی ئەو جۆرە کارانە درۆکردنە بە ئەقڵی خەڵك، و خواردنی ماڵیانە بە ناحەق و باتڵ، وتێکدانی بیروباوەڕی خەڵك و سەر لێ شێواندنیانە.

بە نموونە خوێندنەوەی (بورجی بەخت) حەرامە بڵاوکردنەوەی و سەیرکردنی، وە ئاکامی خراپ بە دوای خۆی دەهێنێت، لەوانە:

- دەبێتە هۆی دروست بوونی زۆر بیری خراپ وەك دڵەڕاوکێ و دوو دڵی.
- دەبێتە هۆی دروستبوونی ڕەشبینی.
- دەبێتە هۆی تووشبوون بە نەخۆشیە دەروونیەکان.



بەرگی دووەم

# ڕاستگۆیی کەم دەبێت!

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی مرۆڤی ڕاستگۆ کەم دەبێت..

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ( لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى.. يقل الصدق..)[1].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت.. هەتا ڕاستگۆیی کەم دەبێتەوە..

هەر چەندە هەندێك لە زانایانی فەرموودەناس دەفەرموون: ئەم فەرموودە بێ هێزە.. بەڵام لە واتادا زۆر واقیعیە.. وە لەم سەردەمەدا خەڵکێکی زۆر پەنای بردووەتە بەر درۆکردن و ڕاستگۆیی بەرەو ئاڕاستەیەکی کەم دەڕوات..

ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لەسەر ئەوەش کە لەلایەن خوای گەورەوە ڕەوانە کراوە.

موسڵمان دەبێ لەگەڵ (الله) ڕاستگۆ بێت بەوەی کارەکانی هەموو بۆ خوای گەورە بن و، تێکەڵ بە ڕیاو خۆدەرخستنیان نەکات.

موسڵمان دەبێ ڕاستگۆ بێت لەگەڵ خەڵکیدا بەوەی درۆیان لەگەڵ نەکات.

موسڵمان دەبێ لەگەڵ خودی خۆیدا ڕاستگۆ بێت بەوەی ڕاستییەکان نەشارێتەوەو، خۆی هەڵنەخەڵەتێنی و، دان بە کەم و کورتیەکانیدا بنێ و ڕاستیان کاتەوە.

بە کورتی و کوردی موسڵمان درۆزن نییەو، نابێ درۆزنیش بێت، چونکە ڕاستگۆیی بناغەی دامەزراندنی کەسایەتی مرۆڤە.

لە کۆتایی دەڵێم: سەرەنجامی ڕاستگۆیی بەهەشتی هەتا هەتاییە و درۆکردنیش ئەنجامەکەی سزای دۆزەخی پڕ لە سزا و ئازارە.

---

(١) ضعيف: أخرجه ابن عساكر في تاريخ دمشق (٤٥٣/٧) أخرجه الدولابي في «الكنى» (١/ ٣١) ، والطبراني في « المعجم الكبير» (٢٢/٣٧٦/ ١ ٩٤) ، وابن عساكر في «التاريخ « (١٠٢٩/٨) وقال الألباني في السلسلة الضعيفة : ضعيف.

## بڵاوبونەوەی زمانی ئینگلیزی و
## کەمبوونەوەی زمانی عەرەبی لە جیهان

یەکێك لە نیشانەکانی نزیك بونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی بڵاوبوونەوەو سەرهەڵدانی زمانی ئینگلیزی و کەمبوونەوەی زمانی عەرەبیە لە هەموو جیهان.

**زمـــان:** پردی پەیوەندیە ئاڵگۆڕە هەمەلایەنەکانی ژیانی تاکو کۆمەڵی مرۆڤایەتی بووە، لە زانستی (Linguistics) ئاماژە بەوە دەکرێ کە بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی، مرۆڤەکان جیا لە زمانی دایك هەوڵی فێربوونی زمانێکی تریان داوە بۆ ئەوەی کە ئاشناو تێکەڵی نەتەوەی تر ببن، جا یەکێك لەو زمانانە زمانی ئینگلیزیە.

ئەو ڕاستیەی کە نکوڵی لێنەکراوە ئەوەیە کە جیایی و فرە زمانی ئاخاوتنی مرۆڤەکان زمانی ئینگلیزیە ئەمەش یەکێکە لە نیشانەکانی گەورەیی خوا، هەروەکو دەفەرموێ: [ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّلْعَـٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ ][1].

هەرچەندە بڵاوبوونەوەی زمانی ئینگلیزی نیشانەیەکی ڕوونە لە نیشانەکان بەڵام نابێ ئەوە لە بیربکەین کە نیشانەیەکە لە نیشانە چاکەکان و باشەکان، ئەگەرچی زۆرینەی ئەوانەی کە قسەی پێ دەکەن بێ بڕوان، بەڵام ئەمە دەبێتە هۆی جۆرێك لەتاپۆکردنی ئیسلام لەسەر نەتەوەیەکی دیاریکراو لە هەمان کاتیشدا دروست کردنی زۆرێك لە ڕۆحیەتی دەمارگیریو دابڕکاریو بۆشایی لە نێوان ئوممەتی ئیسلامی، بە گشتی بە پێچەوانەی ئەوەی کە خوا پێوەری پارێزگاری کردۆتە سەنگی مەحەك.

ئەگەر سەیری زمانی عەرەبی بکەین لەم سەردەمەی ئێستادا دەبینین فێربوونی ئەم زمانە لە پوکانەوە دایەو زمانی ئینگلیزی لەبەرەو پێش چوون دایە، هەر چەندە ئەورووپیەکان بۆ وەرگرتنی ئەو ژیارو پێشکەوتنەی کە لەلای موسڵمانەکان هەبوو

---

(١) سورة الروم، الآية : (٢٢).

پەنایان بردە بەر فێربوونی زمانی عەرەبی، هەروەکو (د.زەغلول نەجار)یش کە گەورە زانای موسڵمانی هاوچەرخی جیهانیە دەڵێ: یەکەم شت کە زاناو پێشەواکانی ئەوروپا بەسەر قافڵەیی (ڕوجەر بیکون) کردیان بۆ بنیاتنانی ژیاری زانین و پێشکەوتن لە ئەوروپا وەرگێردرانی کتێبە زانستیە عەرەبیەکان بوون کە لەلایەن موسڵمانەکانەوە نوسرابوون بۆ سەر زمانەکانی ئیسپانی و ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیتاڵی.

بەڵام بەداخەوە لەسەدەی هەژدەو نۆزدەدا موسڵمانان بەرەو جۆرێك لە دوا کەوتن و داڕوخانی هزری و زانستی و ڕامیاری و زمانی عەرەبی هاتن، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٢٤ع بە تەواوی خەلافەت و حوکمرانیان لە دەستدا و زمانی عەرەبیش بەرەو پوکانەوە چوو.

موسڵمانان پێویستە لەسەریان کە شارەزای زمانی عەرەبی ببن بۆ فێربون و لێ حاڵی بوونی پرەنسیپەکانی قورئان و سوننەت، لە هەمان کاتیشدا نابێ زمانە بیانیەکان بەتایبەتی زمانی وڵاتانی ڕۆژئاوا فەرامۆش بکەین بە تایبەتی زمانی ئینگلیزی، بەڵکو فێربوونی ئەم زمانە واجبێکی ئەم ئوممەتەیە کە هەوڵ بدەن پسپۆری تەواویان لێ وەدەستبهێنن، چونکە دەیان هۆکاری لۆژیکی و شەرعی پاڵپشتی ئەم بیرکردنەوە ستراتیژیە دەکەن کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- ئێستا زمانی ڕۆژئاوا (بەتایبەتی ئینگلیزی) زمانی زانست و تەکنەلۆژیایە.

٢- هەرکەسێ شارەزای زمانی (ئینگلیزی) بێت لە فێڵ و پیلانەکانیان دڵنیا دەبێ، لەبەر ئەوە زمان دەبێتە (کلیل) و دەرگای نهێنیەکانی ئەم سەردەمەی جیهانگیری (lobalization) پێ دەکرێتەوە بە تایبەت کە هەندێ وڵاتی زلهێز نەخشەو پیلانی (١٠٠) ساڵی داهاتووی خۆیان داڕشتووە.

٣- زمانی ئینگلیزی پردی ئاڵوگۆڕکردنی پەیام و بیروباوەڕەکانە، بە تایبەت لەم سەردەمەی ئێستادا، چونکە هەر بەهۆی ئەم زمانەیە ئاینەکەمان دەگات بە هەموو جیهان و ڕۆژانە سەدان کەس دێن ناو ئاینەکەمان.

٤- میللەتانی موسڵمان پێویستیان بە گەیاندنی ئازارو مەینەتیەکانە بۆ میللەتانی ترو پەیوەندی کردن پێیانەوە، تاکوو یەکێتی ئوممەتی ئیسلامی بە ئاشکرایی بچەسپێ و ڕەنگ بداتەوە.

# پەیدابوونی کۆمەڵانێکی گومڕا
# کە قورئان بۆ خەڵکی دەخوێننەوەو ڕاڤەی دەکەن

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی پەیدابوونی کۆمەڵێك کەسایەتین کە خەڵکی بەرەو گومڕا بوون دەبەن بە هۆی قسە گەورەکانیانەوە...

پێشەوا عەبدوڵڵای کوڕی کوڕی عەمری کوڕی عاص (ﷺ) دەڵێت: لەناو دەریا کۆمەڵێك شەیتانی زنجیرکراو هەن.. کە پێغەمبەر سولەیمان بەستونیەتیەوە (..يُوشِكُ أَنْ تَخْرُجَ، فَتَقْرَأَ عَلَى النَّاسِ قُرْآنًا)[١]. واتە: نزیکە بۆتان دەربچن و قورئان بەسەر خەڵکیدا بخوێننەوە.

لە ریوایەتێکی تر دەڵێت: (يوشك أن تظهر شياطين يجالسونكم في مجالسكم ويفقهونكم في دينكم ويحدثونكم وإنهم لشياطين)[٢].

واتە: نزیکە شەیتانەکان دەربکەون و دادەنیشن لەگەڵتان لەناو مەجلیسەکانتان، وە باسی ئایین و تێگەیشتنتان بۆ دەکەن و قسەتان بۆ دەکەن ئا ئەوانە شەیاتینن..

پێشەوا عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ﷺ) دەڵێت: (إنَّ الشَّيْطانَ لِيَتَمَثَّلُ في صُورَةِ الرَّجُلِ، فَيَأْتِي القَوْمَ، فيُحَدِّثُهُمْ بالحَديثِ مِنَ الكَذِبِ، فَيَتَفَرَّقُونَ، فيَقولُ الرَّجُلُ منهمْ: سَمِعْتُ رَجُلًا أعْرِفُ وجْهَهُ، ولا أدْرِي ما اسْمُهُ يُحَدِّثُ)[٣].

واتە: بە دڵنیایی شەیتان خۆی دەکاتە هاوشێوەی پیاوێك، دێتە لای گەلانێك، بۆیان باس دەکات وتەی درۆیین، ئەوانیش کە جوودا دەبنەوە لە یەکتری، پیاوێك لەوان دەڵێت: گوێم لە پیاوێك بوو دەم و چاوی دەناسمەوە، بەڵام نازانم ناوی چییە کە قسەی دەکرد.

---

(١) مشكل الآثار للطحاوي (٦/ ٤٤٨).

(٢) رواه ابن وضاح.

(٣) صحيح مسلم ، برقم: (٧).

لە ڕیوایەتێکی تر فەرموویەتی: (يوشك أن يظهر فيكم شياطين كان سليمان بن داود أوثقها في البحر، يصلّون معكم في مساجدكم، ويقرؤون معكم القرآن، ويجادلونكم في الدين وإنهم لشياطين في صور الإنس)[1].

واتە: نزیکە سەرهەڵبدات لەنێوتان کۆمەڵە شەیتانێك کە سولەیمانی کوڕی داود (سەلامی خوای لێ بێت) بەستونیەتیەوە لە دەریا، نوێژتان لەگەڵ دەکەن لە مزگەوتەکان، وە قورئان لەگەڵتان دەخوێننەوە، وە موناقشەی ئایینیتان لەگەڵدا دەکەن، ئا بە دڵنیایی ئەوانە شەیتانەکانن لەسەر وێنەی مرۆڤن.

لەوانەیە پرسیار بکرێت کە بۆچی پێغەمبەر سولەیمان ئەو شەیتانانەی لە نێو دەریادا بەستوەتەوە؟

لە وەڵامدا دەڵێم: خوای پەروەردگار پێغەمبەرایەتی و پادشایەتی بە پێغەمبەر سولەیمان بەخشی، وە جننی بۆ تەسخیر کرد کە لە خزمەتی دابن، بەڵام شەیتانەکان درۆیان کرد بە دەم پێغەمبەر سولەیمان و گوتیان: پێغەمبەر سولەیمان کافر بووەو خەڵکی فێری جادوو دەکات، ئا ئەم شەیاتینانە درۆیان بەدەم ئەم پێغەمبەرەوە کرد، بۆیە پێغەمبەر سولەیمان بەستونیەتیەوە لە نێو دەریا.. ئا ئەم گومڕایانە دەچنە ناو خەڵکی یان لەسەر تەلەفزیۆن باسی بابەتی ئایینی بۆ خەڵکی دەکەن، ئا ئەم جۆرە کەسانە گومڕان و خەڵکیش گومڕا دەکەن.

دەبێت پێش هاتنی کۆتایی بونەوەر ئەم شەیاتینانە دەربچن، هەروەکو ئەبی عالیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: (لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَمْشِيَ إِبْلِيسُ فِي الطُّرُقِ وَالأَسْوَاقِ، فَيَقُولُ: حَدَّثَنِي فُلانٌ عَنْ فُلانٍ عَنْ نَبِيِّ اللَّهِ (ﷺ) بِكَذَا أَوْ كَذَا)[2]. واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا ئیبلیس بە نێو ڕێگاکان و بازارەکاندا نەڕوات، دەڵێت: فلان بۆی باس کردم لە فلانی ئەویش لە پێغەمبەر(ﷺ) بەم شێوە یان ئەو شێوە.

---

(١) التفسير الرحيب، الدكتور رجب ديب (١/ ٣٨٢).

(٢) الكفاية في علم الرواية، للخطيب البغدادي (لا ٤٣٠).

## زۆربوونی باران و بەرهەمی کەم

یەکێك لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی وای لێدێت بارانێکی زۆر دەبارێت، بەڵام گژو گیایەکی زۆر کەم شین دەبێت.. سەرچاوەی ئەم دیاردەیەش دەگەڕێتەوە بۆ زۆری گوناهکردن کە خەڵکی ئەنجامی دەدەن، وە زانراویشە کە گوناهکردن نیعمەت لا دەبات..

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُمْطَرَ النَّاسُ مَطَرًا عَامًّا، وَلاَ تَنْبُتَ الأَرْضُ شَيْئًا)[١].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا بارانی زۆر نەبارێ بەسەر خەڵکیدا، وە ئەرزیش هیچ شین ناکات.

بارانی زۆر دەبارێ بەڵام ئەرز ناڕوێنێ، لەم سەردەمەدا ئەگەر سەیر بکەین دەزانین زۆرێك لە وڵاتان بارانی زۆر دەبارێ و لافاو هەڵدەستێ، شارو شوێنی وا هەیە بن ئاو دەکەوێ، خێرو بێری وڵاتیش ناهێڵێت ئەو بارانە، چونکە ئەو بارانە بارانی بەرەکەت نیە، یەکێك لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی باران دەبارێت بەڵام ئابووری وڵات زیاد ناکات و بەڵکو وێرانی دەکات.

زاناکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەگەر ئەم بارەی ئێستا کە هەیە وەك خۆی بەردەوام بێت، لەبەرز بوونەوەی ئاستی پیس بوونی هەواو خراپ بوونی ژینگە کە دەستی مرۆڤی تێدایەو هەیەو کاریگەری هەیە لە دروست بوونی بە هۆی جەنگ و ئەو کارەساتانەی کە بە هۆی مرۆڤەوە دروست دەبێت، وەك ئەو هەزاران تەنە ژەهرەی کە دەچێتە ناو هەواوە لە هەموو ڕۆژێك، یان دروست بوونی پاشەڕۆی ناوکی، هەموو ئەمانە دەبنە هۆی پیس کردنی باران و تێکدانی سوڕی ئاو لە سەر زەویدا، ئاوی ئەم ڕوبارو دەریایانە دەبنە هەڵم و پاشان بەرز دەبنەوەو دەبنە هەور .

---

(١) مسند الإمام أحمد (٣/ ١٤٠) برقم: (١٢٤٥٢) وقال الشيخ شعيب الارناؤوط: صحيح.

زۆر فەرموودەمان هەیە کە باس لە نزیکی ڕۆژی هەستانەوە دەکەن، هەندێکیان پەیوەستن بە باری کەش و هەواو ڕووبارو ئاوەوە لەسەر ئەم هەسارەیە.

با بزانین لەم بارەیەوە زانست چی دەڵێت و چی دۆزیوەتەوە؟

زانایان هۆشیاریان داوە لەبارەی مەترسی ژەهراوی بوونی باران ئەمەش بە هۆی پیس بوونی بەرگە هەوای زەویەوە، لە وتەکانیادا دەڵێن: ئاوی بارانی سەدەکانی ڕابردوو پاك بووە، بەڵام ئەمڕۆ زۆر جار کە باران بە ترشی کبریت پیس بووە، بە بارانی ترش ناودەبرێت .

هەروەها زیاتر دەڵێن: ئەگەر ڕێژەی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن لە سنورێکی دیاریکراو لە هەوادا زیاد بکات کاریگەری دەبێت لەسەر پیس کردنی ئاوی باران، دوای بارینی زیان دەگەیەنێت بەو خاکەی کە لەسەری دەبارێت ، ئەمەش دەبێتە هۆی خراپکردنی زەویەکە لە جیاتی ئەوەی ببێتە خۆراکی ڕووەك و درەختەکان.

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم فەرموودەیە هەست بە بوونی ئیعجازێکی گەورە دەکەین، پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (لَيْسَتِ السَّنَةُ بِأَنْ لَا تُمْطَرُوا، وَلَكِنِ السَّنَةُ أَنْ تُمْطَرُوا وَتُمْطَرُوا، وَلَا تُنْبِتُ الْأَرْضُ شَيْئًا)[1].

کەواتە چۆن لەوە بگەین ؟

چۆن دەبیٚ باران بباریٚ و ئاو بێتە خوار بۆ سەر زەوی ، بەڵام زەوی هیچی لیٚ سەوز نەبێت و هیچ سوود لەو ئاوە وەرنەگرێت کە لە ئاسمان دێتە خوارەوە .

ئێستا زانایانی ژینگە خەمی ئەوە دەخۆن و دەڵێن: بەرزبوونەوەی ڕێژەی پیسبوون بۆ ئەم ئاستە زۆرە پێشتر نەبینراوەو وێنەی نەبووە، زەویش هاوسەنگی خۆی لە دەست داوە، لێرەدا ئەو ئایەتەمان دێتەوە یاد کە خوای گەورە دەفەرمویٚ: [ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾].

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٢٨) باب: في سكنى المدينة، برقم: (٢٩٠٤).

بەرگی دووەم

واتە: خراپە (بەڵاو شێوان و دەرد) لە وشکانی (زەوی) و دەریادا دەرکەوتووە، بە هۆی ئەو خراپانەی بۆ ئەوەی (تۆڵەی) هەندێ لەو (خراپانەی) کردویانە بچەژێژن بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە (لە خراپەکاری).

خوای گەورە لێرەدا باس لە خراپ بوونی ژینگە دەکات کە تازە نیشانەکانی لەسەر زەوی دەرکەوتووە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُمْطَرَ النَّاسُ مَطَرًا عَامًّا، وَلاَ تَنْبُتَ الأَرْضُ شَيْئًا)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا بارانی زۆر نەبارێ بەسەر خەڵکیدا، وە زەویش هیچ شین ناکات.

زانایانی بورای ژینگە دەڵێن: بەهۆی پیسبوونی زەویەوە، بەهۆی کارگەکان و پاشماوە پیسەکانەوە ئاو و هەوای زەوی و دەریاکان پیس بون، ئەمەش کار دەکاتە سەر تەندروستی مرۆڤ و ڕووەك و گیانلەبەران، ڕێژەی شێرپەنجەو نەخۆشیە قورسەکان ڕوو لە زیادبوونەو بە ملیارەها دۆلار ساڵانە بۆ چارەسەر خەرج دەکرێ، سەدەیەك لەمەوبەر باران پاك بوو، زەوی پاك بوو، بەڵام ئێستا بەهۆی دووەم گازی ئۆکسیدی کاربۆن و گازی دووەم ئۆکسیدی کبریت کە چەند زیاد بکات لە هەوادا دەبێتە هۆی پیس بوونی ڕووەکو درەختەکانیش زیانیان لێ دەکەوێت، هەروەها بە هۆی ترشی کبریتەوە بارانی ترشەڵۆکی دەبارێت کە زیانێکی زۆر دەدات و زەوی ئەو هاوسەنگیەی هەیەتی نایمێنێ، ئاشکرایە هاوسەنگیەکی گرنگ هەیە لە بونەوەردا، مرۆڤ و گیانلەبەران بە ڕۆژ دووەم ئۆکسیدی کاربۆن هەڵدەمژن و ئۆکسجین دەدەنەوە.

زانایان دەڵێن: ئەگەر حاڵ بەم جۆرە بڕوات و کەشوهەوا پیس ببێت بەهۆی ئاسەواری جەنگەکان و ئەو ملیۆنەها تەن پیسیانەی کە فڕێ دەدرێتە سەر زەوی و دەریاکان، وەك پاشماوەی نەوەوی ئەوا سوڕی ئاو لەسەر زەوی تێك دەچێ و ئەو ئاوەی کە دەبێ بە هەڵم لە دەریاکان و ڕووبارەکان، وە دەبێ بەهەورو بەهۆی ئەو هەوا پیسەی کە پیای دێتە خوارەوە کبریت و قورقوشم و گازی

---

(١) مسند الإمام أحمد (٣/ ١٤٠) برقم: (١٢٤٥٢) وقال الشيخ شعيب الارناؤوط: صحيح.

دووەم ئۆکسیدی کاربۆنی تێکەڵ دەبێ و دەبێتە بارانێکی (حامض) ی کە زیانی زۆر بە ژینگەی ڕووبارو زەوی و دەریاکان و درەختەکان دەگەیەنێت، ئەو کاتە ڕاستە باران باریوەو بەڵام هیچ سەوز نابێت و هیچ ناڕوێت.

لە ئەنجامی دوکەڵی زۆری کارگەکان، هەوری چڕی دوکەڵاوی دروست دەبێت (الضباب الدخاني) کە ترشەڵۆکی تیایەو چەند ڕۆژێ بە ئاسمانەوە دەمێنێتەوە، ئەو گازە پیسانەی بەهۆی هۆکارەکانی گواستنەوە دەچێتە ئاسمان، بەهۆی تیشکی سەروبنەوشەیی خۆرەوە، کارلێکی کیمیایی ڕوو دەدات و ئەو هەورە دوکەڵاویە دروست دەکات و پلەکانی گەرما دەگۆڕێ و زیانی گەورە دەدات لە تەندروستی مرۆڤ ، هەروەك لە ساڵی ١٩٥٢ع لەشاری لەندەن ڕوویدا کە ئەو هەورە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بەری ئاسمانی گرت و چوار هەزار کەس بەهۆیەوە مردن، ئەم ڕوداوەش لە ئەنقەرەو ئەسینا ڕوویداوە.

خوای گەورە (با) دەنێرێت بۆ پیتاندن وەکو دەفەرموێ [ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَـٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَسْقَيْنَـٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمْ لَهُۥ بِخَـٰزِنِينَ ﴿٢٢﴾ ][1].

واتە: وە بامان ناردووە بۆ پیتاندنی (دارو درەخت و ڕووەك)، ئینجا لە ئاسمانەوە بارانمان باراندووە، وە ئێوەمان پێ تێراو کردووە، لە کاتێکدا ئێوە نەتان دەتوانی ئەو (ئاوە) خەزن بکەن.

کەوایە (با) کاریگەری هەیە لەسەر گوێزانەوەی گەردیلەی هەڵمی ئاو کە لەسەر ڕووی ڕووبارەکانەوە بوون بە هەڵم ، پاشان بەرزی دەکاتەوە بۆ چینە بەرزەکانی سەرەوە، ئەوانیش لە دەوری گەردیلەکانی خوێ و تۆزو دووکەڵ لە هەوادا کۆدەبنەوە کە بە بەردەوامی بە هەوادا هەڵواسراون.

دوای چڕ بوونەوەیان و بوونیان بە هەور، کاریگەری تەنە پیسەکانی لەسەر دەبێت کە لە هەوادا هەیەو (با) لەگەڵ خۆی هەڵیان دەگرێت.

---

(١) سورة الحجر: ٢٢.

لەوانەیە کەسێك پرسیار بکات و بڵێت: چی ڕوودەدات کاتێك لە هەوادا ڕێژەی ئۆکسیدی کاربۆن زیاد دەکات!

لە وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێین: ڕێژەی ئاوێتەی قورقوشمی ژەهراوی کە زۆر مەترسیدارە زیاد دەکات و پاشان ڕێژەی ئاوێتەکانی کبریتی ژەهراویش زیاد دەکەن .

ئەوەی کە ڕوودەدات کۆبوونەوەی هەڵمی ئاوە لە دەوری ئەم پیسیانە، بەهۆیەوە بارانی ترش دروست دەبێت کە پڕیەتی لە ڕەگەزی کبریت و پڕە لە ئاوێتەی قورقوشم و پڕە لە پیسی جۆراو جۆر، کاتێك ئەم پیسیانە لە ڕێژەیەکی دیاریکراو زیاد دەکەن چی ڕوودەدات؟

کاتێك زەوی ئەم بارانە دەخواتەوە ڕووەکەکان توانای ئەوەیان نابێت کە ئاوەکە لەم پیسیانە پاك بکەنەوە، واتە: ڕووەکەکان ئاوەکە دەمژن لەگەڵ ئەو پیسیانەی کە تیایەتی، بێگومان هەموو دەزانین ئەو بارانەی ئەمڕۆ دەبارێت ئەندازەیەك پیسی پێوەیە، بەڵام هێشتا ڕێژەکە کەمەو زۆر نیە، ئەو ژەهراوی بونە گەورەیە ڕوو دەدات کە ئەمڕۆ زانایان بەردەوام کۆمەڵی نێو دەوڵەتی لیٚ ئاگادار دەکەنەوە[1]. بە جۆرێك ڕێژەی ترشی بارانەکە زیاد دەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی لەناوبردنی ڕووەك.

ئەمە بەڵگەیەکی ماددی ئاشکرایەو نیشانەیەکی ڕوونە لەسەر نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی و دەرکەوتنی فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، وەك ئەوەی ڕوو بەڕووی ئەوانە بدوێت کە ئینکاری پێغەمبەرایەتیەکەی دەکەن و پێیان بڵێت: ئێوە دەتانەویٚ بە پێی حیساباتی خۆتان لەم دیاردەیە خۆتان بپارێزن، خۆ پاراستن لە دیاردەی بارانی ترش کە دەبێتە هۆی لەناوبردنی گیاو ئاژەڵ و مرۆڤ ، وە

---

(١) ئەوە ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەرە بۆ ئومەتەکەی، بەڵام ئەوانەی ئینکاری دەکەن فەرموو با ڕێگرین لە هاتنە دی ئەو نیشانەیە، با هەموو هۆکارەکان بخنە گەڕو ژینگە لەو قەیرانە دەرکەن، بەڵام بە داخەوە ئەو نیشانەیەو هەموو نیشانەکانی تر یەك بە دوای یەك دێنە دی.

دڵنیان باران بە شێوەیەكی گەورە پیس دەبێت، وە دەشێت زەوی هیچی لێ سەوز نەبێت وە بۆچونتان وایە كە ئەمە لە داهاتوودا ڕوودەدات.

بۆیە پێشەوامان تاجی سەرمان پێغەمبەرمان(ﷺ) ئاماژەی پێكردووە بە یەكێك لە نیشانەكانی هاتنی ڕۆژی دوایی.

پێشەوا ئیبنو عەباس(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (مَا مِنْ عَامٍ أَمْطَرَ مِنْ عَامٍ، وَلَكِنَّ اللَّهَ يَصْرِفُهُ حَيْثُ يَشَاءُ..)[1].

واتە: باران بارینی هیچ ساڵێك لە ساڵێكی تر زیاتر نیە، خوای گەورە خۆی بەشی دەكات لە نێوان دروستكراوەكانیدا.

لە فەرموودەیەكی تر دەفەرموێ: (مَا مِنْ سَاعَةٍ مِنْ لَيْلٍ وَلَا نَهَارٍ إِلَّا السَّمَاءُ تُمْطِرُ فِيهَا، يُصَرِّفُهُ اللَّهُ حَيْثُ يَشَاءُ)[2].

واتە: هیچ كاتژمێرێكی شەوو ڕۆژ نیە بارانی تێدا نەبارێت، خوای گەورە خۆی دابەشی دەكات.

كاتی خۆی ئیغریقیەكان دەیانگوت: باران لە ئەنجامی تووڕەیی خوایەكانەوەیە، هەندێ گەلی تریش بتیان بۆ خوای باران دروست كردبوو دەیانپەرست، كە ئیسلام هات ئەو بیرو بۆچونانەی هەموو پێچایەوەو لەم دوو فەرمودەدا هەقیقەتی زانستی وا باس دەكات كە لە سەدەی بیستەمدا بەهۆی مانگی دەستكردەوە دۆزراوەتەوە، بڕی ئەو ئاوەی دەبێ بەهەڵم لە دەریاو ئۆقیانوسەكانەوە ساڵانە نەگۆڕەو ئەو بارانەش كە دەبارێ نەگۆڕە بەهەمان شێوەو بەردەوامیش لە شەو و ڕۆژدا باران دەبارێت لەسەر زەوی یان لەسەر دەریاو ئۆقیانووسەكان.

لە ساڵی (١٧٧٠)ع لە هیندستان بە هۆی وشكانی و بێبارانی نزیكەی (١٠) ملیۆن كەس گیانیان لە دەست دا .

---

(١) صحيح: المستدرك (٢/ ٤٧٥) برقم: (٣٥٧٧) وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

(٢) معرفة السنن والآثار (٥/ ١٩٤) برقم: (٧٢٦١).

خوای گەورە زەوی بە بەرگێکی جوگرافی (geosphere) لە هەسارەکانی تری کۆمەڵەی خۆرو ئەو ئەستێرەو هەسارانەی تا ئێستا زانراون جیاکردۆتەوە، بەرگی زەویش لە چوار جۆر پێکهاتووە، هەوایی (atmosphere)بەردەلان (lithosphere) ئاویی (hydrosphere) مادده ئەندامە پێوستیەکانی تر (biosphere) .

ئەم بەشانە بەردەوام بە چالاکیەکی گەورە لە ڕێی ئاڵ و گۆڕی نێوان ووزەو ماددەوە لەگەڵ یەکتردا کارلێك دەکەن، ئەو کارلێکردنەش بەرگە جوگرافیەکەی زەوی کردۆتە یەك پارچەی سروشتی تەواو کار، جێی ئاماژەیە ئاو ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینی لە بە ئەنجام گەیاندنی کردارەکانی نێوان ووزەو مادده .

ئەم ڕێژە گەورەیەی ئاو لەسەر ڕووی زەوی و لەم واقیعە فیزیایی و کیمیاییەی ئێستای زەویدا چەندێکی دیاریکراو لە ئاوی شیرن لە ڕێی بارینەوە پێشکەش دەکات، هەر چەندە لە بەرگە جوگرافیەکەی زەویدا بەسە بۆ دابینکردنی هەموو پێوستیەکانی زیندەوەران.

چونکە ئاو سەرچاوەی گرنگی ژیان و توخمی سەرەکییە لە مانەوەو بەردەوامی ژیانی مرۆڤ و زیندەوەران، بارانیش لەسەرچاوە گرنگەکانی ئاوی سەر زەویە، زۆر سەیرە ئەم هەموو ئاوە چۆن بەو ئاسمانەوە ڕاگیراوە؟

لە کاتێکدا ئێمەی مرۆڤ ناتوانین تەنها یەك سەتڵ ئاو لەسەر ڕووی خۆمانەوە ڕاگیر بکەین، لەوەش سەیرتر ئەو هەموو ئاوە چۆن و بە چ ڕێکوپێکی و یاسایەکی جوان دێتە خوارەوە، دڵۆپ.. یەك لە دوای یەك، چونکە ئەگەر ئەو بارانە بە هەر شێوەیەکی تر بهاتایە خوارەوە، ئەو کات چی ڕووی دەدا ؟

بۆچی وەها نایەتە خوار؟

ئەو یاسایە کامەیە کە دڵۆپ دڵۆپ بەڕێزو بە ڕێکوپێکی و یەك لە دوای یەك دای دەبارێنێت، هەروەك کۆمەڵێ سەربازی مەشق پێ کراوی گوێڕایەڵ بۆ هەموو فەرمانێك، لەمانەش سەیرتر ئەوەیە کە جار جارێك هەورەکان دەگرمێنن،

وەك ئەوەی سرودی خۆشخوان بچڕن، بروسکەکانیش گوللەی خۆشی و گردان و بە ئاسمانی ئاوەدانیدا گوزەرە دەکەن.. زۆر سەیرە چۆن ئاوو ئاگر پێکەوە گۆرانی بۆ ژیان دەڵێنەوە، چونکە هەورە بروسکە پڕیەتی لەبارگەی کارەبایی جێگری (ستاتیك)ی موجەب و سالب، کە لە کاتی خاڵی بوونەوەی ئەو بارگە کارەباییانەدا بروسکە دروست دەبێت، ئەو هەورە بروسکەیە چی دەکات؟ بە هۆی ئەو بروسکەیەوە ئۆکسجینی هەواو نایترۆجین یەك دەگرن دووەم ئۆکسیدی نایتریت دروست دەبێ، ئینجا ئەم نایتریتە دەبێتە دیاری دەستی باراناوەکەو لەگەڵ خۆیدا دەچێتە ناو زەوییەوە ، لەناو زەویشدا ئەو نایتریتە لەگەڵ توخمەکانی ناو زەویدا یەك دەگرێت و نیتراتی کالیسیۆم.. باشترین خۆراك و پەیینی زەوی پێك دەهێنێت، ئەی نابینی کە هەمیشە پیت و بەرەکەتی خاك بەردەوام پارێزراوە، ئەوە بە هۆی ئەو پەیینەی (الله) بەدی هێناوە، کە بە یارمەتی و هاوکاری هەورە بروسکەو باران و توخمەکانی ناو خاك دروست ئەبێت ..

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: ( لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى.. يكثر المطر ويقل الثمر..)[1].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت.. هەتا باران زۆر دەبارێت و بەروبووم کەم دەبێتەوە..

لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: (لا تقوم الساعة حتى لا تحمل النخلة إلا تمرة )[2].

ئەم فەرموودەیەش کینایەتە دەلالەتە لەسەر ئەوەی کە بەروبووم و بەرەکەت کەم دەبێت.

---

(١) أخرجه ابن عساكر في تاريخ دمشق (٤٥٣/٧) أخرجه الدولابي في «الكنى» (١/ ٣١) ، والطبراني في « المعجم الكبير» (٢٢/٣٧٦/ ١ ٩٤) ، وابن عساكر في «التاريخ « (١٠٢٩/٨) وقال الألباني في السلسلة الضعيفة : ضعيف.

(٢) رواه ابن ابي شيبة (٣٧٥٥٠).

# زۆربوونی هەورە بروسکە

یەکێك لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی دیاردەی هەورە بروسکە سەهەڵدەدات.

بۆیە زۆربوونی هەورە بروسکە هۆکارێکە بۆ مردنی سەدان کەس کە لە چەند شارێکی جیاوازی جیهان خەڵکی پێی کۆچی دوایی دەکەن.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (تَكْثُرُ الصَّوَاعِقُ عِنْدَ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ ، حَتَّى يَأْتِيَ الرَّجُلُ الْقَوْمَ ، فَيَقُولَ : مَنْ صَعِقَ قِبَلَكُمْ الْغَدَاةَ ؟ فَيَقُولُونَ : صَعِقَ فُلاَنٌ وَفُلاَنٌ)[1].

واتە: بە نزیکبوونەوەی ئاخر زەمان هەورە بروسکە لێدان زۆر دەبێت بەجۆرێك یەکێك لەناو کەسەکانیدا پرسیار دەکات ئاخۆ ئەم بەیانیە کێ هەورە بروسکە لێیداوە، ئەوانیش دەڵێن: فلان و فلان.

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (..أَلَمْ تَرَوْا إِلَى الْبَرْقِ كَيْفَ يَمُرُّ وَيَرْجِعُ فِي طَرْفَةِ عَيْنٍ؟..)[2].

واتە: ئایا هەورە بروسکەتان نەبینیوە کە چۆن لە ماوەی چاوتروکانێکدا دەڕوات و دەگەڕێتەوە؟!

لەم باسەدا دەبینین کە پێغەمبەر(ﷺ) بە وردیەکی سەرسوڕهێنەر لە قۆناغەکانی هەورە بروسکە دواوە، تەنانەت کاتی ڕوودانەکەشی دیاری کردووە، لەوانەیە بەلامانەوە سەیر بێت گەر بزانین ماوەی پێویست بۆ ڕوودانی بروسکەیەکی هەور هەمان کاتە کە بۆ چاوتروکاندنێك پێویست دەبێت! چونکە ئەو کاتەی کە بۆ ڕوودانی بروسکەیەکی هەور پێویستە، بریتیە لە چەند بەشێك لە هەزار بەشی چرکەیەك!

---

(١) صحيح: أخرجه الإمام أحمد في (مسنده) (٣/ ٦٤) برقم: (١١٦٤٣). وقال الشيخ شعيب الأرناؤوط: صحيح، وأخرجه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٤٤) وقال: هذا حديث صحيح على شرط مسلم ولم يخرجاه، ولم يوافقه الذهبي.

(٢) صحيح مسلم (١/ ١٨٦) باب: أدنى أهل الجنة، برقم: (١٩٥).

ئەمەش دەیسەلمێنیٚ کە پێغەمبەر(ﷺ) چەند شتێکمان بۆ باس دەکات کە تەنها بە ئامێرە پێشکەوتووەکانی وێنە گرتن (کە لە چرکەیەکدا هەزار وێنە دەگریٚ) توانیومانە ببینین.

**لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە پێش کە:**

ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) ڕەونەکراوی خوای گەورە نەبوایە، ئەم زانیاریە وردانەی لە کویٚ بوو کە دۆزینەوەیان کاری لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی زانستیی پتر لە دوو سەدەی خواست؟!

## (هەورە بروسکە) لە ئەفسانە دێرینەکاندا:

خەڵکانی زوو کاتیٚ دەیانڕوانیە هەورە بروسکە پێیان وابووە کە ڕووداوێکی پیرۆزەو پەیوەستە بەو بتانەوە کە گوایا سزای سەرپێچی کارانیان دەدەن!

خەڵکی سەدەی حەوتەمی عیسایی، واتە: ئەو سەردەمەی کە پێغەمبەری (ﷺ) تێدا ژیاوە، بەو باوەڕەدا بوون کە: خوایەك (بتێك) بۆ هەورە بروسکە هەیە بەناوی (زیووس)!! تەنانەت زیرەکترین مرۆڤی جیهان لەو ڕۆژەدا ئەم باوەڕەی هەبووە.

## یەکەم لێکۆڵەر لەم دیاردەیە لە ڕووی زانستەوە:

سەدەی هەژدەهەم، واتە: یازدە سەدە دوای پێغەمبەر(ﷺ)، بۆ یەکەم جار زانایان دەستیان دایە لێکۆڵینەوە لەسەر دیاردەی هەورە بروسکە لە ڕووی زانستەوە.

زانای بەناوبانگ (بنیامین فرانکلین) یەکەم کەس بوو کە لە ڕێی کۆلارە کاغەزیە بەناوبانگەکەیەوە لەم دیاردەیەی کۆڵیەوە، ئەوە بوو کۆلارەیەکی کاغەزی بەست بەتەلێکی کانزاییەوەو بەبەرزی هەڵیدا بۆ ناو هەورەکان، ئینجا لە ڕێی تەلەکە بەر زەوی کەوت پزیشکێکی گەورەی لێکەوتەوە[1]!

---

(١) سایتی: موسوعة الاعجاز العلمی فی القرآن والسنة، د. زغلول النجار .

زانایان سەلماندوویانە، کە هەورەکانی ئاسمان کێشیان بە ملیۆنان تەنە، واتە: زۆر قورسن، چەند لێکۆڵینەوەیەك دەریانخستووە، کە هەورە بروسکە پێویستی بە هەورە قورسەکانە، کە بە هەورە کەڵەکە بووەکان ناو دەبرێن، کەواتە ڕاستیە زانستیەکە دەڵێت: پەیوەندی لە نێوان هەورە قورسەکان یان کەڵەکەبووەکان و ڕوودانی هەورە بروسکەدا هەیە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ﴿١٢﴾][1].

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە ڕاڤەی ئەو ئایەتە دەفەرموێ: خوای گەورە هەورە بروسکە دەنێرێت وەك سزا بۆ هەرکەس کە خۆی بیەوێت، ئەم دیاردەیە لە ئاخر زەماندا زۆر دەبێت.

هۆی دابەزینی ئەو ئایەتەی پێشوو وەك ئیبنو کەثیر دەیگێڕێتەوە ئەوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەنێرێت بەشوێن کەسێك لە گەورەکانی قوڕەیشدا، تا بێت بۆ لای و ئەویش دەڵێت: من لەوە بەرزترم کە بێم بۆ لای موحەممەدو قسەی نابەجێی تریش دەکات، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) دوو جاری تر دەنێرێت بەشوێنیداو ئەو هەمان وەڵامی دەبێت، تا لە جاری سێیەمدا خوا یەك هەورە بروسکەی لێدەدات و کاسەی سەری دەبات، ئیتر ئەو ئایەتەی پێشوو دابەزی.

هەورە بروسکە لێدان (Thunderbolt) خاڵیبوونەوەی کارەباییە لە نێوان پەلە هەورێکی بارگە موجەب، یان سالب لەگەڵ شوێنێك، یان بینایەك، یان کەسێك، یان ئاژەڵێك لەسەر زەوی، ئەوەی سەیرە تیرەی گورزەی بروسکەکە کەمترە لە ٥ر٢سم بەڵام درێژی دەگاتە ٥٠کم، لە کاتی لێدانیدا پلەی گەرمی ئەو شوێنەی هەورە بروسکەکە لێیدەدات بۆ زیاد لە ٣٠٠٠٠ پلەی سەدی بەرز دەکاتەوە، ئەوەش دەبێتە هۆی کشانی هەوای ئەو نێوەندەو دابەزینی پەستانی هەوا تێیدا، بۆیە هەر بە ڕوودانی بروسکەکە هەورە گرمەکەی لەگەڵدا دروستدەبێت[2].

---

(١) سورة الرعد، الآية: (١٢).

(٢) سایتی: موسوعة الاعجاز العلمی فی القرآن والسنة، د. زغلول النجار .

ئەو بروسکەیەی کە لەبارگەی سالبەوە دروستدەبێت تەزووە کارەبا ساتیەکەی دەگاتە ٣٠ کیلۆ ئەمپێرو بڕی بارگەی ٥ کۆلۆم و وزەی ٥٠٠ جول دەگوێزێتەوە، لەوانەیە تەزووی ساتی بروسکەکە بەهێزەکان بگاتە ١٢٠ کیلۆ ئەمپێرو بارگەکانیشیان بگاتە ٣٥٠ کۆلۆم!

بەڵام ئەو بروسکەیەی کە لەبارگەی موجەبەوە دروستدەبێت نە تەزووە ساتیەکەی، نە وزەکەی و نەبارگەکەی ئەوەندە زۆر نیە.

مانگە دەستکردەکان لە یەك چرکەدا نزیکەی ١٠٠ بروسکە تۆمار دەکەن، واتە: لە ساڵێکدا نزیکەی ٣٫١ ملیار بروسکە، ٨٠٪ی ئەو بروسکانە لە نێوان هەورەکان خۆیاندا ڕوودەدەن و ٢٠٪ی یان لە نێوان هەورەکان و زەویدا ڕوودەدەن کە ئەوانیش هەورە بروسکە لێدان، بە پێی ئەو داتایانەی کە لە مانگە دەستکردەکانی ئاژانسی ناساوە وەرگیراون، کە تایبەتن بە چڕیی ڕوودانی بروسکەکان لەسەر ڕووی زەوی لە نێوان ساڵانی ١٩٩٥ع تا ٢٠٠٣ [١].

زۆربەی بروسکەکان لەسەر وشکانی ڕوودەدەن بە بەراوورد لەگەڵ سەر ڕووی ئاوەکان کە ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ کەمی فراوانی گەرمی تایبەتی وشکانی کە هەواکەی سەر ڕووی زیاتر گەرم دەبێت، ئەوەش دەبێتە هۆی زیادبوونی گێژەڵوکەی هەوراوی، با.. گەردەلول و هەورە گرمە، هەروەها بەپێی نەخشەکان ٧٠٪ی بروسکەکان لەناوچە خولگەییەکاندا ڕوودەدەن و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تریش دەگۆڕێت، بەپێی یەکێك لە لێکۆڵینەوەکان بەرازیل کە دەکەوێتە ناوچەی یەکسان زۆرترین هەورە بروسکەی تێدا ڕوودەدات، (ئۆسمار بینتۆ) توێژەرەوە لە کۆمەڵەی کارەبایی زەپۆش کە هاوبەشی پەیمانگای بەرازیلە، لە لێکۆڵینەوە فەزاییەکاندا، دەڵێت: ساڵانە (٧٠) ملیۆن هەورە بروسکە لەو وڵاتە ڕوودەدات، بۆیە ئەو بروسکانە ڕێژەیەکی زۆر لە مردن، هاوڕێ لەگەڵ زیانێکی ماددی زۆر لەو وڵاتەدا، لەگەڵ خۆیاندا دێنن!

---

(١) سایتی: موسوعة الاعجاز العلمی فی القرآن والسنة، د. زغلول النجار .

بەپێی ئامارەكان ژمارەی مردن بەهۆی هەورە بروسكەوە لە ئەمریكا زیاترە لە ژمارەی مردن بەهۆی كارەساتە سروشتیەكانی دیكەوە، ساڵانە ٥٠٠ تا ٦٠٠ كەس لە وڵاتەدا بەهۆی هەورە بروسكەوە دەمرن، هەروەها ژمارەی بریندارانی لە نێوان ١٠٠٠ تا ١٥٠٠ كەس دەبێت بەهۆی هەمان دیاردەوە، زۆربەی قوربانیەكانیش ڕەگەزی نێر دەگرێتەوە لە نێوان ١٥ تا ٤٤ ساڵیدان، كە بە زۆری لە دوو ویلایەتی فلۆریداو تەكساس دەگرێتەوە، هەمان سیناریۆی گیانلەدەستدان و زیانی ماددی لە وڵاتانی دیكەو بەشێوەی جیاجیا دووبارە دەبێتەوە.

ئەوەی جێی تێڕامان و سەرنجە ئەوەیە كە لە ئێستادا هەورە بروسكە زۆر زیادی كردووە لە چاو ڕابردوودا، كە ئەوەش یەكێكە لە نیشانەكانی نزیكبوونەوەی ڕۆژی دوایی، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (تَكْثُرُ الصَّوَاعِقُ عِنْدَ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ ، حَتَّى يَأْتِيَ الرَّجُلُ الْقَوْمَ ، فَيَقُولَ : مَنْ صَعِقَ قِبَلَكُمْ الْغَدَاةَ ؟ فَيَقُولُونَ : صَعِقَ فُلَانٌ وَفُلَانٌ)[1].

واتە: بە نزیكبوونەوەی ئاخر زەمان هەورە بروسكە لێدان زۆر دەبێت بەجۆرێك یەكێك لەناو كەسەكانیدا پرسیار دەكات ئاخۆ ئەم بەیانیە كێ هەورە بروسكە لێیداوە، ئەوانیش دەڵێن: فلان و فلان.

ئاژانسی هەواڵی نۆفۆستی ڕووسی دەڵێت: ئەمساڵ لە ڕووسیا بەرزترین پلەی گەرمی تۆمار كراوە كە گەیشتۆتە ٣٨ پلەی سەدی، بەڵام لە ١٩٢٠ع ژمارەی پێوانەیی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەو وڵاتەدا ٣٦,٨ پلەی سەدی بوو [2]!!

لە زۆر وڵاتی دیكەدا بەرزبوونەوەی نائاسایی پلەی گەرمی تۆمار كراوە وەك وڵاتی سعودیەو عێراق، كە لە سعودیە لە ژێر سێبەردا پلەی گەرمی ٥٠ پلەی سەدی تۆماركراوە، بەڵام لە هەتاودا ٦٠ پلەی سەدی تۆمار كراوە.

---

(١) صحيح: أخرجه الإمام أحمد في (مسنده) (٣/ ٦٤) برقم: (١١٦٤٣). وقال الشيخ شعيب الأرناؤوط: صحيح، وأخرجه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٤٤) وقال: هذا حديث صحيح على شرط مسلم ولم يخرجاه، ولم يوافقه الذهبي.

(٢) سايتى: موسوعة الاعجاز العلمى فى القرآن والسنة، د. زغلول النجار .

خوای گەورە دەفەرموێت: [هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا]، خوای گەورە هەورە بروسکەتان نیشاندەدات لێی بترسن و وەك خۆشی و تەماعێکتان بەوەی، کە ئەو هەورە بروسکەیە بارانێکی بە فەڕو ڕەحمەتی پێوە بێت.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: کاتێك گوێتان لە هەورە گرمە بوو زیکری (سبحان الله وبحمده) زۆر بکەن لە هەورە بروسکە بە دوو دەبن.

پێغەمبەر(ﷺ) فێری ئەوەمان دەکات کە چۆن خۆمان بپارێزین لە هەورە بروسکە لێدان و کلیلی ئەوەمان دەداتە دەست کە ئەویش بە گوتنی (سبحان الله وبحمده) دەبێت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ئەگەر گوێتان لە هەورە گرمە بوو ئەوا ناوی خوا زۆر بێنن و یادی خوا زۆر بکەن، چونکە هەورە بروسکە لە کەسێك نادات کە زیکری خوا بکات.

پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرمایشتێکی قودسیدا دەفەرموێت: ئەگەر بەندەکانم بەگوێی منیان بکردایەو ملکەچی فەرمانەکانم بوونایە، ئەوا بە شەو بارانی ڕەحمەتم بۆ دەباراندن و تێر ئاوم دەکردن و بە ڕۆژیش خۆرم بۆ دەردەخستن، هەرگیز دەنگی هەورە گرمەم بە گوێیاندا نەدەدا.

## ڕاستییەکی مێژوویی:

هەتا کۆتایی سەدەی بیستەمیش زانیاریەکان لەبارەی هەورە بروسکەوە کەم بوون، بەڵام لەوکاتەدا کە زانایان ئامێری وێنەگری دیجیتاڵیان داهێنا، کە لە چرکەیەکدا زیاتر لە (١٠٠٠) وێنە دەگرێ، توانیان هەندێ زانیاری لەبارەی نهێنیەکانی هەورە بروسکە بەدەست بهێنن، بەڵام زانیاریە وردەکان هەتا ئێستاش هەر نەزانراون [1]!

---

(١) سایتی: موسوعة الاعجاز العلمی فی القرآن والسنة، د. زغلول النجار .

## هەورە بروسکە لە چەند ڕەنووسێکدا:

- هەموو چرکەیەك ١٠٠ جار لە ئاسمانی گۆی زەویدا هەور چەخماخە دەدات.
- هەموو ڕۆژێك زیاد لە ٨ ملیۆن چەخماخەی هەور لە جیهاندا ڕوودەدات.
- هەموو ساڵێك لە ئەمریکا ١٠٠ کەس بەهۆی هەورە بروسکە گیان لە دەست دەدەن.

## چەند ڕەنووسێکی سەرسوڕهێنەر:

پلەی گەرمیی ناو چەقی تیشکی هەورە بروسکە دەگاتە ٣٠ هەزار پلەی سەدی، واتە: پێنج هێندەی ڕووی خۆرە!!

پەستانی کارەباییەکەی : ١٠٠٠ ملیۆن فۆڵتە.

تەزووی کارەباییەکەی : ٢٠٠ هەزار ئەمپێرە.

## زانایان چۆن لە هەورە بروسکە دەکۆڵنەوە؟

بروسکەکان لە هەورێکەوە بۆ هەورێکی تر دەگۆڕێن، ئەوەش بە پێی دووریی هەور لە زەویەوەو بە گوێرەی ئەندازەی بارگەی کارەبایی ناو هەورەکەو بارگەی کارەبایی ڕووی زەویو بەپێی پلەی گەرمی و خێرایی باو، ڕێژەی شێ و، هۆکارەکانی تری جگە لەمانەش.

لەبەر ئەوە، زانایان پەلە هەورێك – وەك نموونە – هەڵدەبژێرن و لە ڕووی بیردۆزیەوە لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەن، بۆ دیاریکردنی کاتی چەخماخەی هەورەکەو کاتی هەموو یەکێ لە قۆناغەکانی[1].

---

(١) سایتی: موسوعة الاعجاز العلمی فی القرآن والسنة، د. زغلول النجار .

## هەورە بروسکە چۆن ڕوو دەدات؟

زانایان بۆیان دەرکەوتووە کە هەورە بروسکە بە چەند قۆناغێکدا دەڕوات، گرنگترینیان قۆناغی (ڕۆشتن و گەڕانەوە)یە، ئەوەبوو توانییان وێنەی ئەو قۆناغە بگرن و دڵنیابوون لەوەی کە بروسکە لە هەورەوە دادەبەزێت و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ ناوی!!

**قۆناغی یەکەم:** تیشکێکی کارەبایی سالب لەهەورەکەوە بەرەو زەوی دادەبەزێت، ئەوەش لە ماوەیەکی یەکجار کورتتدا کە چەند بەشێکە لە هەزار بەشی چرکەیەك.

**قۆناغی دووهەم:** ئەم تیشکە هێندە لە زەوی نزیك دەبێتەوە هەتا بەر ئەو بارگە موجەبە دەکەوێت کە لەسەر ڕووی زەویدا هەیە.

**قۆناغی سێهەم:** بارگە موجەب و تیشکە سالبەکە بەر یەك دەکەون و، بە فەرمانی خوای گەورە پزیسکێکی بە تەوژمی کارەبایی پەیدا دەبێت کە بەرەو سەرەوە بۆ ناو هەورەکە دەگەڕێتەوە.

**قۆناغی چوارەم:** دواجار ئەو تیشکە بینراوە پێکدێت کە دەگەڕێتەوە و، گەرمی و وزەی هەورە بروسکەی لە خۆگرتووە. هەموو ئەم کردارانەش لە نزیکەی (٢٥) میللی چرکەدا ڕوودەدات.

**دوای ئەم ڕاستیە زانستییانە دەپرسین:**

ئایا پێغەمبەر(ﷺ) چۆن لەم دیاردە ئاڵۆزە دواوە؟

ئایا فەرمایشتی ئەو سەرەوە تێکەڵ بە ئەفسانەی ئەو چەرخە بووە کە تیایدا ژیاوە؟

ئایا کاریگەریی فەرهەنگی ئەو ڕۆژگارەی لەسەرە کە ئەفسانەکانی تێدا باو بووە سەبارەت بە هەورە بروسکە؟

دەبا سەرنج لەم فەرموودە پیرۆزە بدەین:

پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە خێرایی ڕۆشتنی هەندێ کەسی نەتەوەکەی بەسەر پردی سیرات لە ڕۆژی دوایدا، فەرموویەتی: یەکەمتان وەکو هەورە بروسکە بەسەریدا تێدەپەڕێت.

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (..أَلَمْ تَرَوْا إِلَى الْبَرْقِ كَيْفَ يَمُرُّ وَيَرْجِعُ فِي طَرْفَةِ عَيْنٍ؟..)[1].

واتە: ئایا هەورە بروسکەتان نەبینیوە کە چۆن لە ماوەی چاوتروکانێکدا دەڕوات و دەگەڕێتەوە؟!

## ئاماژەیەك بۆ خێرایی هەورە بروسکە:

لەوەدا کە فەرموویەتی: (یەکەمتان وەکو هەورە بروسکە بەسەریدا تێدەپەڕیت) ئاماژەی تێدایە بۆ بوونی خێراییەکی دیاریکراو بۆ هەورە بروسکە، دیارە ئەمەش خەڵکی ئەو سەردەمە نەیانزانیوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) تیایدا ژیاوە[2].

## ئاماژەیەك بۆ قۆناغەکانی هەورە بروسکە:

لەوەشدا کە سەبارەت بە هەورە بروسکە فەرمویەتی: (دەڕوات و دەگەڕێتەوە) ئاماژەی تێدایە بۆ بوونی چەند قۆناغێك لە پێکهاتنی هەورە بروسکەدا، کە گرنگترینیان قۆناغی ڕۆشتن و قۆناغی گەڕانەوەیە، ئەم قۆناغەش تەنها چەند ساڵێکی کەمە لە توانای مرۆڤ دا هەیە بیانبینێت!!

---

(١) صحیح مسلم (١/ ١٨٦) باب: أدنى أهل الجنة، برقم: (١٩٥).

(٢) سایتی: موسوعة الاعجاز العلمی فی القرآن والسنة، د. زغلول النجار .

## ئاماژەیەك بۆ كاتی هەورە بروسكە:

لەوەشدا کە سەبارەت بە کاتی هەورە بروسکە فەرمو: (لەچاو تروکانێك)دا ئاماژەی بۆ (کات)ی چەخماخەی هەورەکە تێدایە، کە یەکسانە بەو کاتەی بۆ چاوتروکاندن پێویستەو بە چەند (دە) بەشێکی (میللی چرکەیەك) دیاری کراوە، ئەم تەشبیهەش لە ڕووی زانستیەوە زۆر وردە.

زانایانی ئاژانسی (ناسا) هەمان دەستەواژەی پێغەمبەر(ﷺ) بەکاردەهێنن!

یەکێك لە زانایانی ئاژانسی (NASA) لە ڕاڤەی کرداری هەورە بروسکەدا دەڵێت: (هەورە بروسکە لە ماوەی بەشێکی بچووك لە چرکەیەك دا توانای گەرمکردنی هەوای هەیە، کاتێ هەوا بەو خێراییە گەرم دەبێت، بە شێوەیەکی توند دەکشێت و پاشان دەچێتەوە یەك، بە وێنەی تەقینەوەیەك کە لە چاو تروکانێکدا ڕوودەدات))!!

(Stev Goodman A Lightning Primer,www.nasa.gov) ئەم قسەیەش ئەوە دەگەیێنێت کە چەخماخەی هەور لە ماوەی چاو تروکانێکدا ڕوودەدات، بۆیە پێغەمبەرمان (ﷺ١٤٣٧) ساڵە باسی لەم نیشانەیەوە فەرمووە[1].

ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەر(ﷺ)، لەسەر ئەوەش کە لەلایەن خوای گەورەوە ڕەوانە کراوە.

ئەوەش بەڵگەیە لەسەر دەست پێشخەریی پێغەمبەر(ﷺ) لە زانستی هەورە بروسکەدا! چونکە پێش زانایانی خۆرئاوا لەبارەی قۆناغەکان و کاتی هەورە بروسکە دواوەو، ئاماژەشی داوە بەبوونی خێراییەك لە ڕوودانی ئەو بروسکەیەدا.. هەروەها بەڵگەیە لەسەر وردیی دەستەواژەکەی سەروەرمان لە تەشبیە کردنی کاتی هەورە بروسکەدا بە: ماوەی چاوتروکاندنێك!

---

(١) سایتی: موسوعة الاعجاز العلمی فی القرآن والسنة، د. زغلول النجار .

تازەترین لێکۆڵینەوەی زاناکان لە بارەی هەورە بروسکەوە دەڵێت: هەورە بروسکە چەند قۆناغێکی زۆر کورتە گرنگترینیان ( القائد المار ) (Stepped leader) کە ئەو تیشکەیە کە لەهەورەکەوە دێت بەرەو زەوی کەبریتییە لە بارگەی سالیب و پاشان گەڕانەوەی (شرارە)یەکە لە بارگەی موجەب بەرەو هەورەکە کە پێی دەوترێت (الضربة الراجعة )کە هەورە برووسکەکە زۆرتر لەمەوە درووست دەبێت (Return stroke) کە ئەمەش ماوەکەی ئەوەندە کورتە هەستی پێناکرێت و دەڵێن یەك لەسەر سەدی چرکەیەکە.. باشە ئەگەر خوا حەزرەتی ئاگادار نەکردبێت چۆن ئاوا بەچەند وشەیەك ئالیەتی هەندەسی وردی ئەوکردارە فیزیاییە دەتوانێت باس بکات و تەنها لە سەدەی بیستیش دا زانایان بیدۆزنەوە ؟؟!!ئەوەی سەیرە زانایان هەمان تەعبیری حەزرەت بەکاردێنن کە هاتن و گەڕانەوەیەوماوەکەش هەر چاو تروکاندنێکە !!

هەورە بروسکە شتێکی ترسناکەو هەرلەکۆنەوە مرۆڤ لێی ترساوەو تەنانەت ئیغریقیەکان دەیانووت ئەوە چەکی (خوای زیۆس)ە و هەزاران خورافات و ئەفسانەیان لەبارەوە دانابوو .لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەوە تا سەدەی بیست واتە: دوو سەدەو نیو دیراسات و تاقیکردنەوە کراو بە هۆی کامێرەی زۆرو بە هۆی مانگە دەستکردەکانەوە بە هەزاران باس و لێکۆلینەوە سەری هەڵدا، لەساڵی ٢٠٠٠ع توانیان وێنەی هاتن و گەڕانەوەی هەورە بروسکە بگرن پاش ئەوەی توانیان کامێرەی زۆر پێشکەوتوو بۆ ئەم مەبەستە دروست بکەن، شایانی باسە لە هەر چرکەیەکدا سەد هەورە بروسکە دەبێت لەئاسماندا واتە ڕۆژی ٨,٦ ملیۆن هەورە بروسکە.. هەورە بروسکەیەکیش تەیارێکی ١٠٠ هەزار تا ٢٠٠ هەزار ئەمپێر دروست دەکات و ڤۆڵتیەکەشی نزیکەی ١٠٠ملیۆن تا هەزار ملیۆن ڤۆڵت دەبێت[1].

---

(١) سایتی: موسوعة الاعجاز العلمي في القرآن والسنة، د. زغلول النجار .

# شایەتی دانی درۆ و شاردنەوەی شایەتی ڕاستی

یەکێ لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی شایەتی درۆ زۆر دەدرێت و شایەتی هەق و ڕاستی دەشاردرێتەوە، ئەگەر لەم ڕۆژگارە سەرنج بدەین دەبینین لە دادگاکان چ شایەتیەکی درۆ دەدرێت و چەند کەس ستەمی لێدەکرێت و چەندین کەس ماڵی حەرام دەخۆن، ئەمڕۆ هەموو فەرمایشتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بە چاوی خۆمان دەبینین.

پێشەوا ئیبنو مەسعود(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (أَنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ تَسْلِيمَ الْخَاصَّةِ وَفُشُوَّ التِّجَارَةِ حَتَّى تُعِينَ الْمَرْأَةُ زَوْجَهَا عَلَى التِّجَارَةِوَقَطْعَ الأَرْحَامِوَشَهَادَةَ الزُّورِ وَكِتْمَانَ شَهَادَةِ الْحَقِّ وَظُهُورَ الْقَلَمِ)[١].

واتە: لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی سڵاو لە کەسانێکی تایبەت دەکرێ و بازرگانی بڵاودەبێتەوە تا وای لێ دێ ژن یارمەتی مێردەکەی دەدات لە بازرگانی و پەیوەندی خزماتی دەپچڕێ و شایەدی درۆ دەدرێ و شایەدی ڕاست و ڕەوا دەشاردرێتەوەو پێنوسیش دەردەکەوێ.

بە ڕاستی لەم سەردەمەی ئێستا ئێمە تیایدا دەژین لە زۆربەی دادگاکان و بازاڕەکان و... شایەتی بە درۆ دەدرێ و هەق و ڕاستی تیایدا دەشاردرێتەوە، وە شایەتی بە درۆ دەبێتە هۆی بەتاڵکردنەوەی شایەتی هەق و ڕاستی، پێشەوا عبدالرحمن ی کوڕی ئەبی بکرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ؟ ثَلَاثًا الْإِشْرَاكُ بِاللهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَشَهَادَةُ الزُّورِ)[٢].

---

(١) مسند الإمام أحمد ، (٢/ ٧٩١) برقم: (٣٩٤٧) وقال الشيخ أحمد بن شاكر : إسناده صحيح .

(٢) صحيح مسلم (١/ ٩١) باب: بيان الكبائر وأكبرها، برقم: (٨٧).

واتە: پێتان بڵێم و ئاگادارتان بکەمەوە لە گوناهە گەورەکان: هاوبەش بۆ خودا پەیدا بکەیت و ئازاری دایك و باوکت بدەیت و شایەتی بە درۆ بدەیت و هەق و ڕاستی بشاریتەوە.

چەند هەق بە هۆی شایەتی درۆوە فەوتاوە، چەند ستەم لە بێ تاوانان کراوە بەو هۆیەوە، یان هەندێ شتی وایان دەسکەوتووە کە شایەنی ئەوە نەبوون، یان پلەو پایەو ڕەچەڵەکێکیان دراوەتێ کە پلەو پایەو ڕەچەڵەکی خۆیان نیە، لەو کەم تەرخەمیانەی کە لە شایەتی دانی درۆ ئەوەیە کە هەندێ کەس لە دادگاکاندا دەیکەن لە گوتنیدا بەوەی کە کەسێ لەوێدا دەڵێ: شاهێدی بۆ دام و شاهێدی بۆ دەدەم، شایەتی بۆ دا لە شتێك دا پێویستی بە زانینی ڕاستی و حاڵەتەکەی هەیە وەك شاهێدی بۆ بدایە خاوەنی خانوویەکە، یان بێ تاوانی بۆ کەسێك ڕادەگەیەنێت لە کاتێکدا ئەو لە دەرگای دادگا نەبێت، ئەمەش درۆ و شایەتیەکی درۆیە.. یان هەیە شایەتی دەدات لەبەرامبەر کرێیەکدا وەکو ئەوانەی لەبەردەم دەروازەی دادگاکاندا دەبینین ئەوە شایەتیدانی درۆیە.. هەروەها شایەتیدانی درۆ لە زۆرێك لە ماڵەکانماندا لە کاتی کێشەی کۆمەڵایەتی و خێزانیەکاندا دەبینین، هەروەها گرفتی ژن و مێردو گرفتەکانی تەڵاق، لەم باسانەشدا شایەتی درۆ دەبینین.. هەروەها شایەتی دانی درۆ وەك ئەو باوکەی شایەتی ڕەوشت بەرزی و چاکی بۆ کوڕەکەی دەدات دەشزانێت کە مەی دەخواتەوەو نوێژیش ناکات کەچی بە فریشتە دەیچوێنێ.. یاخود شایەتی دانی دایك بۆ کچەکەی کە ڕەوشت بەرزە لە کاتێکیشدا وانییە ئەوە شایەتی دانی درۆیە..

دووبارەکردنەوەی هۆشداری دانی دەربارەی شایەتی بە ناحەق لێرەدا لەبەر ئەوە بوو خەڵك بە کارێکی ئاسان سەیری دەکات و زۆر دەرهاویشتەی خراپی لێدەکەوێتەوە، وەکو دوژمن کاری و حەسودی، هەروەها خراپەی زۆری لێ پەیدا دەبێت، چەندین ماف بەهۆی شایەتی بە ناحەق پێشێل کراوە، چەندین ستەم بە سای ئەوە کراوە بەرامبەر خەڵکی بێ تاوان، یان چەندین کەس دەسکەوتی وایان بەدەست هێناوە، کە مافیان نەبووە، یان چەندین کەس کراوە بە نەسەبەی کەسانێك بەسای ئەو شایەتیە، کە لەوەچەی ئەوان نەبووە.

# بەرزکردنەوەی باڵەخانەو خانوو بەرە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر خانوو باڵەخانەکان بەرز دەکرێنەوە..

حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مِنِ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ خَصْلَةً: إِذَا رَأَيْتُمُ النَّاسَ .. وَاسْتَعْلَوُا الْبِنَاءَ..)[١]

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر حەفتاو دوو تایبەتمەندە: ئەگەر خەڵکانێکتان بینی .. باڵەخانەکانیان بەرز کردەوە ..

ئەگەر سەیری مێژووی ئەندازیاری و ئاوەدانی بکەین دەبینین بیناسازی و باڵەخانەکان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم دەستی پێکردووە، ئەم پێشکەوتنە گەورەیەی لە بارەی تەکنەلۆژیاو بڵاوبوونەوەی پیلکانە کارەباییەکان توانای بەخشیە بینا بەرزەکان و باڵەخانە هەور بڕەکان، فەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە خەڵك پێشبڕکێ دەکەن بۆ دروست کردنی بینا بەرزەکان کە ئەمەش بە ڕاستی ئەمڕۆ بەدی هاتووە، دەوڵەتانیش کە دێنە پێشبڕکێ لەم بوارە هەر دەوڵەتێك هەوڵ دەدات بۆ دروست کردنی باڵەخانەی بەرزتر لەوانی دیکە.

ئەبو هوریرە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (لَا تَقومُ الساعةُ حَتى يَتطاولَ النَّاسُ فِي البُنيان)[٢].

---

(١) حلية الأولياء، لأبي نعيم (٣/ ٤١٠)، بە ژمارە (٤٥٥٥). حديث مرفوع، غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ ، لَمْ يَرْوِهِ عَنْهُ فِيمَا أَعْلَمُ إلا فَرَجُ بْنُ فَضَالَةَ . وهو ضعيف كما قال الحافظ العراقي ( ٢٩٧/٣).

(٢) الأدب المفرد (١/ ١٦٠) باب: التطاول في البنيان، برقم: (٤٤٩).

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا خەڵکی خانووی قات قاتی بەرز دروست دەکەن.

(يَتطاولَ البُنيان) بە زۆرکردنی نهۆمی ماڵەکان دەبێت و بەرزکردنەوەیان، هەروەها بە چاك دروستکردنی بونیات و بەهێزکردن و جوانکردنی و بە فراوەنکردنی خانووەکان و زۆرکردنی بەشەکانی.

ئیبنو حەجەری عەسقەلانی (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت:

واتای کێبرکێی بەرزکردنەوەی تەلارەکان، ئەوەیە کە هەرکەسێك بینایەك دروستدەکات، دەیەوێت بەرزاییەکەی لە بەرزایی بینای کەسێکی تر زیاتر بێت[1].

ئەمڕۆ فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتوونەتە دی، خەڵکی ئەمڕۆ بینای وا دروست دەکەن کە لە دەیان نهۆم پێك هاتووە بە تایبەتی ئەو عەرەبانەی کە هەتا دوێنیٚ ڕووت و پیٚ پەتی بوون و حوشتریان دەلەوەڕاندو نان نەبوو بیخۆن و بەشی زۆریان لە چادرو خێوەتگا دەژیان یان لە خانووی گڵدا دەژیان کە بستێك لە بالاٌی خۆیان بەرزتر نەبوو، ئەمڕۆ دەیان بینین لە ژێر سایەی نەوت و پترۆڵ هەمووی لە خانووی چەند نهۆمیدا دەژین و سەدان و هەزاران کۆشکی وایان دروست کردووە کە دوورگەی عەرەبی لە مێژووی تەمەنیدا شتی وای بە خۆوە نەدیوە، کە ئەمەش بە پێی فەرموودەکان یەکێکە لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی.

ڕۆژنامەیەکی کوەیتی ئەوەی ڕاگەیاندووە، کە کێبڕکێیەکی توند ڕووبەڕووی بورجی دوبەی دەبێتەوە، لەو پڕۆژانەی دیکەی نیوە دوورگەی عەرەبییەوە، کە خاوەنەکانیان هیوای ئەوەیان هەیە، کە بەرزایی ئەم بورجانە، بەرزایی بورجی دوبەی تێپەڕێنێت، کە بورجی دوبەی بەرزاییەکەی زیاتر لە ٨٠٨ مەترە.

ڕۆژنامەی (القبس)ی کوەیتی ئەوەی ڕاگەیاند، لە کاتێکدا خاوەن پڕۆژەکان بۆ پێشبڕکێکردنیان لە دروستکردنی بەرزترین بورجدا، پشت بە ناوبانگ و شکۆ دەبەستن، بەهیوای بەدەستهێنانی قازانج، ڕەنگە گەڕانەوەی سەروەت و سامانی سەرفکراویان لەم پڕۆژانەدا هیوایەکی کەمی هەبێت.

---

(١) فتح الباري (١٣/ ٨٨).

## كێبڕكێی هەرێمی :

لە وڵاتی كوێت، كۆمپانیای (تمدين العقاريه وأجيال) پلان دادەنێت بۆ دروستكردنی بورجێك بە بەرزایی ١٠٠١ مەترو ناو دەنرێت بورجی موبارەكی گەورە، ئەم بورجە بەشێكە لە پرۆەی گەشەپێدانی شاری (الحرير)، كە بڕی ٨٦ ملیار دۆلاری تێدەچێت.

لە بەحرەین، كۆمەڵگای شاری مەرجان ٢٠٠ نهۆم دەگرێتە خۆی بە بەرزایی ١٠٢٢ مەتر، ئەم پرۆژانەی كە لەداهاتوودا دەستیان پێدەكرێت، مشتومڕێك دروست دەكەن، لەكاتێكدا لوتكەی پەیوەندییە گشتیەكانی لە پشت بەدەستهێنانی بینایەك، كە خاوەنی زۆرترین بەرزیی بێت، هاوكاریی دانانی شارێك لەسەر نەخشە دەكات. واقعی ئابوری و دروستكردنی باڵەخانە بەرزەكان جێگەی پرسیاری گەورەن. پێشبڕكێ لەسەر دروستكردنی درێژترین بورج لە وڵاتانی دوورگەی عەرەبیدا، هەروەها پرسیار لە سوودو جوانكاری و كاریگەریی ژینگەییان، وێنەی جەنگێكی دڕندانە لە نێوان وڵاتانی دوورگەی عەرەبیدا، كە بە نەوت دەوڵەمەندن، دەكێشێت.

بەتایبەت پاش ڕاگەیاندنی سووربوونی ئەمیر بن تەلال لەسەر دروستكردنی بورجێك لە سعودیە كە بەرزاییەكەی لە ١٦٠٠ مەتر تێدەپەڕێت، بەمەش هەموو سنووورە نەفسی و ئەندازەییەكان تێدەپەڕێنێت، لەگەڵ ئەم بورجەدا ئەمیری سعودی كە لە دەوڵەمەندترین پیاوانی جیهان دادەنرێت، زیاتر لە ڕكابەرەكانی لە دوورگەی عەرەبیدا دەڕوات، بەتایبەت ڕكابەرەكانی لە دوبەی و كوێت[1].

ئەمەش هەواڵدانی پێغەمبەرە(ﷺ) لەبارەی شوانەكانی مەڕوماڵات و حوشترەوە، ئەوە عەرەبەكانی نیشتەجێی بیابانن (كێ لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) بە شوانی و مەڕوماڵات و حوشتر بەناوبانگ بوو، جگە لە عەرەب) بەردەوام دەبن لە كێبڕكێی بەرزكردنەوەی تەلارو باڵەخانەكان هەتا دەگەنە، ئەوەی هەر

---

(١) گۆڤاری هەیڤ. گۆڤارێكی ئیعجازی قورئان و فەرموودەیە.

یەکێکیان هەوڵدەدات تەلارێك دروستبكات بەرزتر بێت لە هاوتاکەی و ئەمەش ڕوویداوە.

چۆنیەتی دروستکردنی بناغەی بیناکان لە ڕووی زانستی سەردەمەوە چەند خاڵێك ڕوون دەکەینەوە بۆ ئەوەی زیاتر ئێوەی بەڕێزو خۆشەویست سوودمەندبن، خوای گەورە دەفەرموێ:

[ أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٍ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَانْهَارَ بِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿١٠٩﴾ ][1].

لەم ئایەتە پیرۆزە خوای گەورە باس لە دروستکردنی (مسجد الضرار) دەکات کە لە لایان (دووڕووەکان) مونافیقەکانی شاری مەدینەوە هەستان بە دروستکردنی بە مەبەستی خستنەوەی ناکۆکی و دووبەرەکی لە نێوان باوەرداران دا .

ئەو بینایەی کە دووڕووەکان دروستیان کرد، گەرچی مزگەوت بوو وەك هەریەك لە مزگەوتەکان، بەڵام دروست کردن و مەبەست و نیەتیان لەم بونیاتنانەدا شاراوە نەبوو، جگە لە خراپی و پیسی مەبەست و نیەتیان هیچی تر نەبوو .

ئەم ئایەتە پیرۆزە وێنەیەکی هونەری جوانی (ماددی و مەعنەوی) (بەرجەستەو بێ جەستە)ی بۆ کۆکردینەوە، بە لێکچواندنی تێگەیشتنێکی بێ جەستە بۆ تێگەیشتنێکی بەرجەستەی هەست پێکراو.

پوختەی واتای ئایەتە پیرۆزەکە بریتیە لەوەی: ئەگەر کەسێك هەستێت بە دروست کردنی بینایەك بە مەبەست و نیەتی دووڕوویی و بێباوەڕی، وەك دروست کردنی ئەو بینایە وایە کە لەسەر لێواری چاڵێکی داڕوخاو دروست بکرێت، کە بێگومان ئەنجامەکەی بە داڕووخانی کت و پڕ و خێرای لێوارە چاڵەکەو بیناکەش دێت بە دوای دا .

---

(١) سورة التوبة ، الآية : (١٠٩) .

# دایک دەبێتە خزمەتکاری منداڵی

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی دایك دەبێتە خزمەتکاری منداڵەکانی، ئەم نیشانەیەش زۆر ڕاشکاوانە لەم سەردەمەدا بەدی دەکرێت..

هەروەك لە فەرموودەی جبریل هاتووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) تیایدا فەرمووی: (وَسَأُخْبِرُكَ عَنْ أَشْرَاطِهَا إِذَا وَلَدَتِ الأَمَةُ رَبَّهَا)[1].

واتە: وە لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە دایك ببێتە خزمەتکاری بەخێوکەرەکەی.

زانایان لە واتای ئەم نیشانەیە چەند بۆچونێکیان هەیە، کە پێشەوا ئیبنو حەجەری عەسقەلانی چوار لەم بۆچوونانەی باسکردووە:

١) پێشەوا خەتابی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

واتای وایە ئیسلام دەسەڵاتی بەر فرەوان دەبێ و دەست دەگرێ بەسەر وڵاتەکانی کافر، جاریە زۆر دەبێ مناڵیان دەبێ، وە مناڵەکەش لە شوێن گەورەکەیەتی لەبەر ئەوەی منداڵ نەسەبی لە باوکیەتی کە ئازادە بەڵام دایکی هەر بە جاریە دەمێنێتەوە[2].

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: ئەمە قسەی زۆربەی زانایانە دەربارەی ئەم فەرموودە[3].

پێشەوا ئیبنو حەجەر(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ:

---

(١) صحيح البخاري (١/ ٩٧) باب: سؤال جبريل النبي، برقم: (٥٠).

(٢) فتح الباري (١/ ١٢٢).

(٣) شرح صحيح مسلم (١/ ١٥٨).

لەم واتایە گومانێك هەیە[١]، لەبەر ئەوەی منداڵ بوونی ژنە جاریەکان لەو سەردەمی کە ئەم فەرموودەیەی فەرموە هەبووە، وەدەست بەسەر داگرتنی وڵاتانی کوفرو جاریە گرتنیان لەسەرەتای ئیسلامدا هەر هەبووە، جا واتای گشتی فەرموودەکە ئەوە دەخوازێ کەوا ئەم ڕووداوە ڕوویدات لە نزیك هاتنی قیامەت[٢].

٢) ئەوەیە کەوا پیاوەکان دایکی منداڵەکانیان کە جاریەن بفرۆشن و ئەمە زۆر بێ و بڵاوبێتەوە، جا منداڵ دایکی بکڕێ و نەی ناسێتەوە دەبێتە گەورەی.

٣) ئەوەیە کە جاریەکە منداڵێکی ببێ بە جووت بونێکی گوماناوی یان داوێن پیسی لە پاشان جاریەکە بفرۆشێتە یەکێك دروست، جا منداڵەکەی یان کچەکەی بیکڕێ بەڵام ئەو ڕایەش هەروەکو یەکەم وایە.

٤) ئەوەیە کە پێشێڵ کردنی مافی دایك لەلایەن منداڵەکەیەوە بێ و هەڵسوکەوتی خۆ بەگەورە زانین بەرامبەر دایکی بەکار بێنێ، وە ئیهانەی بکات بە جوێن و لێدان و خزمەتکاری پێکردنی.

پاشان پێشەوا ئیبنو حەجەر(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

ڕاڤەی چوارەم زیاتر لەمەبەستی فەرموودەکە نزیکە لای من، لەبەر ئەوەی شوێنەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا ئەم کارە نامۆیە دەبێتە نیشانەیەك بۆ ڕۆژی دوایی ئەو کاتەی کە کارەکان پێچەوانە دەبنەوە بە جۆرێك بەخێوکەران دەبنەوە خزمەتکار[٣].

٥) پێشەوا ئیبنو کەثیر(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

ئاماژە پێکراوە لەوانەیە لە کۆتایی زەمان بێتە دی، کە ئەو ئافرەتە بن کە لەلای پیاوێکی گەورە بن و جگە لەو نەبن لە ئازادەکان، جا لەبەر ئەمە پێوانەی

---

(١) پێشەوا ئیبنو کەثیر ئەم وتەیە بە دوور دەخاتەوە لەمەبەستی فەرموودەکە.

(٢) فتح الباري (١/ ١٢٢).

(٣) فتح الباري (١/ ١٢٢ ١٢٣).

بەرگی دووەم

کرد بە فەرموودەی: (وە کە بینیت کەوا برسیان و پێخواسان و ڕووتان و هەژاران شانازی دەکەن بە خانووی بەرزو تەلارەوە)[1].

هەندێ لە ئەهلی زانست و زانیاری فەرموویانە: کابرایەکی گەورەی ئازاد کەنیزەکێ لە کەنیزەکان مارە دەکات.. پاشان کوڕێکی لێ دەبێت، ئەم کوڕە کە لەم کەنیزەکە بووە دەدرێتە پاڵ ئەو پیاوەو بەناوی ئەوەوە بانگ دەکرێت، وە بە ئازادی و گەورەیی (سید) گەورە دەبێت چونکە کوڕی ئەو پیاوەیە لە کاتێکدا کە دایکی هێشتا کەنیزەکێکە لە کەنیزەکەکان[2].

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: زۆربوونی ڕەنجاندن و سەرپێچی دایك و باوك لەلایەن منداڵەکانیانەوە[3].

---

(١) النهاية في الفتن والملاحم (١/ ١٧٧).

(٢) فتح الباري (١/ ١٥٣).

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

## ئاوات خواستن بە مردن لە ترسی ئاشوب

ئاوات خواستن بە مردن یەکێکە لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی.

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ بِقَبْرِ الرَّجُلِ فَيَقُولُ: يَا لَيْتَنِي مَكَانَهُ)[1].

واتە: سوێند بەوەی کە گیانی منی بە دەستە دونیا کۆتایی پێ نایەت هەتا وای لێدێت پیاو بە لای گۆڕێکدا تێ دەپەڕێت و دەڵێت: خۆزگە من لە جێی مردووی ئەم گۆڕە بوومایە.

لە فەرموودەیەکی تر دەفەرموێ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا تَذْهَبُ الدُّنْيَا حَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ عَلَى الْقَبْرِ فَيَتَمَرَّغُ عَلَيْهِ، وَيَقُولُ: يَا لَيْتَنِي كُنْتُ مَكَانَ صَاحِبِ هَذَا الْقَبْرِ، وَلَيْسَ بِهِ الدِّينُ إِلَّا الْبَلَاءُ)[2].

واتە: سوێند بەوەی کە گیانی منی بە دەستە دونیا کۆتایی پێ نایەت هەتا وای لێدێت پیاو بە لای گۆڕێکدا تێدەپەڕێت خۆی لە خۆڵەکەی وەردەدات و دەڵێت: خۆزگە من لە جێی مردووی ئەم گۆڕە بوومایە، لەبەر دینداری وا ناڵێت، بەڵکو لەبەر بەڵاو ناخۆشی و فیتنە وا دەڵێت.

پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەڵێت:

ڕۆژگارێك دێت بەسەرتان، گەر یەکێ لە ئێوە مردن هەبێ کەوا بیفرۆشێ ئەوا ئەو دەیکڕێ[3].

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٣١) باب: لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل، برقم: (٢٢٣١).

(٢) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٣١) باب: لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل، برقم: (٢٢٣١).

(٣) فيض القدير شرح جامع الصغير (٦/ ٤١٨).

پێشەوا حافیظی عێراقی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەوە ناگەیەنێ کە لە هەموو وڵاتێك یان کاتێك یان لە هەموو خەڵکیدا ئەم تەمەننای مردن خواستنە ڕوو بدات، بەڵکو ڕاستیەکەی ئەوەیە کە لە هەندێك شوێن ئەمە ڕوودەدات، بەڕاستی ئەمەش بەڵگەیەکە کە خەڵکی ئەو کات تووشی چ ناخۆشی و بەڵایەکی توند دەبنەوە، لەبەر ئەوەی مرۆڤ خۆزگە دەخوازێ بۆ مردن بەبێ ئەوەی خۆی بۆ ئامادەکردبێ، لەبەر ئەوەی کاتێ مردوو و گۆڕەکانی بینی حەزی پێناکات، بەڵام ئەم مرۆڤە لەبەر ناخۆشی ئاشوب مەرگ دەخوازێ، جا ئەم فەرموودە دژی ئەم فەرموودە نیە کە نابێ مرۆڤ مردن بخوازێ و خۆزگەی بۆ بکات لەبەر ئەوەی ئەم فەرموودە باسی حاڵی سەردەمێك دەکات کە خەڵك مردن تیایدا دەخوازن و باس لە حوکمی دروست بوونی یان نەبوونی ناکەن[1].

بەڵگەش هەیە کە دروستە داوای مردن بکەیت لە کاتی فیتنەو ئاشوب بە پێی ئەم دوعایەی پێغەمبەری خوا (ﷺ): (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ، وَتَرْكَ الْمُنْكَرَاتِ، وَحُبَّ الْمَسَاكِينِ، وَأَنْ تَغْفِرَ لِي وَتَرْحَمَنِي، وَإِذَا أَرَدْتَ بِقَوْمٍ فِتْنَةً فَتَوَفَّنِي إِلَيْكَ، وَأَنَا غَيْرُ مَفْتُونٍ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ حُبَّكَ، وَحُبَّ مَنْ يُحِبُّكَ، وَحُبًّا يُبَلِّغُنِي حُبَّكَ)[2].

مەبەست لە دروست بوونی مرۆڤ ئاوەدان کردنەوەی سەر ڕووی زەمین و خواپەرستیە، ئەو ڕۆح و لاشەی کە خوا بە ئێمەی بەخشیوە سامانی ئێمە نیە، تاکو بتوانین هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەین، بەڵکو سامانی خودایەو بە ئەمانەت لەلامانەوەیە، هەر کات حەز بکات دەیباتەوە.

مرۆڤ کاتێ تووشی ئەشکەنجەو ئازار دەبێ، ئەو کات دڵی تەنگ دەبێ هەست بە نا ئومێدی ژیان دەکات، چ لەلایەنی دینەوە بێت مەبەستم پێ ئێش و ئازارەکەیە، چ لە لایەنی ژیانی ڕۆژانەیەوە بێت، ئەو کات ئاواتە خوازە بمرێت و نەمانی لەم ژیانە بە باشتر دەزانێ کە ژیانێکی پڕ ئێش و مەرگەساتە.

---

(١) فتح الباري (١٣/ ٧٥ ٧٦).

(٢) صحيح: لمستدرك (١/ ٧٠٨) برقم: (١٩٣٢) قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الْبُخَارِيِّ.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێمان ڕادەگەیەنێ کە ئاوات نەخوازین بۆ مردن لە کاتی ناخۆشی و ناڕەحەتی ژیانی دونیا، ئەگەر پێویستی دەکرد ئاواتە خوازی بین فێرمان دەکات کە چی بڵێین.

پێشەوا ئەنەس (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ، فَإِنْ كَانَ لَا بُدَّ مُتَمَنِّيًا فَلْيَقُلْ: اللهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْرًا لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْرًا لِي)[١].

واتە: هەرگیز ئاوات بە مردن مەخوازن کاتێك ناخۆشی و ناڕەحەتیەکتان بەسەر داهات، ئەگەر پێویست بوو داوای بکەن بەم شێوەیە داوای بکەن، ئەی پەروەردگارا بمژێنە ئەگەر ژیان چاکە بۆ من، بمرێنە ئەگەر مردن چاکە بۆ من.

بۆیە ئاوات نەخواستن دوو سودی بۆ موسڵمانان هەیە:

یەکەم: مانەوەی بڕوادار لەسەر گۆی زەوی تەنیا خێرو چاکەی لێ چاوەڕوان دەکرێ، توێشوو زەخیرە بۆ خۆی زیاد دەکات، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لَا يَتَمَنَّى أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ إِمَّا مُحْسِنًا فَلَعَلَّهُ يَزْدَادُ وَإِمَّا مُسِيئًا فَلَعَلَّهُ يَسْتَعْتِبُ)[٢].

واتە: هیچ کەسێکتان ئاوات نەخوازێت بە مردن، چونکە ئەو کەسە ئەگەر چاکە کار بێت دەگونجێت چاکەکانی زیاتر بکات، ئەگەر خراپەکاریش بێت دەگونجێت بگەڕێتەوە لای پەروەردگار واز لە خراپەکاری بهێنێت.

هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر لە ناخۆشی و ناڕەحەتی دەژیان، لەگەڵ ئەوەش داوای مردنیان نەدەکرد، چونکە قەدەغە کرابوو.

پێشەوا قەیسی کوری حازم(ﷺ) دەڵێت: (دَخَلْنَا عَلَى خَبَّابٍ نَعُودُهُ وَقَدِ اكْتَوَى سَبْعَ كَيَّاتٍ... وَلَوْلَا أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) نَهَانَا أَنْ نَدْعُوَ بِالْمَوْتِ لَدَعَوْتُ بِهِ)[٣].

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٠٦٤) باب: كراهة تمنى الموت، برقم: (٢٦٨٠).

(٢) صحيح البخاري (٩/ ٨٤) باب: ما يكره من التمنى ، برقم: (٧٢٣٥).

(٣) صحيح البخاري (٧/ ١٢١) باب: تمنى المريض الموت، برقم: (٥٣٤٨).

واتە: ئێمە سەردانی خەبابمان کرد کە لاشەی لە حەوت شوێندا ئوتو کرابوو دەیگوت: گەر پێغەمبەر(ﷺ) قەدەغەی نەکردبووایە داوای مردن بکەین من داوام دەکرد.

دووەم: داوا نەکردنی مردن دەمانگەیەنێتە پلەی بەرز، جا بەر ستایشی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەوین، کە باشترین کەس ناوی بردووە لە دونیادا، پاداشتێکی زۆریشی بۆ ئامادە کراوە لەلایەن پەروەردگارەوە.

پێشەوا ئەبی بەکرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (أَنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: أَيُّ النَّاسِ خَيْرٌ؟ قَالَ: مَنْ طَالَ عُمْرُهُ وَحَسُنَ عَمَلُهُ، قَالَ: فَأَيُّ النَّاسِ شَرٌّ؟ قَالَ: مَنْ طَالَ عُمْرُهُ وَسَاءَ عَمَلُهُ)[1].

واتە: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد باشترین کەس کێیە؟ فەرمووی: ئەوەی تەمەنی درێژەو کردەوەی چاکە، گوتی: ئەی خراپترین کەس کێیە؟ فەرمووی : ئەوەی تەمەنی درێژەو کردەوەی خراپە.

هەرگیز کردەوەی پیاوێکی تەمەن (٦٠) ساڵان لەگەڵ پیاوێکی تەمەن (٣٠) ساڵان ناچن بەناو یەك تەرازوودا.

جا ئەوەی باسمان کرد کە قەدەغە کرابوو ئاوات بخوازێ بە مردن لە کاتێك دا بوو کە مرۆڤ کاتی بۆ ڕەخسا بێ، هیچ گرفتێك نەبێت لەبەر دەمیدا وەکو فیتنەی مردن، یان بڵاوبوونەوەی کاری بەدڕەوشتی بەڵام گەر ژیانی دونیای بۆ نەڕەخسا بوو بۆ ئەوەی بتوانێ خوا پەرستی تێدا ئەنجام بدات و لە کردەوە چاکەکانی بەردەوام بێت، ئەو کات بۆی هەیە ئاوات بخوازێ بە مردن.

پێشەوا ئەنەس (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) هەموو جارێك ئەم دۆعایەی دەکردو دەیفەرموو: (.. وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْرًا لِي)[2].

واتە: بم مرێنە گەر مردن باشترە بۆ من.

---

(١) المستدرك (١/ ٤٨٩) برقم: (١٢٥٦).

(٢) صحيح مسلم (٤/ ٢٠٦٤) باب: كراهة تمنى الموت، برقم: (٢٦٨٠).

ئەمە لە کاتێکدایە کە هەست بکەیت لەسەر ڕووی زەوی هیچ چاکە کاریەك نەماوە، ترسی لە دەست دانی بیروباوەڕەکەت هەبوو، بێگومان کە ژیان بەم ئاڕاستەیە ڕۆیشت، خێرو بێری بۆ موسڵمانان تێدا نەما مردن چاکترە.

یەکەم کەس کە ئاواتی بە مردن خواستبێ پێغەمبەر یوسف بوو، خوای گەورە دەفەرموێ: [رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِي مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾].

واتە: ئەی بەدی هێنەری ئاسمانەکان و زەوی تۆ پشت و پەناو یارو یاوەری منیت لە دونیاو قیامەتدا، داواکارم بە موسڵمانی بم مرێنیت و بمخەیتە ڕیزی چاکەکانەوە بمگەینیتە بە کاروانی چاکان .

یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێت:

بەیانیەك پێغەمبەر(ﷺ) بۆ نوێژی بەیانی دوا کەوت، دوای بە پەلە هات و نوێژەکەی بۆ کردین، ئێمەش پرسیاری ئەوەمان لێکرد کە بۆچی دوا کەوتی؟

فەرموی: خەونێکم بینی، تا لە کۆتاییدا فەرمووی: خوای گەورە پێی فەرمووم: ئەی محەممەد(ﷺ) داوا بکە، منیش داوام کردو گوتم: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ عَمَلًا بِالْحَسَنَاتِ، وَتَرْكًا لِلْمُنْكَرَاتِ، وَإِذَا أَرَدْتَ فِي قَوْمٍ فِتْنَةً وَأَنَا فِيهِمْ فَاقْبِضْنِي إِلَيْكَ غَيْرَ مَفْتُونٍ)[1].

واتە: ئەی پەروەردگار داوات لێ دەکەم کە ئیشی چاکە بکەم و واز لە خراپە بهێنم، ئەگەر ویستت توشی فیتنەو وەرگێڕانیان بکەیت، ئەگەر من لەناویاندا بووم ئەی خوایە بم مرێنە و رزگارم بکە لەو بەڵایەی کە توشی ئەوانی دەکەیت.

هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) هەر کاتێك هەستیان بکردبوایە کە ژیان بۆ ئەوان خێرو بێری نەماوە، ئاواتە خواز بوون بۆ مردن .

---

(١) المعجم الكبير (٨/ ٣٤٩) برقم: (٨١١٧).

پێشەوا عومەری کوری خەتاب (ﷺ) لە کۆتایی تەمەنی دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ كَبِرَتْ سِنِّي وَضَعُفَتْ قُوَّتِي. وَانْتَشَرَتْ رَعِيَّتِي. فَاقْبِضْنِي إِلَيْكَ غَيْرَ مُضَيِّعٍ وَلاَ مُفَرِّطٍ)[١].

واتە: ئەی پەروەردگار بێ هێزو لاواز بوومە تەمەنم درێژ بووە، ژێر دەستەکانم بڵاوەیان کردووە، خوایە بمبەرەوە لای خۆت ، پێش ئەوەی کەم و کورِی و نارِەحەتیم بێتە رِێ، لە پاش یەك مانگ دوای ئەم پارِانەوەیە خوای گەورە بردیەوە لای خۆی.

پێشەوا عەلی (ﷺ) هەموو جارێك بە حەسەنی کورِی دەگوت لە شەرِی (صفین): (وَلَوَدِدْتُ أَنِّي مُتُّ قَبْلَ هَذَا بِعِشْرِينَ سَنَةً)[٢].

واتە: ئەی حەسەن ئاواتە خواز بووم کە بمردوبوومایە پێش (٢٠) ساڵ لەمەوبەر.

پێشەوا ئەبی سەلەمە (ﷺ) دەڵێت: چووینە لای پێشەوا ئەبو هورِەیرە (ﷺ) سەیرم کرد وا لەسەر مەرگ دایە زۆر مردنی لەسەر نارِەحەت بوو، منیش باوەشم پیادا هێناو گوتم: خودایە شیفای ئەبو هورِەیرە (ﷺ) بدەی، ئەویش فەرمووی: سوێند بە خوا رِۆژگارێك دێتە پێش موسڵمانان بە لای گۆرِدا تێپەرِ دەبن ئاوات دەخوازن بە جێگای مردووەکان.

جا مرۆڤ چەند کردەوەکانی زیاد بێت پلەی بەرزتر دەبێت، بۆیە گەر کردەوەی زیاتری پێ دەکرا قەدەغە کراوە لەسەری داوای مردن بکات، بەڵام ئەگەر وانەبوو کردەوەکانت هەر خراپە بوو، ئەو کاتە ئاوات خواستن بە مردن بۆت بە چاکە دەنوسرێت.

لە کۆتاییدا ئەم وتەیەتان بە بیر دێنمەوە کە پێشەوا سەهلی کورِی عەبدوڵلای تەستەری (رِەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: کەس داوای مردن ناکات تەنیا سێ کەس نەبێت:

- پیاوێك نەزان بێت بە رِووداوەکانی پاش مردن.
- پیاوێك سەرگەردان بێت بە قەدەری خوا.
- پیاوێك حەز بکات بە گەیشتنی بە خوا.

---

(١) المستدرك (٣/ ١٠٤) برقم: (٤٥٧٤).

(٢) المستدرك (٣/ ١١١) برقم: (٤٥٥٧).

# کاری بەدڕەوشتی لەسەر ڕێگاکان ئەنجام دەدرێت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر لە هەندێك شار کاری بەدڕەوشتی لەسەر ڕێگاکان ئەنجام دەدرێ.

ئەو کۆمەڵگایانەی کە زینا لە ناویاندا بڵاوبۆتەوە کە لە ڕێگای خودا لایان داوە، لەو پەڕی چەرمەسەری دەناڵێنن و بەدەست زیناوە گیریان خواردووەو بنەمای ڕەوشت لەناویاندا ڕووخاوە، بە تایبەتی بناغەی ئایین، بەڕاستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕاستی فەرمووە کە دەربارەی میللەتانی زیناکەر هەواڵی داوە بەراوردی کردووە لەگەڵ ڕوودانی قیامەت کە دەفەرمووێت: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لا تَفْنَى هَذِهِ الأُمَّةُ حَتَّى يَقُومُ الرَّجُلُ إِلَى الْمَرْأَةِ فَيَفْتَرِشُهَا فِي الطَّرِيقِ فَيَكُونُ خِيَارُهُمْ يَوْمَئِذٍ مَنْ يَقُولُ لَوْ وَارَيْتَهَا وَرَاءَ هَذَا الْحَائِطِ)[1].

واتە: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەم ئوممەتە لەناو ناچێت، تا پیاو بۆ ژن هەڵدەستێ و لە چەقی ڕێگا ڕایدێخی، جا چاکترین کەسێکی ئەو ڕۆژە ئەو کەسەیە کە بڵێ: ئەگەر بتبردایە پەنا ئەو دیوارەی باشتر بوو.

ئەمڕۆ کۆمەڵە گەنجێك بەدی دەکەین کە چەند مەترێك دوورن لەسەر ڕێگاکان یان پارکەکان و کەسیش بۆی نییە بڵێت بۆ ئەو کارە ئەنجام دەدەیت.. ئەمەش بە هۆی نەمانی پیاوەتی و مەردایەتیە بە بەرچاوی خەڵکیەوە لەسەرە ڕێگاکان زینا دەکرێت و کەسیش ڕێگری ناکات، لەم سەردەمە ئەم دیمەنانە لەسەر ڕێگاکان و سەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان بەدی دەکرێت.. زۆر بە ئاشکرا.

پاکو بێگەردی بۆ خوای گەورە کە لەم سەردەمە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەمووی هاتوونەتە دی.

---

(١) صحيح: صحيح ابن حبان (١٥/ ١٧١)، ورواه ابو يعلى في مسنده (٦١٨٣/ ٣٤٤)، قال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٣٣١/٧) رواه أبو يعلى، ورجاله رجال الصحيح.

# زۆر بوونی مردنی کتوپڕ

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر مردنی کتوپڕ زۆر دەبێت..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (مِنَ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ ..مَوْتُ الْفَجْأَةِ)[1].

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی ڕۆژی دوایی مردنی کتوپڕ دەردەکەوێت.

بە پێی ئەم فەرمووده پیرۆزە بۆمان بە دیار دەکەوێت کە هاتنی مردنی کتوپڕ نیشانەیەکە لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی.

لە ڕیوایەتێکی تردا فەرموویەتی: (من أشراط الساعة موت البدار) [2].

واتە: لە نیشانەکانی قیامەت مردنی کت وپڕو خێرا زۆر دەبێت..

ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) بریتیە لە موعجیزەیەکی زانستی کە لە ناوەڕۆکی بابەتەکەماندا دەیسەلمێنین بە بەڵگەی پزیشکی، ئەم موعجیزەیە شایەتی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەدات کە نێردراوی خوایەو هەموو قسەکانیشی پەیامی خوای گەورەن.

ئەمەش کارێکی زۆر پێش چاوە لەم سەردەمەدا، بە جۆرێك مردنی کتوپڕ کە زۆر بڵاوە لە نێو خەڵکیدا پێی دەڵێن (السكتة القلبية) واتە: وەستانی دڵ بۆیە مرۆڤی هۆشمەند وا باشە کە ئاگاداری خۆی بێ و تەوبە بکات بۆ لای خوای گەورەو بگەڕێتەوە پێش ئەوەی مردنی لەناکاو پەلاماری بدات.

پێشەوا بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

---

(١) رواه الطبراني في (الأوسط) و(الأحاديث المختارة) (٦/ ٣٠٥) برقم: (٢٣٢٥) وحسنه الألباني: في (صحيح الجامع) برقم: (٥٨٩٩).

(٢) المصنف ابن ابي شيبة، برقم (١٢١٣٣) (٧/ ٤٣٩).

إغتنم في الفراغ فضـــل ركوع فعسـى أن يكون موتك بغتة
كم صحيح رأيت من غير سقيمذهبت نفسه الصحيحة فلتة

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: یەکێ لە کارە سەرسوڕهێنەرەکان ئەوەیە کە پێشەوا بوخاری مردنەکەی بە کت و پڕی بوو[1].

نەتەوە یەکگرتوەکان هەموو ساڵێك سەرژمێری تازەمان پێ دەڵێن: سەبارەت بە ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە ئەنجامی وەستانی دڵ و مێشك دەمرن و ئەم ژمارانە لە زیادبوونێکی بەردەوام دان، ئەم سەرژمێریانە پێمان دەڵێن: کە نەخۆشیەکانی دڵ هۆکاری یەکەمی مردنن لە جیهاندا .

لەم لێکۆڵینەوەیەدا بۆمان دەردەکەوێت کە هیچ کەسێکی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی ئەوەی نەداوە کە ڕۆژانێك بێت و مردنی کتوپڕ تیایدا دەرکەوێت و زیاد بێت، مەگەر پەیوەندی بە سروش و نیگاوە هەبێت و لەلایان خوای گەورەوە ئەم زانیاریانەی پێ درابێت.

دیاردەی مردنی کتوپڕ دیاردەیەکی نوێیە تا ڕادەیەك، یەکەمین لێکۆڵینەوەش لێکۆڵینەوەکەی (فرامینگهام) بوو لە ساڵی (١٩٤٨)ع (heart study Framingham) نیوەی ژمارەی ئەو کەسانەی کە بەشداریان لە لێکولینەوەکەدا کردبوو ئێستا لە ژیاندا نەماون .

(فرامینگهام) پێناسەو مردنی کتوپڕمان بۆ دەکات بەو مردنەی کە دوای کەمتر لە کاتژمێرێك لە دەرکەوتنی نیشانەکانی ڕوو دەدات .

دەرکەوتووە کە زۆربەی حاڵەتەکانی مردنی کتوپڕ بە هۆی نەخۆشیەکانی شا خوێنبەری دڵەوەیە، ئەم جۆرە مردنەش پێی دەوترێت (scd/ sudden cardiac death) لە لێکولینەوەکەشدا دەرکەوتووە کە ئەو پیاوانەی تەمەنیان لە نیوان (٤٥-٧٥) ساڵی بووەو بە هۆی نەخۆشیەکانی دڵەوە مردوون لە (٦٠٪) یان بە مردنی کتوپڕ مردوون بەبێ هیچ نیشانەیەکی پێشتر .

---

(١) هدي الساري مقدمة فتح الباري ، للحافظ ابن حجر العسقلاني، (لا ٤٨١).

لیکۆڵینەوەکە ئەوەی دەرخستووە کە مردنی کتوپڕی دڵ بریتیە: لە تێکچوونی کتوپڕ کە ئەمەش لە ئەنجامی حاڵەتی ناجێگیری دەروونیەوە دروست دەبێت، سەرەڕای چاودێری زۆرو خێرا فریاکەوتنی نەخۆشیشەوە بە هەموو ڕێگاکان، بەڵام ئەم نەخۆشیە سەرکەوتووە لە کارەکەیدا .

## مردنی کتوپڕ چیە؟

پێشینان گوتویانە (هۆکارەکان زۆرن مردنیش تاقانەیە)، دەتوانین لەم پەندەوە بیروباوەڕی ساکاری پێشینانمان بۆ دەربکەوێت دەربارەی مردن، پێشینان باوەڕیان وابووە کە مردن هۆکارێکی هەیە ئەویش بریتیە لە نەخۆشی کارەسات خۆ کوشتن یان هەرشتێکی تر، بەڵام کە باس لە مردنی بێ هۆکار بکەین ئەوە مردنی کتوپڕە کە پێشتر نەزانرابوو .

هۆکاری سەرەکی مردن لەم سەردەمە بریتیە لە جەڵتەی لە ناکاوی دڵ کە بەبێ هیچ ئاگادارکردنەوەیەك دێت، دەرکەوتووە کە نیوەی ئەوانەی توشی نەخۆشیەکانی دەبن، بە مردنی کتوپڕ دەمرن، مردنی کتوپڕیش هێرش دەباتە سەر مرۆڤی نەخۆش تەنانەت ئەگەر لە نەخۆشخانەو لە ژێر چاودێریشدا بێت، لێکۆلەوەرەکان دەریان خستووە کە (١٠٪) یان بە شێوەیەکی کتوپڕ لە ناو نەخۆشخانەدا دەمرن و (٩٠٪) یان لە دەرەوەی نەخۆشخانە.

## سەرژمێرییەکان:

هۆکاری یەکەمی مردن لە وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بریتیە لە نەخۆشیەکانی دڵ (جەڵتەی دلأ) بە ڕێژەی نزیکەی (٢٨٪) ی کۆی مردنەکان دەبێت .

ڕاپۆرتەکانی سەرژمێری ئەوە دووپات دەکەنەوە کە لە ساڵی (٢٠٠١)ع تەنها لە ئەمریکا نزیکەی (٧٠٠) هەزار کەس مردوون بە هۆی نەخۆشیەکانی دڵەوە، بەڵام ئەی ژمارەی ئەوانەی کە ساڵانە بە هۆی مردنی کتوپڕەوە دەمرن چەندە؟

لە وڵاتە یەکگرتووەکان ساڵانە زیاتر لە (٣٠٠) هەزار کەس دەمرن بە هۆی نەخۆشیەکانی دڵەوە، سەرژمێرییەکان دووپاتی دەکەنەوە کە ڕێژەی مردنی کتوپری دڵ زیاد دەکات بە شێوەیەکی گشتی لە هەموو جیهانداو پیاوان زیاتر تووشی دەبن لە ژنان بەڕێژەی (٣) بۆ (١)، مردنی کتوپڕ ڕوو دەدات بەبێ هیچ ئاگادارییەکی لە پێش، تەنانەت هەندێ جار بەبێ هیچ نیشانەیەکی نەخۆشی دڵ سەرەڕای ئەو ملیۆنەها دۆلارەیش کە خەرج دەکرێت لە لێکۆڵینەوەکانی نەخۆشییەکانی دڵ لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

لەگەڵ ئەوەی توانیویانە ئەو ژمارەیە کەمبکەنەوە کە لە ئەنجامی نەخۆشی دڵی کتوپڕەوە دەمرن، بەڵام ڕێژەی مردنی کتوپر بە جێگری ماوەتەوە.

**جگەرە کێشان و ئالۆزی دەروونی:**

جگەرە کێشان ئەگەری ڕوودانی مردنی کتوپڕ سێ هێندە بەرز دەکاتەوەو جگەرە کێشان بەرپرسیارە لە (٤/١) ی نەخۆشیەکانی دڵ لە جیهان، ئەم نەخۆشیانە زۆربەیان کۆتاییان دێت بە مردنی کتوپڕ.

ئالۆزیە دەروونیەکان کار لە زیادبوونی مردنی کتوپڕ دەکەن، هەروەها لێکۆڵینەوەکانی قۆناغەکانی تەمەن ڕوونیان کردۆتەوە کە لە بارترین قۆناغی تەمەن بۆ تووشبوونیان بە مردنی کتوپڕ بریتیە لە تەمەنی چلەکان و پەنجاکان، لەم قۆناغەدا تەمەنی ژیری مرۆڤ پێ دەگات، هەروەها ئەوانەی کە نەخۆشی شەکرەیان هەیە ئەگەری تووشبونیان بەم مەرگە زیاترە.

ئایا چارەسەری پزیشکی هەیە بۆ ئەم دیاردەیە ؟

زۆربەی پزیشکان باس لە چارەسەری دوای ڕوودانی نەخۆشیەکە دەکەن (وەستانی کتوپڕی دڵ یان مێشك) لەبەر ئەوەی هەتا ئێستاش چارەسەری ئەم نەخۆشیە ترسناکە نیە ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەری ڕزگاربوون لەم مردنە زۆر کزە.

پزیشکەکان دووپاتی دەکەنەوە کە ڕێگای نموونەیی بۆ بە ڕەنگاربوونەوەی ئەم مردنە بریتیە لە دەستکەوتنی بەرزترین پلە لە جێگیریی کارەکانی دڵدا.

بەرگی دووەم

ئەو چارەسەرانەی کە ئێستا هەن ئەوەیە کە نەخۆشەکە لە ژێر چاودێریەکی ووردا بێت دوای ئەوەی نەشتەرگەریەکی خێرای بۆ دەکرێت، بەڵام ئەم ڕێگایە چارەسەرە هیچ ئەنجامێکی نابێت تەنها لە چەند حاڵەتێکی کەمدا نەبێت، ئامۆژگاری پزیشکان بە کەمکردنەوەی ڕێژەی شەکر و کۆلیسترۆڵ لە خواردنی ئەو نەخۆشانەدا هیچ گرنگیەکی نیە لەم حاڵەتەدا .

بەڵام ئەی چارەسەری ئەوانە چیە کە بە خۆیان نازانن و کەسیش چاوەڕوانی مردنی کتوپڕ یان لێ ناکات؟

زانستی پزیشکی نەیتوانیوە پێشتر درك بەم حاڵەتانە بکات، بەڵام ئایا پێغەمبەر (ﷺ) ئەمانەی پشتگوێ خستووە یان چارەسەری بۆ دانەناون؟

ئایا چارەسەری قورئان و پێغەمبەر(ﷺ) چیە بۆ ئەم حاڵەتانە؟

خوای گەورە ئاماژەی بە وشەی دڵ (القلب) کردووە لە زۆربەی ئایەتە پیرۆزەکان: دڵ هەیە نەخۆشە، دڵ هەیە ڕەق و بێ بەزەییە، دڵ هەیە کوێرەو نابینێ، دڵ هەیە نابیستێ، دڵ هەیە دەترسێت لە خوای گەورە و ئارامە دڵ هەیە دەفامێت و ژیر دەبێت.

کەواتە دڵ تەنها تروومپایەك نیە بۆ پاڵ نانی خوێن بەڵکو دەزگایەکی تەواوەو بەر پرسیارە لە جێگیریی و ئارامی دەروونی لە مرۆڤدا، یادکردنەوەی خوای گەورەش باشترین ڕێگایە بۆ ئارامی و هێوربوونەوەی دڵەکان.

هەر کاتێك باوەڕدار یادی خوای خۆی دەکاتەوە ئەوا دڵەکەی ئارام دەبێت و توشی هیچ تێکچونێك نابێت، تۆش دەتوانیت چاوەکانت دابخەیت، وا لە دڵت بکەیت کە بترسێت و مەزنی و گەورەیی خودا یاد بکەیتەوە، بۆ نمونە بڵێ: (لا إله إلا الله) سەیرکەو بزانە چ هەستێکت لا دروست دەبێت، ئایا هەست ناکەیت لە هەموو کەس زیاتر هێمن و ئارام و دڵنیاتری « وەکو بینیمان کە هۆکاری مردنی کتوپڕ بریتیە لە تێکچونی لە ناکاو لە ئیشەکانی دڵا، لەبەر ئەوە پزیشکان نەیانتوانیوە هەتا ئێستا چارەسەری ئەم دیاردەیە بکەن، بەڵام قورئانی پیرۆز چارەسەری کردووە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فێری پاڕانەوەیەکی کردوین کە هەموو ڕۆژێك خوێندویەتی دەفەرموێ: (مَا مِنْ عَبْدٍ يَقُولُ فِي صَبَاحِ كُلِّ يَوْمٍ، أَوْ مَسَاءِ كُلِّ لَيْلَةٍ: بِسْمِ اللهِ الَّذِي لاَ يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ إِلاَّ لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ)[1].

واتە: هیچ بەندەیەك نیە بەیانیان لە هەموو ڕۆژێك و ئێوارانی هەموو شەوێك بڵێت: (بِسْمِ اللهِ الَّذِي لاَ يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ إِلاَّ لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ) هیچ بەڵایەکی کتوپڕی توش نابێت.

## ئیعجازی زانستی لە نیشانەیەکی کۆتایی بونەوەر:

دەتوانین ڕووی ئیعجاز کورت بکەینەوە لەم فەرموودە پیرۆزەدا بە چەند خاڵێکەوە:

١) کەس ناتوانێت پێشبینی زۆر بوونی مردنی کتوپڕ بکات، لەبەر ئەوەی کەس نەیتوانیوە ئەم دیاردەیە بناسێت، هەتا ئەم چەند ساڵە کەمەی دوایی نەبێت، کاتێك زانایان توانیان سەرژمێری وورد بکەن، سەیریش لەوەدا بوو کە ئەو ژمارانەی دەستیان کەوتبوو پێشبینی نەدەکرا، چونکە ژمارەی ئەوانەی بە مردنی کتوپڕ مردبوون زۆر بەرز بوو .

٢) زانایان ئەمڕۆ دەڵێن: دیاردەی مردنی کتوپڕ جیا نەکراوەتەوەو نەناسراوە هەتا وەکو (٥٠) ساڵ پێش ئێستا لێکۆلینەوەی پزیشکی بۆ نەکرابووهەتا وەکو (٢٠) ساڵ پێش ئێستا، ئەمڕۆ زانایان هەوڵ دەدەن بۆ دۆزینەوەی ئەو ڕێگایانەی کە بە ڕەنگاری ئەم مردنە بکاتەوە، لەبەر ئەوەی ئەوان درك بە گەورەیی کێشەکە دەکەن، بەڵام هەوڵەکانیان بێ سوودە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەوا ئەم دیاردەیە لە زیادبوونێکی بەردەوام دایە زانایانیش دەستیان کردووە بە ناسینی هۆکارەکانی ئەم مردنە، ئەمەش ڕاستی ووتەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (مِنَ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ ..مَوْتُ الْفَجْأَةِ)[2].

---

(١) سنن الترمذي (١٢/ ٢٩١) باب: ما جاء في الدعاء، برقم:(٣٧١٦).

(٢) الأحاديث المختارة (٦/ ٣٠٥) برقم: (٢٣٢٥) وقال إسناده حسن.

واتە: لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی ڕۆژی دوایی مردنی کتوپڕ دەردەکەوێت.

٣) هەندێ لە گوماندارو بێباوەڕان بانگەشەی ئەوە دەکەن کەوا ئەم مردنە هەر ناسراوە لە سەردەمی کۆنەوە، ئێمەش پێیان دەڵێین: ئەم مردنە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) نەناسرابوو هەر لەبەر ئەوەش لە ووتەی شاعیرو ئەدیبەکانی ئەو سەردەمەدا ئاماژەی پێنەدراوەو بەڵگەش بۆ ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەرکەوتنی ئەم مردنەی داناوە بە نیشانەیەك لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی، ئەگەر ئەو مردنە لەو کاتەدا بناسرایە ئەوا بە دڵنیاییەوە بێباوەڕەکانی ئەو سەردەمە ڕەخنەیان لەم فەرمودەیە دەگرت، هەروەك دەزانین بێباوەڕان هیچ شتێکیان بەبێ ڕەخنە بەجێ نەهێشتووە، ئەگەر ئەم دیاردەیە بڵاوبوایە لەو سەردەمەدا کە پێغەمبەر(ﷺ) هات و دەرکەوتنی ئەم دیاردەیە دانا بە نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی، ئەگەر ئەمە ڕووی بدایە خەڵکی ئەم فەرمودەیان پێ سەیر دەبوو کە چۆن باسی شتێکیان بۆ دەکات کە بوونی هەیە، لەبەر ئەوە دەتوانین ئەم فەرمودەیە دابنێین بە موعجیزەیەکی پزیشکی لە پێغەمبەر(ﷺ) کە باس لە دیاردەیەك دەکات کە زانایانی ڕۆژ ئاوا نەیان زانیبوو هەتا ئەم چەند ساڵانەی دوایی نەبێت[١].

---

(١) www"kaheel7"com . گۆڤاری هەیڤ، ژمارە (١٢) گۆڤارێکی زانستی وەرزیە ساڵی سێیەم، ١٤٢٨ هـ .

بەرگی دووەم

## ئاوات خواستن بە هاتنی دەجال

پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی داوە کە ڕۆژگارێك دێتە پێش خەڵکانێك ئاواتە خوازی هاتنی دەجالن.

پێشەوا حوذەیفەی کوری یەمان(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَيَأْتِيَنَّ عَلَى أُمَّتِي زَمَانٌ يَتَمَنَّوْنَ فِيهِ الدَّجَّالَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، مِمَّ ذَاكَ؟ قَالَ: مِمَّا يَلْقُونَ مِنَ الْعَنَاءِ وَالْعَنَاءِ)[1].

واتە: ڕۆژگارێك دێت بەسەر خەڵکیدا کەوا ئاوات دەخوازن دەجال بێت بۆ ناویان، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا بە دایك و باوکەوە بە قوربانت بین لەبەرچی؟ فەرمووی: لەوەی کە ڕووبەڕووی دەبنەوە لە کۆڵە مەرگی و ناخۆشیدا.

من زۆر جار گوێم لە خەڵکی بووە کە ئاوات دەخوازن بە بینینی دەجال و ڕووبەڕووبوونەوەی لە کاتێکدا بە یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر هەژمار دەکرێت.

زۆرجاران خەڵکی بە هۆی غەم و دڵتەنگیەك یان بە هۆی ئەنجامدانی تاوانێك ئاوات بە هاتنی دەجال دەخوازێت، ئەمەش بە زۆری لەلایەن گەنجەکانمانەوە.

هەرگیز لە بیری ئەوە مەبە کە ئاوات لە هاتنی دەجال بخوازیت، چونکە نازانیت بە بڕواداری دەمریت یان شوێنی دەکەویت، بۆیە لێرە شارەزابوون لە شەرع زۆر گرنگ و هەستیارە، چونکە هەر کەسێك داوای زانستی شەرعی بکات تا ئیسلامی پێ زیندوو بکاتەوە، ئەوە لە ڕاستگۆیانە، وە پلەی لە دوای پلەی پێغەمبەرانە.

---

(١) رواه الطبراني في (المعجم الأوسط) (٤/ ٣٠٩) برقم: (٤٢٨٩) لَمْ يَرْوِ هَذَا الْحَدِيثَ عَنْ عُبَيْدِ بْنِ طُفَيْلٍ إِلَّا قَبِيصَةُ، تَفَرَّدَ بِهِ: أَحْمَدُ بْنُ عُمَرَ الْوَكِيعِيُّ.

## لەناوبردنی یەکتری هۆزەکان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی مرۆڤ بەرەو لەناوچوون دەچێت و ژمارەی لەناوچوانیش زۆر دەبێت

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ( لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى.. يهلك الناس..)[١].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت.. هەتا خەڵکی لەناودەچن

هەر چەندە هەندێك لە زانایانی فەرمووودەناس دەفەرموون: ئەم فەرمووودە بێ هێزە.. بەڵام لە واتادا زۆر واقیعیە..

پێشەوا ثەوبان (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (.. إِنِّي سَأَلْتُ رَبِّي لِأُمَّتِي أَنْ لَا يُهْلِكَهَا بِسَنَةٍ عَامَّةٍ، وَأَنْ لَا يُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ سِوَى أَنْفُسِهِمْ، فَيَسْتَبِيحَ بَيْضَتَهُمْ، وَإِنَّ رَبِّي قَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنِّي إِذَا قَضَيْتُ قَضَاءً فَإِنَّهُ لَا يُرَدُّ، وَإِنِّي أَعْطَيْتُكَ لِأُمَّتِكَ أَنْ لَا أُهْلِكَهُمْ بِسَنَةٍ عَامَّةٍ، وَأَنْ لَا أُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ سِوَى أَنْفُسِهِمْ، يَسْتَبِيحُ بَيْضَتَهُمْ، وَلَوِ اجْتَمَعَ عَلَيْهِمْ مَنْ بِأَقْطَارِهَا أَوْ قَالَ مَنْ بَيْنَ أَقْطَارِهَا حَتَّى يَكُونَ بَعْضُهُمْ يُهْلِكُ بَعْضًا، وَيَسْبِي بَعْضُهُمْ بَعْضًا)[٢].

واتە: داوام لە خودای باڵا دەست کرد بۆ ئومەتەکەم کە بە گرانیەکی سەرتاپا لە ناویان نەبات، وە دوژمنێکی بێجگە لە خۆیان بەسەردا زاڵ نەکات کە هەتکیان بکات و لە ناویان بەرێت، خوای گەورەش فەرمووی: ئەی موخەمەد(ﷺ) من

---

(١) ضعيف: خرجه ابن عساكر في تاريخ دمشق (٤٥٣/٧) قال الألباني في السلسلة الضعيفة: ضعيف.

(٢) صحيح مسلم (٤/ ٢٢١٥) باب: هلاك هذه الأمة، برقم: (٢٨٨٩).

که کارێکم قەزا کرد قەزاکەم ڕەت ناکرێتەوە، وە من ئەوەم داوە بە ئومەتەکەت کە بە گرانیەکی سەرتاپا لە ناویان نەبەم، وە دوژمنێکیان بەسەردا زاڵ نەکەم بێجگە لە خۆیان کە هەتکیان بکات و لە ناویان بەرێت، ئەگەر هەموو مەملەکەتەکانی دونیاش لەسەریان کۆببنەوەو پەلەماریان بدەن هەتا ئەوە نەبێت کە خۆیان یەکتر لە ناو خۆیاندا لە ناو بەرن و خۆیان هەتکی ناموسی یەکتر بکەن.

لەم فەرموده بۆمان دەردەکەوێت کە ئومەتی ئیسلام هەرگیز دوژمنانی ناتوانن لە ناوی بەرن و زەفەری پێ ببەن، بەڵکو هەرچی نەهامەتی و لاوازی و بە هەلاکەت چوونی هەیە هەمووی لە ڕێی ناکۆکی و دووبەرەکی و شەڕ و کوشتاری ناو خۆیانەوە دوچاری دەبن.

پێشەوا عامری کوری سەعید(ﷺ) ئەویش لە باوکیەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ:

(سَأَلْتُ رَبِّي ثَلَاثًا، فَأَعْطَانِي ثِنْتَيْنِ وَمَنَعَنِي وَاحِدَةً، سَأَلْتُ رَبِّي: أَنْ لَا يُهْلِكَ أُمَّتِي بِالسَّنَةِ فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُهُ أَنْ لَا يُهْلِكَ أُمَّتِي بِالْغَرَقِ فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُهُ أَنْ لَا يَجْعَلَ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ فَمَنَعَنِيهَا)[١].

واتە: داوای سێ شتم کرد لە خودای باڵا دەست، ئەویش دوانی پێ بەخشیم بەڵام ئەوەی تریانی پێنەبەخشیم، داوام لە خودا کرد کە سەرتاپای ئومەتەکەم بە گرانی لەناو نەبات، ئەویش پێی بەخشیم، وە داوام لێ کرد کە ئومەتەکەم سەرتاپا بە لافاو لەناو نەبات، ئەویش پێی بەخشیم، وە داوام لێ کرد کە ئومەتەکەم خۆیان لەناو خۆیاندا یەکتر لەناو نەبەن ، بەڵام ئەمەیانی پێ نەبەخشیم.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢١٦) باب: هلاك هذه الأمة، برقم: (٢٨٩٠).

## پەیدابوونی ئامێری تەلەفۆن و ڕادیۆ

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر پەیدابوونی ئامێری تەلەفۆن و ڕادیۆیە..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمویٚ: (إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يَفْشُوَ الْمَالُ وَيَكْثُرَ، وَتَفْشُوَ التِّجَارَةُ، وَيَظْهَرَ الْعِلْمُ، وَيَبِيعَ الرَّجُلُ الْبَيْعَ فَيَقُولَ: لَا حَتَّى أَسْتَأْمِرَ تَاجِرَ بَنِي فُلَانٍ، وَيُلْتَمَسَ فِي الْحَيِّ الْعَظِيمِ الْكَاتِبُ فَلَا يُوجَدُ)[1].

واتە: یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر ماڵ زۆر دەبێتەوەو بازرگانی تەشەنە دەکات و نەفامی سەرهەڵدەدات، پیاو شتێك دەفرۆشێت و دەڵێت: نەخێر، تاکو ڕای فلانە بازرگان وەربگرم، لە گەڕەکی گەورەشدا دەگەڕێن بە دوای نوسەرێکدا دەستیان ناکەوێت.

لەم فەرمودەیە تێدەگەین کە هەندیٚ بازرگانی گەورە لەوانە سەرمایەدارەکان بن، یان ئەو بریکارە متمانە پێکراوانەی کە کاڵا و شتومەك دەنێرن و دەهێنن، لەوانەیە ئەوانە دەست بگرنە سەر بازاڕدا، خۆیان بەرزو نزم بە نرخەکان بکەن، ئیتر بازرگانە بچوکەکان نەتوانن بازرگانی بکەن بە مۆڵەتی ئەوان نەبێت.

وە ئەمڕۆش بازرگانەکان دەتوانن لە ڕێگای تەلەفۆنەوە کڕین و فرۆشتن ئەنجام بدەن جا دووربن لە یەکەوە یان نزیك بن..

بەڵگە نەویستە کە بەهۆی داهێنانە زانستیەکانەوە هەموو پیشەییەکان دەتوانریٚ بە کاتێکی کەم کارێکی زۆر ئەنجام بدرێت و ئەنجامەکەشی گەلێك باشتر بێت .

بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) لە چەندین فەرموودەی هاوشێوەی تریش ئاماژە بە هەمان مەبەست دەکەن وەکو دەفەرمویٚ: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَقَارَبَ الزَّمَانُ،

---

(١) سنن النسائي (٧/ ٢٤٤) برقم: (٤٤٥٦). قال الألباني: صحيح.

فَتَكُونُ السَّنَةُ كَالشَّهْرِ، وَيَكُونُ الشَّهْرُ كَالْجُمُعَةِ، وَتَكُونُ الْجُمُعَةُ كَالْيَوْمِ، وَيَكُونُ الْيَوْمُ كَالسَّاعَةِ، وَتَكُونُ السَّاعَةُ كَاحْتِرَاقِ السَّعَفَةِ)[١].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا کات لێك نزیك دەبێتەوە ساڵ وەك مانگی لێ دێت و مانگ وەکو هەفتەی لێ دێت و هەفتە وەکو ڕۆژی لێ دێت و ڕۆژێك وەکو سەعاتێکی لێ دێت سەعاتێکیش وەك و سووتانی پوشکی دارخورمای لێ دێت .

سەدان ساڵ لەمەوبەر بۆ پەیوەندی نێوان خێڵەکان چەند هەفتەیەکی دەویست کەچی ئێستا لە نزیکەی چرکەیەك دا ڕێك دەخرێت وەکو ئینتەرنێت و مۆبایل و.. هتد، وە هەموو هۆکارە تەکنەلۆجیاکانی پەیوەندی کرد .

لە هەموو کەنارێکی ئەو زەویە دەتوانین بەهۆی ڕادیۆ گوێ لە دەنگی کابرای قسەکەری ئێستگەیەك ڕابگرین، هەتاکو گوێمان لەهەستی هەناسەی دەبێت، یاخود دەتوانین بەهۆی تەلەفۆنێکی بێ تەل قسە لەگەڵ یەکێکی تری ئەو پەڕی کەناری سەر ئەو زەویە بکەین، یان لەهەر کوێیەك بیت دەتوانیت بەهۆی ئامێری فاکس دەتوانی نامە بە دەققی خۆی بنێری.

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُكَلِّمَ السِّبَاعُ الإِنْسَ، وَحَتَّى تُكَلِّمَ الرَّجُلَ عَذَبَةُ سَوْطِهِ وَشِرَاكُ نَعْلِهِ وَتُخْبِرَهُ فَخِذُهُ بِمَا حَدَثَ فِي أَهْلِهِ بَعْدَهُ)[٢].

واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە ڕۆژی دوای بەرپا نابێت هەتا وای لێدیت گیاندارە دڕندەکان قسە لەگەڵ مرۆڤ دەکەن و پیاو جێ دەستی

---

(١) صحيح ابن حبان (٢٥٦/١٥) ، رقم : (٦٨٢٤) ، وقال محققه شعيب الأرناؤوط : إسناده صحيح عى شرط مسلم . وذكره ابن كثير في النهاية في الفتن والملاحم (٢٣٤/١) بهذا الإسناد وقال : زعم سهل أن هذا الإسناد على شرط مسلم . وابن حجر في الفتح (١٩/١٣) ، وعزاه لأحمد والترمذي عن أبي هريرة وأنس . والتبريزي في مشكاة المصابيح ، رقم : (٥٤٤٨) .

(٢) حسن: أخرجه الترمذي، باب: ما جاء في كلام السباع، (٤/ ٤٦) برقم: (٢١٨١)، قال الإمام الترمذي: وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.وصححه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٤٦٧) ووافقه الذهبي.

قامچیەکەیی و قەیتانی پێڵاوەکەی خۆی قسەی لەگەڵ دەکەن، وە ڕانی خۆی پێی دەڵێت: کە لە پاش خێزانەکەی چی کردووە.

پێشەوا ئەحمەد لە موسنەدەکەی لە ئەبو سەعیدی خودری دەگێڕێتەوە کە گوتی: گورگێك لە ڕانەمەڕێکی داو کاوڕێکی برد، شوانەکەش دوای کەوت و لێی ستاندەوە گورگەکەش لەسەر کلکی هەڵکورماو گوتی: لە خودا ناترسی ئەو ڕۆزیەم لیێ دەستینی کە خودا بۆی ناردوومە، شوانەکەش گوتی: گورگێگ لە سەر کلکی هەڵکورماو بە زمانی ئادەمیان دەمدوێنێ، گورگەکەش گوتی: شتێکی سەیرت پێ نەڵێم موحەممەد(ﷺ) لە یەسریبەوە هەواڵی ڕابردووان بە خەڵکی دەڵێ، جا شوانەکە یەکسەر مەڕەکەی خۆی بە پێش خۆی دا تا هاتە ناو شاری مەدینەی پیرۆز، ئینجا چووە خزمەت پێغەمبەرو(ﷺ) بۆی گێڕایەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمانی دا بانگ ڕادێرن، پاشان هاتە دەرو بە شوانەکەی فەرموو: بۆیان بگێڕەوە ئەویش حاڵەتەکەی بۆ گێڕانەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: صدق (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُكَلِّمَ السِّبَاعُ الإِنْسَ، وَحَتَّى تُكَلِّمَ الرَّجُلَ عَذَبَةُ سَوْطِهِ وَشِرَاكُ نَعْلِهِ وَتُخْبِرَهُ فَخِذُهُ بِمَا حَدَثَ فِي أَهْلِهِ بَعْدَهُ)[1].

واتە: ڕاست دەکات سوێند بەوەی کە گیانی منی بە دەستە ڕۆژی دوای بەرپا نابێت، هەتا وای لێدێت گیانداره دڕندەکان قسە لەگەڵ مرۆڤ دەکەن، پیاو جیێ دەستی قامچیەکەیی و قەیتانی پێڵاوەکەی خۆی قسەی لەگەڵ دەکەن، وە ڕانی خۆی پێی دەڵێت کە لە پاش خێزانەکەی چی کردووە.

ئەوەی زیاتر ئێستا جێی سەرسوڕمانە باسی ئەو ئامێرە زانستیە پێشکەوتووەیە کە مرۆڤ لەسەردەمی تەکنەلۆژیادا پێی گەیشتووە و بە یەکێك لەو ئامێرە پێشکەوتوانەی کە مێژووی دروست بونەکەی نزیکەو خزمەتێکی بەرچاوی کردوە لە بواری مرۆڤایەتی، بەپێی فەرمودەکە پێدەچێت ئامێری بیستنی (مۆبایل یان جێب تەلەفۆن بێت) دیارە (ﷺ) ویستویەتی بە شێوازێك هاوەڵانی

---

(١) حسن: أخرجه الترمذي، باب: ما جاء في كلام السباع، (٤/ ٤٦) برقم: (٢١٨١)، قال الإمام الترمذي: وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.وصححه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٤٦٧) ووافقه الذهبي.

تێبگەیەنێت لەو سەردەمەدا بۆیە ڕون کردنەوەی زیادی داوە، وە بەڕاستی باس کردن لە شتێك کە نەبینرابێت تێگەیاندنی قورسە بە تایبەتی بۆ یارەکانی کە لەسەردەمێك دابوون هیچ تەکنەلۆژیایەك بوونی نەبووە، بۆیە زۆر ئاساییە ئەگەر وای دابنێین ئێمەش لەسەردەمی ئەودا بژیاینایە هەرگیز شتی وا لەگەڵ توانای مێشکماندا یەکی نەدەگرتەوە، پێدەچێت پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ئامێرەو ئەو وایەرەی هێنرابێتە بەرچاو بۆیە ئەو وەسفە جوانەی بۆ داناوە لە بری ناوهێنانی لە فەرمودەکە، پێغەمبەریش(ﷺ) دەفەرمووێ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُكَلِّمَ السِّبَاعُ الإِنْسَ، وَحَتَّى تُكَلِّمَ الرَّجُلَ عَذَبَةُ سَوْطِهِ وَشِرَاكُ نَعْلِهِ وَتُخْبِرَهُ فَخِذُهُ بِمَا حَدَثَ فِي أَهْلِهِ بَعْدَهُ)[1].

لەم فەرمودەیە دەردەکەوێت چی شتێك لە بری جێی دەستی کە قامچی پێ دەگرێت کە قسە بکات، وە جێب خۆی لە شێوەی قامچی دایە، وە قەیتانی پێڵاو پێدەچێت (وایەر) بێت، وەك وایەری تەلەفۆن کە قسەی لەگەڵ دەکات پێدەچێت هێنرابێتە پێش چاوی ، خوای گەورەش زاناترە، بەڵام من نازانم چ تەعبیرێك بۆ (ڕان) بکەم کە قسە دەگرێتەوە، ئەگەر تێفکرین تێکڕایی ئەم وەسفانە هەمووی بێگیان و (جماد)ن، وە لە کۆتاییدا پێویستە ئەوە بەبیر هەموان بیهێنینەوە هەموو پێش هاتێك بەر لەوەی ڕوویدات لەلای پەروەردگارمان نوسراوەو ڕابردوە، بۆیە پێویستە زۆر لامان ئاسایی بێت کە باسی ئەم ئامێرەش کرابێت، دەتوانرێت بگوترێت ئەمە کۆتایی نیشانە بچووکەکانە کە ڕوویداوە.

---

(١) حسن: أخرجه الترمذي، باب: ما جاء في كلام السباع، (٤/ ٤٦) برقم: (٢١٨١)، قال الإمام الترمذي: وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.وصححه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٤٦٧) ووافقه الذهبي.

# سەرهەڵدانی نێربازی و مێبازی
# پیاو و پیاو ئافرەت و ئافرەت

بەها ئەخلاقیەکان چاکترین ڕێکخەری ژیانە لە ناو کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی، بەڵام ئەمڕۆ ئەم بەها ئەخلاقیانە کە لە کۆمەڵگادا دەمانپارێزێ وا خەریکە چوار دەوری گیراوەو کەوتۆتە بەر هەڕەشە، ئەو نیشانانەو هێمایانەش کە ئاماژە دەرن بۆ داڕوخان و ڕەوشت کە دووچاری زۆرێك لە کۆمەڵگاکان هاتووە کە ئەمانەن: لادانی سێکسی بازرگانی کردن بە ئافرەتانی بێ ئابڕو، زینا کردن، لەشفرۆشی، تەعەدا کردن لە منداڵ، زیادبوونی ئەو نەخۆشیانەش کە لە ڕێگای کاری بەدڕەوشتیەوە ئەنجام دەدرێت، ئەم کارە قێزەونەش وا دەکات کە دوو چاری مرۆڤ ببن، بەڵام ئەوەی کە دەبێ زۆر لێی ئاگاداربین و وریابین کرداری بەدڕەوشتیە لە نێوان هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ، بەڵام لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆدا کرداری بەدڕەوشتی و زەواجی هاو ڕەگەز واتە: پیاو لەگەڵ پیاو ژنیش لەگەڵ ژن زۆر بە ئاسایی و بە شێوەیەکی ڕێك و پێك لە ئەوروپا ئەنجام دەدرێت، وە زۆربەی زۆری وولاتەکان کۆمەڵێك ڕێکخراویان هەن هانی ئەو جۆرە زەواجە دەدەن، بەڵکو لە پەرلەمانیش یاسایان بۆ دەرچووەو مافەکانیشیان دەپارێزرێ .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی ئەم زەواجە دەفەرموێ: (إِنَّ مِنْ أَعْلَامِ السَّاعَةِ وَأَشْرَاطِهَا أَنْ يَكْتَفِيَ الرِّجَالُ بِالرِّجَالِ وَالنِّسَاءُ بِالنِّسَاءِ)[1].

واتە: لە بەڵگەو نیشانەکانی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی پیاو لەگەڵ پیاو کاری بەدڕەوشتی ئەنجام دەداو ژنیش لەگەڵ ژن واتە لێك خشاندن.

بەم شێوە کردارەشیان هێرش دەکەنە سەر ڕەوشت و کەرامەت و موقەددەساتی کۆمەڵگا و ئایین ، وە لەم سەدەیەی ئێستاشدا ئەم دیاردەیە زۆر زۆر بڵاوە کە

---

(١) المعجم الكبير (١٠/ ٢٢٨) برقم: (١٠٥٥٦).

ئەمەش یەكێكە لە بەڵگەو نیشانە هەرە دیارەكانی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی .

فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر بە ڕوونی پێمان ڕادەگەینێت كە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی ئەم كردەوە خراپانە زۆر دەبێ و بەبێ شەرمی و ئابڕوییش ئەنجام ئەدرێت.

پێشەوا ئەنەسی كوری مالیك (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: (لَا تَذْهَبُ الدُّنْيَا حَتَّى يَسْتَغْنِيَ النِّسَاءُ بِالنِّسَاءِ، وَالرِّجَالُ بِالرِّجَالِ، وَالسِّحَاقُ زِنَا النِّسَاءِ فِيمَا بَيْنَهُنَّ)[١].

بۆیە دروست نیە پیاو سەیری نێوان ناوكو ئەژنۆی پیاو بكات ئیتر ئەو پیاوە خزمی نزیكی بێت یان دوور، موسڵمان بێت یان كافر.. بەڵگەشمان ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەره(ﷺ) كە دەفەرموێ: (لَا يَنْظُرُ الرَّجُلُ إِلَى عَوْرَةِ الرَّجُلِ، وَلَا الْمَرْأَةُ إِلَى عَوْرَةِ الْمَرْأَةِ)[٢]. واتە: با پیاو سەیری عەورەتی پیاو نەكات، ئافرەتیش سەیری عەورەتی ئافرەت نەكات.

حەرامە بۆ ئافرەت بڕوانێت بۆ ڕانی كوڕەكەی یان كچەكەی یان دایكی یا دراوسێكەی یا هاوڕێكەی نە لەگەرماودا نە لەشوێنەكانی تر..

حیكمەت لەم حەرام بونە بۆ ئەوەیە ئافرەت پارێزراو بێت لە هێرشی هەڵچوونی غەریزەی جنسی كە گڕی تێ بەردەدات كاتێك دیمەنێكی ورووژێنەر دەبینێ.. ئەم ورووژێنەرە جنسیە دەبێتە هۆی ئەوەی ئافرەت بۆ دامركاندنەوەی هەڵچوونی غەریزەی جنسی پەنا بباتە بەر كاری نابەجێ و دزێوی لێك خشاندن.

نێربازی و لێكخشاندن نەخۆشیەكی ترسناكە دەرەنجامەكانی بەس بوونی پیاوە بۆ پیاو، یان ئافرەتە بۆ ئافرەت، زۆربەی كۆمەڵگە بەناو پێشكەوتوو خاوەن شارستانیەكان توشی ئەم نەخۆشیە بوون وەك ئەمریكاو بەریتانیا.. تەنها

---

(١) فوائد تمام (٢/ ٩٥) برقم: (١٢٢٩).

(٢) صحيح مسلم (١/ ٢٦٦) باب: تحريم النظر إلى العورات، برقم: (٣٣٨).

لە شارێکی وەکو نیویۆرك نزیکەی نیو ملیۆن کەس بە ئاشکرا توشی نەخۆشی ناباوی جنسی بوون.. بەڵام ئەوانەی نەخۆشیەکەیان شاردۆتەوە بە ئارەزووی خۆت ژمارەیان بۆ دابنێ.

پێشەوا ثوبەی کوڕی کەعب (ﷺ) دەڵێت: (عند اقتراب الساعة، فمنها نكاح الرجل الرجل ونكاح المرأة المرأة ..)[1].واتە: لە کاتی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی پیاو لە پیاو و ئافرەت لە ئافرەت مارە دەکرێت..

ئەگەر سەیری وڵاتانی ئەوڕوپا بکەین ئەوە بەدی دەکەین کە پیاو لە پیاو مارە دەکرێت و ئافرەتیش لە ئافرەت... ئەمەش موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا دەسەلمێنێت..

تاوانی گەلی (لوط) ئەوە بوو: نێرینەکان تووشی یەکتر دەبوون، لەبەر قێزەونی و ناشیرنی دەرەنجامی خراپی ئەو تاوانە خوای گەورە تاوانکاری ئەو تاوانەی بە چوار جۆرە سزا سزا دەدات، کە خوای گەورە بەسەر هیچ گەلێکدا نەیسەپاندووە، ئەویش ئەمانەن:

- چاوەکانی کوێرکردن.
- سەرەو ژووری کردن.
- بە بەردی سورکراوەی بە لێزمە بەردبارانی کردن.
- دەنگی تۆقێنەرو بەهێزی بەسەردا ناردن.

وە ئەوەی لەسەردەمی ئێمە ڕوودەدات وەکو پەتا کوشندەکان و چەندین نەخۆشی ئەوتۆ کە لە پێشینەکانی ڕابردووی ئێمەدا نەبووە، ئێستا ڕوودەداتوەکو نەخۆشی ئایدزی کوشندە ئەوەش بە هۆی ناپاکی و زیناکردن و نێربازی و مێبازیە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر حیکمەت و کار بەجێیی خوای گەورە لە دانانی ئەو سزا زۆرەی کە دیاری کردووە.

---

(١) شعب الإيمان، باب: في تحريم الفروج (٤/ ٣٧٥) برقم: (٥٤٥٧).

## زۆربوون و پەیدابوونی گەرماوی ئافرەتان لە بازارەکان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی گەرماو پەیدا دەبێت لە دەرەوەی ماڵ..

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عەمر (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (إِنَّهَا سَتُفْتَحُ لَكُمْ أَرْضُ الْعَجَمِ وَسَتَجِدُونَ فِيهَا بُيُوتًا يُقَالُ لَهَا الْحَمَّامَاتُ، فَلَا يَدْخُلَنَّهَا الرِّجَالُ إِلَّا بِالْأُزُرِ، وَامْنَعُوهَا النِّسَاءَ إِلَّا مَرِيضَةً أَوْ نُفَسَاءَ)[1].

واتە: بێگومان خاکی عەجەمتان بۆ ئازاد دەکرێت، ماڵانێکی تێدا دەبینن پێیان دەڵێن: گەرماوەکان، با پیاوەکانتان نەچنە ناویانەوە ئیللا بە پەشتەماڵەوە نەبێت، واتە: عەورەتیان داپۆشراو بێت، لە ئافرەتانیان قەدەغە بکەن، ئیللا ئەوانەیان نەبێت کە نەخۆشن یان زەیسانن.

بۆیە دروست نییە ئافرەتان بچنە حەمامەکانی بازار، بە بەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە فەرموویەتی: (من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يدخل حليلته الحمام)[2].

واتە: هەر کەسێك باوەڕی بەخوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە با خێزانەکەی نەبات بۆ حەمام.

---

(١) ضعيف: أخرجه أبو داود كتاب: الحمام، برقم: (٤٠١١)، وابنُ ماجه ، كتاب: الأدب، بابُ دخولِ الحمّام، برقم: (٣٧٤٨) وضعّفه الألبا ﷺ في (ضعيف الجامع) (٢٠٧٩) .

(٢) صحيح: أخرجه الترمذيُّ ، كتاب: الأدب، بابُ: ما جاء في دخول الحمّام، برقم: (٢٨٠١) وصحّحه الألبا ﷺ في صحيح الترغيب والترهيب، برقم: (١٦٤).

لە فەرموویەکی تر فەرموویەتی: (الحمام حرام علی نساء أمتي)[1].

واتە: حەمام حەرامە لەسەر ئافرەتانی ئوممەتەکەم.

لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: سویٚند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، هەر ئافرەتیٚك جلەکانی لە غەیری ماڵی دایکەکانیدا داکەنیٚت ئەوا ئەو پەردەیەو سنوورەی کە لە نیٚوان خۆی و خودادا هەیە هەتك کردووەو بەزاندوویەتی[2].

(١) صحيح: أخرجه الحاكم في (المستدرك) (٧٧٨٤) وحسَّنه الألبانيُّ في (صحيح الجامع) برقم: (٣١٩٢).

(٢) صحيح:أخرجه أحمد في (مسنده) برقم: (٢٧٠٣٨) وصحَّحه الألبانيُّ في(صحيح الترغيب والترهيب)(١٦٩).

## لەباربردنی منداڵ زۆر دەبێت

لە نیشانەكانی نزیكبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی لەباربردنی منداڵە.. ئافرەتانێكی زۆر منداڵەكانیان لەبار دەبەن بە بیانووی ئەوەی ناتوانن پەروەردەی بكەن...

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: (لَتُؤْخَذَنَّ الْمَرْأَةُ فَلَيُبْقَرَنَّ بَطْنُهَا، ثُمَّ لَيُؤْخَذَنَّ مَا فِي الرَّحِمِ فَلَيُنْبَذَنَّ مَخَافَةَ الْوَلَدِ)[١].

بۆیە لەباربردنی منداڵ تاوانەو حەرامە و ناشەرعییە و دەچێتە چوارچێوەی كوشتنەوە كە خوای گەورە سزای دوا ڕۆژی ئەو كەسانە دەدات.

زانایانی ئیسلام یەكدەنگن كە حەرامە منداڵ لەباربەیت، دوای سەدو بیست ڕۆژ.

پێشەوا ئیبنو قودامە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەگەر ئافرەتی سك پڕ دەرمان بخواتەوە بۆ ئەوەی منالی لەبار ببات، بەندەیەكی لەسەر وەك دییە(خوێن)، وە میراتی لێ وەرناگرێت، وە بەندەیەك ڕزگار دەكات[٢].

پێشەوا ئیبنو جوززی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەگەر ڕوح كرایە بەر منداڵ لەبار ببەیت، ئەمەیان كوشتنی نەفسە ئیجماع هەیە[٣].

فەتوای لێژنەی دائیمە دەڵێت: ئەگەر حەمل تێپەڕی لە چل ڕۆژ حەرامە منداڵ لەبار ببەی، چونكە دوای چل ڕۆژ دەبێتە عەلەقە، كە هەنگاوی سەرەتای دروستبوونی مرۆڤە[٤].

---

(١) مصنف ابن ابي شيبة (١٥/ ٧١) برقم: (٣٨٤٥٢).

(٢) المغني (٨/ ٣٢٧).

(٣) القوانين الفقهية (٢/ ٧٠).

(٤) فتاوى اللجنة الدائمة (٢١/ ٤٥٠).

تەنانەت بە پێی یاسای سزادانی عێراقی ماددەی (٤١٧) یاساکە دەڵێت: بە حەپسکردن سزا ئەدرێت کە لە ماوەی ساڵێك زیاتر نەبێت و بە بژاردن کە لە (١٠٠) دینار زیاتر نەبێت (هەموارکراو ٤٥٠٠٠ کەمتر نەبێت و لە ٢٢٥٠٠٠) هەزار زیاتر نەبێت، یان بە یەکێك لەو دوو سزایە، هەر ئافرەتێك بە هەر ڕێگایەك کۆرپەلەی خۆی لەبار خۆی بردبێت، یان وای کردبێت کەسێکی تر بە ڕەزامەندیی ئەو ئەو کارە بکات.

## دوورگەی عەرەبی دەبێتە باخ و ڕووبار وەکو جاران

یەکێ لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی سەردەمێك دێت دوورگەی عەرەبی دەبێتە باخ و ڕووبار وەکو جاران، ئەمەش موعجیزەیەکی پێغەمبەرە(ﷺ) کە لەم سەردەمە هاتۆتە دی.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَعُودَ أَرْضُ الْعَرَبِ مُرُوجًا وَأَنْهَارًا)[١].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا دوورگەی عەرەبی دەبێتەوە بە باخ و باخات.

جا ئەم باخ و باخاتە بە هۆی هەڵکەندنی بیرو ئاوەڕۆ و کشتوکاڵ کردنی دەبێتەوە باخ و ڕووبار، هەروەکو ئێستا ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) سەری هەڵداوە، یان بە هۆی گۆڕانی کەش و هەوا، ئەگەر کەشی گەرمی ئەوێ ببێتە کەشێکی خۆش و فێنك، وە خودای باڵادەست ڕووبارو کانیاوی تێدا هەڵبقوڵێنێتەوەو، لە وشکە خاکەوە بیکاتە خاکێکی پڕ بە پیت و بەرەکەت.

بەڵێ... ئەو عەرەبستانەی کە تا دوێنێ بە دەگمەن ئاوو سەوزایی تێدا دەبینرا، ئەمرۆ کت و پڕ بە هۆی پارەی نەوت و دەوڵەمەندی خەڵکەکەیەوە سەدان هەزار باخچەو هەوارگەو سەیرانگای تێدا دروست کراوە بە ڕادەیەك کە هەرگیز خاکی عەرەب شتی وای بە خۆیەوە نەبینیوە.

ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵ دانە بەوەی کە لە ڕابردوویەکی دووردا نیوە دوورگەی عەرەب ڕووباری تیابووەو ئاوەدان بووە، وە ڕۆژی دواییش نایەت تاوای لێ نەیەتەوە... وە زانستی سەردەم و زانایانی جیۆلۆجی ئەم ڕاستیەیان سەلماند، کە بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتی موحەممەد(ﷺ).

---

(١) صحيح مسلم (٢/ ٧٠١) كتاب: الزكاة، باب: الترغيب في الصدقة، برقم: (١٥٧).

سەرەتا ئەم فەرموودەیە ئاماژەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەری تێدایە کە دەفەرموێت: جارێکی تر بیابانی عەرەب دەبێتەوە بە باخ و باخات و ڕووبار واتە: دەبێت پێشتر لە مێژوویەکی کۆندا باخ و ڕووبار بوویێت، هەروەها ئەم فەرموودەیە پەیوەندی بە داهاتوویەکی گرنگەوە هەیە کە چاوەڕێی دەکەین.

پێشەوا نەوەوی دەڵێت: لە واتای گەڕانەوەی خاکی عەرەب بۆ شینایی و ڕووبار: واتاکەی وایە کە عەرەب وازی لێ دەهێنن و پشت گوێی دەخەن و کشتوکاڵی لێ ناکەن و ئاوی نادەن لە ئاوەکەی، ئەوەش لەبەر هۆی کەم پیاوی و زۆربوونی شەڕو جەنگەکان و یەك لە دوای یەکی ئاشوبەکان و نزیکبوونەوەی ڕۆژی دوایی و هیوا نەبوونی کات بۆ سەر قاڵبوون بە کشتوکاڵ و برەو پێدانی[1].

بەڵام ئەوەی بۆ من دیارە لەوەی کە پێشەوا نەوەوی بۆی چووە زۆر دوورە لە مەبەستی فەرموودەکە لەبەر ئەوەی خاکی عەرەب خاکێکی وشك و کەم ئاوەو کەم شتی لێ دەڕوێ، زۆربەی ئاوەکانیشی ئاوی باران و بیرەکانە، جا ئەگەر خەڵکەکەی وازی لێهێناو کشتوکاڵەکەی مردو وشك بوو ئەوا نابێتەوە بە شینگەو ڕووبار لەم خاکە.

وە ڕاستی فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خاکی عەرەب ئاوی زیاد دەبێ تاکو دەبێتە ڕووبار گەلێ، جا شینایی تیادا شین دەبێ و دەبێتە خاکێکی پڕ لە شینایی و ڕووبار، وە ئەوەی ئەم بۆچوونە بەهێز دەکات ئەوەیە کەوا لەم سەردەمەدا چەندین کانیاوی زۆر بە دەرکەوتوون کە ئاویان لێ هەڵدەقوڵێ وەکو ڕووبار، کە ئەمەش هاتنە دی فەرموودەکانی پێغەمبەری ئازیزە، ئێستا ئەگەر بچیتە زەوی عەرەب کە نیمچە دوورگەی عەرەبیە بە تایبەتی بیابانی لماوی (ربع الخالي)، یان بچیتە مەککەو چوار دەوری یا حیجازو دەوروبەری جگە لە بیابانێکی ووشکی لماوی چیتر نابینیت، هەر چەندە ئاوی بدەیت هیچ ڕووەکێکی لێ ناڕوێت، ئایا کەس پێشبینی ئەوە دەکات ئەو بیابانە پێشتر باخ و باخات و ڕووبار بوویێت؟ ڕووبارو باخ لە کوێیە[2]؟

---

(١) صحيح مسلم (٧/ ٩٧) مع شرح النووي.

(٢) العلم طريق الإيمان، د . عبدالمجيد الزنداني، (لا ٥٧) .

بەرگی دووەم

سەدە لە دوای سەدە ڕۆیشت، زانست پێشکەوت و توێژینەوەکان زیادیان کرد، زاناکان سەلماندیان کە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ڕاستیەکی زانستیە، سەلماندیان کە ووشکە بیابانی عەرەب لە پێش دا باخ و باخات و ڕووبار بووە، وە زیاد لەوەش لە داهاتوو دەبێتەوە بە باخات و ڕووبار، کەواتە توێژینەوەکە دوو بەشە کە فەرموودەکە باسی لێوە دەکات، یەکەم لە زەمەنی ڕابردوو، دووەم لە داهاتوو.

یەکەم لە ڕابردوودا :

سەرەتای لێکۆڵینەوەکان بە گەڕانی جیۆلۆجی دەستی پێکرد، گەورەترین گەڕانی جیۆلۆجیش گەڕانەکەی (بیترو وبیر) بوو، هەروەك لە گۆڤاری (Nature) بەرواری (١٩٨٩/٤/٢٧)ع هاتووە دەڵێت: گەورەترین گەڕان و لێکۆڵینەوەی جیۆلۆجی بە پێشەوایەتی (بیترو وابیر) ئەنجام درا، کە ڕوویان کردە دەوڵەتی ئیمارات لەساڵی (١٩٨٩)ع، لەو گەڕانەدا چەندەها پاشمەوەی ئاژەڵیان دۆزیەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ کۆتاییەکانی چاخی (میوسین)، لە پاش ماوەی ئەو ئاژەڵانەش کە دۆزیانەوە (شیردەرەکان و ئەسپی دەریا و وورده گۆشت خۆرەکان و کەرکەدەن و کیسەڵ و تیمساح و ماسی و باڵندە و مەیموون) بوون، ئاشکراشە کە ئەمانە لە ژینگەی باخ و دارستان نەبێت ناژین.

لە گۆڤاری (الثقافية العالمية) ژمارەی (٥٩) کە ئەویش لە گۆڤاری (Aramco Aorld August ١٩٩٢) وەریگرتووە دەڵێت: چەرخی کۆنی (بلیستوستینی) پێش ملیۆنێك ساڵ دەستی پێکردووەو پێش (١٠) هەزار ساڵ لەمەوبەر کۆتایی هاتووە کە لەو چەرخەدا بەستەڵەك بەشەکانی باکووری ئەوروپاو ئەمریکای داپۆشیبوو، بەو چاخەش دەوترێت چاخی بەفرین (Glacials)، لە ماوەی نێوان هەموو چاخە بەفرینەکانیش دا پێی دەوترێت: (Inter Glacials) کەش و ئاو و هەوا زۆر خۆش دەبێتەوە[1].

---

(١) العلم طريق الإيمان، د . عبدالمجيد الزنداني، لا ٥٨ .

لە کتێبی (الجغرافيا التأريخية والطبيعية)ی (د.إبراهيم أحمد رزقانه) لاپەڕە (١٤٦)دا هاتووە کە دەڵێت: بڵاوبوونەوەی بارستە بەستەڵەکییەکانی باکووری زەوی لە ماوەی چاخە بەفرینەکان کاریگەری گەورەی لەسەر کەش و ئاو و هەوای زەوی کردبوو کە بووە هۆی جوڵانی پشتێنەی باران بارین بەرەو باشوری زەوی، بەوەش نیمچە دورگەی عەرەبی و بیابانی گەورەی ووشکی عەرەبی خستۆتە ژێر کاریگەری پشتێنەی بای باراناوی خۆرئاوا کە ئێستا ئەو پشتێنەیە کاریگەری لەسەر خۆرئاوای ئەوروپایە، بەوەش ئەو ناوچە ووشکە بیابانیە سەوز بوونەتەوەو پڕبوون لە چەندەها ڕووبار و باخ و زەوی بە پیت.

ڕێگایەکی تر کە زاناکان توانیان ڕاستێتی باخ و ڕووباری بیابانی عەرەبی پێ بسەلمێنن بریتی بوو لە ڕێگای (الاستعشار عن بعد) واتە: هەست کردن لە دوورەوە.

لە کتێبی (مورفولوجية الأراضي العربية)ي (د.محمد صفي الدين) لاپەڕە (٥١,٥٠)دا لە بارەی ئەم ڕێگایەوە دەڵێت: یەکەمجار ئەم شێوازەیان لە بیابانی میسر بەکارهێنا لە ساڵی (١٩٨١)ع لە تاقیگەی ڕوو پێووی شوێنەوار ناسی ئەمریکا لە ویلایەتی ئەریزۆنا، ئەو زانیاریانەی بە هۆی ڕاداری سەر مەکۆی بۆشایی - مكون الفضاء - (کۆلۆمبیا) وە کۆیان کردەوە دەریخست لە ژێر ئەو ناوچە بیابانەی باشووری میسرو باکووری خۆرئاوای سودان کە ئێستا هیچ بارانی لێ نابارێت بە تێکڕایی (٥٠) ساڵ جارێك نەبێت، زاناکان بینیان کە چەندەها ڕێڕەوی ڕووباری کۆنی گەورەی تێدایە کە هەندێکیان فرەوانتر بوون لە ڕێڕەوی ئێستای ڕووباری نیل.

گۆڤاری (آفاق علمية) ژمارە (١٧) لاپەڕە (٣٢) دەڵێت: ئەوەی زیاتر جێگای سەرنج ڕاکێشانە بە هۆی تیشکی ئەو ڕادارانەوە کە لمی بیبانە ووشکەکانی پێ دەبڕدرێت و لەسەر ڕووی بەردە کلسیەکانی کەناری ڕووبارە ووشکەوە بووەکان پێچەوانە دەبنەوە، هەزارەها ئامێری دەستکردی مرۆڤە وەك (تەور و پاچ و ... هتد)، چاخی بەفرین دۆزرایەوەو مێژووی ئەو کاتەشیان بە

(٢٠٠) هەزار ساڵ پێش ئێستا دیاری كرد، بەوەش زاناكان بۆیان دەركەوت كە بیابانەكان لەو سەردەمانەدا تەڕ و پاراو و شوێنی ئاوەدانی بوون .

لە هەمان گۆڤاری پێشوودا ژمارە (٣٤) دەڵێت: لەسەرەتای هەشتاكانی سەدەی پێشوودا لێكۆڵینەوەی چڕو پڕ دەستی پێكرد، لە ساڵی (١٩٨٤)ع داوا لە دوو زانای وەكالەتی فەزایی ئەمریكی (ناسا) كرا ڕوو پێویەكی ناوچەی نیمچە دوورگەی عەڕەبی بكەن بە هۆی ڕاداری سەر مەكۆی بۆشایی (چالینچەر)، پاش سەیركردنی وێنەی مەكۆكەو بەراوردكردنی لەگەڵ وێنەی دوو مانگی دەستكردی (سپۆت) و (لاندسات)، نەخشەیەكی جوانی ناوچەی (ربع الخالي) پێشكەش كرا كە تیایدا ڕێگای قافڵە كۆنەكان و مۆڵگەكانی ئاوی ژێر زەوی و ڕێڕەوی ڕووبارە كۆنەكانی تیا دەركەوت كە هەموو ئەو ناوچانە لە توانادا نیە بە چاوی ئاسایی ببینرێن، لەبەر ئەوە بڕیاردرا شوێنێك لەو ناوچەیەدا هەڵبكەندرێت بەوەش قەڵایەكی پتەوی هەشت لا دۆزرایەوە كە چەندەها بورج و دیواری بەرزی هەبوو كە بەرزیەكەی دەگاتە (١٠) مەترو چەندەها ژووری گەنجینەو شوێنی نیشتەجیّ ی تێدابوو، ناوی ئەو شارەش نرا (ئۆبار)[١].

ئەمەش بەشی یەكەمی فەرموودەكە بوو كەوا زەوی عەڕەب باخ و باخات و ڕووبار بووە.

دووەم لە داهاتوودا :

زاناكان لەسەدەی نۆزدەهەم بۆ یەكەمجار لە ڕێگەی بیردۆزێكی گەردوونزانیەوە دەركیان بەوە كرد كە زەوی بیابانی عەرەب لە داهاتوودا دەبێت بە باخات و ڕووبار.

دكتۆر ئەحمەد مستجیر دەڵێت: بیردۆزی گەردوونزانی چاخی بەفرین سەرەتا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی (١٩) و كارەكانی زانای گەردوونی ئوستكوتلەندی (جیمس كرول) كە لە ساڵی (١٨٢١)ع لە دایك بووەو لە هەشتاكانی سەدەی

---

(١) العلم طريق الإيمان، د . عبدالمجيد الزنداني، لا ٥٩ .

نۆزدەهەم دا بیردۆزەکەی بڵاوکردەوە، لەو کاتەش لەبەر ئەوەی ئەم زانیاریەی لەسەروو ئاستی تێگەیشتنی خەڵکیەوە بووە بیردۆزەکەیان قبوڵ نەکرد، هەتا زانای گەردوونی یۆگۆسلافی (میلانکۆ فیێتش) هات و جارێکی دیکە بیردۆزەکەی بڵاوکردەوە، کە ناوەڕۆکەکەی ئەمەبوو: هۆکاری گۆڕانکاری کەش و ئاو و هەوا لەسەر ڕووی زەوی دەگەڕێتەوە بۆ دووخاڵ :

١) شێوە گۆڕانی خولگەی زەوی بە دەوری خۆردا، چونکە زەوی بە دەوری خۆردا لە خولگەیەکی نیمچە بازنەییدا دەسوڕێتەوە، بەڵام هەمیشە بەو جۆرە جێگیر نیە، جارێك دوور دەکەوێتەوەو جارێك نزیك دەبێتەوە هەتا شێوازی سووڕانەوەکەی دەبێتە ئیهلیجی (هێلکەیی)، پاشان دەچێتە سەر شێوە نیمچە بازنەییەکەی ئەوەش لە سوڕێکدا کە ماوەی (١٠٠) هەزار ساڵ دەخایەنێت، لەو کاتەشدا کە خولگەکە نیمچە بازنەیی بێت زەوی هەموو ڕۆژەکانی ساڵ بە چوونیەکی بڕە گەرمی لە خۆرەوە وەردەگرێت، بەڵام کە خولگەکە هێلکەیی بێت لە هەندێ ڕۆژانی ساڵدا زەوی لە خۆر نزیك دەبێتەوە، بەوەش گەرمی زیاتر وەردەگرێت، ئەوەندە هەیە بڕی ئەوەندە گەرمیەی کە زەوی لەخۆرەوە وەریدەگرێت و لە ساڵێك بۆ ساڵێکی تر بە بەردەوامی جێگیرە[1].

٢) گۆڕانی تەوەرەی سوڕانەوەی گۆی زەوی بە دەوری خۆی کە لەسەر ئاستی سوڕانەوەی بەدەوری خۆردا لارە، ئەو لاریەش هەموو (٤١) هەزار ساڵێك لە (٢١,٨) پلەوە دەگۆردرێت بۆ (٢٤,٥) پلە کە ئێستا ئەو لارە گۆشەیە (٢٣,٤) پلەیەو لەم بوونەوەش دایە، لە هەمان سەرچاوەی پێشوودا دەڵێت: لەسەردەمی (میلانکۆ فیێتش) ئەستەم بووە کە بیردۆزی گەردوونی بۆ چاخی بەفرین تاقی بکرێتەوە، هەروەها ئەستەم بوو مێژووی هەزارەها ساڵی ڕابردووی دروست بوون و توانەوەی بەستەڵەکەکان بە ووردی بزانرێت، لەبەر ئەوە بە شێوەیەکی نەچەسپاو مایەوەو چەند کەسێکی کەم نەبێت گرنگیان پێ نەدا هەتا کاتی گەشەکردنی تەقەمەنی نوێ کە توانی پلەی گەرمای زەوی هەزارەها ساڵی ڕابردوو

بەرگی دووەم

---

(١) العلم طريق الإيمان، د . عبدالمجيد الزنداني، لا ٦٠ .

دیاری بکات، ئەوەش بە لێکۆڵینەوەی پاشماوەی سەدەف و قەواقیع و زیندەوەرە بەراییەکانی ناو قووڵایی دەریاکان بەوەی ئەو نیشتەنیانەیان لە قووڵایی دەریاکان لە شێوازی لوولەی درێژدا دەرهێناو پلەی گەرمی نیشتەنیەکەیان بە ووردی دیاری کردو لەوەشەوە توانیان پلەی گەرمای ئەو سەردەمەی نیشتەنیەکەی تێدا دروست بووە دیاری بکەن[1].

لە هەمان سەرچاوەی پێشوودا هاتوە دەڵێت: درێژی چاخی بەفرین نزیکەی (١٠٠) هەزار ساڵ دەبێت، لە ماوەی نێوان هەردوو چاخێکی بەفریندا قۆناغی نێوانیان دێت کە بۆ ماوەی (١٠-٢٠) هەزار ساڵ بەردەوام دەبێت، ئێستاش لە ماوەی کۆتایی قۆناغی گەرمبوونەکەدا دەژین کە (١٠) هەزار ساڵە دەستی پێکردووە.

لەم زانیاریانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە زەوی لە کاتی نزیك بوونەوەی چاخی بەفرینی نوێدایە، بەوەش ڕاستێتی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) دەسەلمێت.

لێرەدا خۆشحاڵین بە ووتوێژی نێوان زانایەکی موسڵمان و پرۆفیسۆرێکی جیۆلۆجی بخەینە ڕوو لەسەر ئەم ڕاستیە زانستیە، ئەویش زانای موسڵمان (عبدالمجید الزندانی)یە لەگەڵ پرۆفیسۆر (الفرید کرۆنر)ی ئەڵمانی کە لە بەناوبانگترین زاناکانی جیهانە لە جیۆلۆجیاداو لەناو زاناکاندا لە ڕەخنەکانی بۆ تیۆرەکانی گەورە زانایانی جیهان بەناوبانگە.

مامۆستا زەنەدانی دەڵێت: پرۆفیسۆر کرۆنەر یەکێك بوو لەوانەی هەر هەڵێکی ڕاکردنی لەسەر بابەتە ئایینیەکان ببینی بایە لێی ڕادەکرد، بۆ نمونە: لەسەر ئەم بابەتە کە ووتوێژی لەگەڵ کراو مامۆستا زەنەدانی پرسیاری لێکرد: ئایا وولاتی عەرەب باخ و باخات و ڕووبار بووە؟

ئەویش وەڵامی دایەوە گوتی: بەڵێ ، ئینجا پێی گوت : کەی وابووە؟

گوتی: لە چاخی بەفرین کە بەسەر زەوی ڕۆیشتووە کە بەستەڵەکەکان لە جەمسەری بەستووی باکوور کەڵەکە دەبن و پاشان بەرەو باشوور دەکشێن، کاتێك

---

(١) ظاهرة الصوبة، د.أحمد مستجیر، (لا ٦٢- ٦٣).

لە دوورگەی عەرەبی بە ڕێژەیی نزیك دەبێتەوە کەش و ئاو و هەوا دەگۆڕێت، وولاتی عەرەبیش لە هەموو وولاتانی جیهان زیاتر دەبێتە باخ و باخات و ڕووبار.

مامۆستا زەندانی پێی گوت: ئایا جارێکی تر ولاتی عەرەب دەبێتەوە باخ و ڕووبار؟

گوتی: بەڵێ ئەوە ڕاستیەکی زانستیە.

مامۆستا زەندانی گوتی: بۆچی؟

گوتی: لەبەر ئەوەی چاخی بەفرین دەستی پێکردۆتەوە.

ئەو بەستەڵەکانە لە جەمسەری بەستووی باکووری زەویەوە جارێکی تر بەرەو باشوور دەکشێن، لە ڕێگاکەیدا لە ناوچە نزیکەکانی وولاتی عەرەب نزیك دەبێتەوە، پاشان گوتی: بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەو باو باران و گێژەلوولەکە بەفرینانەیە کە هەموو زستانێك لە شارە باکووریەکانی ئەوروپا و ئەمریکا دەدات، ئەمەش یەکێکە لە بەڵگەکان و زاناکان چەندەها بەڵگەی تریان پێیە کە ئەوە ڕاستیەکی زانستیە، مامۆستا زەندانی گوتی: ئەوەی تۆ باسی دەکەیت زاناکان پاش چەندەها هەوڵی دوورو درێژی دەرخستنی زانستی و بەکارهێنانی چەندەها ئامێری وورد نەبێت پێی نەگەیشتوون، بەڵام ئێمە لەسەر زمانی پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار پێش (١٤٠٠) ساڵ پێمان گەیشتووە، پاشان پێی گوت: کێ بە موحەممەدی گوتوە کە وولاتی عەرەب باخ و باخات و ڕووبار بووە[1]؟

خێرا خۆی وەڵامی دایەوەو گوتی: ڕۆمان (کۆنترین نووسراوی ڕۆمان پێش (٣٠٠٠) ساڵ نووسراوە، بەڵام ئەم بارودۆخەی بیابانی عەرەب پێش (١٠-١٥) هەزار ساڵ لەمەوبەر بووە، مامۆستا (زەندانی) دەڵێت: زانیم دەیەوێت لەو گێژاوەی تێی کەوتووە خۆی ڕزگار بکات، لەبەر ئەوە پرسیارێکی ترمان ڕووبەڕووی کردەوەو پێمان گوت: ئەی باشە کێ هەواڵیدا پێی کە جارێکی تریش زەوی عەرەب دەبێتەوە بە باخ و ڕووبار؟

---

(١) ظاهرة الصوبة، د.أحمد مستجير، (لا ٦٢- ٦٣).

بەرگی دووەم

پڕۆفیسۆر ماوەیەك دەستی کرد بە بیرکردنەوەو لە پاشان گوتی: بێگومان ئەو زانیاریانەی لەسەرەوە بە نیگا (وحی) نەبێت ناگاتە مرۆڤ.

شێخ (عبدالمجید زەندانی) پێی گوت: دەگویٚ بگرە بزانە کیٚ هەواڵی داوە بە پێغەمبەر موحەممەد(ﷺ) کە ئەم فەرموودەیەی فەرمووە کە ئیمامی موسلیم (ڕەزای خوای لێبیٚ) ریوایەتی کردووەو دەفەرمووێ: ((لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَعُودَ أَرْضُ الْعَرَبِ مُرُوجًا وَأَنْهَارًا))[1].

واتە: ڕۆژی دوای نایەت هەتا دوورگەی عەرەبی دەبێتەوە بە باخ و باخات.

ئاخۆ کیٚ پێی ڕاگەیاندووە کە لە داهاتوودا وای لی دێتەوە... ئەویش بیری کردەوەو گوتی: شتی بەرزی تیایە گوتم: بینووسە بۆم، ئەویش بە دەستی خۆی نووسی (بە ڕاستی سەرسامی کردم ئەو ڕاستیە زانستیانەی کە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر موحەممەد(ﷺ) هەن، کە ئێمە لە ڕێی زانستی نویٚ وە لەم دواییەدا دۆزیومانەتەوە، کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنیٚ کەوا پێغەمبەر(ﷺ) نەگەیشتۆتە ئەم زانیاریانە مەگەر لە ڕێگەی وەحیەوە).

بەڵیٚ... پاش دوو سەعات و نیوی کۆنفراسێك زانایەکی دوور لە دینی ئەڵمانی ئاوا کاری تێکرا و ڕاو بۆ چوونی گۆڕدرا بەو جۆرەی کە ئاوا تەعبیری لیٚ کرد[2].

کاتێك فەرموودەیەکی وا دەبیستین و ڕاستیە زانستیەکەمان لەلا ڕوون دەبێتەوە، ئەوەمان لەلا دەسەلمێت کە وتەو بەڵێنی پێغەمبەر(ﷺ) سەد لە سەد دێتە دی، ئەوەمان دێتە یاد کە بەڵێنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) تەنها ئەم بەڵێنانەی دونیا نەبوون، بەڵکو چەندان بەڵێن و هەواڵی تری ڕاگەیاندووە لە باسی بەهەشت و دۆزەخ و دوا ڕۆژو کاتی مەحشەر، ئەو هەموو بەڵێنانەی دیکەش کە لە قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانیەوە بە ئێمە گەیشتووە، گەر ئێمە دڵنیا بووین کە

---

(١) صحيح مسلم (٢/ ٧٠١) باب: الترغيب في الصدقة، برقم: (١٥٧).

(٢) العلم طريق الإيمان، د . عبدالمجيد الزنداني، لا ٥٦ .

وەعد و زانستیەكان هاتنە دی، كەواتە ختسنە ڕووی موعجیزە زانستیەكان زیاتر باوەڕمان بە ڕۆژی دوایی و بەڵێنەكانی زیاد دەكات، چونكە هەردوو بەڵێنەكانی دونیا و دوا ڕۆژ لەسەر زمانی ڕاستگۆترین كەسەوە بە ئێمە گەیشتووە.

نیوە دوورگەی عەرەب (أرض العرب) پێشینە بیابانێكی تیایەو دەكەوێتە نێوان هێڵی درێژی (٥١) و(٣٠)ی سەر ڕووی هێڵی ئیستیواو خوارووی هێڵی ئیستیواوە.

وە هەندێ شوێنی وەك (الربع الخالي) ناوچەیەكی بێبارانە و شوێنی وای هەیە بە (٥٠) ساڵ جارێكیش بارانی تیا نابارێت... وەكاتێ پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێ) باسی وشك و برنگی و بێ سەوزایی مەككە دەكات لە چەند هەزار ساڵ لەمەو بەرەوە دەفەرموێت: [رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ﴿٣٧﴾][1] .

واتە: ئەی پەروەردگارمان « بێگومان من یەكێ لە منداڵەكانم (ئیسماعیل) ی كوڕم داناو جێم هێشت لە شیو و دۆڵێكی ووشك و بێ دەرامەت، لای ماڵە پیرۆزو بەرەكەتەكەی خۆت لە مەككەدا، ئەی پەروەردگاری ئێمە بۆ ئەوەی لەوێ بەرێك و پێكی نوێژەكانیان بكەن و بێتاقەت نەبن دەسا تۆش دڵی خەڵكێك ڕابكێشە بۆ لایان، تا دڵ خۆش بین، لەو دۆڵ و شیوەدا میوەجات و ڕزق و ڕۆزییان بدەرێ، سا بەڵكو بە باشی خواپەرستی و سوپاسگوزاری تۆ بكەن.

كەواتە لەچەند هەزار ساڵ لە مەوبەرەوە ناوچەكە بیابان بووە، دەی چۆن پێغەمبەر(ﷺ) زانی كە لە ڕابردوودا نیوە دورگەی عەرەب ڕووبارو ئاوەدانی زۆر بووە، وە ڕۆژی دواییش نایەت تا لە داهاتوودا وای لێنیێتەوە، ئێستاش ئەگەر تەماشای نیوە دوورگەی عەرەبی بكەین هەمووی بۆتە باغ و باخچە.

زانایانی جیۆلۆجی باس لەچاخە سەهۆڵینەكان دەكەن كە هاتوون بەسەر زەویداو سەهۆڵ و بەفرو سەرمای زۆر هەبووەو نزیكەی (١٠٠٠٠) ساڵ لە

---

(١) سورة إبراهيم ، الآية : (٣٧).

مەوبەر تەواو بووەو فەترەیەکی گەرمی هاتووە بەسەر زەوی، ئێستاش بەرەو ئەو چاخە سەهۆڵیە دەچینەوە، لە چاخە سەهۆڵیەکەدا بارانی زۆر باریوە لە نیوە دورگەی عەرەب و ڕووبارو ئاوەدانی زۆری تیا بووەو لە فەترەی گەرمیەکەشدا وشکی و بێ بارانی و بیابان هاتووە بەسەر ناوچەکەدا.

زانای جیۆلۆجی ئەمریکی (هال ماکلور) لەنامەی دکتۆراکەی بەناوی (الربع الخالي)وەیە دەڵێت: دەریاچەی زۆر هەبووە لە نیوە دوورگەی عەرەب لە چاخە سەهۆڵینەکاندا کە دوو جاریش دەرکەوتووە، یەکێکیان لە پێش (٣٧٠٠٠) هەزار ساڵ بۆ (١٧) هەزار ساڵ و دووەمیش لە پێش (١٠٠٠٠) هەزار ساڵ بۆ (٥٠٠٠) ساڵ پێش ئێستا.

لەگەڵ پێشکەوتنی زانست لەم ساڵانەی دواییدا توانرا زۆر ئاسانکاری بۆ شوێنەوار ناسەکانمان بکرێت، ئەویش بە هۆی وێنە گرتن و کەشف کردنی ژێر زەوی یەوە بۆ چەندەها مەتر[1].

بۆ نموونە: لە ساڵی (١٩٨١)ع دیراسەی بیابانی میسری کراو زانایانی ئەمریکی بۆیان دەرکەوت کە لە جێی نیلی ئێستا ڕووبارێکی تری گەورە هەبووەو لە ئەنجامی گۆڕانی جیۆلۆجیەوە نەماوەو (نیل) جێی گرتۆتەوە، بەمەش بۆیان دەرکەوت کە چەند هەزار ساڵێك لە مەوبەر بیابانی میسرو سودان ئاوەدانی و ڕووباری تیا بووە، بە هەمان شێوەش دیراسەی نیوە دوورگەی عەرەب کرا لە کەشتیە ئاسمانیەکان و مانگە دەستکردەکانەوە، دەرکەوت کە ڕووباری گەورە هەبووە لە ڕۆژئاوای نیوە دوورگەی عەرەبەوە بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕووە و کوێت ڕۆیشتووە، هەر چەندە ئێستا وشك بووەو لم دایپۆشیوە، پاشان بۆیان دەرکەوت کە ڕووبەرێکی فرەوانی باکووری خۆرئاوای کوێت دەڵتای ئەو ڕووبارە گەورەیە بووە.

دکتۆر (فاروق الباز) دەڵێت: ڕەنگە ئاوێکی زۆری ژێر زەوی هەبێت لە چینەکانی ژێر زەوی، چونکە ئەو ڕێڕەوەی ڕووبار دیارە شوێنەواری ئادەمیزادیش

---

(١) ظاهرة الصوبة، د.أحمد مستجير، (لا ٦٢- ٦٣).

بەرگی دووەم

هەیە لە قەراغ ڕووبارەکەدا کە هی چەند هەزار ساڵ لە مەویەرە، بەڵام هەندێ زانای تر دەڵێن: ئەو ئاوەی ژێر زەویەکە ئێستا وولاتی سعودیە سوودی لیٰ وەردەگرێت هی (٣٠٠٠٠) هەزار ساڵ لە مەوبەرە کە لە ژێر زەویدا کۆبۆتەوە.

هەروەها یەکێك لە دۆزینەوە گرنگەکانی ساڵی (٢٠١٢)ع، دۆزینەوەی تۆڕێکی زۆر فراوانی ڕووبارو دەریاچە بوو لە ژێر لمی بیاباندا.

پرۆفیسۆر (petraglia michael) لە زانکۆی ئۆکسفۆرد لەگەڵ تیمێك هەستان بە لێکۆڵینەوەیەك لە بیابانی نیمچە دوورگەی عەرەب، بینیان ئەم بیابانە وشك و برینگانە، تۆڕێکی گەورەی ڕووبار لە ژێر لمەکەیدا شاراوەتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم ناوچەیە لە زوودا شوێنی ژیان و ئاوەدانی و بێستان و دارستان بووە.

لەمەوە زانایان دەریانخست کە چۆن لە ڕابردوودا ئەو بیابانە وشکانە ڕووبار گەل و بێستان بوون، لە داهاتووشدا هەر بەو جۆرەیان لێدێتەوە[1].

## خاکی تەبوك هەمووی دەبێت بە باخ و باخات :

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر خاکی تەبوك هەمووی دەبێت بە باخ و باخات..

پێشەوا موسلیم (ڕەحمەتی خوای لیٰ بیٰ) فەرمودەیەکمان بۆ ڕیوایەت دەکات لە پێشەوا موعازی کوری جەبەل (ﷺ) کە دەیگێڕێتەوە دەڵێت: (خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) عَامَ غَزْوَةِ تَبُوك، فَكَانَ يَجْمَعُ الصَّلَاةَ، فَصَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعًا، حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمًا أَخَّرَ الصَّلَاةَ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، ثُمَّ دَخَلَ، ثُمَّ خَرَجَ بَعْدَ ذَلِكَ، فَصَلَّى الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعًا، ثُمَّ قَالَ: إِنَّكُمْ سَتَأْتُونَ غَدًا، إِنْ شَاءَ اللهُ، عَيْنَ تَبُوكَ، وَإِنَّكُمْ لَنْ تَأْتُوهَا حَتَّى يُضْحِيَ النَّهَارُ، فَمَنْ جَاءَهَا مِنْكُمْ فَلَا يَمَسَّ مِنْ مَائِهَا شَيْئًا حَتَّى آتِيَ فَجِئْنَاهَا وَقَدْ سَبَقَنَا إِلَيْهَا رَجُلَانِ، وَالْعَيْنُ مِثْلُ

---

(١) ظاهرة الصوبة، د.أحمد مستجير، (لا ٦٣).

الشِّرَاكِ تَبِضُّ بِشَيْءٍ مِنْ مَاءٍ، قَالَ فَسَأَلَهُمَا رَسُولُ اللهِ(ﷺ) هَلْ مَسَسْتُمَا مِنْ مَائِهَا شَيْئًا؟ قَالَا: نَعَمْ، فَسَبَّهُمَا النَّبِيُّ (ﷺ)، وَقَالَ لَهُمَا مَا شَاءَ اللهُ أَنْ يَقُولَ. قَالَ: ثُمَّ غَرَفُوا بِأَيْدِيهِمْ مِنَ الْعَيْنِ قَلِيلًا قَلِيلًا، حَتَّى اجْتَمَعَ فِي شَيْءٍ، قَالَ وَغَسَلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِيهِ يَدَيْهِ وَوَجْهَهُ، ثُمَّ أَعَادَهُ فِيهَا، « فَجَرَتِ الْعَيْنُ بِمَاءٍ مُنْهَمِرٍ أَوْ قَالَ: غَزِيرٍ - شَكَّ أَبُو عَلِيٍّ أَيُّهُمَا قَالَ - حَتَّى اسْتَقَى النَّاسُ، ثُمَّ قَالَ يُوشِكُ، يَا مُعَاذُ إِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ، أَنْ تَرَى مَا هَاهُنَا قَدْ مُلِئَ جِنَانًا)[1].

واتە: لە ساڵی غەزای تەبوك دا لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕۆیشتینە دەرەوە بۆ ئەو غەزایە، لەو ماوەیەدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژەکانی کۆدەکردەوە، نوێژی نیوەڕۆ و عەسری بەیەکەوە کۆدەکردەوە، هەروەها نوێژی شێوان و عیشاش هەتا ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی دواخست، پاشان هاتە دەرەوەو نوێژی نیوەڕۆ و عەسری پێکەوە کرد، فەرمووی: إن شاء الله بەیانی کاتی چێشتەنگاو دەچینە سەر کانی تەبوك، جا هەرکەس لە ئێوە گەیشتە ئەوێ، با هیچ دەست لە ئاوەکەی نەدات، هەتا منیش دەگەمە لای، کاتێك گەیشتینە لای کانیەکە، دوو پیاو پێش ئێمە کەوتبوون لەوێ بوون، کانیەکەش ئاوێکی کەمی هێندەی قەیتانی پێڵاوێکی لەبەر دەڕۆیشت.. پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لە دوو پیاوەکە کرد: ئایا هیچ دەستتان لە ئاوی کانیەکە داوە؟ گوتیان بەڵێ، پێغەمبەریش(ﷺ) لۆمەو سەرزەنشتی کردن و هێندەی خوا ویستی لێبوو قسەی پێگوتن.. پاشان خەڵکەکە بەدەستیان کەم کەم ئاویان لە کانیەکە دەگرت، هەتا لە شتێکدا ئاوەکەیان کۆکردەوە.. پێغەمبەریش(ﷺ) دەست و دەموچاوی تیادا شت و پاشان ئاوەکەی کردەوە ناو کانیەکە، ئیتر کانییەکە ئاوێکی خوڕ یان زۆرو لێشاوی لەبەر ڕۆشت، هەتا خەڵکەکە ئاویان خواردەوە، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی موعاز نزیکە، ئەگەر خوای گەورە تەمەنت درێژ بکات، ئەو کاتە ئەم ناوچەیە ببینیتەوە، کە هەمووی پڕ بووە لە باخ و باخات.

ئەم فەرمودەیەش هەروەکوو چۆن باس لە دروستیی کۆکردنەوەی نوێژەکان دەکات، هاوکات باس لە هەندێك موعجیزەی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات.

---

(١) صحیح مسلم (٤/ ١٧٨٤) باب: في معجزات النبي برقم: (٢٢٨١).

بەرگی دووەم

## پێگەی تەبوك :

میرنشینی تەبوك، دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای سعودیە، ڕووی سەرەوەی تەبوك بەرامبەر بە وڵاتی شامەو کەنارێکیشی لەسەر دەریای سوور هەیە، ناوچەی تەبوك لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بیابانێکی کەم ئاو بوو، بەڵام بەهۆی گۆڕانکاریەکانی ژینگە، کە ناوچەی تەبوك و گۆی زەویشی بەشێوەیەکی گشتی گرتەوە، ڕێژەی بارانبارین لە ناوچەی تەبوك زیادی کردو بووە گرنگترین سەرچاوەی دەستکەوتنی ئاو لە میرنیشینی عەرەبی سعودیە، بەوەش تەبوك لە بیابانەوە گۆڕرا بە یەکێك لە ناوچە کشتوکاڵیەکان بەجۆرێك لەساڵی (١٤٢٠) ی کۆچیدا، پانتایی زەوی چێنراو نزیکەی (٢٢٨٣٨٤٠) هکتار بوو، کە لە ٧٠٪ ی ئەو ڕێژەیە دەکەوێتە دەوروبەری شاری تەبوکەوە لەسەر ڕێی مەدینەی مونەوەرەو ڕێگای ئوردن (ڕێگای مەلیك خالیدی پێشوو)، ڕێژەی گەنم لە پێش هەموو بەرهەمە چێنراوەکانی تردا دێت، هەروەها (شركة تبوك للتنمية الزراعية) (تادکوا)، کە بە گەورەترین کۆمپانیای کوشتوکاڵی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەند (جیهانی ئیسلامی) دادەنرێت و پسپۆرە لەبەرهەمهێنانی میوەو ئالیك و دانەوێڵەو پەتاتەو پیازدا، دەکەوێتە ناوچەی تەبوکەوە، کە نزیکەی (٤٥) کیلۆمەتر بە ئاراستەی سنوری ئوردون لە شاری تەبوکەوە دوورە، لە تەبوك کۆمپانیای ئەسترا هەیە، کە پانتایی زەوییەکەی (٣٥)کم دووجایەو گوڵی چنین بەرهەم دەهێنێت، گوڵی جۆری مێخەك و لەیلیم و بەیبوون و جەربیراو ئەستر، کە تەنها بۆ بازاڕەکانی ناوخۆی سعودیە دەنێردرێت، هەروەها کێڵگەکانی تەبوك ترێ و زەیتون و چەقالە و خۆخ و قەیسی و مزرەمەنییەکان و سێو بەرهەم دێنن.

## ئیعجازی غەیبی و زانستی :

هەر بە خوێندنەوەی فەرمودەکە ئاشکرایە، کە ناوچەی تەبوك لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) سکاڵای لە کەمی ئاو بووە، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کرد لەوەی هاوەڵانی دەست لە ئاوی کانی تەبوك بدەن، هەتا خۆی

دەگاتە لایان و نزایان بۆ دەکات، بەڵام لەوە سەیرتر ئەوەیە، کە بە موعازی فەرموو (ئەی موعاز نزیکە، ئەگەر خوای گەورە تەمەنت درێژ بکات، ئەو کاتە ئەم ناوچەیە ببینیتەوە، کە هەمووی پڕبووە لە باخ و باخات) ئێستا کێڵگە کشتوکاڵییەکان لەناوچەی تەبوك بڵاوبونەتەوە، بە تایبەتی لە چوار دەوری شارەکەدا، لە ساڵانی داهاتووشدا بەهۆی زیادبوونی ڕێژەی بارانبارین کێڵگە کشتوکاڵیەکان ڕوو لە زیادبوون دەکەن، بۆ نموونە لەم ساڵ دا بارانبارینی زۆر بووەتە هۆی دروست بوونی لافاوی گەورە، کە ناوچەکە ساڵانێکی زۆرە لافاوی لەوجۆرەی بەخۆیەوە نەدیوە[1].

---

(١) فراس نور الحق (بەڕێوەبەری پێگەی (موسوعة الاعجاز العلمي في القرآن والسنة)، WWW.HAIV.ORG..

# داگیرکردنی کەعبە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی داگیرکردنی کەعبەی پیرۆزە، کە ئەمەش بە یەکێك لە ڕووداوەکانی هاتنی محەممەدی مەهدی ئەژمار دەکرێت..

دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە دەفەرمووی: (يَغْزُو جَيْشٌ الْكَعْبَةَ فَإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنْ الْأَرْضِ يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ)[1].

واتە: سوپایەك کەعبە داگیر دەکات، کاتێك دەگەنە دەشتێکی بەرفراوانی زەوی، ئەوەڵ و ئاخیریان ڕۆدەچن.

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە کتێبەکەی (فتح الباري - باب هدم الكعبه) دەڵێت: ئەمە ئاماژەیە بەوەی کە داگیرکردنی کەعبە ڕوودەدات، جارێکیان پێش ئەوەی پێی بگەن، خوا لەناویان دەبات، دواتر دەتوانن و دەیڕوخێنن، وا دەردەکەوێت ئەوانەی کە دێن و وێرانی دەکەن دوا دەکەون لە جاری یەکەم.

وە ئەو سوپایەی کە شەڕی کەعبە دەکەن:

یان ئەوەتا لە ڕۆمەکانن کە دەیانەوێت کەعبە داگیربکەن لە ڕێگای وڵاتانی ئوردن و سوریا.. یان لەلایەن ئێرانەوە بە تایبەتی شیعە، لە دروشمی حەجدا ئەو فیتنە مەترسیدارە سەرهەڵدەدات.

تەنانەت دکتۆر (عبدالمنعم النمر) کتێبێکی تۆکمەی هەیە لە ژێر ناونیشانی (المؤامرة على الكعبة) کە لە قەرامیتەکانەوە باس لەمە دەکات تا سەردەمی خومەینی، هەمووی بە شێوازێکی دۆکۆمێنتکاری.

---

(١) صحيح البخاري (٣/ ٦٦) باب: ما ذكر في الأسواق، برقم: (٢١١٨).

هەر چەندە بەندە گومان بۆ خاڵی دووەم دەبات و بە پەسندی دەزانێت، چونکە هەندێ: لە شیعەکان بۆ نوێژکردن ڕوویان ناکەنە کەعبە، بەڵکو هەندێك ڕوویاندەکەنە نەجەف و هەندێکی تریش ڕوویان دەکەنە کوفە، تەنانەت هەندێکیشیان دان بە بوونی ڕووگە (القبله) دانانێن.

## وشکبوونی دارخورماکانی بیسان و کەمبوونەوەی دەریاچەی تەبەرِیەو وشک بوونی کانیاوی زەغر

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر وشکبوونی دارخورماکانی بیسان و کەمبوونەوەی دەریاچەی تەبەرِیەو وشکبوونی کانیاوی زەغرە.

فاتیمەی کچی قەیس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێکیان بە جەماعەت لە ڕیزی ئافرەتاندا نوێژی دەکرد لە دوای پێغەمبەر(ﷺ) لە مزگەوت.. کاتێك لە نوێژەکەی بویەوە لەسەر مینبەرەکەی دانیشت و پێدەکەنی و دەیفەرموو: با هەر یەکەتان لە شوێنی خۆی دانیشێت و هەڵنەستێت.. پاشان فەرمووی: دەزانن بۆچی کۆمکردونەتەوە؟ گوتیان: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرموی: (إِنِّي وَاللهِ مَا جَمَعْتُكُمْ لِرَغْبَةٍ وَلَا لِرَهْبَةٍ، وَلَكِنْ جَمَعْتُكُمْ، لِأَنَّ تَمِيمًا الدَّارِيَّ كَانَ رَجُلًا نَصْرَانِيًّا، فَجَاءَ فَبَايَعَ وَأَسْلَمَ، وَحَدَّثَنِي حَدِيثًا وَافَقَ الَّذِي كُنْتُ أُحَدِّثُكُمْ عَنْ مَسِيحِ الدَّجَّالِ، حَدَّثَنِي أَنَّهُ رَكِبَ فِي سَفِينَةٍ بَحْرِيَّةٍ، مَعَ ثَلَاثِينَ رَجُلًا مِنْ لَخْمٍ وَجُذَامَ، فَلَعِبَ بِهِمِ الْمَوْجُ شَهْرًا فِي الْبَحْرِ، ثُمَّ أَرْفَئُوا إِلَى جَزِيرَةٍ فِي الْبَحْرِ حَتَّى مَغْرِبِ الشَّمْسِ، فَجَلَسُوا فِي أَقْرُبِ السَّفِينَةِ فَدَخَلُوا الْجَزِيرَةَ فَلَقِيَتْهُمْ دَابَّةٌ أَهْلَبُ كَثِيرُ الشَّعَرِ، لَا يَدْرُونَ مَا قُبُلُهُ مِنْ دُبُرِهِ، مِنْ كَثْرَةِ الشَّعَرِ، فَقَالُوا: وَيْلَكِ مَا أَنْتِ؟ فَقَالَتْ: أَنَا الْجَسَّاسَةُ، قَالُوا: وَمَا الْجَسَّاسَةُ؟ قَالَتْ: أَيُّهَا الْقَوْمُ انْطَلِقُوا إِلَى هَذَا الرَّجُلِ فِي الدَّيْرِ، فَإِنَّهُ إِلَى خَبَرِكُمْ بِالْأَشْوَاقِ، قَالَ: لَمَّا سَمَّتْ لَنَا رَجُلًا فَرِقْنَا مِنْهَا أَنْ تَكُونَ شَيْطَانَةً، قَالَ: فَانْطَلَقْنَا سِرَاعًا، حَتَّى دَخَلْنَا الدَّيْرَ، فَإِذَا فِيهِ أَعْظَمُ إِنْسَانٍ رَأَيْنَاهُ قَطُّ خَلْقًا، وَأَشَدُّهُ وِثَاقًا، مَجْمُوعَةٌ يَدَاهُ إِلَى عُنُقِهِ، مَا

بَيْنَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى كَعْبَيْهِ بِالْحَدِيدِ، قُلْنَا: وَيْلَكَ مَا أَنْتَ؟ قَالَ: قَدْ قَدَرْتُمْ عَلَى خَبَرِي، فَأَخْبِرُونِي مَا أَنْتُمْ؟ قَالُوا: نَحْنُ أُنَاسٌ مِنَ الْعَرَبِ رَكِبْنَا فِي سَفِينَةٍ بَحْرِيَّةٍ، فَصَادَفْنَا الْبَحْرَ حِينَ اغْتَلَمَ فَلَعِبَ بِنَا الْمَوْجُ شَهْرًا، ثُمَّ أَرْفَأْنَا إِلَى جَزِيرَتِكَ هَذِهِ، فَجَلَسْنَا فِي أَقْرُبِهَا، فَدَخَلْنَا الْجَزِيرَةَ، فَلَقِيَتْنَا دَابَّةٌ أَهْلَبُ كَثِيرُ الشَّعَرِ، لَا يُدْرَى مَا قُبُلُهُ مِنْ دُبُرِهِ مِنْ كَثْرَةِ الشَّعَرِ، فَقُلْنَا: وَيْلَكِ مَا أَنْتِ؟ فَقَالَتْ: أَنَا الْجَسَّاسَةُ، قُلْنَا: وَمَا الْجَسَّاسَةُ؟ قَالَتْ: اعْمِدُوا إِلَى هَذَا الرَّجُلِ فِي الدَّيْرِ، فَإِنَّهُ إِلَى خَبَرِكُمْ بِالْأَشْوَاقِ، فَأَقْبَلْنَا إِلَيْكَ سِرَاعًا، وَفَزِعْنَا مِنْهَا، وَلَمْ نَأْمَنْ أَنْ تَكُونَ شَيْطَانَةً، فَقَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ نَخْلِ بَيْسَانَ، قُلْنَا: عَنْ أَيِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ؟ قَالَ: أَسْأَلُكُمْ عَنْ نَخْلِهَا، هَلْ يُثْمِرُ؟ قُلْنَا لَهُ: نَعَمْ، قَالَ: أَمَا إِنَّهُ يُوشِكُ أَنْ لَا تُثْمِرَ، قَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ بُحَيْرَةِ الطَّبَرِيَّةِ، قُلْنَا: عَنْ أَيِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ؟ قَالَ: هَلْ فِيهَا مَاءٌ؟ قَالُوا: هِيَ كَثِيرَةُ الْمَاءِ، قَالَ: أَمَا إِنَّ مَاءَهَا يُوشِكُ أَنْ يَذْهَبَ، قَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ عَيْنِ زُغَرَ، قَالُوا: عَنْ أَيِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ؟ قَالَ: هَلْ فِي الْعَيْنِ مَاءٌ؟ وَهَلْ يَزْرَعُ أَهْلُهَا بِمَاءِ الْعَيْنِ؟ قُلْنَا لَهُ: نَعَمْ، هِيَ كَثِيرَةُ الْمَاءِ، وَأَهْلُهَا يَزْرَعُونَ مِنْ مَائِهَا، قَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ نَبِيِّ الْأُمِّيِّينَ مَا فَعَلَ؟ قَالُوا: قَدْ خَرَجَ مِنْ مَكَّةَ وَنَزَلَ يَثْرِبَ، قَالَ: أَقَاتَلَهُ الْعَرَبُ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: كَيْفَ صَنَعَ بِهِمْ؟ فَأَخْبَرْنَاهُ أَنَّهُ قَدْ ظَهَرَ عَلَى مَنْ يَلِيهِ مِنَ الْعَرَبِ وَأَطَاعُوهُ، قَالَ لَهُمْ: قَدْ كَانَ ذَلِكَ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: أَمَا إِنَّ ذَاكَ خَيْرٌ لَهُمْ أَنْ يُطِيعُوهُ، وَإِنِّي مُخْبِرُكُمْ عَنِّي، إِنِّي أَنَا الْمَسِيحُ، وَإِنِّي أُوشِكُ أَنْ يُؤْذَنَ لِي فِي الْخُرُوجِ، فَأَخْرُجَ فَأَسِيرَ فِي الْأَرْضِ فَلَا أَدَعَ قَرْيَةً إِلَّا هَبَطْتُهَا فِي أَرْبَعِينَ لَيْلَةً غَيْرَ مَكَّةَ وَطَيْبَةَ، فَهُمَا مُحَرَّمَتَانِ عَلَيَّ كِلْتَاهُمَا، كُلَّمَا أَرَدْتُ أَنْ أَدْخُلَ وَاحِدَةً - أَوْ وَاحِدًا - مِنْهُمَا اسْتَقْبَلَنِي مَلَكٌ بِيَدِهِ السَّيْفُ صَلْتًا، يَصُدُّنِي عَنْهَا، وَإِنَّ عَلَى كُلِّ نَقْبٍ مِنْهَا مَلَائِكَةً يَحْرُسُونَهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، وَطَعَنَ بِمِخْصَرَتِهِ فِي الْمِنْبَرِ: هَذِهِ طَيْبَةُ، هَذِهِ طَيْبَةُ، هَذِهِ طَيْبَةُ - يَعْنِي الْمَدِينَةَ - أَلَا هَلْ كُنْتُ حَدَّثْتُكُمْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ النَّاسُ: نَعَمْ، فَإِنَّهُ أَعْجَبَنِي حَدِيثُ تَمِيمٍ، أَنَّهُ وَافَقَ الَّذِي كُنْتُ أُحَدِّثُكُمْ عَنْهُ، وَعَنِ الْمَدِينَةِ وَمَكَّةَ، أَلَا إِنَّهُ فِي بَحْرِ الشَّأْمِ، أَوْ بَحْرِ الْيَمَنِ، لَا بَلْ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ مَا هُوَ، مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ مَا هُوَ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ، مَا هُوَ وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ إِلَى الْمَشْرِقِ، قَالَتْ: فَحَفِظْتُ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ))[1].

**واتە: سوێند بەخوا نە بۆ خۆشی و نە بۆ ترس کۆمنەکردونەتەوە، بەڵام (تەمیمی داری) پیاوێکی گاور بوو، هات و بەیعەتی پێ دام و موسڵمان بوو،**

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٦٤) كتاب: الفتن، باب: في الدجال وكثه في الأرض، برقم: (٧٢٤٣).

بەرگی دووەم

وە قسەیەکی بۆ گێڕامەوە، لەگەڵ ئەوەی کەمن بۆم باس کردبوون دەربارەی مەسیحی دەجال وەك یەك وابوون، بۆی باس کردم کە سواری پاپۆڕێکی دەریایی بووە لەگەڵ (٣٠) پیاو لە خێلی (لخم) و (جزام)، پاشان بۆ ماوەی مانگێك شەپۆلی دەریا هێناونی و بردوونی، پاشان لە نزیك دوورگەیەکەوە لە دەریادا لەنگەری پێ گرتوون، هەتا خۆرئاوابوون، ئینجا بە بەلەم لە پاپۆڕەکەدا دابەزیون و چونەتە دوورگەکە، دەعبایەکی توکنی قژ زۆر بەرەو پیریان هاتوە، پێش و پاشی لەبەر موو زۆری لێك جیا نەدەکرایەوە، گوتیان: نەگبەت تۆ چیت؟ گوتی: من (جساسەم) واتە: (هەواڵ بەر)[1]، گوتمان: جەساسە چیە؟

گوتی: خەڵکینە ئێوە جارێك بڕۆن بۆ لای ئەو پیاوە لەو دەیرەدا[2] چونکە زۆر تامەزرۆی هەواڵتانە..

گوتی: کە ناوی پیاوی برد زۆر ترساین کە ئەم شتە شەیتان بێت، گوتی: ئێمەش بەپەلە ڕۆیشتین تا چوینە ناو دەیرەکە کە سەیر دەکەین گەورەترین زەلام کە تا ئێستا بینیبێتمان لە قەبارەدا وە بەتوندترین شێوە کۆت و زنجیر کرابوو، هەردوو دەستی بەسترابوو بە ملیەوە، لە هەردوو ئەژنۆیەوە هەتا هەردوو پاژنە پێی ئاسن بوو، گوتمان: ماڵ وێران تۆ کێی؟

گوتی: ئەوا ئێوە دەبینین، بەڵام پێم بڵێن ئێوە کێن؟

گوتیان: ئێمە خەڵکی عەرەبین، سواری پاپۆڕێکی دەریایی بووین، تووشی هەڵچونی شەپۆلی دەریاوە بوین، یەك مانگ شەپۆل یاری پێکردین، هەتا لەم دورگەیەی تۆ پاپۆرەکەمان لەنگەری گرت، ئێمەش سواری بەلەم بوین و هاتینە دوورگەکە، دەعبایەکی توکنی قژ درێژمان بینی، لەبەر موو زۆری پێش و پاشیمان بۆ جیا نەدەکرایەوە پێمان گوت: نەگبەت تۆ کێی؟

گوتی: من (جەساسەم)، گوتمان: (جەساسە) چیە؟

---

(١) صحيح أشراط الساعة الصغرى والكبرى، لا ١١٧.

(٢) جێگایەکە قەشەکان تیایدا دادەبڕێن بۆ خواپەرستن.

گوتی: جارێ بڕۆن بۆ لای ئەو پیاوەی لەو دەیرەدایە چونکە زۆر تامەزرۆی هەواڵی ئێوەیە، ئێمەش بەپەلە هاتین بۆ لای تۆو ترساین ئەو دەعبایە شەیتان بێت، گوتی: هەواڵی دارخورماکانی (بیسان)[1]م پێ بڵێن؟ گوتمان: چ شتێك دەربارەی دەپرسیت؟ گوتی: پرسیاری دارخورماکانیتان لێ دەکەم، ئایا بەر دەگرێت؟ پێمان گوت: بەڵێ.. گوتی: هێندەی نەماوە بەر نەگرێت، گوتی: هەواڵی دەریاچەی (طبرية)[2]م پێ بڵێن؟ گوتمان: چ شتێك دەربارەی دەپرسیت؟ گوتی: ئایا ئاوی تێدایە؟ گوتمان: ئاوی زۆرە، گوتی: ئاوەکەی هێندەی نەماوە نەمێنێت، گوتی: هەواڵی کانیاوەکەی (زغر)[3]م پێ بڵێن؟ گوتمان: چ شتێك دەربارەی دەپرسیت؟ گوتی: ئایا کانیاوەکە ئاوی تێدایە؟ ئایا خەڵکەکەی بە ئاوەکە کشتوکاڵ دەکەن؟ گوتمان: بەڵێ ئاوی زۆرەو خەڵکەکەشی کشتوکاڵی پێ دەکەن، گوتی: هەواڵی پێغەمبەری نەخوێندەوارەکانم پێ بڵێن چی کرد؟ گوتمان: لە (مەککە)وە دەرچووەو لە (یثرب) واتە: (مەدینە) نیشتەجێ بووە، گوتی: عەرەبەکان شەڕیان لەگەڵ نەکرد؟ گوتمان: با، گوتی: ئەی چی لێکردن؟ ئێمەش پێمان گوت: زاڵ بوو بەسەر هەموو عەرەبەکانی چوار دەوریداو ئەوانیش گوێڕایەڵ و ملکەچی بوون، پێی گوتین: جا ئەوە بوو، گوتمان: بەڵێ.. گوتی: ئەگەر بە قسەی بکەن و شوێنی بکەون خێری خۆیانی تێدایە، منیش وا پێتان دەڵێم من کێم: من (مەسیح)م، وە هێندەم نەماوە کە ڕێم پێ بدرێت دەرچم، کە دەریش چووم دەگەڕێم بەسەر زەویدا، لە ماوەی چل شەودا هیچ گوندو ئاواییەك نامێنێت تێی نەچم، جگە لە (مەککە) و (طيبة) نەبێت، هەردووکیانم لێ قەدەغە کراوە، لەگەڵ ویستم بچمە یەکێکیانەوە، فریشتەیەك بەرەو ڕووم دێت شمشێرێکی لە ڕوومدا بەرزکردۆتەوە ناهێڵێت تێی بچم، وە لەسەر هەر ڕێگەیەکی فریشتەیەکی لێیە پاسەوانی دەکەن.

---

(١) (بيسان): شارێکە لە فەلەستین.

(٢) (طبرية): دەریاچەیەکە و ئاوەکەی سازگارە و دەکەوێتە شاری فەلەستین و ئوردن.

(٣) (زغر): گوندێکە لە شام لە قەراغ دەریای مردوو. بەڵام (ابن الاثير) دەڵێت: (زغر) لە شامە لە خاکی (البلقاء) بڕوانە: النهايه (٢/ ٣٠٤). هەندێکیش بە دەریای مردوو دەڵێن: (بحيرة زغر) لەبەر مێرگێکی نزیك لەو دەریایە.

پاشان فاتیمەی کچی قەیس (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: پێغەمبەر(ﷺ) بە دارەکەی دەستی کێشای بە مینبەرەکەداو فەرموی: (ئا ئەمە تەیبەیە، ئا ئەمە تەیبەیە ، ئا ئەمە تەیبەیە) واتە: شاری مەدینەیە ئایا منیش هەمان قسەم بۆ نەکردون؟ خەڵکەکەش گوتیان: بەڵێ.. ئەویش فەرموی: منیش قسەکەی تەمیمم بە دڵ بوو کە وەك قسەکەی من وابوو کە بۆم کردن دەربارەی دەجال و مەککەو مەدینە، ئەوە دەجالە لە دەریای شامە یان لە دەریای یەمەن، نەخێر.. بەڵکو وا لەڕووی خۆرهەڵات، ئەوا وا لەڕووی خۆرهەڵات، ئەوا وا لەڕووی خۆرهەڵات، (وە بەدەستی پیرۆزیشی ئیشارەتی بەرەو خۆرهەڵات کرد) (فاتیمە) دەڵێت: ئەم فەرمودەیەم ئاوا لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) لەبەر کردووە.

لەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆمان دەردەکەوێت کە دەجال خۆی پرسیاری چەند نیشانەیەکی کردووە کە لە پێش هاتن و دەرچونیدا دەردەکەوێت، ئەویش وشك بوونی ئاوی دەریاچەی (طبرية)یە کە دەکەوێتە نێوان سوریا و فەلەستین و ئوردون، وە تا ئێستا هەواڵەکان باس لەوە دەکەن کە ئیسرائیل سەر گەرمی دروست کردنی چەند بەنداوێکە لەسەر ئەو ڕووبارانەی کە دەڕژێنە دەریاچەی (طبرية)یە بەمەبەستی گرتنەوەی ئاوەکەی‌و وشککردنی دەریاچەکە تا سوریا و ئوردونی لێ بێ بەش بکات و بیکاتە کارتێکی فشار لەسەریان، هەروەها بەرنەگرتنی دارخورماکانی (بیسان) کە دەجال کردویەتی بە نیشانەی هاتنی خۆی، ئەویش دەکەوێتە نێوان سنوری (ئوردون و فەلەستین)ەوە، وە (یاقوت الحموی) چەند سەدەیەك لەمەوبەر باس لەوە دەکات کە چەند جارێك بەلای ئەو شوێنە تێپەڕیووەو جگە لە دوو دارخورمای سیس و وشك بوو هیچی لێ نەماوە[1].

وە کانیاوی (زەغر)یش وەکو (یاقوت الحموی) باسی دەکات دەکەوێتە دورایی سێ ڕۆژە ڕێ لە شاری (قودس)ەوە بەرەو باشور بۆ دیوی خاکی حیجاز.. وە ئەمڕۆ دەکەوێتە نێوان سنوری ئوردون و فەلەستینەوە، دیارە ئەو

---

(١) نیشانەکانی رۆژی دوایی و روداوەکانی پێش هاتنی، هاورێ محمد نەمین، لا ١٩١.

شوێنانەی کە دەجال پرسیاری کردوون ئەمڕۆ هەموویان دەکەونە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی جوولەکەوەو هەر ئەوانیش هەڵدەستن بە وشك کردنی ئەو شوێنانە لە پێش هاتنی دەجالدا، کە ئەمەش کارێکی بێ نهێنی نیە کە لەناو ئەو هەموو شوێنەی دونیادا دەجال تەنها پرسیاری چەند شوێنێك دەکات کە ئەمڕۆ کەوتۆتە ژێر سنوری دەسەڵاتی ئیسرائیلەوە، دیارە هەر لەکۆنەوە چاوەڕێی دەستی و پێوەندەکانێتی لە ئیسرائیل کە زەمینە سازی بۆ هاتنی بکەن و تەنها ڕووداوەکانی ئەوێشی کردووە بە نیشانە بۆ کاتی دەرچون و خۆ ئاشکراکردنی.

لەم فەرموودەیە دەگەینە چەند ئەنجامێك لەوانە:

أ- تەمیمی داری (ڕەزای خوای لێ بێت) دەجالی بینیوە پێش ئەوەی موسڵمان بێت.

ب- دەجال بوونی هەبووە لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) کە بەستراوەتەوە لە پەرستگایەك، وە لە دواییدا دەردەچێت لەو کاتەی کە ڕێگەی پێ دەدرێت.

ج- دەجال ئەگەری ئەوەی هەیە لەم پەرستگایە مردبێت و دواتر خوای گەورە زیندووی بکاتەوە.

د- ئەگەری ئەوەی هەیە ئەم پەرستگایە لە شاری ئەصبەهان بێت و لە کۆتایی بونەوەر دەربچێت، هەروەکو پێغەمبەر(ﷺ) ئەم هەواڵەی پێداوین.

هەر چەند لەم سەردەمە کۆمەڵێك نەخوێنەوار فەرموودەی جەساسە ڕەت دەکەنەوە، لە کاتێکدا بێئاگان لەوەی کە پلەی فەرموودەکە لە بەرزترین پلەی فەرموودەیە.. بۆیە ئەم ڕووداوە ڕاست و دروستەو هیچ گومانی تێدا نییە..

## پیرەمێردەکان خۆیان گەنج دەکەنەوە بە بۆیەی ڕەش

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی، پیاو سەرو ڕیشی خۆی ڕەش دەکاتەوە، لە ترسی ئەوەی پێی نەڵێن: تۆ پیاوێکی پیری، یان پیرەمێردەکان خۆیان گەنج دەکەنەوە، جا بە هەر هۆکارێك بێت، بۆ نمونە: هۆکاری هاوسەرگیری بێت یان هەڵخەڵەتاندن بێت.. زۆر پیرەمێرد هەن لە ڕێگای سبوغی ڕەشەوە خۆیان تەزویر دەکەن، بۆ ئەوەی بچێتە داخوازی ئافرەتێك.. یان هەڵی بخەڵەتێنێت...

پێشەوا ئیبنو عەباس (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (يَكُونُ قَوْمٌ يَخْضِبُونَ فِي آخِرِ الزَّمَانِ بِالسَّوَادِ، كَحَوَاصِلِ الْحَمَامِ، لَا يَرِيحُونَ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ)[١].

واتە: لە مەولا کەسانێك پەیدا دەبن لە ئاخیر زەمان دا بە ڕەنگی ڕەش مویان ڕەش دەکەنەوە وەك ژێر چەنەی کۆتر ئەوانە بۆنی بەهەشت ناکەن.

ئەگەر سەیری ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەین لەم سەردەمەدا هاتۆتە دی، چونکە لەم سەردەمەی ئێستادا پیاو و ئافرەتانێکی زۆر سەرو ڕیشی خۆیان ڕەش دەکەنەوە.

وە ئەوەی زیاتر بۆ من بەرچاوە کە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەفەرموێ: (وەکو ڕەشایی بن دەنوکی کۆتر) پێچواندنێکە بۆ ڕەشی هەندێ بن دەنوکی کۆتر لێدەکەن و سەر ڕوومەتیان دەتاشن و سەر ژێر چەنەیان دەهێڵنەوە لە پاشان بە ڕەنگی ڕەش بۆیاغی دەکەن کە وەکو بن دەنوکی کۆتری لێ دێ.

---

(١) صحيح: سنن أبو داود (٦/ ٢٧٢) باب: ما جاء في خضاب السواد، برقم: (٤٢١٢). وقال الشيخ الأرناؤوط: حديث صحيح.

پێشەوا ئیبنو جەوزی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: لەوانەیە مەبەست لەوەی کە بۆنی بەهەشت ناکەن ئەوەبێ کەوا بەهۆی کرداری بێ کە ئەنجامیان دابێ، یان بیرو باوەڕێك نەك تەنیا لەبەر هۆکاری بۆیەکردن بێ، وە لەوانەیە ئەم بۆیە کردنە دروشمی شێوەیان بێ.

لەم سەردەمە ئەم جۆرە کەسانە بەچاوی خۆمان دەیانبینین.. ئەم تەزویرە بۆ پیرەمێردەکان زۆر کێشەیە کابرایەك تەمەنی (٧٠) ساڵ بێت دەیکات بە (٢٥) ساڵ ، ئەوجا دەیەوێت بچێتە داخوازی بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەی هەڵبخەڵەتێنێ.

ئەم کارە بەزۆری بڵاوبوەتەوە لەناو ئەو کەسانەدا کە پیریان لێ دەرکەوتووە، بۆیە ڕەنگی خۆیان ئەگۆڕن بە ڕەشکردنەوەی قژیان، بەم کارەش خۆیان بەرەو خراپە دەبەن و دەیانەوێت فێڵ لە خەڵکی بکەن و خۆیان وا نیشان دەدەن کە گەنجن بە شێوەیەك کە شێوەی ڕاستی خۆیان دەگۆڕن، بۆیە گومان لەوەدا نیە کە کاریگەرییەکی خراپی هەیە بۆ سەر کەسایەتی ئەو مرۆڤە، وە تەنها تەفرەدانی خەڵکە.

زۆربەی زۆری زانایانی ئیسلام کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەو کەسەی تەمەنی گەورەیەو بەساڵا چووەو سەرو ڕیشی سپی بووە نابێت ڕەنگی ڕەش بەکار بهێنێت، بەڵکو دەبێت ڕەنگێك بێت دوور بێت لە ڕەشەوە (زەرد، سوور، بۆر) بەڵام کۆمەڵێك لە زانایان بەکارهێنانی ڕەشیان بۆ گەنجەکان بە دروست گرتووە بۆ ئەوانەی کە تەمەنیان درێژ نەبووەو بە گەنجی سەرو ڕیشیان سپی بووە[١].

پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداری کردوینەتەوە کە سەرو ڕیشمان بپارێزین لە بۆیەی ڕەش، چونکە پێشەوا جابری کوری عەبدوڵلا(ﷺ) دەڵێت: (أُتِيَ بِأَبِي قُحَافَةَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ وَرَأْسُهُ وَلِحْيَتُهُ كَالثَّغَامَةِ بَيَاضًا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): غَيِّرُوا هَذَا بِشَيْءٍ، وَاجْتَنِبُوا السَّوَادَ)[٢].

---

(١) الحلال والحرام، د. يوسف القرضاوي، لا ٣٤ .

(٢) صحيح مسلم (٣/ ١٦٦٣) كتاب اللباس والزينة ، باب استحباب خضاب الشيب بصفرة أو حمرة، وتحريمه بالسواد، برقم: (٢١٠٢).

واتە: لە ڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا کاتێ پێشەوا (ئەبوبەکر) (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەبو قوحافەی باوکی هێنایە بەردەم پێغەمبەر(ﷺ) بینی قژی ئەبو قوحافە زۆر سپی بوو، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ڕەنگی قژی بگۆڕن بەشتێك بەڵام ڕەنگی ڕەشی لێ دووربخەنەوە.

لە ڕاستی دا ئافرەتیش وەکو پیاو وایە دروست نیە ڕەنگی قژی بگۆڕێت بە ڕەش، بەڵام ئەو کەسانەی لە تەمەنی (ئەبو قوحافە)دا نین و قژیان سپی بووە ئەوا گوناهیان ناگات ئەگەر قژو ڕیشیان ڕەش بکەن.

پێشەوا زوهەیری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەگەر گەنج بووینایە ئەوا بە ڕەنگی ڕەش قژی سەرو ڕیشیمان بۆیە دەکرد، کاتێك کە ددان و ڕوخسارمان بگۆڕایە (پیربوینایە) ئەوا وازمان لە ڕەنگی ڕەش دەهێنا.

هەر چەندە کۆمەڵێك لە زانایان ڕێیان داوە بە بۆیەکردنی قژو ڕیش بە بۆیەی ڕەش وەك کۆمەڵێك لە پێشینان (سلف) لەوانە هاوەڵەکانیان تێدا بووە وەکو (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و عوقبەی کوڕی عامیر و حسن و..هتد).

هەندێك لە زانایانیش ڕێگەی ئەومیان نەداوە بە بۆیەکردنی قژ بە ڕەش تەنها بۆ کاتی جیهاد نەبێت ئەوەش بۆ ترس خستنە دڵی دوژمنان تا کاتێك موسڵمانان ببینن وا بزانن کە هەموویان گەنج و لاون واتە: (بەهێزن).

پێشەوا نەوەوی دەڵێت: ڕەش کردنی سەرو ڕیش حەرامە[1].

خەڵکانێکی زۆر پرسیار دەکەن و دەڵێن : ئایا دروستە ئافرەت مووەکانی بە ڕەش ڕەنگ بکات؟

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا (لە شەرحی عەسقەلانی لەسەر (صحیح)ی بوخاریدا هاتووە کە هەندێ لە زانایان ڕایان وایە، کە ڕەنگ کردن بە ڕەنگی ڕەش بۆ ئافرەتان و بۆ پیاوان دروستە، هەروەها (ئیبنو قەیم) گوتویەتی: ڕەنگی ڕەش دروستە بە مەرجێك ڕەشێکی ڕوت و تۆخ و بێ گەرد نەبێ، بەڵکو ڕەشەکە

---

(١) شرح صحيح مسلم (١٤ / ٨٠) .

تێکەڵ کرابێ لەگەڵ سووردا، وەکو ئەوە کە خەنەکە لەگەڵ وەسمە (كَتَمْ) تێکەڵ کرابێ لەم کاتەدا دروستە، بەڵام ئەگەر ڕەشیەکەی ڕووت بێ ئەوە دروست نیە مەگەر خاڵی بێ لە فێڵ و فریودا.

بۆیە هەرچوار پێشەواکانی ئیسلام و جمهور دەفەرموون: ناپەسندە، ئەمەش چەند بەڵگەیەکە لە بەڵگەکانی هەر چوار پێشەواکان:

**مالکیەکان دەڵێن:** ناپەسندێکی جوانە بۆ پیاوان کە ڕەنگی ڕەش بەکاربهێنێت، ناپەسەندیەکەشی لەوەیە هیچ مەبەستێکی شەرعی نەبێت، بەڵام ئەگەر بۆ جەنگ بوو ئەوە دروستە بەڵکو خێرشی دەگاتێ، بەڵام ئەگەر مەبەستێکی فاسدی هەبوو وەکو ژن هێنان ئەوە حەرامە، وە ناپەسند نیە ڕەنگی زەرد بەکاربهێنێت وەکو خەنە، بەڵکو دروستە بۆ پیاوان خەنە بەکاربێنێت بۆ سەرو ڕیش، بەڵام دروست نیە بەکارهێنانی خەنە بۆ دەست و قاچ بەبێ هیچ هۆکارێك، چونکە ئافرەتان بۆ جوانی بەکاری دەهێنن، وە دروست نیە بۆ پیاوان خۆ بچوێنن بە ئافرەتان.

**حەنەفیەکان دەڵێن:** زۆر خێرە بۆ پیاوان سەرو ڕیشیان بۆیە بکەنەوە، بەڵام ناپەسندە دەست و قاچەکان بۆیە بکات، چونکە خۆچواندنە بە ئافرەتان، هەروەها ناپەسندە ڕەشکردنەوەی موو بە ڕەنگی ڕەش بەبێ هیچ مەبەستێکی شەرعی، بەڵام ئەگەر مەبەستێکی شەرعی هەبوو وەکو ئەوەی دڵی دوژمنی پێ بترسێنێت ئەوە شتێکی سوپاسکراوە، بەڵام ئەگەر تەنها بۆ جوانی بوو بۆ ئافرەتان ئەوە ناپەسندە.

**حەنبەلیەکان دەڵێن:** سونەتە بۆیە کردن بە خەنە و جگە لەویش وەکو زەعفەران، بەڵام ڕەشکردنەوە ناپەسندە ئەگەر هیچ مەبەستێکی شەرعی نەبێت ئەو کاتە ناپەسند نیە، بەڵام ئەگەر مەبەستێکی خراپی هەبوو ویستی ئافرەتێك هەڵخەڵەتێنێ و بیکاتە کەسێك لە کەسەکانی ژیانی ئەوە حەرامە[1].

---

(١) كتاب الفقه على المذاهب الأربعة، عبدالرحمن بن محمود عوض الجزيري،(٢/ ٤٥).

**شافعیەکان دەڵێن:** ناپەسندە ڕەشکردنەوەی ڕیش بە ڕەنگی ڕەش، تەنها بە زەردو سوور دروستە ئەگەر مەبەستێکی شەرعی هەبێت[١].

وتەی پەسند لەم بارەیەوە ئەوەیە کە دکتۆر عبدالکریم زیدان دەڵێ: بە لای منەوە ڕەنگ کردن بە ڕەنگی ڕەش بۆ ئافرەتی خاوەن مێرد دروستە، جا ئایا ئەو ڕەنگە ڕەشە بۆ گۆڕانی ڕەنگی موو بێ یان بۆ گۆڕانی مووی سپی بێ، کاتێ ئەو ڕەنگ کردنە بە ڕەنگی ڕەش گونجاوی ئافرەتەکەو سروشتی مووەکانی بێ، هەروەها ئەو ڕەنگە جوان و ڕازاوە بێ بۆ ئافرەتەکە، ئەمەش هیچ فێڵ و فریودانی تێدا نیە بۆ پیاوەکە، چونکە پیاوەکەی ژنەکەی خۆی دەناسێ، ئەم ئافرەتەی کە ئەمەی کردووە تەنها بۆ ئەوە کردوویەتی لای مێردەکەی خۆی جوان و ڕازاوە بێ، تاوەکو مێردەکە زیاتر خۆشی بوێ و دڵی بچێتە سەر ژنەکەی، کە ئەمەش شەرعی خوا زۆری پێ خۆشەو پێی چاکە و ڕێگەی داوە و بانگی خەڵکی بۆ دەکات.

---

(١) سمێڵ و ڕیش لە ئیسلام هێشتنەوەو تاشین و قوتکردنیان، یعقوب حسین عبدالکریم، لا ٧٦.

بەرگی دووەم

# هەڵاوسانی مانگ

یەكێك لە نیشانەكانی نزیكبونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەیە كە مانگ لە سەرەتای هەڵاتنی گەورە بێتە بەر چاو، لە ساتی دەركەوتنیدا وەكو مانگی دووشەوەو سێ شەوە بێتە بەر چاوان.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (مِنَ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ انْتِفَاخُ الأَهِلَّةُ)[1].

واتە: لە نیشانەكانی هاتنی ڕۆژی دوایی هەڵاوسانی مانگە.

لە فەرموودەیەكی تر دەفەرموێ: (من اقتراب السَّاعَةِ أَنْ يُرَى الْهِلَال لليلة، فَيُقَالُ هَذَا ابْنُ لَيْلَتَيْنِ..)[2].

واتە: لە نیشانەكانی نزیكبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەگەر مانگی نوێ وەكو دوو شەوەی لێ هات.

لەم فەرمودەیە بۆمان دەردەكەوێت كە هەڵاوسانی مانگ یەكێكە لە نیشانە هەرە نزیكەكانی هاتنی ڕۆژی دوایی.

شێخ موحەممەد بەرزنجی و پێشەوا سففارینی دەفەرموون: ئەم نیشانەیە سەری هەڵداوەو بەردەوامیش دەبێت[3].

ئەوە چوارساڵە سەیری مانگی یەك شەوەی ڕەمەزان دەكەم لە ساڵانی (٢٠١٧ ٢٠١٨ ٢٠١٩ ٢٠٢٠) زۆر بە ڕوونی دیارە كە مانگی یەك شەوەی

---

(١) المعجم الصغير (٢/ ١١٥) برقم: (٨٧٧).

(٢) صحيح: رواه الطبراني في الصغير (٢/ ٤١). وقال الألباني في صحيح الجامع (٧٦) حسن، والأحاديث المختارة (٦/ ٣٠٥) برقم: (٢٣٢٥).

(٣) الإشاعة (لا ٧٠)، ولوامع الأنوار (٢/ ٦٨).

ڕەمەزانی خۆی بە دوو شەوەو سێ شەوە نیشان دەدات... بۆیە دڵنیام لەسەر نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەرو هاتنە دی نیشانەیەکی قیامەت.

## پەیدابوونی ڕق و کینە لە نێو خەڵکی

لە نیشانەکانی نزیبکوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی ڕق و کینە پەیدا دەبێت لە نێو خەڵکی..

دەگێڕنەوە لە پێشەوا حوزیفەی کوڕی یەمان (ﷺ) کە دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەر دەربارەی هاتنی ڕۆژی دوایی، ئەویش فەرمووی: (عِلْمُهَا عِنْدَ رَبِّي لاَ يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا إِلاَّ هُوَ ، وَلَكِنْ أُخْبِرُكُمْ بِمَشَارِيطِهَا وَمَا يَكُونُ بَيْنَ يَدَيْهَا ، إِنَّ بَيْنَ يَدَيْهَا فِتْنَةً وَهَرْجًا، قَالُوا : يَا رَسُولَ اللهِ ، الْفِتْنَةُ قَدْ عَرَفْنَاهَا فَالْهَرْجُ مَا هُوَ ؟ قَالَ بِلِسَانِ الْحَبَشَةِ : الْقَتْلُ ، وَيُلْقَى بَيْنَ النَّاسِ التَّنَاكُرُ فَلاَ يَكَادُ أَحَدٌ أَنْ يَعْرِفَ أَحَدًا)[١].

واتە: زانستی هاتنی ڕۆژی دوایی و کاتی دیاریکراوی کەس نایزانێ تەنها خوای گەورە نەبێ، بەڵام هەواڵتان پێ دەدەم بە نیشانەکانی پێش ئەوەی ڕۆژی دوایی بێت، بێگومان بەر لە هاتنی ڕۆژی دوایی ئاشوب گەلێ پەیدا دەبێ لەگەڵ هەرەجا، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئاشوب زانیمان کە چیە؟ بەڵام هەرەج چیە؟ فەرمووی: کوشتن و کوشتارە وە ڕق و کینەو حەز پێك نەکردن دەکەوێتە نێوان خەڵك، تا وای لێدێتکەسێ کەسێ ناناسێ واتە: هاموشۆی یەکتر ناکەن.

ئەگەر سەیری وشەی (بَيْنَ النَّاسِ التَّنَاكُرُ) بکەین، ئەوکات بۆمان دەردەکەوێت کە بە چەند واتایەك دێت:

---

(١) مسند الإمام أحمد (٥/ ٣٨٩) برقم: (٢٣٣٥٤)، وقال شعيب الأرناؤوط: حديث صحيح لغيره.

• بڵاوبوونەوەی کێشمە کێشمەی خەڵکی.
• داننەنان بە مافی خەڵکی و ئینکارکردنی.
• پاداشتیان بە خراپە بدەیتەوە پاش ئەوەی چاکەیان لەگەڵ کردویت.

جا بە ڕاستی ڕق و کینە کەوتە نێو خەڵك لە کاتی زۆربوونی ئاشوب و زۆربوونی کوشتن و کوشتار، لە کاتێکدا کە ماڵ زاڵ دەبێ بەسەر مێشك و دڵی خەڵکیدا، هەر یەکێ کار دەکات بۆ دەستەبەرکردنی بەشی خۆیەتی، وە گوێ نادات بە بەرژەوەندی خەڵکانی ترو مەسڵەحەتیان ڕەچاو ناکات و مافەکانیان ئاوڕ لێ ناداتەوە، جا یەکسەر نەخۆشی و خۆپەرستی نەخوازراو بڵاوە دەکاتەوە، وە مرۆڤ گەشە دەکات لە نێو ئامێزی ئارەزووەکان و چێژەکانیدا، وە برایەتی ئیمانی ئەو برایەتیەیە کەوا دەبێتە هاندەر بۆ خۆشویستنی یەکتری لەبەر خوا نامێنێ و یارمەتیدانی یەکتری لەسەر چاکسازی و پارێزگاریش تووشی هەمان هەرەس دەبێت.

پێشەوا موحەممەدی کوڕی سوقە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: (أَتَيْتُ نُعَيْمَ بْنَ أَبِي هِنْدٍ، فَأَخْرَجَ إِلَيَّ صَحِيفَةً، فَإِذَا فِيهَا: مِنْ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ الْجَرَّاحِ وَمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: سَلَامٌ عَلَيْكَ... (فذكر الكتاب وفيه) وَإِنَّا كُنَّا نَتَحَدَّثُ أَنَّ أَمْرَ هَذِهِ الْأُمَّةِ فِي آخِرِ زَمَانِهَا سَيَرْجِعُ إِلَى أَنْ يَكُونُوا إِخْوَانَ الْعَلَانِيَةِ أَعْدَاءَ السَّرِيرَةِ، (ثم ذكر جواب عمر بن الخطاب لهما، وفيه) .. كَتَبْتُمَا تُحَذِّرَانِي أَنَّ أَمْرَ هَذِهِ الْأُمَّةِ سَيَرْجِعُ فِي آخِرِ زَمَانِهَا إِلَى أَنْ يَكُونُوا إِخْوَانَ الْعَلَانِيَةِ أَعْدَاءَ السَّرِيرَةِ، وَلَسْتُمْ بِأُولَئِكَ وَلَيْسَ هَذَا بِزَمَانِ ذَلِكَ، وَذَلِكَ زَمَانٌ تَظْهَرُ فِيهِ الرَّغْبَةُ وَالرَّهْبَةُ، يَكُونُ رَغْبَةُ بَعْضِ النَّاسِ إِلَى بَعْضٍ لِصَلَاحِ دُنْيَاهُمْ)[1].

واتە: هاتمە لای نوعەیمی کوڕی باوکی هیندو پەڕاوێکی دەرهێنا بۆم کە تیایدا هاتبوو: لە ئەبو عوبەیدەی جەراح و موعاذی کوڕی جەبەل بۆ عومەری کوڕی خەتاب: سەلامت لێ بێ جا کیتابەکەی باس کرد کە تیایدا هاتبوو) وە ئێمە قسە لەوە دەکەین کەوا کاری ئەم ئوممەتە لە کۆتایی بونەوەر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە موسڵمانان ببنە برای پێش چاوو دوژمن لە نێو دڵاندا.. (پاشان باسی وەڵامی عومەری کوری خەتابی کرد بۆ هەردووکیان کە دەڵێ) ئێوە نووسیوتانەو ئامۆژگاریم

---

(١) المعجم الكبير (٢٠/ ٣٢) برقم: (٤٥).

بەرگی دووەم

دەکەن بەوەی کەوا کاروباری ئەم ئوممەتە لە کۆتایی بوونەوەر دەگەڕێتەوە ئەوەی کە موسڵمانان برای بەرچاوو دوژمنی نێو دڵان بن، وە ئێوەش ئەم کەسانە نین، وە ئەم سەردەمەش ئەو سەردەمە نیە، بەڵام ئەمەی ئێوە دەڵێن: ئەوە لەسەردەمێك ڕوودەدات کە ڕەغبەت و رەهبەت لە نێو خەڵکدا بڵاوەی کرد کە هەندێ کەس ڕەغبەت دەکا بۆ لای هەندێ لەبەر چاککردنی گوزەرانی دونیایی.

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ( لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى.. تختلف الأمور بين الناس..)[1].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت.. هەتا جیاڕایی دەکەوێتە نێوان خەڵکیەوە..

هەر چەندە هەندێك لە زانایانی فەرموودەناس دەفەرموون: ئەم فەرموودە بێ هێزە.. بەڵام لە واتادا زۆر واقیعیە.. وە لەم سەردەمەدا خەڵکێکی زۆر پەنای بردووەتە بەر درۆکردن و ڕاستگۆیی بەرەو ئاراستەیەکی کەم دەڕوات..

ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لەسەر ئەوەش کە لەلایەن خوای گەورەوە ڕەوانە کراوە.

بەڵێ.. زۆرجاران پەیدابوونی ڕق و کینە سەردەکێشێت بۆ قسەنەکردن لەگەڵ یەکتری.. ئەوەندە بەسە لە گوناهەکانی دەنگ دابڕین لە نێوان موسڵمانان دا، کە ببێتە هۆی بێ بەش بوون لە لێخۆشبوونی خوای گەورەو بە دەسەڵات، تەنانەت پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەیەك فەرموویەتی: لە هەموو جومعەیەك کردەوەکانی خەڵك دوو جار دەخرێتە ڕوو، ڕۆژی دووشەم و ڕۆژی پێنج شەم، چاوپۆشی لە هەموو بەندەیەك دەکرێ تەنیا بەندەیەك نەبێت لە نێوانی ئەوو براکەی دا کینە هەبێت، دەگوترێ واز لەو دوانە بێنن ، یا دوایان بخەن هەتاوەکو بە ئاگا دێنەوە.

---

(١) ضعيف: خرجه ابن عساكر في (تاريخ دمشق) (٤٥٣/٧) وأخرجه الدولابي في (الكنى) (١/ ٣١)، والطبراني في (المعجم الكبير) (٣٧٦/٢٢/ ١ ٩٤) ، وابن عساكر في (التاريخ) (١٠٢٩/٨) وقال الألباني في السلسلة الضعيفة : ضعيف.

هەر کەسێکیش لەو دوو کەسە ناکۆکە تەوبەی کرد پێویستە لەسەری بگەڕێتەوە لای برادەرەکەی و سەلامی لێ بکات، جا ئەگەر ئەوەی کردو هاوەڵەکەی ڕەتی کردەوە ئەوا تاوان لەسەر ئەو نامێنێت و تاوانەکە دەکەوێتە سەر ئەوەی سەرپێچی دەکات.

## جوتبوون لە ڕێگای حەڕام

لە نیشانەکانی نزیبکوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی هەندێ کەسی نامۆ ئەوانەی ڕەچاوی شەریعەتی ئیسلام ناکەن، خۆیان ناپارێزن لە چوونە لای خێزانەکانیان لە دواوە (جێگای دەرچوونی پیسی) کە ئەوەش یەکێکە لە تاوانە گەورەکان.. تەنانەت پێغەمبەری خودا (ﷺ) نەفرەتی لە ئەنجامدەری ئەو کارە کردووە کە فەرموویەتی: نەفرەت لێکراوە ئەو کەسەی بچێتە لای ژنەکەی لەلای پشتەوەی[1].

پێشەوا ئوبەی کوڕی کەعب (ﷺ) دەڵێت: (عند اقتراب الساعة، فمنها نكاح الرجل امرأته في دبرها، وذلك مما حرّم الله ورسوله..)[2].

واتە: لە کاتی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی پیاو دەچێتە لای خێزانەکەی لە ڕێگای حەڕام و پشتەوە.. لە کاتێکدا خوا و پێغەمبەری خوا حەڕامیان کردووە..

لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: هەر کەسێ چووە لای ژنی بێ نوێژ (حەیزدار) یان ژنێك لەلای پشتەوەی، یان چووە لای جادووگەرێك ئەوە بێباوەڕ بووە بەوەی بەسەر پێغەمبەر (ﷺ) دابەزیوە[3].

---

(١) رواه الإمام أحمد (٢/ ٤٧٩) وهو في صحيح الجامع، برقم: (٥٨٦٥).

(٢) شعب الإيمان، باب: في تحريم الفروج (٤/ ٣٧٥) برقم: (٥٤٥٧).

(٣) صحيح الجامع، برقم: (٥٩١٨).

ئەگەر چی ژمارەیەك لە ژنە سروشت پاكەكان ئەو كارە ڕەت دەكەنەوە، بەڵام هەندیٚ لە پیاوان هەڕەشەی تەڵاق دان دەكەن، ئەگەر گوێڕایەڵ نەبن، هەندێكیشیان فێڵ لەو ژنانە دەكەن، كە شەرم دەكەن پرسیار لە مامۆستایانی ئایینی و زانایان بكەن، بەوە فێلیان لێدەكەن كە گوایە ئەو كارە حەڵاڵە.. گومان لەوەدا نییە كە پشتەوە جێگای پیسابییە و شوێنی منداڵ نییە، یەكێكیش لە هۆكارەكانی ئەو تاوانە دەستخستنە ناو ژیانی خێزانی پاكە بە چەند كەلەپورێكی پیسی نەفامی وەكو پیادەكردنی چەند حەرامێكی نامۆ وەكو فیلمی بەرەڵایی بیٚ ئەوەی تەوبە بكەن.

## زۆربوونی قوتابیانی زانستی شەرعی

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی، قوتابیانی ئەهلی شەریعەت زۆر دەبن و خوای پەروەردگار ئەم ئایینە لەسەر دەستی ئەوان زیندوو دەکاتەوە.

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو فەرمووی: (إنه سيأتيكم أقوام من أقطار الأرض يتفقهون في الدين، ويطلبون حديثي، فإذا جاءوكم فأكرموهم)[١].

واتە: بە دڵنیایی قەومانێك دێن لە هەموو وڵاتانی زەوی بۆ ئەوەی لە ئایین تێبگەن و فێربن، وە داوای فەرمودەی من دەکەن، ئەگەر هاتن ڕێزیان لێ بگرن.

لە ریوایەتێکی تر فەرموویەتی: (يأتيكم رجال من قبل المشرق يتعلمون، فإذا جاءوكم فاستوصوا بهم خيرا)[٢].

واتە: پیاوانێك دێن لەلای ڕۆژهەڵاتەوە فێردەبن و زانستی شەرعی وەردەگرن، هەر کاتێك هاتن ئامۆژگاریتان دەکەم لەگەڵیاندا باش بن.

لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: (سَتُفْتَحُ لَكُمُ الْأَرْضُ وَيَأْتِيكُمْ قَوْمٌ أَوْ قَالَ: غِلْمَانٌ حَدِيثَةٌ أَسْنَانُهُمْ يَطْلُبُونَ الْعِلْمَ، وَيَتَفَقَّهُونَ فِي الدِّينِ وَيَتَعَلَّمُونَ مِنْكُمْ فَإِذَا جَاءُوكُمْ فَعَلِّمُوهُمْ وَأَلْطِفُوهُمْ..)[٣].

---

(١) أخرجه الترمذي (٧/ ٤٠٩) كتاب: العلم، باب: ما جاء في الاستيصاء بمن يطلب العلم، برقم: (٢٧٨٨).

(٢) سەرچاوەی پێشوو.

(٣) حسن: أخرجه ابن عبدالبر في (جامع بيان العلم) (١/ ٥٧٨)، برقم: (٩٩١)، وقال محققه: حديث حسن.

واتە: ئێوە زەویتان بۆ ئازاد دەکرێت، قەومانێك دێن یان گوتی: کەسانێکی تازە پێگەیشتوو دێن بە دوای زانستەوەن، وە دەیانەوێت لە شەریعەتی ئیسلام تێبگەن، وە دەیانەوێت لە ئێوە فێربن، هەر کاتێك هاتن ئێوەش فێریان بکەن، وەنەرم ببن لەگەڵیان..

لەم فەرموودانەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە لە دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) کەسانێك پەیدا دەبن، کە دەبنە هەڵگری ئاڵای زانست و شوێنکەوتەی پێغەمبەر (ﷺ).. نموونەی ئەو کەڵە پیاوو زانایەنەش وەکو پێشەوایان (حەنەفی و مالیك و شافعی ئەحمەد... هتد).

# ملکەچی لە نوێژدا نامێنێت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر ملکەچی لەناو نوێژدا نامێنێت، هەتا زۆر جاران مرۆڤ بیر دەکاتەوە کە چەن ڕکات نوێژی کردووە نازانێت (٣ یان ٤ یان ٥) بیری نایەتەوە.. یان فکری لەناو نوێژدا دەڕوات کە دەبێتە هۆی ئالۆزبوونی مێشکی.

پێشەوا شەددای کوری ئەوس (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) بوو فەرموویەتی: (أولُ ما يُرفع من الناس الخشوع)[1]. واتە: یەکەم شت کە لە نێو خەڵکی هەڵدەگیرێ و نامێنێت ملکەچی و خشوعە.

پێشەوا ئەبو دەرداء (ﷺ) دەڵێت: (يوشك أن تدخل مسجد الجامع فلا ترى فيه رجلاً خاشعاً)[2].

واتە: نزیکە خەڵکی بچێتە مزگەوت بەڵام پیاوێکی تێدا نابینیت لە مزگەوت کە ملکەچ و بە خشوع بێت.

لە ریوایەتێکی تر دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (أول شئ يُرفع من هذه الأمة الخشوع حتى لا ترى فيها خاشعاً)[3].

واتە: یەکەم شت کە لەم ئوممەتە هەڵدەگیرێت نەمانی خشوعە، هەتا پیاوێکی تێدا نابینیت کە بە خشوع و ویقار بێت.

---

(١) أخرجه الطبراني في (الكبير) (٧/ ٢٩٥) برقم: (٧١٨٣). قال صاحب مجمع الزوائد (٢/ ١٣٦)، رواه الطبراني في (الكبير) وفيه عمران بن داود القطان ضعفه ابن معين والنسائي ووثقه أحمد وابن حبان.

(٢) صحيح: أخرجه الترمذي (٧/ ٤١٢) كتاب: العلم، باب: ما جاء في ذهاب العلم، وقال: حسن غريب، وأخرجه الحاكم في (المستدرك) كتاب: العلم، باب: هذا أوان يختلس العلم من الناس (١/ ٩٩) وصححه ووافقه الذهبي.

(٣) حسن: أخرجه الطبراني في (الكبير)، قال في (المجمع) (٢/ ١٣٦)/ وإسناده حسن.

پێشەوا سوفیانی ثەوری (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت: سەردەمێك بەسەر خەڵكی دێت دڵیان پڕ دەبێت بە خۆشەویستی دونیا، ئەو دڵەیان وای لیٚ دێت هیچ خشوعیٚ تێدا نامێنێت[1].

## ئافرەت بەسەر پیاو زاڵ دەبێت!

لە نیشانەكانی نزیكبوونەوەی هاتنی كۆتایی بونەوەر، بەشێكی زۆری ئافرەتان دەبنە ئاغا بەسەر پیاوەكانیان و ناوێرن قسە لە قسەیان بكەن.. ئەم نیشانەیەش زۆر بە ئاشكرا بەدی دەكرێت لەم سەردەمە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (كیف بكم أيها الناس إذا طغى نساؤكم؟ قالوا: يا رسول الله (ﷺ) إن هذا لكائن؟ قال: نعم، وأشد منه)[2].

واتە: ئەی خەڵكینە ئێوە حاڵتان چۆن دەبێت كاتێك ئافرەتان بەسەر ئێوەدا زاڵ دەبن؟ گوتیان: ئەوە ڕوودەدات ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟ فەرمووی: بەڵیٚ، لەوەش خراپتر.

لە كوردستان توندوتیژی دژی پیاوان هەڵكشاوەو زیادی كردووە، تەنها لەماوەی ١١ مانگی ساڵی ٢٠١٦ ع (٥٤٣) سكاڵا تۆمار كراون و هەشت پیاویش لەلایەن ژنەكانیان كوژراون.

بەداخەوە.. هەندێك لە پیاوان لەلایەن ژنەكانیانەوە تووشی لێدان و ئازاردان دەبنەوە، هەندێك لە ژنان پیاوەكانیان لە ماڵ كردووەتە دەرەوە، یان ناپاكی

---

(١) حلية الأولياء، (٤/٢).

(٢) ضعيف: أخرجه ابو يعلى (١١/ ٣٠٤) برقم: (٦٤٢٠). في إسناد أبي يعلى موسى بن عبيدة وهو متروك.

بەرگی دووەم

هاوسەرێتی، دەست بەسەرداگرتنی مووچە یان دەست بەسەرداگرتنی منداڵ و زۆر شێوەی تری توندوتیژی بەرامبەر بە پیاوان ئەنجام دەدرێت.

لە ساڵی ٢٠١٩ع (٥٤٥) حاڵەتی جۆراو جۆر دژی پیاوان ئەنجامدراوە، سکاڵامانیش بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

دەرکردنی پیاوی بە تەمەن، خیانەتی هاوسەری، توندوتیژی جەستەیی، تەداخولکردنی ژیانی هاوسەران.. هتد.

## سەرکردەکان بۆ خۆشی و دەوڵەمەندەکان بۆ بازرگانی و هەژارەکان بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیان و قورئان خوێنەکان بۆ رووپامایی دەچنە حەج

له نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی رۆژی دوایی پەیدابوونی کۆمەڵە کەسانێکن کە هەر یەکەیان بۆ بەرژەوەندی ژیانی خۆیان دەچنە حەج.

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ:

(يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَدْعُو الرَّجُلُ ابْنَ عَمِّهِ وَقَرِيبَهُ: هَلُمَّ إِلَى الرَّخَاءِ، هَلُمَّ إِلَى الرَّخَاءِ، وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَا يَخْرُجُ مِنْهُمْ أَحَدٌ رَغْبَةً عَنْهَا إِلَّا أَخْلَفَ اللهُ فِيهَا خَيْرًا مِنْهُ، أَلَا إِنَّ الْمَدِينَةَ كَالْكِيرِ، تُخْرِجُ الْخَبِيثَ لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَنْفِيَ الْمَدِينَةُ شِرَارَهَا، كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ) [1].

واتە: سەردەمێك دێت بەسەر خەڵکی کە پیاو بانگی کوڕە مامی دەکات وە نزیکانی کەوا وەرن بۆ خۆشگوزەرانی، بەڵام مەدینە زۆر بۆیان چاکترە ئەگەر بزانن، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هیچ کەسێك نیە کە بە ئارەزووی خۆی لێی دەرچێت ئیلا خوای گەورە لەو چاکتر دەکات بە جێنشین تیایدا، ئاگادارین کەوا مەدینە وەکو ئاسنی دەست ئاسن گەرە پیسایەتی دەردەکات لە خۆی، وە کۆتایی بونەوەر نایەت تاکو شاری مەدینە پیاو خراپەکانی لە خۆی دەردەخات، هەروەك کە ئاسنی ئاگراوی دەست ئاسنگەر پیسی ئاسن لا دەبات.

پێشەوا قازی عیاز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە واتای ئەم فەرموودەدا دەڵێت: مەدینە مرۆڤە پیسەکان لە خۆی دوور دەخاتەوە لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) لەبەر ئەوەی ناتوانێ ئارام بگرێ لەسەر کۆچکردن و مانەوە لە مەدینەدا تەنیا

---

(١) صحيح مسلم (٢/ ١٠٠٥) باب: المدينة تنفي شرارها، برقم: (١٣٨١).

ئەو کەسە نەبێت کە بڕواکەی پتەوە، بەڵام دوورڕووەکان و نەزانەکانی عەرەب ئارام ناگرن لەسەر ناخۆشیەکان لە مەدینە، وە دڵ ئارام نین بەو پاداشتەی کە لەم ناخۆشیەدا بۆیان هەیە.

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەمە لەسەردەمی دەجالە، وە قسەکەی قازی عیاز بە دوور زانیووە، وە باس دەکات کە لەوانەیە ئەمە لە چەند کاتێکی جیاوازدا ڕوویدات[١]. پێشەوا ئیبنو حەجەر دەڵێت: لەوانەیە مەبەستی هەردووکیان بێت: کات و سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە بەڵگەی چیرۆکی دەشتەکیەکە، هەروەك هاتووە لە صەحیحی بوخاری لە جابرەوە(رضي الله عنه) کە دەڵێت: دەشتەکیەك هاتە لای پێغەمبەرو(ﷺ) بەیعەتی پێدا لەسەر ئیسلام، وە بەیانی هاتەوە تای لێ بوو، گوتی: ڕێگەم پێبدە دەگەڕێمەوە سێ جار، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕازی نەبوو، بەڵام لە جاری سێیەم ڕێگەی پێداو فەرمووی: شاری مەدینە وەکو ئاسنی دەستی ئاسنگەر وایە پیسایەتی لە ئاسن لا دەبات وە پاکەکەی لە خۆی دەگرێ[٢].

کاتی دووەم: سەردەمی دەجالە، پێغەمبەر(ﷺ) باسی دەجالی کرد لە پاشان فەرمووی: شاری مەدینە خۆی داتەکێنێ و خەڵکەکەی سێ جار لە بێژنگ دەدات جا خوای گەورە ئەوەی کافرو دووڕووە لێی دەردەکات، بەڵام لە نێوان ئەم دووکاتەدا نەخێر، لەبەر ئەوەی زۆرێك لە گەورە هاوەڵان دەرچوون لە مەدینە لە دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) وەکو موعازی کوری جەبەل و ئەبو عوبەیدەو ئیبنو مەسعود جگە لەوانیش دەرچوون تیایدا[٣]. پێشەوا جابری کوری عەبدوڵلا (رضي الله عنه) دەڵێت: عومەری کوری خەتاب (رضي الله عنه) پێی گوتم: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بووە دەیفەرموو: (لَيَسرنَّ الراكبُ بِجَنَباتِ المدينةِ ثُمَّ لَيَقولَنَّ لقد كان في هذا حاضرُ من المسلمين كثير)[٤].

---

(١) صحيح مسلم (٩/ ١٥٤) مع شرح النووي.

(٢) صحيح البخاري (٤/ ٩٦) مع الفتح.

(٣) فتح الباري (٤/ ٨٨).

(٤) صحيح: مسند الإمام أحمد (١٢٤/١) رقم الحديث: (١٢٤) قال أحمد شاكر: إسناده صحيح.

واتە: وای لێ دێت وولاخ سوار بە تەنیشت مەدینەدا تێ دەپەڕێت، پاشان دەڵێت: کاتی خۆی ئا لێرەدا موسڵمانان شارو ئاوەدانیەکی زۆریان هەبووە.

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عەباس(ﷺ) دەڵێت: (ألا أخبركم بأشراط الساعة يحج الناس إلى هذا البيت الحرام يحج ملوكهم لهواً وتنزهاً وأغنياؤهم للتجارة ومساكينهم للمسألة وقراؤهم رياء وسمعة فعند ذلك يظهر كوكب له ذنب)[1].

واتە: هەواڵتان پێ بدەم بە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی، خەڵکی حەج دەکەن و بەرەو بەیت بەڕێ دەکەون، سەرکردەکانیان بۆ خۆشی خۆیان و دەوڵەمەندەکان بۆ بازرگانی و هەژارەکان بۆ دابین کردنی بژێوی ژیانیان و قورئان خوێنەکان و مامۆستایانی ئایینی بۆ ڕووپامایی و ناوبانگ دەچنە حەج.. لەو کات ئەستێرە کلکدارەکە سەرهەڵدەدات و دەردەکەوێت..

حەج: بنەمای پێنجەمە لە ئەڕکانەکانی ئیسلام، پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك لە تواناییدا بێت بچێتە حەج، وە لەلایەن زمانەوانیەوە نیازو مەبەست دەگەیەنێت، بەڵام لە ڕووی ئاینیەوە ڕۆیشتنۆ بەرێکەوتنە بەرەو ماڵی خودا (بیت الله الحرام).

زانایان هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کە حەجکردن لە تەمەندا یەکجار واجبە بۆ کەسێك کە ماڵ و سەروەت و سامانی هەبێت، وە لەسەر هەموو پیاوو ژنێك کە تەکلیفی شەرعیان لەسەرە، بەو مەرجەش کە توانایان هەبێت.

---

(١) رواه ابن مردويه .

## ئاوات خواستن ساڵ بە ساڵ خۆزگەم بە پار

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر، خەڵکی ئاوات بە ساڵانی ڕابردوو و تەمەنی منداڵی و گەنجیەتی دەخوازێت.

پێشەوا ئەنەسی کوری مالیك (ﷺ) دەڵێت: (اصبروا فإنه لا يأتي عليكم زمان إلا الذي بعده أشر منه حتى تلقو ربكم)[1].

واتە: ئارامبگرن بە دڵنیایی سەردەمێك نایەت ئیلا لە پاش ئەو سەردەمە خراپتر دێت، هەتا بە خزمەت خوای گەورە دەگەن.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری مەسعود (ﷺ) دەڵێت: (لا يأتي عليكم عام إلا وهو شر من الآخر)[2].

واتە: هیچ ساڵێك بەسەرتاندا نایەت ئیلا خراپترە لە ساڵی پێشوو.

لە ریوایەتێکی تر فەرموویەتی: (ليس عام إلا والذي بعده شرٌ منه)[3]. واتە: هیچ ساڵێك نییە ئیلا لە دوای دا خراپتر دەبێت.

لە ریوایەتێکی تر فەرموویەتی: (أمس خير من اليوم، واليوم خير من الغد، وهكذا حتى تقوم الساعة)[4].

واتە: دوێنی باشترە لە ئەمرۆ، ئەمرۆ باشترە لە بەیانی، بەو شێوەیە هەتا ڕۆژی دوایی دێت.

---

(١) صحيح البخاري (١٣/ ١٦) كتاب: الفتن، باب: لا يأتي زمان إلا الذي بعده شر منه، برقم: (٦٦٥٧).

(٢) مجمع الزوائد (٧/ ٢٨٥).

(٣) أخرجه الطبراني في (الكبير) (٩/ ١٠٥) برقم: (٨٥٥٠). قال الحافظ ابن حجر في (فتح الباري) سنده جيد.

(٤) صحيح: أخرجه الطبراني في (الكبير) (٩/ ١٥٤) برقم: (٨٧٧٣). وقال الهيثمي في (المجمع) (٧/ ٢٨٦): رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح.

# خەڵکی ئاوات بە هاتنی محەممەدی مەهدی دەخوازن

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی خەڵکی ئاوات بە هاتنی محەممەدی مەهدی دەخوازن.

فەرموودە ڕاست و دروستەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ڕاستیە دەسەلمێنن کە لە کۆتایی دونیادا لە کاتێکدا کە ئیسلام غەریب دەبێت و شەریعەتی خوا لەکار دەخرێت و موسڵمانان بێ شوان و ڕابەر دەبن و سەرتاپای زەوی ستەم دەیگرێتەوەو زۆرداران و ستەمکاران تیایدا خاوەن دەسەڵات دەبن تا وای لێدێت کەس هیوای خێرو چاکەی نامێنێت کە جارێکی تر بگەڕێتەوە سەر زەوی، ئا لەو کاتەدا خوای پەروەردگار ڕووی ڕەحمەتی خۆی لە بەندە دڵسۆزەکانی دەکات و پێشەوایەکی خاوەن باوەڕو عەزیمەتیان بۆ دەڕەخسێنێت، کە لەسەر دەستیدا دین زیندوو دەبێتەوەو ئیسلام و موسڵمانان سەر بەرز دەبن و قەڵای کوفرو ستەمکاران هەرەس دێنێت و سوننەت دەبوژێتەوەو بیدعەت دەمرێت و خێرو بەرەکەت و ڕزق و ڕۆزی بە جۆرێك بەسەر زەویدا دەڕژێت کە وێنەو نمونەی لە هیچ سەردەمێکدا نەبووە، هاتنی ئەم پێشەوایە ئیسلامیەش بە کوێرایی چاوی هەموو دوژمن و ناحەزێکی ئەم دینە ڕاستیەکە وەکو هەموو هەواڵە ڕاستەکانی تری پێغەمبەر(ﷺ) دێتە دی و قەدەری خواش هەر بە ئەنجام دەگات، ئەم پێشەوایەش (محەممەدی مەهدی)یە[1].

پێشەوا صەباح (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: (يمكث المهدي فيهم تسعاً وثلاثين سنة، يقول الصغير: يا ليتني كبرت، ويقول الكبير: يا ليتني كنت صغيراً)[2].

---

(١) رحلة الي الدار الآخرة، جمع وترتيب: محمود المصري، لا ٢٥٤.

(٢) التقاء المسيحين في آخر الزمان (لا ٨٣).

واتە: مەهدی سی و نۆ ساڵ لە نێوتاندا دەمێنێتەوە، منداڵی بچوك دەڵێت: خۆزگە گەورە دەبووم، وە گەورە دەڵێت: خۆزگە بچوك دەبومەوە.

محەممەدی مەهدی ناوی (محەممەدی کوڕی عبدوڵلای حەسەنی)یە، لە نەوەی (حەسەنی کوری عەلی کوری ئەبو طالیب)ە، هاتنی ئەو پێشەوایەش لە کۆتایی بونەوەر دەردەکەوێ ئەمەش لە بەزەیی و میهری خوداوەیە بۆ ئەم ئوممەتە، موحەممەدی مەهدی یەکێکە لەو جۆرەکەسانەی کە هەق و دادگەری بەرپا دەکاو ستەم قەدەغە دەکات، خوای گەورە بەهۆی (محەممەدی مەهدی) یەوە بەیداخی خێرو چاکە هەڵدەکا و بۆ ئوممەت دەبێتە هۆی دادەوەری و رێنمونی و پشتیوانی و رێبەری خەڵکی بۆ سەرکەوتن.

مەسەلەی (محەممەدی مەهدی) بڕوایەکی جیهانیە کە لە قورئان و سوننەت و تەواوی نامە ئاسمانیەکاندا باسکراوە، کە ئازادی بەخشی جیهانیە و لەسەر دەستی ئەو هەر حەوت کیشوەرەکان دەبن بە یەك خێزان و چینایەتی و هەژاری نامێنێ.

پێشەوا طاوس (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: (وددت أنی لا أموت حتی أدرك زمان المهدی)[1].

واتە: من حەز دەکەم نەمرم هەتا بە سەردەمی محەممەدی مەهدی دەگەم.

پێشەوا ئیبنو لوهەیعە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: (یتمنی فی زمان المهدی الکبیر الصغیر، والصغیر الکبیر)[2].

واتە: لە سەردەمی محەممەدی مەهدی ئاوات دەخوازن گەورەو بچوك و بچوك و گەورە.

پشت بەخوای گەورە لە بەرگی سێیەم بە درێژی باسی محەممەدی مەهدی دەکەین.

---

(١) أخرجه نعیم بن حماد في (الفتن) (٢/ ٣٢).

(٢) التقاء المسیحین في آخر الزمان (لا ٨٣).

بەرگی دووەم

# پەیدابوونی تەیارەی جەنگی

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی تەیارەی حەربی زۆر دەبێت، جا هەندێکیان ناسراون بە: تەیارەی ئێف ١٦.. یان ئێف ٣٥.. هتد..

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (ویل للعرب من شر قد اقترب، الأجنحة وما الأجنحة؟ الويل الطويل في الأجنحة، (ريح فيها هبوبها، وريح تهيج هبوبها وريح تواحی - تراخی - هبوبها)[1].

واتە: خاك بەسەر عەرەب لەو ڕوداوە خراپەی کە نزیك بۆتەوە، باڵ، چ باڵێك؟..

گومانی تێدا نییە ئەمڕۆ زۆربەی عەرەب دەناڵێنن بە دەست دواکەوتوویییەوە، لە کاتێکدا وڵاتە زلهێزەکان لەوپەڕی پێشکەوتنن.

لە کاتێکدا ئیسلام لەو پەڕی شکۆمەندی و گەورەییە، بەڵام عەرەب بەرەو دواوە دەچێت، تەنانەت فێربوونە بە دوای وڵاتانی غەربەوە دەچن لە کارە بێسوودەکانی ژیان تەنانەت بە هۆی چەکە پێشکەوتوەکانیان وڵاتە عەرەبەکانیان لەناو برد بەو چەکە سەرەکیانەی کە باڵیان هەیە، کە ئەمڕۆ ئەم باڵدارانە بە چاوی خۆمان دەیانبینین کە ئامادەیان کردوون لە ساڕوخ و قونبەلەو چەکی کیمیایی.. هتد.

سبحان الله.. لەم سەردەمە زۆر ڕاشکاوانە ئەوە بەدی دەکەین کە ئەمڕۆ ئەم جۆرە تەیارانە جیهانیان خاپور کرد.

ئەمڕۆ زۆربەی وڵاتانی جیهان لە هەوڵی بەدەست هێنانی ئەو جۆرە فڕۆکەیەن، تەنانەت ماوەیەك پێش ئێستا سەرۆکی ئێران لە کاتی کردنەوەی پڕۆژەیەکی سەربازیدا ڕایگەیاند، کە دروستکردنی تەیارەو ڕادار و ساڕوخ یەکێکە لە دەستکەوتە گەورەکانی ئێران لە بواری سیستەمی بەرگری.

---

(١) رواه عبد الرزاق في (مصنفه): (١١/ ٣٥٢) برقم: (٢٠٧٣٠).

# کافرەکان قورئان دەخوێننەوە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر کافرەکان قورئان دەخوێننەوە، بۆ ئەوەی خەڵکی پێ هەڵبخەڵەتێنن.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عەباس (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَيَقرأَنَّ القُرآنَ ناسٌ من أُمَّتِي يَمرُقُونَ من الإسلامِ، كَما يَمْرُقُ السَّهْمُ من الرَّمِيَّةِ)[1].

واتە: سوێند بەخوا خەڵکانێك لە ئوممەتەکەی من قورئان دەخوێنن لە ئیسلام دەردەچن هەروەکو چۆن تیر لە تیروکەوانەکەی خۆیەوە دەردەچێت..

بە درێژایی مێژووی ئیسلام کەسانێك پەیدابوون قورئانیان دەخوێندەوە لە کاتێکدا موسڵمان نەبوون، یان خۆیان بە موسڵمان نیشان دەدەن کە گوایە پاڵپشتی لە ئایینی ئیسلام دەکەن قورئان بۆ خەڵکی دەخوێننەوە، جا لە ڕێگای کەناڵە ئاسمانیەکان بێت یان تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان یان.. هتد..

مێژوو شاهێدە هێشتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ژیاندا مابوو کەسانێك قورئانیان دەخوێندەوە وەکو پەیدابوونی موسەلیمەی درۆزن و سەجاح و ئەسوەد.. وە کەسانێك هەبوون کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان دەکرد لە هەموو تاقم و بیروڕا گومڕاکان وەکو قەرامیتەو عەلەوی و خەواریج و مورجیئەو.. هتد.. لەم سەردەمەی ئەمڕۆش قادیانیەکان و بەهائیەکان و عەلمانیەکان و نوسەیریەکان و بەعسیەکان و زەردەشتیەکان.

ئا ئەمانە بانگەشەی ئیسلام دەکەن و قورئانیش دەخوێننەوەو بەداخەوە زۆربەیان پارەی پێ پەیدا دەکەن و وەردەگرن.

پاکو بێگەردی بۆ خوای گەورە کە هەموو موعجیزەکان وەکو خۆی دێتە دی و چاوەکانمان دەبنە شاهێد و گەواهیدەر لە ڕۆژی دوایی.

---

(١) صحيح الجامع، برقم: (٥٤٦٣).

# وشکە ساڵی زۆر دەبێت

یەکێك لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر وشکە ساڵی زۆر دەبێت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ خَمْسٌ إِذَا ابْتُلِيتُمْ بِهِنَّ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ تُدْرِكُوهُنَّ: .. وَلَمْ يَمْنَعُوا زَكَاةَ أَمْوَالِهِمْ، إِلَّا مُنِعُوا الْقَطْرَ مِنَ السَّمَاءِ، وَلَوْلَا الْبَهَائِمُ لَمْ يُمْطَرُوا.. )[1].

واتە : ئەی کۆمەڵی موهاجیرەکان پێنج بەڵا هەن ئەگەر دوو چاریان ببن پەنا بەخوا دەگرم لەوەی پێیان بگەن، یەکێك لەو پێنج بەڵایانە ئەگەر زەکاتی ماڵەکانیان نەدەن ئەوا بارانیان لە ئاسمانەوە لێ دەگیرێتەوەو لەبەر خاتری ئاژەڵیش نەبوایە هیچ نەدەباری..

زەکات نەدان خوای گەورە تورە دەکات فریشتەکان نیگەران دەبن و ڕەحمەتی خوا دانابەزێت، کەواتە خوای گەورە باران بارینی بەستۆتەوە بە دەرکردنی زەکاتی ماڵەوە، واتە: کاتێك زەکاتی ماڵەکەم دەدەم ئەو ماڵە گەشە دەکات وەك چۆن کاتێك باران باری زەوی گەشە دەکات و دەبوژێتەوە، بە هۆی نەدانی زەکاتەوە وشکە ساڵی زۆر دەبێت.

پێشەوا موجاهید(ڕەحمەتی خوای لێ بێ ) دەڵێت: کاتێ وڵات تووشی وشکە ساڵی و بێبارانی دەبێت حەیواناتی نەفرەت لەو مرۆڤانە دەکەن کە بێ فەرمانی خوا دەکەن و دەڵێن: ئەمە بە هۆی تاوانی نەوەی ئادەمەوەیە[2].

---

(١) صحيح: أخرجه الحاكم في (المستدرك) كتاب: الفتن والملاحم، باب: ذك خمس بلاء أعاذ النبي منها للمسلمين (٤/ ٥٤ ٥٤١) وصححه ووافقه الذهبي.

(٢) الجواب الكافي (لا ٣٨).

پێشەوا عیکرەمە دەڵێت: ژیانلەبەرەکانی سەر زەوی تەنانەت دووپشك و شتە زیانبەخشەکان دەڵێن: بە هۆی نەوەی ئادەمەوە بارانمان بۆ ناباریێت[١].

## زیادەڕەوی لە ئاوی دەست نوێژو غوسل زۆر دەبێت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر خەڵکانێك زیادەڕەوی دەکەن لە دەست نوێژو غوسل و بەکارهێنانی ئاو.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری مغفل دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إنَّهُ سيَكونُ في هذِهِ الأمَّةِ قومٌ يَعتدونَ في الطَّهورِ والدُّعاءِ)[٢].

واتە: بە دڵنیایی لە داهاتوویەکی نزیك دا کۆمەڵێك لەم ئوممەتەی من پەیدا دەبن زێدەڕەوی دەکەن لە بەکارهێنانی ئاوو پاڕانەوەدا.

ئیسراف: واتە: زێدەڕەوی کردن لە هەر کارێك کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات، هەر چەندە ئەم پێناسەیە بۆ نەفەقە بەکار دێت[٣].

بێگومان لەم سەردەمە زۆر کەس ئیسراف و زێدەڕەوی دەکەن لە خواردن و خواردنەوەو بەکارهێنانی ئاو، بەڕاستی ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی فەرمووە هەمووی وەکو ڕۆژی ڕووناك هاتۆتە دی.

تەنانەت لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: بخۆن و بخۆنەوەو جل بپۆشن و ماڵ ببەخشن، بەبێ ئەوەی ئیسراف بکەن و خۆتانی پێ هەڵکێشن..

تەنانەت ئیسراف لە بەکارهێنانی ئاو و دەست نوێژو غوسلیش حەرامەو دروست نییە.

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢) صحيح: رواه الحاكم في المستدرك على الصحيحين، كتاب الطهارة ، باب: سيكون في هذه الأمة قوم يعتدون في الطهور والدعاء برقم: (٥٩٦). قال الألباني صحيح.

(٣) مفردات ألفاظ القرآن، للاصبهاني، لا ٤٠٧.

## زیادەڕەوی لە دۆعاکردن

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر خەڵکانێك زیادەڕەوی دەکەن لە دۆعاکردن.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری مغفل (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إنَّهُ سيَكونُ في هذِهِ الأمَّةِ قومٌ يَعتدونَ في الدُّعاء)[١].

واتە: بە دڵنیایی لە داهاتوویەکی نزیك دا کۆمەڵێك لەم ئوممەتەی من پەیدا دەبن زێدەڕەوی دەکەن لە پاڕانەوەو دۆعاکردن.

مەبەست لەم فەرمووده ئەوەیە: هەندێك کەس کە دەپاڕێنەوەو داوای شتێك لە خودا دەکەن زۆر وردی دەکەنەوە، ئەمەی وا بێت و ئەمەی وابێت..

ئیسراف: واتە: زێدەڕەوی کردن لە هەر کارێك کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات، هەر چەندە ئەم پێناسەیە بۆ نەفەقە بەکار دێت[٢].

پێشەوا ئیبنو قەییم (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت:

خۆشەویسترین کەس لەلای پەروەردگار ئەو کەسانەن، کە زۆر دەپاڕێنەوەو بە جوانترین و باشترین شێوە داوا لە پەروەردگار دەکەن، چونکە پەروەردگار پێی خۆشە بەندەکەی داوای لێبکات و بپاڕێتەوە، هەر چەند بەندە بپاڕێتەوە داوا لە پەروەردگار بکات ئەوا خودای گەورە خۆشی دەوێت و لە خۆی نزیك دەکاتەوەو، خۆشی دەوێت و پێی دەبەخشێت[٣].

---

(١) صحيح: رواه الحاكم في المستدرك على الصحيحين، كتاب الطهارة ، باب: سيكون في هذه الأمة قوم يعتدون في الطهور والدعاء برقم: (٥٩٦). قال الألباني صحيح.

(٢) مفردات ألفاظ القرآن، للاصبهاني، لا ٤٠٧.

(٣) حادي الأرواح، لا ٩١.

# فیتنەو ئاشوب دەکەوێتە نێو وڵاتی موسڵمان نشینەکان هەتا کار دەگاتە ئەو حاڵەی کەسانێک لە ئیسلام دەربچن



لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر فیتنەو ئاشوب دەکەوێتە نێو وڵاتی موسڵمان نشینەکان.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (إِنَّهَا سَتَكُونُ فِتَنٌ: أَلَا ثُمَّ تَكُونُ فِتْنَةٌ الْقَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْمَاشِي فِيهَا، وَالْمَاشِي فِيهَا خَيْرٌ مِنَ السَّاعِي إِلَيْهَا، أَلَا، فَإِذَا نَزَلَتْ أَوْ وَقَعَتْ، فَمَنْ كَانَ لَهُ إِبِلٌ فَلْيَلْحَقْ بِإِبِلِهِ، وَمَنْ كَانَتْ لَهُ غَنَمٌ فَلْيَلْحَقْ بِغَنَمِهِ، وَمَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَلْحَقْ بِأَرْضِهِ، قَالَ فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ(ﷺ) أَرَأَيْتَ مَنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ إِبِلٌ وَلَا غَنَمٌ وَلَا أَرْضٌ؟ قَالَ: يَعْمِدُ إِلَى سَيْفِهِ فَيَدُقُّ عَلَى حَدِّهِ بِحَجَرٍ، ثُمَّ لِيَنْجُ إِنِ اسْتَطَاعَ النَّجَاءَ، اللهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ؟ اللهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ؟ اللهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ؟ قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ(ﷺ) أَرَأَيْتَ إِنْ أُكْرِهْتُ حَتَّى يُنْطَلَقَ بِي إِلَى أَحَدِ الصَّفَّيْنِ، أَوْ إِحْدَى الْفِئَتَيْنِ، فَضَرَبَنِي رَجُلٌ بِسَيْفِهِ، أَوْ يَجِيءُ سَهْمٌ فَيَقْتُلُنِي؟ قَالَ: يَبُوءُ بِإِثْمِهِ وَإِثْمِكَ، وَيَكُونُ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ)[1].

واتە: لە دوای من فیتنەی زۆر ڕوودەدات پاشان فیتنەیەك دێت ئەوەی دانیشتبێت تیایدا باشترە لەوەی تیایدا دەڕوات، ئەوەی دەڕوات باشترە لەوەی کە هەوڵی بۆ دەدات، هەر کاتێك ئەو فیتنەیە ڕوویدا، ئەوەی حوشتری هەیە با بچێت بە لای حوشترەکەی خۆیەوە، ئەوەی کە مەڕی هەیە با بچێت بە لای مەڕەکەی خۆیەوە، ئەوەی کە خاك و زەوی هەیە با بچێت بە لای خاك و زەویەکەی خۆیەوە، پیاوێکیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەی ئەگەر یەکێك نە وشترو نە مەڕو نە زەوی هەبوو چی بکات باشە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: با بەردێك هەڵگرێت و شمشێرەکەی خۆی پێ بشکێنێت و پاشان

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢١٢) كتاب: الفتن، باب: نزول الفتن كمواقع المطر، برقم: (٢٨٨٧).

بۆی دەرچێت ئەگەر توانای دەرچوونی هەبوو، خوایە شایەت بە پێم گوتن: خوایە شایەت بە پێم گوتن: خوایە شایەت بە پێم گوتن: پیاوێکیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەی ئەگەر بە زۆر ڕاپێچیان کردم بۆ یەکێك لە دووبەرەی شەڕەکەو پیاوێك بە شمشێرەکەی لێی دام یان تیرێکم بەرکەوت و کوژرام؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ئەوا گوناهی خۆی و گوناهی تۆش دەچێتە ئەستۆی ئەو و دەچێتە ئاگرەوە.

ئەمەش یەکێکە لە جۆرەکانی فیتنەو ئاشوب کە سەرتاپای ئەو وڵاتانە دەگرێتەوە کە زۆرینەیان موسڵمانن، لە پێناوی بەدەست هێنانی سەروەت و سامان و ماڵ ئامادەن ئایین و موسڵمانبوون بگۆڕنەوە لە پێناوی.

# زیادەڕەوی لە جل وبەرگی ڕەنگاو ڕەنگ و گران بەها

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر کەسانێك جۆرەها جل و بەرگی ڕەنگاو ڕەنگ دەپۆشن، لە پێناوی ناو دەرخستن و فیز لێدان بەسەر چینی هەژارەکان، وە هەژارەکانیش لەو پەڕی ناخۆشی ژیان گوزەر دەکەن.

پێشەوا ئەبو ئومامە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (سَيَكُونُ رِجَالٌ مِنْ أُمَّتِي يَلْبِسُونَ أَلْوَانَ اللِّبَاسِ .. فَأُولَئِكَ شِرَارُ أُمَّتِي)[١].

واتە: لە دوای من پیاوانێك لە ئوممەتی من پەیدا دەبن، جۆرەها جل و بەرگی ڕەنگاو ڕەنگ لەبەر دەکەن.. ئا ئەوانە خراپترینی کەسی ئوممەتی منن.

ئیسراف: واتە: زێدەڕەوی کردن لە هەر کارێك کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات، هەر چەندە ئەم پێناسەیە بۆ نەفەقە بەکار دێت[٢].

بێگومان لەم سەردەمە زۆر کەس ئیسراف و زێدەڕەوی دەکەن لە خواردن و خواردنەوەو بەکارهێنانی ئاو و لەبەرکردنی جلوبەرگی گران بەها، بەڕاستی ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی فەرمووە هەمووی وەکو ڕۆژی ڕووناك هاتۆتە دی.

تەنانەت لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: بخۆن و بخۆنەوەو جل بپۆشن و ماڵ ببەخشن، بەبێ ئەوەی ئیسراف بکەن و خۆتانی پێ هەڵکێشن..

بۆیە هەر شتێك لە پێناوی غەیری خوای گەورە سەرف بکرێت ئەوا ئیسرافەو زێدەڕۆییە.

---

(١) حسن: رواه الطبراني في (المعجم الكبير) (٨/ ١٠٧) برقم: (٧٥١٢). قال الألباني في صحيح الترغيب (٢/ ٤٧٩): حسن لغيره.

(٢) مفردات ألفاظ القرآن، للاصبهاني، لا ٤٠٧.

بەداخەوە.. زۆربەی خەڵکی هەوڵ دەدەن ڕووی دەرەوەیان بە جوانترین و پاکترین شێواز دەرکەوێت، بەڵام لەولاوە هەوڵی پاکردنەوەی دڵ و دەروون نادەن لەو نەخۆشیانەی کە خودای گەورە ئاگاداری کردووینەتەوە لێی.

## هەر کەسەو بە ڕەئی خۆی سەرسوڕمان دەبێت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی هەق و ڕاستی وون دەبێت و خەڵکی بە ڕەئیەکان و وتەکانی خۆی سەرسوڕمان دەبێت.. هەمووی ڕەئی خۆی پێ قەبوڵەو ئەوانی بەرامبەری پێ قەبوڵ نەکراوە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: (إِذَا رَأَيْتَ شُحا مُطَاعًا، وَهَوًى مُتَّبَعًا، وَدُنْيَا مُؤْثَرَةً، وَإِعْجَابَ كُلِّ ذِي رَأْيٍ بِرَأْيِهِ)[1].

بەڵێ.. خەڵکێکی زۆر لەم سەردەمە بە ڕای خۆی سەرسوڕمانە، کە ئەوەش دەستپێکی دەرچوونە لە هەق و ڕاستی بۆ باتیڵ و ناڕاستی..

هەر کەسەو هەڵدەستێت و دەڵێت: ئەوەی ڕای منەو پێویستە شوێنی بکەون، جا دەروێشەکانیان هەڵدەستن جوانی دەکەن و جۆرەها جوانکاری و هێنان و بردن بۆ ڕەئیەکانیان دەکەن.. تەنانەت ئەگەر چەندین بەڵگەش هەبێت دژ بە ڕەئیەکانیان بەڵام وەری ناگرن و بە دوای ناڕاستی دەکەون.

کەسی بڕوادار فەرمانی پێکراوە لە هەموو کاتێکدا ملکەچ بێت بۆ پەیامی خودا و پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەك لە هەوڵی ئەوەدا بێت فەتوا بە ڕەئی خۆی ئاراستەی خەڵکی بکات.

---

(١) ضعيف: أخرجه أبو داود (٤٣٤١) واللفظ له، والترمذي (٣٠٥٨)، وابن ماجة (٤٠١٤). وضعفه الألبا ن في ضعيف الترمذي، برقم: (٥٨٥).

بەرگی دووەم

ڕەحمەتی خوای گەورە لەو کەسە بێت کە هەمیشە وتەی زانایان بە نرخ دەنرخێنێت و خۆی بە دوور دەگرێت لە ڕای کەسایەتی خۆی، چونکە زۆر جاران مرۆڤ بەرەو لەناوچوون دەبات.

## ئافرەتان داوای هاوسەرگیری لە پیاوان دەکەن

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی گەنج هاوسەرگیری ناکات، هەتا ئافرەتان داوا دەکەن کە بیانخوازن لە ترسی توشبوون بە زینا یان لەبەر گوناهو سەیرکردنی فیلمی بێ ڕەوشتی..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لا تقوم الساعة حتى يتبع الرجل قريب من ثلاثين امرأة كل تقول: أنكحني أنكحني)[1].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا هەتا ئافرەتان شوێن پیاوێك دەکەوێت کە ژمارەیان خۆی لە سی کەس دەدات، هەمووی دەڵێت: بمخوازی بمخوازە.

لە ریوایەتێکی تر فەرموویەتی: (وَتَرَى الرَّجُلَ الْوَاحِدَ يَتْبَعُهُ أَرْبَعُونَ امْرَأَةً، يَلُذْنَ بِهِ مِنْ قِلَّةِ الرِّجَالِ وَكَثْرَةِ النِّسَاءِ)[2].

واتە: دەبینی پیاوێك چل ئافرەت شوێنی کەوتوون و لەگەڵی رادەبوێرن داوای لێدەکەن و ڕەجا دەکەن کە بیانخوازێ، ئەویش لەبەر کەمی پیاوو زۆربوونی ئافرەت.

پێشەوا ئەنەسی کوری مالیك (ﷺ) دەڵێت: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرمو: (مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يَظْهَرَ الْجَهْلُ وَيَقِلَّ الْعِلْمُ وَيَظْهَرَ الزِّنَا وَتُشْرَبَ الْخَمْرُ وَيَقِلَّ الرِّجَالُ وَيَكْثُرَ النِّسَاءُ حَتَّى يَكُونَ لِخَمْسِينَ امْرَأَةً قَيِّمُهُنَّ رَجُلٌ وَاحِدٌ)[3].

---

(١) أخرجه الحارث بن أبي أسامة، برقم: (٧٩٤) وإتحاف الخيرة، للبوصيري (١٠/ ٢٦١) برقم: (٩٩٣٢).

(٢) أخرجه البخاري (٣/ ٢٨١) برقم: (١٤١٤).

(٣) صحيح البخاري، كتاب العلم ، باب رفع العلم وظهور الجهل، (١٧٨/١-مع الفتح) ، وصحيح مسلم، كتاب العلم ، باب رفع العلم وقبضه وظهور الجهل والفتن في آخر الزمان ،(٢٢١/١٦ – مع الفتح) .

واتە: لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی زانست هەڵدەگیرێ و نەزانی زۆر دەبێ و زینا زۆر دەبێ و مەی خواردنەوە زۆر دەبێ پیاو کەم دەبنەوەو ژنان زۆر دەبن تا وای لێدێت پەنجا ژن بەرامبەر یەك پیاو دەبێت.

پێشەوا موسلیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەیە دەڵێت: هۆی ئەمەش زۆر بوونی فیتنەو شەڕو کوشتارە لە نێوان پیاواندا لەبەر ئەوەی پیاوان خاوەنی شەڕو جەنگن نەك ئافرەتان[1].

بەڵام ئەگەر سەیری وشەی (لِخَمْسِينَ) بکەین بۆ عەهدی ئیشارەیە، واتە: بە کاروبارەکانیان هەڵدەستن و بەخێویان دەکەن و سەرپەرشتیان دەکەن بۆ بژێوی ژیانیان.. هەندێ جاریش بە کینایەت واتەکە هەڵدەگرێ، کە داوای هاوسەرگیری لە پیاوان بکەن جا بە حەڵاڵی بێت یان بە حەرامی.

پێشەوا حوزەیفەی کوڕی یەمان (ﷺ) دەڵێت: (إذا عمت الفتنة ميز الله أولياءه حتى يتبع الرجل خمسون امرأة تقول: يا عبد الله استرني يا عبد الله آوني)[2].

واتە: هەر کاتێك فیتنە بڵاوبوویەوەو سەرتاپای ماڵەکانی داگیر کرد، خوای گەورە دۆستەکانی خۆی جیاواز دەکاتەوە، هەتا پەنجا ئافرەت شوێن پیاو دەکەوێت و دەڵێت: ئەی بەندەی خوا دامبپۆشە، ئەی بەندەی خوا لە خۆتم بگرە.

ئەگەر سەیری ئەم فەرموودەیەی پێشەوا حوذەیفە بکەین، دەڵێی ئەو سەردەمەیە کە تیایداین، گەنج و پیاوی وا هەیە لەگەڵ پەنجا ئافرەت پەیوەندی هەیە، وەعدی بە هەمووشیان دایە تا بیانخوازێ..

ئەم فەرموودانە بەڵگەی زۆر ڕاشکاوانەن کە لە کۆتایی بونەوەر ژمارەی ئافرەتان زۆر زۆر دەبێت..

---

(١) صحيح البخاري (١/ ١٧٨) مع الفتح.

(٢) أخرجه علي بن معبد، كتاب: الطاعة والمعصية، وذكره الحافظ ابن حجر في فتح الباري (٩/ ٣٣٠) شرح الحديث برقم: (٥٢٣١).

چۆن بتوانین جەمع و تەوفیق لە نێوان ژمارەی (٣٠ ٤٠ ٥٠) بکەین لەم سێ فەرموودەیەی باسمان کرد؟

لە وەڵامدا دەڵێم: جەمع و تەوفیقەکە زۆر سانایە:

مەبەست لە (سی) ئافرەتەکە کە شوێن پیاوان دەکەون ئەوەیە: کە خۆیان پێشکەشی پیاو دەکەن کە بیانخوازێت، هەر یەکێك لە ئافرەتان ئاوات دەخوازێت بۆ ئەو پیاوە بێت کە داوای دەکات.

مەبەست لە (چل) ئافرەتەکە کە شوێن پیاوان دەکەون ئەوەیە: داوا لە پیاوان دەکەن کە بیانگرێتە خۆی و پارێزگاریان لێ بکات.

مەبەست لە (پەنجا) ئافرەتەکە کە شوێن پیاوان دەکەون ئەوەیە: هەر یەکێك لەو ئافرەتانە داوا دەکەن کە دایانپۆشێت و بیانحەوێنێتەوە.

لە فەرموودەیەکی تر پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لا تقوم الساعة حتى تمر المرأة بالنعل فتقول لقد كان لها مرة رجل)[1].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا ئافرەت بەلای نەعلێکی پیاودا نەڕوات، دەڵێت: جارێکیان لێرە پیاوێکی لێ بوو.

بۆیە ئافرەت ئەوەندە زۆر دەبێت بۆنی پیاو دەکات هەتا پاشماوەی نەعلی پیاوێك دەبینێت، پیاوێکی بیر دێتەوە.. واتە: زۆر زۆر کەم دەبن..



---

(١) أخرجه البزار كشف الأستار (٤/ ١٥٠ ١٥١) برقم: (٣٤١٨)، وقال في المجمع (٧/ ٣٣١) ورجاله رجال الصحيح.

# زینای شاراوە زۆر دەبێت

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی زینای شاراوە زۆر دەبێت، بەنموونە: پیاو سێ جاران خێزانەکەی خۆی تەڵاق دەدات، هاوسەرگیریەکەیان کۆتایی دێت، بەڵکو گوێشی بۆ نادەن ئەگەر دەیانجار تەڵاقیشی بدات، ئەمجا جووت دەبن لەگەڵ یەکتری وەکو ئەوەی هیچ شتێك ڕووی نەدابێت..

لەم سەردەمە ئەم دیاردەیە زۆر زۆرە، وشەی تەڵاقیش بەردەوام لەسەر زمانەپێشەوا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (يأت على الناس زمان يطلق الرجل المرأة طلاقها، فتقيم على طلاقها فهما زانيان ما أقاما)[1].

واتە: سەردەمێك بەسەر خەڵکی دێت، پیاو خێزانەکەی تەڵاق دەدات، ئەمجا هەر لەگەڵیشی دەمێنێتەوە، هەردووکیان زیناکاران هەر چەند لەگەڵ یەکتری بمێننەوە.

یەکێکی تر لە زینا شاراوەکان ئەوەیە ئافرەت ئافرەتی مارە دەکات بەبێ ئاگاداربوونی سەرپەشتیارو بەبێ بوونی مارەیی.. ئەمە ئێستا زۆر زۆرە بە تایبەتی لە هەندەران.. زۆر جار پەیوەندیمان پێوە دەکرێت کە گوایە باوك یان برا ڕازی نین لە بەشوودانی کچەکەیان و خوشکەکەیان.. ئەوانیش لە هەندەران ڕێك دەکەون.. لە کاتێکدا بێ ئاگان کە ئەوە زینای شاراوەیە.. یان ئەوەتا پیاو ژن دەهێنێت بە نهێنی و بەبێ بوونی بەڵگەنامەی هاوسەرگیری پێشووی کە ئایا پیاوەکەی پێشووی مردووە یان نا... بۆیە هەر هاوسەرگیریەك مەرجەکانی هاوسەرگیری تێدا نەبێت ئەوە باتیڵە..

بۆیە ئەوە یەکێکە لە هۆکارەکانی زینا زۆر مەترسیدارە، بۆیە ئەوانەی کە ئەو کارانە ئەنجام دەدەن وا دەزانن لەسەر هەقن، بێ ئاگان لەوەی کە ئەوە زینایە..

---

(١) ضعيف: أخرجه الطبرا ن في الأوسط والكبير (٧/ ٣٢٣)، وفيه سيف بن مسكين، وهو ضعيف. برقم: (١٢٤٣٥).

# نیشانەکانی ڕۆژی دوایی
# لە تەوراِت و ئینجیل و زەبور و پەرتوکەکانی تر

پێش هەموو شتێك دەبێت ئەوە بزانین کە پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداری کردووینەتەوە کە هەر شتێك لە تەوراِت و ئینجیل هات، نە بەدرۆی بزانن نە بەڕاستیشی بزانن، بەڵکو بێدەنگی باشترین دەسکەوتە، چونکە پێغەمبەرانیش (سەلامی خوایان لەسەر بێت) باسی نیشانەکانی ڕۆژی دواییان کردووە وەکو (ئەشعیا و ئیرمیا و حزقیال و دانیال و زەکەریاو موسا و داود و عیسا) بە کورتی حەزم کرد لە خزمەتتان چەند نیشانەیەك باس بکەم کە لە لەم کتێبانە هاتوون، کە ئەمانەن:

- دەرکەوتنی ئەوانەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن و کۆتاییان مەسیحی دەجالە.
- زۆربوونی کوشتن و بڵاوبوونەوەی برسیەتی[١].
- زۆربوونی بومەلەرزە.
- هەڵگەڕانەوەی خەڵکی بۆ کوفر و وازهێنانیان لە باوەڕ.
- بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و مردنی زۆر[٢].
- بڵاوبوونەوەی درۆو و دوو ڕوویی و خەڵکی بەسەر شان و باڵی دووڕووەکان دەڵێن.
- بڵاوبوونەوەی بەدڕەوشتی.
- نەمانی خۆشەویستی لە دڵی خەڵکی.
- ڕق لێبوونەوە لە خەڵکی هەق.

---

(١) سفر الرؤيا (٦ ٣ ٤). نص الترجمة السبعينية.

(٢) سفر الرؤيا (١٦ ١ ٢). نص الترجمة السبعينية.

بەرگی دووەم

- بەرزبوونەوەی نرخی شت و مەك[١].
- ئازاردانی دایك و باوك.
- زۆربوونی قسە هێنان و بردن.
- زۆر بوونی جوێن دان.
- حەڵاڵکردنی حەڕام و حەڕامکردنی حەڵاڵ.
- ئەو خواردن و خواردنەوانەی کە خودا حەڕامی کردووە.
- زۆربوونی گێلی و نەزانین.
- ڕەتکردنەوەی پەیامە خواییەکانی ئاسمانی.
- خەڵکی حەز بە خۆشەویستی دونیا دەکەن.
- زۆربوونی بەدڕەوشتی ئافرەتان.
- زۆربوونی تاوان.
- پیس بوونی دەریاو زەریاکان[٢].
- بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی[٣].
- ئازارێك تووشی خەڵکی دەبێت و نازانێت سەرچاوەکەی کوێیە[٤].
- وشککردنی ڕووباری فوڕات[٥].
- زۆربوونی بومەلەرزەو هەورە بروسکە[٦].

---

(١) سفر الرؤيا (٦ ٥ ـ ٦). نص الترجمة السبعينية.

(٢) سفر الرؤيا (١٦ ٣ ٧). نص الترجمة السبعينية.

(٣) سفر الرؤيا (١٦ ٨ ٩). نص الترجمة السبعينية.

(٤) سفر الرؤيا (١٦ ١٠ ١١). نص الترجمة السبعينية.

(٥) سفر الرؤيا (١٦ ١٢). نص الترجمة السبعينية.

(٦) سفر الرؤيا (١٦ ١٧ ١٨). نص الترجمة السبعينية.

# نـــاوەڕۆک



بەرگی دووەم

بەرگی دووەم

بەرگی دووەم

بەرگی دووەم

بەرگی دووەم

بەرگی دووەم

بەرگی دووەم

# زانستی نوێ
# و
# کۆتایی بوونەوەر

لای هەموو مرۆڤێك ئاشكراو ڕوونە كە خوای پەروەردگار پێغەمبەرمانی محەممەد(ﷺ) ناردووە بۆ ئەوەی ببێتە موژدەدەرو ترسێنەر تا ڕۆژی دوایی.

ئەم ئوممەتەش كۆتا ئوممەتە، پێغەمبەری خۆشەویستمان (محمد) كۆتایی پێغەمبەرانە، خوای پەروەردگار ئەم ئومەتەی تایبەتمەند كردووە كە نیشانەكانی ڕۆژی دوایی لێوەی سەر هەڵبدات و لەسەر زمانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوونی بكاتەوە. زانستی سەردەم ڕاستی نزیكبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی دەردەخات، بۆیە زۆر پێویستە لەسەر موسڵمانی ژیر، بیر لە كاتی هاتنی ڕوودانی ئەم ڕۆژە ترسناكە بكاتەوە.

خوای گەورە ئەوەندە هۆكارو توانای پێ بەخشیوین كە ئیتر هیچ بیانویەكمان بۆ نەمێنێتەوە لە كاتی هەر بەڵایەكدا، نایەتە بەر هەستم ئادەمیزادێك هەبێت لە دەرگای زانایەك بدات و پرسیاری لێ بكات نیشانەكانی كۆتایی بونەوەر چییە؟ لەبەر ئەوەی بابەتەكەی بەلاوە گرنگ نیە.




كتێبخانەی
حاجی قادری كۆیی
بۆ چاپ و بڵاو كردنەوە

■ 07504671394 - 07824671394
■ فەیس بووك : كتێبخانەی حاجی قادری كۆیی
■ هەولێر - بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری